نەوشیروان مستەفا ئەمین

# کورد و عەجەم



## مێژووی سیاسیی کوردەکانی ئێران

چاپی سێیەم



نەوشیروان مستەفا ئەمین

# کوردو عەجەم

## مێژوی سیاسیی کوردەکانی ئێران

سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان
سلێمانی ٢٠٠٥

## سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

دەزگایەکی کەلتورییە لەساڵی ١٩٩٢دا دامەزراوە، ئامانجەکەی لێکۆڵینەوەی زانستییە لەبوارەکانی ئاسایشی نەتەوەییو سیاسەتی نێو دەوڵەتانو ئابوریو مەسەلە ستراتیجییەکانو هەوڵی بەدەست هێنانی قازانجی ماددی نادا.

هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەی کەسەنتەر دەریاندەکا، گوزارشت لەڕاو بۆچونی خاوەنەکانیان دەکەنو بەپێی پێویست گوزارشت لەڕاو بۆچونی سەنتەر ناکەن.


- نەوشیروان مستەفا ئەمین
- کوردو عەجەم مێژوی سیاسیی کوردەکانی ئێران
- چاپی سێیەم
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- سلێمانی ٢٠٠٧
- مۆنتاجی کۆمپیوتەر: ئاسۆ سەعید
- تایپ: گۆنا عەبدوڵڵا
- بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان
- ژمارەی سپاردن: (٤١٣)ی ساڵی ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی سەنتەر: ٤/٣٠/٥
- چاپ: چاپخانەی ڕوون

# پێشەکی

ساڵی ١٩٧٩ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کۆبونەوەیەکی جەماوەریی گەورەی لەنەغەدە ساز کرد.

کۆبونەوەکە بو بەشەڕی کوردو ئازەری.

ڕێکخراوە کوردییەکان‌و لقەکانی ڕێکخراوە ئێرانییەکان لەکوردستاندا هەر یەکەیان بەجۆری لەسەر ئەو شەڕە دوان. حکومەتی ئەوسای ئێرانیش بەجۆرێکی جیاواز لەوان لەدەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆیەوە لێکی دایەوە.

پێشتر بیست بوم‌و خوێندبومەوە. برادۆست‌و موکری‌و بلباس‌و مەنگوڕو مامەش‌و زەرزاو شوکاک‌و جەلالی... چۆن سەرکوت کرابون‌و، ڕاپەڕینی ١٨٨٠ چۆن پێش ئەوەی هێزەکانی دەوڵەت بێنە سەری توشی بەرەنگاری سەختی دانیشتوانی عەجەم بوبو. سمکۆش دوچاری هەمان گیروگرفت بو بو. لەسەردەمی جمهوریەتی مەهابادیش‌دا، کێشەی دیاری کردنی سنورو جۆری ڕەفتار لەگەڵ کەمایەتی کوردو ئازەری ناو هەردو حکومەت بوبو بەهۆی گرژی پێوەندیەکانیان‌و گلەیی ڕوس لەسەرکردەکانی کورد.

ڕوداوەکەی نەغەدە سەرلەنوێ ئەوانەی لا زیندوکردمەوە.

بۆ من هۆی لەخۆپرسین بۆ، بۆچی هەرچەند تەکانێکی کوردی لەسەروی ڕۆژئاوی ئێراندا دەس پێ دەکا، بەرلەوەی دەوڵەت هێزی سەرکوت کردن‌و دامرکاندنەوەی بنێرێتە سەر لەگەڵ ئازەرییەکان توشی شەڕی خوێناوی ئەبێ؟

لەوساوە کەوتمە پیاوچونەوەی مێژوی سەر لەبەری ئێران. سەرچاوەی زۆرم پەیدا کردو کەرەستەی زۆرم خڕکردەوە. لەبەرئەوەی ئەمجارەیان بۆ دۆزینەوەی وەڵامی پرسیارێکی دیاری کراو ئەگەڕام، گەلێ بابەتی نوێم بۆ هاتە پێشەوە، نەمتوانی هۆی ناکۆکی عەجەم لەگەڵ کورد بدۆزمەوە، بەڵام بەپێی تێگەیشتنی خۆم گێڕانەوەی مێژوی چەند قەرنی ڕابوردوی پێوەندی ئەم دو نەتەوەیە ئەتوانی یارمەتیدەر بێ بۆ جۆرێ لەلێکدانەوەی هۆکانی ئەو ناکۆکیە.

ناوی خوام لێ هێنا، کەوتمە کۆکردنەوەو خوێندنەوەی سەرچاوە، چۆن ئەڵێن قسە قسە ڕائەکێشێ، سەرچاوەش سەرچاوەی ڕائەکێشا. کەرەستەی زۆرم لا کۆبوەوە. کەوتمە سەر بیری نوسینی بابەتێکی لێکۆڵینەوەیی. بابەتەکەم لەلا گەڵاڵە بو. چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەم دیاری کرد. دەستم کرد بەنوسین. ڕەشنوسی هەموو باسەکانم تەواو کرد. هەندێکیانم پاکنوس کرد. فریا نەکەوتم پاکنوسی

هەمویان تەواو بکەم، لەیەکێ لەو کارەساتانەی ڕۆژانە لەکورد ئەقەومێن، زۆری کەرەستەکانم تیاچون. ئەوەی دەرباز بو سەرلەنوێ ساڵو نیوێ مەشغوڵی بـوم تـا ئەمەی لێ پەیدابو.

ئەم باسە وەکو بەتەما بوم ئەبو ٩ بەش بێ. ٦بەشی ئەوانەن کەئێستا هەن. ٣ یان فەوتان. لەنێوانی بەشی دوهەمو سێهەمدا ئەبو دو بەشی تر هەبن، بەشی سێهەم، دەربارەی لوڕ. لەوێدا جگەلەوەی مێژوی لوڕ تاووتوێ کـرا بـو، باسـەکە بەهۆی جیابونەوەی لوڕی لەنەتەوەی کورد ئەکۆڵیەوە. بەشی چـوارەم، گێڕانـەوەی مێژوی دامەزرانو جێگیربونو لەناوچونی ئەمارەتی ئەردەڵان بـو. دوایـین بەشـی واتە ئەو بەشەی ئەبو بکەوێتە دوای باسەکەی سمکۆوە، باسی حکومەتی مەهاباد بو، جگە لەسەرچاوەکانی بێگانە، پشت ئەسـتور بـو بەبەڵگـەو بـاری سـەرنجی کوردی لەوانە بەرۆژنامەی کوردستانو بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمەی مەهاباد.

جگە لەم ناتەواوییە خۆشم ئەزانم هەندێ کـەموکوڕی دیـاری تـری تێدایـە، ویسـتم سـاڵە جیاوازەکـانی مـیلادی، هیجـری قەمـەری، هیجـری شەمسـیو شاهنشاهی، کە لەئێران بەکارئـەهێنرێن هـەمویان وەك یـەك لێ بکـەم، لەبـەر ئـەوەی سەرچـاوەیەکی بـاوەڕپێکراوم دەس نەکـەوت کـەلکی لێ وەربگـرم بـۆ گۆڕینیـان، بەناچـاری وەك خـۆی وازم لێ هێنـان. لەپاشـکۆی کتێبەکـەدا ئـەبو بیبلۆگرافی هەموو سەرچاوەکانی تێدا بێ بەڵام نەم پـەرژا تـەواوی بکـەم. هـەر کەسێ بتوانی یارمەتییەکم بدا بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەیەکی تێی کەوتوم یا بۆ پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکانی، زۆرم پێ خۆش ئەبێو لەپێشەوە سوپاسی ئەکەم.

خوا یار بێو عومر باقی بێو هەلێکی لەبارم بۆ هەڵ بکەوێ هـەوڵێکی تـر ئەدەم باسەکەم وەکو بەتەما بوم تـەواو بکـەمو، ئەوەنـدەی لـەتوانای منـدا بـێ کەموکوڕییەکانی نەهێڵم.

بۆ نوسینی ئەم باسە کەڵکم لەزۆر سەرچـاوەی فارسـی، عـەرەبی، کـوردی، ئینگلیـزیو، لەیارمـەتیو کارناسـان کـردنو ئامۆژگـاریو بیروبۆچـونی زۆر لەهاوڕێکانم وەرگرتوە. جارێ ناکرێ ناویان بێنم. بەڵام هەمیشە چاکەو پیاوەتییانم لەبیرە.

هیوادارم ڕەنجەکەم بەفیرۆ نەچو بێ.

توانی بێـتم گۆشـەیەکی مێـژوی گەلەکـەمم رون کردبێتـەوەو، خزمـەتێکی میللەتەکەمم کردبێ.

نەوشیروان مستەفا ئەمین

## ١ جیۆپۆلەتیکو چارەنوسی کورد

### ١-عەجەم لەکوردستاندا

### ١/١ هەڵکەوتی جوگرافی کوردستان

ئەگەر فاکتەری جیۆپۆلـەتیك دەورێکـی کاریگـەر یـا کـەمی لـەبڕیاردانی چارەنوسی گەلاندا نەبێ، ئەوا لێکۆڵینەوەی مێژوی کۆنو نوێی نەتـەوەی کـورد، بەئاشکرا دەری ئەخا کەهەڵکەوتی جوگرافی شوێنی ژیانی کورد لەسـەر ئـەرز، دەوری بڕیاردەری هەبوە لەدیاری کردنی چارەنوسی رابردو و، ئێستایدا.

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست" کە لەلای خوارویەوە خەلیجو ئۆقیانوسی هیندو، لەلای ڕۆژئاوایەوە دەریای سپی ناوەڕاستو، لەلای سەرویەوە دەریای رەشە، ٣ قارە گەورە دێرینە ئاوەدانەکەی دنیا: ئەوروپا، ئاسیاو ئەفریقا بەیەکەوە ئەبەستێ. شـاڕێگە جەنگیو بازرگانییەکانی ئەم ٣ ناوەندەی پێدا تێ ئەپەڕێ.

شوێنی ژیانی کورد، واتە کوردستان کەوتبووە ناوجەرگەی ئەم ناوچەیەوە کـە بەدرێژایی مێژوی مرۆڤایەتی، لەهەر قۆناغێکدا بەجۆرێ گرنگییـەکی دنیـایی هەبوە.

لەو سەردەمەدا کەئیمپراتۆریی ئێران لەڕۆژهەڵاتو ئیمپراتۆرییەکانی یۆنانو ڕۆمـان لـەڕۆژئاوا، دو ناوەنـدی زلهێزەکـانی دنیـا، لـەململانێی فراوانخـوازیو پەلهاویشتندا بون، هەندێ لە لەشکرکێشییە گەورەکانیان بـەناو شـوێنی ژیـانی ئێلەکانی کوردا رائەبوردو، هەندێ لەشەڕە قورسـە خوێناوییەکانیشـیان لەسـەر ئەرزی کوردستان ئەقەوما.

تێکهەڵچونی گوگامل(٣٣١ پ.ز) کە بەسەرکەوتنی ئەسـکەندەری یۆنـانیو تێشکانی یەکجاریی داریوشی ئێرانی تەواو بو، کۆتایی بەدەسەڵاتی ئیمپراتـۆری هەخامەنشی- ئێرانی هێناو، بو بەسەرەتای دامـەزرانی دەسـەڵاتی چـەن قـەرنی یۆنانییەکان لەناوچەکەدا، لەدەشتی هەولێر قەوما.

دوایی تر، کەسەرلەنوێ ئیمپراتۆریەتی ساسانی دامەزرا، پایتەختەکەی خۆی لەتەیسفونی نزیك شاری بەغداد بینا کرد. ئەوێی کردە بنکەی هەمو لەشکرکێشییەکانی بەهەرچوار لای خۆیدا، بۆ سەر ئەرمەنستان، یۆنان، رۆمان، سەروی ئەفریقا. لەشکرکێشییەکانی بەناو ئەرزی کوردا رائەبورد. ساسانییەکان بەپێڕەوی لەنەریتی دێرینەی حوکمڕانی هەخامەنشییەکان، لەهەر لایەکی سنورەکانیدا، جۆرێك لەسەربەخۆیی بۆ گەلە خۆجێییەکانی ئەو ناوچانە سەلماند بو. گەورەکانیان نازناوی شایان ئەدرایە، هەریەکێ لەو شاهانەیش لەمەلبەندەکەی خۆیدا بەهێزەکانی گەلەکەی خۆی، ئەبو سنورەکانی ئیمپراتۆریی لەهێرشی بێگانە بپارێزێ. ئیمپراتۆر خۆیشی: شاهانشا، شاهی شاهەکان بو[1]. ئەم جۆرە رێکخستنە، ئەگەرچی چاکەی زۆری هەبو، بەلام تۆوی لاوازکردنی دەوڵەتەکەشی تێدا بو، بگرە یەکێ بو لەهۆکانی روخانیو بەرگە نەگرتنی لەبەرامبەر هێرشی بەپڕتاوی عەرەبدا.

سەرهەڵدانی دەعوەتی دینی ئیسلامی لەنیوە جەزیرەی عەرەبییەوەو، هەوڵدانی بۆ پەرەپێدانو بلاوکردنەوەی لەدەرەوەی سەرزەمینی خۆیان، ئەبو بەهۆی پێکادان لەگەڵ دو هێزە گەورەکەی ئەو سەردەمە" یەکێکیان، ئیمپراتۆریی ساسانیو، ئەوی تریان ئیمپراتۆریی بێزەنتی. لەپاش تێکهەڵچونی سەختی هەردو سوپای گەورەی عەرەبی- ئێرانی لەقادسیە(٦٣٥ز/١٥ك)لەسەر روباری فورات، هەمو شەڕە سەختەکانی تری ئەم دو هێزە لەجەلەولا(٦٣٦ز/١٦ك)، حەلەوان (٦٤٠ز/٢٠ك)، و دوایین تێکهەڵچونی بڕیاردەریش لەنەهاوەند(٦٤٢ز/٢٢ك) کەناوی فتح الفتوحی لێ نراو، ئیتر بەیەکجاری کۆتایی بەدەسەلاتی دەوڵەتی ساسانی ئێران هێناو، بو بەسەرەتای دامەزرانی ئیمپراتۆریی فراوانی عەرەبی- ئیسلامی لەسەرانسەری ناوچەکانی خواروی رۆژئاوای ئاسیادا، هەمووی لەسەر ئەرزی کوردستان قەومان. ئێران ئیتر ناوەندێکی سیاسیو جەنگیی خورتو یەکگرتوی تێدا نەما لەهێرشی هێزەکانی بێگانە بیپارێزێ، لەئەنجامی ئەو شەڕو روداوانەشدا چەندین ئێلی گەورەی کورد لەژێر گوشاری هێرشی عەرەبدا پەرەوازەی شوێنە دورەکانی ناوەوەی ئێران بون.

پایتەختی دەوڵەتی تازە- دامەزراوی عەرەبی ئیسلام لەمەککە بو، مەککەش بەهۆی هەلکەوتی جوگرافییەوە لەناوەڕاستی بیابانی جزیرەی عەرەبیدا نەیئەتوانی ببێتە ناوەندی بەڕێوەبردنو سەرپەرشتیی هەمو ئەو سەرزەمینە فراوانەی، هێزەکانی عەرەب لەماوەیەکی کورتدا بەشەڕ هێنا بویانە ژێر باری فەرمانبەرییەوە. هەر لەسەرەتاوە بۆ سەرکردایەتی درێژەپێدانی

لەشکرکێشییەکانی سوپای عەرەب بۆ سەر کوردستانو ئێرانو ئەرمەنستانو، چەسپاندنی دەسەلاتی ئیسلام لەخواروی میزوپۆتامیا((ئـەرزی دوچۆمان: ارض الرافدین))دا، چەن شارێکیان دامەزران وەکو" بەسرە(٦٣٨ز)،کوفە(٦٣٩ز)، واسیت(٧٠٢ز). ئەم شارە نوێیانە بونە شوێنی جێگیربونی هەندێ لەقەبیلە عەرەبە هاتوەکانو، بارەگای سازدانو رێکخستنو سەرکردایەتی هێزەکانی عەرەبی ئیسلام بۆ فراوان کردنی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی نوێو، چەسپاندنی تەواوی دەسەلاتی دینی، سیاسی، جەنگیی خۆیان لەوڵاتە فەتح کراوەکاندا. کوردستان لەلای خوارویەوە لەوساوە ئیتر کەوتە ژێر گوشاری بەردەوامی عەرەبەوە، قەبیلەکانی عەرەب پاڵیان بەئێلەکانی کوردەوە ئەنا بەرەو ژور بۆ ناو شوێنە سەختە شاخاوییەکان هەڵ بکشێن. خۆیان لەشوێنەکانی ئەواندا جێگیر ئەبون.

پایتەختی ئیسلام ماوەیەکی درێژ لەمەککە نەمایەوە. لەپاش شەڕێکی ناوخۆ، ئەمەوییەکان کۆتاییان بەدەسەلاتی خەلیفەکانی سەدری ئیسلام هێنا(٦١٢-٦٦١ز/؟-٤٠ك). زنجیرەی ئیمپراتۆریی- خەلافەتی عەرەبی ئەمەوییان لەشام دامەزراند(٦٦١--٧٥٠ز/ ٤٠-١٣٢ك). دەسەلاتی ئەوانیش زۆری نەخایاند لەلایەن بنەماڵەی عەبباسییەوە بەهاوکاری گەلانی نەعەرەبی ئێرانی، لەشەڕێکی سەختدا لەسەر تاوی زێی بادینان(٧٥٠ز / ١٣٢ك)لەخواروی موسڵدا لەناوبران، ئیمپراتۆریی- خەلافەتی عەبباسی دامەزرا(٧٥٠-١٢٥٨ز). پایتەختی دەوڵەتەکەی لەشامەوە گوێزایەوە بەغداد، بۆ نزیك کەلاوەکانی تەیسفونی پایتەختی ساسانی(٧٦٢ز)، کەباووباپیرانی خۆیان سەدەیەك لەوەوبەر روخاند بویان. هێنانی پایتەختی خەلافەتی عەرەبی- ئیسلامی بۆ بەغداد، واتە راستەوخۆ بۆ لای خواروی شوێنی دێرینەی ژیانی کورد، بەکردەوە کوردی خستە ژێر تینی گوشاری روبەڕو و بەردەوامی عەرەبو تەعریبەوە، چونکە هیچ نەتەوەو دەوڵەتێکی تریان لەبەینا نەبو. هەم خۆیو هەم نیشتمانەکەی بونە لەمپەرێکی مرۆییو ئەرزیی لەنێوان قەبیلەکانی عەرەب لەلایەك، وە گەلانی فارسو ئەرمەنیو بیزەنتی لەلایەکی ترەوە. لافاوی بەخوڕی تەعریب، کە لەماوەیەکی کورتدا خواروی ئەرزی میزۆپۆتامیا، رۆژئاوای روبارەکانی فوراتو دیجلە، هەمو سەرزەمینی شام، سەروی ئەفریقا، تەنانەت گەیشتە ئەندەلوس لەئیسپانیا، کەچی لەبناری چیاکانی زاگرۆسدا، واتە لەسەر سنوری شوێنی ژیانی کورد، نەی توانی زیاتر تەشەنە بکاتو بتەنێتەوە، بگرە ئیتر لەوێدا راوەستا.

## ٢/١ هوروژمی تورك بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

زاناکان مرۆڤایەتی دابەش دەکەن بەسەر چەند رەسەنی سەرەکیدا، هەر رەسەنەش بەسەر چەن رەگەزو لقوپۆپی گەورەو پچوك دا. یەکێ لەم رەسەنانە بە((ئۆرالو ئالتایی)) ناوئەبرێ، چونکە لەناوچەکانی ئورالەوە تا مەڵبەندەکانی ئالتایان گرتۆتەوە، تورکو مەغۆل ئەبێ دو رەگەزی گەورەی ئەم رەسەنە بن، کە لەناوچەکانی ئاسیای ژورودا ئەژیان.

سەبارەت بەهاتنی تورك بۆ مەڵبەندەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست چەندین تیۆریی جیاواز هەیە، بەڵام هەمویان لەوەدا یەك ئەگرنەوە، کەی هاتونەتە ناوچەکەوە. زانای ئێرانی، سعیدی نفیسی، لەیەکێ لەتوێژینەوەکانی خۆیدا نوسیویەتی:

((... لەدەوروبەری سەرەتای قەرنی ٥ هەمی زایینیدا ئێران لەدولاوە لەگەڵ دو رەگەزی بێگانە روبەڕو بوەوە. ئەوانەیان کە لەسنورەکانی سەروی رۆژهەڵاتی ئێرانەوە دەرکەوتون، ئێرانییەکان پێیان وتون: هفتالو، عەرەبیش پێیان وتون: هیتلو هیاتلەو لەباری سەرنجی مێژونوسانی ئەمڕۆ وە بێگومان لەرەگەزی تورك بون. ئەوانەشیان کە لەسنورەکانی سەروی رۆژئاواوە لەپشتی کێوەکانی قافقاسەوە دەرکەوتون، ئێرانییەکان هەمیشە بەوانەیان وتوە: خەزەر، ئەوانەش بەپێی لێکۆڵینەوەکانی ئەم سەردەمە بێگومان لەتورکەکانی ئەمڕۆ بون.

((لەو زەمانەدا تورك لە٣ لای دەریای خەزەردا" لەلاکانی رۆژهەڵاتو ژورو و رۆژئاوایدا ژیاونو، بەسەر چەندین ئێلو هۆزدا دابەش ئەبون. ئەوی لەمێژو و ئەدەبیاتی ئێمەدا(مەبەستی هی ئێرانە)لەهەمویان زیاتر ناوی براوە بریتی بون لە:

تورکی یەغما، خەلج یا خرلخ، غوز، خەرخیز((قەرقیز)) باشقورد، قەزاق، قەراقالباق، سەلجوق، تورکمان، کلموك، فارغلی، تەغزغوز، برتاس، قرلغ لەژوروی رۆژهەڵاتی ئێرانو" قەراپاپاخ، کیماك، بجناك، سالور، بایەندور، ئەفشار، بیکدلی، برسخان، بەیات، خەزەر لەژوروی رۆژئاوای ئێران. هەروەها ٣ ئێلی گەورەی تریش هەبون بەناوی بولغار، قەپچاقو تاتار کە لەسەردەمێکا لەگشت کەنارەکانی دەریای خەزەردا نیشتەجێ بون، بەڵام هەندێ ئێلی تر لەرۆژهەڵاتەوە بەشێنەیی تەنگیان پێ هەڵچنینو، تەنیا لای رۆژئاوای دەریاکەیان بۆ هێشتنەوە.

((مەغۆل لەکۆتایی قەرنی ٦ هەمی کۆچیو قەرنی ١٣ هەمی زایینیدا، واتە نزیکەی نۆ سەد ساڵ لەدوای تورك، لەمێژودا دەرکەوتن، بەڵام لەبەرئەوەی

خزمایەتی نزیکیان لەگەڵ تورك هەبو، لەو زەمانەوە بەزۆری وایان زانیوە تورك‌و مەغۆل لەیەك رەگەزن[٢].

نفیسی لەدرێژەپێدانی لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا سەبارەت بەهاتنی ئێلەکانی تورك بۆ ئێران، نوسیویەتی:

((لەقەرنی ٤ هەمی کۆچیدا یەکێ لەئێلە گەورەکانی تورك کە لەلێوارەکانی جەیحوندا ئەژیا، بەشێنەیی بەرەو خوار بوەوە، سەرەتا خوارەزم‌و دوایی تر مەڵبەندی گورگانیشی گرت، کەم کەم دانیشتوانی خۆجێیی کونی ئەوێی دەرکرد. ئەم ئێلە گەورەیە ئەبو بەدو هۆزی پچوك ترەوە((غوز))و((تەغزغوز)). ئەوانەیان کەهاتنە ئێرانەوە ناویان تورکمان بو، لەناو ئەوانیش‌دا تیرەیەکیان لەنەوەکانی سەلجوق، بەناوی سەلجوقییانەوە لەئێران‌و سەرزەمینێکی فراوانی وڵاتانی ئیسلامی‌دا پادشاییان دامەزراند.

((تورکمانەکان هەر لەو دەمەوە کەهاتنە ئەو ناوچانە لەوێ مانەوە، ئەوەتا بەشێکیان لەجمهورییەتی تورکمانستانی سۆڤیێتی دان‌و بەشەکەی تریشیان تورکمانەکانی مەڵبەندی گورگانن.

((لەو زەمانەوە کەتورك لەرۆژهەڵات‌و رۆژئاوای دەریای خەزەرەوە سەریان هەڵدا، ئێلەکانی تورك بون بەدو لقی سەرەکی" ((تورکی رۆژهەڵاتی))و((تورکی رۆژئاوایی)) زمانەکانی تورکی ئەم سەردەمەش بەتورکی رۆژهەڵاتی‌و تورکی رۆژئاوایی دابەش ئەبن.

((تورکانی رۆژهەڵاتی، وەکو پێشتر وترا، چەندین سەدە بو لەسەروی کێوەکانی قافقاسدا ئەژیان‌و، زنجیرە چیا بەرزو سەختەکانی ئەو سەرزەمینە، رێی لێ گرتبون پەلاماری ئێران بدەن، تەنانەت پادشایانی ساسانی بەم کۆسپە گەورەو سروشتییەیش دانەکەوت بون، دیوارێکی زۆر ئەستوری وەکو دیواری چینیان لەبەرامبەر ئەوانەدا دروست کرد بو، هەروەکو دیوارێکیشیان لەبەرامبەر تورکانی رۆژهەڵاتی‌دا بینا کردبو.

((ناسراو ترینی ئێلەکانی تورکی رۆژئاوایی، ئێلەکانی خەزەر، بولغار، قەبچاق بون، هەندێ لەهۆزەکانی ئەمانە کەدوایی تر هاتنە ئێران، بەیات‌و ئەفشارو بایەندور و سالور بون بەگوێرەی هەندێ بەڵگە ئەبێ ئێلی قاجاریش هەر لەریزی ئەمانەدا بژمێردرێ))[٣].

تاسەردەمی عەبباسییەکان، هەواڵ‌و دەنگوباسی تورك یاهیچ گەلێکی تر کەبەرەچەڵەك بچێتەوە سەر رەگەزی ئۆرال- ئالتایی، وەکو گەلێکی دانیشتوی

ناوچەکە، یاهێزێکی کاریگەر لەروداوەکانی ناوچەکەدا، بەتایبەتی ناوچەکانی ژیانی کوردا، نیە.

نوسەرێکی ئێرانی تر لەزمانی زولالیان، مێژونوسی سۆڤێتییەوە ئەنوسی:

((ئێلە رەوەندەکانی تورك کەناویان غوز یا ئوغوز بو، لەرۆژگاری کۆنەوە لەلێوارەکانی سەیحونو بەینی ئەوێو گۆمی ئارالو دەریای خەزەردا ئەژیان. لەنیوەی دوەمی سەدەی ١٠هەمی زایینیدا، غوزەکان لەگەڵ ئێلە کۆچەرەکانی تری ئاسیای ناوەڕاستدا یەکیان گرتو، دەوڵەتێکیان دامەزراند. لەم یەکگرتنەدا غوزانی سەلجوقی لەهەمویان گرنگ تر بون، ناوی سەلجوق یان لەهۆزی((کینین ئوغوز))ەوە لەخۆیان نا. لەنیوەی دوەمی سەدەی ١٠هەمی زایینیدا، غوز ئیسلام بون. لەبەرئەوەی غوزەکان لەوەڕگای تەواویان نەبو، بۆیە کەوتنە دەسدرێژی بۆ سەرزەمینی دراوسێکانیان، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی لەوەڕگایان هەبو))[٤]

پاش لەناوچونی سامانییەکان، تورکانی غوز بون بەهێزی دەسەڵاتداری ناوچەکەو، شەپۆل لەدوای شەپۆل رویان کردە مەڵبەندەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی خۆراسان، ئازەربایجان، ئەرمەنستان، کوردستان، خاکی عەرەبو ئاسیای پچوك.

عەبباسییەکان، خۆیان بەیارمەتی گەلانی نەعەرەب، ئەمەوییەکانیان شکانو، خەلافەتی عەبباسییان دامەزراند. بۆ پارێزگاری پایتەختو دەسەڵاتی خۆیانو سەرزەمینی فراوانی قەڵەمڕەوی دەوڵەتەکەشیان ئەبو پشت بەهێزی بەکرێگیراوی گەلانی نەعەرەب ببەستن. خەلیفەکانی عەبباسی هەر لەسەرەتای دامەزرانی دەوڵەتەکەیانەوە، لەشکرەکانی خۆیان بەزۆری لەخەڵکی گەیلانو دەیلەم پێك ئەهێنا، لەقۆناغێکی ژیانی خەلافەتی عەبباسیدا دەسەڵاتی دەیلەمییەکان گەیشتبوە رادەیەك، خەلیفە دەسەڵاتی دنیایی- سیاسیو جەنگیی لەدەس دابوو، بەتەنیا پایەی دینی مابو. سەرکردەکانی سوپا، کە نە لەبنەماڵەی عەبباسیو نە لەڕەسەنی عەرەب بون، نازناوی شاهنشاه وئەمیر الامراء یان بەخۆیان ئەدا. دەیلەمییەکان بوو بونە مەترسییەکی راستەقینە بۆ سەر دەزگای خەلافەت. لەوانە بو ئەوان لەجێگەی خەلیفەکانی عەبباسی دەوڵەتی تایبەتی خۆیان دابمەزرێنن، نەخوازە گەلەکانی دەیلەمو گەیلانو مازندەرانیان لەپشت بو، کەسەرچاوەیەکی دەوڵەمەنی هێزی مرۆیی سوپاکانیان بون. خەلیفەکانی عەبباسی نەیان ئەتوانی ئەو بۆشاییە سوپاییە هەروەکو سەردەمی سەدری ئیسلام و بەنی ئومەییە، بەجەنگاوەرانی خاوەن باوەڕو ئازای قەبیلەکانی عەرەب پڕ بکەنەوە، ئەبو پەنا هەر بۆ جەنگاوەرانی بەکرێگیراوی نەعەرەب ببەن.

٨ هەمین خەلیفەی عەبباسی موعتەسەم بیللا(٢١٨-٢٢٧ك)ی کوڕی هارون ئەلڕەشید کەدایکی کەنیزەکێکی تورك بو، ٨ هەزارو، بەگوتەیەکی تر، ١٨ هەزار تورکی کڕی. سوپایەکی پۆشتەو پڕچەکی، بۆ بەهێز کردنی پایەکانی دەسەلاتی خۆی لەبەرامبەر هێزەکانی دەیلەمو نەیارەکانی تریدا لێ پێك هێنان. هەر لەبەر ئەوان پایتەختی خۆی لەبەغدادەوە گوێزایەوە شارێکی نوێ بەناوی سامەڕا[٥]. بەمەش ڕێ بەفراوانی لەبەردەمی هورووژمی ئێلەکانی تورکدا کرایەوە بۆ ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. تورك لەوساوە ئیتر بون بەیەکێ لەهێزە گرنگە بڕیاردەرەکانی ناوچەکە.

نفیسی لەلێکۆڵینەوەکەیدا ئەنوسێ:

((... لەو دیو کێوەکانی قافقاسەوە، لەسنورەکانی سەروی خۆراوای ئێراندا، ئێلی جیاجیا لەڕەگەزی تورك، دانیشت بون. لەسالی ٦١٩ی کۆچیدا مەغۆلەکان لەهەمان ڕێگەی قافقاسەوە هێرشیان کردە سەر روسیای ئەمڕۆو خاکی سلاڤەکانو تا سالی ٧٠٢ز هەمو روسیایان لەژێر دەسدا بو. دوایی تریش تا ٨٦٦ز هێشتا بەشێکی ئەم ولاتەیان هەر لەژێر دەس دابو. لەسەرەتای قەرنی ٨ هەمی کۆچییەوە کەسلاڤەکان کەم کەم کەوتنە دەرکردنی مەغۆلەکان بەهەر چوارلای خۆیاندا، واتە بەلای سەرو و ڕۆژهەلاتو خوارو و ڕۆژئاوا، بەلام زۆرتر لای خواروی قەلەمڕەوەکەی خۆیان فراوان ئەکردو ئەو شوێنانەی دراوسێیان بونو بەدەس گەلانی ترەوە بو لەدەستیان دەرئەهێنانو ئەوانیان بۆ ئەولاتر دەرئەکرد. لەو گەلانەی کەسلاڤەکان لەشوێنەکانی خۆیان دەریان کردنو ئەرزەکەیان داگیر کردن هەمان تورکی ڕۆژئاوایی بون. کەدو ڕێ زیاتریان لەبەردەما نەبو، یا ئەبو لەچیاکانی قافقاس بپەڕنەوە بەرەو خوار بڕۆن، واتە پەنا ببەن بۆ سەروی ڕۆژئاوای ئێرانی ئەو سەردەمە، یان ئەبو لەلێوارەکانی دەریای ڕەشدا بلاو ببنەوە. وەهاشیان کرد. بەو هۆیەوەیە لەو زەمانەوە تورك لەتورکیای ئەمڕۆو لەنیوە جزیرەی بالکانو لەنیوە جزیرەی کریمەو لەسەرو و خواروی روباری ئاراسدا دەرکەوتن.

((ئەو بنەمالانەی تورك لەم مەلبەندانەدا پادشاییان دامەزراند، هەمویان لەدوای ئەو ڕۆژەوە پەیدا بون:

((بنەمالەی کرمیان لەکوتاهیە لە٦٩٩دا، بنەمالەی حەمید ئۆغلو لەئەناتۆلی لە٧٠٠دا، بنەمالەی تکەئوغلو ئەنتالیە دوای ٧٠٠، بنەمالەی منتشا ئۆغوللری لەناوچەیەکی تری ئەناتۆلیدا دوای ٧٠٠، بنەمالەی ذوالقدر ئوغوللری لەئەلبوستانو مەرعەش لە٧٤٠دا، بنەمالەی ئالی عوسمان لە٦٩٩دا،

بنەماڵەی گرای لەکریمە لە٨٢٣دا، خانەکانی غازان لە٨٤٩دا، خانەکانی قاسموف لە٨٥٦دا، جەلایەرییان لەئێران و عیراق لە٧٣٦دا، چوپانیان لەئازەربایجان لە٧١٨دا، تغا تیموریان لەمازندەران لە٧٣٧دا، قەراقوینلو لەئازەربایجان لە٧٨٠دا، ئاق قوینلو لەئازەربایجان لە٧٨٠دا.))[٦].

مێژونوسی کورد ئەمین زەکی، لەژێر سەرناوی ((کورد لەدەوری فتوحاتی تورکدا))نوسیویەتی:((ئۆغوزەکان کەپێشڕەوی سەلجوقییەکان بون کە لە ڕەی هەڵسان و رویان کردە ولاتانی غەرب(٤٢٠ی هیجری و ١٠٢٩ی میلادی)، یەکێ لەقوماندانەکانی غەزنەوی کەناوی ((تاش فراش))بو لەگەڵ ٣ هەزار سوارێك کەبەشێکی کورد بوون ڕێگەی پێ گرتن و شەڕیان بو. تەصادوف گەورەی کوردەکان کەوتە دەس ئوغوز بەزۆر کاغەزێکیان بۆ کوردەکان پێ نوسی تا دەست لەشەڕ هەڵگرن. بەم تەرحە غەلەبەیان سەندو پێش کەوتن.

((لەساڵی ٤٢٩دا ئوغوزەکان گەیشتنە دەوری مەراغا، شاری مەراغایان وێران و تالان کردو زۆریان لەخەڵکەکەی کوشت و لەدواییدا هەڵیان کوتایە سەر عەشیرەتی((هازبەنی))و کوشتارێکی زۆریان لێ کردن، لەدواییدا عێلەکانی کوردی ئەو ناوە لەگەڵ حاکمی ئازەربایجاندا ئیتیفاقیان کردو موقابەلەیەکی بەشیددەتیان نواندو بەهەر حاڵێك بو ئوغوزەکانیان گەڕاندەوە.

((تاقمێکی تریان تا ئەرمینیە چو بون لەوێدا قەتڵ و تالانێکی زۆریان کردو گەڕانەوە دواوەو هاتنە دەوری ورمێ و سەرخێلاتی عێلی ئەبو ئەلهیجای هازبەنی، ئەم کوردانە بەتەبیعەت شەڕێکی قورسیان لەگەڵ کردن بەلام زۆربەی ئۆغوزەکان لەنەتیجەدا شپرزەی کردن و بلاوبونەوە.

((لەساڵی ٤٢٠ی هیجریدا حکومەتی روادیی کوردی لەتەورێزدا تەشەکولی کرد موئەسیسی ئەم حکومەتە((واهـ سودانی کوڕی مامەلان))ە تا ساڵی ٤٢٦ دەوامی کرد. حکومەتی((دیسم))پێشڕەوی ئەم حکومەتەیە.

((لەساڵی ٤٢١ی هیجریدا، حکومەتی شوانکارەی کورد لەولاتی فارس دامەزراو بەهەر نەوعێ بو تا٧٥٦ دەوامی کرد.

((لە٤٣٢ی هیجریدا، موزەفەری واهـ سوزانی کوڕی مامەلان، لەدوای ئەمە کەهەمو رونەسای ئۆغوزی بەفێڵ گرد کردەوە هەمویانی قۆڵ بەست کردو هجومی کردە سەر لەشکرەکەیان و زۆری لێ کوشتن. بەلام قۆڵی ورمێ یان لەمە رزگاری بو، روی کردە ولاتی حەکاری کە لەتەوابیعی موسڵ بو، تالانێکی زۆریان کردو لەوەقتێکا کەلەبەینی چیاکاندا گیرۆدە مابون، کوردی ئەو ناوە لەهەمو لایەکەوە دەوریان دان و ١٥٠٠ کەسێکیان لێ کوشتن و دیلێکی زۆریشیان لێ

گرتن‌و تالآنێکی باشیان دەس کەوت. لەناو دیلەکانا حەوت ئەمیری ئۆغوزیش هەبو.

((لەنزیك بونەوەی ئوردوی تۆغرۆل بەگدا ئوغوزەکان لەترسا بەتالوکە پێش کەوتن. قۆڵێکی کە لەژێر قوماندەی مەنسور ناو ئەمیرێك‌دا بو بەسەر زۆزان‌دا روی کردە جزیرەی ئیبن عومەر، هێشتا لەشەرقی ئەم وڵاتە بون کەقۆڵێکی تریان لەقوماندەی بوقا((بوغا))دا روی کرد بوە دیاربەکرو، دەستی کردبوو بەتالآنی ناوچەی کاردو((کاردی))ی بازابداو حسینیەو پیشخابور((فیشخابور)).

((حاکمی جزیرە سلێمانی کوڕی ناسرِ ئەلدەولەی مەروانی، کەلێکی دایەوە زانیی کەئەم ئوغوزانە لەپێش بەهارا لەوڵاتی جزیرە ناتوانن تێ پەڕن لەبەرئەوە فکری لێ کردەوە، بەفێڵێك مەنسوری قوماندانی ئوغوزەکانی گرت‌و بەیارمەتی کوردەکانی باشناوی ((فێنك))هەڵی کوتایە سەریان، تادەوری نسیبین بردنی‌و زۆری لێ کوشتن، بەڵام ئەم حەرەکەتەش دیسان نەبو بەمانیعی زەرەریان‌و نیهایەت خۆیان گەیاندە دیاربەکرو هەمو لایەکیان وێران‌و تالآن کرد. حاکمی مەروانیی دیاربەکر ماڵێکی زۆری بەئوغوزەکان دا، لەدیاربەکر دوری خستنەوە. لەدوایی‌دا رویان کردە تەرەفی موصل و نەفسی شارەکەیان دوجار زەوت کردو قەتڵ‌و تالآنێکی بێ غایەتیان کرد. قەرەواشی ئەمیری موسڵ بۆ مودافەعەی موسڵ تەڵەبی موعاوەنەتی لەئومەرای عەرەب‌و کورد کرد.

((لەساڵی ٤٦٣ی هیجریدا(١٠٧١م)کە ئیمپراتۆری رۆم، رومانوس((ئارمانوس))ی چوارهەم لەدەشتی مەلازگرد مەغلوب‌و ئەسیر بو، هەمو ئەرمینیەو کوردستان بەرە بەرە کەوتە دەس حکومەتی سەلجوقیی ئەلپ ئەرسەلان، ئەو حکومەتان‌و ئامارەتانی کوردە کەهەبو یەك لەدوای یەك لەناو چو، وڵاتەکانیان کەوتە دەس سەلجوقییەکان.

((لە٤٩٣ی هیجری‌دا، ئاخر حوکمداری مەروانی کە لەئەخلات دا مابوەوە، بەسەبەبی سوئی ئیدارەی خۆی‌و بوغزی ئەهالی ئەویش مەحو بوەوە، وڵاتەکەی کەوتە دەس سوکمان قوتبی غوڵامی ئەتابیکی ئەورێز.

((خولاسە لەئیستیلای تورك‌دا وڵاتانی کورد کە لەسەرەڕێگەدا بون زۆر زۆر زەرەریان دی. ئەو نیفاق‌و تەفرەقەی کە لەبەینیانا بو نەی هێشت کە بەکۆمەڵی‌و برایەتی بەرامبەر ئەو لافاوە بەقووەتە بوەستن، کەلەبەر ئەمە موقابەلەی مونفەریدەیان بێ فائیدە بو، بەسەرو ماڵ زۆر زەرەریان دی‌و هیچ قەومێکی تر بەقەد کورد لەژێر دەست‌و پێ‌دا نەچو، زاتەن لەئیبتیدای تاریخەوە تا ئیمرۆ ئەگەر بەدیققەت تێ بفکرین ئەبینین کەپەشۆکی‌و ماڵ وێرانی ئەم

قەومە، هەمو نەتیجەی نیفاق‌و تەفرەقـەیان بـوەو تـا ئـەم حاڵـەیان دەوام بکـا دائیمەن لەژێر دەستوپێ‌دا ئەچن))[7]

بەجۆرە تورك، یاخود وردتر، ئێل‌و گەل‌و نەتەوەی جیاجیا کـە بـەناوی تـورك، غوز، تورکمان، مەغۆل، ئازەری.. هتد گەیشتنە کوردستان، لەهەندێ شـوێنی‌دا بەژمارەی زۆر نیشتەجێ بون. چەندین دەوڵەتیان دامەزران. شـەپۆلە گـەورەکانی تـورك بەکوردسـتان‌دا تـێ پـەڕی. هەنـدێ لەبنەماڵـە گـەورەکانی سـەلجوقی، ئەتابیکی، جەلایـەری، قـەرەقوینلو، ئـاق قوینلـو.. ناوەنـدی دەسـەڵاتی خۆیـان لەناوجەرگـەی کوردسـتان‌دا، دامـەزران. هـەروەها هێرشـی مەغۆلـەکانیش، بەتایبـەتی لەشکرکێشـیی گـەورەی هۆلاکـۆ بـۆ سـەر بەغـدادو، دوایی‌تـر دامەزراندنی پایتەختی خۆی لەمەراغەی نزیك کوردستان‌و، هێرشەکانی تەیموری لەنگ، هەر بەناو کوردستان دا تێ پەڕین.

هەڵکەوتی نالەباری جوگرافی کوردستان لەجێگیر بون‌و تەنینـەوەی تـورك‌دا دەورێکی کاریگەری هەبو. تەنانەت تێکهەڵچـونی گـەورەی تورکـانی سـەلجوقی لەگەڵ بێزەنتییـەکان کـە کۆتـایی هێنـا بەدەسـەڵاتی یۆنانییـەکان لەئاسـیای بچـوك‌داو، بـو بەسـەرەتای جـێگیر بـونی یـەکجاری‌و پەلهاوێشـتنی تـورك لەسەرانسەری ناوچەکەداو، دوایی تـر دامـەزرانی دەوڵـەتی عوسمـانی، ئـەویش لەمەلازگرد(١٠٧١ز)، هەر لەسەر ئەرزی کوردستان رویدا.

کورد ئەگەر لەدوای فەتحی ئیسلامییەوە تا ئەو کاتە لەلای خوارووییەوە لەژێر گوشاری پەرەسەندنی عەرەبدا بـو، ئـیتر لـەلای ژووری‌و لـەلای رۆژهەڵاتیشـیەوە کەوتە ژێر گوشارێکی بەهێز ترەوە، کەئەویش گوشاری جێگیر بونی لافاوی یـەك لەسەر یەکی گەلانی تازە هاتوی تورك- رەگـەزو، دوایی‌تـر لێشـاوی کاولکـەری مـەغۆل بو.

### ٣/١ دامەزرانی دەوڵەتی ئێران

شێخ سفی ئەلدین ئیسحاق(٦٥٠-٧٣٥ك)لەئەردەبیلەوە کەوتە بڵاوکردنەوەی تەریقەتێکی سۆفی، کە مریدەکانی بەناوی سـەفەوییەوە ناسـرا بـون. تەریقـەتی سەفەوی لەناو ئێلە تورکمان‌و ئازەرییەکانی ئازەربایجان‌و ئەنەدۆڵ دا پەرەی سەند. کوڕو نەوەکانی لەدوای خۆی تا ئەهات دەسەڵاتی دینی‌و دنیاییان بەهێزتر ئـەبو. مریـدەکانی سـەفەوی بـۆ جیاکردنـەوەی خۆیـان لەخـەڵك لـەزەمانی سـوڵتان حەیدەرەوە هەر یەکەیان کڵاوێکی سوری لەسەر ئەنا. خۆیان پێیان ئەگوت تـاجی حەیدەری، بەڵام خەڵك پێیـان ئـەوتن قزلبـاش. ئـوزون حەسـەن(٨٧٣-٨٨٢ك)، پادشای ئاق قوینلو لەگـەڵ ئـەم بنەماڵەیـە خزمایـەتی دامەزرانـد، خەدیجـەی

خوشكی خۆی دابو بەسوڵتان جنیدی نـەوەی شـێخ سـفی الـدین. دوایـی تـریش مـارتای كچی خۆیدا بەسوڵتان حەیدری كوڕی شێخ جنید.

لەدوای مردنی ئۆزون حەسەن نێوانی ئەم دو بنەماڵەیە تێك چو. شێخ جنیـد لەململانێی بەدەستهێنانی دەسـەڵاتدا كـوژرا. حەیـدەری كـوڕی لەشـێخایەتیدا جێگەی گرتەوە. سوڵتان حەیدەریش هەر لـەململانێی بەدەسـتهێنانی دەسـەڵاتدا لەشەڕدا لەگەڵ فەرمانڕەوایانی شیروان‌و ئـاق قوینلـودا كـوژرا(٨٩٣ك)حەیـدەر لەدوای كوژرانی چەند كوڕێكی لەپاش بەجێ مابو، لەوانـە عـەلی، ئیسـماعیل، ئیبراهیم.. سوڵتان یعقوبی ئاق قوینلو لەدەسەڵاتیان ئەترسا. هەموویانی لەقـەڵای ئیستەخر لەشیراز زیندانی كرد، بەڵام مریدەكانی سەفەوی عەلی یـان لەجێگـەی باوكی بە((مرشد))و((سوڵتان))ی خۆیان دانا بو.

ئەمیرەكانی ئاق قوینلو لەناو خۆیانـدا لـەململانێدا بـون، ئـەم ململانێیـە لەدوای مردنی سوڵتان یعقوب(٨٩٦ك) زیاتر توندو تیژ بـو. رۆسـتەم بـەگ بـۆ بەهێزكردنی دەسەڵاتی خۆی، هەوڵیدا كەڵك لەمریـدەكانی سـەفەوی وەربگـرێ. بەو مەبەستە پورو پورزاكانی بـەرێزەوە لەقـەڵای ئیسـتەخرەوە هێنایـە تـەورێز. سوڵتان عەلی‌و مریدەكانی كرد بەگژ بای سونقوری ئامۆزایدا. لەم شـەڕەدا بـای سونقور كوژرا(٨٩٨ك). بەمەش سوڵتان عەلی لەجاران بەهێزتر بو. رۆستەم لێی كەوتە ترسەوە. ویستی بەفێڵێك لەناوی ببات. سوڵتان عەلی بەوەی زانی، خـۆی‌و مردیدەكانی بەكۆمەڵ رێگەی هەڵاتنیان گرت. هێزەكانی رۆسـتەم بـەگ دوایـان كەوتن. لـەم راونانـەدا سـوڵتان عـەلی كـوژرا(٩٠٠ك). سـوڵتان عـەلی دیـارە پێشبینی كوژرانی خۆی كردوە. چونكە وەكو ئەڵێن لەپێش كـوژرانیدا بەدەسـتی خۆی كڵاوی سوڵتانی قزلباشی لەسـەری خـۆی هـەڵگرتوە، كردویەتییـە سـەری ئیسماعیلی برای، كەئەوسا تەمەنی هێشتا ٨ ساڵ بو.

تەریقەتی سـەفەوی بوبـوە بزوتنەوەیـەكی دینـی-سیاسـی ئەوەنـدە بـەهێز، كوژرانی یەك لەدوای یەكی سەرۆكەكانی نەك هەڵی نەوەشاند، بەڵكو زەمینـەی خۆش كرد دەسەڵاتی سیاسی بگرێتە دەست. مریدەكانی سەفەوی لەدوای كوژرانی عەلی، ئیسماعیلی برایان بەمرشدی كامل‌و سوڵتانی خۆیان دانـا بـو. ماوەیـەك لەئەردەبیل شاردیانەوە. بەڵام بۆ پاراستنی گیـانی لەمەترسـی ئـەمیرەكانی ئـاق قوینلو بەنهێنی بردیانە گـەیلان. ماوەیـەك لەرەشـتو، چـەن سـاڵێك بـەنهێنی لەلاهیجان ژیا. ساڵی ٩٠٥ك لەكاتێكا ئەمیرەكانی ئاق قۆینلو بەربو بونە گیانی یەكتری، ئیسماعیل كەتازە ئەبو بە١٣ساڵ، بەپێی رێوشـوێنێك كەخەلیفـەكانی تەریقەت بۆیان دانا بو، لەلاهیجانەوە كەوتە خۆ ئاشكرا كردن‌و بـەرەو ئـەردەبیل

کەوتــە ڕێ. بەدرێــژایی ڕێگــا مریــدەکانی بــاوكو بــاپیرانی ئەهاتنــە ریــزی لەشکرەکەیەوە، تا ئەهات ژمارەیان زیادی ئەکرد.

لەزنجیرەیەك تێکهەڵچونی خوێناویدا، فــەرمانڕەوایانی شــیروانو ئــەمیرەکانی ئاق قوینلوی تێك شکاندو شــاری تــەورێزی گــرت. لەجێگــەی پادشــاکانی ئــاق قوینلو لەتەورێز لەسەر تەختی شــاهێتی دانیشــت(٩٠٧ك ١٠٥١). ئیســماعیل پایەکانی شاهێتی خۆی لەسەر ٤ بناغە دامەزران:

١-سیادەت، ئیسماعیل بەگوێرەی شەجەرەیەك کەیەکێك لەباپیرەکانی ســازی کردبو خۆی بە نەوەی ئیمامی عەلی دائەنا[٨].

٢-تەریقەت، ئیسماعیل خۆی بە((مرشــدی کامــل))ی تەریقــەتی ســەفەوی دائەناو، لەراستیشدا نەوەی شێخ سفی ئەلــدینی ئــەردەبیلی دامــەزرێنــەری ئــەم تریقەتە بو.

٣-تەشــەییوع، ئیســماعیل لەیەکــەم ڕۆژی ڕاگەیانــدنی شــاهێتی خۆیــەوە، شیعەی کرد بە مەزەبی رەسمــی دەوڵــەت، فــەرمانی دا لەمزگەوتــەکاندا بــانگ بەشێوەی شیعە بدرێ، لەخوتبەی نوێژی هەینیدا ناوی دوانزە ئیمامــەکان بــبرێ، لەعنەتی ٣ خەلیفەکانی ڕاشدین بکرێ"

٤-ئێرانی بون، ئیسماعیل هەوڵیدا سەرزەمینی دێرینی ئێران لەدەوڵــەتێکی یەکگرتودا یەك بخاتو، فەرهەنگی ئێرانی زیندو بکاتەوە.

ئێران بەدەوڵەتی فارس ناسراوە، بەڵام شا ئیسماعیل خۆی فارس نەبوە، ئازەری بوە. تەنانەت شیعری بەزمانی تورکی- ئــازەری هۆنیوەتــەوەو(ختــابی)) کردۆتــە نازنــاوی شــیعری خــۆی. زمــانی گفتوگــۆی دەربــارو، زمــانی گفتوگــۆو لەیــەك گەیشــتنی نــاو خێزانەکــەی خۆیشــی ئــازەری بــوە. ئەوانــەیش کەبونــە هێــزی دامەزرێنەری دەوڵەتەکەی، هێــزی پاراســتنو لەشکرکێشــیەکانی، کاربەدەســتی دەربارو، حوکمڕانی ناوچەکان سەرانی ٧ ئێلی تورکی ئــازەری: شــاملو، روملــو، تکــەلو، ئیســتاجلو، قاجــار، ئەفشــار، زولقــەدر بــون، کــەخاوەنی ڕێکخــراوی خێڵەکیو، خاوەنی تەجروبەی زۆری شەڕوشۆڕ بون.

نوســەری ئێرانــی، نەســرولڵا فەلســەفی، لەیــەکێ لەلێکۆڵینــەوەکانیدا نوسیویەتی:

((لــەدوای گرتنــی ئازەربایجــان، شــا ئیســماعیل سەرانســەری ئێرانــی، لەولایەتەکانی عیراقی عەجەمو ئەســفەهانو فــارسو کرمــان، تــا خوزســتانو بەشێکی عیراقــی عــەرەبی، لەســوڵتانەکانی ئــاق قوینلــو گــرت، بەشــکاندنو کوشتنی شیبك خانی ئوزبەك خوراسانیشی گرتو، سەرانی قزلباش کەئەو هەمو وڵات گرتنو سەرکەوتنانە ئەنجامی گیانبازیو دلێریو فیداکاری ئەوان بو لەرێی

((مورشیدی کامیل))دا، لەهەر ولایەتێکا بە ئەلقاب وعەناوینی ئەمیرولئومەراو بیگلەربیگیو خانو سوڵتانو بیگ، بونە خاوەنی حکومەتی سەربەخۆو زەویوزارو ئەرزی فراوان.

((شا ئیسماعیل لەدوای فەتحی هەر ولایەتێ دەسکەوتو دیلو ئەرزەکانی ئەوێی لەناو سەردارەکانی قزلباشدا دابەش ئەکرد. بەم شێوەیە لەسەرانسەری ئێراندا ئێلەکانی تورك نەژادو تورك زمان، بونە فەرمانڕەوای ئێرانییانی رەسەنی پارسی زمانو، چینێکی مومتازی خاوەن دەسەڵات لەئێراندا پەیدا بو کە هەمو کارو پایە سوپاییو دەوڵەتییەکانیان بەدەس بو، بەو پەڕی ئیستیبداو قودرەتەوە حوکمڕانییان ئەکرد. هەر لەسۆنگەی ئەوەوە لەسەردەمی سەفەویدا، ئەگەرچی بەشایان ئەگوت شاهنشاهی ئێران، بەڵام بەدەوڵەتی ئێرانیان ئەگوت مەملەکەتی قزلباش. لەدەرباری ئێراندا بەتورکی قسە ئەکراو، شا ئیسماعیل خۆی بەتورکی شیعری دائەنا. قزلباشەکانی تورك خۆیان لەخەڵکی رەسەنی ئێرانی بەنەجیب ترو گەورەتر ئەژماردو، ئەوانیان بۆ سوکایەتی بەتاتو تاجیك ناو ئەبرد))[9].

شا ئیسماعیل لە لەشکرکێشییەکانیدا ئەوپەڕی دڵڕەقیو دڕندایەتی بەرامبەر دوژمنو نەیارەکانی بەکار ئەهێنا.

لەشەڕی شیرواندا دوای کوشتنی فرخ یسار، ئیسك و پروسکی خەلیل ئەڵڵای باوکی فرخی لەگۆڕ دەرهێناو سوتاندی، دوای گرتنی تەورێزیش بەهەمان شێوە ئێسقانی نەیارەکانی باوكو باپیری لەگۆڕ دەرهێنا، ئاگری تێ بەردا. لەبەغداش ئێسقانی ئەبو حەنیفەی لەگۆڕ دەرهێناو سەگێکی لەجێگەکەی ناشت. محەمەد کرهی لەپاش بەدیل گیرانی لەگەڵ ٧ کەسی ترا خست بوە ناو قەفەزەوە، لەمەیدانێکی گشتی ئەسفەهاندا، بەزیندویتی سوتاندنی. لەدوای گرتنی بەتلیس لاشەی شێخ ئەمیری بلباسیو کوژراوەکانی تریان لەگوك مەیدان ئاگر تێ بەردا.

بەفەرمانی شا ئیسماعیل خۆی، مریدەکانی گۆشتی مراد بەگی شاهلویان کردە کەبابو، گۆشتی شیبك خانی ئۆزبەکیان بەکاڵی خواردو، پێستی سەریان لەکا پڕ کردو بەدیاری بۆ سوڵتان بایەزیدی عوسمانیو، هەر پەلێکیان بۆ یەکێ لەحوکمڕانی ناوچەکان ناردو، کاسەی سەریشیان لەزێڕ گرت، شا ئیسماعیل لەبەزمی بادە نۆشیدا خۆی شەرابی تیا ئەخواردەوە.

لەسۆنگەی ئەوەی سوڵتان حسێن بایقرا لەنامەیەکدا کەبۆ شا ئیسماعیلی نوسی بو، وەکو پێویست بەرێزەوە ناوی نەبرد بو، شا ئیسماعیل هەڵی کوتایە

سەریان‌و ٧هەزار کەسی لێ کوشتن. لەسەر ئەوەی دایکی، یان وەکو هەندێ سەرچاوەی تری ئێرانی ئەڵێن باوەژنی، شوی بە یەکێ لەناحەزەکانی باوکی کرد بو، لەناوەڕاستی بازاڕی تەورێزدا بەشمشێر دونیمەی کرد[10].

ئەمیرەکانی ئاق قوینلو رەفتاریان لەگەڵ کورد رەق بو. لەزۆر جێگە ئەمیرە خۆجێییەکانی کوردیان لێ خست بو، خۆیان‌و هۆزەکانیان لەجێگەی ئەوان حوکمڕانییان ئەکرد. کاتێ کەئەمیرەکانی ئاق قوینلو لەناو خۆیاندا تێك چون‌و بەربونە گیانی یەکتری‌و، دەنگوباسی راپەڕینی شا ئیسماعیل گەیشتە کوردستان. ئەمیرەکانی کوردیش لەمەڵبەندەکانی خۆیان هەر یەکەیان لەلای خۆیەوە کەوتە هەوڵ دانی دەرکردنی ئاق قوینلو. میر شەرەف کوڕی میر بەدر خانی جزیرو بۆتان‌و، مەلیك خلیلی ئەیوبی سیرت‌و حەسەنکیف‌و، شێخ حەسەنی چەمشگەزەك‌و، میر سەیفەدین موکریانی لەدەسەڵاتی ئاق قوینلو پاك کردەوە[11].

میرەکانی کورد بەهیوا بون مەڵبەندو میرایەتی خۆیان بەخۆیان بسپێردرێنەوە، بەڵام شا ئیسماعیل ئەیویست دەسەڵاتێکی ناوەندی دابمەزرێنێ. ئەویش پێڕەوی هەمان سیاسەتی تورکمانەکانی ئاق قوینلوی ئەکرد، ئەمیرەکانی کوردی لا ئەبرد، ئەمیرەکانی قزلباشی لەکوردستان لەجێگەدا ئەنان.

شا ئیسماعیل لەهەمو لەشکرکێشییەکانی‌دا لەهەرچوار لای قەڵەمڕەوەکەی‌دا، لەماوەی چەند ساڵێکی کەم‌دا ئیمپراتۆرییەکی فراوانی دامەزران، سنورەکەی ئەگەیشتە سنوری کۆنی ئیمپراتۆریی ساسانی، بو بوە هەڕەشەیەکی راستەقینە لەسەر ئیمپراتۆریی عوسمانی. یاوز سەلیم لەو هێرشە گەورەیەدا کەبەناو کوردستاندا بۆ سەر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی سەفەوی کرد، بۆ یەکەمین جار لەدەشتی چالدێران شکستێکی سەختی بەشا ئیسماعیل‌دا(٩٢٠ك/١٥١٤ز). بەڵام ئەم شەڕە دەوڵەتی تازە دامەزراوی ئێرانی لەنا نەبرد. بەڵکو ئەم دەوڵەتە هەرما. چەن قەرن لەململانێ‌دا بو لەلایەکەوە لەگەڵ شۆڕش‌و هەڵگەڕانەوەی گەلە ناتازەرییەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی‌و، لەلایەکی ترەوە لەگەڵ دەوڵەت‌و گەلە دراوسێکانی.

شا ئیسماعیل لەداخی تێکشکانی چالدێران خوی دایە بادەنوشی‌و گۆشەگیری، نەی توانی تۆڵەی تێکشکانی چالدێران بکاتەوە، هەروەها نەشیی توانی لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی بکاتە هیچ جۆرە پەیماننامەیەکی ئاشتی، بەداخی ئەم شەڕەوە لەتەمەنی گەنجی‌دا سەری نایەوە(٩٣٠ك/١٥٢٤ز). بەڵام دوژمنایەتییەکی قوڵی بەمیرات بۆ جێنشینەکانی لەدوای خۆی بەجێ هێشت.

## ٢-سەفەوی و گۆڕینی هەلومەرجی دیمۆگرافی رۆژهەلاتی کوردستان

تاسەردەمی سەفەوییەکان لەداوێنی چیاکانی قافقاس بەرەو خوار بۆ سەر روباری ئاراس و لەوێشەوە بەناو مەڵبەندەکانی ماکۆو، خوی بەرەو خوار تاسەر دەریاچەی ورمێ بەرەو خوارتر شوێنی ژیانی ئێلاتی کورد بو. روداوەکانی سەردەمی فەتحی ئیسلامی و، خەلافەتی عەبباسی و، کۆچورەوی تورکانی غوزو، هێرشەکانی مەغۆل و کێشەو بەرەی نێوان ئێلە تورکمانەکانی قەرەقۆینلوو ئاق قوینلو نەیتوانی بو بەجۆرێکی بنەڕەتی هەلومەرجی دیمۆگرافی ئەو شوێنانە بگۆڕێ. ئەگەرچی هەندێ لەپاشماوەی ئێل و هۆزەکانی تورك. تورکمان، مەغۆل و تازەری لەو ناوچەیەدا جێگیر بون، بەلام هەمیشە زۆرایەتی دانیشتوانی و دەسەلاتدارەکانی کورد بون، تەنانەت لەسەردەمی پەیدابونی سەفەوییەکاندا ئەمارەتە بەهێزەکانی چەمشگەزەك، دونبولی، مەحمودی، برادۆست، هەکاری، موکری.. لەناوچەکانی سەروو، رۆژئاواو، خواروی دەریاچەی ورمێدا هەبون[١٢].

شا ئیسماعیلی سەفەوی(٩٠٧-٩٣٠)دامەزرێنەری دەولەتی ئێران، لەسیاسەتی دینی‌دا تعصبێکی بێ ئەندازەی بۆ مەزەبی شیعە هەبو دژی سوننەو[١٣]، لەسیاسەتی نەتەوەیی‌دا تعصبێکی زۆری بۆ ئەو ٧ ئێلە تازەرییەی قزلباش: شاملۆ، روملو، ئیستاجلو، تکەلو، قاجار، ئەفشار، زولقەدر هەبو، کەبون بەهێزی سەرەکی دامەزراندنی دەولەتەکەی و لەشکرکێشییەکانی لەناوچەکەدا[١٤].

سیاسەتی کوردیی شا ئیسماعیل لەسەر ٣ کوچکە دامەزرا بو:

١-نەهێشتنی دەسەلاتی سەرداره خوجێیەکانی کوردو، دانانی سەرانی قزلباش بەخۆیان و هۆزەکانیانەوە لەجێگەی ئەوان"

٢-ناچارکردنی خەلکی ناوچە داگیرکراوەکانی کوردستان بۆ دەس هەلگرتن لەمەزەبی سوننی و چونە سەر مەزەبی جەعفەری"

٣-بەکارهێنانی ئەوپەڕی توندوتیژی بۆ چاوترساندنی خەلك و، سەرکوتکردنی بێ بەزەییانەی هەمو جۆرە بەرهەلستی و ملنەدانێ.

شا ئیسماعیل لەو لەشکرکێشییەدا کە بەناو کوردستان دا لەئەرزنجانەوە بۆ دیاربەکرو لەوێوە بۆ موسل و بەغدادو لوڕستانی کرد، دەستی لەهیچ جۆرە زەبروزەنگێ نەپاراست. نورعەلی خلیفەی روملوی بۆ سەرکوتکردنی ئێلە کوردەکانی ئەرزنجان، بەتایبەتی ئێلی چەمشگەزەك و، خان محەمەد خانی ئیستاجلوی بۆ سەرکوتکردنی ئێلە کوردەکانی دیاربەکر دانا. ئەوانیش بەو پەڕی

توندوتیژییەوە کەوتنە هەوڵدانی سەرپێ دانەواندنی میرو مەزنەکانی کوردو، جێگیر کردنی سەرانی قزلباش‌و هۆزەکانیان لەقەڵاو شارەکانی کوردستاندا. لەزستانی ٩١٢دا شا ئیسماعیل بەلەشکرێکی زۆرەوە خۆی چو بۆ ناوچەی خوی. لەوێ بارگەی خست. لەکاتێکدا ئەمیرەکانی کوردستان بەکۆمەڵ بۆ دەربڕینی گوێڕایەڵی‌و دڵسۆزی چوبونە لای، بێ هیچ بەهانەیەك هەمویانی گرت‌و، هەر یەکەیانی دایە دەست یەکێك لەمەزنەکانی قزلباش‌و، هێزەکانی قزلباشی ناردە سەر کوردستان بۆ داگیرکردنی" چاپان سوڵتانی ئیستاجلو بۆ سەر بتلیس‌و، دیو سوڵتانی روملو بۆ سەر هەکاری‌و ، یکان بەگی تکەلو بۆ سەر جزیرەی بۆتان‌و[١٥] ، عەبدی خان‌و سارو عەلی مهرداری شاملو بۆ سەر ئێلەکانی موکری‌و مەحمودی لەخۆرئاوای دەریاچەی ورمێ[١٦].هێزەکانی قزلباش شەڕی سەختیان لەگەڵ ئێلەکانی کورد کردو بەکۆمەڵ لێیان کوشتن.

سیاسەتی دینی‌و نەتەوەیی شا ئیسماعیل لەناوچە داگیرکراوەکانی کوردستان‌و عەرەبستاندا مەلاو گەورەکانی کوردو عەرەبی رەنجاند، تۆوی ناکۆکییەکی قوڵی مەزهەبیی شیعی- سوننی‌و، ناکۆکییەکی قوڵی نەتەوەیی کورد-عەجەمی چاند. هەمو ئەوانە چەند جار نامەو نێردراویان ناردە لای سوڵتان بایەزیدی عوسمانی(٨٨٦-٩١٨ك)و سوڵتان سلیم(٩١٨-٩٢٦ك)بۆ هاندان‌و بانگکردنی دەوڵەتی رۆم بۆ پەلاماردانی دەوڵەتی تازە دامەزراوی شیعەی ئێرانی‌و لەناو بردنی[١٧]ئیمپراتۆریی عوسمانی تا ئەو سەردەمە روی پەلهاوێشتنی فتوحاتی لەئەوروپا بو. دروست بونی دەوڵەتی شیعەی ئێرانی لەسنوری رۆژهەڵاتی داو، هەوڵدانی بۆ فراوان بونی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی لەکوردستان‌و قافقازو ئەرمەنستان‌و عەرەبستاندا، مەترسییەکی راستەقینەی بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی دروست کرد. بابیعالی بۆ لەناوبردنی ئەو مەترسییەی هەڕەشەی لەسنوری رۆژهەڵاتی ئەکرد. روی سەرنجی بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەرگێڕا. کەوتە لەشکرکێشی‌و داگیرکردنی نیشتمانی کوردو ئەرمەن‌و عەرەب.

سوڵتان سلیم بەهێزێکی گەورەوە، کەبەشێکی کورد بو، بەناو کوردستاندا هێرشی کردە سەر ئازەربایجان کەناوەندی دەسەڵاتی سەفەوی بو. خان محەمەد خانی ئیستاجلو لەدیاربەکرەوەو نورعەلی خلیفەی روملو لەئەرزنجانەوە، بۆ بەشدار بون لەبەرگیری هێرشی عوسمانی، کشانەوە ئازەربایجان. بەدەم رێگاوە هەمو ئەو ناوچانەیان وێران کردو ئاگر تێ بەردا. بۆ ئەوەی ئوردوی عوسمانی نەتوانێ خۆراکی خۆی‌و ئالیکی باربەرەکانی لێ دابین بکا[١٨] . لەشکری رۆم بەسەرکردایەتی سوڵتان سەلیم‌و لەشکری عەجەم بەسەرکردایەتی شا ئیسماعیل لەدەشتی

چاڵدێران لەسەروی ڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێ لێکیاندا(٩٢٠ك). لەشکری عەجەم تێکشکا، تەنانەت شاری تەوریزی پایتەختی سەفەوی کەوتە دەس هێزەکانی عوسمانی[١٩].

بەڵام بەهۆی درێژە نەکێشانی هێرشی ڕۆمەوە ئەم سەرکەوتنە نەیتوانی کۆتایی بەدەوڵەتی سەفەوی بهێنێ، هەروەها نەبو بەهۆی هیچ جۆرە ڕێککەوتنێ، تەنانەت ڕێکەوتنی ڕاگرتنی جەنگ، بەڵکو بو بەسەرەتای دەسپێکردنی ململانێیەکی خوێناوی درێژخایان لەنێوانی ئەم دو هێزە زلەی ناوچەکەدا.

لەئەنجامی جەنگی چاڵدێراندا بەشێکی فراوانی کوردستان کەوتە ژێردەستی سوڵتانی ڕۆم‌و ئەویش بەپێچەوانەی شای عەجەمەوە بەڕێوەبەرایەتی میرنشینە میراتییەکانی کوردی بەمیرەکانی کورد سپاردەوە.

هەڵکەوتی جیۆپۆلەتیکی کوردستان لەنێوان هەردو دەوڵەت داو، بەلادا نەکەوتنی ململانێی سیاسی- چەکداری ئەم دو هێزەو، درێژە کێشانی شەڕو تێکهەڵچون، کوردی لەچەند سەرەوە تێوەگلاند:

١-هەر دو دەوڵەت بەهەمو شێوەیەك هەوڵیان ئەدا دەس بەسەر کوردستاندا بگرن‌و بیخەنە سەر قەڵەمڕەوی خۆیان، بۆ ئەمەش لەشکریان ئەکردە سەرو، بەزۆرو بەخۆشی مەزنەکانی کوردیان ئەهێنایە بەر فەرمانی خۆیان‌و، ئەیان کردن بەگژ یەکتری داو، ئەندامانی یەك خێزانیان لەیەکتری هان ئەدا.

٢-لەهەمو پێکادانەکاندا بەشێکی گرنگی هێزەکانی هەردولا لەئێلەکانی کورد پێك ئەهێنرا، هێزی مرۆیی کورد توشی لەناوچون‌و ڕاگوێزان‌و هێنان‌و بردن ئەبو.

٣-کوردستان خۆی بو بەیەکێك لەمەیدانەکانی پێکادانی هێزە چەکدارەکانی هەردولا، هەندێ لەشەڕە گەورەکانی لەسەر ئەرزی کوردستان قەوما. هەروەها کوردستان چونکە کەوت بوە نێوان هەردو دەوڵەتەوە، بو بەیەکێ لەڕێگە سەرەکییەکانی لەشکرکێشییە گەورەکانی هەردولا بۆ پەلاماردانی شارو مەڵبەندە ستراتیجی‌و گرنگەکانی یەکتری، لەئەنجامی ئەمەشدا ئاواییەکانی کوردستان وێران ئەبون، سامانی بەتاڵانی لەشکری داگیرکەر ئەبرا، بەروبومی کشتوکاڵ‌و ئاژەڵی ئەفەوتا، زەرەری گیانیی زۆری لێ ئەکەوت.

دەوڵەتی ئێران لەسەرەتای دامەزرانیەوە لەدولاوە ڕوبەڕوی مەترسی هێرشی دەوڵەتانی سوننی بو، لەلای ڕۆژئاوایەوە هەمیشە لەبەر مەترسی هێرشی عوسمانی دابو، لەلای ڕۆژهەڵاتیشیەوە لەبەر مەترسی هێرشی ئۆزبەك دابو. شاکانی ئێران بۆ بەربەستی ئەو مەترسییانە" لەناوەوە ئاڵوگۆڕی دیموگرافییان

ئەکرد، جێگۆڕکێیان بەئێلەکانی کوردو، لورو تورکمانو، ئازەری.. هتد، ئـەکرد، بۆ پارێزگاری هەردولای سنور لەگەڤی ڕۆمو ئۆزبـەك لـەدەرەوەش هـەوڵی پەیـدا کردنی هاوپەیمانی ئەورووپایی‌و مەسیحییان ئەدا، بۆ هاوکاری دژی ئیمپراتـۆریی عوسمانی، کەماوەی چەند قەرن بو، بوبوە مەترسییەکی گـەورە بـۆ سـەر دنیـای مەسیحی.

شا ئیسماعیل بۆ بەهێزکردنی سنوری خۆراسان لەبەرامبەر هێرشی ئۆزبەکدا ئێلی کوردی قەرامانلوی لەکوردستانەوە بۆ خوراسان گوێزایـەوە[20]. دوای ئـەویش شا تهماسبی کوڕی بەشێکی گەورەی ئێلە کوردەکـانی زەنگنـە، چـگنی، زیـك، کەلهوری لەکوردستانەوە گوێزایەوە بۆ خۆراسان[21].

جەنگی ٢٠ سـاڵەی نێـوان شـا تهماسـب(٩٣٠-٩٨٤)و سـوڵتان سـلێمانی قانونی(٩٢٦-٩٧٤)، زنجیرەیەکی گرنگی شـەڕەکانی لەسـەر ئـەرزی کوردسـتان قەوماو، بەشێکی گـەورەی قوربانییەکانیشـی مـەزنو کـوڕی ئێلـە کوردەکـانی ژێردەستی هەردو دەوڵەت بو، ئەو شەڕانە کارەسـاتو ماڵوێرانییـەکی گـەورەیان بەسـەر کـورد هێنـا، کۆتاییەکەشـی بـەپێکهاتنی ئاشـتی ئاماسـیە (٩٦٣ك:١٥٥٥ز)هات.

جەنگی ٢٠ ساڵەی ئێرانی- عوسمـانی(٩٤٠-٩٦٠ك)کارەسـاتێکی گـەورەی بەسەر کوردستان هێنا. ئولامە سوڵتانی تکـەلو حـاکمی ئازەربایجـان، کەیـەکێ لەگەورەی گەورەکانی قزلباش بو، لە شا تهماسب یاخی بو، پـەنای بـۆ سـوڵتان سلێمانی قانونی برد، ئولامە بوو بەمایەی تێکدانی نێوانی هەنـدێ لەئـەمیرانی کوردو عوسمانی. هەروەها توانی هانی ئیبراهیم پاشای صدری ئەعزەمو سـوڵتانی عوسمانی بدا بۆ پەلاماردانی ئێران. لەشکری عوسمانی، کەبەشێکی پێك هات بو لەهێزی ئێلەکانی کورد، بەسەرکردایەتی ئیـبراهیم پاشـاو بەچاوسـاغی ئولامـە بەناو کوردستاندا هێرشی کردە سەر ئازەربایجانو پایتـەختی دەوڵـەتی صـەفەوی داگیر کرد(٩٤٠ك). بۆ جێگیر کردنی ئەم سەرکەوتنە سـوڵتان سـلێمان خۆیشـی بەهێزێکی گەورەوە بەناو کوردستان دا ڕوی کردە تەورێزو بۆ بەسەربردنی زستانی سەختی ئەو ساڵە لەهەمەدانەوە دیسانەوە بەناو کوردستاندا ڕوی کردە گەرمیانی بەغـداو بەغـدادی لـەدەس قزلبـاش دەرهێنـا(٩٤١). سـوڵتان هـەر بـەناو کوردستاندا گەڕایەوە بۆ ئەستەمبوڵ. شا تهماسب، تەورێزی گرتـەوەو تـا شـاری وان پێشڕەوی کرد[22].

دوای ئەم شەڕانە، هەردو دەوڵەت لەبەر گیروگرفتی ناوەوەی خۆیـان و بـەهۆی خەریکی هێزەکانی عوسمانی بەلەشکرکێشییەوە لەئەورووپاو، خەریکی هێزەکـانی

ئێرانی بە بەربەستی هێرشی ئۆزبەکەوە، هیچیان نەیتەپەرژایە سەر سازدانی پەلاماری گەورە بۆ سەر تەوی تریان، تا ئەلقاس میرزای برای شا تهماسب هەڵات و پەنای بۆ سوڵتان سلێمان بردو هانی دایەوە بۆ هێرش بردنە سەر ئێران(٩٥٣ ك). عوسمانییەکان هێزێکی گەورەیان بۆ پەلامار دانی ئێران سازدا. شا هەر کەهەواڵی بزوتنی لەشکری دوژمنی بیست، خۆی تەورێزی بەجێ هێشت و شنب غازانی کردە بارەگای خۆی و فەرمانی دا بەنێردراوەکانی کەهەمو شوێنەکانی سەر رێی لەشکرکێشیی تورك ئاگر بدەن و دانەوێڵەو گیای تێدا نەهێڵن و جۆگەکانی پڕ بکەنەوە. فەرمانەکانی شا لەو بارەیەوە، ئەوەندە بەخێرایی و وردی جێبەجێ کران، بەقسەی مێژونوسانی ئێران" سوپای هێرشهێنی تورك نە دڵۆپی ئاوو نەگەڵایەکی سەوزی لەسەر رێگەی خۆیدا نەدی[٢٣]. سوڵتان سلێمان ئەمجارەش چوەوە ناو تەورێز(٩٥٥)، بەڵام ئەمجارەش لەبەرکەمی خۆراك و ئالیك، بە ناچاری چۆڵی کردو بەناو کوردستاندا لەرێگەی وانەوە گەڕایەوە پایتەختەکەی خۆی. دوا بەدوای ئەو تهماسب هاتەوە ناوچەکەو هێزێکی نارد بۆ سوتاندن و وێران کردنی ئاواییەکانی ئەخلات، گزل درە، عادل جواز[٢٤].

لەدوایین قۆناغی جەنگی ٢٠ ساڵەدا، تهماسب لە٤ قۆڵەوە هێزەکانی خۆی ناردە سەر ئاوایی و قەڵاکانی ئەرجیش، بارگیری، پاسین، وان، موش، بەندماهی، عادلجواز..(٩٦٠)و سەرانسەری ئەو ناوچانەیان لە((ئاگرو خوێندا نقوم کرد))[٢٥] شا خۆی چوە سەر قەڵای ئەخلات و گرتی و تەختی کرد. پاش ٣ مانگ گەمارۆدان قەڵای ئەرجیشی گرت و لەتۆڵەی ئەو لاساریيەی قەڵادارەکان نواند بویان، شا فەرمانی دا((کەوڵی سەری ئەو کوردانەی قەڵاکەیان پاراست بو بەزیندویەتی بگرون))[٢٦]بۆ دوەمین ساڵ لەسەر یەك هەمو ناوچەکانی وان، وستان، ئاموك، کواش، ئەلباق، خوشاب.. یان تاڵان کردو، ئاگریان لەدانەوێڵەو پوش و پاوانیان بەردا[٢٧].

لەدوای ئەم هێرشانە، سوڵتان سلێمان هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی سازدا، کەبۆ جاری چوارەم لەشکر بۆ سەر ئێران ببات. پاش چەند تێکهەڵچونێکی بچوك، بەرلەوەی هێزەکانی هەردو دەوڵەت روبەڕوی یەکتری ببنەوە، هەردولا لەئەنجامی گیروگرفتی ناوەوەی خۆیان و، مەترسی هێرشی دەرەکیدا، کەوتنە گۆڕینەوەی نامەو نێردراو. سەرەنجام گەیشتنە پەیمانی ئاشتی ئاماسیە، کەبە حسابی ئەبجەد بە((الصلح خیر))ئەکاتە ٩٦٩ی کۆچی[٢٨].

لەسەردەمی شا ئیسماعیل و سوڵتان سەلیمەوە هیچ جۆرە رێککەوتن و ئاشتییەك لەنێوان ئەم دو ئیمپراتۆرییەدا نەبو بو، بەڵام پێکهاتنی ئاماسیە بو

بەهۆی ناسینی رەسمی دەوڵەتی شیعەی ئێرانی لەلایەن عوسمانییەوە، هەروەها بەلاداخستنی وەختیی هەندێ لەکێشە ئەرزی، مەزهەبی، سیاسییەکانی هەردولا.

لەم رێککەوتنەدا، بەپێی تەرازوی هێزەکانی هەردولا، ئەرمەنستان، گورجستان، کوردستان، بەشێکی عەرەبستان بەسەر هەردو دەوڵەتدا دابەش کران، ئەبو ناوچەی قارس بەبێلایەنو قەڵاکەی بەکاولی بهێڵرێتەوە، هەردولاش بەڵێنیان بەیەکتریدا کار بەدەستانی سنورەکان کێشەو بەرە دروست نەکەنو، داڵدەی راکردوانی یەکتری نەدەن[29].

بەندە سەرەکییەکانی پێکهاتنی ئاماسیە، لەقۆناغەکانی داهاتودا، دوای هەڵگیرسانەوەی هەمو جەنگێکی خوێناویو دەسپێکردەوەی هەمو گفتوگۆیەکی ئاشتی، ئەبونە بنچینەی گفتوگۆ بۆ رێکخستنی پەیماننامەی نوێ.

لەماوەی جەنگی ٢٠ ساڵەدا هەندێ ئاڵوگۆڕی دیمۆگرافی لەکوردستاندا رویدا، شاتهماسب چەند ئێلێکی کوردی گوێزایەوە بۆ خوراسان. سلێمانی قانونییش هەر بۆ هەمان مەبەست هەندێ لەئێلە کوردەکانی گوێزایەوە بۆ سەر سنورەکان، مەلا محمودی بایەزیدی لەم بارەیەوە نوسیویەتی:

((کەسوڵتان سلێمانی داد پەروەر گەڕایەوە ئەستەمول دایکی روی تێ کردو پێی گوت: کوڕم وا تۆ گەڕایتەوە، بەڵام ئاخۆ لەمەودوا گورجو قزلباشەکان هێرش ناهێننە سەر مەڵبەندەکانت؟

سوڵتان لەوەڵام دا گوتی: دایکە دیوارێکی پتەوم لەنێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو دەوڵەتانی گورجو عەجەم دا دروست کرد، دوژمن ئیتر پێی ناکرێ هیچ زیانێکمان پێ بگەیەنێ.

دایکی پرسی: چۆن توانیت لەو مەودا درێژەدا دیوار دروست بکەیت؟

سوڵتان لەوەڵامدا پێی گوت: دایکە من ئەو دیوارەم لەگۆشتو خوێن دروست کردوە. بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانەم بەرەو روی هۆزە کوردەکان کردۆتەوە... دوژمن ناتوانێ زەفەریان پێ بەرێو بگاتە ناو دەوڵەتی ئیسلام))[30].

لەدوای مردنی تهماسب، ئیسماعیلی کوڕی کەنزیکەی ٢٠ ساڵ بو لەقەڵای قەهقەهەدا زیندانی بو لەسەر تەختی شاهێتی دانیشت. ئەو هەر لەکۆنەوە ناسرا بو بەوەی دژی پێکهاتنی ئاماسیە بوە. کەهاتە سەرکار رێزی پەیمانی ئاماسیەی نەگرتو کاربەدەستانی سنور هەندێ کار شکێنییان کرد. هەروەها بەر بوە گیانی براو برازاو هەندێ لەگەورەکانی قزلباش، زۆری کوشتن. پەریخانی خوشکی شا ئیسماعیلی دوەم کەخۆی بەهاوکاری هەندێ لەسەرانی قزلباش ئەویان کردبو بە شا، هەر خۆیان پیلانێکیان لەئیسماعیل گێڕاو کوشتیان. محەمەدی خودابەندە،

تەنیا برای زیندویان کردە شای ئێران شا محمد کابرایەکی بودەڵەی کوێرەموشە بور خۆی نەیئەتوانی بەکاروباری دەوڵەت رابگا هاوسەرەکەی کەژنێکی هەڵکەوتوی لێوەشاوە بو دەستی بەسەر کاروباری دەرباری ئێران‌و هەمو کاروبارەکانی تری دەوڵەتی ئێراندا گرت بو. لاوازی پشێوی‌و بێ سەروبەری ئێرانی داگرت بو. بابیعالی پشێوی ناوخۆی ئێرانی بەهەل زانی کەوتە پەلاماردانی سنورەکانی. لەپێشەوە کوردەکان کە لەعەجەم داخ لەدڵ بون ئەوان هێرشیان هێنایە سەر هەندێ لەناوچە کوردنشینەکانی ئازەربایجان، خوی‌و سەلماس‌و ورمێ‌و شنۆیان گرت[31].کوردەکانی ناو سنوری دەوڵەتی عوسمانی زۆر بەچالاکی لەهەمو لەشکرکێشییەکانی تری عوسمانیدا بۆ سەر ئازەربایجان‌و گورجستان‌و ئەرمەنستان لەدژی هێزەکانی ئێران، بەشدار بون.

د. نوائی لەیەکێ لەلێکۆڵینەوەکانیدا نوسیویەتی:

((رێککەوتنێکی کە لەنێوان شا تهماسب‌و سوڵتان سلێمان قانونیدا کرا بو، سوڵتانی عوسمانی بەخەتی خۆی نوسی بوی‌و پشتیوانی لێ کرد بو، ئارامییەکی تەواوی بەسنورەکانی رۆژئاوای ئێران بەخشی، بەلام دوای ئەوەی شا محمد هاتە سەرکار، کوردەکانی دانیشتوی ناوچەکانی نێوان وان‌و ئازەربایجان دەستی فەسادیان کردەوە، خەسرەو پاشای حاکمی وانیان هان دا بۆ پەلاماردانی سنورەکانی ئێران. پاشای گۆرین لەخۆیەوە- یا بەئاگاداری دەرباری عوسمانی- لەشکری نارده سەر خوی‌و سەلماس، قزلباشەکان کەپشت ئەستور بە رێککەوتنی ئاشتی بێ ئاگا پاڵیان لێ دابوەوە، تێ شکان، کوردەکانی ورمێ(رەزائیەی ئەمرۆ)یان داگیر کرد، هەرچەند ئەمیرخانی تورکمانی بەگلەربەگی ئازەربایجان توانی جارێك کوردەکان بشکێنی، بەلام لەبەرئەوەی نەیتوانی دەسەلاتی دەوڵەت‌و ئاسایش لەناوچەکەدا بچەسپێنێ جارێکی تر کوردەکان ئەو شوێنانەیان گرتەوە، خەڵکی ئەو شوێنانەش بەناچاری یا ولاتی خۆیان بەجێ هێشت‌و رۆیشتن یا چونە ژێر ئالای دوژمنەوە))[32].

هەمو شاهەکانی عەجەم، بەگوێرەی توانای خۆیان، درێژەیان بەهەمان سیاسەتی شا ئیسماعیلی یەکەم ئەدا بەرامبەر بەکورد، ئەم سیاسەتە لەسەردەمی شا عەباسی یەکەمدا(٩٩٦-١٠٣٨)چوە قۆناغێکی نوێی جێبەجێ کردنەوە کە لەسەر ٣ پایەی سەرەکی دامەزرا بو:

١-گۆڕینی بنەڕەتیی هەلومەرجی دیمۆگرافی سەروی رۆژهەلاتی کوردستان‌و، راگوێزانی ئێلە گەورەکانی کورد بۆ ناوچە دورەکانی سەروی رۆژهەلاتی ئێران بەتایبەتی بۆ خۆراسان‌و، هێنان‌و جێگیرکردنی ئێلە ئازەرییەکان بۆ کوردستان"

٢-هەوڵدانی گۆڕینی زۆرەملێی مەزەبی خەڵکی کوردستان لەسوننیەوە بۆ شیعە"
٣-سەرکوتکردنی بێ بەزەیی و توندوتیژی هەمو سەرکێشییەکی کورد.
شا عەباس، کەمێژونوسانی ئێران بە((کبیر))ناوی ئەبەن، لەسەرەتای سەدەی ١١هەمی کۆچییەوە کەوتە دانانی ڕێوشوێنی گۆڕینی هەلومەجی دیمۆگرافی کوردستان بەتایبەتی ئەو ناوچانەی کەوت بونە نێوان روباری ئاراس و دەریاچەی ورمێ، کەهەمیشە یەکێ لەشارێکانی هێرشی رۆم بو بۆ سەر ئێران، بەتایبەتی بۆ سەر ئازەربایجان و پایتەختەکەی، تەوریز، کەئەوسا یەکێ لەگەورەترین شارەکانی بو. ئێرانییەکان لەترسی هێرشی یەك لەسەر یەکی رۆم، پایتەختەکەی خۆیان لەتەوریزەوە گویزابوەوە بۆ قەزوین، دوایی تریش بۆ مەڵبەندێکی دورتر لەمەترسی رۆم لەناوجەرگەی ئێراندا، واتە بۆ ئەسفەهان.
لێکۆڵەرەوەی ئێرانی، نصراللە فلسفی، دەربارەی سیاسەتی خێڵەکیی شا عەباس، نوسیوێتی:
((شاە عەباش هەر وەکو لەماوەیەکی کورتدا سەرانی خودسەر و خاوەن نفوزی قزلباشی بە هێزی تەگبیر یا بەشمشێر لەناوا نەهێشت ئاوەهاش سەرانسەری ئێرانی هێنایە ژێر باری فەرمانی حکومەتی مەرکەزیی، واتە ئیرادەی شەخسی خۆیەوە، کەوتە ململانێ لەگەڵ سەرانی ئەو ئێل و هۆزانەدا کەئەیانویست لەقەڵەمڕەوی ئێل و عەشیرەتەکانی خۆیاندا سەربەخۆو فەرمانڕەوا بن، هەر کەسێکیان کەسەرپێچی لەفەرمانەکانی کرد بێ سڵ کردنەوە بەزوریی سەرکوتی کردن، بەتایبەتی لەگەڵ ئەو ئێلە کوردانەی، کە لەسنورەکانی رۆژئاوای ئازربایجان و کوردستان بونو، لەجەنگەکانی ئێران و عوسمانیدا لەسەردەمی شاهێتی باوکیدا سوڵتان محمد خودابەندە، بەهۆی هاومەزەبییەوە رویان لەئێران وەرگێڕابوو داوبویانە پاڵ سوڵتانی عوسمانی، بەوپەڕی دڵڕەقییەوە بێ بەزەییانە رەفتاری لەگەڵ کردن.
((دوای ئەوەی شا ئێلە یاخییەکەی ئەهێنایەوە ژێربار، بۆ ئەوەی توانا و دەسەڵاتی ئەو ئێلە لەقەڵەمڕەوی دێرینەی خۆیدا کەم بکاتەوە زۆرجار چەندین بنەماڵەی ئەو ئێلەی ئەنارده ولایەتێکی دورەدەست و، جێگەکەی ئەوانی ئەدا بەدەستەیەك لەخەڵکی ولایەتەکانی تر. لەهەمان کاتدا کەسانی ئێلەکەی بەتاوانی یاخی بون جەریمە ئەکردو، پارەیەکی زۆری لێ ئەسەندن))[٣٣].
شا عەباس لەدوای ساڵی ١٠١١ەوە ٥٠ هەزار خێزانی لەئێلی گەورەی چەمشگەزەك و هەندێ لەئێلە کوردەکانی تری کوردستانی بۆ دەشتەکانی خواروی

تاران راگوێزاو، لەوێشەوە بەخۆیانو ماڵو رانو رەوەوە بۆ خوراسانی ناردنو، پارێزگاری سنوری سەروی رۆژهەلاتی قەڵەمڕەوی عەجەمی لەبەرامبەر هەرەشەی ئۆزبەکدا پێ سپاردن[٣٤]. بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەش رێوشوێنی هێنانو جێگیر کردنی هەندێ لەئێلە گەورە شەڕکەرەکانی قزلباشی بۆ کوردستان دانا.

ئەمیر خانی برادۆست، کەبە((ئەمیرخانی یەکدەست))و((خانی لەپزێڕین))ناو ئەبرێ، خۆی بە کردەوە گەورەترین دەسەلاتداری ناوچەکانی خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ بو، لەلایەن شا عەباسەوە بەحاکمی ورمێ دانرابو. مەزنایەتی ئێلە کوردەکانی تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ، سۆما، برادۆست، موکریانی ئەکرد، قەلای دمدمی لەنزیك ورمێ ئاوەدان کردەوەو، تا ئەهات قەلاکەی خۆی قایم ئەکردو، هێزەکانی خۆی زۆرترو زیاتر پڕچەك ئەکرد. شا عەباس لەئەمیر خان کەوتە گومانەوە، کە لەو خۆسازدانە ئامانجی سەربەخۆیی بێ، لەبەرئەوە کەوتە بەهانە پێ گرتنی. هێزێکی گەورەی ناردەسەری، پاش شەڕێکی سەختو ئابلۆقەدانێکی درێژ قەلاکەی گرتو هەزاران کەسی لێ کوشتن (١٠١٨ك)[٣٥]. بەیتبێژەکانی کورد ئەم رواوەیان کردۆتە داستانێکی قارەمانانەی تێکۆشەرانی موسڵمانی کورد لەبەرامبەر هێرشی کافرانی داگیرکەری عەجەمدا[٣٦]. شا عەباس لەدوای داگیر کردنی دمدمو نەهێشتنی دەسەلاتی ئەمیرەکانی کورد لەورمێو سپاردنی دەسەلات لەناوچەکەدا بەکاربەدەستانی عەجەم، راستەوخۆ هێرشێکی گەورەی کردە سەر موکریانو، لەوێش کوشتارێکی زۆری لەکوردەکانی ئەوێ کردو، ژنو منداڵی بەدیل بردن(١٠١٩ك)[٣٧].

نوسەرێکی تر دەربارەی قەتڵوعامی ئێلی موکری نوسیویەتی، شا عەباس فەرمانیدا بەسوپاییەکانی خۆی، کە٦٠ هەزار سوار بون، بکەونە کوشتنی ئێلی موکری کە لەناوچەیەکدا ئەژیان دوانزە فرسەنگ بو. ئەم هێزە ٤ شەو ٤ رۆژ خەریکی قەتڵوعام بون[٣٨].

شا عەباس لەکورد داخ لەدڵ بو، هەم داخی ئەوەی لەدڵ دابو، لەشەڕەکانی عوسمانی- ئێراندا هاوکارییان لەگەڵ عوسمانی کرد بوو دژی قزلباش، هەم خۆی لەکاتی شەڕەکانی ١٠١٤دا لەلایەن کوردێکی موکری دیلەوە، خەریك بو بەخەنجەر بکوژرێ[٣٩].

شێخ حەیدەری موکری لەکاتی پەلاماردانی قەلای ئەریواندا(١٠١٢)لەریزی سوپای قزلباش دا کوژرا. قوبادی کوڕی لەجێگەی شێخ حەیدەر لەلایەن شا عەباسەوە کرابوە مەزنی ئێلی موکریو فەرمانڕەوای مەراغە. بەلام شا قینی

کۆنی لەباوك‌و باپیری قوباد خان بو، لەو سەفەرەدا کە بۆ موکریانی کرد، داخی دڵی خۆی پێ رشتن‌و تۆڵەی رابردوشی لێ کردنەوە.

شا عەباس خوشکەکەی قوباد خانی، کە بەقسەی مەلا جەلال لەناو کوردا بەقەشەنگی بەناوبانگ بو، زەوت کرد. کەچی دوای ئەوە بە٤ رۆژ قوباد خان‌و هاورێکانی کوشت‌و فەرمانی کوشتنی بەکۆمەڵی ئێلی موکری دەرکرد، مەلا جەلالی منجم نوسەری هاوزەمان‌و هاودەمی شا عەباس، کوشتاری بەکۆمەڵی موکری بەجۆرە ئەگێڕێتەوە.

((... بەپێی الامور مرهونە باوقاتها سزای کردەوەکانی ئەو کوردانە لەپەردەی شاردنەوەدا مابوەوە، بەڵام لەرۆژی ١٨ی ربیع الثانیدا کاتێ کە هەتاو بە١٤ درجە لەسەرەتان دا بو قوباد خانی لەگەڵ ٩٤ کەس لەگەورەکانی کورد لەکۆڕی بەهەشتئاییندا کوشت‌و هەر ئەو کاتەش حوکمی قەتلوعامی جەماعەتی موکری عیززی صدور کرد، غازییان وەکو ئەو مەلەی کەدان لەزەوی دابچنێتەوە، کوردەکانیان لەکێوو دەشتەکانی ئەو مەڵبەندەدا چنییەوەو کوشت. نوابی سەگی بەردەرگای عەلی(ئەمە ناوی شا عەباس بوە-و)خۆی چو بۆ سەر قەڵای عەلی کەندی لەناوچەی گاودولی مەراغەو، بە ئوردوەکەیەوە لەو مەنزلە دابەزی. عەلی خانی شاملۆی بەخۆی و لەشکرەکەیەوە نارده سەر قەڵاکەی حسین سوڵتانی برای قوباد خان لەناوچەی لەیلانی مەراغە. لەبەرئەوەی ئەو قەڵایە زۆر قایم بوو، کەسانێکی سوپایی کارزان پارێزگارییان ئەکرد، شەڕی بەچاك نەزانی. بۆیە کەوتە بەکارهێنانی لطائف الحیل، دوکەس لەخەڵکی ئەو قەڵایە لەوێ بون کەوت بونە دەس غازییانی شێرگر، بەدەستی بەستراوەوە هێنایاننە بەردەمی خانی ناوبراو، خان فەرمانی بەردانی هەردوکیانی فەرمو، وتی: ((بڕۆن‌و بەئەهلی قەڵاکە بڵێن لەبەرئەوەی خیانەتێك لەقوباد خان روی دابو، ئەوی لەگەڵ تاقمی خائین کوشت. ئێمەشی بۆ ئێرە ناردوە، بەو مەرجەی هەر کەس شاهیسون بێ‌و بەشەرەفی سوجدەی ئەشرەف موشەرەف بێ، ماڵ‌و ئەسباب‌و ژن‌و زارۆکی ئازاد ئەبێ، هەر کەسێکیش نەیەت ئەوا لەسەرکوتکردن‌و کوشتن‌و تاڵانکردن پارێزراو نابێ.

((هەر کەئەم دو کەسە گەیشتنەوە ناو قەڵا، ریش سپییەکیان بەناوی سلێمانەوە لەقەڵا هاتەدەرێ، چوە لای خان، بەدڵنەوایی کراوی گەڕایەوە. پاش ماوەیەك کوردێکی زۆر لەقەڵاکە هاتنە دەرێ، لەبەرئەوەی خەریك بو ئەبو بەشەو پێی گوتن: ((قەڵا هی شایە. ئوسوڵ وایە کە٣٠کەس لەئێمە لەگەڵ خۆتان ببەنە ناو قەڵاوە، چەند کەسێکیان لەبورج‌و بارو چەند کەسێکیشیان لەسەر

دەرگاکە دابنێن‌و، خۆتان روبکەنە خزمەتی ئەشرەف. ئەو هەرچی فەرمانێکی‌دا بەجێی بهێنن.

((دانیشتوانی قەڵاکە لەکەمیی هاتوەکان‌و زۆریی خۆیان بایی بون. ئەوانەیان بردە ناو قەڵاکەوە و، یەك یەك‌و دو دو زیادیان کردو بەو جۆرە پتر لە ١٠٠ کەس چونە ناو قەڵاوە. ئەو تاقمە کوردەیش ئەو شەوە لەدەرەوەی قەڵاکە مانەوە، بۆ نوستن هەر دوان‌و سیانیان ناردە خێوەتی یەکێ لەقزلباش. بۆ بەیانی تاقمێکی تریشیان لەقەڵاوە هاتن. فەرمان درا ئەو تاقمەی شەو لەوێ مابونەوە بێن. کەهاتن نەزرێیان پۆشی بو، نەچەکیان هەڵگرت بو. حەزرەتی خان بۆ ئەوەی دڵنیایان بکا زرێ‌و چەکی ئەو تاقمەی ئامادە کردو پێی لەبەر کردن. ئەوەش بو بەهۆی دڵنیا بونیان. پاش ماوەیەك پێیان وتن: ئەبێ بچن بۆ خزمەتی ئەشرەف ئەو هەرچی فەرمانێکی پێ‌دان جێبەجێی بکەن، بەڵام لەبەرئەوەی رێگاتان نادەن بەچەکەوە بچنە خزمەت شا، چەکەکانتان لەماڵەکانی خۆتاندا دابنێن‌و ئینجا بڕۆن بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی ئەو.

(سەبارەت بەو دڵنەواییە تەواوەی لەوانیان دی بو، چەك‌و ئەسبابەکانی خۆیان ناردەوە ماڵەکانی خۆیان، ١٧٢ کەسی لەگەڵ نۆکەرێکی خۆیا ناردە خزمەتی ئەشرەف. پاش ماوەیەکی تر یەکێکی ناردە ناو قەڵاکە، لەبەرئەوەی نەوەکو کەسێکیان لەوێ بەجێ مابێ‌و نەچوبێ بۆ سوجدەی شاەو، توشی ئازاردان ببێ‌و، ئێمە لەڕوی دروستییەوە بەئێوەمان وت، دوای ئەمەش ٦٤ کەسی تر هاتنە دەرێ، ئیتر هیچ کەس لەقەڵاکەدا نەمابو. دەسبەجێ فەرمانی رۆیشتنی ئەو تاقمەشیان دا. هەمویان کوشتن‌و، دەستیان گرت بەسەر ماڵ‌و ئەسباب‌و ئەسیرەکانی قەڵاکەدا. ئەو تاقمەش کەچوبونە خزمەتی ئەشەرەف، ئەوانیش هەمو کوژران، بێ ئەوەی خوێن لەلوتی یەکێ لەغازییان بێت.

((یەکێ لەغولامەکان، لەناو دیلەکاندا منداڵێکی ٨ساڵەی بۆ خۆی هەڵبژارد بو،(منداڵەکە)کابرای بەشمشێرەکەی خۆی لەچەند لاوە بریندار کردو بەزمانی کوردی وتی: ((ئەوە لەباتی خوێنی باوام))دەسبەجێ منداڵەکەیان کوشت.

((هەروەها ژنێکی ئاوس لەگەڵ کچۆڵەیەکی ٦ ساڵەدا، پیاوێ بەتوندی قسەی ناشیرینی لەگەڵ کردبو. پیاوەکە بۆ خۆشتن چوبوە حەمام، بەڵام کەهاتە دەرێ بینی" ژنەکە سەری کچۆڵەکەی خۆی بڕیوەو کێردێکی کردوە بەزگی خۆی‌داو ئەو منداڵەشی کوشت بو کەلەزگی دابو، ئەیویست خۆیشی بکوژێ،

ئەوانیش دەستیان نەگرت‌و وتی: ((دوای مێردەکەم منیش ژیانم ناوێ))، سەری خۆی بڕی.

((قرچقای بەگ تا سەرچەمی جەغەتو چو، ٣٠٠ کەسی لەجەماعەت‌و ئولوسەکانی دەوروبەری خۆی گل دایەوە. ویستیان هەڵێن. بەڵام ئەو هەمویانی گرت‌و کوشت. ژمارەیەکی زۆر دیل‌و ئەسپ‌و گاو مێگەلێکی بێ شوماری پێش خۆی‌داو هێنایەوە. دایان بەوانەی هێنابویان.

((لەشکری قورچی باشی، بەسەرکردایەتی کوڕەزاکەی لەگەڵ قورچی ١٠٠ کەللەو دیل‌و ئەسپێکی زۆرو گاو مەڕی بێ ژمارەیان هێنا.

((بەپێی حوکمی جیهانموطاع، ئەسفندیار بەگی عەرەب گوزلو چو بو گەرمەرود بەحەمییەتی مامی قوباد خان لەموکرییەکان ٢٧ سەلك‌و دیلێکی زۆری لەگەورەکانی ئەو هۆزە هێنا، لەگەڵ ماڵ‌و ئەسباب‌و گاو مێگەلێکی زۆر، هەموی درایەوە خۆی‌و تابینەکانی..

((خەڵکی شاری مەراغەش دەستیان گەیشتەی ئەوانەی رقیان لێیان بو، نزیکەی ٣٠٠ کەللەیان لێ هێنان.

((بەگشتی زیاتر لەدوو هەزار سەری بڕاویان هێنا.

((هەروەها فەرمان درا بەو ئەمیرو لەشکرەی لەدەوری قەڵای دمدم بون، موکرییەکانی ورمێ بکوژن. ئەوانیش بەگوێرەی حوکمی ئەشرەف لەرۆژی دوشەممە ٢٧ی ربیع الثانی‌دا دەستیان کرد بەکوشتنیان ١٠٧ کەللەیان لەگەڵ دیلێکی زۆرو ئەسپ گاراں‌و مێگەل‌دا لەدارایی ئەو جەماعەتە لەکەناری سیاه رودەوە هاورد، مەولانا خصالی مێژوی ئەو روداوەی بەشیعر هۆنیوەتەوە، ئەڵێ:

((کاتێ قزلباش قەڵای کوردەکانیان فەتح کرد، خوێنیان لەبادە جیا نە ئەکردەوە،

((هەواڵ هات: رۆمی هاتون، وەکو دەستارِ بەدەوری خۆیاندا ئەخولێنەوە،

((بۆ دوعای شاهی عالەم لەدڵ بانگی: قوموا ایها الناس بەرزبوەوە

((بۆ ئەوەی گومان‌و دودڵی لەبیرمدا نەمێنێ، بۆ فال بەدوی دو تاریخدا ئەگەڕام.

((نوسرا: ماتەمی کوردان لەڕۆمی‌و

((نوسیم: جەژنی فەتح لە شا عەباس))

((هەروەها بە پەخشانیش وتویانە: ((قەتلوعامی موکری هەقە))

هەر ٣ رستەی ((ماتم کردان ز رومی))و ((عید فتح از شاه عەباس))و((قتل و عام مکری حق)) بەژمارەی ئەبجەد ئەکاتە ١٠١٩ی کۆچی کەساڵی کوشتنی بەکۆمەڵی ئێلی موکرییە))[٤٠].

زەبروزەنگی خوێناوی شا عەباس ئەگەرچی زەرەری گیانیوماڵی زۆری لەئێلەکانی موکریانو برادۆست دا، بەڵام نەیتوانی گیانی بەرەنگارییان تێدا بکوژێ. پاش ٦ ساڵ لەداگیرکردنی قەڵای دمدم، کوردەکانی برادۆست سەرلەنوێ قەڵاکەیان ئازاد کردو ناوچەکەیان گرتەوە دەست، بەڵام هێزی قزلباش چوە سەریانو بۆ جاری دوەم قەڵای دمدمیان لەدەست کورد دەرهێنا[٤١].

## ١/٢ هێنانی ئێلی ئەفشار بۆ ورمێ

راگوێزانی بەکۆمەڵی دەیان هەزار خێزانی ئێلە کوردەکانی دەوری ورمێ بۆ خۆراسانو، دوایی‌تر تێشکانی تراجیدی ئێلی برادۆستو موکریو، گیانی قەڵای دمدمو، کوشتنی مەزنەکانی کوردو، کوشتنی زۆرایەتی لایەنگرەکانی ئەمیرخانو، کوشتاری بەکۆمەڵی خەڵکی موکریان" بون بەسەرەتای گۆڕانێکی بنەڕەتی لەپێکهاتنی دیمۆگرافی دانیشتوانی ناوچەکەدا. لەئەنجامی ئەوەش دا گۆڕانی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، جەنگی. کورد سەرەڕای ئەوەی بەشێکی گرنگی هێزی مرۆییو مادی خۆی لەدەس داو، لەتەرازوی هێزەکانی ئەم ناوچەیەدا سەنگی قورسی جارانی نەما، دەسەڵاتی حوکمڕانیشی لەدەس دەرچو، کەجاران بەدەس گەورە خۆجێییەکانی کوردەوە بو.

ئێلی ئەفشار یەکێ بو لەو ٧ ئێلە قزلباشە، کەبەشداری سەرەکی لەشەڕەکانی شا ئیسماعیلو دامەزراندنی دەوڵەتی سەفەوی شیعەدا کرد بو[٤٢]. ژمارەیەکی زۆر لەکاربەدەستانی دەوڵەت لەسەرانسەری قەڵەمڕەوی صەفەویدا لەناو ئەوان دا هەڵ ئەبژێردرانو، دەسەڵاتێکی زۆریان لەدەرباری شاهەکانی عەجەم دا هەبو. بەڵام هەندێ لەسەرانی ئەم ئێلە تاوانبار کرا بون بە هاوبەشی لەکوشتنی مهد علیای هاوسەری شاه محمد خودابەندە، کەبە بەرچاوی شاوە لە سەردەس تێکەڵاو کردنی لەگەڵ ئەمیرێکی تاتاری دیلکراودا کوشت بویان(٩٨٧ك). هەروەها تاوانبار کرابون بەکوشتنی حەمزە میرزای کوڕی شاه محەمەد(٩٩٤)[٤٣].

کە شا عەباس هاتە سەر تەخت، سەرانی ئەفشار ئەترسان لەوەی شا تۆڵەی کوشتنی دایکیو براکەیان لێ بکاتەوە. لەبەرئەوە لەگۆشەو کەناری ئێراندا پەرەوازە بو بون، نەیان ئەوێرا وەکو جاران خۆیان لەدەربار نزیك بخەنەوە.

لەسۆنگەی ئەوەی هەندێ لەسەرانی ئەم ئێلە لەشەڕەکانی بەغدادا(١٠٣٥ك: ١٦٢٥ز) ئازایەتییان نواند، شا عەباس یەکێك لەگەورەکانی ئەفشاری بەناوی ((کلب علیە))ەوە بانگ کرد. پایەی ((خان))ی پێ بەخشیو رای سپارد کەئێلی پەرەوازەی ئەفشار کۆ بکاتەوەو لەورمێ[44]لە شوێنی ئێلە کوردەکان جێگیریان بکا(١٠٣٥ك)شا عەباس لەمەش دو مەبەستی هەبو:

یەکێکیان- سپاردنی پارێزگاری ناوچە سنورییەکانی ئەوێ بەیەکێك لەئێلە دڵسۆزەکانی دەرباری عەجەم، لەجێگەی ئێلە کوردەکان کە بەگوێرەی گۆڕانی تەرازوی هێزەکانی رۆژو عەجەم ئەم لاو ئەولایان ئەکرد"

ئەوی تریان-سپاردنی سەرکوتکردنو تەمێکردنی ئێلە یاخییەکانی کورد، کەچەندین ساڵ بو لەشۆڕشو هەڵگەڕانەوەدا بون دژی دەسەڵاتی عەجەم، بەیەکێ لەئێلە شەرکەرە دڕەکانی قزلباش.

کلب علی خان لەماوەیەکی کورتدا ٨ هەزار خێزانی ئەفشاری پەرەوازەی عیراقی عەجەمو، فارسو، کرمانو، خۆراسان.ی لەسەلماس کۆکردەوە[45]. بەلام چونکە ناوچەی سەلماس چۆڵەوانی نەبو، ئەم تازە هاتوانە لەسەرەتاوە توشی بەرەنگاریی دانیشتوانی ناوچەکە، واتە توشی ئێلاتی کورد بون. نوسەرێکی ئەفشار خۆی ئەگێڕێتەوە ئەڵێ:

((کاتێك کلب علی خانو کۆکراوەکانی کۆچ لەدوای کۆچ گەیشتنە دەوری سەلماس، هەندێ لەئێلاتی ئێرانیو عوسمانی دانیشتوی سەر سنورەکان کەئەو هەواڵەیان بیست، لەسەر داوای تەمرخانی کوڕی ئەمیرخانی خاوەنی دمدم بەژمارەیەکی زۆر کۆبونەوە، بۆ بەرهەڵستیو رێ پێ نەدانی ئێلی ئەفشار هاتنە پێشەوە، لەکەناری چەمی قەرەسوی سەلماس دا تێکهەڵچون. شەڕێکی قورس قەوما. دلێرانی ئەفشار، شێرانی بێشەی شەڕو هەرا، دەستیان لێ دانە کەرەستەی جەنگو لێدان، ئازایەتیو مەردایەتی یان نواند. لەئەنجامدا، پەلامارەدەرەکان(مەبەستی کوردەکانە-و)لەژێر زەبری هێرشی غازییانی ئەفشاردا پێی راوەستانو خۆڕاگرتنیان تێدا نەما. زۆریان کوژرانو، ئەوانەی لەشمشێریش رزگاریان بو هەڵاتن بۆ کێوە سەختە هەڵەمودەکان خۆیان شاردەوە. دوای ئەوە، کلب علی خان لەگەڵ ئێلی ئەفشار بەسەرکەوتویی چوە ناو شاری ورمێ. بۆ شوێنی دانیشتنی خۆی توپراق قلعەی هەڵبژارد، بۆ هەر یەکێ لەهۆزەکانی ئێلی ئەفشار بلوك یا ناحیەیەکی دیاری کرد تیا جێگیر بن))[46].

کلب علی هاتوەکانی بەم جۆرە دامەزران:

ئێلی کوندوزلو لەمەڵبەندی دول"

ئێلی قرقلو لەمەڵبەندی رەوزە"
ئێلی کوهکلویە لەمەڵبەندی نازلو"
تیرەی ایمانلو لەگەڵ بەشێکی ئێلی ارشلو لەدەوری شاری ورمێ"
ئێلی ارشلو لەشنۆ وسلدوز"
تیرەی قاسملو لەساین قەلا[47]

ئێلی ئەفشار لەدامەزرێنەرانی دەوڵەتی شیعەی صەفەوی بو، تەجروبەیەکی زۆری شەڕوشۆڕی هەبو لەناوچە جیاوازەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست داو، لەنزیکەوە هەمو نەتەوەکانی فارس، کورد، تورك، عەرەب، ئۆزبەك، گورجی، ئەرمەنی... یان ئەناسیو، لەگەڵ هەمویان تەجروبەی شەڕو ئاشتی یان هەبو، هەروەها تەجروبەی بەڕێوەبردنی وڵاتو شارو گوندو ئێلو هۆزی جیاجیایان هەبو. ئاخوندەکانی شیعە لەرێوشوێنەکانی ئاینی شەڕ: غەزا، جیهاد، فەتح..و جۆری بەڕێوەبەرایەتی خەڵك بەگوێرەی جیهانبینینی تایبەتی خۆیان دەرسی زۆریان دادابون. ئەوان خۆیان بەموسڵمانو زیندوکەرەوەی نەریتەکانی محەمەدو عەلی وحەسەنو حسێنو ئیمامەکانی تر دائەنا. مەزهەبەکانی تری ئیسلام لەوانە سونییان بەگومڕاو(تائفەی ضالە)) ئەزانێ، لەشەڕدا داراییو سەرو ناموسیان بۆ خۆیان بەحەڵاڵ ئەژمارد. لەبەرئەوە ئەمانە، بۆبردنەوەی جەنگو بەدەستهێنانی سەرکەوتنو جێگیر کردنی دەسەڵاتی خۆیان، کە گوایە دەسەڵاتی ئیسلامە، سڵیان لەهیچ نەئەکردەوە، گوێیان نەئەدایە ترسی دینیو دنیایی، هەم فرتوفێڵیان لەدوژمن بەحەڵاڵ ئەزانیو، هەم بەکارهێنانی زەبروزەنگ.

تیرەکانی ئێلی ئەفشار، کەیەکێ لەئێلە سەرەکییەکانی قزلباش بو، چەند پشت بو وا پەروەردە کرا بون کەپابەندی هیچ جۆرە ئیعتیبارێکی بنەماڵەیی، عەشیرەتی، دینی، نەتەوەیی، زمانو شوێن نەبن، لەناو خۆیاندا پیلانیان لەیەك ئەگێڕاو، لەبەرامبەر دوژمنانی دەرەوەدا یەکیان ئەگرت. بەفەرمانی((مرشدی کامل))باوك کوڕی خۆی سەرئەبڕیو، گۆشتی لەشی دوژمنی خۆی بەزیندویەتی ئەخوارد.

شا عەباس ئەیویست نفوزو دەسەڵاتی ئێلەکانی قزلباش کەم بکاتەوە، بەتایبەتی دەسەڵاتی جەنگییان. بۆ ئەو مەبەستە لەلایەکەوە هەوڵیدا لەشکرێکی نوێی رێکوپێك دابمەزرێنێو چەکدار بکا، لەلایەکی تریشەوە هەوڵیدا ئێلەکانی قزلباش کەهێشتا لەهیچ کوێیەك بەتەواوی جێگیر نەبو بون، نیشتەجێ بکا[48].

سەرنجدانێ لەسنوری ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەری ئەخا کەبەدرێژایی ئەو سنورە عەجەم بەجۆری نیشتەجێ کراون، لەمپەرێکی باریکی نەتەوەیی-ئازەریی ئەوتۆیان لەنێوان کوردو فارس‌دا دروست کردوە، لەهیچ ناوچەیەکدا سنوری هاوبەشیان لەنێوان ئەم دو نەتەوەیەدا نەهێشتوە. بەڵکو لەهەمویدا عەجەمی لێ جێگیر کراوە. ئەو دو نەتەوە ئێرانییە: کوردو فارس کەچەند هەزار ساڵ بو هاوسنور بونو پێکەوەو بەتەنیشت یەکەوە ئەژیانو مێژویان تێکەڵاوی یەکتری بو، تا هەتایە لەیەکتری دابڕانو نەتەوەیەکی تریان کەوتە بەینەوە. جێگیر کردنی ئێلی ئەفشاریش ئەکرێ هەر لەچوارچێوەی ئەو ستراتیجە گشتییەدا سەیری بکرێ.

ئێلە ئازەرییەکانی قزلباش، لەوانە ئێلی ئەفشار، کەبەدرێژایی سنوری خۆرهەڵاتی کوردستان نیشتەجێ کرابونو، ئەرکی سەرکوتو دەستەمۆکردنو سەرپێ دانەواندنی گەلێکیان پێ سپێردرا بو، کەنەریتی ژیانو جۆری جیهانبینیو خووڕەوشتی کۆمەڵایەتیو پەروەردەی دینییان بەتەواوی لەگەڵ ئەوان جیاواز بو، ئەمەش بو بەیەکەمین هۆی دروست کردنی ناکۆکییەکی قوڵی گشت لایەنە لەنێوان دو میللەت‌دا کەڕوداوەکانی ناوچەکە بەزۆر کردبونی بەدراوسێی یەکتری.

## ٢/٢ بەرهەڵستی ئێلاتی کورد

ئێلی ئەفشار هێشتا بەتەواوی لەورمێ جێگیر نەبو بو جارێکی تریش کوردەکان هەڵیان کوتایەوە، سەریان لێرەش‌دا نوسەرێکی ئەفشار خۆی روداوەکە ئەگێڕێتەوە:

((لەسەرەتای حوکمڕانی کلب عەلی خان‌دا لەورمێ، دەماودەم هەواڵ هاتو دوایی بو بەڕاست کەوا ئەشرار(مەبەستی لەو کوردانەیە کەئەمان ئەرزەکەیان داگیرکرد بون-و)بەژمارەیەکی زۆر لەمەڵبەندی دەشتو تەرگەوەڕەوە، بۆ تێهێنانەوەی تێکشکانەکەی شەڕی قەرەسو، وە تۆڵەسەندنەوە لەکلب عەلی خان، وەکو لافاو رویان کردۆتە شاری ورمێو گەیشتونەتە نزیك گوندی ئەنهر لەمەڵبەندی بنابی روضە.. کلب علی خان بەو دەستوپێوەندانەی لەلای بون روی هیمەتی کردە بەرهەڵستی هێرشهێنەکان. لەدەوری قەرەحەسەنلو گەیشتنە یەك، هەردولا تاویان دایە چەكو بەگژیەکا چون، شەڕ دەستی پێ کرد. خانی حوکمڕان لەکاتی شەڕەکەدا بینی کەئەشراری شەقاوەت نیهاد بەشەڕو هەڵاتن وەکو منالانی ناو جۆلانە بۆ دواوە ئەچن، لەوە سەری سوڕما. وای زانی کەئەو رێوی خووانە لەڕوی غەدرو حیلەوە بۆ هەستاندنی رقو وروژاندنی ئێلی ئەفشار وا

ئەکەن، بەڵام کەبەلای ورمێدا روانی، بینی ۳۰۰ تا ٤۰۰ سواری نیزەدار لەدواوە دیارن بەخێرایی روەو ئەوان دێن، ئەشرار لەبینینی ئەمەو گەیشتنی یارمەتی بەئەفشار کەوت بونە سەر خەیاڵی هەڵاتن..))[49].

تێکهەڵچونی ئەم جارەش بەقازانجی عەجەم بەلادا کەوتو ئێلەکانی کورد تێ شکان. دیارە دوای ئەو زنجیرە شەڕانەی لەنێوان لەشکری سەفەوی‌و کوردا رویدا بوو، هێزی کورد ئەوەندە لاواز بو بو، چاری ئێلیکی واپچوکی پێ نەئەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هیوایان نەبڕی بو، تەمر خانی برادۆست سەر لەنوێ هێزەکانی خۆی سازداو، بۆ ئازاد کردنی ناوچەکە قەڵای دمدمی کردەوە بنکەی پەلاماردانی عەجەم. بۆ جاری سێیەم شەڕێکی قورس لەدەوری ئەم قەڵایەدا روی دا، بەلام کورد ئیتر بەیەکجاری ئەم قەڵایەی لەدەسدا، بەلەدەسدانی قەڵاکەش عەجەم ئیتر بۆ هەمیشە لەناوچەکەدا جێگیر بون‌و، دەسەڵات لەناوچەکەشدا کەوتە دەس ئەوان. هەمان نوسەری پێشو، ئەم شەڕە بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:

((ماوەی ساڵێك بەسەر حوکمڕانی کلب علی خاندا رابوردبو، لەم ماوەیەدا دیسانەوە تەمر خان هەندێ لەنارازییان‌و ئەشراری لەخۆی کۆکردەوە. دەستی کردەوە بەهێرش‌و دەسدرێژی بۆ سەر ورمێ. کلب عەلی خان بۆ ئەوەی بەهانەی ببڕێ لەپێشەوە کەوتە نوسینی نامەی ئامۆژگاری‌و-دادانی پەند. بەلام کەڵکی نەبو، ئینجا گەنج عەلی خانی برای، قەڵاکەی گەمارۆ دان، هەمو رۆژ تەقەیان لەیەکتری ئەکرد. لەبەرئەوەی قەڵای ناوبراو بەسترا بو بەناوچە عەشیرەت نشینەکانەوە، ئەشراری سەرسنور لەڕوی تعصب‌و لاسارییەوە بۆ فریاکەوتنی تەمر خان کەوت بونە جموجۆڵ. شۆڕشێکی گەورەیان هەڵگیرسان. گەنج عەلی خان لەگرتنی قەڵاکە نائومێد بو، داوای یارمەتی لەبراکەی کرد.

((کلب عەلی خان کەڕوداوەکەی بیست هەندێکی لەلاوانی جەرارو کینەگوزاری ئەفشاری کۆکردەوە. روی کردە قەڵای دمدم. پاش نیوەڕۆی هەمان رۆژ گەیشتە داوێنی قەلا. پاش هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی کارو بەرزیی‌و قایمیی حەسارەکەی، هەوای هیمەتی بەئارەزوی گرتنی بورجەکانی ئەو قەڵا قایمە کەوتە فڕین. لەلای چەپ‌و راستەوە هێرشیان کردە سەر ئەو دو بورجە ناودارەی بەسولق‌و بوزلق ناسرا بون، هەردولای رۆژهەڵات‌و رۆژئاوایان لەخوارەوە گرت. تفەنگچییەکانی ئەشرار هەرکە ئەوەیان دی لەقەڵا دەرپەڕین‌و تا دەمی ئاوا بونی خۆر بەگوللەی تفەنگ هەنگامەی جەنگ گەرم بو، بەلام زۆر لەکوردەکان کەوتنە بەر تیغی بێ درێغی دلاوەرانی ئەفشار، ئەوانی تر گەڕانەوە ناو قەڵاکە. رۆژی دوایی سەرلەنوێ هێزی ئەفشار بەفەرمانی کلب عەلی خان ناودار بەریزی

رازاوەوە هێرشیان بردە سەر حەسار. بەڵام قەڵاییەکان لەترسی لێدانی دەستی بەهێزی غازییان زاتی شەڕیان نەبو. پێیان لەقەڵا نەهێنایە دەرێ. لەبورج و بارووەکانەوە کەوتنە هاوێشتنی تۆپ و تفەنگ.

((کلب عەلی خان زانی کەئیتر ئەشرار زاتی بۆ پێشەوە هاوێشتنی هەنگاویان نەماوە. شەو سەرۆکەکانی ئەفشاری کۆکردەوە. سیبەو سەنگەریان دروست کرد. ڕۆژی دوایی هەمو قشون بەکۆکردنەوەی کەرەستەی سیبەو سەنگەرەوە خەریك بون. چەند ڕۆژێکی وەها بەسەر برد. لەدوایی دا وەکو ئەڵێن" ارباب الدول ملهمون، تەگبیرێکی بەبیرا هات بو، بڕیاریدا ئیسترێك بهێنن، ۳ شەو و۳ڕۆژ بیلەوەڕێنن بێ ئەوەی ئاوی بدەن، ڕۆژی چوارەم بەری بدەن بەڵکو لەتینواندا بۆنی ئاوەڕۆی ئەو ئاوە بکا کەبۆ سولق ئەچێ و، لەدەرەوە نەبینراوو داپۆشرا بو، ئەگەر شوێنی ئاوەکەیان دۆزییەوە هەڵی بکەنن و لەباتی ئاو شەربەتی ناسازگاری مەرگ بەگەروی قەڵاییەکاندا بکەن. بەگشتی وایان کرد وەکو فەرمو بوی، پاش ۳ شەو و ۳ ڕۆژ ئەو وڵاخە بێ زمانەیان بەرەڵا کردو، بەدەوری قەڵاکەدا گێڕایان. بەقودرەتی حەزرەتی پەروەردگار کە لەگومەزی سولق نزیك بونەوە کە لەلای خوارەوە وە بە ئەرزەوە بەسترا بو، هەستی بەهاژەی ئاوی ژێر ئەرزەکە کرد. لەتاو تینویەتی کەوتە سمکوڵ. ئەوسا بەفەرمانی کلب عەلی خان کارێز کەنی شارەزایان هێنا بەقوڵنگ و مەتین ئەو شوێنەیان هەڵکەندو ئاوەڕۆکەیان دۆزییەوە. چەند خەروار نەوتیان هێناو تێیان ڕشت. ئەگەرچی ئاوی عەمارەکە پڕ بو لەنەوت. لەگەڵ ئەوەشدا گەمارۆ دراوەکان چەن ڕۆژێ نەوتاویان خواردوەو خۆیان ڕاگرت. سەرەنجام لەبەر بێ ئاوی و لەترسی گیانیان هاواریان لێ هەستاو داوای بەخشین و ئەمانیان کرد. مەشایەخی ئەشرار بەناچاری کەلامولڵاهی مەجیدیان کردە شەفیع و هاتنە لای کلب عەلی خان. خانی ناوبراو لەسەر تکای مەشایەخ لەتاوانەکانیان خۆش بو بەو مەرجەی تەمرخان و لایەنگرەکانی، تفەنگ و تۆپ و کەلوپەل و ئەموال و شتەکانی کەلەقەڵاکەدا پێیان بو، بەجێ بهێڵن و گیانی خۆیان دەرباز بکەن. بەوە ڕازی بون و کەوتنە سوپاس و ستایش.

((شەو قەرەولەکان دەوری قەڵایاندا بوو پاسەوانییان لێ ئەکرد. کەڕۆژ بوەوە دەروازەی قەڵایان کردەوە" ئەشرار نائومێدو زەرەرمەند بەدەستی بەتاڵ لەقەڵا دەرچو بون، هەر کەس بە لایەکدا پەرەوازە بو بو. شتی سەیر ئەوە بو ۸٦ کچۆڵەو تازەبوکی ئەشرار لەترسی ئەتك کردنی پەردەی ناموسی خۆیان، نەوەکو دەسدرێژییان بکرێتە سەر، شەو لەبەرزایی بورجەکان و لەسەر دیواری بڵندی قەڵاوە خۆیان هاویشت بوە ناو دۆڵێکی قوڵەوە، گیانیان سپارد بو))[٥].

### ٣/٢ قوڵبونەوەی ناکۆکی عەجەمو کورد

پەیوەندی کوردو عەجەم لەم ناوچەیەدا ئیتر هەرگیز نەچوە سەر باری ئاسایی پێکەوە ژیانی بەئاشتی، بەڵکو ڕەنگێکی دوژمنانەی بەخۆیەوە گرت.

عەجەم، لەڕوی مەزهەبەوە شیعە بون، سوننەیان بەگومڕا دائەنا.

لەڕوی زمانەوە بەتورکی ئەدوان کورد لێ یان تێ نەئەگەیشتن.

لەڕوی سیاسییەوە کاروباری حوکمڕانیو داراییو جەنگیی دەوڵەتیان لەدەسدا بو، پشت ئەستور بون بەپشتیوانی مادیو مەعنەوی دەوڵەتی مەرکەزی ئێران، وەکو ژێر دەستە ڕەفتاریان لەگەڵ کورد ئەکردو بە((ئەشرار))یان دائەنان، بۆ ئەوەی ئێلەکانی دەوروپشتیان بهێننە ژێر فەرمانی خۆیانەوە، سڵیان لەگرتنی هیچ ڕێگایەکی نارەواو لەبەکارهێنانی هیچ چەشنە توندو تیژییەك نە ئەکردەوە.

بەڵام ئێلە کوردەکان، لەڕوی مەزهەبەوە سوننە بون، شیعەیان بە ڕافضی دائەنا.

لەڕوی زمانو نەتەوەوە لەئێلی تازەهاتوی ئەفشار جیاواز بون.

لەڕوی سیاسییەوە ئەوانیان بەداگیرکەری نیشتمانەکەیان ئەزانیو، تێ ئەکۆشان بۆ هەڵکەندنو دەرکردنیان، لەبەرئەوە هێرشیان ئەبردە سەریان، لێیان ئەکوشتنو ڕێگەیان لێ ئەبڕین.

درێژەکێشانی ئەم حاڵەتە، ناکۆکی کورد- عەجەمی بردە قۆناغێکی ئاڵۆزی واوە کەڕەنگی سیاسی، نەتەوەیی، دینی بەخۆیەوە گرتو، لەپێوەندییەکانی دوا ڕۆژی هەردو گەلو، لەژیانی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگیی ناوچەکەدا تاوی دایەوە، ناکۆکییەکان بەخۆشی بەلادا نەکەوتو ئاسایش بەتەنیا بەزۆری چەك ڕائەگیرا. عەجەم هەرچەن هەلێکی بۆ هەڵ بکەوتایە ئەوپەڕی زەبروزەنگی بەکارئەهێنا بۆ سەرکوتکردنی کوردو، بەتاڵان بردنی سامانو داراییو، بەدیل گرتنی ژنو منداڵیو، لەشکرکێشی ئەکردە سەر گوندو ئاواییو هەواری ڕەوەندەکانی. توندوتیژی خوێناوییان تێکەڵاو کرد بو لەگەڵ بەکارهێنانی فروفێڵو تەفرەدان و لەخشتە بردن. ئێلەکانی کوردیش هەرچەن بەخۆیانا ڕاپەڕمونایە هەڵیان ئەکوتایە سەر عەجەم، لێیان ئەکوشتنو تاڵانیان ئەکردن، بەهەر ڕێیەکی بۆیان بگونجایە ئازاریان پێ ئەگەیاندن، تەنانەت هەندێ جار ئوردوی ڕۆمیان ئەهێنایە سەریان.

عەجەم لەدوای چەند پشتێك توانییان لەناوچەکەدا جێگیر بن. دەس بەسەر شارو قەڵاکاندا بگرنو کوردی لێ دەربکەن بۆ گوندو ناوچە شاخاوییەکان. هەندێ لەکۆنفدراسیۆنی ئێلە کوردەکانی وەکو برادۆستیان هەڵوەشاند، ئێلەکانی

حەیدەرانلو و جەلالی یان پەرەوازە کرد، ئێلەکانی شوقاقی، دونبولی، پازوکی، مافی.. یان لەڕوی زمانو مەزەبەوە بەتەواوی گۆڕی.

مەڵبەندی ورمێ ئەگەرچی بەکردەوە کەوتە دەس عەجەم بەلام ئیتر ئارامو ئاسایشی تێدا نەما، لەلایەك هێرشی یەك لەسەریەکی سوپای عەجەم بۆ تەمێ کردنو سەر پێ دانەواندنی ئێلە کوردەکانو هێنانە ژێر باری فەرمانبەری و، لەلایەکی ترەوە بەرهەڵستی توندوتیژی بەردەوامی ئێلەکانی کورد بۆ پاراستنی((کەسایەتی سەربەخۆ))ی خۆیان، سەرباری ئەمانەش ناوچەکە خۆی یەکێك بو لەشارێگەکانی لەشکرکێشیەکانی رۆمو عەجەم بۆ سەر یەکتری.

کلب عەلی خان ئەفشار، یەکەمین دەسەلاتداری عەجەم، لەورمێ کە مرد(١٠٤٣ك)ئێلە کوردە لێدراوەکان ئەمەیان بەهەل زانی، بەقسەی میرزا رشید وەکو((حشرات الارض)) هاتنە جۆشو خرۆشو((تەلاقیان بۆ یەکتری خوارد کەیەکدڵو یەك زمان بۆ لەناو بردنی ئەفشار))تێ بکۆشن. هەمو ئێلەکانی سۆما، برادۆست، دەشت، تەرگەر، مەرگەوەر، بەردەسور راپەڕینو هێرشیان بردە سەر ورمێ. شەڕێکی قورس لەوێ روی دا، ئەم جارەش وەکو جارەکانی تر((اشرار مغلوبو منکوب))تێشکانو، ئەوانەی دەرباز بون((وەکو تەپوی بەر رەشەبای توند))هەلاتن[51].

قەلای قوتوز کەیەکێ لەقەلا گرنگەکانی سەرسنوری رۆمو عەجەم بو، تا ئەو سەردەمە لەدەس ئێلی مەحمودی کوردا بو، سوپای ئێران لەو لەشکرکێشییەدا کەکردی بۆ سەر وان، بەیەکجاری لەدەس ئێلی مەحمودی دەرهێناو ئەوانی لێ دەرکرد(١٠٤٣ك)[52].

جەنگی درێژخایانی رۆمو عەجەم بەپەیماننامەی ئاشتی زەهاو(١٠٤٩) کۆتایی هات، ئەو سنورەی هەردو دەولەت لەسەری پێکهاتبون، لەئاخسقەوە لەقەفقاس بەناو مەڵبەندەکانی قارس، وان، شارەزور، بەغداد، بەسرا تا سەری ئاوی خەلیج بەناوجەرگەی کوردستاندا رائەبورد. هەر بەگوێرەی ئەم رێککەوتنە ئەبو قەلاکانی قوتور، ماکو، مەغازبرد کاول بکرێنو بەچۆلی بهێلرێنەوە[53].

ئەمە خۆی بەڵگەی ئەوەیە کەئەم مەڵبەندانە چ کارەساتێکیان بەسەر هاتوە. پێکهاتنی زەهاویش نەیتوانی ناکۆکییەکانی رۆمو عەجەم بەتەواوی چارەسەر بکا، بەڵکو دابەش کردنی نارەوای نەتەوەکانی کورد، ئەرمەنی، گورجی، عەرەبو دابەش کردنی دینو مەزەبە جیاوازکان، بگرە ئێلو هۆزەکانی ناوچە سنورییەکان، بەسەر ئەم دو دەولەتەدا، ناکۆکییەکانی ئالۆزترو ململانێکانی سەخت تر کردو، هەلکەوتی جوگرافی شوێنی ژیانی کوردیش، کە لەبەینی

هەردو دەوڵەتدا بو، کوردی خستە بەینی بەرداشی هێزەکانی رۆم‌و عەجەمەوە، ئەحمەدی خانی(١٠٦١-١١١٩ك) خۆی شایەتی روداوەکانی ئەو سەردەمەیە، لەم روەوە ئەڵێ:

((تێ بفکرە لەلای عەرەبەوە تا ئەگاتە گورجستان،

((کورد بۆتە بورج

((لەچوارلاوە بۆتە حەساری رۆم‌و عەجەم، کەچی هەردوکیان، کوردیان کردۆتە ئامانجی تیری قەزا

((گوایە ئەوانە کلیلی سەر سنورەکان‌و هەر تیرەیەکیان دیوارێکی پتەون،

((ئەم قولزومی رۆم‌و بەحری تاجیکە، کەئەکەونە جولان و لەشکرکێشی،

((کورد لەخوێنی خۆیدا ئەگەوزێ، چونکە لەبەینی ئەواندا بۆتە بەرزەخ..))[٥٤]

## ٤/٢ سەرکوتکردنی ئێلی بلباس

لەو ماوە ئارامییەدا کە بەدوی پەیماننامەی ئاشتی زەهاودا هات، عەجەم توانی شانوشکۆی ئێلی برادۆست کەهاوسنوری عوسمانی بو بشکێنێ‌و، نەهێڵێ جارێکی تر راست بێتەوەو مەترسی بۆ دروست بکەن، بەلام هاوزەمان لەگەڵ کز بونی ئێلی برادۆست، ئێلی بلباس لەلای خواروی ناوچە عەجەم نشینەکانی مەڵبەندی ورمێ گەشەی کردو بەهێز بو.

ئێلی بلباس لەو سەردەمەدا پێك هات بو لەیەکگرتنی ٤ هۆزی سەرەکی: مەنگور، مامەش، پیران، باڵەك، هۆزەکانی ئەم ئێلە رەوەندی تەواو نەبون، ئەگەرچی هاوینان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ ئەچونە چیای قەندیل، بەلام بنەیان لەبناری قەندیل‌و دەشتی لاجان‌و موکریان‌و سلدوز بو، کشتوکاڵیان تێدا ئەکرد. مەزنایەتی ئێلی بلباس لەدەس ئاغاکانی مەنگوڕدا بو، تا باپیر ئاغاو هەزار کەس لەپیاوە هەڵبژاردەکانی ئێلەکەی لەمیوانداریيەکدا لەمەراغا لەخەودا کوژران (١١٩٨ك)[٥٥].

خداد بەگی ئەفشار لەپاداشتی ئەوەی لەتەنگی ئاب گەرمدا شۆڕشگێڕانی کوردی شکاندبو (١١٠٥ك)دەرباری ئێرانی نازناوی((خان))ی پێ بەخشی بو، کردبویە بیگلەربیك(بەگی بەگەکان))ی ئەفشار لە١١٣٤دا جارێکی تر بەلەشکری عەجەمەوە هێرشی کردە سەر لاجان لەبناری قەندیل، کەمەڵبەندی ئێلی بلباس بو، لەگەڕانەوەیدا بەدیل‌و تالانییەوە، شەڕکەرەکانی بلباس لەناکاو هەڵیان کوتایە سەری، پاسەوانەکانیان کوشت‌و دیلەکانیان لێ سەندنەوەو تالانەکەیان پێ بەجێ هێشتن، لەسەر ئەم ریسواییە خۆی کوشت[٥٦].

ئێلی بڵباس و ئێلی زەرزا بوبــون بــەدڕك لەکەڵەکــەی عەجــەمدا، لەبەرئــەوە یەکێك لەپەژارەکانی حاکمەکانی ورمێ و مەراغە هەمیشــە لــەناوبردنی ئــەم دو ئێلە بو. ئێلەکانی کوردیش بەهۆی ناکۆکی ناوخۆیان و، نزمــی ئاســتی ئــابوری و کۆمەڵایەتی و سیاســی و فەرهــەنگیی خۆیانــەوە، نــەیان تــوانی بــۆ پێکهێنــانی قەوارەی سەربەخۆی خۆیان کــەڵك لــەو پشــێوییە فراوانــە وەربگــرن، کەبــەهۆی هێرشی ئەفغانەوە بۆ سەر ئێران و، لەناوچونی بنەماڵەی سەفەوی و، گۆڕانی یــەك لەدوای یەکی بنەماڵە حوکمڕانەکانەوە، دروست بو.

لەسەردەمی دەسەڵاتی نــادر شــادا(١١٤٨-١١٦٠)، محەمــەد عیســی خــانی بەگلەربەگی ئەفشار داوای لەنادر کرد بۆ سەرکوت کردنی بڵباس یارمەتی بــدا. ئەویش هێزێکی گەورەی بەسەرکردایەتی نصر الله میرزای کوڕی و، ئیبراهیم خانی ظهیر الدولەی برایدا بۆ نارد، لەگــەڵ هێزەکــانی محەمــەد عیســا خــان لــەنزیك سابلاخ یەکیان گرتەوە، هەڵیان کوتایە سەر ترکەش لە قەنــدیل(١١٤٩). ئێلــی بڵباس هەر ٢ هەزار کەسێ ئەبون، هەندێکیان کــوژران و، هەنــدێکیان گــیران و، ئەوانی تریشیان هەڵاتن[٥٧]. نادرشا خۆیشی بۆ چاو ترســاندنی خــەڵکی ناوچــەکە دوای ئەوەی دەستی لەئابڵوقەدانی موســڵ هــەڵ گــرت لەســاین قــەڵاوە چــو بــۆ سەردانی سۆمای برادۆست قەڵاکانی بانیە و بەردەرەش(١١٥٨)[٥٨].

بڵباس ئێلێکی دەوڵەمەن بون، خاوەنی ئاژەڵ و گاڕان و رەوەی زۆر گــەورە بــون، هەروەها ئەرزێکی بەپیتی فراوانیان لەبەردەســتدا بــو، کاربەدەســتانی عەجــەم چاوی تەماعیان بڕی بوە سامان و داراییان و، ئەیان ویست بەزەوت کردن و تــالانی ماڵ و دارایی ئەوان خۆیان دەوڵەمەند بکەن. مەزنەکانی بڵباسیش ئــەیان ویســت کەم ترین باج و سەرانەو پێشکەش بدەن، هۆی سەرەکی ململانــێ و تێکهەڵچــونی خوێناوی ئەفشاری عەجەم و بڵباسی کورد، ئەگەرچی تێکەڵاو بو لەگەڵ نــاکۆکی مەزهەبیی و نەتەوەیی، بەڵام لەراستیدا زۆرتر لایەنی ئابوری هــەبو، نــەك لایــەنی سیاسی.

حاکمــەکانی ورمــێ و مــەراغــە هەرکــەس بوایــە ئــەبو یــەکێ لەبەنــدەکانی کارنامەکــەی" تــەمێ کردنــی بڵبــاس و ئێلــە کوردەکــانی تــر بــێ. چــەند جــار تێکهەڵچونی خوێناوی لەنێوان سوپای عەجەم و ئێلە کوردەکاندا رویدا. دەزگــای بەڕێوەبەرایەتی ئێران تا ئەهات بۆگەن تر ئەبو، ئاڵوگۆڕی یــەك لــەدوای یــەکی بنەماڵــە دەســەڵاتدارەکانی ســەفەوی و، ئــەفغانی و، ئەفشــار و، زەنــد و، قاجــار، هەمیشە گۆڕانی حاکمەکانی ورمێ و مەراغەشی بەدودا ئەهات. بەرتیل وەرگرتن بەناوی پێشکەشەوە بو بەیەکێ لەنەریتەکانی خۆ نزیکخستنەوە لەدەرباری شاهی

و لەحاکمەکانی تەوریز. حاکمەکان پلەو پایەکانی خۆیان بەپارە ئەکری، لەبەرئەوە ئەوانیش پلە حکومەتییەکانی خوار خۆیان بەپارە ئەفرۆشتەوەو، هەریەکەش هەولی ئەدا زۆرترین سامانو دارایی پێکەوە بنێو ماوەی دەسەلاتداریتی خۆی بەکاربهێنێ بۆ خۆدەولەمەند کردن بەهەر ریگەیەکی نامەشروع. زیادکردنی باجو سەرانە، داگیرکردنی زەویوزار، زەوتکردنی مالو دارایی خەلك، تالان، جەریمە کردنی بە ناهەق.

ئێلەکانی بلباسو زەرزا ئەوەندەیان زولم لەدەزگای کاربەدەستی عەجەم دی بو، شۆرشیان هەلگیرساند. بناری قەندیلو شنۆ هەتا ناوچەی دولیان لەعەجەم ئازاد کرد. هێزەکانی خۆیان بۆ بەرەنگاری لێ دامەزراندن، هێزەکانی عەجەمیش کەوتنە خۆسازدان بۆ سەرکوت کردنیان. رۆستەم خانی حاکمی ورمێ لەریگەی جاریجانو قاشقەگدوکەوە بو سەرلاجانو، محەمەد بەگی گەورەی قەرەحەسەنلو و، موئمین خانی حاکمی ساین قەلا لەگەلی قاسملۆوە بۆ سەر شنۆ چون. کابایزی مەزنی بلباس لەشنۆوە سەرپەرشتی شەرەکەی ئەکرد. ئێلی زەرزا لەدەشتەبیل شکانو لە گەردنەی شنۆ خۆیان گرتەوە. لەم شەرەدا لەکورد، کابایزی مەزنی بلباسو لەعەجەم، محەمەد بەگی قەرەحەسنلۆ کوژران(١١٧٨ك)[٥٩].

کاربەدەستانی عەجەم لەپال بەکارهێنانی زەبروزەنگ دا دژی ئێلەکانی کورد، بۆ دەستەمۆ کردنو سەرپێ دانەواندنیان، کەوتنە بەکارهێنانی هەندێ ریگەی تری وەکو دامەزراندنی خزمایەتی بەهۆی ژنوژنخوازییەوە لەگەل هەندێکیانو، دروستکردنی ناکۆکیو دوژمنایەتی لەنێوان هەندێکی تریان داو، بەگژاکردنی یەکتری. هەروەها هەولیان ئەدا لەململانێی ناوخۆیاندا کەلکیان لێ وەربگرن. لەو کێشەیەدا کەنەیارەکانی نەجەفقولی دونبولی حاکمی تەوریز، ئەیان ویست تەوریزی لێ داگیر بکەن، نەجەفقولی لەدەس ئەوان بۆ خوی هەلاتو، داوای یارمەتی لە ئیمام قولی خانی حاکمی ورمێ کرد. ئەویش جگە لەهێزەکانی ئەفشار، شێخ عەلی خانی موکری حاکمی سابلاخو، جەعفەر سولتانی زەرزا حاکمی شنۆو، قەرەنی ئاغای مەزنی بلباسو، میرزا ئاغای سەرخێلی شوکاکی بەشەرکەرانی ئێلەکانیانەوە رەوانەی خوی کرد(١١٩٥ك)بۆ یارمەتی دونبولییەکانو بەلاداخستنی ئەو ناکۆکییە بەقازانجی ئەوان[٦٠].

ئەحمەد ئاقای مقدم تاوانێکی گەورەی بەرامبەر بلباس کرد. نەجەفقولی حاکمی تەوریز، حاجی عەلی محەمەد ئاقای حاکمی مەراغەی لەسەر راوورت کوشت بو(١١٩٠ك)[٦١].

ئەحمەد ئاقای کوڕی لەجێگەی ئەو کرابوە حاکمی مەراغا. ئەحمەد ئاقا بەپێی ڕاسپاردەی دەرباری ئێرانی، بەپیلان کەوتە دامەزراندنی دۆستایەتی لەگەڵ باپیر ئاغای مەنگوڕ مەزنی ئێلی بلباس و، هێمنی کردەوە. دۆستایەتییەکەیان ئەوەندە بەهێز بو داوای لەباپیر ئاغا کرد بۆ سەندنەوەی تۆڵەی باوکی لەحاکمی تەوریز هاوکاری بکاو، بەخۆیو هەزار کەس لەسوارە هەڵبژاردەکانی بلباسەوە بچێ بۆ یارمەتی دانی. باپیر ئاغاش هەزار سواری هەڵبژاردەی لەگەڵ خۆی بۆ مەراغا برد. ئەحمەد ئاقا بەناوی میوانداریییەوە هەرچەند کەسێکیانی لەماڵێکدا دامەزران، لەنیوەی شەودا بەنوستویی هەمویان کوشتن(١١٩٨ك)[٦٢]. شایەرەکانی موکریان ئەم کارەساتەیان کردۆتە بەیتێکی تراجیدی بەگۆرانییەوە ئەیلێن[٦٣]. کاربەدەستانی ئێرانی لەسەر ئەم تاوانە نازناوی((خان))یان بە ئەحمەد ئاقا بەخشیو بو بە((ئەحمەد خانی مقدم)).

محەمەد قولی خانی بەگلەربەگی ئەفشار بۆ ئەوەی دۆستایەتی لەگەڵ ئێلی زەرزا دابمەزرێنێ خوشکێکی خۆیدا بو بەئەفراسیاب سوڵتان زەرزا. لەو سەردەمەدا ململانێی نێوان ئاقا محەمەد خانی قاجار(١١٩٣-١٢١١ك)ولوتف عەلی خانی زەند(١٢٠٣-١٢٠٩)لەسەر تەختی ئێران هێشتا بەلایەکدا نەکەوت بو. ئێران هێشتا ناوەندێکی دەسەڵاتداریی تێدا جێگیر نەبوبو، حاکمەکانی ناوچەکان هەوڵی خۆ بەهێزکردنو خۆدەوڵەمەند کردنیان ئەدا. کەسیان چارەنوسو پاشەڕۆژی خۆی نە ئەزانی.

محەمەد قولی خانی حاکمی ورمێ ئێلەکانی زەرزاو شوکاکی بەلای خۆیدا ڕاکێشا بو بۆ تاڵان کردنی ئێلی بلباس، کەهێشتا ٣ ساڵ بەسەر کارەساتی کوشتنی بەکۆمەڵی مەنگوڕدا لەمەراغا تێ نەپەڕی بو، هێزێکی ناردنە سەر، لەو کاتەدا قەرەنی ئاغا مەزنی بلباس بو، لەسەرچەمی لاوین تێکهەڵچون(١٢٠١ك) بلباس شکانو هەڵاتن بۆ چیا. ماڵو داراییان تاڵان کرا[٦٤]. بوداق خانی موکری ئەگەرچی لەهاوکاری عەجەم درێغی نەکرد بو، بگرە تاوانبار کرا بو بەدەس تێکەڵاوکردن لەگەڵ عەجەم بۆ قڕانی بلباس، کەچی ئەویش لەسزادانی عەجەم رزگاری نەبو، چاویان هەڵکۆڵی(١٢٠٣ك)[٦٥].

ئاقا محەمەد خانی قاجار بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی شاهێتی خۆی روی کردە ئازەربایجان. ویستی محەمەد قولی خانی حاکمی ورمێ بگۆڕی. محەمەد قولی لەترسی گیانی خۆی پەنای برد بۆ ئێلی زەرزا لەشنۆ، ئاقا محەمەد فەرمانیدا بەقاسم خانی حاکمی نوێی ورمێ، کەبرای محەمەد قولی بو، لەگەڵ عەسکەر خانی ئەفشار بچن بۆ تەمێ کردنی ئێلی زەرزا . محەمەد قولی گەڕایەوە لای

عەجەم‌و بەخشییان[٦٦]. بەڵام داڵدەدانی ئەو، بوە بەهانەی پەلاماردانی زەرزا. ئێلی زەرزا داوای لەئێلەکانی بلباس‌و هەرکی کرد بەدەنگیەوە بێن‌و بۆ بەربەستی هێرشی عەجەم. قاسم خان جگەلە هێزی ئەفشار، هێزەکانی دونبولی‌و موکریشی لەگەڵ خۆی برد بوە سەر زەرزا. هێزەکانی موکری لەژێرەوە لەگەڵ زەرزا ڕێک کەوت بون شەڕی یەکتری نەکەن. هێرشی عەجەم تێکشکا. هەزار کەسی لەشەڕکەرانی ئەفشارو دونبولی کوژران(١٢٠٦ك)[٦٧].

محەمەد قولی خان سەر لەنوێ بوەوە بەحاکمی ورمێ(١٢٠٧ك). ئەفراسیاب سولتانی زەرزا، هەم زاوای بو، هەم لەتەنگانەدا داڵدەی دابو، بەخۆشی دامەرزانەوەیەوە چو بۆ پیرۆزبایی لێ کردنی بۆ ورمێ، بەڵام لەوێ دەرمانداویان کردو مرد[٦٨].

فەتح عەلی شاهی قاجار(١١٨٥-١٢٥٠ك)بۆ جێگیر کردنی دەسەڵاتی خۆی لەئازەربایجان‌و، سەرکوت کردنی سەرپێچی محەمەد قولی خان، خۆی لەرێگەی تەورێز- مەراغا- سابڵاخەوە روی کردە ورمێ[٦٩]. محەمەد قولی بەبریندارى لەشەڕدا گیرا. فەتح عەلی شا، حسێن قولی خانی لەجێگەی ئەو کردە حاکمی ورمێ‌و، عەباس میرزای کوڕی خۆی کە(نائب السلطنة)ی بوو کردە والی ئازەربایجان.

عەباس میرزا(١٢٠٣-١٢٤٩ك) ماوەیەکی درێژ لەئازەربایجان حوکمڕانی کرد، لەسەردەمی ئەوا روداوی گرنگ رویدا، جەنگی روسی- ئێرانی کەچەندین سالی خایاندو قۆناغی یەکەمی بەسەپاندنی پێکهاتنی گولستان(١٢٢٨/١٨١٣)و قۆناغی دوەمی بەسەپاندنی پێکهاتنی تورکمان چای(١٢٤٣/١٨٢٨) کۆتایی هات‌و، جەنگی عوسمانی-ئێرانی کەئەویش چەندین سالی خایاند بەپەیماننامەی ئەرزڕۆم(١٢٣٨ك)تەواو بو.

دابین کردنی خەرجی جەنگەکان‌و، بژاردنی زەرەری روسیەو، خەرجی نوێ کردنەوەی قشونی ئێران‌و، خەرجی پێویستییە زۆرەکانی دەرباری بۆگەنی قاجارو، خێزانە دەسەڵاتدارەکانی، باری سەرشانی هەمو خەلکی ئێرانی قورس کرد بو، بەتایبەتی خەلکی کوردستان، ئەوی کەوت بوە ناوچەی دەسەڵاتی عەباس میرزاوە.

ئێلی بلباس کەلکیان لەئالۆزانی هەلومەرجی ئازەربایجان وەرگرت. ناوچەکانی خۆیان لەژێردەستی کاربەدەستانی عەجەم دەرهێناو، تا نزیک قەڵای ورمێ پێشڕەوییان کرد(١٢١٤ك) هێزەکانی عەجەم چەند جارێ چونە سەریان بێ ئەوەی بتوانن چاریان بکەن[٧٠]. عەباس میرزا فەرمانیدا بەحسێن قولی خانی

بەگلەربەگی ئەفشار کەبەسوپای ئەفشارو بەئەحمەد خانی مقدم مەراغەیی کەبەسوپای مقدمەوە لەکەناری چەمی گادەر یەك بگرنەوە، بۆ ئەوەی پێکەوە پەلاماری ئێلی بلباس بدەنو شۆڕشەکەیان دامرکێننەوە، لەم سەردەمەدا عەجەم توانی بوی هەندێ لەئێلە کوردەکان دەستەمۆ بکاو، بهێنێتە ژێر فەرمانەوە. بۆ ئەم هێرشە هەندێ لەشەرکەرانی ئێلەکانی شوکاكو زەرزاو شەمزینان ساز درابون. هەمویان لەسلدوز کۆبونەوە. تۆپخانەیان لەگەڵ خۆیان برد.

هێزەکانی بلباس لەدەشتی لاجان دامەزرا بون، هۆزی پیان بەسەرۆکایەتی مامەند ئاغاو، هۆزی مەنگوڕ بەسەرۆکایەتی هەمزە ئاغاو، هۆزی مامەش بەسەرۆکایەتی سوار ئاغاو، هۆزی باڵەك بەسەرۆکایەتی ئیبراهیم سوڵتان.

حسێن قولی خان سەرکردەی گشتیی هێزەکانی عەجەم، هێزەکانی خۆی بۆ شەڕ دابەش کرد" شەڕکەرانی ئێلی شوکاکی بەسەرۆکایەتی ئیسماعیل ئاغای شکەفتی بەچەرخەچی لەشکرو، شەڕکەرانی ئەفشاری لەقۆڵی راستو، شەڕکەرانی مقدم مەراغەیی لەقۆڵی چەپ داناو، خۆیشی لەناوەندی هێزەکەدا جێگەی گرتو، تۆپخانەیان لێ دابەستن.

لەرۆژی هەینی ١ی سەرەطانی ١٢١٦دا هێرشیان دەست پێ کرد.

نابەرامبەرییەکی ئاشکرا لەژمارەو چەكو رێکخستنی ئەم دو هێزەدا هەبو، لەئەنجامی شەڕەکەدا ئێلی بلباس تێکشکاو شپرزە بو. ژمارەیەکی ئەوەندە زۆریان لێ کوژرا، بەقسەی میرزا رەشید، بەفەرمانی بەگلەبەرگ لەبناری چیای قەندیل دا لە((لەسەری براوی پیاوەکانی ئەم ئێلە لەدو جێگە منارەیان دروست کردو، موئەزین بۆ بانگدان لەسەریان راوەستان)). پێنج شەش ئەسپی رەسەنی ئەو تالانییەشیان هەڵبژارد لەسەلکی شەڕکەرانی کورد باریان کردنو، بەرەشید سوڵتان قاسملۆی ئەفشاردا، بەدیاری بۆ فەتح عەلی شایان نارد[71]. ماڵو دارایی‌و رانو رەوەی ئەم ئێلە تێکشکاوەو هەرچی بەردەستی دوژمن کەوت بەتالان برا.

دوای ئەم سەرکەوتنە بەگلەربەگ لەلاجانەوە چو بۆ سەردانی شنۆ، قاسم سوڵتانی زەرزا کەئەویش لەم کوشتارەدا هاورێ لەگەڵ عەجەم بەشدار بو، لەگەڕانەوەی بەگلەربەگدا بۆ خواحافیزی تاگەردنەی شنۆ لەگەڵی چو بو، بەگلەربەگ بەدەم رێگاوە رێوشوێنی جۆری بەرێوەبردنی لێرە بەدواوەی شنۆی بۆ قاسم سوڵتان رون ئەکردەوە، لەو کاتەدا لەسەر بەرزایی گەردنەکە گۆڕستانێکی گەورە سەرنجی حسین قولی خانی راکێشا کە لەگۆڕستانی خێڵە کوردەکانی نەئەکرد. بەگلەربەگ لەقاسم سوڵتانی پرسی:((ئەو گۆڕستانە چییە؟)) ئەویش زمانی سوتا وتی: ((ئەوە گۆڕستانی کوژراوەکانی ئەفشارە کە لەسەردەمی

لێخرانی محەمەد قولی خاندا لەتێکهەڵچونێکی ئەفشاردا بەسەرکردایەتی قاسم خانی برای محەمەد قولی خان لەگەڵ ئێلی زەرزادا کوژراون)). لەوەش مەبەستی تێکهەڵچونەکەی ساڵی ١٢٠٦بو. لەسەر ئەم قسەیە بەگلەربەگ فەرمانیدا بەندی گرانیان خستە گەردنی قاسم سوڵتانو بەگیاوی لەگەڵ خۆیان بردیانە ورمێ. لەکاتێکا لەورمێ بەبۆنەی ئەم سەرکەوتنەوە ماوەی ٣ رۆژ بو جەژنو شاییان ئەکرد. لەگەرمەی ئەم ئاهەنگانەدا، قاسم سوڵتانی زەرزا ئەگەرچی ئەویش لەگەڵ هێزی عەجەمدا چو بوە سەر هاونەتەوەکانی خۆی، لەباتی ئەوەی خەڵات بکرێ، بەفەرمانی حسێن قولی خانی بەگلەربەگ، لەسەر ئەو قسەیە بەدارو فەلاقەوە بەسترا پاش سزادانێکی سەخت، ٣ هەزار تومان جەزایان لێ سەند، ئینجا بەریاندا[٧٢].

عەباس میرزا لەکاتێکا خەریکی گفتوگۆی رێککەوتنێکی زەلیلانە بو لەگەڵ روسیا(١٢٢٧)، تالآن کردنی ئێلی بلباسی سپارد بەئەحمەد خانی مقدمو عەسکەر خانی ئەفشار بەو مەرجەی ١٥هەزار تومان، لەباتی ئەو تالآنییە، بەدیوانی بەرزی عەباس میرزا بدەن[٧٣]. ئەحمەد خان بۆ ئەوەی عەسکەرخان لەو دەسکەوتە بێ بەش بکا، پێشدەستی کرد. خۆی بەتەنیا چوە سەریان کوشتاری لێ کردنو سەر لەنوێ تالآنی کردنەوە. بێ بەش کردنی عەسکەرخان لەم تالآنییە دوژمنایەتی لەنێوان ئەودو پیاوەدا دروست کرد[٧٤].

عەباس میرزا بۆ ئەوەی تەنگ بەئێلی بلباس هەڵبچنێ، یاخود بەقسەی میرزا رەشید بۆ ((دەفعي شەڕ))ی ئەم(طائفة ضالة))یە ناوچەی سلدوزی بەخشی بەئێلی قەرەپاپاخ[٧٥] کە لەئەنجامی دەس هەڵ گرتنی ئێران لەئەرزەکانی ئەوبەری روباری ئاراس بۆ دەوڵەتی روسیا، ناچاربون کۆچ بکەن بۆ ئێران.

عەجەم بۆ ئەوەی پرزەی ئەم ئێلە سەرکێشە ببڕن، ئەمیر خانی قاجار(خاڵۆی نائب السلطنة)، لەناوبردنی پاشماوەی ئەم ئێلەی بەهاوکاری سوپاکانی ئەفشار مقدم پێ سپێردرا. ئەویش دوساڵ لەسەریەك هەڵی کوتایە سەریان. دوای کوشتارو تالآن پەرە وازەی کردنو هەتا شارەزوورو گەرمیان راوی نان(١٢٣١-١٢٣٢ك)[٧٦].

بلباس لەدوای ئەو کارەساتە خوێناوییانە ئەگەرچی لەهەندێ شوێنی دێرینەی خۆیاندا مان، بەڵام وەکو کۆنفیدراسیۆنێکی بەهێزی ئێلگەل لەبەریەك هەڵوەشان. هەندێکیان پەرەوازە بون بۆ شارەزور، بیتوێن، پشدەر، بناری کۆسرەت، دۆڵی شەهیدان، تەنانەت هەندێکیان پەڕینە لای هەولێرو موسڵ.

### ٥/٢ شازادەکانی قاجار، زوڵمی زۆرتر ئەهێننە کوردستانەوە

سەردەمی قاجار هاوزەمان بو لەگەڵ هەوڵدانی دەوڵەتە گەورەکانی ئەورووپا بۆ پەلهاویشتن لەئاسیاو ئەفریقا. روسیا چاوی بڕی بوە ناوچەکانی سەروی ئێران. جەنگی ئێرانی- روسی لاوازی قشونی ئێرانی ئاسیایی لەبەرامبەر هێزی دەوڵەتی روسیەی ئەورووپایی‌دا دەرخست. فەتح عەلی شا هەواڵی جەنگی فەرەنسی- روسی بیست بو. لە١٢١٩دا نامەیەکی بۆ ناپلیۆنی ئیمپراتۆری فەرەنسی نوسی، داوای هاوکاری لێ کردبو دژی روسیا[٧٧]. ناپلیۆنیش ئەوسا کەڵکەڵەی گرتنی هندستانی لەسەرا بو. ئەمەی بەهەل زانی" پەیمانی جەنگیی، سیاسی، بازرگانی((فینکن شتاین ١٢٢٢))ی لەگەڵ بەست. نامەو نێردراوی تایبەتیشی بۆ لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی جوگرافی، سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی ئێران‌و، جێبەجێ کردنی ئەو رێککەوتنە ناردە ئێران.

ناپلیۆن بەهیوا بو، لەسۆنگەی دۆستایەتی ئێرانەوە، گوشاری روسی‌و ئینگلیزی لەئەورووپا لەسەر خۆی کەم بکاتەوەو، رێی لەشکرکێشی‌و داگیرکردنی هیندستانی بۆ تەخت بێ. هیوای لەسەرئەوە هەڵچنی بو" کەهەم هێزەکانی ئێران لەسەر رێوشوێنی سوپایی ئەورووپا رێك بخاتەوە بۆ ئەوەی ببێتە پشتیوانی لەشکرکێشی داهاتوی فەرەنسە بۆ سەر هیندو، هەم بتوانێ تەبایی‌و یەکێتی ئێرانی- عوسمانی بکاتە گوشارێکی قورس بۆ سەر روسیا.

یەکێك لەئەنجامە راستەوخۆکانی رێککەوتنی فەرەنسی- ئێرانی فینکن شتاین، ناردنی هەیئەتێکی نیزامی فەرەنسی بو بۆ ئێران. ناپلیۆن گرنگییەکی ئەوتۆی بەم هەیئەتەدا بو. خۆی رێوشوێنەکانی کارکردنی ئەم هەیئەتەی دانا بو. ئامۆژگاری‌و فەرمانەکانی بۆ نوسی بون[٧٨].

هەیئەتی نیزامی فەرەنسی بەسەرۆکایەتی گاردان لەکاتێکا هاتە ئێران(١٢٢٢)کەهێشتا جەنگی ئێرانی-روسی بەلادا نەکەوت بو. ئەم هەیئەتە خزمەتی گەورەی لەشکری ئێرانی کرد، ٣ ناوەندی مەشقیان لەتاران، تەورێز، ئەسفەهان دامەزران. زیاتر لە١٤ مانگ خەریکی مەشق پێ کردنی چەند هەزار سەربازێکی ئێرانی بو. تەنانەت ئەوان وشەی سەربازیان داهێناو، ئونیفورمیان کردە باو. ئەم هەیئەتە هەوڵی‌دا لەشکری ئێران لەسەر شێوەی سوپاکانی ئەورووپا رێك بخات و تاکتیکە جەنگییە کۆنەکانی ئێرانییەکان بگۆڕێ، فێری تاکتیکی نوێی بەکارهێنانی تفەنگ‌و نیزەو تۆپیان بکەن. دو کارگەی داڕشتنی تۆپیان

لەتاران‌و تەورێز دامەزران‌و لە١٢٢٣ەوە کەوتە دارشتنی تۆپی سەنگین، کەپێشتر ئێران نەی بو[٧٩].

چەند ئەندامێکی هەینەتەکە لەتەورێز جێگیر بون. ئەوان خەریکی رێکخستنەوەی هێزەکانی عەباس میزا بون،((فوج))ی نیزامییان لێ پێك ئەهێنان. ئەم فەوجانە هەرچەندە لەسەر شێوەیەکی نوێ تر لەجاران رێك ئەخران، بەلام لەسەرەتادا هەر لەهەمان تیرەو هۆزەکانی عەجەم‌و بەفەرماندەیی مەزنەکانی خۆیان کۆ ئەکرانەوەو رێك ئەخران. ئێلە کوردەکان بەچاوی گومانەوە سەیری ئەم فەوجانەیان ئەکرد. ئاغاو گەورەکانی کورد لەترسی ئەوەی نەوەکو دەسەلاتی خۆیان بەسەر هۆزەکانی خۆیاندا لەدەس بدەن. نەچونە ریزی ئەم فەوجانەوە. لەئەنجامدا ئەم فەوجانە بونە هێزێکی چەکداری رێکوپێك بۆ دەس گرتنی تەواو بەسەر هەمو مەلبەندە کورد نشینەکاندا.

دەرباری قاجار لەسەردەمی فەتح عەلی شادا لەوپەڕی فەسادا بو، نوسەرێکی ئەو سەردەمە ئەگێڕێتەوە:

((لەرۆژێکەوە کەپادشاە گەیشتە تەمەنی روشدو بلوغو توانی لەگەلّ ژنان بنوێ‌و منالّی لێ بکەوێتەوە تائەو کاتەی بۆ ئەو· دنیا چو لە٤٧ سالّ زیاتر نەبو، کەچی لەم ماوە کورتەدا لەپشتی پاکی ئەو ٢هەزار فرزەندو نەوەی لێ کەوتۆتەوە.و تائەمرۆ ٢١ سالّ بەسەر مردنی ئەوا تێ پەڕیوە، ئەگەر فرزەندو نەوەکانی ئەو پادشایە بژمێرین سەیر نیە کەبگەنە ١٠ هەزار کەس..))[٨٠].

هەندێ سەرچاوە ئەلێن ژمارەی ژنەکانی فەتح عەلی شاە گەیشتۆتە هەزار ژن[٨١].

ئێرانناسی بەناوبانگ، لورد کیزن، لەم روەوە نوسیویتی:

((بەم زۆرییەو فرەیی نەوەیە بارو رۆژی رەعیەتە بەدبەختەکانی ئێران دیارە. هەمو ئەم شازادانە بەنێرو مێیانەوە، موچەیان لەدەولەت وەرئەگرت. سەرەڕای ئەوەش حکومەتی شارەکانی ئێران بەدەس شازادەکانەوە بو، زۆری ئەوانە لەشارێکا بەمیرات فەرمانفەرما بون، وەکو کوللەی برسی بەری رەنجی جوتیارانی ئێرانیان هەلئەلوشی[٨٢].

عەباس میزا چوارەمین کوڕی فەتح عەلی شا، وەلیعەهدو نائب السلطنەو، والی تەورێز بو، لەتەمەنی ٤٦ سالّیدا مرد(١٢٤٩ك)کەچی ئەویش ٢٦ کوڕو ٢٢ کچی لەپاش بەجێ مابو[٨٣] کەیەکێکیان محەمەد میرزا(١٢٥٠-١٢٦٤)، ئەو کەسەی دوایی لەجێگەی فەتح عەلی شای باپیری بو بەشای ئێران.

خەرجی گرانی هەردو خولی جەنگی ئێرانی-روسی: (١٢١٨-١٢٢٨)و(١٢٤٢-١٢٤٣)وخەرجی پێکهێنانی لەشکری نوێی ئێرانو، خەرجی هەردو خولی جەنگی ئێرانی- عوسمانی: (١٢٢١)و(١٢٣٦)و، خەرجی ئەو هەمو شازادەیەو هی کۆشكو سەراو ژیانی تایبەتییان لەئەستۆی خەڵکی ئێراندا بو، بەتایبەتی لەئەستۆی خەڵکی ئازەربایجاندا، کەعەباس میرزا والی بو.

شەڕەکانی عەباس میرزا لەگەڵ روسو تورك زیانی زۆریان لەکورد دا. هەزاران کەس لەئەنجامی ئەم شەڕانەدا کوژرانو، بەسەدان ئاوایی توشی تالآنو کاولیو زەرەر بون، کەچی لەرێککەوتنەکانیشی نەك هەر هیچ قازانجێکیان نەکرد, بەڵکو توشی زەرەری گەورە تر بون. لەئەنجامی پەیمانەکانی گولستانو تورکمانچای دا، هەروەکو ئێران ئەرزێکی فراوانی لەدەس دا، ناچاربو دراوێکی زۆر لەباتی زەرەری جەنگ بەروسیا بدات, بەڵکو هەندێ لەناوچەکانی ئازەربایجان، لەوانە هەندێکی کورد نشین، وەکو بارمتە لەژێردەستی هێزەکانی روسدا مایەوە تا ئێران ئەو چەردە دراوەی دا کەگفتی دابو. لەئەنجامی ئەم دو پەیمانە دا چەند ئێلێکی کورد کەوتنە ژێر دەستی روسیاوە، چەند ئێلێکی تریشیان زۆزانو لەوەڕگاو پاوەنو ئاواییەکانی خۆیان بەیەکجاری لەدەس داو دەربەدەر بون.

هەر لەئەنجامی زوڵمی کاربەدەستانی قاجاردا ئێلە گەورەکانی حەیدەرانلوو سیپکیو هەندێ هۆزو تیرەی تری کورد بەکۆمەڵ لەناوچەکانی ماکۆو خویەوە بۆ ناو خاکی عوسمانی کۆچیان کرد. کۆچی بەکۆمەڵی ئەم ئێلانە ئەوەندە گرنگ بو، تەنگوچەڵەمەیەکی لەپەیوەندی دەرباری قاجارو بابی عالی تورکدا خوڵقاند، کە بەیەکێ لەهۆ سەرەکییەکانی هەڵگیرسانی خولی دوەمی جەنگی ئێرانی-عوسمانی دائەنرێ کەبەپەیمانی یەکەمی ئەرزڕوم دوایی هاتو مادەی سێیەمی بەتایبەتی بۆ ئەوان تەرخان کرا بو.

پەیمانی یەکەمی ئەرزڕۆم(١٢٣٨)سەر لەنوێ کوردستانی لەسەرێ هەتا خوارێ لەنێوان هەردو دەوڵەتی رۆمو عەجەمدا، بەپێی پەیمانەکەی ساڵی ١١٥٩، دابەش کردەوە. سنوری ئەو پەیمانەش لەسەر بنچینەی پەیمانی زەهاو دانرا بو. پەیمانی ئەرزڕۆم، بەبیانوی ((دەس وەرنەدان لەکاروباری ناوخۆی یەکتری))و((خۆ هەڵ نە قورتاندن لەکاروباری کوردستان))و((لابەلاکردنی بەخۆشیی کێشەکانی هاتوچۆی رەوەندەکان بۆ گەرمیانو زۆزان))بەپێی مادەی یەکەمیو((جۆری بەلاداخستنی کێشەی ئێلە پەنا دراوەکان))و((دالدە نەدانی راکردوانی یەکتری))بەپێی مادەی سێیەمو چوارەمی، بناغەی رێوشوێنەکانی هاوکاری سیاسیو سوپایی هەردو دەوڵەتی دژی بزوتنەوەی کورد داڕشت.

فەتح عەلی شا کوڕەکانی خۆیو زاواکانی لەشوێنە گرنگەکانی ئێراندا ئەنا، عەباس میرزا لەئازەربایجانو، محەمەد عەلی میرزا حوکمڕانی رۆژئاوای ئێرانو، محەمەد وەلی میرزا حوکمڕانی کرمان بون. هەریەکەیان هێزێکی چەکداری پێکەوە نابو، بەئارەزوی خۆیان باجو سەرانەیان لەخەڵك ئەسەند. ئەمانە حەسودییان بەیەکتری ئەبرد، بەتایبەتی بەعەباس میرزا، نەك بەتەنیا لەبەرئەوەی باوکی بەوەلیعەهدو جێنشینی خۆی دای نابو، بگرە لەبەرئەوەش چونکە ئازەربایجانی بەو سپارد بو، کەگرنگترینو دەوڵەمەندترین ئیالەتی ئێرانی بو، یەکێ لەهۆکانی تێکشکانی عەباس میرزا لەهەردو جەنگی روسیدا ئەوە بو، براکانی لەکاتی پێویستدا نە هێزیان بۆ یارمەتی دانی ناردو، نە بەشداری خەرجی جەنگەکانی بون[٨٤].

شازادەکانی قاجار بەهەمو ئێراندا بڵاوبونەوە، هەریەکەیان هەڵپەی ئەوەی بو" گوندو ئەرزوماڵو دارایی خەڵك زەوت بکا، خۆی دەوڵەمەند بکا، ژیانێکی خۆش بۆ خۆی دابین بکا، هەریەکێ لەمانە وەکو نیشانەی خانەدانێتی میرزایەکی بەدواوە ئەنوسراو، نازناوێکی زلی بۆشی پێ ئەدرا. هەندێك لەمانە گەیشت بونە ئازەربایجانو، هەندێکیشیان بونە حاکمی ورمێ لەوانە: محەمەد رەحیم میرزا ضیاء الدولـة، ئەکبەر میرزا، مەلیك مەنسور میرزا، ئەحمەد میرزا معین الدولـة.. ئەمانە لە دەربارێکا گەورە بو بون کە لەهەمو رویەکەوە نمونەی فەسادی سیاسی، ئەخلاقی، مالی، ئیداری بو. ئەوانەی ئەبون بەحاکمی ورمێ گوێیان نەئەدایە باش کردنی گوزەرانی خەڵكو پێشکەوتنی وڵات. خەریکی راوورِوتو سەندنی باجو سەرانەو، وەرگرتنی بەرتیلو پێشکەشو، زەوت کردنی ماڵو دارایی خەڵكو، دەس گرتن بەسەر ئەرزو دەرامەتی ئاواییەکان دا بون. فەتح عەلی شا خۆی کابرایەکی پولەکی پارەپەرست بو، خۆشییەکی سەیری لەکۆکردنەوەی زێرو خشڵو گەوهەر وەرئەگرت، بەدیاریو پێشکەش کاری کاربەدەستانی رائەپەڕاند. دەرباری قاجار پلەو پایەو نازناوی بەپارە بەکاربەدەستانی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت ئەفرۆشت. ئەوانیش پلەو پایەی حکومەتیی خوار خۆیان بەخەڵکی تر ئەفرۆشتەوەو، بەهەمویان خەریکی روتاندنەوەی خەڵك بون. کونت گوبینو، وەزیری موختاری فەرەنسی لەدەرباری قاجاردا لەساڵانی (١٨٥٥-١٨٥٨/١٢٧٢-١٢٧٥)لەکتێبی((٣ ساڵ لەئاسیا))دا دەربارەی بەرتیلخۆریی لەئێراندا نوسیوێتی:

((یەکێ لەو عەیب، بگرە لەو بەڵایانەی لەئێراندا رەگی داکوتاوەو، بڕینیشی زۆر دژوارە، بەڵکو مەحاڵە، بەرتیلخۆرییە. ئەم کارە بەجۆرێ بڵاوە، لەشاوە

بیگری تا پچوك ترین مەئموری دەوڵەت بەرتیل وەرئـەگرن. کەچـی هـیچ کـەس دەنگی لیّوە نایەت. ئەڵیّی هەمو مەئمورو کاربەدەستانی ئیّران لەسەریّ تاخواریّ لەناو خۆیاندا لەسەر ئەوە ریّك کەوتون، کە لەمەسەلەکە بیّـدەنگ بـن. لـەپیّش ئەوە دا بچمە لەنـدەن کتیّبـی حـاجی بابـای ئەسـفەهانیم دەسـکەوت، لـەکاتی خویّندنەوەیدا بەرچاوم کەوت، کـە لـەزەمانی سـەڵتەنەتی فـەتح عـەلی شـادا، وەزیری موختاری ئینگلیزی، فەردەیـەك پەتاتـەی بـەدیاری بـۆ دەوڵـەتی ئیّـران بردبو، گوتبوی کەئەگەر ئەو گیایە لەئیّراندا بڕویّنن هـەرگیز توشـی قـاتوقڕی نابن چونکە رواندنی ئاسانە، بەروبومی زۆرە، بەباشی جیّگـەی نـان ئەگریّتـەوە، بەڵام سەدری ئەعزەمی فەتح عەلی شا، پیّش ئەوەی پەتاتەکە وەربگریّ گوتبـوی: ئەگەر رواندنی ئەم گیایە لەئیّراندا بڵاو بکەمەوە چەندە بەرتیل بەمن ئەدەن؟

((ئەو کاتە من هیّشتا نەهات بوم بۆ ئیّران، سەرم سـوڕما بـو چـۆن ئـەبیّت سەدری ئەعزەمی دەوڵەتیّکی گەورەی وەکو ئیّران، بۆ چاندنی روەکیّك کـەقازانجی هەمو خەڵکی تیّدا بیّ، داوای بەرتیل بکـا. بـەڵام ئـەوە ماوەیەکـە کـەوا خـۆم لەئیّران ئەژیم، هەست ئەکەم کەئەو قسەیە راست بوە.

((مەحاڵە لەئیّران تۆ ئیشت بەیەکیّ لەمەئمورەکانی دەوڵەت هەبیّو بتوانیّ بەبیّ دانی بەرتیل کارەکەی خۆت بڕویّنی..))[٨٥] مەبەستی لەو سەدری ئەعزەمەی کەبەرامبەر بە پەرە پیّدانی رواندنی پەتاتە داوای بەرتیلی کرد بو، هەمان میرزا شەفیعی بەناوبانگە، کە لە١٢١٥ تا ١٢٣٤ واتە لەیەکیّ لەئاڵۆزاوترین دەورانی میّژوی ئیّراندا سەروەزیر بو[٨٦].

یەکیّکیتر لەپیاوە هەرە بەناوبانگەکانی ئیّـران، مـیرزا حسـیّن خـانی مشـیر الدولەو سوپا سالاری ئەعزەم، ئەویش لەو ماوەیەدا کـەبو بەسـەدری ئـەعزەمی ئیّـران، بەرامبـەر بەپـەنجا هـەزار لـیرە بـەرتیل((ئیمتیـاز))یّکـی بـە رویتـەر دا(١٢٨٩/١٨٧٢)، کەمافی دروستکردنی ریّگـەی ئاسـنینی رەشـت- تـاران- خەلیج، تراموای ناو تاران، وەرهیّنـانی هـەمو کانـەکانی ئیّـران، بـەکارهیّنانی لیّرەوارو ئاوا کردنەوەی زەویوزاری بەیار، هەڵکەندنی جۆگەو هەڵبەستنی بەنداو، دامەزراندنی ئاشو کارگە، بانك، خەتی تەلگوراف.ی ئەدایە. روسیا نەی هیّشت ئەم ئیمتیازە سەربگریّ[٨٧].

عەباس میرزا نائب السلطنة، جاریّکیان تالاّن کردنی ئیّلی بلباس بەقۆنتەراتی ١٥ هەزار تومان دا بەدو کـەس لەسـەرکردەکانی هیّزەکـەی[٨٨]. جـاریّکی تـریش بەرامبـەر بـە٣٠ هـەزار تومـان هیّزیّکـی بەسـەرکردایەتی حـەبیب الله خـانی

شاهسون‌و سلیمان خانی گورجی بۆ هاوکاری مەحمود پاشای بابان نارده سەر سلێمانی[89].

دەزگای دەوڵەتیی عەجەم لەتەوریز خەریکی سازدانی هێزی نیزامی بو، بەو هێزانە هەوڵی ئەدا بەتەواوی دەس بەسەر ناوچەکەو بەسەر ئێلە کوردەکانی رەوەندو نیشتەجێدا بگرێ‌و، شوێنە سەختەکان کەپێش تر نەیان ئەتوانی بیگەنێ‌و، ئەوانەی لەدەوڵەت یاخی ئەبون پەنایان بۆ ئەبرد، ئەوانەش قایم بکەن. باجی قورس‌و، جەریمە کردنی ناڕەواو، گێچەڵ کردن بەوانەی گومانی سامان‌و دارایی یان لێ ئەکراو، تالآن کردنی هۆزو ئاواییەکانی کورد بو بوە سەرچاوەیەکی گرنگی دەرامەتی دەزگاکانی دەوڵەت‌و ژیانی کاربەدەستانی ورمێ.

رەوەندەکانی رۆژئاوای ورمێ‌و هەرکی‌و شوکاك‌و بڵباس لەدانی ئەو باجە زۆرەی خرا بوە سەریان سەرپێچیان کرد. عەسکەر خانی ئەفشار چوە سەر ئێلی شوکاك، دوای ئەوەی ئیسماعیل ئاغای شکەفتی بەفێڵ کوشت(١٢٣٥)ناوچەکەشی زەوت کردن[90]. هەر ئەوچوە سەر مستەفا بەگی هەکاری لەئالباغ، کە لەسەر سنور بو، پاش ٣ مانگ ئابڵوقەدان بەدیل گرتی[91] ومالّو دارایی تالآنی کرد. فەتح عەلی ئەفشاریش چوە سەر ئێلی هەرکی پاش کوشتارو راونان تالآن کردن[92]. ئەمیر خانی قاجاریش چوە سەر بڵباس دوای کوشتن‌و راونان تالآنی کردن[93].

فەوجە نیزامییەکانی عەجەم کەوت بونە هەوڵ دانی ئەوەی دەس بگرن بەسەر شوێنە سەختەکانی کوردستاندا، قەلاکانی کونەمێش‌و بەردەڕەش کەدو شوێنی سەخت بون‌و، ئەوانەی لەدەوڵەت یاخی ئەبون رویان تێ ئەکرد، هەردوکیان گیران‌و هێزی دەوڵەتییان لێ جێگیر بو (١٢٦٠)[94]. کاربەدەستانی عەجەم پەناهێنانی نورڵلای بەگی هەکارییان بۆ ناوچەکە کردە بەهانەی لەشکرکێشییەکی تر. نورڵلا بەگ یەکێ بو لەهاوکارەکانی بەدرخان‌و بەشداری بەرەنگاریی هێرشەکانی عوسمانی بوبو. دوای تێکشکانی راپەڕینەکەیان، لەدەس رۆم هەلآت بو لەناوچەکانی دەشت‌و تەرگەوەڕ دانیشت بو. کاربەدەستانی عوسمانی داوایان لەفەرمانفەرمای ئازەربایجان کرد کە بەگیراوی بیدەنە دەستیان. ئەویش فەرمانی‌دا بەگلەربەگی ورمێ کەنورڵلا بگرێ. بیداتەوە دەست کاربەدەستانی سنوری عوسمانی. مەزنەکانی کورد ئامادە نەبون نورڵلا بەگ بەدەستەوە بدەن. هێزە نیزامییەکانی عەجەم چون بۆ تەمێ کردنی یاخییەکان‌و گرتنی نورڵلا بەگ، بەلآم خەڵکی مەرگەوەڕو تەرگەوەڕو دەشت بەکۆمەڵ روبەڕوی هێزەکانی عەجەم بون‌و شکاندیان[95].

محەمەد رەحیم میرزای کوڕی عەباس میرزا کەبو بەحاکمی ورمێ بۆ چاوترساندنی گەورەکانی کورد لەپێش هەمو شتێکەوە کەوتە گرتنیان" سەمەد خانو غەفور خانو عەبدوڵڵا لەتیف لەسەرانی زەرزا، کەبۆ بەخێرهاتنی چوبون، هەموویانی گرتو، بەگیراوی رەوانەی تەوریزی کردن[96]. عەلی ئاغای شکەفتی سەرخێڵی شوکاکیان بەقسەی خۆش لاس داو هێنایانە ورمێ، لەوێشەوە بەگیراوی رەوانەی تارانیان کرد[97].

میر سوڵتان، نەوەی ئەمیر خانی یەکدەست لەگوندێکی چەپەکی سەرسنوری ئێرانی- عوسمانیدا بەناوی((بنار)) لەناوچەی مەرگەوەڕ ئەژیا. تا ئەو سەردەمە دەسەلاتی عەجەم نەگەیشتبوە ئەوێ. نعمەتوللا میرزا ئەیویست ئەرزی ئاوایییەکانی ناوچەکە داگیر بکاو، دەرامەتی زەویوزاری گوندەکان بۆ خۆی ببات.((مباشر))ی دانا بو بۆ قەبلاندنی بەشی خۆی لەبەروبومی کشتوکاڵو ئاژەڵو بەرهەمی ناوچەکە. میر سوڵتان ملی بۆ ئەم ملهوڕییە نەدا. ئامادە نەبو ئەو رێوشوێنانەی ئەم کابرایەو((مباشر))ەکانی بۆ سەندنی ملکانەو باجەکانی تر دایان نابو قبوڵ بکا. نعمەتوللا میرزا بۆ جێبەجێ کردنی خواستە تایبەتییەکانی خۆی داوای هێزی لەحکومەت کرد. لەتەوریزەوە فەرمان درا بەعەسکەر خانی سەرتیپ، لەهەمو قەڵاکانی مەڵبەندی ورمێ پاسەوان دابنێ بۆ ئەوەی دەسەلاتی دەوڵەت لەهەمو ناوچەکەدا جێگیر ببێو حوکمەکانی بڕوا.

عەسکەر خان قەڵای بەردەسوری گرتو عەجەمی لێ دانا[98]. بەفرتوفێڵ یاخود میرزا رەشید گوتەنی بە((تدبیراتی صائبەو وعدەو وعید))میر سوڵتانی لەبنارەوە هێنایە بەردەستی خۆی. مباشرەکانی لەگەڵ ناردەوە بۆ بنار بۆ حساب کردنی ئەو باجانەی ئەبو بیدەن. لەوێ پێك نەهاتنو میر سوڵتان گوێی نەدانێ. خەڵکی بەردەسوریش چاویان لەو کردو، ئامادە نەبون داوای موباشیرەکان جێبەجێ بکەن[99].

عەسکەر خان فەوجە نیزامییەکانی قشونی ورمێی سازدا. بەتۆپخانەو سوارەوە لەچەمەنی دز گیر لەدەشتی مەرگەوەڕ لەشکرگای دامەزران،. هێزەکانی کۆکردەوە، حەسەن خانی سەر تیپی سوارەی قەرەپاپاخو، میرزا ئاغای سەرخێڵی شوکاکو سوارەکانی ئەویش گەیشتن، ٣ تا ٤ هەزار سەربازو سوارە کۆبونەوە.

ئەم جارەش عەسکەرخان((تدبیراتی صائبە))ی بەکارهێنا، دەستەیەك سەربازی نارد کە لەقەڵای بناردا وەکو بارمتە بمێننەوە بۆ ئەوەی میر سوڵتان زات بکا بێتە ناو لەشکرگاکەیان. میر سوڵتان هات. بەڵام لەوێ بەبیانوی ئەوەی نامە ئەنێرن بۆ تەوریزو چارەڕوانی هاتنەوەی وەڵامەکەی ئەکەن، گلیان دایەوە، پاش

چەند رۆژێ میر سولّتان نائومێد بـو. گەیشـتـە تینـیـو دەسـتی لـەژیان شـۆرد. بەیانییەکی زوو هەڵی کوتایە سەر چادرەکەی عەسکەرخانی فەرمانـدەی گشـتی لەشکرو، دایە بەر خەنجەرو کوشتی. لەهەمـان چـادرا مـەلیك مەنسـور مـیرزاو نعمەتوڵڵا میرزاشـی لێ بـو. لـەم روداوە حەپەسـان. بـە پەلـەپروزێ لەچـادرەکە دەرپەڕین. کەوتنە هاوار، نۆکەرەکانی سەرتیپ رژانە ناو چادرەکە. هـەر لـەوێدا میر سولّتانیان ئەنجن ئەنجن کرد[100] هێزەکـانی عەجـەم ئەمـەیان کـردە بەهانـەی تۆڵەسەندن. بەمەرگەوەڕ وەر بون بۆ کوشتنو تالان کردن.

نوسەرێکی ئەرمەنی لەکاتی روداوەکانی سالّی ۱۲۹۷دا خۆی لەسابلاخ بـوە، کەهۆی بەشداربونی ئێلی زەرزاو سەرۆکەکانی لەخۆیان ئەپرسی، ئیبراهیم خـانی سەرۆکی زەرزا لەوەلاّم دا ئەڵێ:

((.. هەر کەسێ دەس لەگیانی خۆی بشوا، چی لەدەس بێ ئەیکا. ئەو زوڵمەی من لەحاکمی ورمێ معین الدولەو کوڕەکەی ئەو حاکمی شنۆم دیوە، چۆن لـەبیرم بچێتەوە؟ لەپاش لێخرانی معین الدولـە تـۆ منـت لەتـەورێز بینـی چـەند جـار سـکالاّو گازانـدەم لای کاربەدەسـتانی ئازەربایجـان کـرد، لـەو دەسـدرێژییانەی کەشازادە لە منی کرد بو. هەمو سکالاّکانی خۆم بەبەڵگە سەلماند کەشـازادە ۱۲ هەزار تومانی بێ هیچ بیانویەك لەمن سەندوە. هەمویان راسـتیی خـاوەن هـەق بونی من تێ گەیشتن، کەچی کەسیان هیچیان نەکرد بو بۆ لابردنی ئەو زوڵمـەی لێم کرا بو، تەنانەت نەم توانی ئەو کچانەش وەربگرمەوە، کەبـەزۆر لەئێلەکـەی منیان زەوت کرد بو. سەرەنجام هەمو داواکانی منیان بە۸ سەد تومـان قەبلاّنـد، ئەویشیان هەر نەدامەوە. لەبەر ئەو شـتـانە بـو، تۆڵـە ئـاگری لەجگـەری ئێمـە بەرداو، ئێمەی بۆ لاساریو یاخی بون راکێشا..))[101].

کەڵەکە بونی ئەم روداوانە لەبیرەوەری هەردو گەلی ئازەریو کوردا، بەجۆرێکی سەلبی لەپاشەڕۆژی پەیوەندییـەکانیاندا رەنگـی دایـەوە. لەهەنـدێ سـەردەمی دوایی ترا شێوەی جەنگی ناوخۆی نەتەوەییو مەزهەبیی بەخۆیەوە گرت.

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

[1] سعید نفیسی، تاریخ اجتماعی و سیاسی ایران در دوره معاصر، ج۱. تهران: بنیاد ۱۳۶۶ش، ص۱۲.
[2] هـ س، ل٦.
[3] هـ س، ل ٧-٨.
[4] عنایت الله رضا، اذربایجان و اران(البانیای قفقاز)، تهران: ایران زمین، ۱۳۶۰ش، ص ۱۹۸.
[5] مجموعة من الاساتذة، العراق في التاريخ، بغداد، دار الحرية، ٩٨٣، ص ٤٢٠-٤٢٤.
[6] نفیسی، س ن، ل ١٤-١٥
[7] محمد امین زکی، کوردو کوردستان، بەغداد، ٩٣١، چاپکردنەوەی سیدیان، ل ١٣٤-١٣٨.
[8] لەبارەی رەچەڵەکی سەفەوییەکانەوە بڕوانە: احمد کسروی، شیخ صفی و تبارش، تهران، ۱۳۲۳ش.
[9] نصرالله فلسفی، زندگانی شاه عباس اول، ج۱و۲، ج ٤، تهران: علمی، پائیز ۱۳۶۹ش، ص٢٢٠-٢٢١ دەربارەی هەمان بابەت بڕوانە: د.عبدالحسین نوائی، شاه عباس ج۱و۲، تهران: زرین، ۱۳۶۷ش، ص١٥.
[10] بۆ ئاگاداری زیاتر لەسەر ژیانی شا ئیسماعیلی سەفەوی، بڕوانە: د. عبد الحسین نوائی، شاه اسمعیل صفوی، تهران ارغوان، ۱۳۶۸ش، رحیم زاده صفوی، زندگانی شاه اسمعیل صفوی، باهتمام پررصفوی، تهران کتابفروشی خیام، ١٣٤١ ش، تاریخ عالم ارای صفوی، بکوشش یدالله شکری، چ٢، تهران: اطلاعات،۱۳٦٣ش، المحامي عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٣، بغداد، ١٩٣٩م، ط٢، قم، منشورات الشريف الرضي،١٤١٠ق/١٣٦٩ش.
[11] امیر شرفخان بدلیسی، شرفنامه، بکوشش محمد عباس، چ٢، تهران: علمی،١٣٦٤ش، ص٢٨٤و٣٣٤و ٣٤٥و٥٣٠.
[12] هـ س، ل٢١٣-٢٧٢، ٢٣٠-٢٠٨.
[13] عالم ارای صفوی، ل٦٤، د. مجیر شیبانی، تشکیل شاهنشاهی صفویه، تهران دانشگاه تهران، ١٣٤٦ش، ص٩١.
[14] شیبانی، ل٧٩-٨٣.
[15] بدلیسی، ل٥٣٢.
[16] بدلیسی، ل٣٧٤" عالم ارای صفوی، ل١٠٤-١٠٨.
[17] بدلیسی، ل٥٣٧" نوائی، شاه اسمعیل...، ل٣٢-٣٣.
[18] هامر پورگشتال، تاریخ امپراطوری عثمانی، ترجمة میرزا زکی علی ابادی، باهتمام جمشید کیان فر،ج٢، تهران: زرین، پائیز ١٣٦٧ش، ص ٨٣٦" شیبانی، ل١٨٠.
[19] دەربارەی جەنگی چاڵدێران بڕوانە: شیبانی، ل١٦٧-٢٠٨" هامر پورگشتال، ٨٣٢-٨٤٨" عالم ارای صفوی، ل٤٨٣-٥٠١.
[20] کلیم الله توحدی(اوغازی)، حرکت تاریخی کرد بەخراسان، ج٢، مشهد: چاپخانه دانشگاه فردوسی، ١٣٦٤ش، ص١٣٧. ئەم نوسەرە خۆی کوردی خوراسانە، تا ئێستا ٣ بەرگی لەسەر

راگوێزانی کورد بۆ خوراسان نوسیوه" حرکت تاریخی کرد بەخراسان، ج۱، مشهد، بهمن ۱۳۵۹ش. ج۲ اردیبهشت ۱۳٦٤ش. ج۳ مشهد، ۱۳٦٦ش.

[٢١] هەمان سەرچاوە، جلد۲، ل۱۵۲.

[٢٢] د. عبدالحسین نوائی، شا طهماسب صفوی، تهران: ارغوان ۱۳٦۸ش. ص۱٦٦.

[٢٣] هـ س، ل۱٦۷.

[٢٤] هـ س، ل۱۹۷.

[٢٥] نوائی، هـ ج" بدلیسی، ل۱۹۵.

[٢٦] نوائی، هـ ج.

[٢٧] هـ س، ل۱۹۷-۱۹۸.

[٢٨] د. منوچهر پارسا دوست، ریشەهای تاریخی اختلافات جنگ عراق و ایران، چ۳، تهران: شرکت سهامی انتشارا، زمستان ۱۳٦۷ش، ص۲٦-۲۷" اصغر جعفری ولدانی، بررسی تاریخی اختلافات ایران و عراق، تهران: دفتر مطالعات سیاسی و بین المللی، ۱۳٦۷ش، ص۱۰-۱۲.

[٢٩] د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژو، بەغداد، ۱۹۸۳، ل۱۳۰.

[٣٠] نوائی، شاه عباس، ج۱و۲، س ن، ل۱۲.

[٣١] هـ س، ل۸.

[٣٢] نصرالله فلسفی، زندگانی شاه عباس اول، ج۳، ج٤، تهران: علمی، ۱۳٦۹ش، ص۱۰۹۳.

[٣٣] توحدی، س ن، هەمانجی.

[٣٤] اسکندر بیگ ترکمان، تاریخ عالم ارای عباسی، ج۲، تهران: امیر کبیر، ۱۳۵۰ش، ص۸۰۷-۸۱۰. لێرە بەدواوە: اسکندر بیگ.

[٣٥] ئوسکارمان، تحفەی مظفریە، ساخکردنەوەو هێنانەوەی بۆ سەر رێنوسی کوردی هێمن، بەغداد، کوڕی زانیاری کورد، ۱۹۷۵، ل۲۰۹-۲۱۷.

[٣٦] اسکندر بیگ، س ن، ل۸۱۱-۸۱٤.

[٣٧] فلسفی،ج۳، ل۱۱۰۳

[٣٨] ملا جلال الدین منجم، تاریخ عباس یا روزنامه ملا جلال، بەکوشش سیف الله وحیدنیا، تهران: وحید، ۱۳٦٦ش، ص۲۹٤.

[٣٩] هـ س، ص ۲۸٤-۲۸۷.

[٤٠] اسکندر بیگ، س ن، ل٦۵۸-٦۵۹.

[٤١] شیبانی، س ن، ل۷۹.

[٤٢] نوائی، شاه عباس، هـ س، ص۱۲.

[٤٣] میرزا رشید ادیب الشعرا، تاریخ افشار بانضمام قیام شیخ عبیدالله، بەتصحیح و اهتمام پرویز شهریار افشار-محمود رامیان، تبریز، چاپخانه شفق، ۱۳٤۷ش، ص٤٦. لێرە بەدواوە: میرزا رشید.

[٤٤] هـ س، ل ٤۸.

[٤٥] هـ س، ل٤۸-٤۹.

[٤٦] علی دهقان، رضائیة یا سرزمین زردشت، تهران: ابن سینا ۱۳٤۸ ش، ص۳٦۹.

[٤٧] نفیسی، س ن، ج۱، ل۲۳.

[٤٨] میرزا رشید، س ن، ل۵۰-۵۱.

[49] هـ س، ل٥٢-٥٥.
[50] هـ س، ل ٥٨-٥٩.
[51] هـ س، ل ٥٧.
[52] بۆ تێکستی تەواوی تورکیو فارسی پەیماننامەی زەهاو بڕوانە: میرزا سید جعفر خان مهندس باشی(مشیر الدوله)، رساله تحقیقات سرحدیه، به اهتمام محمد مشیری، تهران، بنیاد فرهنگ ایران، ١٣٤٨، ص ٧٤-٨١.
[53] احمد خانی، مەم وزین.
[54] میرزا رشید، س ن، ل١٩٠.
[55] هـ س، ل ٦٧.
[56] هـ س، ل٨٤.
[57] هـ س، ل ٩١.
[58] هـ س، ل١٦٥-١٦٦.
[59] هـ س، ٢٠١.
[60] هـ س، ل ١٨٧.
[61] هـ س، ل ١٨٩-١٩١.
[62] توسکارمان، س ن، ل ٧٤٢-٧٥٩.
[63] میرزا رشید، س ن، ل ٢٤١.
[64] هـ س، ل ٢٣٩.
[65] هـ س، ل ٢٦٥.
[66] هـ س، ل ٢٦٥-٢٦٦.
[67] هـ س، ل ٢٨١.
[68] هـ س، ل ٣٨٩.
[69] هـ س، ل٣٠٨.
[70] هـ س، ل ٣١١-٣١٢.
[71] هـ س، ل٣١٤.
[72] هـ س، ل ٣٥٣" هەروەها بڕوانە: عبدالرزاق دنبلی، مآثر سلطانیه، بەاهتمام غلام حسین صدری افشار، چ ٢، تهران، ابن سینا، ١٣٢٩ق، ص٢٧٥.
[73] هـ ج.
[74] هـ س، ل ٥٠٤.
[75] هـ س، ل ٣٧١" دنبلی، س ن، ل٣٢٢.
[76] نفیسی س ن ، ج١، ل٩١.
[77] هـ س، ل٩٥-٩٨.
[78] هـ س، ل ١٠٢.
[79] هـ س، ل١٠٠-١١٤.
[80] هـ س، ج٢، ل٢.

[81] اسماعیل نواب صفا، شرح حال: فرهاد میرزا معتمد الدوله، جلد ۱، تهران: ۱۳٦٦ش، ص٥" دەربارەی ژنەکانی فتح علی شاه، بروانه شاهزاده عضد الدولة(سلطان احمد میرزا)، تاریخ عضدی بەکوشش د. عبدالحسین نوائی، تهران، بابك، اسفند ماه ۲٥۳٥.

[82] مهدی بامداد، شرح حال رجال ایران، ج۳، تهران: زوار، ۱۳٤۷ش، ص٦٤.

[83] نواب صفا، هـ ج.

[84] نفیسی، س ن، ج۲، ل۲.

[85] بامداد، س ن، ج۱، ص ٤۱٤.

[86] بامداد، هـ ج.

[87] بامداد، هـ ج.

[88] میرزا رشید، ل ۳٥۳.

[89] عبدالقادر ابن رستم بابانی، تاریخ جغرافیای کردستان موسوم بەسیر الاکراد، بەاهتمام محمد رووف توکلی، تهران، ۱۳٦٦ش، ص۱٤۷.

[90] میرزا رشید، س ن، ل ۳۷۰.

[91] هـ س، ل ۳۷۲ دنبلی، س ن، ل۳۷۰.

[92] هـ س، ل ۳٦٥.

[93] هـ س، ل ۳۷۱.

[94] هـ س، ل ٤۳٥.

[95] هـ س، ل ٤٤۰-٤٤۱.

[96] هـ س، ل ٤٤۳.

[97] هـ س، ل٤٤٤.

[98] هـ س، ل ٤٦۸.

[99] هـ س، ل ٤٦۹.

[100] هـ س، ل ٤۷۰-٤۷۲.

[101] اسکندر غوریانس، قیام شیخ عبیدالله شمزینی در کردستان، به اهتمام عبدالله مردوخ، تهران: دنیای دانش، ۲٥۳٦، ص٥٦.

## ٢ نۆڕینی کوردو عەجەم لەیەکتری

### ١-دڵ لەدڵ ئەڕوانێ

تورکە ئازەرییەکان کە لەناو کوردا بەعەجەم ناسراون، دەوڵەتی سەفەوییان دامەزران، بەدرێژایی سەردەمی دەسەڵاتی سەفەوییەکان کاروباری حوکمڕانی لەدەس ئەواندا بو، دوای ئەوانیش ئەو ماوە کورتەی لێ دەربچێ کەبنەماڵەی زەند حوکمی گرتە دەست، حوکمی ئێران ئیتر هەر لەدەس سەرانی ئێلەکانی ئەفشارو قاجاردا بوە، کەئەوانیش هەردوکیان لەئێلە سەرەکییەکانی دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەوی‌و، هەردوکیان تورکی ئازەری‌و، هەردوکیان شیعەی توندڕەو بون.

دراوسێیەتی دوورودرێژی کوردو عەجەم لەناوچەی ورمێ‌و موکریان لەگەڵ یەکتری، شەڕوشۆڕو پێکدادانی بەردەوام‌و، تێکەڵاوی ناچاری، جیاوازی رەگەزو زمان‌و مەزەب، جیاوازی دەسکەوتی ئابوری‌و سیاسی لەگەڵ یەکتری، لەویژدانی هەریەکێ لەم دو گەلەدا وێنەیەکی دزێوی ئەوی تری دروست کردوە.

شاهەکانی عەجەم‌و مێژوونوس‌و نوسەرەکانی، بەچاوی سوك سەیری کوردیان کردوە. کوردیان بە دزو جەردەو رێگرو پیاوکوژو یاخی لەقەڵەم داوە. نوسەرانی عەجەم لەسەردەمی سەفەوییەکانەوە وەکو" حەسەن بەگی رۆملو، ئەسکەندەر بەگی تورکمان، مەلا جەلال مونجم، نوسەری عالم ئارای سەفەوی، تا نوسەرانی هاوچەرخی وەکو ئەحمەدی کسروی تەبریزی، رەحیم زادەی سەفەوی، عەبدولحسێن نوائی، حسێن مەکی، عەلی دهقان.. هتد، روداوەکانی سەدەکانی رابردو، تێکهەڵچونەکانی نێوان کوردو دەسەڵاتدارە زاڵمەکانی ئێران، لەباری سەرنجی دەوڵەتەوە ئەگێڕنەوە:

١-هەمو شۆڕش‌و ڕاپەڕینەکانی کورد لەپێناوی ئازادی‌دا، بۆ دەرکردنی دەسەڵاتی زاڵمانەی بێگانە لەکوردستان‌دا بەیاخی بونی ناڕەوا دائەنێن‌و، ناوی طغیان، فیتنە، شۆڕش، ئاشوب، غائیلە.ی لێ ئەنێن‌و"

٢-هەمو کورد تەشرار، ئەوباش، طائفة ضالة، طاغي، یاغی، شەقاوەت نیهاد، گەبری هێزیدی، مەنشەئی فیتنەو فەساد.. ناو ئەبەن‌و"

٣-شەڕکەرە داگیرکەرە بێ بەزەییەکانی خۆیان بەموسلْمان، غازی، شێر، دلێر، دلاوەر، قەهرەمان، موجاهید.. باس ئەکەن‌و"

٤-پەیمان شکێنی‌و بێ بەڵێنی‌و پیلانی ناجوامێرانە بۆ لەناوبردنی مەزنەکانی کورد بەشانازییەوە بە لطائف الحیل، تدبیراتی صائبە، کەمەندی تدبیر، وسائل‌و رسائل، زیرەکی‌و زۆرزانی کاربەدەستانی خۆیان ئەژمێرن.

لەبەرامبەر ئەوەدا دیمەنی عەجەمیش لەویژدانی کوردا ناشیرینە. عەجەم بەواتەی کەسێکی کە لەژێر کەوتن‌دا کەساس‌و لەسەرکەوتن دا دڕندەیە، بۆ گەیشتن بەمەبەستی خۆی لەهیچ کارێکی ناجوامێرانە ناپونگێتەوە، بەڵێن ئەداو نای هێنێتە جێ، لەگەڵ دۆست‌و دوژمن درۆ ئەکا. لەململانێ‌و زۆرانبازی‌دا پەنا ئەباتە بەر هەمو ڕێگەیەکی نامەردانە بۆ ئەوەی دوژمنەکەی لەئەرز بدا. فۆلکلۆری کوردی گەلێك بۆچونی لەو بابەتانەی تێدایە، تەنانەت قسەیەکی کوردەکانی لای ورمێ ئەڵێ: ((ئەگەر توشی عەجەم بوی بیکوژە، ئەگەر نەتوانی بیکوژی لەبەری هەڵێ، ئەگینا کەدەمی پێت گەیشت تەفرەت ئەدا)).

بەیتبێژەکانی کورد، بەپێچەوانەی نوسەرانی عەجەمەوە، لەبەیتە حەماسییەکانی خۆیاندا بەسوکی ناوی گەورەو سەرکردەکانی عەجەم ئەبەن‌و، بەشانازییەوە باسی بەرەنگاری کوردو سەرکردەکانیان ئەکەن.

دانەری نەناسراوی بەیتی دمدم، خانی لەپزێڕین‌و هاوڕێکانی بە((موسلْمان))و((تایەفەی غەزایی))و ((هەرچی بمرێ فیدایییە، هەرچی بکوژرێ غەزاییە))، کوژراوەکانی کورد بە((شەهید)) دائەنێ، کەچی لەشکری قزلباش‌و سەرکردەکانی عەجەم بە((تایەفەی کافری))و((کافری بێ ئیمان))و((بەفێڵ))و((مەلعون))لەقەڵەم ئەدا. کابرای بەیتبێژ بەداخێکی زۆرەوە کە لەناخی دەرونییەوە هەڵئەقوڵێ، ئەڵێ: ((ئەی دمدمی بەردی دەلان، جێگەی خان‌و خان ئاودەلان، ئێستا بوی بەمەسکەنی خەرتەلان))[١].

بەیتبێژێکی نەناسراوی‌تر لەگێڕانەوەی ڕوداوی کوشتاری بەکۆمەڵی باپیر ئاغاو هاوڕێکانی دا، پەسەنی باپیر ئاغا ئەدا، بە((نازدار))و((جندی))و((قوچاخ))و((ڕەنگ وەزیری ڕۆمییان))ی ناو ئەبا.

خـــۆیو هاوڕێکـــانی بـــە((ئیســـــلام))و((شــــێر))و عەجەمـــەکانیش بە((جەللاب))و((بێ ئیمـان))و ((کـافری مـەلعون))و((سـەگی غـەلیز))دا ئەنێ.

ئەم بۆچونە هەر لەخۆیەوە لەناو کـوردا دروسـت نـەبوە، بـەڵکو لەئـەنجامی کەڵەکەبونی تەجروبەی پشتاوپشـتی چـەند نـەوەی کـورد، کـە لـەژێر دەسـتی عەجەمدا ژیاون، پەیدا بوە. فۆلکلۆری کوردی گەلێك چیرۆکی تێدایە شـایەرەکان بە بەیت هۆنیویانەتەوە. لەسـەرئەوەی، چـۆن کاربەدەسـتێکی عەجـەم بەقسـەی خۆشو بەڵێنی دۆستایەتیو سـوێندو بـەقورئانی پـیرۆز، گەورەیـەکی کوردیـان لەشوێنێکەوە کەدەستی ئەوانی پێ نەگەیشتوە، راکێشاوە بۆ ناو داوێك کـەبۆیان ناوەتەوە، لەوێ بەبێ گوێدانە هیچ ئیعتبارێك کوشتویانە.

لێرەدا چەند نمونەیەك ئەهێنینەوە کەلەناو دەیان نمونـەی تـرا هەڵبـژێردراون، لەسـەردەمی جیـاوازو، لەشـوێنی جیـاوازو، لەسەردەسـتی بنەماڵـەی حـاکمی جیاوازدا رویان داوە، ئەتوانرێ تەنیا یەك ئەنجامیان لێ هەڵ بهێنجـرێ، ئـەویش ئەوەیە: ئەم روداوانە ناکرێ وەکو رەوشتی تەنیا یەك حوکمڕان یا رەفتاری تایبەتی یەك دەسەڵاتدار بۆ لەناوبردنی دوژمنەکەی سەیر بکرێ، بەڵکو ئەمە نـەریتێکی حوکمڕانی بوە، لەسەردەمی جیاوازدا پێڕەوی کراوە، بەشێك بوە لەجۆری بۆچـونی چینی دەسەڵاتدار بـۆ شـێوەی حـوکمڕانیو بـەڕێوەبردنی گـەلانی ژێـر دەسـتی، بەدرێژایی زەمـان دوبارە بۆتەوەو، جێگیر بوە، ئەویش سەرچاوەکەی ئەگەڕێتەوە بـۆ جــۆری پـــەروەردە کـــردنو پێگەیانـــدنی دینـــی کەرێگـــەی بـــەکارهێنانی سەرەتای((تەقیە))ی پێ داون، وە بۆ تێکشکانی سوپایی ئێران لەهەمو نەبـەردە گەورەکانی مێژوی درێژیدا.

## ٢-چاخی سەفەوی

•

### ١/٢ شا ئیسماعیلی سەفەوی

**نمونە١:**

**قزلباش لەڕوانگەی میری چەمشگەزەکەوە(٩٠٨ك)**

سیاسەتی کوردیی شا ئیسماعیل، وەکو پێش تر باسی کرا، لەسەر ٣ کوچکە دامەزرا بو:

١-لادانی سەردارەکانی کورد لەمیرایەتیو مەڵبەندەکانی خۆیانو، دانانی سەرانی قزلباشو هۆزەکانیان لەجێگەی ئەوان.
٢-زۆرکردن لەسونەی کورد بۆ گۆڕینی مەزەبی خۆیان.
٣-بەکارهێنانی توندوتیژی لەگەڵ خەڵكو مەزنەکانیان لەسەردەمی دەسەڵاتی ئاق قۆینلۆی تورکماندا، گەلێ لەئەمیرو مەزنەکانی کورد دەسەڵاتی میرایەتییان لەدەس دابو، کاربەدەستی تورکمان جێگەکانی ئەوانیان زەوت کرد بو، لەگەڵ ئەوەش دا هێشتا لەهەندێ شوێنی کوردستاندا گەورەو مەزنی کورد دەسەڵاتدار بونو، لەکاروباری ئەو سەردەمەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، سوڵتانو شاهەکان حسابیان لەسەر ئەکردن، لەناو ئەوانەدا حاجی رۆستەم بەگی گەورەی چەمشگەزەك، شا رۆستەمی لوڕ، زاهید بەگی هەکاری..هتد.
لەکاتێکا هێشتا تازە ئەستێرەی شا ئیسماعیل خەریك بو ئەکەوتە درەوشانەوە، چارەنوسی خۆیو دەوڵەتە تازەکەی دیار نەبو بەچی ئەگا، سوڵتان بایزیدی عوسمانی(٨٨٦-٩١٨ك)هەواڵەکانی بزوتنەوەی قزلباش لەحاجی رۆستەم بەگ ئەپرسی. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەی مەزنایەتی ئەو سەردارە کوردەیە، کەئەو کاتە میری چەمشگەزەك بوە. بەگوێرەی نامەکەش ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رۆستەم بەگ ئەبێ هاوسنوری ناوچەی جموجۆڵی قزلباش بوبێ. لەبەرئەوە داوای لێ ئەکا دەنگوباسی راستو هەواڵی رووداوەکانی ئەوێو، ئەنجامی دوژمنایەتی قزلباشو کاربەدەستانی دەوڵەتی بایندوری بۆ بنوسێ.
نامەی سوڵتان بایەزید
(امیر معظم، کبیر مفخم، ذوی القدر الاتم والمجد الاشم، ملکی الصفات، فلکی الذات، حارس محاسن الشیم، صاحب الطبل والعلم، المختص بعنایه باری النسم،
حاجی رۆستەم بەگی مکرم، دامت معالیه
سەلامی عاتیفەت پەیام کە لەچاودێریی شاهانەوە برژێ، متاڵەعە بفەرمونو بزانن،
ئەو ماوە درێژە دوژمنایەتی جەماعەتی قزلباش لەگەڵ ئەربابی دەوڵەتی بایندوری بەچ ئەنجامێ گەیشتوە، علی ماهو الواقع، مەعلومی نوابی کامیابی خاوەن ئیقتیدارو، مەعروزی عەتەبەی عەلیەی فەلەك میقدارو، حەزرەتی بزورگەواری ئێمە نەبوە.

وا بۆ زانینی هەواڵ، هەڵگری نوسراوی ناوازە، پێشەنگی هاورێکانی، کێوان چاوش، نێردرایە ئەوێ. شوێنی ژیانی ئێوەش کەبەو مەڵبەندانەوە نوساوە، ئەبێ ئێوە بەتەواوی ئاگاداری راستیی هەلومەرجی ئەوێ بن.

هەرکە هەڵگری نوسراوی شەریف بەشەرەفی دیدەنی مشرف بو، لەدەنگوباسی راستو روداوەکانی ئەوێ هەر چیتان بۆ ساغ بۆتەوە، بەهۆی ناوبراوەوە، بەنوابی کامیابی ئێمەی رابگەیەنە.

ئەم کارەش بەمایەی چاودێری شاهانەی ئێمە بزانە، هەرچیتان بۆ دەرکەوتوە وەکو خۆی بێ زیادو کەم، رێوشوێنی راستگۆیی بەجێ بهێنە، لە١ی ربیعیی ٩٠٨دا نوسرا[٢].

وەڵامی حاجی رۆستەم

وەڵامەکەی حاجی رۆستەم تا رادەیەکی زۆر هەستو هەڵوێستی یەکێ لەگەورەترین مەزنەکانی ئەو سەردەمەی کورد دەرئەبڕێ:

((ئەخرێتە بەر بیری جیهانئارای نێردراوی دەرگای پەنای گیتی، اعلی الله شان صاحبه کە"

فەرمانی قەزا جەرەیان، نفذه الله الملك المنان، بەسەرکردەی هاووینەو هاودەمانی کیوان چاوشدا، زید قەدرە، وەکو مەلی هەرە بەرزی دەوڵەتو کۆتری بورجی بەختیاریی شەرەفی نیشتنەوەی هەبو، بەهاتنی خۆشبەختانەی پلەوپایەی هەورازتر برد، بۆ بەجێهێنانی سوپاس وتی: (بەیت)

ئەگەر خۆر بەهۆی چاکی خۆیەوە، گەردێ لەخاك هەڵ بگرێتەوە،
بەوە نەك هیچی لێ کەم نابێتەوە، بەڵکو تەواو تر ئەبێ.
والحمدلله الذی هدانا لهذا.

ئەوەی لەهەواڵی قزلباشی، مەزەب خراش، خوا بەلەعنەتیان بکاتو لەناویان بەرێ. پرسیارتان فەرمو بو، چیرۆکی ئەو طایفە باغیە ئێستا بەجۆرەیە:

گەزەندی بە ئەلوەند خان گەیاندوە،
لەوێوە چوە بۆ عیراقی عەجەم، مراد خانی شکاندوەو راوناوە،
لەعیراقی عەرەب بەربۆتە کاری پرناکییەکان
لەگەڵ چەرکەسەکانی میسردا ئاشتیو یەکێتی کردوە،
ئێستاش بەنیازی پەلامارداني دیاربەکرو مەرعەشە.

هەلومەرجی ئێران بەهۆی بێ دادی ئەوانەوە پەرێشانو، زۆری وڵاتو مەڵبەندەکان لەبەر زوڵمو زۆری ئەوان وێران بوە. لەفەزڵی یەزدان ئومێد ئەکرێ کەسەرکوت کردنو لەناوبردنی گروهی باغییان، بەگورزو سەنانی غازییانو،

تیغی خوێنپڕێنی موجاهیدانی خوداوەندگاری ئیسلامییانو، شاهنشاهی زەمـان، مەیسـەرو مقـدەر بـێ. ئینشـائەڵڵا تـەعالا. بـاقی فـەرمان بەئـەمری عـالی سپێردراوە))[٣] .

سەرەڕای ئەم ئاگادارییە گرنگە سوڵتان بایەزیـد هـیچ هـەنگاوێکی جـدیو کاریگەری نەنا بۆ ڕێ برین لەپێشڕەوی شا ئیسماعیل. ئـەو ئومێـدەی بـەگورزو سەنانی غازییانی خوندکاری ئیسلام هەبو نەهاتـە دی. بـەڵکو حـاجی ڕۆسـتەم خۆیشی بەر ئەو((بێ دادی))یەکەوت. نور عـەلی خەلیفـەی ڕۆملـو، سـەرداری نـاوداری قزلبـاش، ئـەرزنجانو ناوچـەکانی دەوروبـەری گـرت. حـاجی ڕۆبسـتەم، ئێلەکەیو مەڵبەندەکەی کەوتە ژێر دەستی قزلبـاش خـۆیو سـەرانی ئێلەکـەی دورخرانەوە بـۆ عێراقـی عەجـەم. کاروبـاری ناوچـەکەیو پارێزگـاری قـەڵاکانی بەسـەرانی قزلبـاش سـپێردرا. دوای تێکشـکانی شـا ئیسـماعیل لەجـەنگی چاڵدیراندا، حاجی ڕۆستەم هەڵی بۆ هەڵکەوت بگەڕێتەوە بەرەو وڵاتەکەی خـۆی. بەڵام بەخت یاریدەی نـەدا. لـەوێدا بـەر((بێـدادی))یـەکی گـەورە تـر کـەوت. لەکاتێکا سوڵتان سەلیم بەخۆیو لەشـکرەکەیەوە بـەرەو تـەورێز ئەچـو، حـاجی ڕۆستەم لەشوێنێکا بەناوی یام سەر بەمەڵبەندی مەرەند خـۆی گەیانـدی، یـاوز سەلیم لەباتی بەخێرهێنانی فەرمانیدا هەر لەوێدا ئەو و کوڕەزاکەیو چل کەس لەمەزنەکانی ئێلەکەیان کوشت[٤].

**نمونە٢:**

**کورد لەروانگەی قزلباشەوە(٩١٢ك)**

نوسەری((شرفنامە))نوسیوێتی:

((جاری دوەم کە شا ئیسماعیل بۆ بەسەربردنی زستان لەخوی هەواری خست، ئەمیر شەریف لەگەڵ ئەمیرو حاکمەکانی کوردستان بەتایبـەتی مـەلیك خـەلیل حاکمی حەسەنکێفو شا عەلی بەگی بوختی والی جزیرەو، مـیر داودی خیزانـیو، عەلی بەگی ساسونیو، ئەمیرەکانی تر یـانزە کـەس بـۆ ماچـکردنی بـەردەرگای شاهی چون بۆ خوی. کـە بەشـەرەفی سـەدرە بوسـی گەیشـتن لەسـەرەتادا ڕێـزو حورمەتی تەواو گیران...

لەم کاتەدا کەئەمیرەکانی کورد بەکۆمەڵ ڕویان کردبوە دەرگای شـاهی، خـان محەمەد لەدیار بـەکرەوە عـەرزی کـرد کەئەگـەر فـەرمانی گـرتنو بەسـتنەوەی ئەمیرەکانی کوردستان جێبەجێ بکرێ، بەندە بەڵێن ئەدا زۆری وڵاتی کوردسـتان، کە لەرۆژانی کۆنەوە کەمەندی تەسخیری سوڵتانەکان لەداگیرکردنی ناتەوان بـوە، ئەتوانم بەکەمێ چاودێری شاهانەوە هەموی بگرم. کاتـێ ئـەم پێشـنیازە کەوتـە

بەرچاوی شا، لەسەر قسەی ئەو((ناموقەیدی کافرە))جگە لەئەمیر شا محەمەدی شیرویی‌و عەلی بەگی ساسۆنی، هەمو ئەمیرەکانی گرت‌و زنجیری کردن، هەر یەکێ لەئەمیرەکانی کوردی بەیەکێ لەئەمیرەکانی قزلباش سپارد. ئەمیر شەرەفی بە ئەمیر خانی موسڵ‌و داو چاپان سوڵتانی بۆ گرتنی ولایەتی بدلیس‌و دیو سوڵتانی رۆملۆی بۆ فەتحی ولایەتی هەکاری ویکان بەگی قورچی باشی تکەلوی بۆ گرتنی دیاری جزیرە بەلەشکری وەك دڵۆپە بارانی بێ ژمارەوە نارد...))[٥].

مەزنەکانی کورد بەگیراوی گل درانەوە، رێگە نەدران بگەرێنەوە شوێنەکانی خۆیان، تا هێرشی ئۆزبەك بۆ سەر خۆراسان دەستی پێ کرد و شا ناچاربو خۆی سەرکردایەتی لەشکرەکەی بکا. لەو ماوەیەدا شا هەندێکیانی بەرداو هەندێکیشیانی گل دایەوە تا هەلیان بۆ هەڵکەوت‌و هەڵاتن.

**نمونە٣:**

**صارمی موکری" کۆنە گاوری یەزیدی(٩١٢ك)**

لەسەردەمی ئاق قۆینلودا، ناوچەی موکریان وەکو مەڵبەندەکانی تری کوردستان کەوت بوە ژێر دەستی ئیلات‌و سەرانی تورکمانەوە، کاتێ ئەمیرەکانی بایەندوری بەربونە گیانی یەکتری، میرە لێخراوەکانی کورد کەوتنە خۆ بۆ دەرکردنی تورکمان‌و دامەزراندنەوەی دەسەڵاتی خۆیان. ئەمیر سەیفەدینی موکری هەندێ لەئێلە کوردەکانی کۆکردەوە، هەڵی کوتایە سەر ئیلی چابقلوی تورکمان کەناوچەی دریاسیان لەبەردەس‌دا بو. لەوێ دەری کردن. بەشێنەیی دەسی گرت بەسەر ناوچەکانی دۆڵ باریك‌و ئەختاجی‌و ئەیلتمورو سلدوز دا. میرایەتییەکی لەموکریان دامەزراند. کەمرد دو کوڕی لەپاش بەجێ ما" صارم‌و بابە عومەر. صارم لەکاروباری حوکمڕانی‌دا جێگەی باوکی گرتەوە. مردنی میر سەیفەدین‌و دەرکەوتنی صارم، هاوزەمان بو لەگەڵ سەرکەوتنی شا ئیسماعیل‌دا.

صارم خان ئەی ویست پارێزگاری سەربەخۆیی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی بکات، شا ئیسماعیلیش ئەی ویست ناوچەکە بهێنێتە ژێر فەرمانی خۆیەوە. بۆ ئەو مەبەستە شا ئیسماعیل چەند جارێ لەشکری گەورەی ناردە سەری بێ ئەوەی هیچ سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بەدەس بهێنێ.

شەرەف خان لەو بارەیەوە نوسیویێتی، کورتییەکەی لێرەدا ئەنوسینەوە:

((کەصارمی کوڕی سەیفەدینی موکری لەجێگەی باوکی دانیشت، شا ئیسماعیلی سەفەوی بەنیازی داگیرکردنی ولایەتی موکری سەرکوت کردنی ئەوانە چەند جارێ لەشکری ناردە سەریان. لەبەینی ئەو وقزلباش‌دا چەند جارێ

شەڕوشۆڕ قەوما. هەمو جارێ صارم سەرئەکەوت و قزلباش تێ ئەشکان. تا لەمانگەکانی ساڵی ٩١٢دا کەشا ئیسماعیل بۆ بەسەربردنی زستان چو بۆ خوی، ئیلی شاملۆی بەسەرداری عەبدی بەگی باوکی دورمیش خان و صارو عەلی مهردار بۆ جەنگی صارم نارد. هەردو سەردار بەلەشکری بێ ژمارەوە چونە سەر صارم. شەڕێکی زۆر گەورە قەوماو هەردو سەردار لەگەڵ خەڵکێکی زۆر لەپیاوە زلەکانی شاملۆ لەو شەڕەدا کوژران. صارم بە سەریاندا زاڵ و سەرکەوت.

سەرەنجام لەگەڵ ئەمیرو حاکمەکانی تری کوردستاندا سەری بۆ سوڵتان سەلیم دانەواندو لەدەس قزلباش رزگاری بو.

کەسوڵتان سلێمانی قانونی چوە سەر تەخت، صارم بۆ دەربڕینی دڵسۆزی و گوێڕایەڵی خۆی سەردانی سوڵتانی کرد. ئەویش دڵنەوایی کرد. هەمو ئەو شوێنانەی لەباوکییەوە بۆ ئەو بەجێ مابو دایەوە بەخۆی و، فەرمانی سوڵتانی بۆ دەرچو.

صارم دوای گەڕانەوەی لەسەردانی سوڵتان سلێمان بەماوەیەکی کورت مرد، ٣ کوڕی لەپاش بەجی مان" قاسم و ئیبراهیم و حاجی عومەر، لەبابە عومەری براشی رۆستەم و، لەرۆستەمی برازاشی ٣ کوڕ کەوتنەوە،" شێخ حەیدەرو میر نەزەرو میر خضر))[٦] ئەمانە هەریەکەیان بەجۆرێ لەروداوەکانی ناوچەکەدا دەرکەوتن.

شەرەف خان روداوەکانی بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە، بەڵام نوسەرێکی عەجەم، لەکتێبی((تاریخ عالم ارای صفوی))دا کەبۆ ژیان و شەڕەکانی شا ئیسماعیلی تەرخان کردوە، هەمان روداو بەجۆرێکی تر ئەگێڕێتەوە، کەهەم باری سەرنجی رەسمیی دەربارەی ئێرانی دەرئەبڕێ و، هەم جۆری نۆڕینی عەجەم لەکوردو تەقەلاکانی بۆ رزگاری رون ئەکاتەوە. نوسەری((عالم ارای صفوی))هێرشی لەشکری قزلباش بۆ سەر ئێلەکانی موکریان بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:

((لەلای تەورێزەوە نێردراوێ هات وتی: ئەی شەهریار صارم خانی پادشای کوردستانی چکاری(رەنگە مەبەستی موکری بێ،و) لەگەڵ ئێلەکانی کوردستان بیستویانە کەمحەمەد کرهی یاخی بوەو شا ئیسماعیل چوە بۆ یەزد. ئەویش تەپڵی هەڵگەڕانەوەی لێداوە، ٤٠ هەزار کەسی پێش خۆی داوە چۆتە سەر سوڵتان ئیبراهیمی برای شا بۆ گرتنی تەورێز. کەگەیشتە هۆزی ئورملو قەراگونە سوڵتان بە ٣٠٠ کەسەوە حاکمی قەڵای ئورملو بو. صارم خان هاتە سەر قەڵای ئورملو. کەنێردراوەکە ئەم هەواڵەی هێنا شا ٣ هەزار کەسی بەسارو حسێن شاملۆدا لەئەسفەهانەوە بۆ تەورێز نارد. ئەو(سارو حسێن)لەلەی شازادە بو، بۆ

ئەوە چو بۆ تەوریز چونکە شازادە نەزانو شارەزای شێوەی جەنگ نەبو. بە پەلە خۆی گەیاندە تەوریز هەواڵی صارم خانی لەشازادە پرسی. ئەو(شازادە)وتی: ماوەی مانگێکە لەبەردەمی قەڵای ئورملۆدا لەگەڵ قەراگونە لەشەڕدایەو، لەم لایەوە تەنگی بە قەراگونە هەڵ چنیوە. خەڵکی ناردوە بۆ لای صارم خان، کە ڕێگەمان بدە بچین بۆ تەوریز. صارم خان بەڵێنی دایە ئەگەر ئەو قەڵاکە بەدەستەوە بدا با بەماڵەوە بڕوا بۆ تەوریز. لەبەرئەوەی سوێندی بۆ خوارد، ئەو لەقەڵا دەرچو. فەرموی کوردان لەدواوە هاتن هەمویان کوشتو ژنو منداڵی ئەو جەماعەتەیان بەدیل گرتو گەڕانەوە. هەواڵ بەسوڵتان ئیبراهیم گەیشت کە صارم خان قەڵای ئورملوی گرتوەو روی کردۆتە تەوریز.

شازادە لەگەڵ سارو سوڵتانی مهرداری لەلەی بەچاکیان زانی بەرەو روی صارم خان بڕۆن. ئەگەر بێت تەوریز تالان ئەکا. سارو خانی لەلەی وتی: من ٣ هەزار کەسم لەگەڵ خۆم هێناوە، تۆش ٤ هەزار کەست لەگەڵە، ٣ هەزار کەسیش لەخەڵکی تەوریز کۆئەکەینەوە، بە١٠ هەزار کەسەوە ئەڕۆین سەر ڕێ لە صارم خان ئەگرین. وا پێکهاتن، لەتەوریز دەرچوونو گەیشتنە خوی(لە نوسخەیەکی ترا سەلماس نوسراوە). سارو سوڵتانی صارم خان هاتە مەیدانو پیاوی خواست. شازادە ئەیویست خۆی بۆی بچێتە مەیدانەوە. بەڵام لەلەکەی ڕێی نەداو نەی هێشت، خۆی بۆی دابەزییە مەیدان. سارو سوڵتانی کوشتو سەری بڕی. ویستی بیباتە خزمەتی باوکی. لەو کاتەدا شازادە ئەسپەکەی لنگ دا، خۆی گەیاندە ئەو وکوشتیو سەری بڕی. ویستی لەگەڵ سەری لەلەکەی بیهێنێتەوە. لەو کاتەدا صارم خان لەتاو خوێنی کوڕەکەی ئارامی لێ هەڵگیرا، نەی هێشت ئیتر کەسی بچێتە مەیدانەوە.

ئەو بەد گەوهەرە لەتاو خەمی کوڕەکەی، خۆی هاتە مەیدانەوە. دوای ئەوەی زانی ئەوە شازادەیە وتی: ئەبێ دڵی براکەت بەمەرگی تۆ بسوتێنم، هەروەکو تۆ دڵی منت بەمەرگی کوڕەکەم سوتاند. شازادە نەڕاندی، هەردو تاویان دایە نێزە، ئەوەندە یان شەڕە نێزە لەگەڵ یەکتری کرد، تا نێزەکانی هەردوکیان شکا. ئەوسا دەستیان دایە تیرو کەوان ٣ تیریان گرتە یەك. صارم خان لەتیری سێیەم دا وڵاخەکەی شازادەی پێکا. بێ وڵاخ مایەوە. دەسبەجێ هەستا دەستی برد بۆ تیغی حەیدەری ڕەگەزی زولفەقارو لەکێلانی دەرهێنا. تا صارم خان چو تیرێکی تری تێ بگرێ، شەهریار جێگەی خۆی گۆڕی بو. تیرەکەی لەئەرزیدا. شازادە خۆی گەیاندێ، تیغێکی لەملی وڵاخەکەیدا سەری پەڕاند. لەهەر دو لاوە وڵاخیان تاو دایەوەو، سەر لەنوێ سواربونەوە. بەشیری روتەوە پەلاماری یەکتریاندا. ئەو کۆنە

گاوره یەزیدییە(مەبەستی صارم خانە) شمشێرێکی لەقوببەی سپەری شازادە سرەواند، سپەرەکەی قلیشان‌و سەر سنگی سمی لەوێوە لەزینە زێرینەکە دا ئەسپەکەی بریندار کرد.

صارم خان لەوڵاخەکەی دابەزی، قزلباش رژانە مەیدانەوە، جەنگێکی گەورە رویدا، تا عەسر شەڕ درێژەی کێشا. قزلباش ئەو رۆژە پیاوەتی‌و جوامێرییان نواندو، شازادەیان هەڵگرت‌و گەڕانەوە بۆ تەورێز.

صارم کەوتە داوا لەکوردەکانی خۆی وتی: ئەی گەلی نامەرد، چەن قزلباشی هەر چواریەکی ئێوە ئەبون ٣ هەزار کەسیان لێ کوشتن، نەتان توانی پێشیان بگرن‌و خوێنی کوڕەکەمیان لێ بسێننەوە.

ئەوانیش وتیان: قزلباش ئادەم نین، گوایە ئەوانە لەشیان لەپۆڵا داڕێژراوە، مەگەر چاوت لێ نەبو بە چ جۆرێ خۆیان ئەدایە بەردەمی شمشێر؟

لەو لاشەوە شا ساروخانی مهرداری ناردو هات بۆ قەزوین‌و عەبدی خانی شاملۆی بە٤ هەزار کەسی ترەوە لەقەزوینەوە رەوانە کرد. هۆیەکەشی ئەوەبو کەئەمیرە موزەفەر پادشاهی رەشت بەهان دانی تاقمی تورکمان، کە ٤ هەزار کەسیان لەجەنگی ئەلوەند شا هەڵات بون‌و چوبونە گەیلان‌و دابویانە پاڵ ئەمیرە موزەفەر. ئەوانیش بیست بویان صارم خانی یەزیدی لەکوردانی چکاری یاخی بوەو، لەلای یەزدو ئەبرقوشەوە محەمەد کرهی یاخی بوە، وتیان بۆچی ئێمەش قەزوین نەگرین. ئەو گەوجە وتی باوکم ماوەی ساڵێك شای لەگەڵ سۆفیەکانی لەمولکی رەشتدا حەوانەوە، من بۆچی ئەو ئاشنایەتییە تێك بدەم.

لەم لایەوە شا سوپای کۆکردەوە چوە سەر رەشت‌و، عەبدی خانی بۆ لای تەورێز نارد. کەعەبدی خانی شاملۆ گەیشتە تەورێز، بیستی شازادە چوە بۆ بەرەنگاریی صارم خان، ئەویش چوە ناو تەورێزو بەدویاندا کەوتەڕێ. کە گەیشتە سۆفیان، بینی شازادە بەبرینداری دێت‌و ١٥٠٠ کەسی لێ کوژراوە. شازادەی گێڕایەوە. هەر لەو شوێنەدا بارگەیان خست.

رۆژی دوەم صارم خان دەرکەوت‌و ریزیان بەست. ئەردوان بەگ، کوڕەکەی تری، ئیزنی لەباوکی خواست هاتە مەیدانەوە، داوای مەردی مەیدانی کرد. عەبدی خان بەگ شازادەی برینداری لەپای ئالاکەدا دانا. خۆی لەلایەکەوە راوەستابو کەوڵاخەکەی لەجێی خۆی لنگ دا، هەر کەگەیشتە مەیدان، پاش گفتوگۆ، تیرێکی گرتە عەبدی خان. لەناوکی داو لەئەسپەکەی گلا. دورمیش خانی کوری ئاخێکی هەڵکێشا، ئێخەی خۆی دادڕی بۆی چوە مەیدانەوە، ئەو ئەیویست

دابەزێو سەری ببڕێ ئامانی نەداو نەڕانی: ئەی دەسرەش! ئەگەر پیاوی لەگەڵ لاوان بجەنگە، لێدانی پیرەمێردی هەفتا ساڵە پیاوەتی نیە.

ئەو وتی: ئەوە باوکت بو؟

وتی: بەڵێ ئەو چو قسە بکا، کەوتە جنێودان، وتی: ئەی ناپیاو راوەستە وابۆت هاتم! تیرێکی تری نایە ناو کەوانو هاوێشتی. دورمیش خانیان بینی بەپشتا لەسەر ئەرز راکشا بو. ئەو تیرە بەسەر سنگیا تێپەڕی. ئینجا راست بوەوە. ئافەرینو تەحسینی ئەو لەهەردو سوپاوە هەستاو خۆی گەیاندێ. تیغێکی وەهای سرەواندە قوبەی سپەرەکەی تا ناوکی هەڵدڕی.

ئەوسا صارم خان وتی: مەهێڵن. کوردان لەجێی خۆیان بزوتنو ئەو ۲ هەزار کەسەی سوپای شاملۆش بۆ یارمەتی دانی دورمیش خان ئەسپیان تاو دابوو, ناو مەیدان. بەربونە یەکتری.

با ئەمان لەم جەنگی مەغلوبەیەدا بەجێ بهێڵین. گوێ بۆ هەواڵی شا ئیسماعیل رادێرە. هەر کە گەیشت بوە گەیلان، جاسوسەکان هەواڵی گەیشتنی شایان بۆ ئەمیرە موزەفەر برد بو. ئاهێکی هەڵکێشا. لەسەردارەکانی خۆی پرسی: ئێمە ئەبێ چی بکەین؟ ئەوانیش وتیان: ئەبێ جەماعەتی تورکمان بنێرینە سەر رێی شاو، خۆت لەبۆسە دابی. ئەگەر شتێکیان پێ کرا باشە، ئەگینا هەڵێ بۆ فومن، بەڵکو شا بەدوت نەکەوێ.

ئەو گەوجە، تورکمانەکانی بانگ کرد پێی وتن: ئێوە بڕۆن لەکەناری بەغداد رێ لەشا بگرن، تا منیش بەلەشکرەوە بەدواتانا بێم. ئەوانە رۆیشتن بەڵام لەرێ کەبیستیان چ باسە. خۆیاندا بەجەنگەڵدا. هەڵاتن شا هاتە رەشت. لەبەرئەوەی ماڵەکەیان دەورەدا بو، هەواڵیان هێنا کەبۆ فومن هەڵاتوە. شا چو بۆ فومن. لەوێش کەئەوەی بیست بوو هەڵات بو بۆ ناو جەنگەڵ. شا کەگەیشتە فومن، وتیان: دوێنێ رۆیشت بۆ ناو جەنگەڵ. شا فەرموی چۆن بهێڵم، لەولاشەوە ئەمیرە موزەفەر چو بوە لای ئەمیر زەینەدین، ئەوی دەرسی فێربونی قورئانی بە شا گوت بو. وتی: جگەلە تۆ کەسی کە ناتوانێ لەلای شا تکام بۆ بکا، چونکە تۆ مافی فێرکردنت لەسەری هەیە، بچۆرە خزمەتی شا، بەڵکو لێمان ببورێ. ئەوسا ئەو هەستا کاتێ گەیشت شا لەباسی ئەودا بو کەمیر گەیشت کەلامی خوای بەدەستە بو. شا کەئەوەی دی تەعزیمی بۆ کەلامی خوا کرد. وتی: باوکە لەکوێ بوی؟ وتی: ئەی شەهریار! ئەم پیرە نۆکەرە بۆ تکای ئەمیرە موزەفەر هاتوە، تو هەقی ئەم کەلامە لەقسوری ببورە. شا ئەوسا وتی: لەبەرئەوەی تۆ مافی فێرکردنت لەگەردنی من دایە، ئەوم بەخشی، بەڵام بەو مەرجەی ئەو تاقمەی

ئەویان فریو داوە، بەدەستی بەستراو خۆشی شمشێر بخاتە گەردنی‌و بێت. میر وتی: ئەی شەهریار بڕۆم‌و بیهێنم؟ بۆی نوسی کەبێت‌و سێ چوار کەس کەتۆیان فریو داوە لەگەڵ خۆت بهێنە چونکە شا داوای کردون. دوای ئەو فەرمویان ئەو جەماعەتەیان گرت. خۆیشی تیغ‌و کفنی هەڵگرت. هاتە خزمەتی شا، پێی شای ماچ کرد. شا ئەوی بەخشی‌و لەملی ئەو جەماعەتەشی‌دا. هەواڵی تورکمانەکانی پرسی: وتی: رایان کرد. شا فەرموی: کاتی راوەستانم نیە. ئەگەر ئەوانت گرت بیان کوژەو سەرەکانیان بۆ من بنێرە. خۆیشی بەسواری لەرێی ئەردەبیلەوە یەغار بەرەو تەورێز کەوتە رێ لەقەزوینەوە بە١١ رۆژ چو بۆ گەیلان‌و لەوێوە خۆی گەیاندە تەورێز.

لەکاتێکا ئەو گەیشت، قزلباش تەنگیان پێ هەڵچنرا بو، دورمیش خان‌و بیرام خان بریندار بون. لەبەغیرەتی دا تاویان ئەدایە بەرخۆیان‌و لەعاری هەڵاتن ئەترسان. لەو کاتەدا لەلای بیابانەوە، ئاڵای سپی هەژدیها پەیکەری شەهریار دەرکەوت‌و دەنگی نەرەی ئەو شەهریارە هات. گیان هاتەوە بەر لاوانی قزلباش. هەرکە شا گەیشت، خۆی‌دا بەو کوردە یەزیدییانەدا. لەو شەرە دا صارم خان توشی شەهریارە بو. بە تورەییەوە شمشێری هەڵکێشا. لەناوقەدی داو دونیمەی کردو، ناردی بۆ دۆزەخ. سوپای کوردەکان شکاو مستەفا خانی مەحمودی لەمەیدان هەڵات‌و ٦ سەرداریشیان بۆ شوێنەکانی خۆیان هەڵاتنەوە. شا براکەی دەس کەوتەوەو دورمیش خانی لەباوەش گرت‌و، وتی: پیاوەتی بۆ تۆ حەڵاڵە. بەفەرزەند ناوی برد. بەفەتح‌و نەسرەتەوە چونە دار السلطنەی تەورێز))[٧].

پاش تێپەڕینی چەند قەرن بەسەر ئەم روداوەدا، نوسەرێکی هاوچەرخی عەجەم کەخۆی بە نەوەی شاهانی سەفەوی دائەنێ. هەمان روداو بەهەمان گیانی نازانستییەوە ئەگێڕێتەوەو، ئەنوسێ:

((پاش ئەنجامدانی ئەو کارانە ئوردو لەهەمەدانەوە بەرەو قزل ئوزون کەوتە رێ، لەو شوێنانە بو بەعەرزی پادشای سەفەوییان راگەیاند، کابرایەك بەناوی صارمی کوردەوە تاقمێکی لەئەوباش‌و رێگرەکانی ناوچەکانی کوردستان کۆکردۆتەوە، لەنزیك مەڵبەندی گەروس سوپاگایەکی بو خۆی دامەزراندوە، باج‌و خەراج لەهەمو جوتیارو زەویدارەکانی ئەو ناوە وەرئەگرێ‌و، کاروان‌و قافڵەکانی روت ئەکاتەوە.

شاە ئیسماعیل خۆی بۆ غافڵگیر کردنی صارمی کورد هێرشێکی شەوانەی ناکاوی کرد، بەڵام کوردی ناوبراو لەپێش گەیشتنی مەوکیبی شاهانەدا باروبنەی خۆی بەجێ هێشت بو رێی هەڵاتنی گرت بوە بەر، هەمو شتەکانی کەوتە دەس

لەشكرییانی قزلباش‌و، تاقمێكیش لەدەسوپێوەندەكانی ئەو، كەرێگەی هەڵاتنیان ئەپێوا بەدەستی راونەرانی قزلباش لەناو بران، ئینجا مەوكیبی شاهانە سەبارەت بەوەی هەواڵ هات بو كە ئەمیر حسامەدین حاكمی گەیلان...))[٨].

هەمان نوسەر لەگێرانەوەی تێكهەڵچونی قزلباش‌و صارمی كوردا، ئەنوسێ:

((لەوەرزی بەهاری ساڵی ٩١٢دا ئۆردو لەگەرمیانی تارمەوە روی كردە زۆزانی سوڵتانیە، ماوەیەك لەو ناوچە خۆشەدا بەئەسپ سواری‌و تیر هاوێشتن‌و ئاداب‌و رسومی رۆژانی جەژنەوە خەریك بو، ئینجا روی كردە لای خوی، لەبەرئەوەی هەواڵ هات بو كەصارمی كورد دیسانەوە تاقمێكی لە ئەوباش‌و ئەشراری كورد لەدەوری خوی كۆكردۆتەوە، لەناوچەی ورمێ كەوتۆتە فیتنەو فەساد. شا ئیسماعیل بیرام خانی قرامانلوو خادم بەگی خەلیفەی بۆ سەركوت كردنی صارمی كورد نارد.

سەردارانی ناوبراو پەلاماری كوردانی یاخییاندا، صارم‌و لایەنگرەكانی لەناوچەی ورمێوە رایان كرد بۆ مەڵبەندی كوردستان، سوپاكەی بردە شوێنێكی قایمەوە كەوت بوە سەرلوتكەی شاخی، بەڵام ئەو لەشكرەی مەئموری دواكەوتنی بو، ئێخەیان بەرنەدا، گەیشتنە سەری، صارم لەوێدا بە لەشكرەكەی خۆیەوە كەوتە بەرەنگاری، تێكهەڵچونێكی سەخت لەبەینیاندا قەوما، لەهەر دولا تاقمێ كوژران لەوانە دو كەس لەسەردارانی بەناوبانگی قزلباش یەكێكیان عەبدی بەگی شاملۆو ئەوی كەیان سارو عەلی مهردار تكەلو، بەڵام سەرەنجام فەتح و زەفەر بۆ هێزی قزلباش بو. هەرچەند صارم خۆی لەمەیدانی شەڕدا بەساغی دەرباز بو، بەڵام كورەكەی لەگەڵ براكانی‌و هەندێ لەسەردارەكانی لەشكرەكەی گیران، خەڵكێكی زۆری لێ كوژرا، هەمو ئیل‌و عەشیرەتی صارم تالان كران، بیرام بەگ‌و خادم بەگی خەلیفە بەسەركەوتویی‌و زاڵی گەڕانەوە بۆ ناو ئۆردو، لەكاتی گێڕانەوەی هەواڵەكانی ئەو شەڕەدا هەندێ شتیان لەسەر گوستاخی‌و رەفتاری پیسی كوردەكان عەرزی پادشا كرد, كەئاگری تورەبونی خۆش كردو، فەرمانی كوشتنی هەمو دیلەكانی دەركرد))[٩].

**نمونە٤:**

**كوردێكی یەزیدی كلكدار(٩١٤ك)**

شا ئیسماعیلی سەفەوی ئەمیرەكانی ئاق قۆینلوی یەك لەدوای یەك شكان، هەندێكی كوشتن‌و هەندێكی راونان، مراد میرزای كوڕی سوڵتان یەعقوب لەبەردەمی هێزەكانی قزلباش دا بەتێكشكاوی لەشیرازەوە هەڵات بۆ بەغداد كەهێشتا لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی بایندوریدا مابو، مراد هانای بۆ سوڵتانی

عوسمانیو، عەلاء الدولـە زولقـەدرو، قانصـوە الغـوری سـوڵتانی میسـر بـرد، هیچکام لەوانە بەدەنگییەوە نەچون. مراد لەیارمەتیو پشتیوانی ئەوانە نائومێد بو، خۆیشی بەتەنیا بەری پێشرەوی قزلباشی پێ نـە ئـەگیرا. بەغـدادی بـەباریك بەگی پڕناك سپاردو خۆی روی کردە دیاربەکر. شا ئیسـماعیل وای بەچـاك زانـی بەرلەوەی بچێتە سەر خۆراسان، دوایین بنکەی دەسەڵاتی تورکمانانی ئاق قۆینلـو هەڵکەنێو، لەخەمی ئەوان دڵنیا بێ. ئیسماعیل خۆی لەهەمەدان بوو پێشەکی خەلیل بەگی یساوڵی، کەیەکێ لەسەرانی دڵسۆزی قزلباش بو، ناردە لای باریـك بەگ، بۆ ئەوەی بەخۆشی بیهێنێتە ژێر دەسەڵاتی شای سەفەوییەوە. باریـك بـەگ کەبەوەی زانی تاقمـێ لەدەسـوپێوەندەکانی خـۆی بەدیارییـەکی زۆرەوە نـارد بـۆ پێشوازی خەلیل بەگو نێردراوەکانی شا. ئەوانـە تـا نزیـك خانـەقین بەپیریانـەوە چون. باریك بەگ رێزی زۆری لەنێردراوەکانی شا گرت، بەڵام وەکو ئەوان داوایـان لێ کرد. ئەم خۆی ئامادە نەبو بچێ بۆ لای شا[١٠].

گرتنی بەغداد بۆ شا ئیسماعیل لەچەن لاوە گرنگ بو" لەڕوی ستراتیجییەوە، قەڵەمڕەوی دەوڵەتەکەی فـراوان دەکـرد. شـاری میـژویی بەغـدادو ئـەو ناوچـە دەوڵەمـەنو فراوانـە ئەکەوتـە ژێـر دەسـتیو، لەگـەڵ وڵاتـانی عـەرەب ئـەبو بەدراوسێو، دوا بنکەی نەیارەکانی خۆی هەڵ ئەتەکاند. لەڕوی دینییەوە، زۆریـی شوێنە پیرۆزەکانی شـیعەو گـۆڕی هەنـدێ لەئیمامـەکانی لـەوێ بـون، گیانـی بەغدادو نەجەفو کەربەلاو سـامەڕا هێزێکـی مەعنـەوی گـەورەیان بـەقزلباش ئەدا.

هێزەکانی قزلبـاش کەوتنـە پێشـرەوی بـەرەو بەغـداد. هێزێکـی گـەورەیان لەپێشەوە بەسەرکردایەتی((حسێن بەگی لەلە))لەکرماشانەوە بـەناو خانـەقیندا کەوتە رێ بەبێ بەرهەڵستی چوە ناو شاری بەغدادەوە. باریك بەگ پێشتر هـەڵات بو. شا، خادم بەگی((خلیفە الخلفاء))ی بەحاکمی ئەوێ دانا. خۆیشـی لـەجیمادی دوەمـی ٩١٤(١٥٠٨)دا چـوە نـاو بەغـدادەوە. پـاش زیـارەتی گـۆڕی پـیرۆزی ئیمامەکان، لەکازمینو نەجەفو کەربەلا، بەخۆیو هێزە گەورەکەیەوە کەوتـە رێ بەرەو خوزستان[١١].

((عالم ئارای سەفەوی)) کەدێتە سـەر باسـی هێرشـەکەی شـا ئیسـماعیلو لەشکری قزلباش بۆ گرتنی بەغداد، لەشێوەی سەرگروشتەدا، چیرۆکی کوردێکی تێکـەڵاو ئـەکا، بـەپێی گێڕانـەوەی نوسـەر ئـەبێ کلکـی هـەبوبێ، چونکە((یەزیدی))بوە. مەبەست لەیەزیدی لێرەدا، پێڕەوانی ئولی یەزیدی نییـە. بەڵکو مەبەست لـەپێڕەوانی یەزیـدی کـوڕی معاویـەی ئەمەوییـە، کەلەلایـەن

شیعەوە بەدوژمنی خوێنەخۆیی ئالی عەلی دائەنرێ. وشەی یەزیدی لێرە داو لەگێڕانەوەی چیرۆکی صارم خاندا وەکو جنێو بەکارهێنراوە. ئەم چیرۆکە نیگایەکی جۆری نۆڕینی قزلباش لەگەلی کورد پیشان ئەدا.

((عالم ئارای سەفەوی))نوسیویێتی:

((لەم لایەوە شاە فەرموی چاوم ئەفرێ، سوپا بکەوێتە رێ. لەپێشەوە حەسەن بەگی حەڵواچی ئۆغلی‌و دورمیش خانی نارد. کاتێ ئەوان گەیشتن شەڕ گەرم بو. هەڵیان کوتایە سەر پشتەوەی لەشکری بایرك سوڵتان(مەبەستی باریك بەگی پرناك حاکمی بەغدادە). بایرك ئاخی هەڵکێشا بەناچاری کەوتە شەڕەوە. کەرۆژ بوەوە ئالای(نصر من الله)لەدەشتی بەغداوە دەرکەوت. ئاخ لەبایرك بەرز بوەوە، هەرچەند هەولیدا خۆی بخزێنێتە ناوی قەڵای بەغداوە، رێگەیان نەدا.

کەشیعەکانی بەغداد لەبەرزایی بورجەکەوە روانییان، ئالای هەتاو روی هەژدیها پەیکەری شایان بینی. زانییان کەئەگەر بایرك سوڵتان بێتە ناو قەڵاوە، رۆژانسی مەترسی درێژە ئەکێشێ چونە سەر بەندیخانە، سەید محەمەدی کمانە(کمونە، یەکێ لەشیعە ناودارەکانی عیراقی عەرەب بوە)یان لەبەند رزگار کرد، هاتنە سەر بەرزایی بورجی دەروازە، تەپلی بەشارەتیان لێ دا کەدەوڵەت، دەوڵەتی شاە ئیسماعیل بهادر خان‌و تیغ، تیغی غازییانی قزلباشە.

هەرکە بایرکی ناجسن گوێی لەو دەنگە بو، لەهەر چوار لایەوە خۆی لەناو بەڵادا بینی. دڕی بەو سوپایە داو خۆی گەیاندە دەروازەکە. سەید محەمەدی دی لەسەر بەرزایی دەروازەکەیەو دەروازەکەش داخراوە. وتی: گەورەمان سلاو... دەروازەکە بکەرەوە. هیچمان پێ نەکرا، ئەگەر شا بمگرێ ئەمانم نادا، بەڵام ئەگەر بێمە ناو قەڵاو یەکێ بنێرم داوای ئەمانی لێ بکەم، لەوانەیە ئەمانم بدا. سەید وتی: کاتێ من پێم وتی داوای ئەمان بکە تو قبوڵت نەکرد، ئێستاش کار لەئەمان ترازاوە. برۆ شمشێر لەمل بکە بەشکو شای دڵوریا بتبەخشێ. هەرچەند پاڕایەوە، سەید فەرموی بیدەنە بەر تیر. بایرك بەناچاری جڵەوی بەلای رۆمدا وەرگێڕا. دڵی لەحەرەم‌و ناموس‌و خەزێنە بەردا. لەگەڵ دوسێ هەزار کەس، کەماڵەکانیان لەبەغدا نەبو، بەرێ کەوتن.

بەڵام ئەو حەزرەتە(شا ئیسماعیل) بەهەمو سوپاوە لەپردەکە پەڕییەوە. هەر کەپێی پیرۆزی شا گەیشتە مەیدان، بایرکی ناجسن شکاو، لەمەیدان هەڵات. ئەو حەزرەتە گومانیی‌وا بو چۆتە ناو قەڵاکەوە. لەو کاتەدا کەسێکی سەید محەمەدی کمانە هات، عەرزی کرد: تۆ خۆش بی، نەمان هێشت بایرکی ناجسن بێتە ژورێ. ئەو حەزرەتە فەرمویان: ئەی کەواتە ئەو بۆ کوێ چو؟ وتیان: چو بۆ لای رۆم.

حەزرەت فەرمویان: ئەگەر ئەو دەرباز بێ، فیتنە ئەنێتەوە، چۆن ئەهێڵم دەربچێ. دوی بایرکی ناجسن کەوت. بایرك ماوەیەکی رێ بڕی بو، ئالاکانی شای لەدورەوە بەدی کرد. وتی کەپردەکە ببڕن.

شەهریار(شا ئیسماعیل) کە گەیشتە کەناری روبار(روباری دیجلە)پردەکەی بەبڕاوی دی ماینە مەنسورەکەی تاو دایە ناو ئاوەکە. ماین خۆی هاویشتە دەریاوە. قزلباش کەئەوەیان دی، غولامانی حەزرەتی امیر المؤمنین علیە السلام، رژانە شەتی بەغداوە. کەشا لەشەت هاتە دەرێ، جڵەوی راکێشا، لەگەڵ هەمو سوپاکانی لەئاو دەرهاتن.

ئەو حەزرەتە فەرمویان: سەیر بکەن، ئاخۆ هیچ کەس ئاو بردویەتی؟

وتیان: شا سەلامەت بێ، تەنیا یەکێ ئاو بردویەتی وا ئەڕوا.

شا فەرموی: مەعلوم نیە ئەو کابرایە لەئێمە بێ، بڕۆن بیگرن‌و بیهێنن! مەلەوانەکان چون گرتیان‌و هێنایان.

حەزرەت فەرموی: دەرپێکەی دا بکەنن!.

کەدەرپێکەیان داکەند بەرێکەوت کلکی هەبو، نیشانەیەکی پێوە بو کە لەکوردانی یەزیدی‌و نۆکەری بایرك بو. لەبەرئەوەی بە تەنیا لەناو قزلباشدا بەجێ مابو، ئەویش تاجێکی پەیدا کرد بو لەسەری نابو. تێکەڵاوی سوارەکان بو بو. کاتێ قزلباش خۆیان هاوێشت بوە ناو ئاوەکەوە ئەویش بەناچاری خۆی تێ فڕێدا بو. ئەوە بو ئەو ئاو بردبوی[١٢].

**نمونە٥:**

**میرەکانی کوردو جەنگی چاڵدێران(٩٢٠ك)**

رەفتاری قزلباش لەگەڵ کوردو مەزنەکانی، کوردی تا ئەندازەیەکی زۆر لێ رەنجاند بون. سوڵتان بایەزید لەبەر پیری‌و نەخۆشی نەی پەرژایە سەر ئەوەی چارەیەکی بنەڕەتی‌و خێرای پەرەسەندنی بزوتنەوەی قزلباش بکات‌و رێوشوێنی لەناوبردنی دابنێ. دەوڵەتی سەفەوی لەسەردەمی ئەوا دامەزراو فراوان بو، بگرە چەسپی. بەڵام سلیمی کوڕی کە لەکۆنەوە رقی لەقزلباش بو، کاتێ هاتە سەرتەخت، یەکێ لەبەرنامەکانی هەوڵی روخاندنی دەوڵەتی تازە دامەزراوی ئێران بو. بۆ ئەوەش هەوڵی ئەدا کەڵکی زۆر لەهەستی مەزهەبیی گەلانی ناوچەکە، لەوانە کورد وەربگرێ. مەزنەکانی کورد خۆیشیان کەتوشی گرتن‌و دورخستنەوەو ئازاردان بوبون، کەوتنە هان دانی سوڵتانی عوسمانی بۆ پەلاماردانی قزلباش. تەنانەت حەکیم ئیدریسی بتلیسی ناوی لەمەزهەبی قزلباش

نا بو((مذهب ناحق))واته مەزەبی ناهەق. ئەمەش لەروانگەی دینییەوە دیارە واتایەکی زۆر قورسی هەیە.

شەرەف خان لەم بارەیەوە بەراشکاوی نوسیویتی:

((لەبەرئەوەی ئەمیر شەرەف بەچەند رۆژێ نەیتوانی ولایەتی بتلیس بگرێتەوەو تایەفەی قزلباشی لێ دەربکاو، بەرازی دڵی سوڵتانی دنیاگر، سوڵتان سلیم خان زانی کە گەرەکێتی ولاتی ئێران بگرێ. ئەوسا بەهاوبیری‌و بەتەگبیری شاسواری مەیدانی تحقیق، سالاری کاروانی رێگەی توفیق، دانەری قانونەکانی اصول‌و فروع، نوسەری دیوانەکانی مەعقول‌و مسموع، مامۆستای مەدرەسەی تەقدیس، سلالەی عارفی بەدلیس، مەبەستم حەکیم ئیدریسە، لەگەڵ هەڵبژاردەی بیرباشەکانی بنەماڵەی ئایین بەرزو خێرئەندێشانی خانەدانی رەفعەت ئایین‌و، ستودەی دەوڵەت خواهانی دودمانی ضیاءالدین محەمەد ئاغای کەلهوکی، اظهاري ئیخلاص‌و ئعتقادیان بۆ دەروازەی دەوڵەتی عوسمانی نواند. بۆ ئەم مەسەلانەش ۲۰ کەسی لەئەمیران‌و حاکمانی کوردستان کردە هاوداستانی خۆی. عبودیتنامەیەکیان بەمەولانا حەکیم ئیدریس‌و محەمەد ئاغادا رەوانەی ئاستانەی ئیقبال ئاشیانەی سوڵتانی کرد. سوڵتانی دۆست لاوێنی دوژمن سوتێن. لەسەر داوای ئەمیرەکانی کوردستان بەنیازی گرتنی ولایەتی عەجەمستان، روی کردە ئەرمەن‌و ئازەربایجان، لەدەشتی چالدێران لەگەڵ شا ئیسماعیل کەوتە شەڕو سەرکەوت. ئەمیر شەرەف لەگەڵ هەندێ لەحاکمانی کوردستان لەم سەفەرەدا لەرکابی نەسرەت قرینی سوڵتانی ظفر رهین بو.

لەبەرئەوەی خان محەمەدی والی دیاربەکر لەو شەڕەدا شەربەتی نەمانی چێشت، لەدیوانی شاهییەوە ئیالەتەکەی ئەو بەقراخانی برای‌و حکومەتی بتلیس بەعەوەز بەگی برای‌و جزیرەش بە ئەولاش بەگی براکەی تری سپێردرا. کاتێ مەوکیبی رایەتی سوڵتانی لەلای تەورێزەوە بۆ لای رۆم وەرچەرخا، حەکیم ئیدریس بەعیززی عەرزی جەلالی سوڵتانی گەیاند، کەئەمیرەکانی کوردستان لەالطاف‌و ئیحسانی شاهی جیهان داوا ئەکەن کەولایەتی میراتی خۆیان بەخۆیان بدرێتەوە، لەناو ئەوانەدا یەکێ بەگەورە بەگلەربەگ دابنرێ بۆ ئەوەی بەکۆمەڵ بچنە سەر قراخان‌و، لەدیاربەکری دەربکەن. سوڵتانی گێتی ستێن لەوەڵامی ئەواندا فەرمویان، کە هەرکامێ لەئەمیران‌و حاکمەکانی کوردستان، لێوەشاوەیی امیر الامرائي هەیە لەناو ئەواندا دابنرێ بۆ ئەوەی هەمو ئەمیرانی کورد ملکەچ‌و گوێڕایەڵی بن‌و بچن بۆ دەفع‌و رەفعی قزلباش..))[13].

سەردارەکانی کورد لەو سەردەمەدا پایەیەکی ئەوەندە بڵندیان هەبوە کەسوڵتان سەلیم لەو ((استمالة نامە))یەدا کەراستەوخۆ دوای سەرکەوتنی لەجەنگی چاڵدیران دا لە٢ی رەجەبی ٩٢٠ دا بۆ دانیشتوانی ئەورێزی نوسیوە، زاهید بەگی هەکاری بە((فەخری ئەمیرانی کورد))ناو ئەبا[١٤]. نامەیەکی بۆ((حاکمی خیزوان))نوسیوە کەهاوکاری((فخر الامراء الكرام، ذخر الكبراء الفخام، صاحب المجد والاحتشام، شرف بيگ، دام معاليه..))بکا بۆ رزگارکردنی قەڵای بەتلیس لەقزلباش.[١٥]. هەربەو بۆنەیەوە((فتحنامە))یەکی تایبەتی بۆ((امراء مشرق وقبائل کرد))نوسیوە مژدەی سەرکەوتنی خۆیو تێکشکانی شا ئیسماعیلی پێ داون[١٦]. هەروەها((فتحنامە))یەکێ دۆستانەی بەتایبەتی بۆ شاە رۆستەم بەگی حاکمی لوڕستان لەو بارەیەوە ناردوە[١٧]. لەپەراوێزی ئەو روداوانەدا ئەگونجێ دو تێبینی بکرێ" یەکێکیان، رادەی جیاوازی جۆری نۆرینی رۆمو عەجەم لەکوردو پیاوە گەورەکانی، کەرەنگە هەندێکی بگەڕێتەوە بۆ جیاوازی مەزەب. دوەمیان، پایەی گەورە پیاوەکانی کورد لەو سەردەمەداو، ئەو دەورەی ئەیان توانی لەدژراندن یا بردنەوەی هەر ململانێیەکی نێوان رۆمو عەجەمدا بیگێڕن.

**٢/٢ شاە محەمەد خودابەندە**

**نمونە٦:**

**کورد" مەعدەنی شەڕو مەنبەعی زەڕ(٩٨٦)**

شاە تهماسب لەپاش تەمەنێکی درێژو، زیاتر لە٤٠ساڵ حوکمڕانی مرد(٩٨٤ك). حەیدەر میرزا خۆی لەجێگەی باوکی لەسەر تەخت دانیشت. بەپیلانی پەریخان خانم، شازادەی بەدەسەڵاتی دەرباری سەفەوی، حەیدەر بەکوشت چو، لەناو کوڕەکانی تهماسبدا، ئیسماعیل کەماوەی ٢٠ساڵ بو لەزینداندا گیرا بو، لەجێگەی باوکی بەناوی ئیسماعیلی دوەمەوە دانرا(٩٨٤).ئیسماعیل کابرایەکی رق ئەستوری دڵڕەق بو. زۆرایەتی شازادەکانی سەفەوی کوشت. لەوانە، جگە لەمحەمەد میرزای دایك برای، هەمو براکانی خۆی" مستەفا. امامقلی، سوڵتانعەلی، مەحمود، ئەحمەدی لەناوبرد(٩٨٤). هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەسەرانی دەسەڵاتداری قزلباش. ئیسماعیل کابرایەکی بەدخو بو، هەم تلیاکی بو، هەم نێرباز بو، پەریخانی خوشکی، کەخۆی دەستی لەدانانیدا هەبو، ژیوان بور لەکارەکەیو، سلێمان میرزای دایکبرای کوژرا، ئەترسا ئەویش رۆژی بێتە کوشتن. هەر ئەو لەگەڵ سەرانی قزلباش رێك کەوت، پیلانێکیان بۆ لەناوبردنی دانا. شەوێکیان ژاریان تێکەڵاوی تلیاکەکەی کردو کوشتیان(٩٨٥).

تەنیا کوڕی تهماسب کەبەزیندویّتی مابو، محەمەدی خودا بەندە بـو، ئـەویش لەشیراز ئەژیا(٩٣٨-١٠٠٤)محەمەد سەرەتا بۆیە لەکوشـتن دەربـاز بـو، چـونکە کوێرو بودەڵە بو. ئیسماعیل لێی نەئەترسا پێی وا بـو هیچـی لـەدژی ئـەو پـێ ناکرێ. بەڵام ئەوەش دادی نەدا. سەرەنجام فـەرمانی کوشـتنی ئەویشـی دەرکـرد. ئەوەی کوشتنی محەمەدی پێ سپێردرا بو، بەهۆی رەمەزانەوە کارەکەی دوا خست. ئەمەش بو بەخێر بۆ محەمەد میرزا. چونکە هەر لەو رۆژانەدا کەئەبو ئەوی تـێدا بکوژرێ، ئیسماعیل خۆی کوژرا، لەلایەن پەریخانەوە بەهاوکاری سەرانی قزلباش محەمەد بەشای ئێران دانرا(٩٨٥)ناردیان بـەدوایدا بـۆ شـیراز کەبێتـە قـەزوین لەسەر تـەختی شـاهێتی دابنیشـێ. شـاه محەمـەد خـودا بەنـدە(٩٣٨-١٠٠٤) یەکەمین کوڕی شاه تهماسب بو لەکاتی مردنی باوکیدا تەمەنی ٤٦ ساڵ بو[١٨].

پەریخان بۆ پێشوازی لەشا محەمەدی برای لەکەژاوەیەکی زەرنیگارا کە٤٠٠ تـا ٥٠٠ پیادە هەڵیان گرت بو، تاپیرە سوفیانی لای قـەزوین بـەپیر براکەیـەوە چـو. محەمەد خۆی کەسایەتییەکی لاوازی هەبو، مەهد علیای هاوسەری، کەبە((فەخر النساء بیگم))و((خیر النساء بیگم))ناو ئەبرا، زاڵ بو بەسەریدا، مەهـد علیـا رقی زۆری لەپەریخان بو. محەمەدی هان دا بیکوژێ. شـاه محەمـەد هـەر ئـەو رۆژە فەرمانیدا بەخەلیل خانی ئەفشار، کە لەلەی پێگەیاندنی پەریخان بـو، پـەریخان بکوژێ. پاش چەند رۆژێ پەریخانی خنکاند. بەرامبەر بەم خزمەتە، شا کەلەپوری کوژراوی بەبکوژ بەخشی.

شا کابرایەکی بێ دەسەڵاتی نابینا بو، خۆی لەکاروباری دەوڵەت نەئەگەیانـد. مەهد علیای هاوسەری، کەئەوەی یەکێ لەمیرە ناسراوەکانی مازندەرانو ژنێکـی لێهاتوی خۆبەزلزان بو، دەستی گـرت بـو بەسـەر کاروبـاری دەربـاردا. دانـان و لابردنی کاربەدەستانی دەوڵەتو سوپا لەدەس ئەودا بو. کوڕەکـانی مەهـد علیـا هێشتا منداڵ بـون. حـەمزەیان کـەدانا بـە((وەکالـەتی دیـوانی ئـەعلا))واتـە جێنشینی باوکی تەمەنی ١١ ساڵ بو، لەباتی ئەو دایکی کارەکانی بەڕێوە ئەبرد.

سەرانی قزلباش لەناو خۆیاندا ناکۆکو ناتەبا بون. پیلانیان لەیەکتری ئەگێڕا. هەلومەرجی نـاوەوەی ئێـران شـێوا بـو. تـاژاوەو شەڕوشـۆڕ مەشـهەد، هـیرات، مـازندەران، قرم، شیروانو ناوچە کوردنشینەکانی خـوی، سـەلماس، ورمێـی گـرت بـوەوە. سـەرکردەکانی ئێـران گوێیـان نەئەدایـە فەرمانـەکانی شـاه محەمـەد. بەناکۆکییـەکانی ناوخۆیانـەوە خـەریك بـون. سنورداره‌کانیشـی نـاوەرۆکی پێکهاتنەکەی سلێمان- تهماسبیان پشت گوێ خست بو.

بابیعالی ناکۆکی ناو سەرانی قزلباش‌و لاوازیی دەربارەی ئێرانی بەهەل زانی، کەوتە شەڕ فرۆشتن بەئێران. لەپێشەوە کوردە داخ لەدڵەکانی سەر سنورەکانی گاڵدا هێرش بەرنە سەر ناوچە سنورییەکان. پەلاماری خوی‌و ورمێییان داو گرتییان. دەرباری ئێرانی تینی بەرەنگاریی تێدا نەما بو. هێزەکانی ئێران خۆیان لەبەر هێرشی عوسمانیدا پێ نەئەگیرا. شاه محەمەد داوای لەئەمیرخانی موسل و بەگلەربەگی ئازەربایجان‌و، محەمەدی خانی تخماق ئیستاجلو بەگلەربەگی ئەرمەنستان((چخور سعد))و، ئیمامقلی خانی قاجارو بەگلەربەگی قەرەباغ کرد، بەر لەهێرشی عوسمانی بگرن. ئەوانە لەبەر ناکۆکی ناوخۆیان شتێکی ئەوتۆیان پێ نەکرا. ئۆردوی عوسمانی قارسی ئاوەدان کردەوە، بەناو قافقازدا پێشڕەوی کرد، گورجستان‌و شیروانی گرت(٩٨٦). لەم شەڕانەدا بەتایبەتی لەتیکهەڵچونێکا لە((چلدر))ژمارەیەکی زۆر لەمەزنەکانی کورد کەوتنە بۆسەی قزلباشەوەو کوژران.

مەهد علیا، حەمزە میرزای کوڕی لەگەڵ خۆی بردو، خۆی چو بۆ قەرەباغ بۆ سەرپەرشتی رەوتی جەنگ. عادل گرای خان، یەکی لەئەمیرانی تاتار، لەیەکێ لەو شەڕانەدا بەدیل گیرا بو. بەدیلی ناردیانە لای مەهد علیا. ئەویش بەرێزەوە ناردی بۆ قەزوین. خۆیشی رێز نەگرتن‌و سوکایەتی پێ کردنی سەرانی قزلباشی کردە بیانو، بەپەلە گەڕایەوە قەزوین.

شا نائومێد بو لەهێزەکانی خۆی‌و توانای سەرکردەکانی. دڵنیا بو بەشەڕ بەری هێزەکانی عوسمانی پێ ناگیرێ. کەوتە هەوڵدانی ئەوەی بەرێگەی دیپلۆماسی ناکۆکییەکان لەگەڵ بابی عالی لەسەر بنچینەی پەیمانی ئاماسیە چارەسەر بکا. بۆ ئەو مەبەستە نامەیەکی بۆ سوڵتانی عوسمانی، مرادی سێیەم، نوسی.

مەهد علیا، عادل گرای بۆ دڵنەوایی‌و میوانداری برد بوە ناو یەکێ لەکۆشکەکانی خۆیان. سەرانی قزلباش خۆیان لەبەهانە بون لەم ژنە ئێرانیید بەدەسەڵاتە، ئەیان ویست ملی بشکێنن. تاوانی حەزلێکردنی ئەمیری دیلیان بەپاڵ دا. داوایان لەشا کرد ئەم ژنە لەکاروباری دەربار دور بخاتەوە. شا دەستی بەسەر هاوسەرەکەیدا نەئەڕۆیشت. سەرانی قزلباش هەڵیان کوتایە سەر ماڵی شا. بو بەدەمەقاڵێ لەنێوان مەهد علیاو سەرانی قزلباشدا. سەرانی قزلباش مەهد علیاو دایکیان، لەباوەشی شا محەمەدا، کوشت.

عوسمانییەکان هەلیان بۆ هەڵکەوت بو، هەمو ناکۆکییە کۆنەکانی نێوان هەردو دەوڵەت بژێننەوە. مەرجەکانی کۆنیان دوبارە ئەکردەوەو، بۆ راگرتنی

جەنگ پێیان لەسەر ئەوە دا ئەگرت. سی ئەسپی هێزی عوسمانی بەسەر هەر ئەرزێکی ئێرانیدا رۆیشت بێ، بخرێتە سەر قەڵەمڕەوی عوسمانی. سەلماندنی ئەوەش بۆ دەربارى سەفەوی ئاسان نەبو. لەماوەی حوکمڕانی شاە محەمەددا پەیوەندی ئێرانی- عوسمانی بەتەواوی تێکچو. پەیمانی ئاماسیە خرایە پشت گوێ، هیچ پەیمانێکی ئاشتبونەوەی تازەش نەبەسترا. ناکۆکییە کۆنەکانی سەردەمی شا ئیسماعیلی یەکەمو سوڵتان سەلیم زیندوبونەوە. رەوتی جەنگ بەقازانجی عوسمانی بو. عوسمانییەکان درێژەیان بەهێرشەکانی خۆیاندا. بەشێکی فراوانی قافقازو لای رۆژئاوای ئێران، لەوانە شاری تەوریزیان گرت، ئاڵوگۆڕی نامە لەنێوانی شاو سوڵتانو، لەنێوانی کاربەدەستانی گەورەی هەردو دەوڵەت نەگەیشتە ئەنجامێکی تەواو. هەر لەو ماوەیەدا حەمزە میرزا، کەئەویش خوی‌دا بوە بادەنوشیو نێربازی، یەکێ لەهاودەمەکانی خۆی بەمەستی کوشتی(٩٩٤).

شاە محەمەد لەنامەیەکی درێژدا کەبۆ مورادی سێیەمی نوسیوە، بەبۆنەی هێرشی ئۆردوی عوسمانییەوە بۆ ناو ئەرزی ئێران، لەدوای درێژە پێدانێکی پڕ لەئایەت، شیعر قسەی نەستەقو، ستایشی دوری پڕ لەچاپلوسیو درێژدادڕی، لەباسی کوردا ئەڵێ:

((...ئەعلا حەزرەت خاقانی دوهێلانە بەرز لەگەڵ ئەعلا حەزرەت شای بەهەشتی، انار الله برهانهما، رێگەی پێکهاتنو دۆستایەتییان گرتو، بەیداخی فیتنەو فەسادو جیدال، کەمایەی لەناو چونی عاجزانو مەساکین بور، هەڵ نەکردو، بەپێی فەرمانی واجب الاذعانی: ((انما المؤمنون اخوه فاصلحوا بين اخويكم))و بانگی فیض ئینتیمای((وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فاصلحوا بينهما)) بەجێ هێناو، بۆ خۆشیی حاڵو بەجێهێنانی ئاواتەکانی فیرقەکانی ئیسلامو ئوممەتی خير الانام، عليه الصلاه والسلام، بنچینەی درێژماوی صلحو صلاحو((افضل الصدقة اصلاح ذات البين))یان دانا.

شیعر: فاصلح اذا كان الصلاح موافقا    واصلاح ذات البين خير فوائد

ئەگەر بەصلح بتوانی لەگەڵ دوژمن رێگەی ویفاق بگری، ئاشتی لەجەنگ باشترە بۆ صلحو صلاحو اصلاح تێ بکۆشە، چونکە فەلاح لە صلاح دایە

((والحمدلله تعالى، لەلای ئێمەوە صلحو صلاح بەباشە وەڵام دراوەتەوە، تا ئێستە بۆ پێویستییەکانی ئاواکردنەوەو دامەزراندنی ئەوپەڕی تەقەلامان داوە، لەتوورەهاتی ئیعویجاجی لوجاج پێی ئیقدامان کێشاوەتەوە، رێگەی راستمان بەپێی صدقو صەفا پێواوە.

((دوای ئەوەی کەحەزرەتی شای بەهەشتی، اعلی الله مکانە وانار اللە برهانە، بەپێی(کل شی هالك الا وجهە)) باروبنەی فەنای لەمەعبەری فانی دنیاوە بۆ سەرای موستەقەڕی باقی راکێشا، ئیسماعیل میزا بو بەمەزهەری تاساری ئەشرارو، هەنگاوی لاسایی لەدولّی ئەخلاق و ئەتواری باوباپیرانی مەزنی خۆیدا نەناو، کەوتە رشتنی خوێنی براو خزمەکانی و بڕینی سیلەی رەحم کەجوتە لەگەڵ((انە من عمل الشیطان))هەمویانی بەکفنی خوێناوییەوە رەوانەی شکاتگای عەرەسات کرد. لەبەرئەوە لەنەمامی هیوا، جگە لەحەسرەت و مەلامەت، هیچ بەرێکی نەچنی و لەبەخت و تەختی سەڵتەنەتەکەی هیچ خۆشییەکی نەدی.

((هەر کە لەبارەگای((تؤتي الملك من تشاء)) ودیوانی شەهنشاهی ((وما النصر الا من عند الله))مەنشوری ئیحسانی((عسی ربکم ان یهلك عدوکم ویستخلفکم))نیشانی پایەبەرزی((انا جعلناك خلیفة في الارض)) بەناوی ئەم دڵسۆزەوە نوسرا، وازی لەهەمو وادییەك هێناو، بەپێی ((الولد الحر یقتدي بابائە الغر))کەوتە پێڕەوی سوننەتی بەرزی حەزرەتی شاهی بەهەشتی.

((لەگەڵ ئەوەی بەهیچ جۆرێ نە مەراسیمی پیرۆزبایی و نەپێویستییەکانی پرسە لەهیچ جێیەکی ئەولایەوە دەرنەکەوت، ئێمە دۆستینامەیەکمان لەسەر بنچینەی تەواوی دۆستایەتی و یەکێتی، بۆ نوێ کردنەوەی رێوشوێنەکانی دۆستی و خۆشەویستیی بەسەعادەتمەئاب وەلی بەگی، وەکیلی حکومەتی دەرگای محەمەدی سوڵتان دا بۆ دەرگای فەلەك وێنە نارد.

((هێشتا ناوبراو نەگەیشت بوە تەورێز هەواڵ هات" کوردانی باوەڕ پێ نەکراو، کەوەکو بومی شوم بەشەو بزۆزو بەڕۆژ کوێرن و، لەطەریقی سودادو سەبیلی رەشاد مەحرومو مەهجورن، ئەخلافی کیرامی ئبلیس و ئەهدافی سیهامی تەلبیس و، مەعدەنی شەڕو، مەنبەعی ضەڕن، تاوەڕۆکی ((وجوە یومئذ علیها غبرة ترهقها قترة)لەناوچەوانیان نوسراوو، لەسەحیفەی ئەعمالیان گوتراوی((کانهم حمر مستنفرة فرت من قسورة)) تێ ئەگەی، پەلاماری ورمێیان داوە، حسین خان سوڵتانی خنوسلوی حاکمی ئەوێیان بەگفتی درۆی بێ بناغە و بەڵێنی پوچ لەشار دەرهێناوە ئاڵای ئایاتی زوڵمەتی فسق و فجوریان هەڵ کردوە. ماڵو عەیالی دەردمەندان و ژێر دەستانیان بەتاڵان بردوە. رەعایا و عەجەزەو مەساکین، کەئەسڵەن ئەسەری فەساد لەوجودی بێ وجودی ئەوان ناوەشێتەوە، کوشتوە، منالانی موسڵمانانیان دیل کردوە. دەستی کڕین و فرۆشتنیان تێ ناون.

((هەر لەم کاتەدا، دیسان هەواڵ هات" کەفیرقەیەکی تری ئـەم طـائیفـە پـڕ تەفرەقە بێ بونیادە، شەبەیخونی مەحمود بەگی ڕۆملوی حاکمی خـوی، لـەکاتێکا مەستی خەوی غەفلەت بوە، کردوەو کوشتویانە.

((ئەم موحیبە خێرخوازە لەم مەسەلانەدا ئەصڵەن‌و موتڵەقەن گوێی نەدایـە ئەوانە. هەموان چاوەڕێ بون کەفەسادو ئیفسادی ئەم جەماعەتە بگاتە سـامیعی جەلال‌و، بەپێی((کلکم راع وکلکم مسؤل عن رعیته))هـەر یەکـەیان بـەگوێرەی کارو کردارەکانی خۆی سزا بدرێن. کەچی هاوزەمانی ئەم حاڵە هەواڵ گەیشت کە لەلە پاشا چۆتە سەر مەڵبەندی شیروان‌و دەوروبەری. کۆشکی صـولح‌و سـودادی بەڕەشەبای پەیمان شکێنی‌و بێ بەڵێنی وێران کردوە. هەر لەبەر ئارەزوی فەسـادو بیری لاساری ئالای عەهد ومیساقی نەواندوە..))[19].

وەکو ئەڵێن شا خۆی کوێر بوە. سەرەڕای ئەوە بێ دەسەڵات بوە، بەشـدارییەکی کـەمی کـردوە لەداڕشـتنی سیاسـەتی نـاوەوەو دەرەوەی دەوڵـەتی سـەفەویدا. لەسەردەمێکا مەهـد علیـای هاوسـەری‌و هەنـدێ لەسـەرانی قزلبـاش‌و، دوای کوژرانی ئەویش ئیتر ئەم هەر بەناو شا بو، ئەگینا دەسەڵاتی راسـتەقینە لـەدەس کاربەدەستانی دەربارو سـەرانی قزلبـاشدا بـوە. ئەشـێ نـاوەڕۆکی ئـەو نامەیـە بەهەڵوێستی رەسمیی دەزگای حوکمڕانیی قزلباش لەگەڵی کـوردو، راپەڕینـەکانی دابنرێ. ئەوەش دوایی لەسیاسەتی کوردیی شا عەباسدا بەڕونی دەرکەوت.

### ٣/٢ شا عەباسی کبیر

**نمونە٧:**

**شاه عەباس‌و قەڵای دمدم(١٠١٨)**

**باسی سەرپێچی‌و لاساریی ئـەمیرخانی برادۆسـت‌و چـونی جـەنابی اعتمـاد الدوله بۆ مەڵبەندی ورمێ‌و گەمارۆدانی قەڵای دمـدم‌و چـلۆنایەتی کارەسـات‌و ڕووداوەکانی.**

بەسەرهاتی ئەمیرخانی چولاق بۆ هەمو کەس دەبێ ببـێ بەپەنـد. ئـەی ئـەو کەسەی بەدوای قسەدا دەگەڕێی تاوێك گوێ رادێرە تـا بەسـەرهاتی ئـەمیرخانت، کە لەعەشیرەتی برادۆستی کورد بو، بۆ بگێڕمەوە. لەسەردەمی شای بەهەشتی‌دا قەراتاج ناوێکی کورد لەڕیزی شا پەرستان‌و خزمەتکاراندا بو بەسەر تەرگـەوەڕو مەرگەوەر کەبەمەڵبەندی ورمێ‌و شنۆوە نوساوە رادەگەیشت. پاش نـەمانی شـای بەهەشتی کەرۆمییەکان مرخیـان لـەئازربایجان خـۆش کـرد. عێـل‌و عەشـیرەتە کوردەکانی سەر بەم دەوڵەتە بایان داوەو لەگەڵ رۆمییەکان کـەوتن. شـا محەمـەد

ناوێك لەمیرزادەكانی برادۆست بەفەرمانی خوندكاری ڕۆم كرا بەمەزنو خاوەن دەسەڵاتی برادۆست.

ئەمیرخان سەری بۆ دانەنەواندو ملی بۆ ڕانەكێشا هەردەمە لەگەڵ یەكێك لەئەمیرە گەورەكانی كورد دەكەوت. ماوەیەك لەكن عومەر بەگی حاكمی سۆران ڕاببوارد، لەشەڕێك كەعومەر بەگ لەگەڵ دوژمنەكانی كردی، ئەمیرخان دەستێكی لەئانیشكەوە پەڕی، ناوبانگی بەئەمیرخانی چولاق ڕۆیشت.

لەو ساڵەدا كەئاڵای بەرزی پادشایی لەئازربایجان دەشەكاوەو شا بەو پێوقەدەمە پیرۆزەوە بۆ داگیركردنی نەخچەوانو ئیرەوان دەیاژوا، ناوبراو هاتە بەر دەركی بارەگای پادشایەتیو خۆی بەشاپەرستو خزمەتكار نیشاندا. خاوەن شكۆ ئاوڕی رەحمەتی لێ داوە، مەزنایەتیو دەسەڵاتداری تەرگەوەڕو مەرگەوەڕی پێ بەخشیو نازناوی خانی دایەو سەری بەرزكردەوە. مەڵبەندی ورمێو شنۆی كەسەر بەئازربایجانەو لەسەردەمی شای بەهەشتیدا لەژێر فەرمانی یەكێك لەگەورە گەورەكانی قزلباشدا پێ ئەسپارد. لەسەر فەرمانی شا، وەستا زەڕەنگەرەكان دەستێكیان لەزێڕی سور دروست كردو بەگەواهیراتو مرواری بەنرخ ڕازاندەوەو لەباسكیان بەست. چونكە ئازاو مەرد بو خاوەن شكۆ زۆری ڕو دەدایەو گەلێكی چاكە لەگەڵ دەفەرمو. ئەویش دەستی خزمەتكاری لەسەر سینگی دانا. لەسایەی دڵسۆزیو چاوەدێری خاوەن شكۆدا ڕۆژ بەڕۆژ بەپەیژەی مەزنایەتیدا چوە سەرو لەهەمو هاوشانەكانی خۆی تێ پەڕاند. چەند ناوچەو مەڵبەندی لەئەمیرەكانی كوردی سەر بەڕۆم ئەستاندەوەو سەر وڵاتی خۆی گێڕاڹو بەو جۆرە لەنێو ئەمیرەكانی كورد بەپایە بەرزیو لەشكرزۆری ناوبانگی دەركرد.

زۆر لەخێڵەكانو لەئەمیرزادەكان لەدەوری هاڵاڹو خزمەتی ئەویان رەچاو كرد. هێندەی پێ نەچو هەواو فیز لەسەری داو لەخۆبایی بو. لەو كاتەدا كەجغال ئۆغلی لەشكری بۆ ئازەربایجان كێشاو شەڕ لەدەوروبەری تەورێز قەوما، لەگەڵ ئەوەشدا كەزۆر لەشەڕگە نزیك بوو خۆی بواردو نەهاتە مەیدانو بەخزوری خاوەن شكۆ نەگەیشت. پاش شكاندنو تاراندنی جغال ئۆغلی لەشكری زاڵ بو، لەناوچەی سەلماس خستی. ئەویش بەدیاریو ژوانەوە هاتە بارەگا، لاواندراوەو كەم خزمەتیو خۆبواردنو نەهاتنە مەیدانی بەڕودا نەدراوە. بۆ ئەوەی دردۆنگ نەبێ ئەو و ئەمیرەكانی كورد كەوەحشی ترین تیرەی ئینسانن دڵخۆشی درانەوەو چاكەیان لەگەڵ كرا. مەرەخەس كرا كەبگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، بەڕواڵەت خۆی لەریزی خزمەتكاران دادەنا. بەڵام لەبنەوە لەبەر تەعەسوبی مەزەبیو پیسی دەرون لەگەڵ قزلباشی دەوریەری خۆی دوژمنانە دەجوڵاوە. هەوای سەربەخۆییو

سەرەڕۆیی لەسەریدا بو. ئەوەندەی بروز ئەستاند کەخەریکی ئاوەدان کردنـەوەی قەلایەکی گەورەو قایم ببێ. بەبارەگای دەوڵەتی راگەیاند کەقەلای ورمـێ بنکـوڵ بوە، هەرەسی هێناوەو خۆڕاناگریو بۆ ئەوە نابێ پشتی پێ ببەسترێ. ئەگەر ئیـزن بفەرمون بناغەی چوار دیوارێك لەشوێنێکی لەبار دادەڕێژم. خاوەن شکۆ کەهـەر رواڵەتی ئەوی دەدیو ئاگای لەدەرونی نەبو، ئیزنیدا. ئەویش لە۳ فرسەخی شاری ورمێ لەسەر کێوێکی هەرە بەرز کە کەوتۆتە بەشی تەرگەوەر بناخەی قەلایـەکی قایمی دارِشت.

لـــەنێو کـــورداندا بـــاوە دەڵـــێن! لـــەپێش ئیســـلامدا لـــەزەمانی ساسانیەکان(ئەکاسرە)دا هەر لەو شوێنە قەلایەك هەبوە کەپێی گوتراوە دمـدمو دەسدرێژی رۆژگار خاپورو وێرانی کردوە. پیر بۆداق خان ئەمیری ئەمیرانی تـەورێز کەپیاوێکی بەئەزمونو وشیارو کارامە بوە، لەجوڵانەوەی دوژمنانەی ئـەمیرخاندا نیشانەی کەلەوە کێشیو مل هوڕی بەدی کرد. بۆیە بەبارەگای پـیرۆزی راگەیانـد کە: ((ئەمیرخان لەرێگای راستی لاداوەو هـەوای سەرپێچـیو لاسـاری کەوتۆتـە سەرو بناغەی ئەو قەلا بەرزو قایمەی بۆیە دارِشتوە کە لەرۆژی پێویستدا بەکاری بێ. ئەو غولامـە دروستکردنی ئەو قەلایە هیچ بەقازانجی دەوڵەت نازانم)).

فەرمانی پیرۆز بەم جۆرە بـەرێ کـراوە: ((بـۆ خـۆت ئـەمیری ئـەمیرانی ئـەو سنورەی ، ئەگەر ئەو قەلا دروست کردنە بەقازانجی دەوڵەت نـازانی پێشـگری لێ بکە)). پیربوداق خان لەسەر فەرمودەی شـا پیـاوێکی بـاوەڕپێکراوی نـاردە کـن ئەمیرخانو پێی راگەیاند: ((کەئەو لـەریزی ئـەمیرە مەزنـەکانی شـادا حسـاب دەکـرێو پـەروەردەی دەسـتی خـاوەن شـکۆیەو لافـی پـاکیو بەنـدەیی لێ دەدا. هەرچەند شای عالەم پەنا ئەو پەڕی متمانەی پێ هەیە. بەلام بەو قـەلا دروسـت کردنەی ئەو زمـانی زمـان پیسـان دەکرێتـەوە. ئەگـەر ئـەو قەلایـەیَ لەترسـی پەلاماری رۆمیان دروست دەکا. ئەگەر رۆمیان بێنە ئەو ولاتە هەتا قەلای قـایمو گەورەی وەك قەلای تەورێزو ئێرەوان لەنێویدا بێ، رو لەقەلای وا ناکـەنو ئەگـەر ترسی لەئەمیرەکانی کورد بێ، ئەگەر روداوێك بقەومێ ئێمە غولامـانی بارەگـای شا کەپاراستنی ئەم سنورەمان لەئەستۆیە چۆن دەتوانین خۆ بنگخێنین؟ رەنگ بێ هەر ئەو عاشورە کۆنەی ورمێ بۆ ئەو بـەس بـێ واباشـە کەدەسـت لـەو قەلایـە هەڵبگرێو زمانی پیاوخراپـان لـەخۆی نەکاتـەوەو ئـەو ئامۆژگاریـە دۆسـتانەی ئێمە کەقازانجی ئەوی تێدایە لەگوێ بگـرێو خـۆی نەکاتـە نیشـانەی بوختـانو دەمگۆی ئەوتۆ کەبونی لاساریو دوبەرەکی لێ بێ)). بەڕاسـتی ئامۆژگاریـەکی

دۆستانەو دڵسۆزانە بو. چونکە بەپشت ئەستوریی ئەو قەڵایە بـو کەتوشـی ئـەو چارەنوسە رەشە هاتو ئەوەی پێ گەیی کەدەبو پێی بگا.

بەکورتی ئەمیرخان هەر گوێی نەدا ئەو قسانەو پیاوەکـەی پیربـوداق خـانیش بەدەستی کوردە برادۆستیەکان کوژرا. قەڵایەکی یەکجار قایمو گـەورەی دروسـت کردو ئازوقەو چەك و چۆلی کێشاوە نێو قەڵاکەوە. ئەوجار لەورمێدا رایگوێزت بۆ ئەو قەڵایە. رۆژ بەرۆژ قەڵاکـەی قـایمترو ئـامرازی قـەڵاداری پـەرداختر دەکـردو لەراستیدا هێزی چارە رەشیو لێ قەومانی خۆی زیاتر پێك دێناو، کـاری ئـەوتۆی دەکرد کە بەهیچ بارێك لەگەڵ پاکییو یەکرەنگیی یەکیان نەدەگرتەوە. بۆ نمونـە خان ئەبدالی موکری برای شێخ حەیدەر کە لەخاوەن شـکۆ یـاخی ببـو ولەترسـی هێزی لەشکر لەهیچ شوێنێکی وڵاتەکەی خۆیدا حەجمینو حەوانەوەی نـەما بـو، بەخۆیو بیست کەس لەدەستوپێوەندەکانیەوە پەنای بۆ هێناو ئەمیرخانیش پـەنای داو کردی بەهاودەمو هاونشینی خۆی. بەڵام بەفێڵو رێوی بـازی پیاوەکـانی خـۆی دەنارده دەرگای عالەمپەناو خۆی بەفیدایيو یەکرەنگ نیشـان دەدا. لەکاتێکـدا کەجەلالیەکان ناردرانە کوردستان فەوجێکیان لەگەڵ نێـردرا پیربـوداق خـانیش سەرکردەی ئەو لەشکرە بو. ئەمیرخان کەئەو خەبەرەی بیست بەدەوڵەتی راگەیاند: ((نێوانی منو پیربوداق خان خۆش نیەو قسەی خـراپ لـەبارەی منـەوە بەعـەرز دەگەیەنێ. حەوانەوەی من لەنێو لەشکرێك دا کەئەو سەرکردەی بێ، کارێکی زۆر گرانو ئەستەمە)).

بۆ دڵ راگرتنی ئەو ئەم فەرمانە بەقەڵەم داهات: ((لەبەرخاتری ئەو پیربوداق خان ئەو کارەی لێ وەرگـیراوە لـەجێی ئـەو حەسـەن خانمـان تـاعین فـەرمو کـە لەئەمیرەکانی عیراقەو پیاوێکی پاكو سەروڕو خۆشە بـەو حاڵەشـەوە ئەگـەر بـۆ خۆی ناتوانێ لەگەڵی کـەوێ، یـەکێك لـەکوڕەکانیو ردێـن سـپیەکی کارامـەو دوسەد سێ سەد کەسێکی لەگەڵ بنێ. با یەکرەنگییو دڵپاکیی ئـەو بـۆ ئـەمیرو حاکمەکانی کورد سور بێتەوەو خانەنشینیی ئەو بەخۆبواردن دانەنێن)).

ئەمیرخان سەرەڕای ئەو هەمو دڵسۆزیو مودارایەوە کە لەلایەن خاوەن شکۆوە لەگەڵی کرا، هەر لەسەر لاساریو سـەروەریی خـۆی رۆیشـت. کەحەسـەن خـانی ئیستاجلو و گـەورە گـەورەکانی قزلبـاش لەمەراغـە گەیشـتنە محەمـەد پاشـاو جەلالیەکانو بـەرەو خزمـەتی خۆیـان کەوتنـە رێ، بەئـەمیرخانیان راگەیانـد: ((لەسەر فەرمانی پیرۆزی خاوەن شکۆ ئەگەر بۆ خۆی لەتوانایدا نیە بـێ، چـەن پیاوی باوەڕپێکراوی خاوەن ئەزمون کە لەچـاكو خراپـی کوردسـتانو رێگاکـانی ١

ئاگادار بن‌و ڕەوەی بکەون پرسیان پێ بکرێو بۆ ڕاوێژ لەگەڵ کردن بشێن سازبکاو بنێرێ)) ئەمیر چەند پەڵپ‌و بیانوی گرتن.

کورتەی بیانوەکانی ئەوە بو: ((تیرەی جەلالی لاپرەسەن‌و نەگونجاوو باوەڕ پێ نەکراون. با گەورە گەورەکانی قزلباشیش دەگەڵ بن من ناتوانم لەگەڵ لەشکرێك بکەوم کەحەوت هەشت هەزار کەسی جەلالی دەگەڵ بێ. ئەوان لەهەر ڕێگایەکەوە دەیانەوێ بڕۆن. منیش لەپاشان هێندێك کەس بەدوای ئەواندا دەنێرم)) ئەمیرە گەورەکانی دەوڵەت سەرکێشیی ئەویان لەسەرەتای سەفەردا بەدڵ نەبو. ئەوە یان بەلاوە باش بو، ئێستا کەرێگایان بەلای ئەو دایە بەهەر بارێك بێ ڕامی بکەن" چونکە ئەگەر هات‌و ئەمیرخان کە لەنیزیکانی دەرگای شایە وا لاساریی بکاو بەلاڕێدا بڕوا، دەبێ لەئەمیرەکانی دیکەی چاوە نۆڕی چ بین؟ بۆیە وە سەر خۆیان نەهێناو بەزمانێکی نەرم‌و خۆش لێیان ڕاسپارد، خانەخوێی باش بێ‌و چەن شەوێك ڕامان بگرێ، جا کەچاومان پێ کەوت لەسەرخۆ ڕاوێژی لێ دەکەین‌و ئەوەی قازانجی ئەوی تێدا بێ وا دەکەین. ئەمیرخان هەر جوابی نامەو پەیامی حەسەن خان‌و ئەمیرەکانی دیکەی نەداوەو لەسەر کەللە ڕەقی‌و کەلەوەکێشی خۆی توندتر ڕاوەستا.

کەپێشەکی لەشکر گەیشتە ناوچەی بەر حوکمی ئەو دەستەیەك لەکوردەکانی برادۆست بەرەنگاری بون‌و لەگەڵ ئەو جەلالیانەی کە لەپێش دابون بەگژیەکدا هاتن، دو پیاوی جەلالی کوژران‌و چەند کەسیش لەم نێوەدا برینیان هێنا. حەسەن خان‌و ئەمیرەکان کەلەو ڕوداوە ئاگادار کران پیاوەکانیان گێڕاوە پاشەوەو شەڕو کێشەیان ڕاوەستاندو لەنێو فرسەقی قەلا لەجێگایەکی پەسێو هەڵیان‌داو لەشکریان خست. کوردەکان چونەوە قەلاوەو هۆردوگایان وەبەر تۆپاندا، حەسەن خان دیسان پیاوی ناردەوە کن ئەمیرخان‌و هۆی ئەو ڕەفتارە نالەبارەی لێ پرسی. هەرچی لەو لایەوە قسەی خۆش‌و دۆستانە کران، ئەو پەڵپ‌و بیانوی سەیرتری هێنا گۆڕێ‌و دەرگای دۆستایەتیی‌و ئاشنایەتیی داخست. توشی هەرکەس لەقزلباش‌و جەلالی بوبان کەبۆ جێبەجێ کردنی کاروباری پێویست لەهۆردو وە دەردەکەوتن دەیان کوشت‌و ڕوتیان دەکردەوە. دوپات بونەوەی ئەو کارانە دوژمنایەتی لەنێو هەردولادا بەهێزتر دەکرد. محەمەد پاشاش بۆ تۆڵە ئەستاندنەوە لەجەلالیەکان وەکارکەوت‌و پیاوەکانی پۆل پۆل تا بەر قەلا دەچون‌و لەو لاشەوە کوردەکان لێیان وە خۆ دەکەوتن‌و بەپیریانەوە دەهاتن‌و لەهەردو لاوە چەند کەس دەکوژران‌و بریندار دەبون. کار لەکار ترازاو شەڕو کێشە گەرمتر بو. هێندێك کەس لەجەلالیەکان کە لەمحەمەد پاشا دڕدۆنگ بون بەتایبەتی محەمەد

بەگی برای تویل‌و دەستوپێوەندەکانی بایان داوەو چونە کن ئەمیرخان. بەو جۆرە نزیکەی سێ سەد چوار سەد کەس لەگەڵ ئەو کەوتن. ئەوەش پتر ئەوی لەخۆبایی کردو محەمەد پاشاش بەجارێکی هەراسان‌و جارز بو. ئاگری دوژمنایەتی لەنێوان ئەواندا هەڵ گیرسا، فەرمانی قەزا لەبارەی کوردە یاخیەکاندا دراو ملک‌و وڵاتەکەیان داگیر کرا. حەسەن خان بەناچاری لەوێندەرێ دامەزراو چلۆنایەتی بەپێچکی تەختی پادشا راگەیاند. ئەو خەبەرە لەئەردەویل بەعەرز گەیشت.

وەك لەسەرەتاوە نوسیمان عالی جەناب اعتماد الدولە، حاتم بەگی بۆ ئەو لای رەوانە فەرمو کە بەچاوێکی ژیرانە تەماشای ئەم سنورانە بکاو ئەگەر ئەمیرخان هیچ جێ متمانە بێ دڵی بداتەوەو بەکەرەمی شاهانە هیواداری بکا. جەلالیەکان لەدەوری قەڵای ئەو راگوێزێ‌و وەك ساڵان جێ هەواریان بداتێ. پێنج هەزار تومەن زێڕی نەقد لەخەزێنەی دارمالی شاهانە وەربگرێ‌و بیدا بەجەلالیەکان. جا ئەگەر ئەمیرخان هەر دانەمەزراو کەللەڕەقی‌و کەلەوە کێشی کرد، ئاوێکی بەو ئاگرە هەڵپرژێنێ‌و ملکەکانی ئەو بەسەر جەلالیەکاندا دابەش بکا تا لەوێ نیشتەجێ بن‌و ئاسەواریش لەکوردە لاسارەکانی دیکە ببڕێ.

## باسی چونە ورمێی اعتماد الدولەو گەمارۆدانی قەڵای دم دم‌و کارەساتەکانی دەوری قەڵا

کەعالی جەناب اعتمادالدولە لەئەردەویلەوە هاتە تەورێزو لەگەڵ پیربوداق خان حاکمی تەورێز بەرخوردار بەگی ئەنیسی تۆپچی باشی‌و تفەنگچیەکانی ئیسفەهانی‌و خوراسانی‌و تەورێزی بافقیی وەڕێ کەوت. دو هەزار کەسیش جەلالی کە لەتالانی قراچە ئەردەهانەوە دەگەڕانەوە لەگەڵ کەوتن.

لەسەلماس، خان وەلەد غازی بەگی حاکمی ئەوێش وێڕای ئەولیا بەگی کوڕی سەیفەدینە کوێرەی حاکمی ئەنزلی‌و سۆما لەگەڵ لەشکر کەوتن. رۆژی ۳ شەممەی ۲٦ی شەعبان گەیشتە هۆردوی ورمێ. حەسەن خان‌و محەمەد پاشاو گەورەکانی بەپیریەوە هاتن‌و بەخزمەت گەیشتن هۆردو لەجێگایەکی باش دامەزرا.

رۆژی دوایی جەنابی اعتمادالدولە پیاوێکی باوەڕپێکراوی دەگەڵ مەلیك ئاغا محەمەدی طسوجی کەئاشنایەتی کۆنی لەگەڵ ئەمیرخان هەبو. ناردە کن ئەو. پاش ئامۆژگاری دۆستانەو خێرخوایانە داوایان لێ کرد کە مل بداو لەدەوروبەری قەڵا بۆ دیدار ئامادە بێ تا ڕێگایەك بۆ نەهێشتنی ناکۆکی‌و ناتەبایی بدۆزنەوەو دڵی ئەو بێننەوە جێ. ئەمیرخان ملی داو لەقەڵا هاتەوە خوارو جەنابی وەزیریش بەچەند کەسەوە چو. چاویان بەیەکتر کەوت‌و لەهەمو بابەتێك دوان.

ئەمیرخان بەئاسوپەلاس دا دەچوو بەفرو‌فێڵو درۆو دەلەسە خۆی بەغولامو نۆکەر نیشان دەداو دەیگوت: ((لەترسی بەرەڵلایی‌و ئاکاری نالەباری جەلالیەکان‌و دڕدۆنگی لەبەرگری کردنی حەسەن خان پەنام بۆ ئەو چوار دیوارە هێناوە. محەمەد پادشا بەهیوای موڵك‌و ماشی منەو منی لەخزمەت خاوەن شکۆو بۆسۆو بەد ناو کرد. ئێستاش تکام ئەوەیە جەنابی وەزیر لەخزمەت خاوەن شکۆ عوزرم بۆ بخوازێتەوە. لەو زستانەدا لێم گەڕێن بۆخۆم نەبزوم. یەکێك لەکوڕەکانم لەخزمەت ئێوەدا دەنێرمە بارەگای بەرزی، جا کەبەهاری خاوەن شکۆ بەرەو کوێستان هات، بۆ خۆشم دێم بن ریسمەی ماچ دەکەم)).

جەنابی اعتمادالدولە دڵنیای کرد، هەمو شتی لێ قبوڵ دەکرێ بەو مەرجەی بەڵێنی خۆی بێنێتە جێ. بڕیار وا درا چونکە قەڵاداری ئەو دەنگسی داوەتەوە. بۆ ئەوەی خەڵك بزانن ئەو یاخی‌و سەرکێش نیە، بەخۆی‌و کەس‌و کارو دەستوپێوەندیەوە بێتە نێو قزلباش‌و لەگەڵ گەورە گەورەکان یەکتر ببینن‌و هیچ ترسی نەبێ. رۆژێك ئەو میوانی اعتمادالدولە بێ‌و رۆژێك اعتمادالدولە میوانی ئەو بێ. تا دەنگوباسی نێوان خۆشیی‌و یەکێتی ئەوان لەو سنورە بلاوبێتەوە، ئەمیرخان بەوە رازی بو قەراری‌دا سبەینێ بێتە خوارێ.

جەنابی وەزیر کوڕێکی جوان‌و باشی رازاندەوە، چونکە ئەمیرخان نەیدەویست چاوی بەجەلالیان بکەوێ، بڕیار درا تاقە کەسێك لەو تیپە لەم کوڕەدا بەشدار نەبێ، ئەوێ رۆژێ هەرچی چاوەنوارِ بون سۆراخی ئەمیرخان نەبو. دیسان ئاغا محەمەدی طسوجی یان نارده کنی، بزانی بۆچی دیارنیە؟ پاش وتووێژێکی زۆر بەئاغا محەمەدی وت: ((قسەی راست ئەوەیە ریش سپیەکانی برادۆست لەفێڵو دەهوی قزلباش‌و جەلالی ئەمین نین‌و پێیان وایە اعتمادالدولەکەپیاوێکی تاجیك‌و خاوەن قەڵەمە، پێشی ئەوانی پێ ناگیرێ‌و ئێمەی پێ ناپارێزرێ. بەکورتی یەخەی خۆم لەدەس ئێوە نانێم، ئەگەر بەقازانجی خۆمی بزانم کوڕێکم بەدیاری‌و پێشکەشەوە دەنێرمە خزمەت خاوەن شکۆو ئەگەر خەیاڵێکی دیکەیان لەسەردایە، ئەوە لەو حەوشە خزاوم‌و جگە لەقەڵاداری چارێکم نیە)).

کورتی بیبڕینەوە لەبنەوە بڕی‌و ناپاکی ئەو ئاشکرا بو. دیاری‌دا کەوتووێژەکانی بۆ فرو‌فێڵو خۆبواردن بوە. ئەو قەڵا قایمە لەخۆی بایی کردوەو رێگای سەرەڕۆیی‌و لاساریی گرتۆتە بەر.

عالی جەناب اعتمادالدولە لەگەڵ ئەمیرەکان راوێژیان کردو هاتنە سەر ئەوە هێندە نەرم کێشیی لەراست ئەمیرخان بەهیچ بارێك لەگەڵ قازانجی دەوڵەت ناگونجێ. هاتنی وەزیری گەورەو باوەڕپێکراوی دەوڵەت بۆ بن قەڵای ئەو بەدەست

بەتاڵی گەڕانەوەی زۆر شورەییەو قبوڵ ناکرێ. هەمو خۆیـان لەقـەڵا گـرتن هـەڵ کرد، خەبەریشیان بەپێچکی تەختی شا ڕاگەیاند.

لـەپێشدا بـەڵێنم دابـو ئـەم چیرۆکەتان وەك چـۆن روی داوە بەتـەواوی بـۆ بگێڕمەوە. جا بۆیە بە پێویستم زانی کەمێکتان باسی قەڵای دمدم بۆ بکەم: ئەو قەڵایە لەسەر دۆندی کێوێکی یەکجار بەرز دروست کراوە کەیەکپارچە بـەردێکی درێژۆکەو تەسکەو وەك پشتی گـا هەڵکـەوتوە. لای شـیمالو جنـوبی دۆڵـی زۆر قوڵن کەلەژێر لابو سەری دەبێ بەپەیژەی خەیاڵ بۆی بچێ. لەبەر بەرزی پێویستی بەشورە نیەو شورە یان بۆ نەکێشاوە. دولایەکەی دیکەیان کەپانایی قەڵایەکـە لای ڕۆژهەڵاتی پاڵی وە بەرزایی چیا داوەو شورەیەکی زۆر تەواوی بۆ کێشراوەو بورجی بڵندی هەنو دەرگایەکی هەیە. لای ڕۆژئاوای کە لەگۆڕاییی نێـزیکترە شـورەیەکی یەکجار قایمی هەیەو دەرگایەکی بەرەو جنوب ئەکرێتەوە، لەدەروازە را بۆ عـەرزی ڕێگایەك بەنێو بەردیدا هەیە کەئەوەندە تەنگە بەزەحمەت سوارێکی تێوە دەچـێ. سەنگەر بردنە پێش لەلای ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە نەبێ ناکرێ. لەلای ڕۆژهەڵات تیر هاوێژێکی بۆ دەرکی قەڵا بێنێ، یەکپارچە بەردی سەختو تەختو ڕەقە. لەبنەوە بودری بۆ لێ نادرێ، کەبەردەکە براوە بـورجێکی زۆر بـەرزو قایمیـان لێ دروسـت کردوە کەبۆ خۆی قەڵاییچەیەکە، تا ئەو بورجە بەردەست نەکرێ سـەنگەر بردنـە بەر قەڵا مەحاڵە. ئاوی قەڵا لەحەوزێکی گەورە را دابین دەکـرێ کـە بـەباران پـڕ دەبێ. بەڵام لەلای شیمال لەنێو گەلیدا نێزیکی قـەڵا کانیـەك هەیـە، ئـاوی زۆر کەمە، ئەمیرخان جۆگەی بۆ کێشاوەو ڕێی بـۆ کردۆتـەوە وەدە حەوزەکـەی کـردوە. ئاوی ئەو کانیە لەئێوارەوە تا بەرەبەیانی حەوزەکـەی پـڕ دەکـا. ئاوەکـەی بەشـی ڕۆژێکی قەڵانشینەکان دەکا. گومبەزێکیان لەڕێکی عـەرزیی لەسـەر حەوزەکـە هەڵخستوە کـە لـەپێش چـاوان ون بـێ. پێـی دەڵـێن((سـولق)) بـۆ پاراسـتنی حەوزخانەکە بورجێکیان بەپاڵ قەڵاوە هەڵچنیوە. لەلای جنوبەوە سـەهۆڵدانێکیان سازکردوە کە لەزستاندا بە بـەفرو سـەهۆڵ داخنـدرێ. لەتەنیشـت وی حـەوزێك هەیە، تا ئەو بەفرو سەهۆڵەی لەگەرمای هاویندا دەتوێتەوەو دەبێتە ئـاو بـەفیڕۆ نەڕواو لـەوێدا کۆبێتـەوە لـەکاتی کـەم ئـاویدا بـەکاربێ، ئـەو سـەهۆڵدانەش قەڵاییچەیەکی لەسەر دروسـت کـراوەو پاسـەوانو تفەنگچـی لەسـەر دانـدراوە. بەوێش دەڵێن((بوزلق))یا((قارلق))ڕێگای وێش وەك ڕێگای ((سولق))لـەدەرەوە را ونە.

بەکورتی ئەم قەڵایە لەپێنج قەڵا پێك هاتوە. یەکیان ئەسڵی قەڵاکە، یـەکیان قەڵای خوارێ، یەك((سولق))و یەك((بوزلق))و ئەوێ دیکەیان بـورجی گـەورەی

دەرەوەی دەرگای ڕۆژهەڵات کە لەپێش‌دا باسمان کرد، هەر پێنج ئەوەندە بەرزو قایمن کەپەیکی تیژڕۆی بیرو مێرولەی خەیاڵ ڕێیان تێ ناباو ڕێیان هەڵ ناگەڕێ.

جەنابی وەزیر بەلێزانیو بیرتیژیو وشیاری خۆیەوە کەمەندی زیبكو زاکۆنی هاوێشتە کۆنگرەی داگیرکردنی ئەو پێنج لا ئەستەمە. خەریکی سازکردنی ئامرازی پێویستی قەلاگیری بو. لەو کاتەدا پێنج سەد تفەنگچی لە لەشکری تایبەتی خاوەن شکۆ بەسەرکردەیی صفرقلی بەگی یوزباشیو قۆرچیەکانی چگنی بۆ کۆمەك گەیشتنە جێ. گەنجعلی خانیش کە لەتەوریز بو، بەلەشکرێکی پەرداخەوە هات. حەسەن خانو ئەمیرانی هاورێی ئەوو تفەنگچیەکانی ئیسفەهانیو میر فەتاحی سەرکردەیان بۆ بەری ڕۆژهەلات داندرانو بەری ڕۆژئاواش بەپیربوداق خان ئەسپێردرا.

مراد خانی سوڵتانی چینیو خەلیل سوڵتانو محەمەد تەقی بەگ بۆ بەرامبەر قەلاییچەی بوزلق نێردرانو پاراستنی دەروازەی ئەولا بەگەنجعەلی خان سپێردرا. تفەنگچی مازندەرانی لەگەڵ صفرقلی بەگو قورچی چگنی بۆ بەری شیمال تاعین کران. بەرخوردار بەگی ئەنیسو تۆپچیەکان بەدو تۆپی گەورەو یەکێ(بالیە)ەوە دامەزرانو قبان سوڵتان بیگدلی بەسەرکردەی توپخانە داندرا. جارێ تۆپێکی بچوکیان لەدەریای ڕەشەوە بەکەشتی هێناو لەسەنگەری حەسەن خان دابەسترا. محەمەد پاشا توشی نەخۆشی دڵ هات، خزمەتێکی پێ نەسپێردرا. بەلام جەلالیەکان بەسەر بەشەکانی لەشکردا دابەشکران. پێنج هەزار تومەن زێڕی شایی عەبباسی کەبۆ باربوی جەلالیەکان هێنرا بو بەسەریان دابەش کرا. بۆ هەر هۆزێکیان جێ هەوارێك لەپێش چاوگیا. لەشکر خێوەتی هەڵداو هەر دەستەیەك چوە سەر کاری خۆی. ئەمیرخان خەبەردار بو ترسا. زۆر جار پیاوی ناردو خەریك بو بەدرۆو دەلەسە ئەو کێشەیە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، بەلام چونکە فروفێڵەکانی ئاشکرا ببون گوێ نەدرا بەقسەکانی. بەناچاری ئەویش خەریکی بەرگریو قەلاداری بو چەند کەس لەئەمیرزادەکانی برادۆست لەقەلا دەرپەڕینو هاتنە ریزی شاپەرستانەوە. هەر کەس لەقەلاوە دەهات دەیگوت: قەلا نشینەکان لەبەر کەم ئاوی سەخڵەتن، چونکە لەبەر وشکە ساڵیو کەم بارانی ئاوی حەوزەکە زۆری لەکەمی داوەو ئەوی ماوەش بۆگەن بوەو دەیدەن بەچوار پێیان. ئاوی خواردنەوەی بریتیە لەئاوی سولق، ئەویش تاس تاس دەدرێ بەپیاو ماقوڵان. ئەگەر سولق داگیر بکرێ جگە لەخۆ بەدەستەوەدان چارێکیان نیە، ئەویش بێتو لەبنەوە ڕا بودری بۆ لێ بدرێ گیانی زۆر گران نیە. ئەو تەگبیرە ئەقڵ دەیگرتو ئەگەر بەو جۆرە ناچاریان کردبان خۆ بەدەستەوە بدەن زۆر لەشەڕو خوێنڕێژی

باشتر بو. هەمو کۆششی خۆیان بۆ ئەو کارە تەرخان کرد. وەستا کـاریز کەنـەکان خەریکی بودر لێدان بون. تا عەرزەکە خاك‌و نەرم بو بەهاسانی چونە پـێش. کـە گەیشـتنە بـەردی، سـەوەیان چـنین‌و شـەوانە لـەرێگای دورەوە گلیـان دەهێنـاو سەوەکانیان پڕ دەکردو بەڕیز دایان دەنان‌و کۆلاتێکی سـەر داپۆشـراویان دروسـت دەکرد. حەسەن خان لەلای رۆژهەلاتەوە ئاوا دەچوە پێش. پیربوداق خـانیش لـەلای رۆژئاواوە سەر بەرەو ژور دەچوە پێش‌و هەر ئەو کارەی دەکـرد. کوردەکـان لەبـەرە بەیانەوە دەڕژانە سەنگەرەوەو شەڕی باشیان دەکردو دەم بەدەم هـاڕەی تـیرەی تیـژ پەڕی ئەوان پەیامی ئەجەلی بەگوێی غازیەکان رادەگەیاندو گوللەی تفـەنگ وەك تەرزە بەسەر ئازاکاندا دەباری، دوسێ جار بـەرۆژی رونـاك خۆیـان دە سـەنگەران هاویشت‌و شەڕی بەسام‌و گرانیان کرد، غازیـەکان زۆر سـەیر خۆیـان رادەگـرت‌و توندیان بەرگری دەکـرد، هـەمو جـارێ لەهـەردولایان زۆر دەکـوژران‌و برینـدار دەکـران، جـارێکی پـەلاماری مەتـەریزی نعمـەتوللا سـولتانی سـۆفییان دا، سۆفیەکان ئازایەتی‌و مەردایەتیەکی سەیریان نیشـاندا، پێـنج کـەس لـەزارکی مەتەریزەکە یەك لەدوای یەك کوژران‌و نەیان هێشت کوردەکان خۆی تـێ بـاوین، هەر کەسی دەکوژرا گیانبازێکی دیکـە جێـی دەگرتـەوە، لـەو رۆژەدا هـەمویان پیاوەتی‌و ئازایەتیان نیشاندا، لەو شەڕەدا حەوت هەشت کـەس غـازی کـوژران‌و پانزەیەك برینداربون، کوردەکانیش تابیست کەسیان لێ کوژراو سی چل کەسـیان برینیان هێناو چیان بۆ نەکراو چونە دەقەلاوە. لەسەنگەری حەسەن خـانی را ئـەو تۆپەی بەرەو بورجەکە دابەسترا بو، پاش بیست رۆژ بەلکو مانگێـك تـۆپ بـاران چرژێکی لەبورجە کەکرد بو، بەلام هێشتا وانەبو پێدا وە سـەر بکـەوێ، حەسـەن خان هەلشەیی کردو سەربەخۆ بێ ئـەوەی پـرس بەاعتمادالدولـە بکـا، رۆژێـك هێرشی بردە سەر بورجەکە، دوازدە لاوی هەلکەوتو ئازایانە خۆیان گەیاندە سـەر بورج، چەند کەسیان ئەنگوان‌و هەلدێران، ئـەوانی کـە چاوترسـاو بـون‌و کـەس نەوێرا هەلکشێ‌و خۆیان هەلداشت. دوسەد کەس کەگەیبونە بن بورجەکە لەوێ دامەزران تا نیوە شەو شەڕ بو خەریکی کۆلینی دیواری بورج بون.

لەو کاتەوە کوردەکان لەپڕ لەپشتەوە پەلاماری غازیـەکانیان داو بـو بەشـەڕە شیر، لەسەر بورجەوەش گوللـەی تفـەنگ دابـاری، لەقەلاشـەوە دەسـڕێژ دەکـراو کۆمەك بۆ غازیەکان نەدەنێردرا، ناچار غازیەکان دەسـتیان لەشـەڕ هـەلگرت‌و گەڕانەوە، لاوی ئازاو هەلکەوتو لەو شەڕەدا کوژران‌و برینـداربون، حەسـەن خـان لەئازایەتی شێتانەی خۆی پەشێوان‌و شەرمەزار بو، کارێك بو کرا بو، لەبەرئـەوە

جەنابی وەزیر لەدوای چوان نەچوو دڵخۆشیی داوە، لەشەڕێدا زۆر کارەساتی وا دەقەومێن، گرتنی قەڵایان بێ کارەساتی وانابێ.

پاش ماوەیەك کەکارێزکەنەکان کاریان کرد. لەبن عەرزەوە نەیانتوانی سەرچاوەکە بدۆزنەوە سەریان لێ شێوا بو نەیاندەزانی بودرەکە بەرەو کوێ لێ دەن؟ بەناچاری هەرچەند هەنگاوێکی دەچونە پێش نیشانەیەکیان دەچەقاند. کەدیاربێ بۆ کوێ دەچن. بەو نیشانانە کوردەکان لەکەین و بەینەکە گەیشتن. لەبەربێ ئاوی وەك ماسی کەوت بونە تورو هەڵبەزهەڵبەزیان دەکرد. هەمو شەویش هێرشیان دەهێنایە سەر بودرەکەو لەگەڵ تفەنگچیەکانی مازندەرانیو صفرقلی بەگو قورچی چگنی کەپاسەوانی بودر بون بەشەڕ دەهاتن، شەڕی زۆر گەورە دەکران و شەو بوێریان نەبو. کارێزکەنەکان دەرفەتی کارکردنیان نەبو، سێ مانگەی رەمەزان و شەشەکان و نێو جێژنان بەو جۆرە شەڕو کێشە درێژەی هەبو، دوسێ جار خەڵکێکی زۆری شەڕ نەکەرو ژن و منداڵیان لەقەڵاوە دەرنا کەژمارەیان نێزیك بەهەزار کەس دەبو.

ئەو خەڵکە بەشڵەژاوی خۆیان دەگەیاندە ئاو. گەمارۆدراوەکان ئەو کانیلکەیان بەئاوی حەیات دەزانیو فیداکارانە بۆ پاراستنی سولق تێدەکۆشان، لەو لایشەوە ئەوپەڕی هەوڵ بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە دراو بێ سود نەبو. چونکە ئاوی حەیات ون بو، جەنابی وەزیر تەگبیرێکی دیکەی کرد، بڕیاریاندا کە بەسەر عەرزیدا بۆی بچن و سەربانی گومبەزی سولق کون بکەن و تۆپی گەورە لەدیواری پەیژە بەرەو دالانی ئاو دابەستن و ئاگری بدەن، کەکوردەکان نەوێرن هات و چۆی کانیەکە بکەن، بودرەکەش بەبن عەرزیدا هەر لێ بدەن، قەرار درا کەمیرسۆفیو میرپازوکیو میر مقدم لەسەنگەرەکانیان بێنە دەرو سەنگەر بگوێزنەوە بۆ سەر سولق، حەسەن خان پیاوی کارامەی لەجێی خۆی دانان و بۆ خۆی سەرپەرشتی ئەو میرانەی وەستۆ گرت. پیربوداق خانیش سەنگەرێکی بەرەو سولق دامەزراند، جەنابی اعتمادالدولە ئەوەندەی ئەو قەڵا گرتنە بەلاوە گرنگ بو، کەبۆ خۆی هاتە سەر تۆپخانە، بیست و یەك رۆژ لەسەر تۆپخانەی بو، لەبەیانەوە هەتا ئێوارە تۆپ هاویشتن و پاراستنی سەنگەرەکان لەژێر چاودێری خۆیدا بو، هەمو شەوێ هەر تەرکێك بەهەر ئەمیرێك ئەسپێردرابایە بەیانی لێی دەپرسراوەو ئەگەر تەنەخی تێدا کردبا. سەرکۆنە دەکرا، کوردەکان زۆر هەراسان بون، کەشەو رادەشکا لاوی تەیارو پەرداخ و چەکدار دەهاتنە دەرێ و لەدەورەی سولق شەڕ دەست پێ دەکراو ئازایەتیان نیشان دەدا، لەو لایەشەوە مەشخەڵ هەڵدەگیرسان و لەبەر روناکایەتی مەشخەڵان تفەنگچیەکان بەربەرەکانیان دەکرد. هەمو شەوێ

ژمارەیەك لەهەردو لایان دەکوژران‌و بریندار دەکران، لەلاپاڵی چیا ئەشکەوتێك هەبو کەبەسەر سولقدا دەیڕوانی، کوردەکان لەبن ئەشکەوتەکەوە بۆدرێکیان لێ دەدا کە لەئەشکەوت بێنە دەرو لای سەرو لەغازیەکان ببڕنەوەو دەریان پەڕێنن‌و بۆ هەمیشە بەرگری لەو کارە بکەن، پاش ئەوەی ئەو خەبەرە بەئەمیرەکان گەیشت وایان بەباش زانی کەپێش دەستی بکەن‌و ئەشکەوتەکە بگرن، تا لەداگیرکردنی سولقدا دەستیان بکرێتەوە. نیزیکی سێ لاوی لەخۆبوردو هەڵکەوتو ئەو ئەرکەیان لەئەستۆی خۆیان گرت. لەگەڵ گزینگی هەتاو ئەو لاوە ئازایانە لەزارکی سەنگەرەوە بەبەر قەڵادا بەغار ڕۆیشتن‌و خۆیان لە ئەشکەوت هاویشت. لەقەڵاوە زۆریان تفەنگ پێوەنان، بەڵام لەیەك کەس زیاتریان لێ نەکوژرا.

((کەشەو بەرگی عەبباسیانی دەبەر کرد، ئەمیرە گەورەکان تا نیوە شەو لەسەر سەنگەرەکانی خۆیان ڕاوەستان‌و پاسەوانێتیان کرد، پاش نیوە شەو دو دەستە لەکوردەکان هاتنە دەرێ. قۆڵێك ڕویان لەسەنگەرەکان کردو شەڕیان هەڵایساندو خەڵکیان بەخۆیانەوە خەریك کردو قۆڵێکیش لەبن ئەشکەوتەکەوە سەریان دەرێناو لەگەڵ ئەوانەی لەئەشکەوت دابون شەڕیان دەست پێ کرد, ئەو لاوە ئازایانە چاك وە دەست هاتن‌و تا گوللەیەکیان پێ ماو تیرێکیان لەتیردان‌دا بو شەڕیان کردو ئەشکەوتیان بەدەستەوە نەدا. پاش ئەوەی هیچییان پێ نەماو دە کەسیشیان لێ کوژراو چی وای نەما بوو کوردەکان خۆیان لەباڵ باوین‌و ئاسەواریان لێ ببڕن، ئەو بیست کەسەی مابون دەستیان‌دا شیران‌و لەئەشکەوت دەرپەڕین‌و بەنێو کوردەکان وەربون، تا بەقونە شەڕ بڕۆن‌و ئەوێ ئەجەلی وە درەنگی کەوتبێ بەزیندویی بگاتەوە سەنگەر، هەشتی بریندارییان هەرچۆنێك بو گەشتنەوە ئەوانی دیکە ڕێگای نەمانیان گرتە پێش، کوردەکان دو برینداریان کەیەکیان تفەنگچێکی ئیسفەهانی‌و ئەوی دیکەیان پازۆکی بو بەزیندویەتی گرت‌و بردیاننە قەڵایە. ئەمیرخان لەئازایەتی ئەوان سەری سوڕما بو نەیهیشت بو بیانکوژن‌و دەرمانی کرد بون‌و پاش ئەوەی برینەکانیان سارێژ ببوەوە ئیزنی دابون بێنەوە دەرێ.

بەکورتی لەبەرەبەری بەیان‌دا ئەو شەڕە دوایی هات‌و کەلاکی کوژراوەکان کەلەبەر زارکی ئەشکەوت کەوت بون دیار بو. غازیەکان کەمێکیان سام لێ نیشت. جەنابی اعتمادالدوله دڵتەنگ بو هەڕەشەی لەئەمیرەکانی مقدم‌و سۆفی‌و پازۆکی فەرمو.

بەڵام لەشەڕدا ئەوانە هەر دەبن‌و ئەویش بۆ ئەوەی دوژمن دڵخۆش نەبن زیاتر لەڕۆژان خەریکی کاروباری شەڕ بو. هەر ئەوێ ڕۆژی چل غازی ئیستاجلو کە

لەگەڵ حەسەن خان بون رقیان هەستاو غیرەتیان بزوتو خۆیان بۆ گرتنەوەی ئەشکەوت ئامادە کرد. اعتمادالدولە لەئیزن دانیان دودڵو لەروداوی دوێشەوی نیگەران بو. حەسەن خان زۆری هەوڵدا و گوتی: ئەمشەو بۆ خۆم ئاگام لەوانە دەبێو بەسێ سەد کەسەوە بەرگری لەهێرشی کوردەکان دەکەم. جەنابی وەزیر لایەك خۆشو لایەك ناخۆش رەزای داو بەقبان سولّتانی بیگدلیو امامقولی سولّتانی ئاجراوی ئەسپارد کەپشتی حەسەن خان لەو شەوەدا بەهەمو هێزی خۆیانەوە بگرن.

لەسەر داوای ئەمیرەکان دە کەسی دیکەیان لەگەڵ خستو بەتێکڕایی بونە پەنجا کەس. بەتەیاریو چەکداری تێشوو پێویستی چەند رۆژەیان هەڵگرتو لینگیان دا بەرەو ئەشکەوت. کوردەکان لەئازایەتیو خۆبەخت کردنی ئەوان سەریان سوڕما. کەشەو داهات زۆرتر لەشەوی دی هاتنە دەرێو شەڕ قەوماو، شەڕێکی یەکجار توندو گەورە. حەسەن خانو ئەمیان لەدەرەوەو کوڕە کوڕەی نێو ئەشکەوت لەژورەوە بەگژ کوردەکاندا هاتنەوە تا بەرە بەری بەیان شەڕ بو کوردەکان هەرچەندی تێکۆشان چیان بۆ بەچی نەکراو بەشڵەژاوی گەڕانەوەو غازیەکان پیاوانە ئەشکەوتیان داگیرکرد. هەمو شەوێ چەند کوردیان کە تابەیانی ئاویان دەکێشاوە بەتۆپو تفەنگ دەکوشتو بریندار دەکرد. تا وردە وردە سەنگەر هەڵکشانو گەیینە سەربانی حەوزی سولق گومبەزی حەوزخانەیان کون کردو لەوێ را رێگای ئاویان دیتەوەو زانیان سەرچاوەکەی لەکوێیە. کوردەکان خەریکی دۆزینەوەی چارە بون.

هەمو رۆژێ لەنێو بودرەکەوە شەڕیان دەکردو بەرگریان لەکاری ئەو کەسانە دەکرد کەبودریان لێ دەدا. ئەمیرە گەورەکان رۆژی هەژدەی مانگی قوربان جەنگەی نیوەڕۆیە، کایەکی زۆریان لەکونی سولق کردو ئاگریان تێ بەردا. پاسەوانی حەوزخانە خۆیان لەبەر ئەو قانگ دانە رانەگرتو هەڵاتنەوە بۆ قەڵا. غازیەکان خۆیان فڕێدا خوارێو سولقیان داگیرکردو رێگای ئاویان باش بەخشتو قوڕ گرت. ئەوی رۆژێ هەرایەکی گەورە لەبن قەڵا دەس پێ کرا. کوردەکان زۆر تێ کۆشان بەرگری لەو کارە بکەن. بەڵام دەروست نەهاتنو هیچیان بۆ نەکرا. پاسەوانی سولق بەتفەنگچیەکانی مازندەرانی ئەسپێردراو ئەمیرە گەورەکان هەر یەکە گەڕانەوە بۆ سەنگەرەکانی پێشوی خۆیان جەنابی اعتمادالدولەش لەتۆپخانە را گەڕاوە بۆ مەزلی خۆی.

ئەمیرخانو گەورە گەورەکان تا دە پازدە رۆژ بەناوی کەمی بوزلقو خەڵکەش بەناوی بۆگەنی حەوزی گەورە قەناعەتیان کردو خەریکی قەڵاداری خۆیان بون

چونکە داگیرکردنی سولق لەزستانەوە تا بەهاری کێشـا. وەختـی بـارانێ هـاتو هەورەکان ئەمسالٚ بەپێچەوانەی سالٚی رابردو وەك فیلانی مەست کەوتنە شـریخو هورو بەرِوحمی خوای کەکەس نازانی چەند زۆرە، نیزیکەی مانگێکی بـێ نێـوبرِ باران باریو لێی نەکردەوەو قەلاٚنشینەکانی لەناو بێ نیاز کـرد، چـونکە تـەگبیر تەقدیری پێ هەلٚناوەشێتەوە، ئەو هەمو هەولٚو تێکۆشانەی لەوسێ مانگەدا بـۆ داگیرکردنی سولق ئەنجام درا بەفیرِۆ چـو قەلاٚنشـینەکان پـتر لـەجاران خـەریکی قەلاٚداری بون))[٢٠].

**باسی داگیرکردنی قەلاٚی دمدمو کوژرانی ئـەمیرخانو دەستوپێوەندەکانیو کارەسـاتەکانی دیکـە، کەهێنـدێکیان لەسـەردەمی ژیـانی اعتمادالدولـەدا و هێندێك پاش ئەو رویان داوە.**

چونکە لەبەر بارانی زۆر وەك گوتمان سولق سودێکی ئەوتۆی نـەبو، برِیـاردرا کەهەمو ئەمیرەکان سەنگەری خۆیان بەرِێگای کوچەی بەسەوەتان دا بەرنە پێشو قەلاٚکە بەیارمەتی خوداو هێزی باسك بگرن. جەنابی وەزیر لەمەزلی خـۆی بـاری کردو بۆ لای سەنگەری حەسەن خان هات. سەنگەرێکی بەسـەرکردەیی صـفرقلی بەگو پیاوەکانی تایبەتی شا کردە سەنگەری خۆیو لـەوێدا دامـەزرا. لەهـەمو لاوە شەو و رۆژ تێ دەکۆشانو شـتومەكو کەرەسـتەیان دەکێشـاوە. سەوەچـنەکان سەوەیان دەچنینو هێندێك گلٚو قورِیان لەرێگای دورەوە دێنـا تـا سـەوەکانی پـرِ بکەن. ئاسنیان بەسەر تەختەیەکی ئەستوردا کێشا بوو گەردونەیەکیان سـازکرد بـوو کەکارگـەرەکان لەپشـت ئـەوێ کاریکـەنو لەگوللـەی زەبـر زەنو تفـەنگ بپارێزرێن. بەو جۆرە شەوانە کاریان دەکردو گەز بەگەز دەچـوونە پـێش. لەگـەلٚ ئەوەشدا هیچ شەوێك نەبو کە دوسێ کەس نەنگیودرێنو لەنێو نەچن. لـەپێشدا حەسـەن خـانو ئـەلیاس خەلیفـەی قـەرەداغلو و مـیر فـەتاحی مـین باشـی تفەنگچیەکانی ئیسفەهانیان بەو جۆرەی گوتمان بردنە پێشو سەنگەریان گەیاندە بن بورجی گەورەی دەرەوەی قەلاٚو تەنیشت دیـواری. قەرابـەگ ناوێـك کـەوەکیلی ئەمیرخانی بو، پاسەوانی لەو بورجەی دەکرد. کارێزکەنـەکان چـەند رۆژ کاریـان کردو ئەو دارانەیان ئاگر تێ بەردا کەبۆ قایمی دەنێو چینەی دیواریـان کێشـابون. ئەو دارانە سوتان. دیوارەکە هەرەسی هێناو زگـیداو نیوەرِۆیـەك کەکارگـەرەکان خەریکی نان خـواردن بـون، لایـەکی بورجەکـە بـزوت تێـك روخـاو دەسـتەیەك لەپاسەوانەکان لەگەلٚ خاكو خولٚ بۆ نێو دۆلٚەکـە جالـە بونـەوە. کەئـەوە رویدا جەنابی وەزیر بۆ حەسەن خانی دەستور فەرمو کەئیتر چ وەختی راوەستانە، هێرش بۆ بورجەکە بەرن.

حەسەن خان فەرمانی هێرشی‌دا. هەوەڵ کەسێکی پێی لەسەر بورجەکە دانـاو تفەنگی لەقەرابـەگ داو سـەری بـڕی‌و هێنایـەوە، پاڵـەوان محەمـەد ناوێـك بـو لەتفەنگچیەکانی خوزانی ئیسفەهانی. لەپاش ئـەو دوازدە کەسـی دیکـەوە سـەر بورجەکە کەوتن‌و حەوت هەشـت پاسـەوانیان لەسـەری سـەر بـڕی. خوشـکەزای ئەمیرخان کەلاوێکی زۆر جوان چـاك‌و شـەنگ‌و شـۆخ بـو، هەڵـدێراو لـەخواریّ لەگەڵ گێلە پیاوێکی تیرەی چینی کـە لەپاسـەوانان بـوو تێـك ئاڵقـان‌و دەسـت بەیەخـە بـون. هـەر دەس بـەجێ کوشـتی‌و سـەری بـڕی‌و هێنایـەوە، جـەنابی اعتمادالدولە زۆری پێ ناخۆش بو وگەلێك بەسەر کابرای دا هات‌و ئەو خەلاتـەی بەهیوای بو نەیدرایە.

بیبڕینـەوە، بورجەکـە داگیرکـراو پاسـەوانەکانی زیاتریـان کـوژران‌و چـەند کەسیشیان لەبن داروبەردو گڵدا خنکان. نوسەری ئەم پیتانە کە لەو هاتوچۆیەدا ڕەفیقی جەنابی وەزیر بو، ئەم چوار نیوە شیعرەی بەدڵ داهات‌و نوسی:

((ئەو بورجە کەبۆ گرتنی دەستت گیرا
لەئاسۆی ئەویّ وەك هەتاو هاتیە دەر
ئەوەندە بەرز بو کەدەستی هیوای کەیوان
کورت بو بۆ ئەوەی بگاتە توربە ڕێژی))

کاتێك بورجی گۆڕین کەوەك بەردی سەر ڕێگای غازیان بو گیرا، کـار هاسـان بو، لەماوەی دە ڕۆژدا سەنگەرەکانیان گەیاندە دەوروبـەری قـەڵاو تۆپچـیەکانیان دامەزرانـد. تـۆپێکی گـەورەی بالیمزیـان بەرانبـەر بەقـەڵای سـەریّ‌و تـۆپێکی دیکـەیان بەرانبـەر بەقـەڵای خـواریّ لەسـەنگەری پیربوداقخـاندا دامەزرانـد و دەستیان بەگوللە باران کردو تـەنگیان بەقـەڵا نشـینەکان هەڵچـنی. ئـەمیرخان سـەری لیّ شـێواو کوردەکـان هیـوا بـڕاو بـون، چـونکە گـەلێك لـەخزم‌و کەسوکارەکانیان لەو شەڕانەدا کوژران. قەڵانشینەکان دەستیان بەهاتنە دەرکـرد. هەمو ڕۆژیّ دە کەس‌و بیست کەس لـەکوردەکان‌و لەجەلالیـەکان خۆیـان دەربـاز دەکردو پەنایان بۆ سەنگەرەکانیان دەهێنا. لەسەر فـەرمانی پـیرۆز پـەنا دەدران‌و خەلات دەکران‌و دڵخۆشی دەدرانەوە.

بەکورتی کاری قەڵا گەیشتە جێگایەك کەئـەوڕۆو سـبەی بگـیریّ. کـەروداوی مەرگی اعتمادالدولـە ڕوی‌دا. چـلۆنایەتی ڕوداوەکـە ئەوەیـە: ڕۆژێکـی لەگـەڵ ئـەمیرەکان لەمـەزڵی گەنجعـەلی خـان بـون. ئێـواریّ کەهاتنـەوە سـەرێکی تۆپخانەیاندا، سەری شەویّ هاتنە دیوەخان، پاش بەجیّ گەیاندنی نوێـژان تـا دو

بەتڵ شەو رابرد وەك جاری جاران زۆر بەرِوگەشیو روخۆشی لەگەڵ خەڵکی مەجلیس قسەی کرد، کاتی خەو چووە جێی نوستن. نوسەری ئەم پیتانە هێشتا نەگەیی بومەوە مەزڵی خۆم کەبەدوام داهاتن. منی هەژار سەرم سورِما کەدەبێ هۆی بانگ کردنم چی بێ؟ یەکی دیکە گەیشتو گوتی: جەنابی میرزا بەمەرگی موفاجات تەواو بوو. هەمو توشی سەرسورِمانو خەمو پەژارە بون. خەبەرەکەمان بەخاوەن شکۆ راگەیاند. هەر ئەوێ شەوێ تەرمەکەیان لەبن قەڵاهێنا خوارێو شوشتمانو کفنمان کرد. ئێوارەی ئەوی رۆژێ ناردمانەوە تەورێزی. ئەمیرەکان نادیان لەدوی امامقولی خان کە بەلەشکرێکی تەیارەوە لەسەلماس بو.

ئەو روداوە هەمو کەسی پەرێشان کردو کاری قەڵای کەنیزیك بەتەواو بون بو کەمێك وە دواخست قەڵانشینەکان خورِاگرتربون. تا محەمەد بەگی شاملۆ کە کرابووە سەردار گەیشتە جێ، ئەمیرەکانی پێشوو تازە هاتوو بەورِپەرِی لەخۆبوردنەوە خەریکی گرتنی قەڵابون. بەماوەیەکی کورت سەنگەرەکان لەخوارەوە گەیشتنە بن دیوارو بورجەکان بەزەبری تۆپە بەرد وەشێنەکان وەلەرزین کەوتنو درزو کەلێنیان لێ پەیدا بو. لەلای سەرەوە ئازایانی قەڵاشکێن هێرشیان هێناو دوسێ بورجیان داگیرکرد. لەلای سەنگەری پیربوداقخانیشەوە غازیەکانی تورکمان پەلاماریان بۆ بورجەکانی خوارەوە کەکورِە گەورەی ئەمیرخان فەرماندەی بو، بردو پێی هەڵچونو وەسەری کەوتن. پاسەوانەکان خۆیان بۆ رانەگیرا. دەستیان لێ هەڵگرتو رایان کرد بو قەڵای سەرەوە. حەوشەکە کراوەو لەوێ را خەریکی هەڵکەندنی دیواری نێوان دو قەڵاکان بون، پاسەوانەکانی بوزلق پیاویان ناردە خزمەت ئەمیرەکانو ئامانیان خواست تەسلیم بونو بوزلقیان بەدەستەوەدا. سێ قەڵای قایم گیان، کوردەکان لەفرە کەوتن، هەمو رویان لەماڵی ئەمیرخان کرد کەئەوێشیان کردبوە نارین قەڵا.

غازیەکان بێ ترس خۆیان لەقەڵا هاوێشت. جگە لەماڵی ئەمیرخان هەمو کەلێنو قوژبنی قەڵاکەیان داگیر کرد، ئەمیرخان کەتەماشای کرد لەهەمو لاوە بەڵا دەورەی گرتوە، کوردەکانی لەشەرِکردن مەنع کردو ناردیە کن محەمەد خانو تکای کرد کەبۆ خۆی لەگەڵ غازیەکانی شاملۆ بێنە ناو قەڵا، چونکە لەحەسەن خان دەترسمو زۆرمان خوێن لەیەکتر رشتوە، ئەو ئاگاداریمان لێ بکا خۆمو کورِەکانمو خێزانو دەستوپێوەندەکانم بەسەلامەتی بنێریتە بەر بارەگای بەرزی شا.

لەو کاتەدا خان ئەبدالی موکری بەچەند کەس لەنزیکەکانی خۆیەوە هاتە دەر، ئەویان ناردە قۆناغی ئەلیاس خەلیفەی قەرەداغلۆ کەمیوانی ئەو بێ.

لەپاش ئەو محەمەد بەگی برای تویل بەو جەلالیانەوە کە لەقەلآدا بون دەرکەوت، پاشان محەمەد بەگ لەسەر ویستی ئەمیر خان چوە نێو قەلآ، ئەمیرخان‌و کورە گەورەکەی‌و نیزیکەی سەد کەس لەعەشیرەتی برادۆست، هەمو زرێ پۆش‌و تفەنگ بەدەست‌و چەکدار بەهەمو ئەسبابی شەڕەوە لەماڵەوە هاتنە دەر، لەگەڵ محەمەد بەگ یەکتریان دی‌و دوسەد کەسێکیش لەقەلآدا مانەوە.

محەمەد بەگ پاسەوانی بەدیاریەوە دانان کە کەس وێیان نەرزێ‌و روو لەماڵیان نەکا، ئەمیرخان‌و دەستوپێوەندەکانی هێنا ماڵی خۆی‌و خێوەت‌و بارەگایەکی گەورەی تایبەتی بۆ هەڵدان. ناردی لەدوی حەسەن خان‌و ئەمیرەکانی تر کەبێن ئەمیرخان ببینن. جا ئەو دەمی هەرچی قازاغجی دەولەتی تێدا بو ئەوەی بکەن. بۆ خۆشی وێڕای براکانی لەنێویان دانیشت‌و بەگەرمی میوانداری لێ کردن، کەحەسەن خان لەخێوەتەکە نیزیك بوەوە ناردی بەدوای محەمەد بەگی‌داو بانگی کردە دەرێ. نەهاتنی حەسەن خان بۆ خێوەت‌و چونە دەرێ محەمەد بەگ ئەوانی نیگەران‌و دڕدۆنگ کرد، حەسەن خان بەمحەمەد بەگی وت: ((سەرم لەکاری تۆ سوڕماوەو قەت وام لەتێگەیشتن‌و لێزانینی تۆ رانەدەدی کە بەخۆت‌و برایانەوە لەنێو ئەو یاغی‌و سەرکێش‌و لاسارانەدا دابنیشی کە دەستیان لەخوێنی خۆیان شوشتوەو جێ متمانە نین‌و نابێ بەهیچ بارێك بڕوایان پێ بکرێ. تەگبیر ئەوەیە کەئەوان لەبەریەك بڵاو بکەی ئەمیرخان‌و کوڕەکەی‌و چەن کەسیان لەکن خۆت گل بدەوەو ئەوانی دیکە هەرچەند کەسیان بەئەمیرێکی بسپێرە کەپاش ئەوەی فەرمانمان بۆ هات جێ بەجێی دەکەین)).

محەمەد بەگ ئەو قسەی پێ بەجێ بو، پیاوی ناردە کن ئەمیرخانی: ((مانەوەی ئەو هەمو کەسە پێکەوە لەجێگایەك ئیمکانی نیە، بۆ خۆت‌و کوڕو خزمەکانت لێرە بحەسێنەوەو ئەوانی دیکە دادەبەشین)). ئەمیر خان ملی راکێشا بەلآم ئاوەڵەکانی ملیان نەداو گوتیان: ((بۆ خۆت دڵنیای کەئەمیرەکان سەربەخۆ ناوێرن ئەتۆ بکوژن. بەلآم یەکێ لەئێمە ناهێڵن. بڕیارمان وابو کە لەخۆشی‌و ناخۆشی‌دا پێکەوە بژین. ئێستا وادیارە تۆ ژیانی دو رۆژت پێ باشترە. ئێمە لێك هەڵنابڕێین‌و ئەگەر بکوژرێین باپێکەوە بمرین)). جوابیان ناردەوە دەرێ لەکاتی ئەو هاتوچۆیەدا لەماڵی الیاس خەلیفە هەرا پەیدا بو، کاتێك خان ئەبدالی موکریان ناردە قۆناغی ئەلیاس خەلیفە، بۆ خۆی لەسەنگەر بو. پیاوەکانی خەریکی میوانداری‌و بەجێ گەیاندنی ئەرکی پێویست بون‌و شەربەتیان بۆ هێنان‌و، لەو حاڵەدا خەلیفە کەپیاوێکی سۆفی‌و خاوەن ئاکارێکی ساکار بو بەسەردا هاتەوەو میوانەکانی زۆر بەخێرهاتن کردو لەپیاوەکانی توڕە بو کەبەو گەرمایە بۆ چەك‌و

بەرگی شەڕتان لەبرادەران نەکردۆتەوە. خزمەتکارێك کەبەرگی شەڕیان لێ وەرگرێ و سوکیان بکا. خان ئەبدالو ئاواڵەکانی خەیاڵێکی دیکەیان بەدڵدا هات. دەسبەجێ لەجێی خۆیان راپەڕینو شیریان هەڵکێشاو چەن شیریان لەئەلیاس خەلیفە داو چەن کەسیان لەخزمو پیاوەکانی کەبێ چەك بون لەنێو خێوەت بریندار کرد. غازیەکانی قەرەداغلو پێیان زانیو بەشیری روتەوە لەخێوەتی وە ژور کەوتن. ئەلیاس خەلیفەو دوکەس لەخزمانی کوژرابونو چەن کەسیش بریندار بون. رویان لەخان ئەبدال کردو ئەویان بەئاوەڵانەوە لەتوپەت کرد، ئەو روداوە قسەی حەسەن خانی وەڕاست گێڕاو کەس متمانەی بەوان نەما. قزلباشی غەزاکەر روبونە شیانو لەسەر کەسەوە نەچونو شیریان تێ نان، هەرەس لەو روش پێشتر هات بوە دەر، چ کورد چ جەلالی کوژرا. چونکە بەردەست بونی ئەو چینە غەدداره وەك ئیمانی ناهومێدی بو. ئەمیرخانو ئاواڵەکانی هێرشی قزلباشیان بۆ دەورەی خێوەتەکەیان دیو راپەڕینو لبادیان کون کردو غازیەکانیان وە بەر تفەنگدا. لەولاشەوە خێوەت گوللە باران کرا. بیست سێ کەسیان وەبەر هاتن کوژران. ئەوانی دیکە بەشیری روتەوە دەرپەڕینو بەشەڕکردن بەرێگای نەماندا رابردن. لەشکری رق هەستاو واڵی دەست بەکوشتار کرد کەئەو کەسانەی شەش مانگ لەوەی پێش هات بونە دەریش دەرباز نەبون، تەڕو وشك پێکەوە سوتا، ئەوانی لەقەڵاش مابونەوە ئاسەواریان لێ بڕا، بەکورتی قەزاو قەدەر وای هێنابو ئەو روداوە لەخۆیەوە قەوما، پاداشی نمەك بەحەرامی خۆیان وەرگرت. پاش لێکۆڵینەوە زاندرا کەئەمیرخانو ئاواڵەکانی تەگبیریان کردبو هات بونە سەر ئەوە کەرزگارییان لەدەس قزلباش ئیمکانی نیە. گوت بویان((بەرگی شەڕی لەبەردەکەینو چەك هەڵدەگرینو دەچینە دەرێ، هەمو ئەمیرەکان لەو کۆڕەدا کۆدەبنەوە، دەستیان لێ دەدەینە شیان، تا لەدەرەوە ئاگادار دەبن جوقەواریان لێ دەهەرین، ئەگەر توانیمان وە دەرکەوینو خۆ رزگاربکەین ئەوە باشە، ئەگەر نەمانتوانی بەس نیە تۆڵەی خۆمان لەپێشدا کردۆتەوەو خوێنی خۆمان ئەستاندەوەو پیاوانە کوژراوین، بۆیە ئەو ئازایەتیە لەخان ئەبدال رویدا لەپێشدا ئەلیاس خەلیفەی کوشت، خودا بۆ خۆی دەزانێ.

پاش ئەم روداوە کوڕە بچوکەکانیو خاوو خێزانی ئەمیرخان ئەوی مابون، هێنایانن بۆ هۆردوگاو ماڵو سامانی قەلانشینەکان بەسەر غازییەکاندا دابەش کرا لەحاڵێکدا کەهۆردوی خاوەن شکۆ لە گاو دۆڵی مەراغە بو، ئەوی قەوما بو بە عەرزی پیرۆزی گەیشت. لەسەر فەرموده چەند رۆژێك گەنجعلی خان بەخۆیو تفەنگچیەکانیەوە لەبن قەلا مانەوەو ئەمیرەکانی دیکە بەلەشکرەوە رویان

لەدەرگای خاوەن شکۆی عالەمپەنا کرد، لەچیمەنی قەراچوق گەیینە بارەگای پیرۆز، ولاتو سامان و دەسەلاتداری ورمێ بەقبان خانی برای محەمەد بەگی بیگدلی ئەسپێردار. سێ هەزار تومەن زێری نەقدیش بۆ پێداویستیەکانی قەلای دمدمو یارمەتی غازیەکانو پیاوەکانی ئەو دیاری کرا، فەرمان درا لەسنوری ساروقورغانو گاورود تا سەلماس هەمو ئەمیرو حاکمەکان لەبەر حوکمی ئەو دابنو لەقسەی دەرنەچن، ئەویش بەلەشکرێکی تەیارەوە چو بۆ وێنەدرێو خەریکی ئاوەدان کردنەوەی قەلا بو، گەنجعلی خانیش بەخۆیو تفەنگچیەکانیەوە تێکەلی هۆردوی گەورە بوەوە))[٢١].

روداوەکانی گیرانی قەلای دمدم لەناو کوردا بۆتە داستانێکی قارەمانێتی کەبەیتبێژو حیکایەت خوانەکانی کورد بەزیندوێتی پاراستویانە، ئەم چیرۆکە بەچەند جۆرو بەچەند زاراوی جیاواز هۆنراوەتەوەو گێڕدراوەتەوە، بەلام ناوەرۆکی هەمویان لەئازایەتیو خۆڕاگرتنی جەنگاوەرانی کوردو دڕندایەتی هێزەکانی عەجەمدا یەك ئەگرنەوە.

بەر لەکورد خۆی، کوردناسانی بێگانە بەیتی دمدمیان تۆمار کردوەو، لەوەش چەندین تێکستی جیاواز ئێستە بەجێ ماون، کەهەریەکێکیان نرخی تایبەتی خۆی هەیە، لەوانە ئەم تێکستەیان کەئۆسکارمان لەسەرەتای چەرخی بیستەم دا لەموکریان لەزمانی((رەحمان بەکر))ـەوە وەری گرتوەو تۆماری کردوە.

نوسەرانی هاوچەرخی کورد بایەخێکی تایبەتیان داوە بەژیاندنەوەی داستانی قارەمانانەی بەرگری دمدم" عەرەبی شەمۆ، لەداستانێکی هونەریداو، مستەفا سالح کەریم لەچیرۆکێکی درێژدا، دایان رشتۆتەوە.

بەیتی دم دم

دلم راناوەستێ لەبەر ئەوی غەمێ، لەبەر ئەوی ژانێ

بانگێکم وەبەر خولای، ئەوی دیکەم وە بەر پێغەمبەری ئاخر زەمانێ

بانگی دیم وەبەر چاکی گەرمێنیو لەکوێستانێ

بانگی دیکەم وەبەر پیرسولەیمانی لەبانی

بانگی دیکەم وەبەر سولتان سەمەدی مالە خۆی دەکرد لەدەشتی ورمێ لەگەل کەونە لاجانێ

بانگی دیم وەبەر سولتان بایاقوبی مالە خۆی دەکرد لەکێوی فەرەنگی بەرامبەر گردی گۆزەگیانێ

بانگی دیم وەبەر شێخ مارفی مالە خۆی دەکرد لەدەشتی مەحمەشەی بەرامبەر بەگردی گورخانی

بانگی دیم وەبەر بەرماڵ سپی لەچومەلانێ
بانگی دیم وە بەر خدری زیندەو خدرەلیاسان، نەمرن، سەییاحن" کەس بەمەنزڵیان نازانێ
بانگی دیم وە بەر ئیمام حەسەن‌و حوسێنی غەریب، مەرقەدیان لەمەشەدو کەربەلایە عەجەم و کلاورەشیان دەچنە زیارەتی" دەڵێن: رۆژی قیامەتی خولا دەمانداتێ ئیمانی
بانگی دیکەم وەبەر حەزرەتی عەلی رۆژی جومعەو جەماعەتان، سوار دەبێ لەدولدولی، دەست دەداتە زۆلفەقاری، دەچێتە خەزای گاورقرانی
بانگی دیم وەبەر سەوزە پۆشی لەحاجی خۆشی لەترشەکانی
بانگی دیم وەبەر ئەو شۆرە سوار سوڵتان سەعد وەقاسی، ماڵە خۆی دەکرد لەترۆپکی کوێستانی
کەوم لێ بەجوت ئەنگوتن لەقسقەپانی
کەلم لێ یاغی بو لەچیمەنی هۆزانی
لەبن گوێیانم خۆش دی هارەی قالنیە لەگەڵ چریکەی کوتانی
خانم چونە سەر بورجی دمدمی، خۆیان هەڵدەدێرن بەرامبەری بەردی شمشێرخانی دڵی خانی بەبرینە چەند بەبرین برینە، زەینی خۆمدا چیمەنی هۆزانی، چەند شین‌و نازەنینە، چۆمی باراندیزی دێتە خواری، چەند زولاڵ‌و شیرینە، دیواندری، بازار بەتاڵ کەری بو کەس نەماوە، بۆ مەش نامێنێ
خانی برادۆستان گوتیان بەخان ئابدەلی موکرییە: بلا بوت دم برایەکی دایك‌و بابییە، دەستت بۆ باریمە سەر بالچوغەی شیان، کێلانانت بۆ بەجێ بێلم، لەبنەبانیی دم دمییە
خەنجەرانت بۆ دەشکێنم جوێ لەنێروییە
شیرانت بۆ دەشکێنم جوێ لەدانزغییە
دەمانچەت بۆ دەشکێنم جوێ لەمیسرییە
تفەنگانت بۆ دەشکێنم، خانی خۆم، جوێ لەوەستا شاقولییە
رمبانت بۆ دەشکێنم، خانی خۆم، جوێ لەنەزەرییە
مەتالانت بۆ دەشکێنم، خانی خۆم، جوێ لەکەرگەدەنییە
زرییانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لەداودییە
ئەسپانت بۆ دەپسێنم، خانی خۆم، جوێ لەسەگلاوییە
پیاوانت بۆ دەپسێنم خانی خۆم، جوێ لەسی ساڵییە

مەگەر ئەو شەڕەکی کردبێ ، ڕۆستەمی مازندەرانی، لەبن کێـوی دەماوەنـدی سپی دیوی دەهێنا زەوتی شیرییە

مەگەر ئەو شەڕەکی کردبێ، کورە ئێرانیان بەخوێن سیاوەشییە

دڵی خانی بە برین، چەند بـەبرین برینـە! بـۆت دەچـمە گـوڵی دمـدمی، چ دمدمێکی ڕەنگینە، چۆمی باراندیزی دێتە خوارێ، چەندی زولاڵو شـیرینە! لـێم بو بەقەسرێکی جندییە خەگواری دەبریەوە. بلا هەر لەشای هەتتا خونکاری، هەر لەخونکاری هەتا شاهیە. شا بە ئەبدالی گەڕایـە، هـو لەدمـدمی دی دەزگایـە، لەئیسپەهانی لێ کرد رایە. شا عەبباس دەڵێ: حەسەن خانە! بلا بکەین تـەگبیرو رایانە، بەسەرماندا هات زستانە، زستان چوو رابرد هاوینـە زوکـە، شـوغلم بـۆ پێك بێنە، دمدمم لەبوبستێنە، ئەو ساڵ حەوت ساڵە لەمن یاغینە.

دەڵـێ: شـا! جێـی ئاسـییە، ئـەز نایچـۆمی، هیمـدادی بـۆ دێ لـەرۆمی، دەنشکینی، تێك دەدا کومی، دەنکەن بە بەردی بن گۆمی، خەلقی بەعام دەنکەن لۆمێ.

شا عەباس دەڵێ: حەسەن خانی بەغەرەزە، بەس، بکـە قسـەی دە نـا تـەرزە! هەستە لەپێشم رابەزە، لەهیمدادت دەیەم ئەزە، دمدم لەزگی بەغەرەزە

حەسەن خان دەڵێ: شا! بەسم لەسەر بکە نازو ئەرجووان، ئەگەر نەم ئەسـتان بەوان زوان، ڕەشم بکەن هەردوك رووان، دامنێ لەجێ ماڵی جووان.

مەیتەر ئەسپیان دەرهێنانە، زینیان لەپشتی دەکوتانە، تەدارەكو ناڵبەندانـە، چەپەر چو بۆ سەر ئیلانە، بەسەر شارو وڵاتانـە، ئـەو ئـیراتو ئیەوانـە، ڕەشـتو کشمیرو گێلانە، بێت لەورمێ لەلاجانە، سـندوس بێـتو موکریانـە، سـنە بـێ، سنور بێ، کرماشانە، دەرگەزێنە، رژدەستانە، هـەویزو، شوشـتەرو، مەریوانـە، سەد هەزار خانو سوڵتانە، پایتەختیان ئیسپەهانە

وە دەرکەوت لەئیسفەهانی، لەقوشەنی، لەتوغیانی، داروبەرد هاتە هەژیانی، تۆز گرتی بەری ئاسمانی، بوە رۆژی ئاخر زەمانی

دە قوشەنان کەوت غلووە، لەشکر تیپ تیپ ئاوا بـووە، مـەنزلێکیان، هـات قافلانتووە

لەو کافری دە بە فێلە، سـەری رمبیـان دەلێـی بێلـە، لەشـکر لـەدوی بـوو بەخێلە، مەنزلێکیان، هات ئەردەویلە

کافر داژوین لەمەجیزە، مەلعونـە دیـن ریـز بـەریزە، مـەنزلێکیان، دەشـتی تەوریزە

دێ لرفــە لرفــی بەیــداغان، دێ دەنگــی زری‌و قولچــاغان، مــەنزل لــەبناو مەراغان

قوشەن دێ رێ بەرییە، دەڵێ: خانی موکری لەکوێیە؟ مەنزڵێکیان، لەدەشتی خوییە، لەشکر ئاژوای بەمەخسوسی، لەخانی موکری دەپرسێ، لەشکر لەدەشتی سندوسی، چەند لەشکرێکی ئەنگامەیە. بەقوشــەن‌و زەمزەمەیــە، هــات گرتــی گەلی دارنەیە(رەحمان بەکر)یان لەگەڵ هەیە

جواب چو لەبۆ خانییە، چاکە خۆ بکا قەوییە، عالەم بۆ ئــەو بزوتییــە، چــاك شەڕێك لەسەر دینییە.

خان دەڵێ: ئەو شا بێ، ئەمنیش خانم، خالەق بێ بەپشتیوانم، غوڵامی رەوێــك شێرانم، قاتلی کوللی شیعانم

رۆژێکی بەیانی بەردا، لەشکری شای هــات لەســەردا، رای پۆشــی بــو، دارو بەردا، هات لەبن دمدمی وردا

دمدمم بەردی مەیــدانی، لێــی دەن تــۆپی ئیسفەهانی، تــۆز گرتــیّ بــەری ئاسمانی، مەرد چاتی‌دا دەگرن مانی، بۆ رۆژی ئاخر زەمانی

دمدم بەردی لەنزاری، لێیاندا تــۆپی هەوشــاری، حــەوت شــەو و رۆژان ئــاور باری، دونیای داگرت، بەیەکجاری، خەبەر چو لەبۆ هەوشاری

دمدمم بەردی لەبەردی، لێی دەن تۆپی نەبەردی، تا رۆژی مەردی‌و نامەردی

دمدمم بەردێکی زوپە، لێ یاندا تۆپخانە‌و تۆپە

دمدم بەردێکی پانە، لێ یاندا تۆپ‌و تۆپخانە، قەلاتی پێ بکەن وێرانە

دمدمم بەردێکی مەیدانی، لێــی دەن تــۆپی لــەکارخانی، کاریتــەی گەییــە هۆزانی

دمدمم بەردی دەبەیە، لێی دەن بەتۆپی کەلەیە، کاریتەی گەییە کوکەیە

خان بە خەزایە مەشغوڵە!

دەمم بەردێکی خڕە، چوار تەرەفی لێوە بڕە، بەهەشتی بەشیر بکرە

خان بەخەزایە مەشغوڵە!

دمدمم بەردێکی شینە، چــوار زســتانە، پێــنج هاوینــە، تێیــدا خــانی لــەپ زێڕینە، زەفەریان پێ نەبردینە

وەکیل‌و وەزیر دەڵێن: خان، ئەوهە کینە؟

خان فەرموی: ئەوە کاروانینە

خان بەخەزایە مەشغوڵە!

خانێك رابو لەكوردانە، كێ بو، لەحەمەد بەگی لیتانە، روی رەش بێ لەگەڵ جووانە! لەسەر یەك نیمچون ناڵانە، زیز بو، چو بۆ نێو ئەوانە، پێی نیشان دان سولە خانە. كێ بو؟ لەكافری بێ ئیمانە، تێیان كرد هاش‌و دەرمانە، پێی قڕ دەبون موسڵمانە، لەوان بوە رۆژی تەنگانە، لەكنیان ئاخرەت زەمانە، چەند گریان ئەو خاتونانە، لێیان تێك چو جێ‌و مەكانە، خولایان بێت پشتیوانە!

خاتونێك دێتە مەیدانێ، لەدڵی خانی دەدا تانێ: لێت حەرام بێ جێی كابانێ، ئاو نییە پێی بكەین شیلانێ

خاتونێك دێ‌و دەبەزی: رەبی، خانە مارت گەزی، لێم رەش بون سەرو كەزی

خاتونێك دی بەفەقیری، چۆكی دادەدا لەپێش میری: خان، سەلا لەمنی فەقیری! خان ئاو نیە پێی بكەین هەویری، خان حەیفە، تۆ بێ مودەبیری

خان بەخەزایە مەشغوڵە!

كێ بو؟ لەخانی لەپ زێڕینە، لەشەرافەتی خاتونی شیرینە، بەفرێك باری بەهاوینە، لەشەرافەتی خانی لەپ زێڕینە، حەوت شەوو رۆژان بەوێ ژینە

رایان وا بو بەهەزاری: سواركەین خدری بریندار، بە چەپەر بچێ بۆ خزمەت خونكاری

وەزیر وای گوت بە بوێری: چاكە قاقەزی بنێرێ، قەلاتی بۆ شای بەجێ بێڵی

كێ بو؟ لەخانی جندییە" گوتیە تایفەی خەزاییە، هەرچی هەڵێ قەیدی نییە، هەرچی بمرێ فیداییە، هەرچی بكوژرێ خەزاییە

تایفێك بو، تایفە كافری، گوتیان بەخان: پوچ‌و ناماقوڵت كرد تا سەرت هەڵدەگرێ" دەس بەشیر دەچین بۆ لەشكری

كێ بو، لەخانی جندییە" دەڵێ: بانگی حەق وە ر ئەوێیە، بێ شەریكە، هیچ شەریكی نییە، غەیرەز خولا هیچ كەسێ نییە، یا بێ شێخی گەیلانی، شێخ جونیدی بەغدادییە، سوڵتان مەعروفی كەرخییە، بابی فەرخی داودییە، بابی رابیعەی عەدەوییە، بابی شەمسی تەورێزییە، شێخ مەحمودی باڵەكییە، عەبدولعەزیزی شنۆییە، شێخ رەشی گەرگەروییە

لەمەیدانی شەڕە قەرقەشە، لەجێ راوگان كەوت بو لەشە، خان دەپرسێ: ئەوهە كێیە؟

خان! گورەی ئەسحابە رەشە

سوارێك هاتوە ئەسپی شییە، خان دەپرسێ: ئەوهە كێیە؟

خان! ئەوە گورەی پیرۆتی مەرگییە

سوارێك هاتوه بەنادری، بەس نی‌یە چەکان وەرگرێ، خان دەپرسێ: ئەوهە کێیە؟

خان! ئەوە عەزرەتی خدری

سوارێك هاتوە لەبۆ گەشتی، بەویە سورەتی بەهەشتن، خان دەپرسێ: ئەوهە کێیە؟

ئەوهە وەیسی ماهی دەشتی

سوارێك هاتوە لەکارخانی، بەویە سورەتی ئیمانی، خان دەپرسێ: ئەوهە کێیە؟

خان! شێخ عەبدولقادری گەیلانی

سوارێك هاتوە هونەرمەندە، ئەسپابی دەعوایەی رەندە، خان دەپرسێ: ئەوهە کێیە؟

خان! ئەوهە شاهی نەخشبەندە

سوارێك هاتوە ئەسپی تازە، مل بەقەتلا پر ئەنگازە

خان دەپرسێ: ئەوهە کێیە؟

خان! ئەوەش سوڵتان سەعدی وەقازە

سەلاح شوران دەست دا چەهان، لەگەڵ سەفی دە مەلەکان، دیت گورەی شێخی بالەکان

خان بەخەزایە مەشغوڵە!

هات عەشەرەی دە موبەشەرە، هەمزەو هەباسو هەیدەرە، لەگەڵ مەقلوبی پەڕ بەسەرە.

ئالآچی سوڵتان سەمەرە. بابی ئالآی نەبی‌یە، حەوت تیپی تێك پەراندییە، خان دەپرسێ: ئەوهە کێیە؟

کورژنی حەزرەتی عەلییە

بابی بەیداغی پێغەمبەری، هەمزە بێ لەگەڵ عومبەری، بێ خالیدی ئیینی وەلی

خان بەخەزایە مەشغوڵە!

خان دەڵێ: ئەبدال بەگە، رۆڵەی بابی، بەمن دەکەی چاك چاك دەبێ

دەڵێ: بابە، چبکەم، لێرەوارە، دوایی نایێ

با بکەین مەدحی هورمز بەگی، رەبی نەزەری بەچەنگی، لەهەزاری دەبرێ مەرگی

خان ئەبدالو کاکە خانە، حەوت شەوانو حەوت رۆژانە، شەڕیان دەکرد بەشێرانە. شیران نەیان دی کیلانە، لەش کەوت بون وەکی گردانە، خوێن روی هەروەك جۆگانە، بالچوغەی شیران نەمانە، شەهیدیان کرد کاکە خانە

خان دەڵێ: خانی خەزایی مە، هەتتا لەدنی ئەز بژی مە، بۆ خۆم پەرژینی شەڕی مە

خان ئاودالو کاکە خانە، گرتبویان وەعدەو پەیمانە: دەست هەڵ ناگرن لەو کارانە

بانگم وەبەر میری میران! خان بۆ خۆی دەکا تەگبیران، حەوت پولی دایە بەر شیران

بانگم وەبەر پادشای قودرەتی!

خانیان شەهید کرد بەکوتکی خێوەتی

هاوارو رۆ رۆ دمدمە!

رۆژێکی تاو هەڵاتی، عەجەم دە کاتن غەباتێ، سەبر هەڵدەکشا بۆ بن قەڵاتێ

کوانێ سواری دە نازەنین؟

کێ بو لەئالی ئادەمان؟ قەڵاتی هەڵگرت بەزەمان

کێ بو لەئالی ئادەمانە؟ قەلاتی هەڵگرت بەزەمانە، حەوت شەو وحەوت رۆژانە، شەڕی دەکرد

بەتۆپانە، قەڵاتی لەدو نەدانە

کوانێ سواری دە نازەنین؟

کێ بو لەئالی بەجەرگە، لەوانی کردوە دەرگە، لەخەنجەری دە منی زەرگە، لەهەزاری دەبرێ مەرگە

هاوارو رۆ رۆ دمدمە!

کێ بو لەخاتون پەروەری، گوتی: کاك ئالێ ئەتۆ ماوی ئەتوش هەڵێ

کێ لەبەر کاك ئالییە، گوتی: خاتونی، پوچو ناماقوڵت کردییە، بەشی خۆم خەزا کردییە، شەهیدییان کرد کاك ئالییە

هاوارو رۆرۆ دمدمە!

کێ بو لەخاتونی خانی: قبوڵ ناکەن کافرستانی، خۆمان هەڵدەدێرین لەچل کەوانی

ئەی دمدمی بەردی دەلان! جێگەی خانو ئاودەلان، ئێستا بوی بەمەسکەنی خەرتەلان.

کوانێ سواری دەنازەنین؟[٢٢]

**نمونه٨:**
**لطائف الحيل" قەتلو عامی موکری(١٠١٩)**

تا صارم خان مابو، میرایەتی موکری لەژێر دەستدا بو. قزلباش نەیان توانی ناوچەکەی لێ زەوت بکەن. صارم خان کەمرد، ٣ کوڕی لێ بەجێ مان: قاسم، ئیبراهیم، حاجی عومەر، بەڵام هەرسێکیان لەتافی لاویدا مردن، هیچ کامیان جێگەی باوکیان پێ پڕ نەکرایەوە.

لەبرازاکانی صارم خان، ڕۆستەمی کوڕی بابە عومەری کوڕی میر سەیفەدین ٣ کوڕی هەبو: شێخ حەیدەر، میر نەزەر، میر خضر. لەپاش کوڕەکانی صارم کاروباری ئەمارەتی موکری بۆ ئەوان مایەوە. ئەوانیش ناوچەکەیان لەناو خۆیاندا دابەش کردو خۆیان هاوێشتە ژێر دەسەڵاتی شا تهماسبی سەفەوییەوە. لەو هێرشەدا کەئۆردوی عوسمانی، بۆ پشتیوانی لەئەلقاس میرزای برای شا تەهماسب، بۆ سەر ئێرانی کرد، سوڵتان سلێمان، هێزێکی پێکهاتوی لەسوڵتان حسێنی حاکمی ئامێدیو، زەینەل بەگی حاکمی هەکاریو، ئەمیرەکانی برادۆست نارده سەر مەزنەکانی موکری(٩٤٨)هەر ٣ برا لەو شەڕانەدا کوژران.

لەشێخ حەیدەر ٢ کوڕ: میرە، حسێنو، لەمیر نەزەر ١کوڕ: بەیرامو، لەمیر خضر ٢کوڕ: ئەلغ بەگ، میر حسێن، بەجێ مابون، ئەمانە هەمویان منداڵ بون. پاش گرتنەوەی ناوچەکە سوڵتانی عوسمانی میرایەتی موکری بەمیرە بەگی کوڕی حاجی عومەری کوڕی صارم خان سپارد. ئەویش بەلێوەشاوەیی ماوەی ٣٠ ساڵ لەکاروباری موکریانی بەڕێوە برد. کەمرد مستەفا بەگی لەپاش بەجێ ما.

لەو سەردەمەدا میرە بەگی کوڕی شێخ حەیدەریش گەورە بوبو. بەڵام ئەو دابویە پاڵ تهماسب. دڵسۆزو گوێڕایەڵی ئەو بو تا مردو ئیسماعیلی دوەم جێگەی گرتەوە. میرە بەگ بۆ نوێ کردنەوەی دڵسۆزی چوە قەزوین بۆ لای شا ئیسماعیل شا ڕێزێکی زۆری لێ نا. زۆری پێ نەچو شا ئیسماعیل کوژرا. شا محەمەد خودابەندە لەسەر تەختی شایەتی دانیشت. لەم سەردەمەدا سەرانی قزلباش لەناوخۆیان تێك چوبون، کاروباری دەربار شێوا بو. میرە بەگ لەگەڵ زۆرێ لەئەمیرو حاکمەکانی کوردستانو لورستانو ئەردەڵان چوە ژێر سایەی سوڵتان مرادی عوسمانییەوە(٩٩١). میرە بەگ ٤ کوڕی هەبو: شێخ حەیدەر، بوادق، حسێن، قاسم، سوڵتان مراد هەر چواری بەسنجەق بەگ دانا بون.

هەر لەو سەردەمەدا میرە بەگ لەگەڵ محەمەد پاشای میری میرانی وان لەلای ورمێوە هێرشیان کردە سەر مەراغەو، قزلباشیان لێ دەرکرد.؟ ڕەوەی بەناوبانگی شا تهماسبیان تالان کرد. لەسەر ئەوە میرە بەگ کرایە بەگلەربەگی مەراغە بەو

مەرجەی لەقزلباش پاکی بکاتەوە. لەم ڕۆژگارەدا سنوری دەسەڵاتی میرەکانی موکری زۆر فراوان بوبو. جگە لەمەراغە، سوڵتان چەند شوێنی تری لەسنجاقەکانی هەولێرو موسڵ پێ سپارد بون.

ناوچەی موکریان، بەهۆی نزیکییەوە لەتەورێزو قەزوین، لەململانێی ڕۆمو عەجەمدا جێگەیەکی تایبەتی هەبو. کاربەدەستانی تورك، ئەگەرچی لەشەڕەکانی خۆیاندا کوردیان دژی قزلباش بەکارئەهێنا، بەڵام نەیان ئەهێشت بنەماڵەیەکی دەسەڵاتداری کورد لەو ناوچەیەدا بەهێز بێ.

هێزەکانی عوسمانی تەورێزیان گرت. جەعفەر پاشا وەزیری پارێزگاری ئەوێ بو. کەوتە گێچەڵ بەمیرە بەگ. سنجاقەکانی بابانو موسڵو هەولێری لێ سەندەوە. سەرەنجام مەراغەشی لێ وەرگرتەوە. میرە بەگ بەناوچە میراتییەکانی باوباپیرانی داکەوت.

شەڕی ڕۆمو عەجەم لەپێوەندی ناو بنەماڵەی میرەکانی ئەوێشدا ڕەنگی دایەوە. ئەوانیش لەناو خۆیاندا لەسەر دەسەلات کەوتنە ململانێ لەگەڵ یەکتری. دڵسۆزی خۆیان ئەگۆڕی. بەگژ یەکتریدا ئەچونو، پیلانیان لەیەکتری ئەگێڕا. کەخضر پاشا لەجێگەی جەعفەر پاشا بو بەوالی تەورێز(۱۰۰۲)ئێلە کوردەکانی ئەوێی کرد بەگژ یەکتریدا. مەحمودییەکانی کرد بەگژ موکرییەکانداو بەشەڕی دان. مەزنەکانی موکریش لەناو خۆیاندا کوك نەبون. بوداق خۆی مرد. حسێن، قاسمی برای کوشت. شێخ حەیدەریش لەتۆڵەی خوێنی قاسمدا حسێنی کوشتەوە.

لەئەنجامی ئەو ڕوداوانەدا میرایەتی موکری لاوازو سنورەکەشی تەسك بووەوە. شێخ حەیدەر قەڵای ساروقورغانی لەمەراغا ئاوەدان کرد بوەوە[۲۳].

شا عەباس کەتەورێزو ئازەربایجانی لەعوسمانییەکان گرتەوە. شێخ حەیدەر چوە ژێر ئاڵای سەفەوییەوە. لەشەڕەکانی قافقازدا بەشدار بو. لەبن قەڵای ئێرەواندا کوژرا.

شا عەباس لەچوارچێوەی ئەو سیاسەتەدا کەبۆ شکاندنی شانو شکۆی ئێلە کوردەکان گرت بوی. دوای ڕاگوێزانی دەیان هەزار خێزانی ئێلە کوردەکانی سەروی دەریاچەی ورمێ بۆ خوراسانو، داگیرکردنی قەڵای دمدمو، سەرکوت کردنی ئێلەکانی برادۆست. چوە سەر ئێلەکانی موکریو بەرپەری دڵڕەقییەوە، قەتلوعامی کردن. دو کەس لەنوسەرانی ناسراوی ئەو زەمانە ئەم ڕوداوەیان بەدرێژی گێڕاوەتەوە. یەکێکیان مەلا جەلال منجم کە لەبەشی یەکەمی ئەم باسەدا هەندێ لەنوسینەکانی ڕاگوێزراو. ئەو مەسەلەکە بە((لطائف الحيل))ناو ئەبا. ئەوی تریان ئەسکەندەر بەگی تورکمان لەکتێبی عالەم ئارای عەباسیدا.

هێمن، نوسینەکەی ئەسکەندەر بەگی وەرگێڕاوەتە سەر زاراوەی موکریانی، والێرەدا وەکو خۆی دوبارە ئەی نوسینەوە. ئەسکەندەر بەگ نوسیویێتی:

## باسی بەرەو مەراغە چونی شاو ڕق هەستانی لەتیرەی موکری و قەتلوعامی ئەو تیرە

عەشیرەتی موکری لەپێڕەوانی ئەم دەوڵەتەو لەسنوری گاودۆڵی مەراغەو سندوس و میاندواودا نیشتەجێ بون. لەسەردەمی شای بەهەشتیدا سەرکردەی ئەو تیرە بەدەست ئەمیرە ناوێکەوە بو. پاش مردنی شاو لەسەر تەخت دانیشتنی سوڵتان محەمەد پادشا کەسوڵتانی ڕۆم بو پەیمانی باوك و باپیرانی خۆی هەڵوەشاندەوەو دنیای هێدی و هێمنی تاڵۆزو پەرێشان کرد، شەڕ هەڵایسێنە بەدفەڕەکانی سنور بازاڕیان گەرم بو. ئەمیرەی ناوبراو کەزۆر ساڵان نمەك پەروەردەی ئەم دەوڵەتە بو. ڕێگای نمەك بەحەرامی و یاغی بون و هەڵگەڕانەوەی گرتەپێش. لەگەڵ ڕۆمیان ڕێ کەوت و دەستی کرد بەتاڵان و کوشتار. لەسندوس و میاندواو ومەراغە دا هاتە سەر ڕەوەی (قەراجیوق)کەڕەوەی تایبەتی حەزرەتی شای بەهەشتی بو و بەباشی ناوبانگی بەدنیادا روی بو. ژمارەیەکی زۆری لەڕەوەکان و پاسەوانی‌ڕەوە کوشت بون و ڕەوەکەی داگیرکرد بو. هەمیشە لەگەڵ ئەو ئەمیرو قزلباشانەی دەبونە حاکمی مەراغە شەڕو کێشە هەبو. دەمێکیش لەخراپە وکوشتارو بەدیل گرتنی ژن و منداڵ رانەدەوەستا. پاش مردنی ئەمیرە بەگ شێخ حەیدەر بەدەستوری بیگلەربەگی ڕۆمیان بو بە ئەمیرو لەباوکی زیاتر سەربەخۆیی پەیداکرد.

بەڵام لەزەمانی فەرمانڕەوایی سوڵتان محەمەد خاندا لەراس جەعفەر پاشای بیگلەربەگی تەوریز سەرکێشی دەکرد. چەند جار نیزیکانی خۆی ناردە بارەگای عالەم پەنای پادشای مەزن و پچوکیی خۆی نیشان دەدا. تا شاهەنشا بۆ داگیرکردنی ئازربایجان چو. شێخ حەیدەر هات بۆ ریسمە ماچ کردن و لاواندراوە، حەزرەتی شای پایە بەرزو سێبەری خودا هەڵەکانی پێشوی تیرەی موکری بەخشی. دەسەڵاتی مەراغەو دەوروپشتی کەهەمیشە بەدەست یەکێك لەئەمیرە مەزنەکانی قزلباشەوە بو دا بەشێخ حەیدەر. ئەو لەبن قەڵای ئێرەوان وەك لەجێی خۆی باس کراوە کوژرا. خاوەن شکۆ لەبەر هەقناسی جێی باوکیدا بەقوبادخانی کوڕی کەهێشتا منداڵ بو. بەکەیخوداو ردین سپیەکانی عیلی فەرمو تا کور گەورە دەبێ لەقسەی دایکی کەکچی پیاو ماقوڵێکی قزلباش و ژنێکی وشیارو ئاقڵ بو دەرنەچن. بۆ ئەوەی قوبادخان خۆ بگرێ برایەکی شێخ حەیدەر کەناوی ئەمیرخان

بەگ بو لەنێو عیل هێنا دەرو جێو پایەی دایەو کردی بەحاکمی گەرمرود. براکەی تری خان ئەبدال داوای مەزنایەتی دەکردو سەری بۆ برازاکەی دانەدەنواندو هێندێك پیاوخراپو بەد فەری مورکی لەخۆ هالاند بو. چەند جار لەشکری ناردرا سەرو دەریان پەڕاند. تا ئاخری وەك باسکرا پەنای بۆ ئەمیرخانی برادۆست بردو لەکن ئەو مایەوە لوتفو دڵسۆزی شاهانە قوبادخانی گرتەوەو سەربەخۆیی تەواوی پەیداکردو هەمو هۆزەکانی موکری بەردەست بو. لەنێو سەرهۆزانی ئەم تیرەدا پیاوی بەراز سروشتو رێوی سیفەت هەبون کە لەرێگای راست دورکەوت بونەوەو لەچۆڵی سەرەرۆیی‌دا گەورە ببونو لەگەڵ قزلباشان کە لەمەراغە خاوەن موڵك بون خراپ دەجوڵانەوەو بەزۆر زەویەکانیان داگیر دەکردن.

قوبادخانیش کە گەیشتێ لەبەرنەزانی وپیسی دەرونی لەگەڵ قزلباشان رەفتارێکی نالەباری گرتە پێش. هەرچەند لەو چەند ساڵەی دوایی‌دا زۆر نافەرمانیو ئاکاری دزێو لەخۆیو لەژێردەستەکانی دەبیندراو گەرد لەسەر دڵی مبارەکی شاهانە دەنیشت. بەڵام لەبەر بەزەییو دڵسۆزی تایبەتی خۆیو لەپێش چاوگرتنی خزمەتی شێخ حەیدەر چاوپۆشی لێ دەکرا. تا وای لێ هات ئاوی لەئاوەڕۆیان دەرکردو سەرەرۆییو لاساری لەرادە بردە دەر، هەر وەکو ساڵی رابردو حوکم کرا بو کەقوبادخان بچێتە کن اعتمادالدولەو لەداگیرکردنی قەڵای دمدمدا لەگەڵ لەشکر بەشداری بکا، خۆی لەو خزمەتەش بواردو نەچو.

لەبەهاری‌دا کەخاوەن شکۆ خەریك بو بۆ رێکخستنی کاروباری ئەو ناوچەیە بەرەو سنور بچێ. قوباد خانیش ناچارو بەخۆیو چەند کەس. لەدەوروپشتەکانیەوە لەیورت قشلاق بەخزمەت گەیشت، چونکە دڵی پاكو روناکی شاهانە لەسەرەرۆیی لاساری ئەوان گەردی لێ نیشت بو، هاتە سەر ئەوە کەئەوان شیاوی لوتفو دڵسۆزی نینو راوەستان لەتەمێ کردنی توندی ئەوان بەقازانجی دەوڵەت نیەو خراپەو کێشەی پتری لێ پەیدا دەبێ. خۆی لەتەمێ کردنیان خۆش کرد. بەڵام بەلێزانیو هۆشیاری خۆیەوە جاری خۆی راگرتو لوتفی لەگەڵ کردن تا گەیشتە مەراغە. قوبادخانو ردێن سپیەکانی موکری لەوە دەترسان شا داوای رەوەی قەراجیوق بکاتەوە. بۆیە بەفێڵ ئەسپە باشو هەڵبژاردەکانیان ناردە جێگایەکی دوردەستو چەند بارگینی نارەسەنی کوردیان لەوێ هێشتەوە، تا ئەگەر باسی رەوە هاتە گۆڕێ ئەوان نیشان بدەن. هەروەها ئاشکرا بو کەهەمیشە لەگەڵ سەردارانی رۆمی کەینو بەینیان بوەو خراپەیان لەگەڵ لێ قەوماو هەژاران کردوەو لەبەر تەعسسوبی مەزەبی زۆریان شیعەکانی مەراغە ئازار داوە. کەوابو دەستی زۆرداران دەبو لەیەخەی هەژاران بکرێتەوە.

بەکورتی لەنێوبردنی ئەو تیپە بەدفەڕو سەرەڕۆیە کە لەموسڵمانی هەر ناوێکیان هەبو ئەرکی سەر ئەستۆی شای دادپەروەر بو، ئاگری رقو تورەیی‌وا لەدڵی خاوێنی شاهانەدا بڵێسەی گرت بو کەتەنیا بەخوێنی ئەو بێ فەڕانە وە کارکەوتنی شیری ئاگربار نەبایە نەدەکوژاوەو دانەدەمرکاوە. لەکاتێکدا کەبارەگای بەرز لەگاودول هەڵی دابوو، رۆژێك قوبادخان بەخۆی‌و سەدو پەنجا کەسەوە رویان لەبارەگای بەرز کرد. ئێوارە وەخت بو گەیشتن. لەگەڵ چوار کەس لەخزمەکانی بۆ حوزور بانگ کران. کە وە ژور سەراپەردە کەوت لەسەر فەرمانی شا لەوەختی چەکمە داکەندن‌دا غولامان بێ ئەوەی بێڵن ببزون کوت کوتیان کردن. کەلاکی پیسی ئەوانیان بۆ کوچەی پشت سەراپەردە راکێشا. بۆ ئەوەی زیانێك لەلایەن ئەو پیاوخراپانەوە بەغولامان نەگا، فەرمان بەعەلی قولی خانی ئیشك ئاغاسی باشی شاملۆ درا لەبەر دەرکی سەراپەردە راوەستێ، یەك یەك بانگیان بکا بۆ مەجلیس. کە وە ژور سەراپەردەی پیرۆز کەوتن دەسبەجێ غولامان بیانکوژن‌و کەلاکیان باوێژنە کوچەی پشت سەراپەردە، تا لەپێش چاوان ون بن. تا بیست سی کەس بەو جۆرە کوژران‌و یەك بەدوای یەکدا فڕێ دران، ئەوانی دەرێ کەمێك دڕدۆنگ بون. یەکیان کەهاتە ژورێ تەماشای کرد خوێن زۆر رژاوەو قوبادخان‌و ئەوانیش دیار نین، قیژاندی‌و دەستی‌دا خەنجەر محبعلی خانی شاهی سیونی برینداركرد. دوسێ کەس کەبەدوای‌دا دەهاتن کشانەوەو خەریکی راکردن بون. غولامان‌و قورچیان تێیان وروکان. هەر لەوێ پارچە پارچەیان کردن. ئەوانی دەرەوە تێ گەیشتن، رایان کردە ئەسپان، هێندێك هەر لەو دەوروبەرە هێندێك لەوەختی راکردندا کوژران‌و تاقیان لێ برا. لەو وەختە بەسامەدا خاوەن شکۆ هاتە دەرو سواری ئەسپی رەسەن‌و خۆشبەز بو روی لەقەلای گاودول کردو سەربازانی قزلباش کوشتن‌و تالانی عەشایری موکرییان پێ ئەسپێردرا. خاوەن شکۆ بەتلیك لەشەو چوبو گەیشتە قەلای گاودۆل.

هێشتا ئەم خەبەرە نەگەیی بوە قەلاکە لەشکر بەزۆر قەلا وەربو هەر کەسیان وەگیر کەوت خستیان. علیقلی خان ناردرا بۆ حەوشەیەی دیکە کە لەو نزیکانە بو. پەنجا شەست کەسێکی دەست بەستراوی هێنا دەرگای بەرز. غازیە تۆڵە ئەستێنەکان بەچاو قوچاندنێك هەمویانی ناردنە ولاتی نەبون. زۆر لەو کەسانەی دەیان هێنان خزمەتکارو پیمەرە دارەکان هەر بەزەبری گۆپاڵو پاچ‌و پیمەرە سەرو مێشکیان دەکوتان و دەهاڕین. ئەسفەندیاربەگی ئاوچی باشی عەرەبکەرلو لەسەر فەرمانی خاوەن شکۆ بەسەررەو ناردرا بۆ گەرمرودو بەفێڵێکی شەڕکەرانەوە ئەمیرخانی برای شێخ حەیدەرو ئەو پەنجا کەسەی لەتیرەی موکری کە

لەگەڵ ئەو بون بەجارێك كوشت. حسێن سوڵتان برازای شێخ حەیدەرو ئەوانەی لەگەڵ ئەو لەورمێ بون بەدەستی حەسەن خان كوژران.

بەكورتی قەتلی عامی ئەو تیرە بەقەڵەمی تەقدیر لەسەر لاپەڕەی رۆژگار نوسرا. ئەو چەند رۆژەی كەشا لەقەڵای گاودوڵ ماوە، هەمو رۆژێ دەستە دەستەو پۆل پۆل دەیان هێنانو لەسەریان دەدان. بەهرامی خوێنخۆر تاوێك لەتیغ وەشاندنو خوێن رشتن رانەدەوەستا. هێندێك لەئویماقو ئیبیو ئوریاد كە لەنێو ئەوان مابونەوە. بەو تاوانەی لەنێو تیرەی دژی دەوڵەتدا خۆیان مات كردوەو لەكاتی دەسەڵاتی رۆمیاندا نەگەڕاونەوە نێو قزلباش هەمویان كوژران.

بیبڕینەوە ئاورگی تیرەی موكری كوژاوەو نیەوەنەكان هەمو كەوتنە بەر مەودای شیری بەبڕشتو ژن و منداڵەكانیشیان بەدیل گیران. پاش چەند رۆژ بلێسەی رقی شاهانە تا رادەیەك دامركانەوەو شێربەگ ناوێك لەو بنەماڵە كەهەمیشە خۆی بەخزمەتكار دەزانێو مەخسود بەگ ناوێك كەبرای ئەو لەریزی ئیشك ئاغاسیانی بارەگای بەرزدا بو، كرانە گەورەو مەزنی موكریو فەرمان درا ئەوانەی لەمەودای شێر رزگار بونو لەكەلێنو پەسیواندا ماونەوە، پەنا بۆ ئەوان بەرنو لەكوشتنو تالآن ئەمین بن.

((پاش ئەم روداوە شا چەند رۆژێك لەنێو ئەسپەكانی رەوەدا لەچیمەنی قەراجیوق رای بواردو ولآتی مەراغەی بەسوڵتان میر مقدم ئەسپارد[٢٤].

### ٤/٢ شاه سوڵتان حسێن

### نمونە٩:

### كەللە منار لەسەری كورد(١١١٣)

شاه سوڵتان حسێن(١١٠٥-١١٣٥)كوڕە گەورەی شاه سلێمانی سەفەوی لەپاش مردنی باوكی بو بە شا، بەكابرایەكی بودەڵەی دەبەنگ، بەڵآم بەیەكێ لەهەرە فاسیدترین شاهەكانی ئێران ناسراوە[٢٥] نوسەری ((رستم التواریخ))لەگێڕانەوەی باسی رابواردنی شادا نوسیویێتی:"

((... نزیكەی هەزار كچۆڵەی صبیحەی جمیلە، لەهەر طائفەو قەومو قەبیلە، لەعەرەبو عەجەمو تورکو تاجیكو دەیلەم، لەسەر رێوشوێنی بوكێیو زاوایی بەعەقدو نیكاحو حەباڵەی خۆی دەرهێنابو، مناڵو نەوەكانی لەنێرومێ، گەورەو پچوك، بەمەزەنە ئەگەیشتنە هەزار كەس..))[٢٦]

هەر لەستایشی ژوری رابواردنەكەیدا دەڵێ:

((لەو سەرا بەهەشت ئاسایەدا، ژورێكی دڵگوشایان دروست كردو جێگایەكی قوڵیان تیا بینا كرد لەهەردو لاوە بەرەو خوار، دەمی سەروی حەوت

گەزو دەمی خواروی یەك گەزو، لەسەرێ تا خوارێ بەردی مەرمەڕیان دانابو، ئەو ژورەیان بەزینەتی زۆردروستو رازاند بوەوە، جاربە جارێ ئەو تاقانەی رۆژگارە خۆی روت ئەکردەوە، ژنێکی مانگ روی ئەندام زێوینیش خۆی روت ئەکردەوە، لەسەرەوەی ئەو شوێنە قوڵەوە روبەڕوی یەك دائەنیشتن، لنگی خۆیان درێژ ئەکردو، بەئارەزوەوە بەوردی ئەیان روانییە یەکتریو ئەخزان، لەسەرەوە تاخوارێ کە بەیەك ئەگەیشتن ئەلفی راست ئەچوە ناو خانەی کافەوە. ئینجا ئەو دو تالبو مەتلوبە دەستیان ئەکردە ملی یەکتریو پاش دەسبازیو ماچوموچێکی زۆر... بەو شوێنەیان ئەوت حەزخانە.

سەرەڕای حەزخانە، شاە جێگایەکی تریشی هەبو، پێیان ئەوت لەززەتخانە ژورێکی خڕی فراوان بو، جاروبار شا لەگەڵ چل پەنجا ئافرەتی شۆخو شەنگدا ئەچوە ناوی، شا خۆی بەڕوتی لەناوەڕاستی ژورەکەدا دائەنیشتو ژنەکانیش هەمویان لەچواردەوری بەڕوتی، هەریەکەیان سەرینێکی ئەخستە ژێر کەمەریەوە، ئەژنۆیان ئەنوشتانەوەو، پێیان ئەنایە ژێر کەمەریان، بەپشتا پاڵ ئەکەوتن. بۆ ئەوەی ئارەزوی شا ببزوێنن، هەر یەکەیان هەوڵی ئەدا سەرنجی شا بۆ خۆی رابکێشێ. شا کەئارەزوی ئەچوە سەر هەرکامێکیان ئەوەیانی هەڵ ئەبژارد. ئەو ژورەی ئەم بەزمەی تیا ئەکرا لەززەتخانە بو...))[٢٧].

لەسەردەمی ئەم شاهەدا ئیمپراتۆریی سەفەوی گەیشت بوە دوایین قۆناغی داوەشانو، لەئەنجامی هێرشی ئەفغانییەکاندا، بنەماڵەی سەفەوی هەم شاهێتییان لەدەس داو، هەم بڕانەوە.

قۆناغی نوێی دامەزراوەی ئەمارەتی بابان هاوزەمان بو لەگەڵ لاوازبونی دەسەڵاتی بنەماڵەی سەفەویو، سەرەتای قۆناغێکی پڕ لەنائارامیو پشێویو ناکۆکی ناوخۆی خوێناویو هێرشی بێگانە بۆ سەر ئێران.

سلێمان بەبە لەدوا چارەکی سەدەی ١١هەمدا کەوتە چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆیو دەسگرتنەوە بەسەر ملکی باباندا. ئیتر لەو کاتەوە سەرگەورەی ئەم بنەماڵەیە لەلایەن عوسمانیەکانەوە نازناوی((پاشای))پێ ئەدرا.

بنکەی قەڵەمڕەوی بابان لەسەرەتادا لەدارەشمانە بو کەئەکەوێتە مەڵبەندی پشدەر.

ئەمارەتی بابان لەلای رۆژهەڵاتو سەرویەوە دراوسێی ئەمارەتی ئەردەڵان بو. والیەکانی ئەردەڵان بەنازناوی((خان))لەلایەن شای ئێرانەوە دائەنران. بنکەی ئەمارەتیان لەسنە بو. هەورامان، مەریوان، بانە، سەقزیان لەژێر دەستدا بوە.

روباری سیروان‌و چیاکانی هەورامان، سورێن، سورکێو سنوری جیاکردنەوەیان بوە لەیەکتری.

لەلای رۆژئاوایەوە دراوسێی ئەمارەتی سۆران بو. گەورەکانی سۆران نازناوی((میر))یان بە خۆیان ئەدا. لەلایەن والیەکانی عوسمانییەوە بەنازناوی((بەگ)) ئەناسران. بنکەی ئەمارەتیان ماوەیەك لەهەریرو ماوەیەك لەرەواندوز بو. زێی بچوك سنوری سروشتی بو لەنێوان دەسەڵاتی هەردو ئەمارەتدا. بەڵام زۆر جار پاشاکانی بابان، رانیە، کۆیە، هەریر، ئاڵتون کۆپرییان لەوبەری زێ لەبەر دەستدا بو.

لەلای خواروشیەوە دراوسێی ولایەتی بەغداد بو. هەندێ جار دەسەڵاتی میرەکانی بابان ئەگەیشتە کفری، زەنگاباد، خانەقین، مەندەلی، زەهاو، جەسان، بەدرە.. واتە ئەگەیشتە جەبەل حەمرین.

ملکی بابان هیچ شارێکی تێدا نەبو. هەندێ گوندی گەورەی تێدا بو. خەڵکەکەشی بەشێکی نیشتەجێ‌و بەشێکی کۆچەر بون. کۆچەرەکان بەگشتی رێکخراوی خێڵەکییان هەبو، لەهەندێ شوێن خێڵەکی نەبون.

گەورەترین ئێلی نیشتەجێ، کەرێکخراوی خێڵەکی هەبو، ئێلی نورەدینی بو. لەناوچەی پشدەرو مەرگەدا نزیکەی سەد گوندیان هەبو. لەکاتی پێویستدا هەزار تفەنگچیان پێ کۆئەکرایەوە. لەگەڵ هۆزەکانی سەکر، شینکی، گەلاڵیدا هاوپەیمان بون. جگە لە مانەش، لەشارباژێر، تالان، سیوەیل، بازیان، قەرەداخ، شارەزور، گوندو ئاوایی هەبو، رێکخراوی خێڵەکییان تێدا نەبو، ئەگەر هەشبوبێ لاوازو بچوك بوە.

گەورەترین ئێلی رەوەندیش ئێلی جاف بو. جاف چەند هەزار ماڵی بو. چەند تیرەی غەوارەش خۆیان دابوە پاڵیان. جگە لەئێلی جاف، هەندێ هۆزو تیرەی بچوکی تر کە٥٠ تا ٥٠٠ ماڵ ئەبون لەبەر فەرمانی گەورەی بابان‌دا بون لەوانە: شێخ ئیسماعیلی، کەلور، مەندمی، مەرزینك(بلباس)، تیلەکۆ، کۆستە، هەمەوەند، سۆفیوەند، کەچەلی، چگنی، زەند، کەروەیی، لور، سەدانی، گورزەیی[٢٨].

سنوری رۆم‌و عەجەم هەندی لەم ئێل‌و هۆزو تیرانەی بەسەر هەردو دیوی سنورا دابەش کرد بو. هەندێ لەمانە بەشی گەورەیان کەوت بونە لورستان، کرماشان، ئەردەڵان، موکریان.

هێزی پارێزگاری ئەمارەتی بابان لەچەکداری سوارەو پیادەی ئەم هۆزانە پێك ئەهات، هەروەها هێزی شەڕکەری ئەمارەت بۆ بەشداری کردنی لەلەشکرکێشیەکانی ئۆردوی عوسمانی‌دا هەر لەمان کۆئەکرایەوە.

ئەمارەتی بابان لەم سەردەمەدا لەگەشانەوەو پەرەسەندن‌دا بو. کەوت بوە هەوڵی چەسپاندنی سەربەخۆیی‌و، فراوان کردنی سنوری قەڵەمرەوەکەی لە۱۱۰۲دا میرەکانی بەبە، سلێمان‌و حەسەن، هەڵیان کوتایە سەر کەرکوك، کەئەوسا ناوەندی ولایەتی شارەزور بو. لەو شەڕەدا متصرفی ئیالەتی کەرکوك، دلاوەر پاشا، کوژرا. کەرکوك کەوتە ناو سنوری دەسەڵاتی بابانەوە. وەزیری بەغداد، حسێن پاشای بەمتصرفی کەرکوك داناو، هێزێکی لەشەڕکەرانی بەغدا، جزیرە، ئامێدی بۆ کۆکردەوە، فەرمانی لەناوبردنی میری بابان‌و، سەندنەوەی شارەزوریان پێ درا بو. ئەم هێزە پاش چەند مانگێ بە سەرنەکەوتویی گەڕایەوە[٢٩].

لەدوای بەستنی پەیمانی زەهاو پێوەندی ئێرانی- عوسمانی ئاسایی بو. شتێکی ئەوتۆ روی نەدابو، ئەم پێوەندییە بناڵۆزێنێ، یا ببێتە هۆی تێکدانی، لەزەمانی شا سوڵتان حسێن‌دا دو روداو قەومان، کەئەیان توانی ببنە هۆی هەڵگیرسانەوەی جەنگ لەبەینی ئەم دو دەوڵەتەدا. بەڵام لاواز بونی هەردولایان رێگەی ئەمەی نەدان‌و کێشەکانیان بەرێگەی هاوکاری بەلادا خست.

یەکەمیان، شۆڕشی ئێلە عەرەبەکانی بەسرە دژی دەسەڵاتی عوسمانی. ئەوانە دەستیان بەسەر بەسرەدا گرت‌و، پاش چەند تێکهەڵچونی خۆیان هاوێشتە ژێرسایەی دەسەڵاتی شای ئێرانەوە. بەڵام شا کلیلی شارەکەی بەرۆستەم خانی نوێنەری‌دا لەگەڵ نامەیەکی دۆستانەی پڕ لەچاپلوسی‌دا بو سوڵتانی عوسمانی نارد(۱۱۰۹)[٣٠].

هەر بەو بۆنەیەوە داوای هاوکاری هەردو دەوڵەتی کردبو بۆ بەرەنگاری‌و سەرکوت کردنی میری بابان.

دوەمیان هێرشی میر سلێمانی بابان بو سەر مەڵبەندی ئەردەڵان‌و گرتنی هەندێ لەشارو ناوچەکانی.

شا لەو نامەیەدا کەبو:

((...شەهریاری کیشوەری حزم‌و قار، شاسواری عرسەی گیرۆدار، سوڵتانی سوڵتانەکانی جیهان، خاقانی خاقانەکانی زەمان، ناصر الاسلام والمسلمین، قامع الکفارو المشرکین، قارەمانی ئاوو خاك، سمی رەسوڵی رب العالمین، قائانی هەردو ئەرزو هەردو دەریا، خادم الحرمین الشریفین، دوەمین ئەسکەندەری ذوالقرنین،

سێبەری سایەداری ڕەحیمی ڕحمان، خاقانی کوڕی خاقانو، سولتانی کوڕی سولتان، مانگی چواردەی ئاسمانی سەلتەنەتو، بەسالەتو، عەزمەتو، جەلالەتو، نەجدەتو، عەدالەتو، عزو شانو نصفه وامتنان: سولتان مستەفا خانی کوڕی سولتان محەمەد خان، نصر الله انصارەو ضاعف اقتدارە..))

شا لەم نامەیەدا داستانی هەلگەڕانەوەی ئێلە عەرەبەکانی بەسرەو، تەنینەوەی بۆ مەلبەندی حوێزەی ئێران ئەگێڕێتەوە، ئەلێ گرتنی بەسرە بۆ ئەوە نەبو بیخاتە سەر قەلەمڕەوەکەی خۆی، بەلکو ئەوان لەباتی سوپاییانی عوسمانی ئەو ئەرکەیان ئەنجام داوە، بەئەمانەت لەدەستی والی عەرەبستان دایە. وەکو جاران بەملکی سولتانی دائەنێنو، بەوی ئەسپێرنەوە.. ئینجا دێتە سەر باسی میری بابان، سلێمانو نوسیوێتی:

((لەبەرئەوەی سلیمان بەبەی مخذول العاقبە، ماوەیەکی درێژە، هەمو رۆژێ شەڕی نابەجێ بەحاکمەکانی سەرسنورو قەبیلەکانی کوردو ئیلو ئەحشامی ئەم لایە ئەفرۆشێو، هاندەری سیلسیلەی فەسادو عناد بوەو، هەندێ لەمەلبەندەکانی ئەو حاکمانەی سەرسنوری داگیرکردوە، بەرامبەر بەو پارێزەرانەی لەو سەرسنورە دانراونو جێبەجێ کردنی مەرجەکانی صلحو میساقیان پێ سپێردراوە کرداری خراپ ئەکا.

چەندین جار کردەوە ناشایستەکانی ئەو پێڕەوی زولمو بێدادە بەپاشایانی بەغداد راگەیەنراوە، هەمو جارێ ئەوانیش گفتی تەمێ کردنو چارەکردنی ئەم کارەیان داوە، بەلام بەهۆی تطمیعو حیلەکانی ئەو رۆژگارە رەشە دەغەلەوە گفتەکانیان بەجێ نەهێناوە.

کەرکوكو ئەو شوێنانەی لەپاشایانو سنجاق بەگەکانی گرت بو لەدەستی ئەودا هێشتویانەتەوە، ئەوەش بۆتە هۆی زیادبونی توغیانی بیابانگەردی وادی خودسەریو خودرایی.

لەوەدا کەئەم خێر ئەندێشو دۆستی صداقت کێشە لەقسەکانی خۆیدا، تیشکی راستی، کالشمس في وسط السما، ئەدرەوشێتەوە، ئەوەی کەئەو سەرۆکی شەیتانگەلە بۆ وروژاندنی کەرەستەی فەساد دەری بڕی بو، نموداری مەوجی سەرابو، ئەو مەلعونە شایستەی بازخواستو سەرکۆنەیە. وە لەو روەوە کەبۆتە مایەی فتنەو فەسادو بەهۆی چاو لێ پۆشینی بەندەگانی ئەو شاهنشا ثریامکانەوە، فێری دڕی بوە.

((لێ بوردونو چاوپۆشینێ لێرە بەدواوە بەرامبەر بەو بکرێ ئەبێتە هۆی نائەمینیو پەشێوانی ئوموری جمهوری ئەنامو هەمو ئەهلی ئیسلام.

ئەگەر لەلایەنی خۆشی هێنی خاقانەوە فـەرمانی لازم الامتثـالِ دەربچـێ بـۆ دانی اهتمامی تەواو بەدەفعی ئەو مادەی وبـال ونکالـە، کەپیسـایی بـونی ئـەو فیتنە ئەنگێزە لەداوێنی دەوڵەتی ئەبەدمدت بشـۆرێو، گـەردی ژیـانی لەسـەر ئاوێنـەی پـاکی خۆشەویستی بسـڕێتەوە، ئەبێتـە هـۆی دامـەزرانی بنچـینەی اختصاص‌و باعیسی پتەوێبونی بناغەی خۆشەویستی تایبەتی.

هەڵگری نامـەی محبـەت عنـوان، ئیالـەت‌و شـوکت پـەناه: ڕۆسـتەم خـان، مەئموری گەیاندنی هەندێ قسەی دۆستانەیە...))[31].

مەستورەی کوردستانی بزوتنی سلێمان پاشای بابان بۆ سەر خاکی ئـەردەڵان‌و دوایی‌تر پێکدادانی هێزەکانی عەجەم‌و بابان بەجۆرە ئەگێڕێتەوە:

((لەسـەردەمی جلوسـی شـاه سـوڵتان حسـێن‌دا کاروبـاری ئـەمارەتی کوردستان(ئەردەڵان)بە محەمەد خانی کوڕی خەسـرەو خـانی ئـەردەڵان سـپێردرا" لەکاتی ئیالەتی ئەودا، سلێمان پاشای بابان بەهۆی زۆریی سوپاو لەشکرو فرەیی زیوو زێڕ بایی بو، لەشکرێکی سازکرد لەئەستێرە زۆرتـر بـو. لەوڵاتـەکانی ڕۆم‌و ئێران‌دا کەوتە تاڵان‌و ڕاوڕوت، بانگی سەرەڕۆیی‌و یاخێتی بـەگوێی دانیشـتوانی هەردو وڵاتدا دا.

سەرەتا بەسوپایەکی لەژمارە بەدەر بەرەنگاری وەزیـری بەغـداد بـوەوە، پـاش تێکهەڵچون وەزیر بەتێکشکاوی هەڵات. دوای ئەوە بەنیازی گرتنـی کوردسـتانی ئەردەڵان ئەو سوپا گەورەیەی جوڵاند. دەستی داگیرکردنی بۆ ئـەو سـنورانە درێـژ کردو دەرگای فیتنەو فەسادی کردەوە. هـەر لەسـەرەتاوە هـەورامان‌و مـەریوان‌و سەقزیان گرت. تەمرخان بەگی کوڕی زۆراب سوڵتانی کوڕی کەلب عـەلی خـانی والی، کـە لەسـەقزو سـیاکۆ بـو، هـەروەها ئیـبراهیم بـەگی میرئەسـکەندەری دەسەڵاتداری مەریوانیـان کوشت. سەرەنجام کەهەواڵی ڕابـون‌و ڕاپـەڕینی سـلێمان پاشا بەگوێی شا سوڵتان حسێن گەیشت، لـەو ڕوداوە شـڵەژا. عەباسـقلی خـانی قاجاری بەسـەردار دانـا بەسـوپایەکی زۆرو لەشـکری زیـاد لـەڕادەو ژمـارە بـۆ لەناوبردنی فیتنەی سلیمان پاشا بۆ یارمەتی دانی سوپای ئەردەڵان نارد.

کەمەوکیبی سوپای قزلباش‌و قشونی ئەردەڵان گەیشـتنە مـەریوان، سـلێمان پاشا هەنگاوی ئازایەتی‌و جوامێری بۆ پێشەوە ناو تێکهەڵچون لە٩هەمی مانگی موحەرەم ساڵی ١٣١٠(بێگومـان ئەم ساڵە هەڵـەی چـاپە)هەنگامـەی جـەنگی دلێران لەبروسـکەی تیـغ‌و شـریخەی سـەنان گـەرم بـو. لەبەیانییـەوە تـائێوارێ خەنجەری دلێران کاری لەیـەکتری ئـەکردو شمشـێری دلاوەران گیـانی ئەکوشـت‌و سەری ئەپەڕاند، هـیچ کامیـان سـەرنەکەوتن. ڕۆژی دوایـی ١٠هـەمی مـانگی ناوبراو بو، دوبارە هەردولا تەپڵی شەڕیان لێدا، ڕیزیان بەست. وەکـو نێـرە شـێر پەلاماری لەشکری یەکتریان‌دا. سلێمان پاشا خۆی لەپشـتی هێرشـەکەوە هاتـە

پێشەوە، پیاوانەو دلێرانە کەوتە شەڕەوەو، ئازایەتی نواند، چەندەها سەری سوارانی ناودار بەزۆری بازوی کەوتە سەر ئەرز.

دواییەکەی، چونکە فەتح و زەفەر بەندە بەتەقدیرەوە نەك بەزۆری بازوی دلێرانی رۆستەم ئاساو، هێزی شمشێری شێرانی پڕ هونەر، شەمالی سەرکەوتن لەئالای دەولەتی عەباسقلی خان هەلی کرد. سلێمان پاشاو لەشکرەکەی تێکشکان و بەزین. زۆری سەرکردەکانیان کوژران و بەدیل گیران و برینـدار بـون و گیران، ئەوانەی لەشیر رزگاریان بو بەهەزار فرتوفێڵ گیانی خۆیان دەرباز کرد. خێوەت و بارەگاو ئەموال و ئەسبابی خۆیان بەجێ هێشت و، بەرەو لای رۆم و قوستەنتین رایان کردو هەلاتن.

قاسم سولتانی هەورامی پاش حەسانەوە لەماندویەتی شەڕو، گوڕانی هەنگامەی شەڕ بەخۆشیی بەزم، بەهۆی کۆنە قینەوە لەبنەمالەی ئەردەلان، سەبارەت بەناپاکی و نادروستی باوەڕ، بەسەرداری قزلباش ئەلێ کە: بەهۆی تعصبی دراوسێیەتی و هاومەزەبی و، بەهۆی گوێ دانە هاوسێیەتی و دور بیرکردنەوە، سوپای ئەردەلان وازی لەرێوشوێنی دۆستایەتی و ئاشنایەتی لەگەل دلێرانی بەبە نەهێناوەو، بەهیچ جۆرێ بەنیازی جەنگ دەستی شەڕیان لێ نەکردونەتەوەو، لەپێکادانی ناوونەنگدا بەهیچ شێوەیەك بەشداری جەنگ نەبون.

عەباسقلی خانی قاجار کەسەرداروبە((زیاد ئوغلی))بەناوبانگ بو، بەدوزمانی قاسم سولتان وروژا، لەسەری موسلمانانی بێ گوناهی سنە کەللە منارێکی دروست کرد، سەری قاسم سولتانیشی وەکو بەیداخ بەسەر بەرزایی سەرەکانی ترەوە هەل واسی.

((فەرد: هەر کەس چی بچێنێ ئەوە ئەدروێتەوە.))[٣٢].

مێژونوسانی ئەردەلان، ئەلێن لەو بەزمەدا ١٥٠٠کەس لەکوردەکانی ئەردەلان کوژراون و، زیاد ئوغلی گردێکی لەکەللەکانیان دروست کردوە، کەلەناو خەلکدا بەکولێن کۆ بەناوبانگ بوە.[٣٣]

وەکو شای ئێران خواست بوی، دەولەتی عوسمانی حەسەن پاشا، یەکێ لەپاشا بەتواناکانی کردە وەزیری بەغدادو، ئەرکی سەرکوت کردنی ئێلەکانی کوردو عەرەب و جێگیر کردنی دەسەلاتی عوسمانی پێ سپێردرا.

هەردو دەولەت کەوتنە هاوکاری بۆ لەناوبردنی سلێمان پاشا. حەسەن پاشا خۆی بەقین بو لەسلێمان پاشا، شکاتی شای ئێرانیشی هاتبوە سەر.

لەلایەن عوسمانیەوە حەسەن پاشای وەزیری بەغداد کەوتە سەرکوت کردنی کوردەکانی سنجارو، سۆران و، عەرەبەکانی لای بەسرە.[٣٤]

لەلایەن عەجەمەوە حسێن خانی لورِ نێردرایە سەر شـارەزوور کەوتـە تـالانو کوشتنی خەڵك. ئێلی بلباسی هەتا تاکۆو قەندیل راو نا[٣٥].

حەسەن پاشای والی بەغداد، سەرەنجام توانی سلێمان پاشا لەگـەڵ ١٧ بـەگی کورد لەدۆستو هاوکارەکانی بەیارمەتی پاشایانی حەلەبو دیاربەکر بکوژێ[٣٦].

بەجۆرە هەوڵدانی بەبە سلێمان بۆ فراوان کردنی قەڵەمرەوی دەسەڵاتی خۆیو، بۆ دامەزراندنی دەسـەڵاتێکی سـەربەخۆ لـەنێوان بەرداشـی هێـزی رۆمو هێـزی عەجەمدا شکاو سەری نەگرت.

شـا سـاڵی ١١٠٦ گـورگین خـانی گـورجی، کەمەسـیحی بـو، بـەحاکمی موسڵمانانی قەندەهار دانا. گورگین خان سەرەڕای جیاوازی دینی لەگەڵ خـەڵکی قەندەهار، زوڵمی زۆری لێ ئەکردن. ماوەی ٥ ساڵ لەوێ مایەوە بێ ئەوەی رەفتاری خۆی لەگەڵ خـەڵك بگـۆڕێ، مـیر وەیسـی هـوتکی کەیـەکێ لەسـەرانی ئیلـی غلیجائی بو، لەوێوە روی کردە دەرباری سەفەوی لەئەسفەهان، بۆ شکات لـەدەس ستەمی گورگین خان. شـاو کاربەدەسـتانی دەربـار گوێیـان نەدایـە گازنـدەکانی میروەیس. میر وەیس هەم نائومێد بو لەوەی بتوانێ هەلومەرجی گەلەکەی خـۆی بەهۆی شاوە باش بکا، هـەم تـێ گەیشـت لـەوەی کاروبـاری دەربـاری سـەفەوی گەیشتۆتە ئەوپەڕی بۆگەنیو لاوازی لەوێوە نەگەڕایەوە قەندەهار بەڵکو چـو بـۆ حەج. پاش حـەج کـردن دوبـارە گەڕایـەوە ئەسـفەهان. سـەرلەنوێ دادی خـۆیو خەڵکەکەی بردەوە لای شاو دەربار(١١١٢). ئـەم جـارەش کـەڵکی نـەبو. کـەس گوێی لێ نەگرت. بەنائومێدی گەڕایەوە قەندەهار.

میر وەیس سەرانی ئێلەکـەی کـۆکردەوەو، لاوازی دەوڵـەتی سـەفەوی بـۆ رون کردنەوەو، هانی دان بۆ یەککگرتنو شۆڕش. رۆژێکیان لەکاتی راودا گۆرگین خانی کوشت(١١١٣) لەماوەیەکی کەمدا کاربەدەستانی سەفەوی لەقەندەهار دەرکردو خۆی دەستی بەسەر کاروباری وڵاتدا گـرت. شـا چـەند جـارێ لەشـکری نـاردە سەریان. بەڵام هەمو جار بەتێکشکاوی ئەگەڕانەوە.

میر وەیس پاش ٨ ساڵ حوکمڕانی مرد(١١٢١). میر عەبدوڵلای برای جێگەی گرتەوە. عەبدوڵلا ویسـتی بچـێتە ژێـر سـایەی دەسـەڵاتی سـەفەوییەوە، بـەڵام مەزنەکانی ئیلی غلیجائی ملیان بۆ ئەوە نەداو میر مەحمودی کوڕی میر وەیسیان لێ هاندا بیکوژێو جێگەی باوکی بگرێتەوە. محمود مامی کوشتو لەجێگەی ئەو بو بـەحاکمی قەنـدەهار(١١٢٢). مـەحمود کەبـەوردی ئاگـاداری هەلومـەرجی ناوەوەی دەربار بو، کەوتە پێشڕەوی. سیستانی گرت. لەڕێگـەی کرمـانو یـەزدەوە چوە سەر ئەسفەهانو، گەمارۆیدا. دوای ئابلۆقەدانێکی درێژو داکەوتنی قاتوقڕی

لەناو پایتەختدا، شاو دەستوپێوەندەکانی خۆیان بەدەستەوەدا. شا بەدەستی خۆی تاجی شاهیتی لەسەری خۆی داگرتو کردیە سەری مەحمود (١١٣٥). مەحمود چوە ناو ئەسفەهانەوە شای لێخراوی لەیەکێ لەکۆشکەکانیدا بەدەس بەسەری داناو خۆی لەسەر تەختی شاهی دانیشت. شا نزیکەی ٦سالّی بەدەس بەسەری بەسەر برد. سەرەنجام ئەوو هەمو شازادەکانی تری کوشت. بەدەگمەن تاكو تەرایان لێ دەرباز بو. لەوانە کورێکی شا کەناوی تهماسب بو ئەویش لەلایەن نادرەوە لێخرا. ئیتر کۆتایی بەدەسەلاّتی ئەم بنەماڵەیە هات کەبنچینەی ئێرانی نوێیان دانا بو.

کوژرانی سلێمان پاشای بابانو ١٧ سەرداری تری کورد ودوایی تر کوژرانی بەکر بەگی بابان لەلایەن والی بەغدادەوە، لەرروداوەکانی داهاتودا بەجۆرێ رەنگی دایەوە کارێکی بڕیاردەری کردە سەر پێکادانی عوسمانی-ئەفغانی(١١٤٠).

لەو نەبەردە گەورەیەدا کە ٧٠ تا٨٠ هەزار سوپایی عوسمانی بەسەرکردایەتی ئەحمەد پاشای کوڕی حەسەن پاشای وەزیری بەغداد لەبەرامبەر ١٧ هەزار ئەفغانی بەسەرکردایەتی ئەشرەف لەنزیکی هەمەدان رویدا، سوپای عوسمانی دوای ئەوەی ١٢ هەزار کوشتەیدا بەتێکشکاوی لەبەردەمی سوپای ئەفغانیدا پاشەکشەی کرد، چونکە ٢٠هەزار سواری کورد بەسەرکردایەتی خانە پاشای بابان، کەباڵی چەپی سوپای عوسمانی پێك ئەهێنا، بەشداری شەڕ نەبون. هەمو مێژونوسەکان هۆی ئەم هەڵوێستەی سوارەی کورد لەو شەڕە گرنگەدا ئەگێڕنەوە بۆ وەرگرتنی بەرتیلو گفتی بەخشینی پلەو پایە بەسەردارەکانی کورد، پڕوپاگەندەی دینیی مەلاکانی ئەفغانی دەربارەی نامەشروعی شەڕی هاودینو هاومەزەب[٣٧] کەچی کەسیان باسی کاری کوژرانی بەکۆمەڵی سەردارەکانی کوردیان نەکردوە لەلایەن حەسەن پاشای باوکی ئەحمەد پاشاوە، لەسەر دڵسۆزییو نادڵسۆزییان بۆ تورك.

**٣-چاخی قاجار**

**١/٣ ئەحمەد خانی مقدم مەراغەیی**

**نمونە١٠:**

**داوی تەزویرو، باپیر ئاغای مەنگوڕ(١١٩٨)**

ئێلی بلباس کەئێستا لەموکریانو خانەو ئەم دیو و ئەودیوی قەندیلو پشدەرو بیتوێنو شارەزوورو گەرمیانو دەشتی هەولێرا دانیشتون.. لێکۆڵینەوەیەکی ئەوتۆیان لەسەر نیە، ئەمیر شەرەفخان لەبارەی بلباسەوە ئەڵێ:

((... ئێلی روژکی، رۆژێکیان ٢٤تیرەی کورد لەشوێنێك بەناوی تاب سەر بەمەڵبەندی خۆیت کۆبونەوەو بون بەدوبەش" دوانزە تیرەیان بلباسیو دوانزەکەی تریشیان بەقەوالیسی ناسراون. بلبیسو قەوالیس دو گوندن لەگوندەکانی هەکاریو، بەپێی گێڕانەوەیەك دو هۆزن لەئێلەکانی بابان)) [٣٨].

لەسەردەمێکا ئەم ئێلە ئەبێ بوبن بەهێزێکی گەورە لەچوار گۆشەی ورمێ- سەقز، شارەزور- رەواندزدا، چونکە لەروداوەکانی ناوچەکانی موکریان، ئەردەڵان، بابان، سۆراندا بەزۆری ناویان دێتە پێشەوە. چەند جارێ کاربەدەستانی ئێرانیو عوسمانی پێکەوە پەلاماریان ئەدەنو، هەرلایەکیان لەقەڵەمڕەوی خۆیەوە هێرشیان ئەبەنە سەر. لە١١٢٥دا لەسەر داوای عەجەم لەدیوی عوسمانییەوە وەزیری بەغدادو، لەدیوی ئێرانەوە والی ئەردەڵان لەشکرکێشییەکی گەورەیان کردە سەریان [٣٩].

لە١١٥٠وەزیری بەغداد جارێکی تر چوە سەریان بۆ راونانو کوشتنو تالان کردنیان، بەبیانوی جەردەییو رێگرییەوە. شایەتێکی ئەو زەمانە، نوسیویتی: ((ئەوانە جەردە نەبون، بەڵکو ئەو قسەیە بۆ مەبەستێ بو کەوەزیر ئەوی ویست. ئەگینا ئەوانە شافیعینو خاوەنی غیرەتو حەمییەتی دینیین، زۆریان تەلەبەی عیلمو خاوەنی مزگەوتو گوندن، رێزی میوان ئەگرن. وەزیر ئەی ویست پەلاماریان بدا وتالانیان بکا. ئەو دەسکەوتانەی ویستی دەستی کەوتن)) [٤٠].

لەدوای هاتنی ئیلی ئەفشار بۆ ورمێو دەوروبەری، وەپاش لاوازبونی ئێلەکانی برادۆست، ئیلی بلباس سەری دەرهێناوەو، بۆتە هێزێکی ئەوتۆ لەناوچەکەدا، مەترسییەکی راستەقینەی بو سەر دەسەڵاتی عەجەم لەورمێو مەراغادا دروست کردەوەو، ئەوانەش هەمیشە لەتەقەلای سەرپێ دانەوانەو لاوازکردنو لەناوبردنی ئیلی بلباسدا بون.

لەکۆتایی سەدەی ١٣هەمی کۆچیدا، کۆنفدراسیۆنی بلباس لە٤ هۆزی سەرەکی پێکهات بو" مەنگوڕ، مامەش، پیران، باڵەك، لەوکاتەدا، بوداق خانی کوڕی شێخ عەلی خانی موکری حاکمی سابلاخو، ئەحمەد ئاقای مقدم حاکمی مەراغاو، ئیمام قلی خانی ئەفشار حاکمی ورمێو، نەجەف قلی خانی دونبولی حاکمی تەوریز بو. هەر لەو ساڵانەدا پشێوی سەرانسەری ئێرانی گرت بوەوە، ململانێ لەنێوان بنەماڵەی زەندو قاجارو، چەند کەسی تر لەناودارانی ئێران لەسەرتەختی شاهێتی ئێران لەوپەڕی توندوتیژی دابو. هێشتا بەلایەکدا نەکەوت بو.

نەجەفقلی خانی دونبولی بەگلەربەگی تەورێز، بەتاوانی رាوروت حاجی عەلی محەمەد ئاقای مەراغەی کوشت(١١٩٠). لەجێگەی ئەو ماوەیەك ئیسماعیل بەگو ماوەیەکی تر زین العابدین بەگی دانا، کەهەردوکیان لەخزمە نزیکەکانی حاجی عەلی بون. ئەحمەد ئاقای کوڕی حاجی عەلی محەمەد بەهاوکاری سەرانی ئیلی مقدم مەراغەییو بەپشتیوانی ئەحمەد خانی دونبولی حاکمی خوی برازای نەجەفقلی خان، بوەوە بەحاکمی مەراغە. لەسەردەمێکا سەرانی زەند لەناو خۆیاندا لەسەر دەسەلات لەململانێدا بون. عەلی مراد خانی زەند ویستی ئەم لەحاکمی بخا، بەلام ئەحمەد ئاغا گوێی نەدایە فەرمانەکەی ئەوو بەیارمەتی ئیمامقلی خانی ئەفشار، بەگلەربەگی ورمێ، لەشوێنەکەی خۆیا جێگیر بو.

ئەحمەد ئاقا، دلسۆزیو گوێڕایەلی تەواوی بۆ کاربەدەستانی تەورێز دەرئەبڕی. بەلێوەشاوەییو دلسۆزییەوە بۆ بنەمالەی قاجار، توانی ببێتە یەکێ لەپیاوە گەورە ناسراوەکانی سەردەمی قاجار. زەینەب خانی کچی، هاوپێخەفی ١٧ هەمی فەتحعلی شای قاجارو کچێکی تریشی هاوسەری محەمەد عەلی میرزا دولتشاهی کوڕی فەتحعلی شا حاکمی کرماشان بو.

ئەحمەد ئاقا لەسۆنگەی کوشتنی بەفێلی باپیرئاغای مەنگوڕو هەزار کەس لەپیاوە هەلبژاردەکانی ئیلی بلباسدا، نازناوی((خان))و بەگلەربەگی وەرگرت. نزیکەی ٤٠ سال دەورێکی کاریگەری هەبو لەسەرکوتکردنی شۆڕشی هەمو ئێلەکانی کوردا، بەتایبەتی چەندین جار چوە سەر هۆزەکانی ئیلی بلباسو، کوشتاری بەکۆمەلی لێ کردنو، سامانو دارایی تالان کردن. هەر ئەو لەشکری بابانی، کەچوبون بۆ یارمەتی دانی ئیلی بلباس، لەیەلتیمور تێ شکانو مەحمود پاشای کوشت(١١٩٨). هەروەها بەشدار بو لەسەرکوتکردنی یاخی بونی ئێلە کوردەکانی ماکۆ، خوی، سەلماس بەسەرکردایەتی جەعفەرقلی خان(١٢١٤).

ئەحمەد خان یەکێك بو لەسەرکردە ناسراوەکانی هێزەکەی محەمەد عەلی میرزای حاکمی کرماشان کەچون بۆ سەرکوتکردنی عەبدولرەحمان پاشای بابان(١٢٢٦). هەمو ئەو شوێنانەی دەستی ئەمو هێزەکەی پێ گەیشت بەقسەی عەبدولڕەزاق دونبولی((بەجۆرێ کەوتنە بەر کوشتنو تالان کردن کەشیرازەی کۆمەلەکەی عەبدولرەحمان پاشای لەبەریەك هەلوەشان))[41].

لەزۆری تێکهەلچونەکانی جەنگەکانی ئێرانی-روسیو، ئێرانی- عوسمانیدا، لەژێر سەرکردایەتی عەباس میرزادا بەخۆیو هێزەکانی مقدم مەراغییەوە بەشدار بو. یەکێ بو لەوانەی پاش هاتنی هەیئەتی جەنگی فەرەنسی بۆ ئێران لەدروست کردنی فەوجە نوێیەکانی نیزام پیادەی ئێراندا بەشداربو.

شاکاری ئەحمەد خان کوشتنی باپیرئاغـای مـەنگوڕو، سـەرکوتکردنی ئیلـی بلباس بو[٤٢].

نوسەری((تاریخ افشار))روداوەکە بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:

((...لەبەرئەوەی ئیلی بلباسی دانیشتوی ناوچەی لاجـانی ورمـێو سـولدوز، بەردەوام دەسدرێژییان ئەکردە سەر مەڵبەندەکانی ورمـێو مـەراغاو، ئەوەنـدەی ئەیان تـوانی لەکوشـتنی خـەڵكو تـاڵان کردنـی مـاڵو کەلوپـەلیان درێغیـان نەئەکرد، ئەحمەد ئاقـا بـۆ تـەمێ کـردنو گـوێ راکێشـان، بگـرە بـۆ لەڕیشـە دەرهێنانی ئەو طایفە طاغیە خسران مالە، هیمەتێکی بەرزی نواند. لەو کاتـەدا سەرۆکی ئیلی ناوبراو ناوی باپیر ئاغای مەنگوڕ بو، کە بـەزاراوەی خۆیـان پێـی ئەڵێن مەزنو، بەئازایەتیو سەرکێشی ناوی دەرکردبـو. ئەحمـەد ئاقـا بـەناردنی رسلو رسائل لەگەڵ ناوبراو بناغەی دۆستیو ئاشنایەتی دامەزران، وە بەڕشـتنی دانی زخارف رای کێشایە ناو داوی تزویرەوە. نامەی بۆ باپیر ئاغا نوسـی: هـەمو دنیا ئەزانێ دوژمنایەتی بەینی منو نەجەف قلی خانی بەگلەربەگی تـەورێز تـا کوێیە، چونکە ئەو کابرایە، حاجی عەلی محەمەدی بـاوکی خـوالێ خـۆش بـومی بەغەدرو حیلە کوشت، سەندنی خوێنی باوکیش لەسەر کوڕەکەی پێویستە، تکام وایە لەگەڵ هەندێ لەئێلەکانی خۆت هەنگاوی یارمەتی دان بهاوێژیو، حـەقی دۆستایەتیو دراوسێیەتی بەجێ بهێنی، هەڵبەت لەوەشدا دەسکەوتو تالاّنی زۆر لەشتومەکی تەورێزو دەورو پشتیتان پێ ئەبڕێ.

باپیری مەنگوڕ بەتەماعی شتومەك فریو درا. لەگەڵ هەزار کـەس لـەلاوانی ئازاو سوارانی جەنگ ئازمودەی مامـەشو مـەنگوڕ بەپۆشـتەو چـەکداری، بـو مەراغا چون، ئەحمەد ئاقا بۆ پێشوازی کردنیان لەشار دەرکـەوتو، بردنیـە نـاو شـار، لـەناو ماڵـەکانی شـاردا هـەر پێـنج کـەسو دەکەسـیانی لـەماڵێك دا دامەزرانو، کەلوپەلی پێویستی بۆ ماڵی هەریـەکێ لـەئاغایانی ئـەو تایەفەیـە نارد . بەلاّم لەپێش هاتنیـان دا، تـەگبیری کوشـتنی ئـەوانی لەگـەڵ ئـەعیانو کوێخایانو سەرانی سوپای مقدم کردبو. بەجۆرێ کەهەر چـەند کەسـێك لەوانـە لەماڵی هەرکەس کەمیوان بن، خاوەنی ئـەو ماڵـە لـەکاتی دانـراودا کـەدەنگی تفەنگێکی بیست میوانەکانی خۆی لـەکاتی خـەودا بکـوژێو رەوانـەی دیـاری عەدەم یان بکات. لەکاتی دیاریکراودا لەنیوەشەودا خاوەن ماڵەکان کەبۆ کارەکە بێداربون، بەبیستنی دەنگی تفەنگ بەجارێك دایان بەسەریان داو، رەوانەی دیاری عەدەمیان کردن، بەجۆرێ کە لەوهەزار کەسە یەکێ بەزیندویەتی دەرباز نەبو.

بۆ بەیانی سەلکی مەغوسی ئەوانەیان بردە بەر چاوی ئەحمەد ئاقـاو، لاشـەی مەزنەکەیان- باپیر ئاغا بەدەروازەی شارا هەڵواسیو کردیان بەپـەنگ بـو سـەیر کەران.

هێشتا ئەم دەنگوباسە بڵاونـەبو بـوەوە دەمەوبـەیانی، بـەئامادەیی تـەواوەوە، بەغار هەڵی کوتایە سەر لاجان، ئەشرار غافڵگیر کران، مـاڵو کەلوپـەلی تـاڵان کردنو بەدەسکەوتێکی زۆرەوە گەڕایەوە. وەختێ ئەم مەسـەلە ترسـناکە لـەئیلی بلباس قەوما، ئەشرار لەترسی ئەوەی نەوەکو ئـەم بـەڵا ناگەهانـە بگاتـە سـەر ئەوانیش، تێکڕا سوێندیان بۆ یەکتری خواردو یەك کەوتن. کەبۆ تۆڵـەی خـوێنی باپیر ئاغا هێرش بکەنە سەر مەڵبەندی مەراغا، تۆڵەی ئـەوە بکەنـەوە کـەڕوی داوە. ئەحمەد ئاقا لەبیستنی ئەم پیلانەی ئەشرار پەشۆکا. ناچار پێشدەستی کـرد لەپەلامار دانیان، لەکاتێکا ئەوان لەشـاری سـابڵاخی موکریـان بـون، لـەناکاو لەناوی جەغەتوو تەتەهو بۆیان پەڕییەوە، هـەڵی کوتایـە سـەریان، لـەحاڵێکا ئەوانە بێ ئاگا بون لەم کارە، کۆمەڵەکەیان پەرەوازە بو، ئازایەتی مەردانی مقدم زیادی کردو، ریزەکانی ئەشرار شڵەژا، سـەرەنجام نـەیان ئـەزانی بـۆ چـارەی ئـەم کارەساتە چی بکەن، مەگەر ئـەوەی پـەنایان بـۆ پاشـای قەراچـۆران(مەبەسـتی پاشای بابانە لەقەڵاچوالان)، هەروەها عەریزەیەکیشیان بۆ علیمراد خـانی زەنـد، کە لەو رۆژانەدا سوڵتانی فارسو عیراق بو، نوسی. لەوێوە لەسـەر داوای ئەوانـە حوکمێك دەرچو" کەمەحمود پاشای قەراچۆران یارمەتی کوردەکان بدا، کەلوپەلی تالاَن کراوی ئەمیرەکانی بلباس لەئەحمەد ئاقـای حـاکمی مـەراغا بسـێنێتەوە، ئەحمەد ئاقا لەحکومـەتی مـەراغا لابـداتو، بـوداق خـانی سـابڵاخی مـوکری لەجێگەی ئەو بکاتە حوکمڕان.

کاتێ ئەم هەواڵانە بەگوێی ئەحمەد ئاقا گەیشت، لەرێگەی رسلو رسـائل ەوە داوای یارمـەتی لەئەمامقلی خانی بەگلەربەگی ورمێو ئەحمـەد خـانی دونبـولی حاکمی خوی کرد. بەیارمەتی ئامادەیی ئەفشارو دونبولی بەسەر مەحمود پاشـادا زاڵ بو. لەبەر ئەوەی مەحمود پاشا لـەو شـەڕەدا گوللـەی تفـەنگی پێکـا بـوی، برینەکەی کاری بو، مرد. بەپێی قسەیەك ئەم روداوە لەساڵی ١١٩٨بـوە. پـاش ئەم روداوانە ئەحمـەد ئاقـا بـەپێی گێڕانـەوەی گلشـن التـواریخ چـۆتە ورمـێ، لەئەمامقلی خانی بەگلەربەگی ئەفشار... نازناوو حوکمی خانی وەرگـرتو، ئـیتر بەئەحمەد خانی مقدم ئەناسرا))[٤٣].

بەیتبێژێکی موکریان ئەم روداوەی هۆنیوەتەوە، ئۆسکارمان لەسـەرەتای ئـەم سەدەیەدا تۆماری کردوە.

## بەیتی باپیراغای مەنگوڕ

## گوێڕادێرنی دیوانە! گوێو لە من بێ دێوانە!

۳ شەوو ۳ ڕۆژانە، بۆ و بکەم مەدحی شیرانە. دۆلابی موکریانە. قاقەز چو بۆ عیلانە. بێ ڕەشەی ڕەسوڵ ئاغانە، لەگەڵ حەمەدی شینانە، ڕابەریان ئەورەحمانە، چۆڵیان کرد، باگردانە. بەعیززەتی سوبحانی، سبحەی لەگەڵ بەیانی، لەشکری باپیرخانی، ڕەنگ وەزیری رومیانی ، سواربو لەباگردانی. مەنگوڕی دەمی وەجاغی، پیاوبون لەسابلاغی، تەدارەك بۆ مەراغی. بۆ مەراغەی ڕەوانە. ۳ شەم سەری هەموانە بە۳ شەموی پڕ هونەر، باپیراغای پڕ جگەر، بدا خانی بۆ دەستەبەر، لەسابلاغی چوبوە دەر، دەڵێ: ((هیچ پەرچت نایەتە بەر))

خالەق! ساحێب سەفایە، پەرچی دەوێ دنیایە، بەئومێدی ئەو خولایە، لێیاندا دەهۆڵو زوڕنایە، ئەسپیان هاتە سەمایە، زۆرخۆشن بۆ دەعوایە، هومێد ڕەسوڵڵایە،((ئەو کارە واپێك نایە!((.

هات، گەبیە فەخرەقایە. لێیاندا دەهۆڵو زوڕنایە. حەوسەد کەسی ڕاگیرایە. زەوقی باپیرا غایە. لێدەن لەتەپڵی شایە. شوکر بۆ خولایە. مەکوژن سەیدو مەلایە! قورعانیان دەسینگی دایە!

هات، گەبیە خاتون باغی. باپیراغای قوچاغی، لەگەڵ خانی سابلاغی. سەیری کەیفو دەماغی، چو لەعەجەمی یاغی.

باپیراغای خاڵ لەڕو، بەرۆژی سێ شەمو چو، عامی خەلقی چو لەدو، چاویان لێ کرد بەفەندی، هات، گەبیە وەکیل کەندی، حەوسەد سواری لەڕەندی.

سبحەینێ چێشتەنگاوە، قاسیدیان دەگێڕاوە، چی ماوە دەنگیان داوە، قوشەن نەبوە تەواوە، تەگبیریان لێ روناوە، سبحەینێ بەیانی داوە، هەر بزوتو نوسراوە، دو عەشیرەتی ماوە.

ئەغلەب ڕمب نەزەرییە، یەك لەسەتی کەم نیە. بزانن مەسلەحەت چیە.((بێ تیپی مەرنەکەنان؟))بۆیەی عالەم ڕاچەنان

بەعەقلم ڕاچەنانە، مەقسودیان گۆڕانە، سولەیمان بەخۆو بەبرانە، ڕایان کردە جلیتانە، مەسلەحەتی هەموانە: ((بچین بۆ سەر عەجەمانە، ڕابەرن بداخانە، مەراغەی بکەین وێرانە، بێن رونیشین لێرانە، مودەبیر کاك سولەیمانە، چونکە گەورەی عیلانە، چ دەفەرموی گیانە؟ ئێرە دەبێ وێرانە؟ مارەیان بکەین ژنانە؟ ئیدی، چلونە سەوزیخانە؟)).

هۆی سولەیمانی خەزالّی! نەوەی رۆستەمی زالّی، حەوت قوببەی لەمەتالّی، پێم نەلّێن ئەتۆ مندالّی! لەجلیی نەکرد خالّی، وەك هەوران بەگەوالی، دەکوژم مالّو تفالی، درەنگە رێی مەکەن خالّی.

گەیبیە، ئەلّلاهو ئەکبەری

لینگیدا پێش خانی بەموشتەری، دەلّێم: ((خانە ئەتۆ کوێندەری، نۆ سەد سواری بەدەفتەری)).

دەلّێم((خانە، لەروحیم بویە موشتەری،لەبۆ مەراغین بەری))

بۆ مەراغەی بردە خوار

یابینای پەروەردگار! بەزار خۆشە نۆ سەد سوار، هەم رۆحمبەرو جەببار، ئیزرائیل بو جلودار، بۆ مەراغەی بردە خوار

بۆ مەراغەی راکشان، ورشە ورشی کەمبەران، بینی میشكو عەنبەران، فەندی پەیاغ بە سەران، قەت نابێ گوزەران

قەت ناتبی گوزەرانە، عەجەم زۆر بێ ئیمانە، لێن تێك دەدەن مەکانە، سەرن دەبڕن لێرانە، خدراغای نەوجووانە، چوە سەر خانی بەرمبانە: ((بابە لێدەم ئامانە!))

باپیر دەلّێت: ((کاکە! کەس ئەوی مەسلّەحەی ناکا. بداغم لەگەلّ پاکە، هیچ دەهویەن لێ ناکا، تەگبیران بکەین چاکە، جێگاکەن زۆر غەمناکە، عەجەم یەکجار هیلاکە))

((عەجەم هیلاكو زۆرزانە))چوە سەر جانی بەرمبانە، دەلّێ: ((بابە لێدەم ئامانە!)).

بانگم وە بەر پادشای لەژور، خان ناردنی دور لەدور، بلباس هاتن بەجەمبور، رانك رەشی چەکمەسور، خان ناردنی بەحوجەتە، بلباسان تالحەو بەختە.

بەسیی رەختی دە زەردا، کاکە رەشی نامەردا، هاتە خوارێ لەسەردا، ئیمانی پێ بو هەردا

مەنگوری دە رمب جولانە، چاویان کەوت بەزیرانە، وە ژور کەوتن یەکانە، چەند شیوی پڕ دەرمانە! چەند شیشەو شەرابە! عەجەم بون بەجەللابە، موکری بون بەقەسابە، هیچ کەس والی دەر نابا، چلۆن دەبێ ئەو حیسابە، هەموی مەستی شەرابە، وای لێ دەرنابا کەسە

خالەق! تۆی فەریادرەسە، مەگەر بەهەرەوەزە، بداخان لێی بو قەزا، رێکی دەدان بەخەزا. تایفەی خان باپیری، رێکی دەدان بەشیری، بو بەخانەبگیری، ئیسلام قڕ بو بەشیری

بەشیری قربو ئیسلام، تێیاندا بۆ قەتلوعام، قەتلوعامیان تێدا بو
سولەیمان بەخۆو بەبرانە، دەردەچو لەدەربانە، ئەگەر لەدەربان دەرچو، چوارو پێنجی کەوتە دو، خەلاس بونی، بۆ نەبو
بۆی نەبو خەلاس بونە، لەو کافری دە مەلعونە، بەو رمبی دەسی سونە، بەداسی کەرەنتونە، هەروەك گەنمیان دەدرونە
هەروەك گەنم و سوالە، دە خوێنیدا شەلالە، بلباس حالت بێ حالە! لەولای بێ شیرە خرە تۆپییان لێدا بەگوڕە، حەوتی لێ بون بەورە، دەنگی لەعەرزی برا.
ئافەریم وەستای خەرات! دەست بەخەنجەری دەدات، حەوت مالی کردن بەرباد
وەستا عوزیری هەندو، خەنجەری شام و تەشو، لەبەرگەڕەکیدا چو، یەکێ لێ خەلاس نەبو
هۆیە وەستا عوزیریا حەوت مال بە وەجاغ کوێری، هەر یەکێکیان دەبوێرێ، ئاوێتی جەزاییری، دابوی لەتەپلی سەری، ئەویشی کرد بێ بەری
کوا مەرزینگ؟ کوا ئومەربل؟ شۆڕە لاوی شل و مل، لەکولانان بونە جل بونە جل لەکۆلانان، لەشی دەوان نەوجەوانان، کەوتبون لەکولانان. لەکۆلان و کەناران، لەشی دەشۆڕە سواران، وەك بژانگی دە داران، سەریان گەبیە حەساران، لەحەساری دەوامگرد، لەبلباسی دەوا خورت، لەش و کەلەش بونە پرد، عەجەم بەسەردا رابرد.
هەر کەس میوانی خۆی کوشت
بەدەهۆل و زوڕنا هاتنە سەر باپیراغای، جا باپیراغا لەبداخانی پرسی:
لەباپیراغای جندییە لەبداخانی پرسییە: خان، ئەو قولە قولە چیە؟
دەلێ: ((یا پیری شوگاییە، ئەوە دەهۆل و زوڕناو شاییە، ئەوە پیشەی ترکییە، زەوقە لەبۆ خەلقییە.
رۆژێکی لەرۆژئاوایە، خان باپیر لەسەرایە، ئاوری تۆپخانە یان دایە، زەلیل باپیراغایە، لیرەی هیچ بۆ پێك نایە" خدری شۆڕیان هەلێناوە، لەپێش بابی راگیراوە. حەمە سور بەچەلەنگی، هەلیان ئەشکاوتە سینگی، کوڕ لەسەر سینگی بابی، لێیاندا بە جەللابی((تو قەت موسلمان نابی!))
سبحەینێ ئەلەسەحەر، کوێت و بوزو سەقەر، لەخاویان هێنا دەر.((لێی کەن زینی موحتەبەر، توندی بکێشن تەنگ و بەر!(( پێی نا لەرکێفی کەوتە سەر.((سوار ببێ پەپاغ بەسەر! پەپاغ بەسەر سوار بێ، خێلی فەقیر هەژار بێ، موکری هەروا داغدار بێ، هەر هاوارو لێدان بێ))

هەر هاوارو لێدانە، بێ سەردارو خێزانە، دەڵێی: مەڕی بێ شوانە، پەخش بون لەزەویانە، دۆڵابی بەگزادانە، سەرکردەی موکریانە، خراب بون ئەو کارانە، بەقڕی دان موسڵمانە، یەکیان نەمان ئەوانە، هومێد بوداغ سوڵتانە، قبوڵ نەکا لەوانە، بوچ بێ دینی غەیانە، وای کرد بو عەجەمانە؟ پێیان نەکا موتمانە، غەلیزن ئەو سەگانە. نەمرە ئەو بداخانە؟ ناترسێ لەگۆڕخانە؟ چییان کردبو بەستەزمانە؟ماڵی خۆی کرد وێرانە، کەسی نەهێشت لەعیلانە. ڕەببی سەد جار شوکرانە، چونکە پێشکار شەیتانە، دەست هەڵگرێ لەو کارانە

هاتو، گەبیە کارێزی، منداڵی پڕ بەئامێزی ئیخسیر چونە تەورێزی
هاتو، گەبیە دەریازی، مەحبوبیان بژارد لەرێزی
هاتە خوار لەلاچینی، لەت بێ لەنیوی زینی، لەبلباس، بەقینی
برایم ئاغا بێ لەسەردا، تاقە سوارەی بێ گەردە، خێزانی دیکدی وەردا
دیکدی وەردا خێزانە، حەسەنی بەکر ئاغانە، میردە رۆژی تەنگانە، بەری هەڵنەدا گوڕانە

مەلا ڕەسوڵ بێ فەڕە، دە پێش بداغی گەرا: ((خانە بەسێ بێ ئەو شەڕە! ئیسلام هەموی وەرگەڕا))

-ئیسلام پاك وەرگەڕاوە، هەتتا سیلمیی هەڵناوە، تا سلیمو بەیتاسی، ئیخسیر، بەسی عەبباسی

بەسی عەبباسی ئیخسیر، زینی ڕۆمیانو بارگیر، لەسەری بو ڕمبو شیر، بداخانی جیهانگیر

بداخان بۆ لەدوایی، هەزار مەڕی شوگایی، هەر هەرزانە، خۆڕایی، دەیاندا مەڕو شایی بزنێك بینی دو کارە لەموی بکرێ دەوارە، بەهای بزنیم دو پارە
هەزار گای بێ جوت بەندە، قیمەتی گای، خولابەندە، بلباسان کاریان گەندە
لەبلباسی گردو مرد. خزمەتی خانیان نەکرد. بۆیە بەدیان بۆ رابرد. خان عەرزی شای لەوان کرد. بۆیە یان تەگبیر لێ کرد خان گوتی: ((خزمەت بەگەرمینیان کرد))بۆیە پاکی برد قڕی کرد.
قڕی کرد لەزەمانی، بنۆڕە تەگبیری خانی. وا گوزەران دەزانێ، ئەمینی دەوڵەتانی. بلباس زۆر بەهەستە زمانی خزمەتو نەکرد بەخانی، بۆ خوو پەیدا کرد غەیانی

تایفەی بوداغ سوڵتانی، لەکن پادشای ڕەوانی
مەنگوڕ زۆر بەستەزمانی. بەستەزمانی بێ شومار، نەیان دا خەرجو بێگار، خانیان لێ بو دەعوا کار، هاتنە پێش پیادەو سوار: ((مالیاتی نادەین چ

جار))وای گوت باپیری نازدار: ((بۆ خۆم دەبمە حاکمی شار، خانی دەردەکەم ئەوجار، خانی دەردەکەم یەقین، بۆ خۆم دەبمە جێ نشین، دەڵێم بەگزادە چ نین)).

ئەگەر ئەو قسە هات، رابرد، خان رونیشت تەگبیری کرد، قسەی خۆیان پاك یەك کرد، عەرزی پادشایان دەکرد. پادشا لەوانی قبوڵ کرد. بداخانی گردو خورد، مانگێکی دی سەبری کرد، پاك مەنگوڕی وەخڕ کرد، سەرتاپای خەڵات دەکرد. بداخان گوتی: ((بمێنم باپیر ئەمنت دەزیینم، سابڵاغیت بۆ دەستێنم، باپیر مەبە ئینتیزار، دەبێ ببیە حاکمی شار، لەبەرم هەیە یەك کار.کارم هەیە لەوێندەری، جاری دەنێرم چەپەری چەپەرێکی بەرەوان، بۆ کن پاشای بەدڵو جان، مەراغەی بکەم وێران، پادشای دەکەم بە خودان، بۆ خۆت ببە ئاغای هەمووان)).

لەمەنگوڕی گردو مرد، قسەی خانیان قبوڵ کرد، بەحەوتوێکی پاکی وەخڕ کرد، بە سابڵاغی تەگبیر کرد.

((گوێو لەمن بێ گەلی جەماعەتی کەس بە بەگزادان هەڵنەخەڵەتێ!))[٤٤].

### ٢/٣ عەسکەر خانی ئەفشار

**نمونە١١:**

**کەمەندی تەدبیر" ئیسماعیل ئاغای شوکاك(١٢٣٥)**

عەسکەر خان بەگلەربەگی ئیلی ئەفشارو سەردەمێك حاکمی ورمێ بو، یەکی بوو لەنۆکەرە دڵسۆزە نزیکەکانی عەباس میزاو، لەجەنگی ئێرانی-روسی‌دا(١٢٢٠)یەکێ لەسەرکردەکانی هێزەکانی بو. لەدوای هاتنی دەستەی نوێنەرایەتی فەرەنسی بەسەرۆکایەتی گاردان بۆ ئێران، بۆ جێبەجێ کردنی پێکهاتنی فەرەنسی- ئێرانی فیتکن شتاین(١٢٢٥: ١٨٠٧)و نوێ کردنەوەی هێزە چەکدارەکانی ئێران، عەسکەر خان کەئەوسا یەکێ لەپیاوە ناسراوەکانی ئێران بو، جگەلەوەی بەشداری دروستکردنی فەوجەکانی پیادەی نیزامی ئازەربایجان بو، لەلایەن فتحعلی شاهی قاجارەوە کرایە دوەمین سەفیری دەربارەی قاجار لەلای ناپلیۆنی ئیمپراتۆری فەرەنسە(١٢٢٢-١٢٢٦).

عەسکەر خان لەگەڵ خۆی بایی پەنجا هەزار تومان دیاری بۆ پاریس بردبو، پاش ئەوەی ٤ ساڵ لەپاریس مایەوە بێ ئەوەی بەهیچ ئەنجامێکی باش بگا، بە١٠هەزار تمەن قەرزەوە گەڕایەوە، ئەو قەرزەی لەسەری کەڵەکە بوبو، ئەیویست لەتاڵان کردنی خەڵکی کوردستان بیبژێرێ. لەپاش گەڕانەوەی عەباس میزا کردی بەحاکمی ورمێ، هەندی سەرچاوە ئەڵێن عەسکەر خان یەکێ بوە لەدامەزرێنەرانی کۆڕی فەرمانسونەری لەئێران[٤٥].

ئێلی شوکاك، کەپێك ئەهات لەچەند تیرەیەك، لەناوچەکانی سنوری ئێران-عوسمانیدا ئەژیان، کاربەدەستانی عەجەم توانی بویان ئەم ئێلە بهێننە ژێر باری فەرمانبەرییەوە، شەڕکەرانی شوکاك لەریزی شەڕکەرانی عەجەم دا بەشداری لەشکرکێشییەکانی عەباس میزاو، سەرکردە سوپاییەکانی تری عەجەم ئەبون" هەم بۆ سەرکوتکردنی ئێلە کوردەکانی وەکو بلباس و زەرزاو، هێزەکانی میری سۆران لەسیدەکان.[٤٦] هەم بۆ بەشداری لەجەنگەکانی روسیاو عوسمانیدا جگە لەوەش ژنوژنخوازییان کەوت بوە بەینەوە لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوانە هیچی دادی نەدان، میزا رەشید باسی سەرپێچی کردنی ئیسماعیل ئاغای شکەفتی سەرخێڵی شوکاك و، کوشتنی بەدەستی عبدالصمد خان، بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:

((رونکردنەوەی ئەم باسە وایە، ئیسماعیل ئاغای کوڕی میزا ئاغای سەرخێڵی ئیلی شکەفتی لەسەر لوتکەی شاخی بنابی نازلو قەڵایەکی قایمی دروست کرد، ئەندەرون و بیرون و دو دژی پتەوی تیابو. ئەم کابرایە وەختی خۆی لەشەڕەکانی نێوان دەوڵەتەکانی ئێران و عوسمانیدا لەپای ئاوزەنگی نائب السلطنەدا خزمەتی دیاری کردبو. بوبوە جێگەی دڵنەوایی کردنی شاهانە. بەشێنەیی کاری ئەو بەرز بوەوە، دەسەڵاتی گەیشتە هەمو ئێل و هۆزەکانی ورمێ، لەگەڵ ئەوەشدا، بەپێی فەرمانی دیوان، ئەبو یەکێ بێ لەژێردەستەکانی حسێنقلی خانی بەگلەربەگ. سەبارەت بەوەی شەرارەت و جەسارەتی سروشتیی هەندێ لەم جۆرە کەسانە، جاروبار ئەبوە هۆی یاخی بون لەگوێڕایەڵی فەرمانەکانی بەگلەربەگی پایەبەرز، توشی تەمێ کردن و گوێ راکێشانی توند ئەبو. لەوەختی خۆیدا بۆ دامەزراندنی بناغەی پەیوەندیو نوێ کردنەوەی رێوشوێنەکانی گوێڕایەڵی کچۆڵەیەکی خۆی لەفرج اللە خانی کوڕە گەورەی عەسکەرخان مارە کردبو.

لەو حەلە بەدواوە، لەسایەی دەربڕین و دڵنیایی خزمایەتییەوە لەگەڵ عەسکەر خان و سەختیی ئەو قەڵایەی پێشتر باسی کرا، سەر لەنوێ کەوتەوە هەڵگەڕانەوەو یاخی بون، رێگەی هاتوچۆی خەڵکی بڕی، کەلوپەل و بەربومی چەن ئاواییەکی دەوری قەڵاکەی تاڵان کرد.

کەهەواڵی یاخی بون و هەڵگەڕانەوەی ئیسماعیل ئاغا گەیشتە بەگلەربەگ، سەرەتا هەر بۆ بیانوبڕین و تێگەیاندن و لەبەرچاوگرتنی خزمایەتی ئەو لەگەڵ عەسکەرخان، عبدالصمد خانی لەگەڵ عەلی سوڵتانی ریش سپی هۆزی کەلوڕو چەند کەسێکی لەکارکەرانی باوەڕپێکراو، مەئمور رەوانەی قەڵا فەرمو. کەبەڵکو بەپەندو ئامۆژگاری بیهێننەوە سەر رێ. خانی ناوبراو لەگەڵ مەئمورەکان، وەکو

فەرمانیان پێ درابو، چون بۆ قەڵای ئیسماعیل ئاغا. لەقەڵاکەی خوارەوە دەستەیەك لەپیاوەکانی کەچەکدارو ئامادە پاسەوان بون، ئیسماعیل ئاغایان لەقەڵاکەی سەرەوە لەهاتنی عبدالصمد خان ئاگادار کرد. پاش رێگە درانیان مەلا صالح ناوێك کەهاودەمی ئەوبو. پێشوازی لەعبدالصمد خان کردو بردی بۆ حەساری سەرەوە. ئیسماعیل ئاغا خۆیشی‌چەند هەنگاوێك لەحەساری سەرەوە هاتە پێشێ‌و، هەمویان پێکەوە چونە ئەندەرونی حەسار.

عبدالصمد خان کەوتە ئامۆژگاری بەبەزەییانەو، گفت‌و گەف، بەڵام لەو هیچ وەڵام‌و قسەیەکی نەبیست، نیشانەی رازی بون یا راست بێ. عبدالصمد خان سەرلەنوێ بەنەرمی‌و میهرەبانی ئامۆژگارییەکانی خۆی دوبارە ئەکردەوەو ئەیوت: خیلاف‌و خیانەت بەرامبەر دەوڵەت هەمیشە ئەبێتە هۆی داماوی‌و زەرەرو، ئەنجامی خراپی لێ ئەوەشێتەوە. ئەو کابرا بێباکە لەبیستنی ئەم قسانە تورە بو، بەدزییەوە جنێوی بەعبدالصمد خاندا. بۆیە عبدالصمد خان وەکو شێری تورەی دڵ پڕ لەقین لەلای ئەو هەستاو، لەدڵی خۆی‌دا سوێندی گەورەی خوارد" ئەگەر بهێڵم ئەم کابرایە بەزیندویەتی بمێنی، دیارە من لەنامەردانی رۆژگارم. ئەوسا لەقەڵاکەی ئیسماعیل ئاغاوە بەسواری هاتە خوارێ‌و، لەماوەی دو سەعات‌دا خۆی لەشار گەیاندە حزوری حسێنقلی خان‌و باسەکەی بۆ گێڕایەوە. ئەم جارەیان بەگلەربەگ، عەسکەر خانی بۆ قەڵای ناوبراو مەئمور فەرمو.

عەسکەرخان رۆژی یەکشەممە ١٤ی محرم الحرام لەگەڵ چەند کەس لەگەورەکان‌و ئەعیان‌و برازاو نەزەر عەلی خانی کوڕی خۆی، چو بۆ سەر قەڵای ناوبراو. لەدەوری قەڵاکە دابەزی، لەدوای ئەویش عبدالصمد خان لەگەڵ سوارانی ناوداری نیزامی کۆکراوەی خۆی کەوتەرێ. عەسکەرخانی کارزان نیازی وابو کەئەو بەکەمەندی تەگبیر نەك بەجەنگ‌و پەیکار گرفتار بکا. بۆیە بەهۆی تەرجومانێکی زمانزانەوە پەیامی بۆناردو نامەی پێ گەیاند. ئاگاداری کرد لەداوێنی قەڵاکەدا ئەیەوێ بیبینێ تا گفتوگۆی لەگەڵ بکات. ئیسماعیل ئاغا قبوڵی کرد. داوای بارمتەی کرد لەناو قەڵا دایان بنێ. تا خۆی بەتەنیا بێتە داوێنی قەڵا. عەسکەرخان بۆ دڵنیایی ئەو، نەزەر عەلی خان‌و فەرەج ئەڵڵا خانی وەکو بارمتە نارده قەڵا، ئیسماعیل ئاغاش ئەوسا زاتی کرد لەگەڵ پێشخزمەتەکەی خۆی‌دا، هاتە خوارێ بۆ چادری عسکەرخان لەدەوری چەمەن چەنزە.

لەم کاتەدا عبدالصمد خان لەگەڵ سوارەکانیو یەکدو دەستە گەیشتە دەرگا. بینی ئیسماعیل ئاغا لەگەڵ براکەیدا خەریکی پرسیارو وەڵامن. هەر بەسواری هاواری لەعەسکەرخان کرد، وتی: هەرکە دوژمنت بەردەس کەوت بیکوژە!

ئیسماعیل ئاغا لەبینینی عبدالصمد خانو بیستنی مصرعێکی کەخوێندیەوە، خۆی گەیاندە ئەسپەکەی. هێشتا پێیەکەی تری نەخست بوە ناو ئاوزەنگی، عبدالصمد خان کتوپڕ تفەنگەکەی خۆی بەرەو ئەو ئاگر داو بەگوللەیەك تەواوی کرد. سوارانو سەربازان لەبینینی ئەم روداوە کەوتنە دەسرێژو، چەند کەسێکی کەهاورێی ئیسماعیل ئاغا بون کرانە نیشانەی گوللە.

عەسکەر خان لەم هەلومەرجەدا لەپەژارەی نەزەر عەلی خانو فرج اللـه خان دابو کە لەقەڵاکەدا بون. عبدالصمد خان لەم کەینوبەینە ئاگادار نەبو. نەوەکو دانیشتوانی قەڵاکە بیان کوژن. بەڵام کەقەڵادارەکان گوێیان لەدەنگی دەسرێژی تفەنگەکان بو، نەزەر عەلی خان بەزیرەکیی خۆی، زانی بوی کەئیسماعیل ئاغا چوە بۆ دیاری عەدەم، روی خۆشی پیشان دانو مژدەی بەکوردەکاندا" لله الحمد پێکهاتنو ئاشتی لەنێوان هەردو لادا کراوە، ئەو دەسرێژەش نیشانەی ئەوەیە. ئەوانیش بڕوایان بەم قسەیە کرد. چاودێری ئەو دو لاوە یان پشت گوێ خست. ئەوسا نەزەر عەلی خانو فرج الله خان هەردو سواربون، بەخێرایی بروسکەو با بەرەو ئوردو کەوتنە غاردان، باوکی مەزنو مامی ناودار بەهاتنەوەو رزگار بونیان گیانێکی تازە یان تێ گەڕایەوەو، خۆشییەکی بێ ئەندازە یان پێ گەیشت. ئینجا سوارانو سەربازان هەڵیان کوتایە سەر قەڵاکەو، هەمو دارایی ئیسماعیل ئاغایان تاڵان کرد. کوڕەکانی ئیسماعیل ئاغا: میرزا ئاغاو، عەلی ئاغاو،یەحیا بەگ لەمەیدان هەڵاتن، بەڵام ژنەکەی ئیسماعیل ئاغا کەناوی((جازی))بو ئافرەتێکی ژیرو ئازا بو، پاش ئەم روداوانە چو بۆ دار السلطنەی تەوریز بۆ لای ولیعەهد نائب السلطنە بەپێی عەرزی ئەو عەلی خانی ئەفشار کەنسقچی باشی دەربار بو بەمەئموری بۆ ورمێ نێردراو، بەلەبەرچاوگرتنی گوێڕایەلّی جۆرە پێکهاتنێ کراو، گەڕایەوە..))[٤٧].

### ٣/٣ عەباس میرزا نائب ئەلسەڵتەنە

**نمونە١٢:**

**جەماعەتی ئەکراد" باعیسی روداني فتنەو فەساد(١٢٣٨)**

ئاقا محەمەد خان، یەکەمین شاهی قاجار بەوەجاخ کوێری کوژرا، چونکە بەمنداڵی خەساند بویان. بەڵام خۆی هێشتا زیندو بو، فەتح عەلی برازای بە ولیعەهد دانا بو. وەسێتیشی بۆ کرد بو کە" شای ئێران ئەبێ هەمیشە کەسی بێ

که لەسەری دایكو باوکەوە لەئێلی قاجار بێ. فەتح عەلی شاهی قاجار ژمارەیەکی زۆر ژنی هەبو. هەر بەو جۆرەش ژمارەیەکی زۆر کوڕو کچی لێ کەوت بوەوە. کەمرد هەر کوڕەکانی ژمارەیان بەرەو ژوری ١٠٠کەس بو. لەناو کوڕەکانیدا لەژیانی خۆیدا، عەباس میرزای هەڵبژارد بو بەنائب السلطنه، واتە بەوەلیعەهدی خۆی.

عەباس لە١٢٠٣دا لەئاوایی نوا لەمازندەران لەدایك بوە. لە١٢١٣دا هێشتا تەمەنی ١١ساڵ بو. باوکی هەڵی بژارد بەولیعهدی خۆیو کردی بەوالی ئازەربایجان. بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی، سلێمان خانی قاجار(اعتضاد السلطنة)بە لەلەیو، میرزای عیسی فراهانی(میرزا بزرگ)بەوەزیریو، ئیبراهیم خانی قاجار بەسەرداری بۆ دانا.

لەیەکەمین هێرشی روسیدا بۆ سەر قافقاز(١٢١٨) عەباس کەهێشتا ١٦ ساڵ بو، لەلایەن شاوە کرا بەسەرکردەی هێزەکانی ئێران. لەهەموو شەڕەکانی هەردو خولی جەنگی روس-ئێرانیدا عەباس میرزا سەرکردایەتی هێزەکانی لەئەستۆدا بو[٤٨].

رێککەوتنی ئێران لەگەڵ فەرەنسەو هەوڵدانی فەرەنسی بۆ رێکخستنەوەی سوپای ئێرانی لەسەر شێوەی نوێی ئەوروپایی، بۆ ئەوەی خۆی لەبەر گوشاری روسیدا بگرێ، کەڵکی ئێرانی نەگرت.

ئێران خولی یەکەمی جەنگی دۆڕاندو بەبەستنی پەیمانی گولستان(١٢٢٨)کۆتایی هات. نابەرامبەری تەرازوی هێزەکانی هەردولا، دەرباری قاجاری ناچار کرد کەزۆر مەرجی گرانی روسی قبوڵ بکا. لەم پێکهاتنەدا، روسیا دەسکەوتی ئەرزی، سیاسی، ئابوری زۆری لەئێراندا بەدەس هێنا.

ئێران خولی دوەمی جەنگی روسی- ئێرانی(١٢٤١-١٢٤٣) لەجاری پێشو خراپ تر دۆڕاند. هێزی روسی گەیشتە تەورێزو، لەکاتێکا خەریکی پێشڕەوی بو بۆ داگیرکردنی تاران، ئینگلیز کەوتە تەقەلای ناوبژی بۆ راگرتنی جەنگو رزگارکردنی ئێران لەروخانو هەڵوەشان. گفتوگۆی ئاشتی لەنێوان عەباس میرزا بەنوێنەرایەتی شاو، جەنەرال پاسکۆڤیج سەرکردەی هێزەکانی روسیا بەنوێنەرایەتی قەیسەر دەستی پێ کرد. لەئاوایی تورکمان چای، لەباتی پەیمانی گولستان، پەیمانێکی نوێیان ئیمزا کرد(١٢٤٣).

مەرجەکانی روس لەپەیمانی تورکمان چایدا زۆرگران تر بو لەوانەی ناو پەیمانی گولستانو، دەسکەوتی ئەرزی، سیاسی، ئابوری زۆر زیاتر بون لەهی

پێشو. عەباس بەگوێرەی ئەم پەیمانە دەستی لەسەرزەمینێکی فراوانی ئێران هەڵگرت بو روسیاو، سەربەخۆیی سیاسیی‌و ئابوری‌و سوپایی ئێرانی کۆتوپێوەند کرد. پەیمانی تورکمان چای ئێرانی کردە دەوڵەتێکی لاواز شوێنی لەمپەری لەنێوان روسیاو هیندستان‌دا گرتەوە. بەڵام عەباس میرزا ئەم پەیمانە زەلیلانەیەی بۆ خۆی بەسەرکەوتنێکی گەورە دائەنا چونکە" لەمادەی ٧هەمی‌دا روسیا بەڵێنی دابو کەپشتیوانی عەباس میرزا بکا بۆ ئەوەی((شاهێتی ئێران)) لەوو دوای ئەویش لەکورو نەوەکانی ئەودا بمێنێتەوە"[٤٩].

دەرباری قاجار لەئەنجامی هەردو خولی جەنگی روسی-ئێرانی‌دا بەشێکی فراوانی لای ژوروی قەڵەمڕەوەکەی لەدەس دا بو. ئەی ویست ئەوەی لەوێ دۆڕاندبوی لەشوێنێکی تر بیبژێرێ. یاخود وردتر بڵێین" ئەی ویست لەسنوری رۆژئاوای‌دا، لەئەرزی کوردستاندا، کەبەشێکی قەڵەمڕەوی عوسمانی بۆ بێتەوە مایە. بۆ ئەوەش دەرباری قاجار ئەی ویست کەڵك لەکورد، بەتایبەتی لەمیرەکانی بابان وەربگرێ.

هاوزەمان لەگەڵ ئەو رووداوانەدا بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد خەریك بو پێی ئەنایە قۆناغی سەرهەڵدان‌و هەوڵی رزگاری لەدەسەڵاتی بێگانەو یەك گرتنەوەی ناوچەییەوە. لەزۆر ناوچەی کوردستان‌دا بزوتن‌و راپەڕین لەپەرەسەندن‌دا بو، هەندێکی کەمو زۆر رەنگی جولانی نەتەوەیی‌و، هەندێکی رەنگی یاخی بونی خێڵەکی‌و، هەندێکیان رەنگی ناڕەزایی کۆمەڵایەتی‌و ئابوریان پێوە بو. لەوانە" تەقەلای میرەکانی بابان، بەتایبەتی عەبدولڕەحمان پاشاو مەحمود پاشای کوڕی. تەقەلای میری سۆران یاخی بونی ئێلەکانی دونبولی، حەیدەرانلو، سیپکی، زیلان، جەلالی، بلباس، شوکاك. دەباری قاجار لەهەریەکێ لەم رووداوانەدا بەجۆرێ تێکەڵاو بو، بەشداری سەرکوت‌و تێکشکاندن‌و لەناو بردنی کردن.

عەباس میرزا چوارچێوەی سیاسەتێکی کوردیی داڕشت بو، کەجۆری بۆچونی دەرباری قاجاری بەرامبەر مەسەلەی کورد بەگشتی دیاری ئەکردو، چۆنایەتی رەفتارکردن لەگەڵی دەرئەخست. ناوکەکەی بریتی بو لەوەی چۆن بتوانن کورد لەململانێی ئێرانی- عوسمانی‌دا بەچاکترین شێوە بەقازانجی خۆیان بەکاربهێنن. عەباس میرزا نامەیەکی درێژی بۆ فەتحعلی شا نوسیوە سیاسەتی کوردیی خۆی رون ئەکاتەوە، لەبەرگرنگی نامەکە وەکوی خۆی لێرەدا رای ئەگوێزین:

((عەرزی نوابی نائب السلطنە، دام ایام اجلالە، ئەمەیە کە:

لەبەرئەوەی هەمو دەوڵەتانی کافر لەم سەردەمەدا خەریکی ئاشتی‌و سازانن، منیش هەمیشە هەوڵ‌و تەقەللامەو، تەلاش‌و رەنجم لەو بوارەدا بۆ ئەوە بوە،

کەناکۆکی لەنێوان دەوڵەتی ئیسلامدا نەمێنی. تا ساڵی پار، کار لەئاشتیو پێکهاتن ترازاو، ماوەی سازان نەما. دوای پێشڕەوی موشو بایەزیدو ئەرجیش کەگەڕاینەوە تەورێز لەلای خۆمەوە قایمقامم بەنیازی سازان نارد. ئەوان وەڵامی راستیان نەدایەوە. چەندجار لەگۆشەو کەنارەوە لەدەرگای ئاشتیماندا. بەڵام بەهیچ جێگەیەك نەگەیشتین. تا ئەمساڵ بەخواستی خواو بەختی شاهنشا، گیانی هەمومان بەقوربانی بێ، توشی ئەو تێکشکانە بون. دوای ئەوە دەسبەجێ خەڵکمان نارد. لەلای خۆمانەوە بەئاشکرا داوای رێککەوتنمان کرد. دواییتر میزا تقی مان ناردو ئەو خزمەتە پیرۆزەمان پێ سپارد. ئەویان ناردەوەو بەڵێنیشان دابویە لەماوەی چل رۆژدا وەڵام بدەنەوە. بەڵام بەجێیان نەهێنا. سەرەڕای ئەمەش دیسان چەند جارێ لەرێگەی ئینگلیزەکانەوە، بەهۆی ئیلچییانەوە لەئەستەمبوڵ ئەوەمان دەربڕیوە. بەڵام تا ئێستەش بەهیچ جۆرێ وەڵامی ئەوان نەگەیشتوە بەڵکو لەهەمو لایەکەوە بەگەرمی خەریکی خۆسازدانن بۆ جەنگو هیچ نیشانەیەکی ئاشتیو سازین دیار نیە. لەگەڵ زانینی ئەمەدا، هەرکات ئێمەش کەنۆکەرانی ئەم دەوڵەتەو سنوداری ئەم مەملەکەتەین، ئەگەر بەهیوای ئاشتی پاڵی لێ بدەینەوە، خۆسازدان پشت گوێ بخەین، ئەوە پێچەوانەی بەرژەوەندی دەوڵەتی قاهیرەیە، بۆیە لەڕوی شارەزاییو دڵسۆزییەوە بەئاشکرا ئەم مەسەلەیە عەرز ئەکەم:

ئەگەر لەلایەن ئێمەوە پێش دەستی نەکرێ، مانگی دوەمی بەهار نەچینە ناو خاکی دوژمنەوە، ئەوەندە دوا بکەوین تا جەوزاو سەرەتان بگا، قشونو تۆپخانەو هێزو خواردەمەنی رۆمی لەهەمو لایەکەوە کۆببیتەوەو، کوردەکان خێزانو رانو رەوەو کەلوپەلەکانی خۆیان لەکوێستانەکانو هەوارەکان دابمەزرێننو، سوارەو سوپاییان لەهەمو لاوە وەکو مێرولەو کوللە هێرش بهێنن. ئەوسا ئەگەر بمانەوێ جەنگ بکەین یاخود بمانەوێ ئاشتی بکەین کارەکە گرانو، چارە دژوار ئەبێ. لوتبەرزیو لەخۆبایی بونی رۆمی لەئاشتیداو، هێزو توانایان لەجەنگدا زۆر زۆر زیاد ئەبێ. بەڵام هەر کات ئێمە لێرەوە زو بجولێین، تا کوێستانەکان بەفری لێ نەچۆتەوەو ئەوان ناتوانن لەکەلێنەکانیدا بحەوێنەوە، بچینە ناو خاکی دوژمنەوەو لەپێش ئەوەدا قشونی عوسمانی کۆببێتەوە شەرارەتی ئەشراری کورد، کەمایەی هەمو شەڕو فەسادێك هەر ئەوانن. بەفەزڵو کەرەمی ئیلاهیو تالیعی سەرکەوتوی شاهنشاهی لەبەریەك هەڵ بوەشێنینو، بەویستی خوا لەموش بەرەو خوار راویان بنێین. ئەوسا ئەگەر بمانەوێ جەنگ یا ئاشتی بکەین، بەیارمەتی

خوای گەورە ئاسان ئەبێ‌و بەسوکی مەیسەر ئەبێ. لوتبەرزیو بـاییبونی رژمـی ئەگۆڕێ بەخۆشڕۆیی‌و زەبرو زۆریشیان ئەبێ بەکزی‌و ناتەوانی.

لەبەرئەو هۆیانە ئەگەر بیری پیرۆزی شاهنشاهی هاتـە سـەر ئـەوەی کـەپێش دەستی بکرێ، قشونی سوارە، کەمەئموورو تەرخان ئەکرێن، ئـەبێ کاتـێ لـەوێوە بجولێن کەلەکۆتایی حەملدا یا ئەگەر زۆر دوا بکەون لەسەرەتای ئـەوردا بگەنـە تـەوریز، تاقشـونی تێـرەش دوا نەکـەوێ، بـەبێ چـاوەڕوانی بـەو پـەڕی پشـت ئەستوربیەوە، ئینشائەللا، هەر لەو کاتانەدا بکەونـە خزمـەت، لـەم حاڵەتـەدا کەئەگەر لەسـەرەتای ئـەورەوە دەس بـەکاری ئـەم لایـە بکـرێ ئومێـدەوارین تـا سەرەتای میزان، بەئاشتی بێ یا بەجەنگ، بتوانرێ لەم لایەوە دڵنیـایی بـەدەس بێ.

کاتی لەشکرکێشی بۆ سەر بەغدادیش هەر لەو دەمانە دایـە، کـام نیعمـەت باشترو بەرزترە لەوەی کە لەم عەزیمـەتی شـاهانەیەدا پەروانـەی احضـاری ئێمـە بگات، لەم سەفەرەدا ملازمی رکابی فەلەك فرسابم‌و، گیانبەختکەرانە لەحزوری میرا دەربکەوین، لەبارەی جـولانی مـەوکیبی جیهـان گـرەوە فـەرمان فـەرمانی ئەشرەفی هومایۆنـە، بـەلام لەبەرئـەوەی لـەڕوی کـەمالی عاطفیتـە وە لەئێمـە پرسیارتان فەرمو بو، بەپێی فەرمانی بالایان عەرز ئـەکرێ کەمـەوکیبی پـیرۆز هەرچـی زوتـر لەسـولتانیەوە بکەوێتـە رێ بـۆ سـازدانی سـوپاو کۆکردنـەوەی سەربازانی سەرکەوتو، پەنا بۆ ئحتسابی روس‌و رۆم و دڵنیایی ولایەتەکانی سنور باشترو خۆشترە، بەلام بەدیارە لەپاش مانگی شـەوالدا زۆر زوەو، ئـەو کاتانـە زۆر زۆر پیرۆزەو لەهیچ جێگەیەکەوە کۆسپ‌و گرفتاری نابێ، بگرە پێشکەوتنی هەمو کارەکان بەجۆرێ کەچەندین جار تەجروبە کراوە طالعـی هومـایۆنی لـەزیادبونی شاهنشاهیە کەبەفەزل‌و تایید تۆفیقی ئیلاهی تیشکی چاودێری سولتانی لەهەر کەس بدات‌و، روی جولانی پیرۆزی بگاتە هەر لایەك، هەر کاتێك بێتە پێشەوە بێ زەحمەت‌و پەشۆکان‌و بۆ پێشەوە ئـەڕوا. لەبەرئـەوەی قـەول وایـە هـەر بڕیارێـك دەربارەی ئەو لایە بـدرێ بەدرێـژی عـەرزی خـاکی پێـی پـیرۆز بکـرێ، ئەوەنـدە ئەخرێتە بەرچاو، کەحکومـەتی شـارەزورو بابـان‌و دەورو پشـتەکانی بـەگوێرەی رێگەپێدانی پـیرۆز دراوەتـە محەمـەد پاشـا(مەبەسـتی مـەحمود پاشـای کـوڕی عەبدولرەحمان پاشایە)دڵنیـایی لەراسـتی بـاوەڕو خزمـەتگوزاری ئـەو کەئـەبێ ئێستەو پاشەڕۆژ بەدی بێت، بەچەند شتێك ئەهێنرێتە دی کەوا یەکەیەکە عەرز ئەکرێ.

یەکەم: گلدانەوەی بارمتە لەبەرئەوەی کوڕە باشەکانی ئەوو، ئەوو عوسمان بەگ، کەهەردوکیان لەکرماشان بون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سەرپێچیەیان لەیەکدو ساڵدا کرد، گلدانەوەی ئەم جۆرە بارمتەیەم بەمایەی دڵنیایی نەزانی‌و بڕیاری ئەوەمدا لەکاتی سەفەری خەیر ئەسەردا، عوسمان بەگ خۆی لەگەڵ هەزار سوار یا زیاتر لەئەعیان‌و گەورەو گەورە زادەکانی بابان، ئینشائەڵڵا تەعالی، لەگەڵ بخاو لەپێشڕەوی سوپای سەرکەوتودا، بەڕاشکاوی‌و ئاشکرا دژی سوپاو سەر عەسکەری عوسمانی بجەنگن.

دووەم: بەئاموشۆی محەمەد پاشاو عوسمان بەگی برای کەماوەیەك بەر لەئێستا عوسمان هات، مانگێك لەتەورێز مایەوە. شەوی جەژن پاشا خۆی تکای کردوە، ئینشائەڵڵا تەعالی، دێت. ئەو کەرۆیشت دیسان عوسمان بەفەزلی خوا دێتەوە. بەو شەرتەی بێنم لەگەڕانەوەدا بەهەمان ڕێوشوێن ناهێڵم دیسان لەهاتوچۆ سارد ببنەوە.

سێیەم: سەرەڕای هەبونی قشون‌و سوپای استعدادی دەوڵەتی قاهیرە لەویلایەتی بابان کە تا ئێستە ئیبراهیم خانی سەرتیپ، کەچەند جار لەتاقم‌و سوپای بابان زۆرترو زاڵ ترەو، لەو شوێنانە بوە. لەرۆژانی سەفەریشدا، باوەڕپێکراوێ لەوێ دانیێم‌و ئەوەندەی قشون کە لەغازیانی سەربازو سوارەی رکابی بەساخلو لەوێ دابنێم، لەباتی ئەوان لەسوارەی بابان‌و بلباس‌و هی تر ئەبەم بۆ سەفەر. لەراستیدا خەڵکی کوردستان‌و ئەردەڵان‌و سابلاخی موکری هەمویان پشتگرو یارمەتیدەر ئەبن‌و، ئەگەر بەقازانجی دەوڵەتی بزانن ئیشارەتی خدیویانە سەبارەت بەیارمەتیدان لەکاتی پێویستدا ئەفەرمون.

چوارەم: هۆی سەرەکی پەژارەیەك کە کەسانی وەکو محەمەد پاشا هەیانە لەوەیە کەباری سەگینی دراو وکەلوپەل‌و طمع‌و توقع بخرێتە سەر شانیان‌و،لەعودەی نەیەن‌و، بەڵێن‌و گفتێك بدەن‌و دوایی بۆیان جێبەجێ نەکرێ‌و لەهەردو لاوە ببێتە هۆی ترس. ئێمەش الحمدلله نەبارێکمان خستۆتە سەر شانی ئەوو، نە طمع‌و توقعێکمان هەیە. ئاسان ئاسان پێشکەشی سەرکاری پیرۆزیش کە لەحەزرەتی هومایۆندا نەختینە مان گرتۆتە خۆ ئینشائەڵڵا تەعالی ئەیدەین. بۆ ئیبراهیم خانمان نوسیوە لەو مەڕو گاو قاترو یابۆ ئەو جۆرە شتانەمان لێ وەربگرێ‌و، بەقشونی فەرمان پێ دراوی بدات‌و بەفەزڵی خوا حسابی ئەوەش، بریتیەکەی هەرچۆنێ بێ لەکەلوپەلی بێ کەڵك‌و دراوی بێ برەو تا خۆمان بۆ سەفەر نەرۆیشتوین ئەیدەین. بێگومان ئەوانە کەبریتیەکەی داو خزمەتی باشی

کرد، بێ هودە ئەم خزمەتە لەدەس نادا. پاش دانی پارەکە پێچەوانەی ڕێوشوێنێك ناجوڵێتەوە کەببێتە هۆی ناڕەحەتی بیری هومایۆن.

پێنجەم: ولایەتی شارەزورو کۆیەو حەریر لەسێ لاوە بەسابلاخو ئەردەلانو سنورەکانی کوردستانو کرماشانەوە بەستراون، کەمەملەکەتی پارێزراوی سەرکاری شاهنشایەو، لایەکیشی بەشوێنی دەسەلاتی وەزیری بەغدادەوە بەستراوە. لەهەر ڕێیەکەوە ئاژاوەو فەسادێك لەو ولایەتەو ئەم تایەفەیەوە بگات. تەنیا لەو لایەیەوەو بەس. ئەو لایەش لەم کاتەدا کەئیبراهیم خانی سەرتیپو محەمەد پاشا تا موسڵ ڕۆیشتونو کەرکوكو هەولێرو پردی سور غاشیەی دڵسۆزیو گوێڕایەڵییان دەربڕیوە، وەزیری بەغدادیش بەجۆرێ خزمەتو سازدانی پیشان داوە کەتائێستە دو سێ جار پیاوی ئەو هاتونەتە لای سەرتیپو محەمەد پاشاو، بەپێی نامەیەك کەنوسی بویان بە گشتی کارەکانی ئەوێ ئەڕوا. ئەگەر لەپێش چۆنی ئێمەدا بۆ سەفەر، ئینشائەڵلا تەعالی بەشێوەیەك کە بەمەبەستی ئەولیای دەوڵەتی قاهیرەیە، کاری بەغدادو وەزیر بۆ پێشەوە چو، لەو لایەشەوە دڵنیا ئەبینو، ئەویش لەحوکمی ولایاتی مەحروسەی شاهنشاهیدا ئەبێو، هەر کاتێ پێشکەوتنێ پێك هات، عەزمێك کە لەکاری بەغدادا مەبەستی هیمەتی بەرزی سوڵتانیە لەو بەهارو هاوینەدا کاروباری ئەوێ بەلادا ئەخات. ئەگەر ناتەواوییەك بمێنێ لەفەسڵی پاییزا، ئەگەر بژین، لەکاتی گەڕانەوەی ئێمەدا، ئینشائەڵلا، ئەتوانین زستان لەگەرمیانی عیراقی عەرەبدا بەسەر بەرینو، بەغداد ئێستە لەسایەی سەری هومایۆنەوە ئەو توانایەی نەماوە بەرگەی هەڵمەتی لەشکری جیهانئاشوبی شاهنشاهی بگرێ.

شەشەم: عەبدوڵڵا پاشا کەگەورەترینو بەسالاچوترین پاشایانی بابانە، لەگەڵ هەزار ماڵی ئێلی بابان، کەزۆریان لەپیاوی ناسراوو ئاغاو گەورەکانیان لێرەن، بەوپەڕی ڕێزو بەرزییەوە گلمان داونەوەو بەتەما هەین لەم ڕۆژانەدا لەدەوروبەری سابلاخ بەشو تیولی بدەینێ. لەبەر ئەوەی ئەبێ هەر کەسێ لەئەهلی ڕۆژگار بەترسو هیوا گل بدرێتەوە. ئەم ڕێگەیەش ترسی محمود پاشا ئەبێ.

بەپێی ئەم ڕێوشوێنو شێوەیە کەبەدرێژایی خرایە بەرچاو، ئومێدم وایە لەکاتی لێرە نەبونی ئێمەدا لەکاروباری ئەم لایەدا هیچ چەوتیو کەموکوڕییەك رو نەدا، بەفەزڵی خوداو باتنی ائمەی اطهاری متوکلینو، بەئیمدادی طالعی اقدسی همایون متوسلین، ئەو تەگبیرەی بەبیری ئێمەدا هاتوە بەم درێژییە رونمان کردۆتەوەو رونی ئەکەینەوە، ئینشائەڵلا لەگەڵ تەقدیر موافق ئەبێو، تکام وایە هەر یەکێ لەو بڕگانە بگاتە بەر خاتری عرش مظاهری وەحیو تنزیل بەئیرشادو

هیدایەتی بفەرمونو، نامەی پیرۆز زۆرتر بگات کەهیچ کاری بێ ئیجازەو عەرزی شەهریاری نەکرێ[٥٠].

لەم نامەیە چەند مەسەلەیەکی سەرەکی هەڵئەهێنجرێ:

١-چۆن رەفتار لەگەڵ کورد خۆی بکرێو ئارام بکرێتەوە"

٢-چۆن وەکو هێزێکی جەنگیو سیاسی لەململانێی ئێرانی- عوسمانیدا، لەکاتی پێکادانی چەکدارو لەکاتی گفتوگۆی سیاسیدا بەکاربهێنرێ"

٣-چۆن کەڵك لەدادوشینی توانای ئابوری کورد وەربگیرێ بۆ ئاسان کردنی کاروباری لۆجستیکی"

٤-چۆن سیاسەتێکی دوروانە لەمەسەلەکەدا بگیرێ، لەلای مەزنەکانی کورد بەجۆرێكو، لەلای دەوڵەتانی تورکو ئینگلیز بەجۆرێکی تر.

کێشەی بابان تەنگوچەڵەمەیەکی قوڵی لەپێوەندی عوسمانی- ئێرانیدا دروست کرد. مەڵبەندی بابانیش بو بەیەکێ لەمەیدانەکانی پێکادانی خوێناوی هەردو هێزی ناوچەکەو کۆتاییەکەشی بەپەیمانی یەکەمی ئەرزرۆم(١٢٣٨)و پەیمانی دوەمی ئەرزرۆم(١٢٦٣)هات. ئەم دو پەیمانە پێوەندییەکانی ئێرانو تورکیایان رێکخستەوە، کێشە ئەرزییەکانی سنوریان بەلاداخستو، بنچینەی سیاسەتی هاوبەشی هەردو دەوڵەتی بەرامبەر مەسەلەی کورد دانا. یەکێ لەئەنجامە راستەوخۆکانیشی لەناوبردنی ئەمارەتە ئوتۆنۆمەکانی کورد بو.

دورویی سیاسەتی عەباس میرزاو کاربەدەستانی تری دەربار لەنامەکانیاندا، بەرامبەر کورد، زۆر ئاشکرایە. لەکاتێکا بەریتانیا خەریکی ناوبژی ئاشتی بو لەنێوانی دەرباری قاجارو بابی عالیدا. نوێنەرانی هەردو دەوڵەت لەئەرزرۆم خەریکی گفتوگۆی پێکهاتن بون. چەندین نامە لەنێوان عەباسو فەتحعلی شاو کاربەدەستانی تورکو ئینگلیزو نوێنەرەکانی خۆیدا هاتوەو چوە. لەم نامانەدا بەرونی سیاسەتی کوردیی دەرباری قاجار ئەخوێنرێتەوە. عەباس میرزا کەخۆی بەرێوەبەری ناکۆکی ئێرانی-عوسمانی بو لەسەردەمی جەنگو لەکاتی گفتوگۆی ئاشتیدا، لەنامەکانیدا رونی ئەکاتەوە.

فەتحعلی شا لەنامەیەکدا کە لە١٢٢١دا بۆ وەزیری بەغدای نوسیوە، عەبدولرەحمان پاشای بابان بە((...عالیجاه، رفیع جایگاه، عزتو نبالت همراه، فخامتو بسالت انتباه، اخلاصو ارادت ئاگاه، امیرالامراء العظام، عبدالرحمان پاشای، حاکم قلعه چوالان...))ناوئەبا.[٥١]

عەباس میرزا لەنامەیەکیدا بۆ مەحمود پاشای بابان بە((...عالیجاه، رەفیع جایگاه، مجدتو مناعەت پەناه، فەخامەتو نبالت اکتناه، ارادت ئاگاه، میری میرانی عظام، مەحمود پاشا حاکمی سلیمانیو بابانو شارەزور..)) ناوی ئەبا[52]

محەمەد عەلی میرزاش لەنامەیەکدا کە لە ۱۲۳۵دا بۆ قاسم ئاغای گەورەی ئیلی حەیدەرانلوی نوسیوە بە((... عالیشان، رفیع مکان، عزتو مناعت بنیان، سنی القدر والمکان، اخلاصو ارادت نشان، عمده الاعیان، وزبده العشایر والارکان، قاسم ئاقا سرخیل تایفه حیدرانلو...))[53]

کەچی عەباس میرزا لەمحرمی ۱۲۳۸دا لەنامەیەکدا کەبۆ لۆرد ستراتفور کانینگ، سەفیری بەریتانی لای بابی عالی(۱۸۲۵-۱۸۳۰)نوسیوە، ئەڵێ:

((...هەندێ مەسەلەمان بەپایە بەرز جۆرج ویلوك(نوێنەری بەریتانیا لای دەرباری قاجار) .فەرموبو تا بەو پایە بەرزە..(مەبەستی کانینگە).. رابگەیەنێ، بۆ ئەوەی ئاگاداربێ لەو روداوانەی لەماوەی ئەم دو ساڵەدا لەنێوان ئەم دو دەوڵەتەدا قەوماونو، فیتنەو نیفاقیان لێ پەیدا بووە.

((بۆ ئەوەی ئەو پایە بەرزە ئاگادار بێ" هەمو ئەو جەنگو دەعواو ئاشوبو غەوغایەی لەنێوان ئەم دو مەملەکەتەدا روی داوە، یا هەرچەند ویستو ئارەزوی ئەم دەوڵەتە نەمرە کەئێستە دیسانەوە خەریکی سازینو وازهێنانن لەشەڕ هاتبێتە سەر صولح، رەفتارو کرداری لەکوردانی بەد نیهادو دانیشتوانی ئەولای سنورەوە، بۆ گەرم کردنی هەنگامەی فەساد، روی داوە..))[54].

رون تر لەوە، ئەبو قاسم قائیمقامی دوەم، وەزیری عەباس میرزا لەسەفەری ۱۲۳۸دا بۆ جۆرج ویلوکی نوسیوە، ئەڵێ:

((ئەی پایە بەرز، دۆستی میهرەبانی عەزیزی، ئەرجومەندی کامگار!

نامەیەکی کەبەبیرەوەری دۆستدار نوسی بوتان، سەرنج درا. لەبابەت چەسپاندنی پێکهاتنی هەردو دەوڵەتی بەرزی ئێرانیو عوسمانییەوە، کەئەبێ بەسەفیری گەورەی دەوڵەتی بەهەیبەی ئینگلیز بگوترێ، داواتان کردبو، ئەو مەرجو بەڵێنانەی کەدەوڵەتی دائم ئەلقەراری ئێران گەرەکێتی لەم پێکهاتنەدا بێ، بەدرێژیو رونی بۆ ئەو دۆستە خۆشەویستە دیار بکرێ، بۆ ئەوەی سەفیری باسکراو لەنیازو مەبەستەکانی ئەولیای دەوڵەتی قاهیرەی ئێران ئاگادار بێو، لەرِوی ئاگاداریو زانینەوە خەریکی ئەنجامدانی کارەکە بێ.

دۆستدار ناوەرِۆکی نامەی ئەو دۆستە خۆشەویستەی بەعەرزی خاکی پێی رۆشنی نوابی ناوازە وەلیعەهد گەیاند، ئەوانیش فەرمویان کە: ئەو شەرتو عەهدە گشتییانەی ئێمە هەمانە بریتین لەوەی، هەرچی بۆتە هۆی تێکدانی

بەینی دو دەوڵەتو دو مەملەکەت، ئینشائەڵڵا تەعالی رابگیرێ. بۆ ئەوەی مەسەلەی دۆستیو ئاشتی بەفەزلی خوا بگەڕێتەوە دۆخی جارانیو، لەسەرەتای دەس پێکردنی رێککەوتنەوە هەردولا سەفیری دەسەڵاتداری خۆیان دیاری بکەن بۆ ئەوەی شەرتو عەهدی جوزئی لەناو هەردو سنوری دراوسێدا، بەئیزنو دەسەڵاتی تەواو لەلایەن هەردوو دەوڵەتەوە ئەنجام بدەن.

((لەبەر ئەوەی شەرتو عەهدی گشتی ئێمە رفعو دفعی ئەو شتانەیە کەلەسەرەتاوە بونەتە هۆی تێکدانی بەینی هەردو دەوڵەت، بۆیە پێویستە ئەم شتانە بەدرێژی لەو دۆستە بگەیەنین"

یەکەم، شتێ کەبو بەباعیسی روودانی فتنەو فساد لەبەینی هەردو مەملەکەتدا ئەوەبو کە، جەماعەتی ئەکراد لەهەردو دیوی سنورەوە کەوتنە نانەوەی ئاژاوە، پاشایانی سنورەکانیش داڵدەیان دانو شوێنو جێیان دانی، هەمو رۆژی عەزێتو ئازار لەدەغەڵیو رێگری بەرعایای مەمالیکی مەحروسەی ئێران ئەگەیشت. لەلایەن سەرعەسکەرەکانەوە رفعی ئەم فیتنەو ئاشوبە نەئەکرا، تا لەئەنجامدا بەناچاری کار گەیشتە شەڕو پێکادان، ئێستاش کەبناغەی ئاشتی دائەنرێ. ئەبێ ئەو ئێلاتو کوردانەی کە لەرۆژانی شەڕدا، یان لەپێش ئەوەدا، لەمەمالیکی مەحروسەی ئێرانەوە رۆیشتون بۆ ولایاتی عوسمانی، هەمویان بگێڕنەوە، لێرە بەدواوەش داڵدەیان نەدەنو رێیان پێ نەدەنو رایان نەگرن، بۆ ئەوەی بەیەکجاری ئاشوبو فساد لەنێوانی دو دەوڵەتی جاوید بنیادا رفع بکرێ.

دوەم، شتێ کەبو بەمایەی ناخۆشیی نێوان هەردو دەوڵەت، ئەو رەفتارەیە کە لەگەڵ حاجیو زائیرو بازرگانانی ئێرانی ئەکرێ...

سێیەم، هەندێ جار جەماعەتی عوسمانیو ئەکراد لەلای ئەرمینیاو بەغدادەوە تێ ئەپەڕنو، دەسدرێژی ئەکەن. لەپاش ئەوەی پێکهاتین، ئەبێ بەجارێ ئەوە رابوەستێو وازی لێ بهێنن..))[٥٥].

قائمقام لەنامەیەکی تریدا بۆ سەر عەسکەری ئەرزڕوم، نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی بۆ گفتوگۆی بەستنی پەیمانی ئەرزڕوم، ناوی کورد بە((فتنەجویان ئەکرادو سایر اهل فساد))ئەبا.[٥٦]

## ٤/٣محەمەد خان امیر نظام

### نمونە١٣:

### هاوکاری عەجەمو رۆم: میری رەواندز(١٢٤٥)

سەرەتای دامەزرانی میرایەتی سۆران رون نیە، لەبەرئەوەی کەوتۆتە شوێنێکی شاخاوی سەختی دابڕاوەوە، دەورێکی زۆریشی لەروداوەکانی ناوچەکەدا نەبوە.

سوڵتان سلیمانی قانونی لەکاتی گرتنی بەغدادو ڕێکخستنەوەی کاروباری ناوچە تازە گیراوەکاندا، عزالدین شێری میری سۆرانی کوشت(٩٤١). کاروباری ئەمارەتی سۆرانی خستە سەر سنجاقی هەولێرو سپاردی بە حسێن بەگی داسنی. کەئەمیرێکی یەزیدی بو. سەیفەدین یەکێ لەمیرەکانی سۆران، هۆزەکانی ناوچەکەی لەخۆی کۆکردەوە. سەرەتا قەڵای هەولێری لەداسنییەکان گرتو دوایی‌تر دەستی بەسەر هەمو مەڵبەندەکەدا گرتەوە. حسێن بەگ چەندی هەوڵیدا چاری میر سەیفەدینی پێ نەکرا. لەسەر ئەوە بانگ کرایە ئەستەمولّو، لەوێ کوشتیان میر سەیفەدین بەسەربەخۆیی مەڵبەندی سۆرانی بەڕێوە ئەبرد. چەند جارێ لەشکری عوسمانی چونە سەری، ئەوانیش نەیان توانی لەناوی ببەن. بەڵام خۆی بۆ دەربڕینی دڵسۆزی‌و بەهیوای پێ سپاردنەوەی خاکی باووباپیرانی بەخۆی، پەنای بۆ دەرگای سوڵتان سلێمان برد. ئەویش بەئاوات نەگەیشتو لەوێ کوژرایەوە. سوڵتان، لەسەر تکای حاکمی ئامێدی، میرایەتی سۆرانی بەقولی بەگ، یەکێ لەمەزنەکانی هەمان بنەماڵە سپارد. ئەوسا بارەگای ئەمارەت لەهەریر بو.[٥٧]

سنوری دەسەڵاتی میرایەتی سۆران لەنێوان هەردو زێی پچوك‌و گەورەدا بو. هاوسنور بو لەگەڵ ئەمارەتی بابان لەلایەك‌و لەگەڵ ئەمارەتی بادینان لەلایەکی ترەوە. قەڵەمڕەوەکەی بەپێی بەهێزیی‌و لاوازیی ئەمیرانی سۆران فراوان یا تەسك ئەبووەوە. سەختی‌و دابڕانی بارەگای ئەمارەت تاڕادەیەك لە کار تێکردنی رواداوەکانی ناوچەکە پاراستویەتی‌و، میرەکانی ئەوێش بەزۆری بەوەندەی لەژێر دەستیاندا بوە داکەوتون.

هەلومەرجی سۆران چەندین دە ساڵ بەو جۆرە رابورد تا ساڵی ١٢١٨ کەئۆغز بەگ مرد. ئوغز بەگ ٦ کوڕی لەپاش* بەجێ مابو. لەژیانی خۆیدا ناوچەکەی بەسەردا دابەش کرد بون. مستەفا بەگ کوڕی گەورەی بو، بەسەر رەواندزو ئاکۆیان‌و باڵەکاندا رائەگەیشت. ئەو لەجێگەی باوکی بەمەزنی سۆران. براکانی‌و خزمەکانی تری ململانێیان لەگەڵ ئەکردو گوێیان نەئەدایە خواستو فەرمانەکانی. دژی ئەم ئەجوڵانەوە. لەگەڵ مەزنەکانی بابان‌و بادینان پیلانیان لێ ئەگێڕا. مستەفا بەگ لەتاو دوژمنایەتی براکانی گەیشتە تینی هەراسان بو، وازی لەدەسەڵاتدارێتی هێنا(١٢٢٩). محەمەد بەگی کوڕە گەورەی لەجێگەی خۆی داناو، خۆی چوە گوندی ئاکۆیان بەگۆشەگیری دانیشت تا مرد(١٢٣٨). محەمەد بەگ(١١٩٨-١٢٥٣)لەلای یەکێ لەمەلا هەرە زاناکانی ئەو دەمی کورد، مەلا

ئەحمەدی ئادەم، خوێند بوی. ماوەیەك سەرپەرشتی دۆڵی هەروتییانی کردبو. لەنزیکەوە چاوی لەململانێو ناکۆکی ناجوامێرانەی مامو خزمەکانی بو.

هاتنی محەمەد بەگ هاوزەمان بو لەگەڵ چەند روداوێکی گرنگدا لەناوچەکەدا:

١-هاتنی هەیئەتی جەنگیی فەرەنسی بەسەرۆکایەتی جەنەرال گاردان بۆ ئێرانو، رێکخستنەوەی هێزە چەکدارەکانی ئێران لەسەر شێوەی نوێو، دامەزراندنی کارگەی دروستکردنی چەكو تفاقی جەنگی.

٢-شۆڕشی محەمەد عەلی پاشا لەمیسرو، لەشکرکێشی ئیبراهیم پاشای کوڕی بۆ سەر سوریاو ئەنەدۆڵ.

٣-بەستنی پەیمانی یەکەمی ئەرزڕوم لەنێوان رۆمو عەجەمدا.

٤-هەوڵدانی بابیعالی بۆ چاکردنی هەلومەرجی ناوخۆی ئیمپراتۆری عوسمانی((تەنزیمات))و، دامەزراندنی دەسەڵاتی ناوەندی.

محەمەد بەگ لەسەرەتاوە بایەخێکی تایبەتیدا بەئاواکردنەوەو قایم کردنی رەواندز، کەبارەگای ئەمارەت بو. چەند قەڵاو بورجی لەناو شارو دەوروبەریدا دامەزراندو، شورایەکی پتەوی بۆ پاراستنی لەدەوری دروست کرد. گرنگییەکی زۆریدا بەپێکهێنانی تۆڕێکی فراوانی کۆکردنەوەی ئاگاداریو دەنگوباس. رێزی زۆری لەمەلاو خوێندەوار ئەنا. موچەی بۆ ئەبڕینەوەو مزگەوتو مەدرەسەی بۆ ئەکردنەوە.

محەمەد بەگ چەند کارێکی گرنگی بۆ گەشەپێدانی ئەمارەتی سۆران کرد:

١-ریزەکانی ناوخۆی یەك خست. هەمو ئەوانەی سەرپێچییان ئەکرد یا کوشتنی یا بەزۆر سەری پێ دانەواندن. لەپێشەوە مامو خزمە سەرەڕۆکانی خۆی سەرکوت کرد. دوبەرەکیو ناکۆکیو ململانێی لەناو مەزنەکانی قەڵەمڕەوەکەی خۆیدا نەهێشت.

٢-کاروباری ئابوری رێکخستنەوە، باجو زەوییانەی دیاری کرد. ئاسایشی تەواوی کارو بازرگانیو کاروانی لەسەرانسەری ناوچەکەدا چەسپاند. بەرپرسی بۆ کاروباری دارایی لەهەمو ناوچەکاندا دانا. چەند خەزێنەداری دانا بۆ رێکخستنی خەرجی داوودەزگای بەڕێوەبەرایەتیو لەشکر.

٣-سوپایەکی گەورەی سوارەو پیادەی لەهۆزەکانی سۆران سازدا. بەشێوەیەکی نوێ رێکی خستو پلەوپایەی تێدا دیاری کرد، چەکداری کردو سەرومڕ خەریکی زیادکردنی ژمارەیو باش کردنی چەکەکانی بو.

٤-کارگەی دروست کردنی چەك‌و تفاقی جەنگی دامەزراند. جگە لەدروست کردنی خەنجەر، دەمانچە، تفەنگ، باروت، لەساڵی ١٢٣٣ بەدواوە کەوتە دارشتنی لولە تۆپ. چەند سەد لولەی جۆراوجۆری دارشت.

٥-بایەخی زۆری بەئاوەدانیدا. دەیان پردی لەسەر روبارەکانی مەڵبەندی سۆران دروست کرد. دەیان مزگەوتی لەگوندەکان‌و، دەیان قەڵاو بنکەی جەنگی لەشوێنە ستراتیجییەکانی ژێر دەسەڵاتی‌دا دامەزراند.

محەمەد بەگ باوەڕێکی قوڵی بەدینی ئیسلام هەبو. رێزی بێ ئەندازەی لەمەلاکان ئەگرت. لەسەر داوای مەلا یەحیا مزوری چوە سەر یەزدییەکان‌و قەتلوعامی لێ کردن, شەریعەت بنچینەی بەڕێوەبردنی کاروبارو بەلاداخستنی ناکۆکییەکانی ناو خەڵکی بو. بەرامبەر نەیارو میملەکانی دڵڕەق‌و بێ بەزەیی بو. لەرەفتاری‌دا لەگەڵ دانیشتوان‌و ژێردەستەکانی دادپەروەر بو.

محەمەد بەگ دوای خۆقایم کردن‌و خۆ بەهێزکردن، لە١٢٣٤دا، کەوتە سەر بیری سەربەخۆیی‌و تەقەلای فراوانخوازی. تا ئەو سەردەمە قەڵەمڕەوی میرەکانی سۆران لەسنورێکی شاخاوی تەسك‌دا قەتیس بو. بەڵام محەمەد بەگ بەهەر چوار لای ئەمارەتەکەی‌دا کەوتە پەلهاوێشتن. تەقەلاکانی محەمەد بەگ، بێگومان، لەژێر کارتێکردنی روداوەکانی سەردەمی خۆی‌دا بون.

لەڕوی جەنگییەوە، کەوتە لەشکرکێشی بۆ فراوان کردنی سنوری حکومەتەکەی بێ ئەوەی گوێ بداتە دەسەڵاتی عوسمانی یا هی ئێرانی. هەندێ لەناوچەکانی ئەمارەتی بابان‌و بادینان‌و، هەندێ شوێنی‌ی لەولایەتەکانی موسڵ، بەغداد، دیاربەکر، وان، حەلەبی لەقەڵەمڕەوی عوسمانی‌و، هەندێ لەناوچە کوردنشینەکانی ولایەتەکانی ئازەربایجان‌و ئەردەلانی لەقەڵەمڕەوی قاجاردا گرت.

لەڕوی سیاسییەوە، بەتەواوی سەربەخۆ بو، گوێی نەئەدایە کاربەدەستانی عوسمانی‌و ئێرانی. بەڵکو لەکاتێکا محەمەد عەلی پاشا کەوتە هەڵگەڕانەوە لەسوڵتانی عوسمانی‌و، ئیبراهیم پاشای کوڕی لەشکرکێشی بۆ سەرشام‌و ئەنەدۆڵ دەس پێ کرد، محەمەد بەگ کەئیتر ناوی لەخۆی نابو((ئەمیری مەنسور))و، لەناو خەڵکدا بەمیر محەمەد ناوی دەرکرد بو، پێوەندی لەگەڵ محەمەد عەلی پاشاو ئیبراهیمی کوڕی‌دا دامەزراند. کەوتە ئاڵوگۆڕی نامە بۆ دانانی رێوشوێنی هاوکاری سوپایی‌و سیاسی[٥٨].

جولانی سوپایی‌و سیاسی میر محەمەدو، پێشکەوتنی خێرای، ترسی لەلای کاربەدەستانی بابی عالی‌و دەرباری قاجار دروست کرد. هەردو دەوڵەت ئەم بزوتنەوەیەیان بەگەفێکی راستەقینە دائەنا بۆ سەر خۆیان. لەراستی‌دا میرایەتی

سۆران لەسایەی ئەو ڕێبازە سیاسیو جەنگییەوە، کەمیر محەمەد، بۆی دیاری کردبو ئەی توانی ببێتە ناوکی پێکهاتنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەکوردستاندا. دەوڵەتانی عوسمانیو ئێرانی بخاتە مەترسی دابەش بونەوە.

کاربەدەستانی عەجەم بۆ چارەکردنی ئەم هەڕەشەیە بەخۆ کەوتن. هەم خۆیان نامەیان راستەوخۆ بۆ کاربەدەستانی عوسمانی نوسی، بۆ ئەوەی کاری هاوبەش بکەن بۆ لەناوبردنی میر محەمەدو جوڵانەوەکەی، هەم هانی کاربەدەستانی ئینگلیزیاندا، داوا لەبابی عالی بکا هەرچی زوتر ئەم مەترسییە دامرکێنێتەوە، بۆ کاری هاوبەشی رۆمو عەجەم دژی میر محەمەد، لەلایەن دەرباری قاجارەوە محەمەد خانی امیر نظامو لەلایەن بابی عالییەوە سەرداری ئەکرەم رەشید محەمەد پاشا تەرخان کران.

میرزا محەمەد خانی امیر نظام (؟-١٢٥٧)یەکێ لەپیاوە ناسراوە دەسەلاتدارەکانی دەرباری قاجار بو، عەلی خانی باوکیشی، لەچاخی فەتحعلی شادا، یەکی لەپیاوە ناسراوەکانی دەربار بو. وەختێ کەگریبایدوف. سەفیری روسی لەتاران، کوژرا(١٢٤٤)، عەباس میرزا لەبەر لێهاتویی محەمەد خانی بەپێشکاری خەسرەو میرزای کوڕی، بۆ عوزرخواهی ناردە پەتروس بورگ. لەوێ دیدەنی ئیمپراتۆری روسی. نیکۆلای یەکەمی کرد. لەو ئەرکەدا کەپێی سپێردرا بو بە سەرکەوتویی گەڕایەوە. لەپاش کوژرانی میرزا قاسم قائمقام(١٢٥١)زۆر کەس وایان چاوەڕێ ئەکرد صەدارەت، واتە سەر وەزیریی ئێران بەمحەمەد خان بسپێردرێ. بەڵام شا بەپێشکاری قهرمان میرزا بۆ ئازەربایجانی نارد.[٥٩]

رەشید محەمەد پاشا لەساڵانی ١٢٤٤تا ١٢٤٨ صەدری اعظم، واتە سەرەك وەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی بو. لە١٢٤٩دا کرایە والی سیواسو، لەهەمان کاتدا ولایەتی دیاربەکریش خرایە ژێردەسەلاتی ئەوەوە بۆ ئەوەی هێزو دەسەلاتی تەواوی لەژێر دەسدا بێ بۆ لابەلاکردنی کێشەی شۆڕشی میر محەمەد، چونکە بوبو بەیەکێ لەگەورەترین پەژارەکانی دەوڵەتی عوسمانی[٦٠]

محەمەد خانی زەنگەنە، امیر نظامی ئێرانی، لەنامەیەك دا بۆ محەمەد رەشید پاشا، سەر وەزیرانی پێشوی عوسمانی، نوسیوێتی:

((...لەپاش دەربڕینی مەراسیمی ئیشتیاق، لەسەر بەرگی یەکێتیو تەبایی ئەنوسی کە، بحمدالله والمنه، پێوەندی دۆستایەتیو یەکگرتن لەنێوان دو دەوڵەتی بناغە پتەودا تەواوە، رێوشوێنی یەکڕیی و ئاشتی لەهەمو بارێکەوە دانراوە. سوپاسی ئەم نیعمەتە گەورەیەو بەهرەی زۆری کاربەدەستانی هەردو دەوڵەتو پیاوەکانی هەردوکیان پێویستە.

بەپێی ئەو یەکێتییەی لەنێوان هەردو حەزرەت دایەو، بەپێی ئەو میهرو خۆشەویستییەی لەبەینایە، دۆستدار بەپێویستی ئەزانێ ئەو جەنابە کە بەحوکمی دەوڵەتی بهیەی عوسمانی رێکخستنەوەی کاروباری ولایەتەکانی کوردستانی پێ سپێردراوە، لەمەئمورییەتی خۆی ئاگادارو لەروداوەکان شارەزا بکا.

ئەو جەنابە خۆیان ئەزانن" محەمەد بەگ لەتابیعانی پاشایانی بابان کابرایەکی کوێخا رەوشت بو، هیچ جۆرە ئیسمو رەسمێکی نەبو. بەهۆی ئەو دوژمنایەتییەی لەناو پاشایاندا بو، خەریکی یەکتری بون، ئەو هەلی بۆ هەڵکەوتو پڕکێشی کرد. کۆمەڵێکی لەخۆ خڕکردەوە. کۆیەو پردی سورو هەولێرو هەندێ شوێنی لەمەڵبەندەکانی حەریرو شارەزورو ژمارەیەکی زۆری لەئاواییەکانی لاجانی موکری گرت. کەسێ رێی پێ نەگرت. تا ناوبانگی پەیدا کردو ناوی دەرکرد. حیلەو تەزویری بەکارهێنا. چوە سەر ئامێدیو دەستی بەسەرا گرت.

دۆستدار ٣ ساڵ زیاتر بو لەئازەربایجان نەبو، بەحوکمی خاقانی بەهەشتی بۆ سەفەری عیراق(عیراقی عەجەم)چوبو. لەو کاتەدا ئەو هێزی ناردە سەر مەڵبەندی سابلاخی موکریو زەرەرێکی بێ ئەندازەی پێ گەیاند. ناوچەی سەردەشتی گرت. پاش هاتنەوە لەسەفەری عیاق، هێزێکی بۆ تەمێ کردنی دیاری کرد، تاقمەکەی ئەوی بەشەڕ لەو مەڵبەندە دەرپەڕاندو چونە ناو شوێنە داگیرکراوەکانی ئەوەوە. قەڵای بەناوبانگی دەربەندو چەند قەڵایەکی تریان کاولو وێران کرد. بڕیار وابو بەیەکجاری کارەکەی یەکالا بکرێتەوە. سەرماوسۆڵەی هەواو هەندێ شتیتر. کە لەو ساڵەدا رویاندا بون بەکۆسپی تەواوکردنی. بەحوکمو ئیشارەتی دۆستدار، قشونی راسپێردراو گەڕانەوە.

دۆستدار، لەکاتێکدا ساڵی رابوردوش ماوەیەك هاوئاوزەنکی شاهنشاهی جەم جا بو، گیانمان بەفیدای بێ، لەعیراق ئەو ٧-٨ هەزار قشونی ناردە سەر مەرگەوەڕ، نزیکەی ٤٠ هەزار تومان ماڵی تالان کردوەو ٤٠٠ کەسی لەژنو پیاوی بەڕێزی موسڵمان کوشتوە. چەند کەسێکی ئایرملو، کە لەئاوارەکانی ئیرەوانن و لەمەرگەوەڕ نیشتەجێن، بۆ رەواندز بردوە. لەوێ گیراونو لەئازاردان. عەیالو ژنی ژمارەیەکی زۆری، لەوانەی ئێستە هاوئاوزەنگی پیرۆزن، کوشتوە. کەئەم هەواڵە بەشاهنشاهی ئیسلام پەنا گەیشت، زۆر دڵگیر بونو پەشێوان، ئاگری قەهرو غەزەب لەکوانوی ویژدانی پیرۆزی دا کلپەی سەند" تەمێ کردنو، چاری کردەوەکانیو، سەندنی تۆڵەی خوێنی موسڵمانان بەدۆستدار سپێردرا.

پاش هاتن بۆ ئازەربایجان، ئەنجام دانی خێرای ئەم کارە بەهۆی هەندێ خزمەتی ترەوە نەکرا، ئێستا کە ئەوانە بەلادا خران، کات بەدەستەوەیە، دەرفەتی چون بۆ هەرجێیەكو کردنی هەرکارێك هەیە. ئامادەیی و سازدانی ئەوەش بەهۆی مشوررو ئاوڕدانەوەی خاوەن شکۆی سێبەری خواوە، اید الله شوکتە، کراوە.

دۆستدار، بۆ ڕێکخستنەوەی کاروبارەکان ئەچێ بۆ ناوچەکانی سەرسنوری ئازەربایجان، ئەو ئەرکەی پێم سپێردراوە، ئینشائەللا بەویستو خواستی جەنابی باری عز اسمە، بریتییە لەتێکدانی بناغەی شەرارەتو فەسادی ئەوو چاری کردەوەکانی.

دفعو لەڕیشە دەرهێنانی خائینی دینو دەوڵەت، لەسەر نۆکەرانی هەردو حەزرەت واجیبە،

ئەو جەنابە کەلەولاوە ئەم فەرمانەی پێ سپێردراوە، تەشریفیان هێناوە، دۆستداریش لەم لایەوە هەنگاو بنێ، تا بەهاوکاری یەکتری بەجارێ مادەی فەسادی ئەو قلعو قمع بکرێ. لێرە بەدواوە ئیتر ناوی ئەو کابرایە لەم دو دەوڵەتە نەبرێ، رعایاو برایانی هەردو مەملەکەت لەزەرەرو زیانی ئاسودەو دڵنیا بن.

هەرکاتێ ئەو جەنابە ناردنی هێزی لەم لایەوە بەقازانجی دەوڵەتی بهیە نەزانیو، خۆی بە تەنیا کەوتە لەناوبردنی بەحوکمی یەکێتی هەردو دەوڵەت پێویستە لەچەند رویەکەوە دڵنیایی بە دۆستدار بدەن:

یەکەم، لەفەوتاندنو لەڕیشە دەرهێنانی تەواوی ئەو"

دوەم، لەئاسایشی ئەو سنورانە کەلێرە بەدواوە شتی وەها رونەداتو دەسدرێژی نەکرێتە سەر رەعییەتەکانی دەوڵەتی بەرز"

سێیەم: لەگەیشتنی ٤٠ هەزار تومانو((دیە))ی خوێنی موسڵمانان"

چوارەم، لەئازادی گیراوەکان کەئێستە لەرەواندزن"

پێنجەم: بڕینی دەستی داگیرکردنی ئەو لەئاواییەکانی لاجانی موکریو هیتر.

بەلگەی مۆرکراو ورێکوپێکی دەوڵەتیمان بدەنێ. کەهەر پێنج مەسەلەی باسکراویان تێ دابێ، بۆ ئەوەی لای هەردو دەوڵەتی بەرز بەلگەی دۆستدارێ، نەبێتە جێگەی باسو رەخنە...))[٦١]

هەندێ سەرچاوە پێیان وایە، نوسینی ئەم نامەیە لە١٢٤٥دا بوە، بەلام بەگوێرەی رەوتی روداوەکان ئەبێ چەند ساڵێك دوایی تر نوسرا بێ. هەرچۆنێ بێ لەم نامەیەو نامەکانی تری پێوەندییان بەم کێشەیەوە هەیە، چەند راستیەك هەڵ ئەهێنجێنرێ:

١-پەیمانی یەکەمی ئەرزڕوم(١٢٣٨) کەبناغەی کاری هاوبەشی حکومەتەکانی رۆم و عەجەمی دانا بو، لەسیاسەتی کوردیی ئەم دو دەوڵەتەدا، کەهەریەکەیان بەشێکی کوردستانیان لەژێر دەستا بو، بەکردەوە رەنگی ئەدایەوە بەتایبەتی لەزەمانێکا کەئیتر((هەستی نەتەوەیی))کورد خەریکی گەشەکردن بوو بۆ((هۆشی نەتەوەیی))و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ لەسەر بنچینەی نەتەوە.

٢-ئەو مەترسییەی دروست بونی ناوەندێکی بەهێزی سەربەخۆ، لەو شوێنەدا کەچەند قەرن بو((ناوچەی لەمپەر))ی نێوان دو دەوڵەتە زلەکەی ناوچەکە بو، ئەی توانی بۆ سەر هەریەکێ لەم دو دەوڵەتە بجولقێنێ.

٣-ئەو مەترسییەی دروست بونی دەوڵەتێکی تازە، لەسەر حسابی جیاکردنەوەی هەندێ لەئەرزی عوسمانیو هەندێ لەئەرزی ئێرانی، ئەی توانی بۆ سەر بەرژەوەندی دەوڵەتانی ئەوروپی، بەتایبەتی بەریتانیا، بجولقێنێ.

٤-پشت گوێ خستنی هەمو جۆرە((رەوایی))یەکی بزوتنەوەو راپەڕینو شۆڕشەکانی کوردو، شاردنەوەی هەمو لایەنێکی سیاسی، ئابوری، کۆمەلایەتی... هتد روناکو پرشنگداری.

کامبل، سەفیری ئینگلیزی لای دەرباری قاجار، لەنامەیەکدا لەرەبیعی دوەمی ١٢٤٨دا کەبۆ امیر نظامي نوسیوە ئەڵێ:

((... لەم ماوەیەدا ئەمیر فەرەیدون میرزا بەنیازی تەمێ کردنی میری رەواندوز بەرەو مەراغەو سولدوز جولاوە. سەبارەت بەیەکێتی هەردو دەوڵەتی بەرز، بەرژەوەندی دڵسۆزی لەوەدایە، هەرکاتێ ئەمیری باسکراو لەگەڵ خودی ئەو جەنابە بەنیازی تەمێ کردنی میری ناوبراو بزوتن، دوای ئەوەی کەتەنبیەو تەئدیبی ئەو کراو، ئەوو سوپاکەی لەخاکی ئازەربایجانو ئەو شوێنانە دەرکردو راونا، ئیتر سوپای نەسرەت لەئەرزی دەوڵەتی بهیەی ئێران زیاتر تێ نەپەڕیو، تەجاوز بە جایز دانەنێ. چونکە دڵسۆز بۆ سەفیری دەوڵەتی خۆی لەئەستەموڵ نوسیوە، کەدرێژایی ئەم جولانەوە چەوتەی میر عەرزی سوڵتان بکا، بۆ ئەوەی فەرمانی رێگرتن لەجولانەوەی چەوتی میر دەربکا. هەرکاتێ مەسەلەکان بەگوێی شەریفی سوڵتان گەیشتو دوای ئەوە رێیان لێ نەگرتو تەمێیان نەفەرمو، ئەوسا بیانوی قسەو گلەییو گازندە لەم دەوڵەتە نامێنێ. ئەگەر میری بەرز تەشریفیان بردوە، پاش خوێندنەوەی نوسراوەکە بەلێدوانێکی خۆتانەوە، بۆ ئەوی بنێرن...))[٦٢]

امیر نظام لەوەلامی کامبلدا نوسیوێتی:

...))

((لەبابەت کاروباری ڕەواندزەوە بەو جۆرەی نوسی بوتانو، دەرتان خستبو کە قشون(مەبەستی هێزی ئێرانە)نەچێتە ناو خاکی ڕەواندزەوە، نەوەکو ببێتە هۆی باس کردنی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی .

ڕاستییەکەی محەمەد، بەگی ڕەواندز بەجۆرێکە کەچەند ساڵە ناوبراو لەدەوڵەتی عوسمانی ڕوی وەرگێڕاوە. لەسەردەمی وەزارەتی داود پاشا لەدار السلامی بەغداد، بەزۆر و بەپێچەوانەی ڕای ئەوەوە، پردی سور، کەمەڵبەندێکی گەورەیە، لەگەڵ چەند شوێنی سلێمانی گرتوە. هەمیشە دژی بوە. تا ئەوە بو کەوەزارەتی بەغداد بەعەلی ڕەزا پاشا سپێردرا. لەو کاتەدا پشێوییەك ڕویدا، ئەویش کۆمەڵەکەی خۆی نارد هەولێریشی گرت، هەروەها زۆری شوێنەکانی ئامێدیو ئەو ناوچانەی زەوت کردوە، بەو پەڕی خلافی قاعدەوە لەگەڵ جەنابی ناوبراو ڕەفتاری کردوەو، بێ حورمەتی بەرامبەر دەوڵەتەکەی خۆی نواندوە. لەم ڕۆژانەیشدا وای زانیوە مەڵبەندی ئازەربایجان لەقشونی جەراری نظام و تۆپخانە چۆڵە، کۆمەڵێکی ٣ هەزار کەسی ناردۆتە سەردەشت، موسا خانی حاکمی ئەوێ لەبەر بێ هێزی نەی توانیوە بەرهەڵستی بکا، قەڵاکەی ئەوێی گرتوە. هەر کەئەم هەواڵە گەیشت نواب ئەمیزادەی مەزن ٢ فەوجی ئەفشارو تاقمێکی موکری، کە٣ هەزار کەس ئەبون، بۆ تەمێ کردنیان نارد.

هەروەکو پێشتر بۆ خزمەت جەنابی اصف الدولەی نوسی بو. پاش گەیشتنی قشونی سەرکەوتوو تۆپخانەی پیرۆز بەوێ، لەپێشەوە هەڵیان کوتایە سەر هۆزە کوردەکانی بلباسو پیران، کە لەهۆزە گەورەکانی ئەوبون، تالانیان کردن. دوای ئەوە چونە سەر قەڵای سەردەشت، ١٠ ڕۆژ قەڵایان گەمارۆداو تۆپ بارانیان کرد. شەوی ١١هەم هێرشیان بۆ کردو داگیریان کرد. هەندێ لەوانەی ڕەواندز کوژرانو، هەندێکیان گیرانو، هەندێکیان هەڵاتن. دوای ئەوەش پایە بەرزی نزیکی حەزرەتی باڵا، محەمەد خانی سەرتیپ بەو کۆمەڵەو سەربازانی خوئیو دو دەستە لەفەوجی بەهادورانو سەربازانی قەراداغیو سوارەی کوردو هی تر بە٨ عەرادە تۆپو خومپارەوە نێردرایە سەر ڕەواندز. لەولاشەوە وەزیری بەغدادیش سێ چوار عەرادە تۆپو ٢ هەزار کەس لەزابتەو هی تری بەسەرکردایەتی سلێمان پاشا ناردۆتە سەری، بۆ ئەوەی ناوبراو تەمێ بکەن.

ئەگەر نواب ئەمیزادەی مەزن نەیان زانی بایە، کەئەو(میر محەمەد)نەیارو یاخییە لەدەوڵەتی عوسمانی، قشونیان مەئموری ناوخاکی ڕۆم نەئەفەرمو، بەڵام ئەم کابرا نادروستە لەهەردو دەوڵەت هەڵگەڕاوەتەوە.

ئەوەش کەئێوە بۆ سەفیری خۆتان لەئەستەموڵ نوسیوە کەقسە لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بکەن، کارێکی زۆر باشتان کردوە. بەڵام ئەگەر لەم ماوەیەدا کارگوزارانی حەزرەتی وەلی نیعمەتمان کردەوەکانی ئەویان پشت گوێ بخستایە، سۆزی کەئەو لەولاوە بی پەرژایە پڕکێشییەکی تری ئەکرد. هەوا ئەبو بەزستان، خۆ ئامادەکردنێکی ترو زیادتری بۆ لەناوبردنی گەرەك بو. بۆیە لەم روەوە باشتر وابو لەم کاتەدا چاری کرا...))[٦٣]

عەباس میرزا لەکاتێکا چوبو بۆ خۆراسان بۆ سەرکوتی هەڵگەڕانەوەی نارازییانی ئەوێ، لەوەڵامی نامەیەکی امیر نظامي دا، لەمانگی شەوالی ١٢٤٨دا، دەربارەی میر محەمەد، نوسیوێتی:

((... نوسراوەکانی محەمەد صالح بەگی چاپار هێنابونی گەیشتن. لەهەواڵەکانی کوردستانت ئاگادار بوین. باسی تەگبیری ئەو پایە بەرزەو، زەبری شمشێری سەرتیپ بۆ هەمو دنیا ئاشکراو جێگەی ئینکاری نیە، بەڵام برینی دەست بەڵکو ملی میر وەختی ئەبێ، کەئینشائەڵلا تەعالی، کۆیە بەدەس بێت یارەواندز فەتح بکرێ...))[٦٤]

ئێرانیەکان ئەیان ویست لەو لەشکرکێشیەدا کەبابیعالی بەدەستیەوە بو بۆ سەر میری سۆران بەشداربن، کاربەدەستانی تورك نەیان ئەویست لەشکری ئێران بێتە ناو خاکی عوسمانیەوە. ئەیان ویست خۆیان بەتەنیا کارەکە ئەنجام بدەن. ئەمەش جۆرێ لەساردی لەناوا دروست ئەکردن. دیپلۆماتەکانی ئینگلیز لەتاران و ئەستەموڵ هەوڵیان ئەدا ناکۆکی باری سەرنجی هەردولایان کەم بکەنەوە. وەزیری موختاری ئینگلیز لەنامەیەکدا بۆ میرزا مەسعود خانی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێرانی نوسیوە ئەڵێ:

((مەعلومی ئەم جەنابەیە" کاربەدەستانی دەوڵەتی بەرزی ئینگلیز زۆر بەپەرۆشەوەن ئەو کاروبارانەی پێوەندییان بەسنورەکانی ئێران و رۆمەوە هەبێ بەیەکگرتویی و خۆشی چارەبکرێن و، هەر وەختێ بۆ تەمێ کردنی مفسدە یا رێگری لەشکرکێشی پێویست بێ، کاربەدەستانی هەردو دەوڵەت لەو کارەدا پێکەوە رێ بکەون بۆ دفعی ئەو مفسدە. قیبلەی عالەم(مەبەستی شای ئێرانە) لەرِوی زانایی و ئاگاییەوە بەجۆرە فەرمانی بەامیر نظام و کاربەدەستانی دەوڵەتی قاهیرە داوە. جەنابی امیر نظامیش بەگوێرەی فەرمانی قیبلەی عالەم نوسراوی لەم بارەیەوە بۆ جەنابی رەشید پاشاو سەرعەسکەری ئەرزرِوم و پاشای بەغداد ناردوە، تاپێکەوە تیپە قاهیرەکانی دو دەوڵەت میری رەواندز، کەسەرکردەی

مفسدان و ڕێگرەکانەو مەملەکەتی دو پاشای عظیم القدری کاول و شێواندوە، بەتەوای قلع و قمع بکەن و لەسەر ئەرزی نەهێڵن.

بەپێی هەواڵێ کەجێگری باڵیۆزی دەوڵەتی بهیەی ئینگلیز لەئەرزڕوم ناردویەتی" جەنابی رەشید پاشا ئامێدی گرتوەو ئەو بەدبەختە بە٣٠٠ کەسەوە بەرەو ڕەواندز رای کردوە، بەم زوانە بەئاسانی لەناو ئەبرێ. پاش گەیشتنی ئەم هەواڵە دۆستدار بەپێویستی زانی پایەبەرز کاپیتان شیل ساحێب ڕەوانەی ئۆردوی رەشید پاشا بکا بۆ ٣ مەبەست:

یەکەم، پیرۆزبایی گرتنی ئامێدی لەرەشید پاشا بکا.

دوەم، ئاگاداری کاروباری ئەو لایە بێت،

سێیەم، لەبەرئەوەی پایەبەرزی ناوبراو لەگەڵ فەوجی ورمێ خەریکی دورخستنەوەی ئەو طاغیە بو، ئاگادارە لەو تالاَن و کوشتارەی لەمەملەکەتی قیبلەی عالەمدا کردبوی، بۆ ئەوەی رەشید پاشا لەو شتانە ئاگادار بکا...))[٦٥]

سەرباری گوشاری سیاسی و جەنگیی عەجەم بۆ((بڕینی مل))ی میر محەمەد، بابیعالی کەوتە دانانی پیلانی لەناوبردنی. بابیعالی ئەو فەرمانەی بەڕەشید محەمەد پاشا سپارد بو. رەشید پاشا یەکێ لەپیاوە هەڵکەوتوەکانی دەوڵەتی عوسمانی بو. شارەزای کاروباری سیاسی، جەنگیی، بەڕێوەبەرایەتی بو. زیاتر لە٤ ساڵ صدری اعظمی هەمو ئیمپراتۆری عوسمانی بو. کرابوە والی سیواس. بۆ ئەوەی لەکارەکەیدا سەرکەوتو بێ، ولایەتی دیاربەکریش بەو سپێردرا. فەرمان درا بەوالی موسڵ، محەمەد پاشا ئاینجە بیرقدارو، وەزیری بەغداد عەلی ڕەزا پاشای لاز، بۆ ئەوەی هەمو هاوکارییەکی بکەن. رەشید پاشا هاوکات لەگەڵ سازدانی هێزێکی سوپای گەورە بۆ سەر میر محەمەد، کەوتە سازدانی سیاسی مەلاکانی کورد لەدژی.. میر محەمەد بەگیراوی ڕەوانەی ئەستەموڵ کرا(١٢٥٢)[٦٦]. لەوساوە بزر بوە، کەس هەواڵی ڕاستەقینەی ئاگادار نییە.

**٥/٣ فەرهاد میرزا معتمد الدولە**

**نمونە١٤:**

**خەلعەت" حەسەن سوڵتانی هەورامی(١٢٨٤)**

فەرهاد میرزا(١٢٣٣-١٣٠٥)کوڕی عەباس میرزا، یەکێ لەسیاسییە گەورەکانی سەردەمی خۆی و، یەکێ لەنوسەرە ڕۆشنبیرەکانی ئێران بوە. لە١٢٥٠ تا ١٢٥٢ حکومەتی لوڕستان و خوزستانی لەبەردەس دابو لە١٢٥٢تا ١٢٥٥ نائب السلطنە ی محەمەد شا لە١٢٥٧ حوکمڕانی فارس و، لە١٢٨٤تا ١٢٩١

حوكمڕانی كوردستان بو، له ١٢٩٠ دا كەناصرالدین شاه بۆ گەڕان چو بۆ ئەوروپا فەرهاد میرزا نائب السلطنه ی بو.
لەژیانی سیاسیدا بەلایەنگری سیاسەتی بەریتانی لەئێراندا ناسراوە. هەر لەسەر ئەوەش چەند جارێ توشی كێشەو تەنگ پێ هەڵچنین بو. بەناچاری خۆی ئەهاویشتە سەفارەتی بەریتانییەوە لەتاران ((بەست نشین)) ئەبو تالێی خۆش ئەبون.
لەژیانی ئەدەبیدا، شیعری زۆری داناوە، چەند كتێبی نوسیوە، لەوانە: نصاب، كنز الحساب، جام جم دەربارەی جوگرافیو مێژو، زنبیل لەسەر شێوەی كەشكۆڵی شێخی بهائی، فلك السعاده لەئەستێرەناسیدا، هدایت السبیل گێڕانەوەی بیرەوەرییەكانی خۆیەتی بۆ حەج.
له١٢٨٤دا كەدانرا بەحاكمی كوردستان ئیتر بە یەكجاری كۆتایی بەدەسەڵاتی بنەماڵەی ئەردەلان هێنا. بۆ چاوشكاندنی خەڵك كەوتە بەكارهێنانی توندوتیژیو زەبروزەنگ. لەگەڵ خۆی كۆمەڵێك فەرمانبەری شارەزای بۆ ڕێكخستنەوەی كاروباری ناوچەكانو، هێزی چەكدارو، باجو، بەڕێوەبەرایەتیكاروباری حكومەت بردبو، بۆ ئەوەی لەوێ جێگیریان بكات.
لەرۆژێكا كەبۆ گرتنەدەستی كاروباری حوكمڕانی كوردستان گەیشتە نزیك شاری سنه، لەلایەن پیاوە ناسراوەكانی ئەوێوە پێشوازی كرا، ئەویش وتارێكی بۆدان، لەوتارەكەیدا وتی: ((تا من لەم ولایەتەدا حاكم بم لەگەڵ هیچ یەكێ لەئێوە، بەهیچ بۆنەیەكو لەهیچ شوێنێكا درۆ ناكەم، ئێوەش ئەبێ هیچ كاتو لەهیچ كارێكا لەگەڵ من درۆ نەكەن، هەركاتێ درۆو فێڵ لەیەكێكتان دەربكەوێ، بێ چاوپۆشیو دواكەوتن سزای ئەدەم))[٦٧]
فخر الكتاب كوشتنی حەسەن سوڵتان بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:
((..پاش ٣ مانگ بۆ سەرلێدانی قەڵای شاه ئابادی مەریوان لەگەڵ ژمارەیەكی كەم لەشارەوە(مەبەستی سنەیە)بەڕێ كەوت. عەلی ئەكبەر خانی شرف الملك، میرزا عەبدولغفار معتەمەد، میرزا ڕەزا عەلی دیوان بەگیو هەندێ لەئەعیانی ولایەتی لەگەڵ خۆی بردبو. كەگەیشتە سنوری مەریوان حەسەن سوڵتانی هەورامی، كەچەند ساڵ بو لەحكومەتی كوردستان یاخیو سەرچاوەی شەرارەتو جەسارەت بو، لەگەڵ مستەفا بەگو بارام بەگی برایو هەزار تفەنگچی، بێباكو مەغرور هاتە حزوری شازادە. (ئەویش)لەهەڵگەڕانەوەو شەرارەتی حەسەن سوڵتان ئاگادارو، لەدڵی خۆیدا بڕیاری تەمێ كردنیدا بو. لەم هاتنو بێباكییە لەناخەوە دڵگیر بو. لەرێگاش چەندین جموجۆڵی

وەحشییانەی لەتفەنگچییە هەورامییەکان دی بو. شازادەی لێزان چاوی لەهەموی پۆشیو گوێی خۆی لێ خەواند تا گەیشتە گوندی بیلک، کەیەکێ لەئاواییە دیارەکانی مەریوانە. شازادە لەمزگەوتەکەی ئەوێدا مەنزلی فەرمو. پاش گەڕانەوەیان بۆ سنە شازادە خۆی هەواڵی کوشتنی حەسەن سوڵتانی بەم جۆرە گێڕایەوە: ئەو شەوە لەمزگەوتی بیلك لەبەر زۆریی خەیاڵاتو بیرکردنەوەی قوڵ لەجێبەجێ کردنی مەبەستی نهێنی خۆمو لەناوبردنی حەسەن سوڵتانی شەرور خەو نەبوە ئاشنای چاوی پڕ لەتورەبون. پاش بیرکردنەوەو تێڕامانی قوڵ بەنیازی پاکەوە ئیستیخارەم بەقورئانی مەجید کردو ئایەتی پیرۆزی((یا یحیی خذ الکتاب بقوە))هاتەوە. لای من هیچ دودڵییەك نەما. بەتەواوی هێزی دڵەوە بڕیاری جێبەجێ کردنی مەبەستەکەی خۆمدا. کەگوێم لەبانگی بەیانی بو، بۆ ئەدای فەریزەی حەقو استمدادی نصرتو استغاثت وپەنام بەدەرگای رب العزە قیامم کرد. دوای تەواوکردنی نوێژو پاڕانەوە، بەتوفیقی خواوەندی غالبو کارساز، زین العابدین خانی فراشباشیم بانگ کرد. بێ ئەوەی کەس لەهاوڕێکانی خۆم ئاگادار بکەم، دەستور ئەلعەمەلی تەواوم دایە کەلەگەڵ ۱۰ کەس لەفراشانی هەڵبژاردەو کارامە لەقاوەخانەکەی مزگەوت، ئامادەو بێ ترس مەردانە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دژوارە ئامادە بن" هەر کەحەسەن سوڵتانو دو براکەی هاتنە قاوەخانە دەسبەجێ حەسەن سوڵتان بکوژنو هەردو براکەشی زنجیر بکەن.

لەبەرئەوەی بەئایەتی پیرۆز استخارەو، بەلێوەشاوەییو کارزانی فراشباشیو، لەئازایەتیو زرنگی فراشەکان دڵنیا بوم، عەلی ئەکبەر خانو معتمدو دیوانبەگیم بۆ لای خۆم داوا کرد. ماوەیەك لەگەڵیان دوام. سەرەتای هەتاو کەوتن بەدڵێکی بێ تاوەوە حەسەن سوڵتانو براکانیم بانگ کرد کەبێن خەڵات بکرێنو بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان. سوڵتانو براکانی بەو پەڕی غرورەوە هاتنەلام. ماوەیەك لوتفو میهرەبانیم بەرامبەر دەربڕین. بەڵێنی امتیازو موچەم پێ دان. پاشان پێم وتن: مەریوان ئەوەندەی ئاوایی تیانیە، مانەوەی ئێوە بەم هەمو خەڵکەوە ئەبێ بەهۆی خەسارەتو زەحمەتی ئەهالیو رەعییەت. خەڵاتەکەتان لەقاوەخانە ئامادەیە، بڕۆن خەلعەتی خۆتان بپۆشنو مەرەخەس بن. خەریکی ئەنجام دانی خزمەتو وەرگرتنی مالیاتی دیوان بن. هەر ۳ برا بۆ قاوەخانە چون. پاش رۆیشتنیان من بەئەسپایی بەعەلی ئەکبەر خانو ئەوانی ترم وت: ئەگەر ئێستە فەرمانی گرتنو بەستنەوەی ئەم ئەشرارە بدەم چی ئەبێ؟ ئەوان بەپەشۆکاوی لەڕوی خێر خواییەوە بەمنیان وت: ئێستە وەختی ئەو کارە نیە، چونکە هەزار تفەنگچی لەدەرەوەی مزگەوت تفەنگ بەدەستەوە راوەستاون،

ئێمەش ئامادەیی تەواومان نیــە. مــن بزەیـەکم کـردو، وتم: ئەگـەر خـوا بیـەوێ ئەوەندە گرنگ نیە.

هێشتا ئەوان وەڵامێکیان نەدابوەوە لەقاوەخانەوە هەرا بەرز بـوەوە. دەسـبەجێ فراشباشی هاتە مزگەوتو مژدەی بەجێ گەیاندنی خزمەتی پـێ سـپێردراوی‌دا" حەسەن سوڵتان کوژرا، دو براکەشی کوتو پێوەن کران.

من بەخۆشییەوە زمانم بە بەجێ هێنانی سوپاسـی حـەزرەتی احـدیت تـەڕبو، عەلی ئەکبەر خان بەشمشێری روتەوە چـوە دەرەوە. لەبـەردەمی مەنزڵەکـەی منـا راوەستا منیش وتم: گوریسێك بخەنە پێی حەسـەن سـوڵتانو لەمزگـەوت تـوڕی بدەنە دەرەوە.

لاشەی مەنحوسی ئەویان فڕێ دایە دەمی تفەنگچییانی هەورامی...))[٦٨].

**نمونە١٥:**

**ئێلی جاف" زیندە بەچاڵ**

ئێلی جاف یەکێك بو لەئێلە رەوەندە گەورەکانی کورد. لەجەبەل حەمرینەوە تا چیاکانی نزیك سنە بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ گـەرمیانو کوێسـتانیان ئـەکرد. هـۆزە گەورەکانی ئەم ئێلە سەر بەئەمارەتی بابان بـونو، هەنـدێ لـەتیرەکانی تریشـی کەوت بونە سنوری ئەمارەتی ئەردەڵانو کرماشـانەوە. ئـەم ئێلـە لەپەیماننامـەی زەهـاو(١٠٤٩/١٦٣٩)دا دابـەش کـران، هەنـدێکیان کەوتنـە دیـوی ئێـرانو زۆریشیان کەوتنە دیـوی عوسمـانی کەبـەجافی مـرادی ناسـراون. ئـەو سـنورەی پەیماننامەی زەهاو دیـاری کـرد بـو نـەی ئـەتوانی رێ لەهاتوچـۆی گـەرمیانو کوێستانی جاف بگرێ. ئەم هاتوچۆیە زۆرجار کێشەی بۆ کاربەدەستانی سنورەکان ئـەخولقان. لەهــەمو گفتوگۆکـانی نێـوان دەوڵـەتانی رۆمو عەجـەمدا، یـەکێ لەباسـەکانیان هەمیشـە بەلاداخسـتنی کێشـەی هاتوچـۆی رەوەنـدەکان بـو. کەسەرەنجام لەپێکهاتنی یەکەمی ئەرزڕوم(١٢٣٨)دا لەسەری رێك کەوتن.

کاربەدەستانی ئێرانی ئەیان ویست رێ لەهاتنی ئێلـی جـاف بگـرن بـۆ نـاو خاکی خۆیان. بۆ ئەو مەبەستەش چەندین جار رێگـەیان بـەئێلی جـاف گـرتو، تالانیان ئەکردن، کوشتاریان لێ ئەکردن، خەڵکیان لێ ئـەگرتن. بـەلام جافـەکان لەبەرتەسکیی لەوەڕگاکانی خۆیـانو ناسـازی ئاوهـەوای هاوینـانی شـارەزوورو گەرمیان، بەناچاری رانەکانی خۆیـان ئـەبردە کوردسـتانی ئێـران. هەنـدێ جـار بەبـەرتیلو پێشـکەشو بـاج، هەنـدێ جـاری تـریش بەملـهوڕیو بەقاچـاخ، هاوینەکەیان لێ بەسەر ئەبرد.

نوسەرێکی ئێرانی لەم رووەوە نوسیویێتی:

((دوانزە تیرەی دەوارنشینی ئێلی جاف کەژمارەیان نزیکەی ٤٥ هەزار ماڵـە، زیاتر لەپەنجا هەزار سواری ئازاو نەترسـیان بەئەسـپی جـوانو چـالاکەوە هـەبو، لەقەڵەمرەوی والی بەغدادا بون. ئەو زەمانــە محەمــەد پاشـا سـەرکۆماریان بـو، ئەگەر گوێڕایەڵی حوکمی هەردو دەوڵەتی بکردایـەو، هاوینــان ئێلەکـەی خـۆی لەشارەزور گل بدایەتەوە، ئاژەڵەکەیان بەهۆی گەرماو رەشەبای سـەبونەوە لـەناو ئەچو، ئەگـەر گوێیشـی نەدایەتـە ئـەو حوکمـەو، بهاتایـە بـۆ کوێسـتانەکانی کوردستان ئەوا گیریان ئەخواردو، گیانو ماڵیان ئەکەوتە مەترسییەوە. لەکاتێکا جافەکان لـەخاکی ئێـراندا بەپـەرتوبڵاوی لەگونـدەکانی مـەریوانو خوڕخـورەو تیلەکۆ نەك هەر بەتـەنیا بـەخۆڕایی رانـەکانیان لەزۆزانـەکاندا ئەلـەوەڕێنن... دەستیان لەهیچ جۆرە شەرارەتو رێگریو هەرزەگییەك نەئەپاراست.

فەرهاد میرزا بۆ جێبەجێ کردنـی حـوکمی هـەردو دەوڵـەتو، بەرهەڵسـتی لەدەسدرێژی جاف قوتویەك شەمچە(مەبەستی شقارتەیە)ی بۆ دیوانبەگی ناردو، لەسەری نوسی بو: ((ئەشراری جاف بکـوژە، ئـاگر لـەماڵیان بەربـدە، شەمچـە نێردرا بۆ ئەوەی ئەو کارە بەئاسانی جێبەجێ بکەیت)).

هەر لەو کاتەدا چەن بار گەنم لەئۆردوی دیوانبەگییـەوە نێـردرا بـو لەئاشـی گونـدەکان بیهـاڕن. جافـەکان لەرێگـە بـارە گەنمـەکانو وڵاخـەکانیان دزی بـو، وڵاخدارەکانیشیان کوشت بو. دیوانبەگی ناردی ئەوەی ئەو کارەی کرد بو بـەناوی عەلی شاپەڕییەوە لەگەڵ ٤ کەس لەهاودەستەکانی بەگیروای هێنایە کوردستان.

عەلی شا کە لەپیاوە ئازاو ناسراوەکانی ئێلی جاف بو، بـاوەڕی نەئـەکرد رۆژێ بێ بگیرێ. کاتێ ئەوو گیراوەکانی تریان بەدارەوە بەست، لـەباتی پاڕانـەوەو تکـاو دەربڕینی پەشیمانی، بەلەخۆ بایی بونەوە، کەوتنە قسە بەدیوانبەگیو، پڕکێشیو پڕوییـان گەیشـتە رادەیـەك، جنێویـان بەفـەرهاد مـیرزاو ناصـرالدین شـادا. لەبەرئەوە هەر ٥کەسەکەیان بەزیندوێتی نایە ژێر خاك، بۆ ئەوەی ئـیتر دەنگیـان دەر نەیەت))[٦٩].

**٦/٣ عەبـاس میرزا ملك ئارا**

**نمونە ١٦:**

**بەدەستەوەدانی قاسید(١٢٩٧)**

عەباس میرزا ملك ئارا(١٢٥٥-١٣١٦) کوڕی دوەمی محەمەد شا بو. لەگـەڵ ناصرالدین شا باوك برا بون. ئەم ٨ ساڵ لەو بچوك تر بو.

دایکی ناصرالدین ملك جیهان خانم، ناسراو بەمەهد علیاو، دایکی عەباس خدیجە خانمی کچی یەحیا خانی چەهریق بو. بنەماڵەی یەحیی خان لەمیرەکانی هەکاری‌و خۆیان بەنەوەی خەلیفەکانی عەبباسی دائەنا. لەتەریقەتدا نەقشبەندی‌و موریدی سەید تەها شەمزینی بون.

محەمەد شاه لەپێش مردنی لەمەهد علیا دڵگیر بو. زۆرتر روی ئەدا بەخەدیجە خانم. لەبەر خۆشەویستی ئەو، ئەو کوڕەی لەویّ بو بەناوی باوکی خۆیەوە ناوی نا عەباس میرزاو، نازناوی نائب السلطنه ی دایە. مەهد علیا بەو بۆنەیەوە، خەدیجەی هەوێی‌و عەباسی هەنەزای دەدزا. بەهەمو رێیەك هەوڵی ئەدا بۆ ئەوان تێ بچێنێ، ناصرالدینی کوڕی پێش بخاو بیکاتە جێنشینی شا.

کاتێ محەمەد شاه مرد (١٢٦٤) عەباس میرزا تەمەنی ٩ ساڵ بو، مەهد علیا بۆ ئەوەی بەیەکجاری لەمەترسی عەباس میملی ناصرالدینی کوڕی رزگاری بێ، براکانی خۆی راسپارد چاوی عەباس کوێر بکەن. عەباس بەهۆی تێکەوتنی فەرهاد میرزای مامی‌و هەوڵدانی سەفارەتی بەریتانییەوە لەم پیلانە رزگاری بو.

ناصرالدین گەیشتە تاران‌و بو بەشای ئێران. لەرۆژانی یەکەمی شاهێتییەوە کەوتە گێچەڵ بەعەباس‌و دایکی، هەمو زێڕو دارایی زەوت کردن. کەوتە پیلان گێڕان بۆ لەناوبردنی. هەمیشە گومانی لەعەباس هەبو. کەتەختی لێ داگیر بکا. کەوتە. ئەم گومانەی هەتا کوژرانی هەر لەدڵدا ما. بابیەکان هەوڵی کوشتنی شایان داو بریندار بو(١٢٦٨). شا ویستی بەسەر عەباسی‌دا بهێنێ‌و ئەوە بکاتە بەهانەی کوشتن یا گرتنی. عەباس پەنای بۆ سەفیرانی بێگانە برد. سەفیرەکانی بەریتانیاو روسیا بەگەرمی بۆی تێکەوتن، لەمردن‌و گرتن رزگاریان کرد. ناصرالدین شایان رازی کرد، بۆ ئەوەی دڵنیابێ لەمەترسی عەباس دوری بخاتەوە بۆ شوێنە پیرۆزەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی لەعێراق.

عەباس میرزا لەکۆتایی ١٢٦٨دا گەیشتە بەغداد. ماوەی ٢٧ ساڵ بەدورخراوەیی لەبەغدادو ماوەیەکی کورتیش لەئەستەموڵ مایەوە. ناصرالدین شا لە١٢٩٤دا رێی گەڕانەوەی بۆ ئێران پێدا. لە١٢٩٥دا گەیشتەوە تاران. شا بۆ ئەوەی روتی بکاتەوە لەناوی((نائب السلطنه ))نازناوی ملك ئارای پێ بەخشی.

شا ماوەیەك حکومەتی زنجانی بەعەباس میرزا سپارد. بەڵام زۆری لێ نەمایەوە لەترسی گیانی هەڵات بۆ قافقاز. پاش چەند مانگێ شا بەخشی‌و گەڕایەوە ئێران(١٢٩٦).

شێخ عوبیدوڵڵا ئەبێ ئاگاداری ململانێی دەسەڵات بوبێ لەدەرباری قاجاردا. لەبەرئەوە کەشۆڕشەکەی دەس پێ کرد. نامەیەکی تایبەتی بۆ عەباس میرزا

نوسی" داوای هاودەستیو هاوکاری لێ کردبو، لەبەرامبەر ئەوەدا گفتی پێدا بو ئەو بە شای ئێران بناسێ. شێخ عوبەیدوڵڵا نامەکەی بەدو نێردراوی تایبەتیدا بۆ تاران بۆ نارد. بەڵام عەباس لەباتی ئەوەی هاوکاری لەگەڵ شێخ بکا، ئاگاداری ناصرالدین شای کرد. نامەو نێردراوەکانی بەدەستەوەدا. لەپاداشتی ئەوەدا شا کردی بەحاکمی قەزوین. بەنوێنەرایەتی ئێران بۆ پیرۆزبایی لەجلوسی نیکۆلای دوەم ئەو چو بۆ روسیا.

لە١٣١٤دا پاش کوژرانی ناصرالدین شا بوبە وەزیری عەدلیە لە١٣١٦دا مرد.

عەباس میرزا خۆی ژیاننامە((شەرح حال))ی خۆی نوسیوەتەوە. لەوێدا سەبارەت بە((فیتنەی ئەکرادی ئازەربایجان))ئەدوێ. هەندێ لەهۆیەکانی رون دەکاتەوە، بەتایبەتی زوڵموزۆرو دەسدرێژی کاربەدەستانی دەوڵەتو، هەڵپەی مظفرالدین میرزای وەلیعەهد کە لەتەوریز دائەنیشت بۆ کۆکردنەوەی پارەو بەرتیلو رابواردنی نارەواو، ئازاردانی کوردەکانی ئازەربایجان، عەباس میرزا خۆی چیرۆکی نامەکەی شێخو بەدەستەوەدانی نێردراوەکانی لەکتێبەیدا((شەرحی حال))دا ئەگێڕێتەوە. عەباس میرزا نوسیوێتی:

((...تەلغورافچی لەتەوریزەوە هەواڵی هەندێ لەم روداوانەی ئاگاداری تاران کرد. لەتاران ئۆردویەکیان بەسەرداری شازادە حەمزە میرزا ناوبراو بەحشمت الدولەی کوڕی مرحوم عەباس میرزا نائب السلطنە سازداو ناردیان. میرزا حسێن خانی مشیر الدولەش کەبۆ قەزوینیان نارد بو، بڕیاردرا بەپەلە بەپێشکاریی ئازەربایجان بچێ بۆ تەوریزو میرزا ئەحمەد بەشەرمەزاری بێتەوە تارانو، تیمور پاشاخانی ماکۆیی بەفەوجی ماکۆو کۆکراوەکانی خۆیەوە بەرەو ورمێ بڕوات. حەمزە میرزا لەرێگە نەخۆش کەوتو بەرەحمەتی خواچو. ئەم لەشکرە کە لەتارانەوە رۆیشتو ئەو لەشکرانەی کە لەتەوریزو ماکۆوە چوبون هەمو گوندەکانی سەرڕێو دەوروبەری ورمێو مەراغەیان تالان کردو، گوێیان نەدایە عەرزو ناموسی کەسو زۆر خراپ تر لە لەشکری کورد وێرانییان بەسەر ناوچەکە داهێنا.

لەم گێژاوەدا، رۆژێکیان بەتەنیا لەکونجی ماڵەکەی خۆمدا دانیشت بوم، بینیم دو کەس هاتنە ناو ماڵەکەو سۆراخی منیان لەنۆکەرەکان کرد، هاتنە لام. زەرفێکیان لەگیرفان دەرهێناو دایان بەمن. بینیم شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ منی نوسیوەو، داوای لەمن کردوە بچم بۆ جەنگ. ئەوانەی نامەکەیان هێنابو یەکێکیان ناوی عەبدولڕەحیم پیر بو. ئەوی تریان حسێن قولیو هەردوکیان

برابون. عەبدولڕەحیم پێی وتم پێویست ناکا دابمێنیێ، ئەگەر بێی بێگومان ئەبی بەشا.

ئەمەش ڕۆنوسی نامەکەی شێخ عوبەیدوللا..(شوێنی نامەکەی بەبۆشی بەجێ هێشتوە)

کەئەم نامەیەم خوێندەوە شڵەژام. لەلایەکەوە ترسام لەوەی نەوەکو نۆکەرەکانم پێ بزانن‌و بڕۆن بەهەر جۆرێ بێ هەواڵەکە بەکاربەدەستانی دەوڵەت‌و شا بگەیەنن. چونکە لەئێران ئەوە بوە بەباو جاسوسی لەهەمو شوێنی داناوەو هەر کەسێ ناسراو بێ یەکێ یا دو کەس لەنۆکەرەکانی ئەو کەسە. بێ ئەوەی خۆی پێ بزانێ، بەدزیەوە پارەی ئەدەنێ بۆ ئەوەی هەواڵی هەڵسوکەوتی ئەو کەسە بکەن بەراپۆرت. لەنۆکەرەکانی خۆم ۳ کەس زیاتری لێ نەبو. ئەوانی تر هەمو خەڵکی تاران بون.

لەلایەکی ترەوە ڕاڕایی کەوتە دڵمەوە کەئەبێ چی بکەم. ئایا بۆ چارەکردنی ئەو هەمو خراپەیەی کەناصرالدین شا بەرامبەر منی کردوە ئەبێ بڕۆم و ببمە هۆی بەهێزبونی شێخ عوبەیدوللاو بەکاغەز نوسین بێ خوێن ڕشتن تەورێز بگرم‌و، پەلاماری تاران بدرێ‌و لەبەرئەوەی هەمو خەڵك لەجۆری هەڵسوڕانی ناصرالدین شا ڕەنجاون، ئەتوانرێ تارانیش بگیرێ. یاخود بەهۆی خۆشەویستی نیشتمان‌و هەم دینان‌و خواردنی نان‌و نمەك نابێ خیانەت بکرێ‌و نابێ ببێتە هۆی ڕشتنی خوێنی شیعەیان. لەحاڵەتی ڕۆیشتن‌دا، ئەبێ چۆن بڕۆم، کە لەو ۲۰ مەنزلە ڕێیەدا نەگیرێم‌و، لەحاڵەتی مانەوەدا ئەبێ چ تەگبیرێ بکەم کەئەم دو کەسە بەدوای مندا هاتون کەس نەیان ناسێ‌و بێ هودەو بەهیچ‌و پوچ لەتاران توشی بەلا نەبم.

بەکورتی وەسوەسە بەجۆرێ دای گرتم کەمردنم بەئاوات ئەخواست. مەسەلەکەش ئەوە نەبو بشێ ڕاوێژی کەس بکەم. بەو دو کەسەم وت: ئێوە بەپەلە بەنۆکەرەکانی من بڵێن ئێمەش هاتوین ببینە نۆکەر، بازەوان‌و ڕاوکەرین، نەختێکیش لەنۆکەرەکان بپاڕێنەوە بۆ ئەوەی ئەوان واستەتان بۆ بکەن‌و ئەوسا لەماڵ دەربچن.

ئەوانە ڕۆیشتن‌و منیش کەوتمە بیرکردنەوە تا شەو داهات. ئەو شەوە خەوم لێ نەکەوت. شەوەکی هەستام، دەسنوێژم گرت، ڕو بەقیبلە دانیشتم. زۆر گریام، زۆر پاڕامەوەو زاریم کرد، لەقازی الحاجاتم خواست چی خێرە ئەوە بکەم. وا بەدڵمدا هات کەخیانەت بە ولی نعمتی ظاهری خۆم نەکەم‌و نەبم بەباعیسی فتنەو فەساد. ئەگەر خراپەیان بەرامبەر کردوم ئەوا من بەخوایان بسپێرم. خۆم بچم بۆ

حوزوری شا کاغەزەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای بدەمێو ئەو دو کەسەش بەدەستەوە بدەم(النجاة في الصدق)). پاش ئەوەی ئەم بڕیارەمدا استخارەی ذات الرقاعیشم کرد" باش بکەو خراپ مەکە، دەرچو.

دوای هەتاو کەوتن، لەئەندەرون دەرچوم بەشێوەی هەمو ڕۆژی دانیشتم. پرسیاری ئەو دو کەسەم کرد لەکوێن. نۆکەرەکان وتیان کەئەوانە وتویانە لەڕێوە گەیشتوین‌و ماندوین، ئەسپەکانیشمان لەکاروانسەرایە، ئەچین بۆ کاروانسەرا شەو لەوێ ئەنوین‌و سبەی بەیانی دێینەوە. کەئەمەم بیست شڵەژام، نەوەکو ئەو دو کەسە نەیەنەوە یاخود بگیرێن‌و منیش توشی بەڵا ببم. دو سەعات بەم جۆرە مامەوە، لەگیانەڵا ناخۆش تر بو. تا بینیم هاتنەوە ناو خانوەکە. سوپاسی خودام کرد. فراش باشیم راسپارد کەئەم دو کەسە لەقاوەخانەکە خەریك بکەن‌و نەهێڵن بۆ هیچ جێیەك بڕۆن، خۆم سواربوم چوم بۆ حوزوری شا. لەباغی عەمارەت لەتەنیشت نارنجستانەوە دانیشت بو. عەرزم کرد کەعەرزێکم هەیە. فەرمویان چیە. عەرزم کرد با ئەو مەسەلەیە مەعلومی شا بێ کەمن کابرایەکی خیانەتکار نیم. ئەگەر بۆ ئەستەموڵ رۆیشتم خوا ئەیزانێ لەبرسا بو. ئەگەر چوم بۆ روسیا لەترسا بو. لەشا ترسان نەعەیبەو نەگوناهە. بەڵام خیانەت لەمن ناوەشێتەوە. ئێوارەی رۆژی رابردو. دو سواری کورد لەلایەن شێخ عوبەیدوڵڵا وە هاتن نامەیەکیان بۆ هێناوم، داوای لەمن کردوە بۆ شەڕ. فەرموی نامەکە لەکوێیە. دەسبەجێ دامە دەستی. خوێندیەوەو، پرسی ئەو دو کەسە لەکوێن. وتم هەردوکیان لەماڵەکەی منن. فەرموی بنێرە بیان هێنن. وتم چەند کەس لەنۆکەرانی دیوان مەئمور بفەرموو بڕۆن بیان گرن. چونکە خەنجەریان پێیە. نەوەکو یەکێ بریندار بکەن‌و هەڵێن. چەند کەسێك مەئمور کران. پاش هێنانیان عەرزم کرد: من ئەوانەم بەدەستەوەدا. ئێستە نەوەکو لەترسی گیانی خۆیان‌و بۆ خۆ دەربازکردن تۆهمەتێك بەپاڵ من بدەن. فەرمویان دڵنیابە.

ئەو دو کەسەیان هێناو بەمحەمەد رەحیم خان عەلاء الدولە یان سپاردن لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ بکاو، لەهەلومەرجی ئۆردوی شێخ ئاگادار بێ. پاش لێکۆڵینەوە حوکمی حەپسی ئەبەدییان فەرمون.

بەرامبەر بەم خزمەتە" ئەموستیلەیەکی ئەلماسی بەمن التفات فەرمو کە ۲۰۰ تومانی ئەهێناو، حکومەتی قەزوینیشی مەرحەمەت کرد بێ ئەوەی هیچ پێشکەشی لەمن وەربگرێو، یەك تۆپی سەرداریی تورمەی خراپی بەخەڵات دامێ...))[۷۰].

## ۷/۳ حەسەن عەلی خانی وەزیری فوائد

**نمونە١٧:**
**دەستی تەگبیر" هەمزە ئاغای مەنگور(١٢٩٨)**

لەپاش کوژرانی باپیر ئاغای مەنگورو ژمارەیەکی زۆری پیاوە هەڵبژاردەکانی تێلەکەی(١١٩٨)بنەماڵەکانی مەنگور بەناوی ئافرەتەوە ناونرا بون. نزیکەی قەرنێکی خایاند تاکو مەنگور توانییان سەر لەنوێ ببوژێنەوە.

هەمزە ئاغا نەوەی باپیر ئاغا، لەتافی لاویدا بو، شەوێکیان لەمێرگێکی نزیك سابلاخ هەڵی کوتایە سەر دەستەیەك لەپاسەوانەکانی عەجەم، کە لەئیلی قەرەپاپاخ بو، بەگوێرەی سەرچاوەیەك ٣١کەس[٧١] و، بەگوێرەی سەرچاوەیەکی تر ٧٠ کەسی[٧٢] لێ کوشتن. دوای ئەوە هێزێکی کۆکردەوە، چوە سەر قەڵای لاجان، کەدیمەنی دەسەڵاتی داگیرکەری لەناوچەکەدا ئەنواندو، کاتی خۆی بۆ چاودێری‌و سەرکوتکردنی ئیلی بلباس، عەجەم دروستیان کرد بو. هەمزە ئاغا قەڵاکەی گرت‌و روخاندی.

هێزەکانی ئازەربایجان خرانە بەر فەرمانی کابرایەك بەناوی شجاع الدولە. سوارەی هەندێ لەئیلە کوردەکانیشیان خرایە گەڵ. هێزەکانی عەجەم چونە سەر هەمزە ئاغا لەلاجان. هەمزە ئاغا خۆی لەبەر هێرشەکەیاندا پێ نەگیرا. کشایەوە بۆ گوندی ژاراوە لەو دیوی قەندیل کە لەژێر دەسەڵاتی عوسمانی‌دا بو. ئێرانییەکان داوای بەدەستەوەدانی هەمزە ئاغایان ئەکرد. پاش چەند وردە تێکهەڵچونێ. هەمزە ئاغا لەلایەن عوسمانییەکانەوە گیراو، نزیکەی ١٠ ساڵی لەزیندانی رۆم دا بەسەر برد.[٧٣]

ساڵی ١٢٩٥ لەلایەن ئێرانەوە لێبوردنی بۆ نێردراو، گەڕایەوە موکریان. کاتی لەنێوان شاری سابلاخ‌و ئاوایییەکانی مەنگوڕایەتی‌دا بەسەر ئەبرد. داوودەزگای بەڕێوەبەرایەتی ئێران، بەتایبەتی لەناوچە کوردنشینەکاندا، لەوپەڕی بۆگەنی‌و فەسادا بو. لەو سەردەمەدا حکومەتی سابلاخ بەیەکێ لەشازادەکانی قاجار بەناوی لوتفعلی میرزا کشێکچی باشی سپێردرا بو. ئەمیش وەکو حاکمەکانی پێش خۆی بەپەلە کەوتە هەڵپەی خۆ دەوڵەمەن کردن لەرێگەی سەندنی بەزۆری بەرتیل‌و، جەریمەکردنی خەڵك‌و، بەدەستهێنانی قازانجی تایبەتی خۆیەوە[٧٤]. فەیزوڵڵا بەگی زنجیرکرد، هەزارو پێنج سەد تومانی جەریمە کرد. حاکمەکەی پێش ئەویش هەر لەم فەیزوڵڵا بەگە دوای ئازارداندو ئەشکەنجەیەکی دڕندانە چوار هەزار تومانی لێ سەند بو. پێنجسەد تومانی لەمینە ئاغای قادر ئاغا سەند. هەر لەسەر پارە شازادە چەندین کەسی ناسراوی گرت، لەوانە یەکێ لەخزمەکانی قادر ئاغاو، عەزیز ئاغای فەتاح‌و، سەرەش گەیشتە سەر هەمزە ئاغا.

نوسەرێکی ئەرمەنی، ئەسکەندر غوریانس، خۆی لەو رۆژانەدا لەتەورێز بوە، روداوی یاخی بونی هەمزە ئاغا بەم جۆرە ئەگێڕێتەوە:

((ئێوارەیەکیان هەمزە ئاغا بۆ پێکهاتن لەسەر مالیاتو، چاکردنی کاری عەزیز ئاغای فەتاح ئەچێ بۆ دار الحکومە، لەبەرئەوەی میرزا ئەبو قاسم تەزکرەنوسی دەولەتی ئێران خۆی لەوێ بوە، وائێمەش بێ کەمو زیاد وەکو ئەوگێڕایەوە، ئەی نوسین: بەندە لەگەڵ میرزا تەقی محرر، کەخۆی لەهەمو شتێ هەڵئەقورتان و هۆی زۆرایەتی مفسدەو خراپییەکان بو، لەژێر خانەکەی شازادە دانیشت بوین. لەناکاو دیمان هەمزە ئاغا لەگەڵ یەکێ لەبرازاکانیو نۆکەرێکیو قلیاندارێك هاتنە ژورێ. دو نۆکەری تریشی لەدەرەوە مابونەوە. لەبەینی ئەوو میرزا تەقیدا لەسەر مالیات گفتوگۆ کرا. میرزا تەقی مالیاتی هەمزە ئاغای بەهەزار تومان دانا.

هەمزە ئاغا لەوەڵام دا، وتی: مالیاتی ئەسڵیی ئێمە هەمیشە ٤٠٠ تومان بوە.

میرزا تەقی وەڵامی دایەوە، وتی: ئەگەر وا بوە ئەی بۆچی پار لەحکومەتی محمەد خاندا هەزار تومانت داوە؟

هەمزە ئاغا دوبارە لەوەڵامدا وتی: ٤٠٠ تومان مالیاتو ٢٠٠ تومانیشم لەباتی تەعاروف داوە. ئەگەر ئێوەش بتانەوێ، ئەوەندەتان تەعاروف ئەدرێتێ، ئەگەرچی لەو ماوەیەشدا کەمن لەم شارەدا دانیشتوم هەموی هەر خەریکی کاری دیوانی بوم، نزیکەی ٨٠٠ تومان پارەم خەرج کردوە.

میرزا تەقی لەرقی هەمزە ئاغا بەگاڵتە پێ کردنەوە، وتی: تۆ چ خزمەتێکی دیوانت کردوە؟ تۆ کەخاوەنو سەرۆکی هەزار خێزانیو لەهەر خێزانێ ٢ تومان وەرئەگری، چی ئەبو ئەگەر نیوەی ئەو ٢ هەزار تومانەت بەشازادە تەعاروف بکردایە؟

میرزا تەقی ئەم قسانەی بەجۆرێ کرد کەبوە هۆی دڵتەنگیو زویری ئەو. ئینجا هەستاو وتی ئەچم مەسەلەکە عەرزی شازادە ئەکەم. گەڕایەوەو لەژورەکەدا دانیشتنەوە. زۆری نەخایاند، بینیمان فەراشباشی شازادە لەگەڵ فەراشێکی تر کەزنجیرێکی بەدەستەوە بو، خۆیان کرد بەژوردا. فەراشباشی روی لەهەمزە ئاغا کردو، وتی: شازادە ئەم زنجیرەی بۆ تۆ ناردوە، ئەبێ ماچی بکەیت!

هەمزە ئاغا لەبیستنی ئەم قسەیە لەباری ئاسایی خۆی دەرچو، دەستی برد بۆ خەنجەرەکەیو، بەزمانی تورکی عوسمانی وتی: ((من بونی قبولْ ئیتمیم)) واتە من ئەمە قوبوڵ ناکەم.

ئەوسا هەڵی کێشایە خەنجەرەکەی‌و رو بەلای فەراشباشی راپەڕی. میرزا تەقی‌و فەراشباشی لەترسی گیان هەردو بۆ ژوری سەرخان، کەشازادە لەوێ چاوەڕوانی ئەنجامی بڕیارەکەی بو، هەڵاتن. ئەمین تەزکەرە ئەڵێ: منیش خۆم خزاندە کونجێکی تاریکی ژورەکەو خۆمم بەدیوارەکەوە نوساند بو. بەحەپەساوی‌و ترسەوە تەماشام ئەکرد. هەمزە ئاغا لەپێکی لەچراکەدا کوژاندییەوە. لەگەڵ برازاکەی لەپەنجەرەکەوە چونە دەرێ. لەم تاریکییەدا دەنگی چەن تفەنگی لەحەوشەکەوە هات. برازاکەی وقلیاندار هەردوك بەئەنگیوراوی هەمزە ئاغاش بەخەنجەر یەکێکی لەنۆکەرانی شازادە گلانە سەر ئەرزو ئەوانی ترهەڵاتن. هەمزە ئاغا پێی وابو ئەم تەگبیرە لەپێشەوە کراوە ودەرگای حەوشەکەشیان لێ گرتوە. لەبەرئەوە روی کردە دەرگاکەو بەپڕتاو دەرپەڕی. پاسەوانەکە نیزەی تفەنگی ئاراستەی هەمزە ئاغا کردو ئەیویست نەهێڵێ بڕواتە دەرێ. هەمزە ئاغا بەدەستێکی نیزەی تفەنگەکەی گرت‌و بەدەستەکەی تری سەربازەکەی دایە بەر خەنجەرو کوشتی. لەپێش ئەوەدا لەدەرگا دەربچێ، چو بۆ حەپسخانە عەزیز ئاغای بانگ کرد، بەلام وەکو دەرکەوت، لەوکاتەدا نۆکەرانی شازادە عەزیز ئاغایان بەبرینداری برد بو بۆ جێگەیەکی تر. هەمزە ئاغا هیچ وەڵامێکی نەبیست. روی کردە لای دەرگاکەو قۆناغە تفەنگێکی سرەواندە سەربازی دەرگاوان‌و خستی. لەگەڵ دو نۆکەری تری خۆی‌دا دەرگایان کردەوەو دەرچون.

ئەمین تەزکەرە ئەڵێ: کاتێ هەمزاغا دەرچو تەقە راوەستا. من چوم بۆ لای شازادە. بینیم یەکێ لەنۆکەرەکانی شازادە تفەنگی مارتینی لەدەست دایە لەسەر پلیکانەکان بۆ پارێزگاری شازادە راوەستا بو. کەچومە ناو ژورەکەوە شازادەم بینی تفەنگی پێ بو. لەو پەڕی شلەژان‌و پەشۆکاوی دابو. عەرزم کرد کەجۆری گرتنی هەمزاغا نەئەبو وابێ. لەوەڵامدا وتی: روی فەراشباشی رەش بێ، لەو دەمەدا ئەویش لەبەردەمی‌دا وەستا بو، منی دڵنیا کردبو لەوەی کەرێوشوێنی گرتنی ئەوی لەهەمو رویەکەوە ئامادە کردوە. بەم جۆرە گوناهەکەی خستە ملی فەراشباشی. لەکاتی ئەم گفتوگۆیەدا ئەحمەد بەگ تفەنگێکی مارتینی بەشانەوە بو، خۆی کرد بەژورداو دەستی کر بەقسە: بەقوربانت بم شازادە، من کەی بەئێوەم گوت کەهەمزە ئاغا بەو جۆرە بگرن. لەم کاتەی شەوداو بەبێ تەگبیرو نابەجێ، ئەبوایە لەپێشەوە چەن کەس لەئاغایان ئاگادار بکرانایەو، بەرۆژی رۆشن بگیرێ. بەم قسانەدا دەرکەوت، کەپێشەکی لەنێوان شازادەو ئەحمەد بەگدا تەگبیر کرابو..)) [٧٥]

هەمزە ئاغا لەدوای ئەم روداوە گەڕایەوە مەنگوڕایەتی‌و کەوتە خۆسازدان. ئەمەش هاوزەمان بو لەگەڵ خۆئامادەکردنی شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی بۆ راپەڕینە گەورەکەی. هەمزە ئاغا بو بەسەرکردەی هێزەکانی شێخ عوبەیدوڵلا لەقۆڵی شنۆ. لاجان، سابڵاخ، بناو، میاندواو.. و لەگەڵ عەبدولقادری کوڕی شێخدا فەرماندەی هێزەکانی ئەو قۆڵە بو، تا لەبەردەمی هێرشی هێزەکانی ئێراندا بەتێکشکاوی کشانەوە. هەمزە ئاغا لەناوچەکانی سنورا بەخۆی‌و هەندێ لەخزمەکانی‌و چەکدارەکانی ئێلەکەیەوە مایەوەو هەر بەهیوای ئەوە بو، شێخ عوبەیدوڵلا سەرلەنوێ تێ هەڵبچێتەوە. بەڵام شێخ عوبەیدوڵلا دوای ئەوەی بەخۆگۆڕین لەئەستەموڵەوە بۆ کوردستان گەڕایەوە، زۆری نەخایاند لەلایەن ئۆردوی تورکەوە پاش چەن تێکهەڵچونێ لەشەمزینان بەدیل گیراو رەوانەی حیجاز کرا. هەمزە ئاغاش ئیتر نائومێد بو. کەوت بوە تەقەللای بەدەسهێنانی ئەمان‌و لێبوردنی ئێرانی. حسنعلی خانی امیر نظام بەهۆی میرزا ئەبو القاسمەوە، قورئانێکی بۆ نارد کەبەخەت‌و مۆری خۆی ئەمانانامەی بۆ لەسەر نوسی بو. هەمزە ئاغا پشت ئەستور بەو ئامانانامەیە هاتە سابڵاخ‌و لەوێ کوژرا.

چەند کەس لەنوسەرانی ئەو سەردەمەی ئێران لەسەر ئەم روداوەیان نوسیوە" عەلی ئەفشار لەکتێبی((رسالەی شۆڕش شێخ عوبەیدوڵلا))دا نوسیوێتی:

لە٢ی شەعباندا عەلائەدین الدەولە امیر نظام بەنیازی سەردانی سنورەکانی لەتەورێزەوە جولا، لەرێگەی دهخورقان‌و مەراغەو سابڵاخەوە چو بۆ ئازەربایجانی غەربی، لەرێگا هەرکەسێ کە لەروداوەکانی جەنگەکانی شێخ عبادالله(نوسەر وەهای ناو ئەبا)خزمەتێکیان کرد بو یا زەرەرێکیان لێ کەوت بو، دڵنەوایی کردن‌و یارمەتی دان‌و بەشێوەی جۆراوجۆر دڵخۆشی دانەوە.

کاتێ گەیشتە ناوچەی لاجان، محەمەد ئاغای مامەش پێشوازی لێ کرد. کەلێوەشاوەیی‌و شایستەیی ئەوی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو سنورانە هەڵسەنگان، حسام الملك‌و عەلی رەزا خانی سەرتیپ کەمەئموری مانەوە بون لەسلدوز، هەردوکیانی مەرەخەس کردو کاروباری ئەو سنورەی بەمحەمەد ئاغا سپاردو، داوای لێ کرد لەو سنورانەدا رێگە بەهاتوچۆی مەنگوڕ نەداو، ئەگەر توانیشی هەمزە ئاغای، کەسوپاسالاری شێخ عوبەیدوڵلا بوە، بەمردویی یا بەزیندویی بۆ ببا.

امیر نظام دوای ئەم کارانە چو بۆ شنۆ. لەپاش رێکخستنەوەی کاروباری ئەوێ‌و سەردان‌و دڵخۆشی دانەوەی سەرانی ئێلی زەرزا لە١٨ی شەعباندا

بەشکۆو دەبدەبەوە چو بۆ ورمێ، لەلایەن هێزەکانی ئەوێوە پێشوازی کراو لەباخی دلگوشا دابەزی.
وەزیری فوائدیش لەم کاتەدا لەسابلاخ بو. جموجـۆلێکی زۆرتـری ئـەکرد بـۆ ئەوەی بتوانـێ هـەمزە ئاغـا بگـرێ. هـەمزە ئاغـاش کـەکۆتایی کـاری شـێخ عبادالللەی بەو چەشنە بینی، لەکردەوەی خۆی پەشیمانو، لەوپـەڕی پەشـۆکاویو شلەژاوی دابو. هەمیشە لەترسو هەراس دا بـو. لەبەرئـەوەی ئیلـی مـەنگوریش ئەیان زانی ئەولیای دەولەتی شاهنشاهی مانی ئەو بەمایەی فەساد ئەزانن، وان لەبیری فەوتانـدنیدا، ئـەوانیش خۆیـان لێ دور رائـەگرتو، یاریـدەیان نەئـەدا. تەنانەت کارگەیشتە ئەوەی کاکەللا ناو، کەبرای هەمزە ئاغا بـو، خـۆی خسـتە خزمەتی وەزیری فوائدو، ئارەزوی لەناوبردنی براکەیو جێگرتنەوەی ئەوی ئەکرد.
هەمزە ئاغا کەهەلومەرجی خۆی وەها ناخۆشو ترسناك ئەدی، بۆ پاراسـتنی گیانی خۆی پەنای بۆ هەمو رێگەیەك ئەبرد. لەو دواییـەدا هەنـدێ لەعولـەماو روحانییانی سابلاخی کردە شەفیعو داوای تەئمینی لەفەرماندەی هێزەکان کرد.
وەزیری فوائدیش ئەویست ئەم کێشـەیە بەدەسـتی تـەگبیر چارەسـەر بکـات. موافەقەتی کرد کە هەمزە ئاغاو چەند کەسـێ لەسـوارەکانی ببینـێ. پێشـەکی پلانێکی بۆ کوشتنی داناو چەند کەسێکی لەنیشانچییانی دیارو ئازای سوپاکەی خۆی لەچالێکا لەبۆسە نا، کەئەیروانی بەسەر ئـەو خێوەتـەدا، کەئـەبو هـەمزە ئاغای لێ دابنیشێ، چاوەڕوانی هاتنی ئەو بون.
هەمزە ئاغا لەگەڵ سەد کەس لەسوارانی چەکداری خۆی لەکاتی دیاریکراودا گەیشتە ئۆردوی وەزیری فوائدو، بۆ خێوەتی ئامـادەکراو رێنـوێنی کـرا. هەرکـە گەیشـتە نـاو خێوەتەکـە دەسـرێژی گوللـە دەسـتی پـێ کـرد. هـەمزە ئاغـاو دەسوپێوەندەکانی لەخاکدا گەوزان.
وەزیری فوائد فەرمانیدا سەریان بڕیو بۆ پیشان دانی امیر نظام بۆ ورمـێی نارد. عـلاء الدولـە امـیر نظـامیش هـەر بەگەیشـتنی کەللـەی هـەمزە ئاغـا فەرمانیدا بیکەن بەسەری نیزەوە، لەشاردا بیگێڕن. بەم جۆرە سوپاسـالارو یـاری غاری شێخ عبادالله بەسزای کردەوەکانی خۆی گەیشت..))[٧٦]
نوسەرێکی تر، امین الدولە لە((خاطرات سیاسی))دا نوسیوێتی:
((حسنعلی خان وەزیری فوائدی عامە بەوەسائل ورەسائل رێگەی دۆسـتایەتی لەگەڵ هەمزە ئاغا کردەوە.. داوای لێ کرد بێتە لای. هەمزە ئاغا بەدڵنیاییەوە چو بۆ نـاو ئـۆردوی حسـنعلی خـان، واریـدی خێوەتەکـەی ئـەو بـو، لـەکاتی ئـەم میهرەبانییەدا بەپێی تەگبیری پێشەکی، حسنعلی خان هەستا چوە خێوەتێکی تر،

لەپشت خێوەتەکەوە بەجارێ چەن گوللە تفەنگ هاوێژرا. هەمزە ئاغاو کەسەکانی کوژران، فەراشباشیەکەی حسنعلی خانیش کە لەناو خێوەتەکەدا بو، ئەویش کوژرا، بەکوژرانی هەمزە ئاغا هێزەکانی کورد هەلاتن‌و، پەرەوازە بون، غائیلە تەواو بو)) [77].

وەزیری فەوائید لەو کاتەدا حسنعلی خان(١٢٣٦-١٣١٨)ی کوڕی محەمەد سادق خانی گەروس بو. پلەی سەرتیپی بەمیرات لەباوکییەوە بۆ بەجێ مابو. لەجەنگی هیراتدا بەشداربو. یەکێ بو لەکاربەدەستە نزیکەکانی دەرباری قاجار. وەختێ مظفرالدین میرزا ولیعەهد بو لەتەورێز، ئەم لەوێ پێشکاری بو. لەسەفەری یەکەمی ناصرالدین شادا بۆ ئەوروپا(١٢٩٠)ئەمیش یەکێ بو لەئەندامانی حاشیەکەی. ماوەیەکیش وەزیری موختاری ئێران بو لەفەرەنسەو بەریتانیا. ماوەیەکیش حوکمڕانی کرماشان بو. چەند کتێبێکی نوسیوە لەوانە" منشات پندنامە یحیویە کەبەتایبەتی بۆ کوڕەکەی خۆی نوسیوە. [78]

بەیتبێژەکانی موکریان ئەم روداوەیان کردۆتە بەیتێکی درێژ بەدەنگەوە ئەیلێن، لێرەدا بۆ تەواوکردنی هەندێ لەدیمەنەکانی باسەکە ئەی نوسینەوە:

((خالق هەر ئەتۆی لەسەر، رەببی هەر ئەتۆی لەسەر، چی تۆ پێت بێ ئێرادە، رانابرن هیچ موقەددەر.

سێ موقددەرن بەسەر دێن، مردن‌و کوشتن‌و گرانی. لەموکوریان دو خێڵ بون، بەگزادەو قارەمانی، یەکێك بۆ لەبەگزادان، حەیفێ بۆ عەلی خانی، پادشا تەگبیری دەکرد، شازادێکی بانگ دەکرد، زۆر چاکی نسحەت دەکرد، بەو دە یارو زەمزەمە، بۆ سابلاغیی بەرێ کرد: دەبرۆ و رامەمێنە، خەلکی تەفرەقە مەکە، مەخلوقێ مەتۆقێنە، دە سەر ئاغاوەتان کە، حەمباراتان بشکێنە، بەو قەتارو نەهاران لەبۆ سابلاغیی بێنە،

حاکم هات‌و، وای نەکرد، دەستی بەبێ ناموسی کرد، پیاوێکی وسین ئاغای گرت، ئەو، بێ سوچ، لوتی کون کرد، وسین ئاغا مودەبیر بو، زۆر چاکی خزمەت دەکرد، کەچووە بۆ مالە خۆی، لەحەیفی ئەو قسەی دەمرد، لەئاغاوەتان بوغلو، راووبی رایان دەکرد، گەر ئەمە هەمزاغای نەگرین، ئەو ولاتی خەرا کرد.

هەمزە مەردی کارخانی، هیچ بەو کارەی نازانێ، بەخۆو بەقلیانداری دەهات لەبۆ دیوانی، لەخواجا بێداریاندا، حاکم چو بالەخانی، خەرەی زنجیران دەهات، فەراش گەینە پێشخانی" ((کاك هەمزە تۆ ماچیکە، موقەسیری دیوانی، دەلاقت دەکەم کوتی، دە ملت دەکەم زەولانی، لێرەشت لێ ناگەڕێم، دەتنێرم بۆ تارانێ))

لەو هەمزاغای جوت غیرەت، دەستی برد بۆ خەنجەری، هەڵدەکێشێ دەبانێ، بەزەبرێنکان لێی دەدان، زیرەی برد بۆ عاسمانی، تەقە تەقی مارتینان، لەبلەسەی دە شەشخانان، چرپان چرپان پەیدا بو، لەکوچەو لەدالانان، هەمزاغا دەنەڕێنێ: تفەنگم لەبۆ بینن، دەزری‌و دەمەرقوپانی، دەئەسپم لەبۆ بێنن، مەتاڵو حەیزەرانی. بەگەل وە دەر دەکەوتن، کادەرویشی کوێستانی، دەچون بۆ باغی قیبلەی، لەوێ دەدران لەسانی، هەمزاغا ئاوڕی داوە، حەمەد وسلەمان کوانێ؟ حەیفێ لەبۆ حەمەدی،کوژراوە مەردی مەیدانی. سێ تەلاقەی فڕێ دان، بەسێ جزمەی قورعانی، لێرەشی لێ ناگەڕێم، دەیماڵم تا تارانی، کۆنە خوێنم وەبیر دێن، وێ ساڵی سەر بڕانی، دەبێ بچمە نەهرییە بەسەنەد شێخی بینم لەبۆ عەجەم قرانی.

ئەو دەمەی دەچوە نەهری، لەگەڵ وەردوی شێخی هات، ئەو دەمەی شنۆی دەگرت، لەمامەشان بوغولو، را و بێ رایان دەکرد، حەمەداغا سوار دەبو، دەهات لەبۆ سابلاغی، پرسی بەحاکمی دەکرد" ماشەڵڵا چەن نادرم، بەتیپ‌و بەلەشکرم، پیاوێکی ساحێب نیوم، بەبێ ئەجەل نامرم، دەستم لەگەڵ بدەنێ، ئەز رێیەی لێ دەگرم.

مەجلیسی واهەڵدایە، بەگزادەو قارەمانی، گەر ئەمە لەشکری بکەین، وەك دەوری نەوشیروانی، دەڵێن شێخی لەگەڵە، پاك تەلاقن دەکەوێ، دەمرین بەبێ ئیمانی.

حەمەداغا سوار دەبو، قەرەپەپاغی گاز کرد، لەگەڵ وەردوی شێخی هات، تاجران خۆیان خەلاس کرد، لەهەموی هەڵات هەڵات، وەخرِ بو هەزار ملەت، خرنالە بەیتی دەکات، ئەگەر حاکم وای زانی، هیچ کەس لەسەری ناکات، دەس بەجێ حاکم هەڵات.

بابدەین دەنگی لەشکری، دەبا بین رەمك‌و پیران، زەرزا بین بەنادری، مەنگوڕو مامەش‌و پیران، گەورك ببنە لەشکری، خێلی فەیزوڵلا بەگی، بەگزادەو دیبوکری، ئەوها دەڵێ کاك هەمزە: پاك کاغەزم بدەنێ، سەبەب بەسبحەی رۆژی، کەس خەتای کەس نەگرێ. شێخ داوای مولکی دەکا، تا تەورێزیی دەگرێ.

تا تەورێزیم ئی وییە، یەکێك وا لەشارێیە، ئەو برای تاجر باشییە، حوجرەی نەکرد خورابیە، دەڵێ ئەو ئالایەی بەشێخییە، سابلاغییان دروست کردییە.

((لەلرفە لرفی ئالایە، تەماحی مالی دنیایە، زۆر بترسین لەدوایە، بێن وەگێڕن ئەو قەزایە.

هەمزاغا سوار دهەو، دە نۆکەران دەفکری، دە گورِە بدەن لەتەپلی لەگەڵ سبحەینێ تاو دەنگوت، دەورەی میاندواوی دەگرێ، هەمزاغای دەنەرِێنێ، سەلیم خانی چارداورو، وەك پوری دەچریکێنێ، لەگەڵ تفەنگی دەی هاوێت، لەخاڵی شێخی دەدا، لەزینی دەترازێنێ، وەك جەللاب دەبری سەری، وەك هەڵۆی دەرفێنێ.

فەسلێکی وا قەلماوە، هێندێك لەپیاوی شێخی،((کالە مونی))یان ناوە، جوابیان دێنا بۆ شێخی" یا شێخ خالێت کوژراوە، شێخ ئەوە گوێی خۆی لێیە. پیاوێکی خوێندەوارە، هەم مەلایە وفەقێیە: دەبرۆن لەو قسەی گەرێن، چبکەم کاری خودی‌یە، دەبرِێن رەدوای کەون، بزانن مەنزڵی لەکوێیە؟ ئاورێ بەردەنە شاری، بێت بەرۆژی حەشرییەت.

تەقە تەقی مارتینان، لەبلەسەی دە شەشخانان، چرپان چرپان پەیدا بو. لەکوچەو لەدالآنان، منداڵو خێزان قورێن، دەپەرِینە سەربانان، چەندیان عەجەم دەکوشتن، لەسەرباغو بێستانان، دەدەرێنن کلیلان، دەبشکێنن دوکانان، ئەتلەسو کیمخواو خارا، بۆ گاوانو شوانان.

لەو حەمەداغای مامەش، چەن پیاوێکی زۆرزانی، لەگەڵ عەجەمان یەکە، بەمەنگورِان غەیانی، لای بناوییەی لێ گرتن، بەری بەرەڵلا کردن، خلسی کردن کرمانی().

میاندواویش تالآن دەکرا، لەگەڵ بەری بەیانی، ئەو تالآنو ماڵی هات، پاکی تاقەت کراوە، یەکێك لەدیبوکریان، مینەی قادراغای ناوە، لەبنەبنەی سەهەندی تالآنو ماڵ گیراوە، بە وەش رازی نەدەبو، بەو حەرابەی کێشاوە.

نایبو مودەبیران لەتیلگرافیان داوە" سەلام لەشای ئێرانی، خەراپیان لێ قەوماوە، ئەو رەژیفرۆشی گەورکی، پاکی هاتو لەو لاوە، ئەو سەردەشتی وا دیوتە، ماڵ بەماڵی سوتاوە، ئەو عەجەمی میاندواوی، بەسیك بەریش نەماوە، شا دەڵێ ئەهوا ناکەم، بەقسەی تەنگۆ بروا ناکەم. ولآتی خۆ خەرا ناکەم.

لەو شێخەکەی چاو مەستە، سبحەینێ لەخەو هەستا، لەو شێخەکەی دە چاو مەست، کەتفەنگی گرت بو بە دەست، بانگی هەمزەی کرد لەقەست، هەمزە بلێند بۆ لەناوی، لەبریقەی زرییەو قەتلآوی، ئەو چەل دەچمە سەر بناوی"

هەمزاغا سوار دەبو، سوارەی برازای کەوتە دو.

هەمزە لەلی برازا، دەمانچەی پشتیم سازە، لێی دەن راوە بەرازە.

هەمزاغا خۆ دەخێوی، سەرتاپای خۆی دەبزیوی، رمبی لێ کردون، بەگەز، خاراو کیمخوای دەپێوێ...

(ئەمجارە بەیت بێژ بەقسە دەیگێرِێتەوە):

دەڵێ هەمزاغا گەڕاوە لەبناوی را، هاتەوە لەو وڵاتەی خۆی نەگرت، ڕۆیی بۆ سەرهەدی تورکیەی، لەوێ چوبو دەخاکی تورکیەیەوە، پادشای تورکیەی بە غەیانی زانی گرتی.

دەڵێ حەوت ساڵان لەئەستەموڵی گیرا، لەپاشان حەوت ساڵەی پادشای تورکیەی بەریدا. هاتەوە بۆ سەرە دی ئێرانی، ئەگەر هاتەوە بۆ سەرهەدی ئێرانی، شا وەزیرێکی لەو سابڵاغەی دادەنێ پێی دەڵێن((وەزیرە چرچە)) دنێرێ لەدوای دەڵێ: بۆخۆی بێ، شا خەڵاتی دەکا. وئەمن سوێندی بۆ دەخۆم ئەگەر شا هیچی پێ ناڵێتو لەگەڵ شای رێك کەوێتەوەو ئەمین بێتەوە لەوڵاتی.

جا دەڵێ هەمزاغا بەخۆی بەحەوسەد کەسیەوە هات لەحەلیاباتی ئەو لەشکرەی لەوێ بەجێ هێشتو هاتە خوار، وەزیرە چرچەش لەکن باغی شێخی لەسەر ئەو کەریزەی کەلێی بو لەوێ خێوەتی هەڵ دەدا، خێوەتێکی زۆر گەورە دەورەی خێوەتی هەمو دەکاتە مردە زینـدە. چەند سەرهەنگو یاوەرو گەورە گەورەش لەوێ دەخێوەتیدا دادەنیشن دەڵێ هەمزاغاش بەخۆیو بەچوار کادەرویشیانەوەو چوار نۆکەرانەوە لەسەر رادێتە خوارێ. دەگاتە پشت باغی شێخی توشی گاڕانی دەبێ. گاوانەکە دەڵێ: ئەرێ ئەتۆ هەمزاغا؟ دەڵێ: بەڵێ، ئەمن هەمزاغام. پێی دەڵێ: وەڵڵاهی هەمزاغا وەرە بەخاتری خولای مەچو، کوڕە وەڵڵاهی دەتکوژن. جوابی ناداتەوە دەڕوا، لەپاشان پیرێژنێك بەدوای گارانیدا دێ، ئەویش دەڵێ: ئەگەر ئەتۆ هەمزاغای وەرە پیاوی چابە بگەڕێوە. بەخودای دەتکوژن، هەمزاغا بەکاکەڵلای برای دەڵێ: وەڵلاهی کاکەڵلا ئەمن قسەی ئەو پیرێژنەیو ئەو گاوانەم لەدڵی چەسپیوە بو: وەڵلاهی دەگەڕێمەوە، دەچمەوە سەرهەدی. هەر هەزلو گیای وڵاتی دەخۆم، چ کارم بەدەوڵەتی نیە. دەڵێ کاکەڵلای گوتی: کورە ئەتۆ بەقسەی چ باوەڕی دەکەی؟ وەڵلاهی هەر دەچم. سواربون لەسەر را هاتنە خوارێ، گەیشتنە دەرکی خێوەتی. دابەزین. هەرچوار کادەروێشێکیان چون دەخێوەتیدا دانیشتن لەگەڵ وەزیریو لەگەڵ ئەو گەورە گەورانە. نۆکەرەکانیش لەدەرکی وڵاغیان بەچنگەوە راوەستان. دەڵێ هەمزاغا فکری لێ پەیدا بو. لەگەڵ وەزیرە چرچەی هەر قسەی دەکردن، وەزیر قورئانێکی چکۆلەی بەدەستەوە بو، چۆلەکێکیشی دە باغەڵی نابو، دەیگوت: هەمزاغا! هەتاکونی ئەو سەرە بەو بەدەنەیەوە بێ ئەتۆ هیچت پێ ناگوترێ، بەو قورئانەی.

دەڵێ دەو قسانەدا بۆ کەوەزیری دەستیدا ئافتاوەی وهاتە دەرێ، هەمزاغا شکی لێ پەیدا بون بەنۆکەرەکەی خۆی گوت: ئەو کالە شەمامە بەندیانە سوکن وەمنیان بدە. ئەتۆ ئەو کەوشو گۆریانەی من لەپێ کە کەدەڵی لینگێکی بۆ

داکەند دەپێی کرد، لینگەکەی دیکەی بۆ دە پێ نەکرا، تەقەی تفەنگێکی هات، هەمزاغا گوتی: کاکەڵلا ئەمن ئـەنگوام، تفـەنگێکیان لەپشـتی دام، کاکـەڵلا دەستیدا خەنجەریو هەڵیکیشا، لەهەر چوارلایان خێوەتیان هەڵبری، دایان گرتن. هەر یێکەی جوڵەی دەهات تفەنگێکیان لێ دەدان، دو کادەروێشێکانی دیـکەش دەرپەڕین، داپەڕین بۆ نێو شاری، دەستێك سەرباز لەژێللا هاتن ئەوانیان کوشتن.

چوار نۆکەرەکان هەڵاتنەوە بۆ کن حەوت سەد کەسی کەلەپشـت شـاری بـون لەحـەلیاباتی، خەبـەریان دانـی وەڵـلا حـاڵێکی ئـاوابو. هـەمزاغا کـوژراو کادەروێشێکیان هەمویان کوژران، ئەو حەوسەد نەفەرە لەوێ هەڵات.

سەری هەمزاغایان بڕی بردیان بۆ تاران بۆ خزمـەت شـای، شـا بـەڕانیدا دا گوتی: حەیف بۆ ئەو پیاوەی کوژرا، نەدەبا بتکوژبایە ئەوە دەمناردە سـەر وڵاتـی لوڕستانی ئەوێم پێ موستەخەر دەکرد، دەمکردە حاکمی وێ، حەیف بوو پیـاوەی کوژرا[٧٩].

**٨/٣ نظام السلطنة**

**نمونە ١٨:**

**حورمەتی کەلامولڵا: جەعفەر ئاغای شۆکاك(١٣٢٢)**

ئێلی شوکاك لەمێژ بو ناکۆك بون لەگەڵ کاربەدەستانی عەجـەم لـەورمێو تەورێز، سەرانی ئەم ئێلە سەربزێوییان ئەکردو، چونکە گەلێك لەسـەرۆکەکانیان بەقسەی خۆشی کاربەدەستان تەفرە درا بونو، ناجوامێرانـە کـوژرا بـون، هـەمو دوڕدونـگ بـون لەهـەمو گفـتو بـەڵێنێکی دەوڵـەت. عـەلی ئاغـای شـوکاك لەزینداندا مرد بو، محەمەد ئاغای کوڕیشی لەناوچەکانی سەرسنور، بـێ ئـەوەی گوێ بداتە کاربەدەستانی ئێرانی لەناو ئێلەکەی خـۆیدا ئـەژیا، محەمـەد عـەلی میرزا ولیعەهد، کەدوایی تر بـو بەشـای ئێـران لەتـەورێز والی بـو، لەپـەیجۆری کوشتنی ئەم پیاوە سەرکێشانەدا بو. سەرەنجام توانییان جەعفەر ئاغا بخەنـە نـاو داوو بیکوژن، ئەحمەدی کسروی تبریزی، خۆی شایەتی ئەم رووداوە بوە ئەگێڕێتەوە:

((ساڵی ١٢٨٤(١٣٢٣)محەمەد عەلی میرزا لەتاران لەجێگـەی مظفرالـدین شا نائیب ئەلسەڵتەنە بو، چونکە شا خۆی چو بو بۆ گـەڕانی ئـەورووپا. محەمـەد عەلی میرزا دوای ئـەوەی خـۆی چـو بـۆ بـەجێهێنانی کاروبـاری نائـب السـلطنە لەتاران، نظام السلطنە ی بەپێشکاری ئازەربایجان دانا.

لەو سەردەمەدا لەقافقاس گەرمەی جەنگی ئەرمـەنیو موسـڵمان بـو، ئـەو دەنگوباسانەی لەوێوە ئەهاتن تەورێزیان ئەهەژان، مەترسی هەڵگیرسـانی ئـاژاوە هەبو. نظام السـلطنە، جەعفەر ئاغای بۆ تەورێز بانگ کرد، بۆ ئـەوەی دڵنیاشـی

بکات قورئانێکی بەئیمزاو مۆری خۆیەوە بۆ نارد، چونکە هەم جەعفەر ئاغاو هەم محەمەد ئاغای باوکی لەگەڵ کاربەدەستان ناکۆك بون.

((نظام السلطنە، پارێزگاری ئاسایشی گەڕەکی ئەرمەنییەکانی بەجەعفەر ئاغا سپارد. ئەوانیش بەجلوبەرگی خۆیانەوە لەناو شاردا ئەسوڕانەوە. محەمەد عەلی میرزا لەتارانەوە بەتەلگراف فەرمانی بەنظام السلطنەدا، کەجەعفەر ئاغا بکوژێ. ئەویش پلانی کوشتنی بەم جۆرە دانا" محەمەد حسێنخانی ضرغام، کەیەکێ لەسەرکردەکانی سوارانی قەرەداغ بو، بانگی بکا بۆ سەراکەی خۆی، دەسوپێوەندەکانی خۆی هەمو چەکدار بکاو لەناو سەرادا دایان بمەزرێنێ، جەعفەر ئاغاش بۆ ئەوێ بانگ بکا.

جەعفەر ئاغا بەبێ دوڕدۆنگی چو بۆ ئەوێ، چەکدارەکانی خۆی لەخوارێ لەحەوشەکەدا بەجێ هێشتو خۆی بۆ بینینی نظام السلطنە بەپلیکانەکاندا سەرکەوت بۆ سەرێ. فەراشەکان، جەعفەر ئاغایان بۆ ژورێکی پچوك رێنوێنی کرد، لەکاتی دانیشتندا زرغام لەکلاو رۆژنەی ژورەکەوە کەدەس لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگ بۆی دانیشت بو، نیشانەی لێ گرتەوەو کوشتی. دەسوپێوەندەکانی بەدەنگ تەقەکانەوە، ئەمانیش بەتەقە کردن سەرکەوتن. فەراشەکان رایان کرد. کاتێ جەعفەر ئاغایان بەکوژراوی دی لەپەنجەرەی ژورەکەوە یەکەیەکە خۆیان هاوێشتە خوارێ، لەکۆڵانەکەوە بەدەم تەقەوە کەوتنە رێ. بەهەر کەس ئەگەیشتن ئەیان دایە بەرگوللەو، بەم جۆرە لەشار دەرباز بون. بەڵام چەکدارەکانی نظام، یەکێکیان لەناو حەوشەکەداو، یەکێکی تریشیان لەکاتی باز داندا لەپەنجەرەکەوە، لێ کوشتن. ئەوانەی هەڵاتن دەرباز بون. لاشەی کوژراوەکان" جەعفەر ئاغاو هەردو هاوڕێکەی، بەدەرگای عالی قاپودا سەرەوخوار چەند رۆژێ بۆ تەماشا کردن هەڵواسران)) [٨٠].

ارفع الدولە، سەفیری دەرباری قاجار لەلای بابیعالی لەئەستەموڵ ئەم داستانە بەمجۆرە تەواو ئەکا:

((رۆژێکیان توتنفرۆشێکی سەلماسی هات بۆ سەفارەتو تکای کرد بو من ببینێ. داوام کردو، هاتە مەکتەبەکەم وتی: ئەم رۆژانە بۆ بەدبەختی روداوێ قەوماوە کەئەگەر خواستە بکەوێتە ناو رۆژنامەکانی ئێرەوە بەتەواوی ریسوا ئەبین. وتی: لەم رۆژانەدا محەمەد ئاغای سەرۆکی ئێلی شوکاك لەگەڵ ژنو منداڵو کوڕ چەند کەسێ لەخزمەکانی هاتون بۆ ئەستەموڵ، رۆژی هەینی پاش رەسمی سەلام، ئەوانەیان بردۆتە کۆشکی یەلدز بۆ حوزوری سوڵتان. ژنی محەمەد ئاغا خۆی هاویشتۆتە بەر پێی سوڵتان، بەدەستێك قورئانو بەدەستەکەی تری کراسی

خوێناوی جەعفەر ئاغای کوڕی بەگریانەوە خستۆتە بەرچاوی سوڵتانو، وتویەتی: ((ئەم هەمو ڕێیەمان لەکوردستانەوە بۆ ئێرە بڕیوە بۆ دو مەبەست هاتوین" یەکەمیان ئەوەیە کەنظام السلطنەی حاکمی تەورێز حورمەتی کلام اللەی بەتەواوی نەگرتوە، قورئانی مۆرکردوەو سوێندی خواردوە کە کوڕەکەم بەسەلامەتی بەخەلعەتو پایەوە ئەنێرێتەوە، داوای کرد بچێتە تەورێز، لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بون، بەجۆرێکی زاڵمانە کوشتنی. مەبەستی دوەمی ئێمە ئەوەیە، کەئێوە بەچاوی خۆتان کراسی خوێناوی کوڕەکەم ببیننو خوێنی ئەو، کە لەئەنجامی باوەڕکردن بەکلام اللەدا بۆ تەورێز ڕژیشت، ڕژاوە لەنظام السلطنە بسێنێ. ئێوە پادشای ئیسلامو خەلیفەی پێغەمبەرن، ئەگەر ئێوە شکێنەرانی حورمەتی قورئان بەسزا نەگەیەنن، ئەبێ کێ بیکا؟ سوڵتان خەتو مۆری نظام السلطنە بەقورئانەکەوە ئەبینێ سەری سوڕ ئەمێنێ بەسەرۆکی تەشریفات ئەڵێ: بەوەزیری کاروباری ناوخۆ رابگەیەنێ، خانوو مەسرەفو کەرەستەی حەسانەوە بەوانە بدا، تا لەم کارە ئەکۆڵرێتەوە. ئێستەش بەو پەڕی ئاسودەییەوە لەخانویەکی حکومەتی‌دا دانیشتونو چاوەڕوانی فەرمانی سوڵتانن. وتم: ئەم هەواڵانەت لەکام سەرچاوە وەرگرتوە بەمنی ئەڵێی؟ وتی: بەرلەوەی بێمە ئەستەموڵ لەسەلماس دوکانی بەزازیم هەبو، کەسەکانی محەمەد ئاغا لەگەڵ من سەودایان ئەکرد، زۆرجار ئەهاتن بۆ دوکانەکەم، ئێستەش کەهاتون بۆ ئێرە ئەیان ویست منیش ببەن بۆ لای خۆیانو بەهۆی منەوە هەندێ شت لەبازاڕ بۆ خۆیان بکڕن. ئەم باسەم لەمحەمەد ئاغا خۆی بیستوە. وتم: بارەکەڵڵا، هەزار ئافەرین، ئێستەش کەوا بەراستگۆیی خزمەتی مەملەکەتەکەی خۆت ئەکەی محەمەد ئاغا پشت گوێ مەخە، بچۆ بۆ لای هەرچی لێ ئەبیستێ وەرە بەمنی بڵێ.

دو رۆژی‌تر هاتەوە وتی: محەمەد ئاغایان لەگەڵ کوڕەکەی بردۆتە بابیعالی بۆ لای صدری اعظم. سەدری اعظم پێی گوتون لەم وەختەدا دەوڵەتی عوسمانی بەچاکی نازانێ لەگەڵ دەوڵەتی ئێران بچێتە جەنگەوە، بەڵام بڕیاری داوە کە بەمحەمەد ئاغا خۆی هەمو جۆرە کۆمەکێك بکەن، چەكو پارەی بدەنێ بڕوات خۆی لەتەورێز تۆڵەی خوێنی کوڕەکەی لەنظام السلطنە وەربگرێ. ئەزانن محەمەد ئاغا بەتەنیا ئەم کارەی پێ ناکرێ. فەرمان بەهەمو ئاغایانی موسڵو وانو کوردستان ئەدەن، هەر کەمحەمەد ئاغا بەکۆمەڵەکەی خۆیەوە بەرەو ئازەربایجان جولا بەبیانوی هاومەزەبییەوە لەهەمو لایەکەوە بچن بۆ یارمەتی دانی. پلەی پاشایەتی بەمحەمەد ئاغاو پلەی میر ئالاییان بەکوڕەکەی داوە. محەمەد ئاغا ئێستە خۆی بەپادشاهی ئێلی شوکاك ئەزانێ.

دو رۆژی تر هاتەوە وتی: محەمەد ئاغا بەڕاستی خۆی بەپادشا ئەزانێ. پایەو جلوبەرگ بەچەند کەسی پیشەوەرو کولهەڵگری کورد ئەداو. لەهەر یەکەیان دە لیرە وییست لیرە وەرئەگرێو پلەی ئونباشیو سەرجوقەییان ئەداتێ. وتی من خۆم بەچاوی خۆم ئەو کەسانەم دی جلوبەرگی سوپایی گونجاو لەگەڵ پلەکەیان کڕیوەو شاردویانەتەوە بۆ کاتێ کە لەئەستەمولەوە ئەجولێن. لەبەرئەوەی دڵنیا بوم ئەم کابرایە درۆ ناکا، دەسبەجێ چوم بۆ لای فەرید پاشای صدری اعظم، بەدرێژی باسەکەم بۆ گێڕایەوە، سەری زۆر سوڕما، وتی تا ئێمە درێژەی ئەم باسە بەحزوری سوڵتان ئەگەیەنین، زۆر ئەخایەنی، خۆتان لێرەوە راستەوخۆ بڕۆن بۆ سەرای سەڵتەنەتیو، بەهۆی تەحسین پاشاوە باسەکە بەعەرزی سوڵتان بگەیەنە منیش وەهام کرد. سوڵتان فەرمانی دەسبەجێی بۆ وەزیری کاروباری دەرەوە سەرۆکی نەزمییە دەرکرد، مەئمورەکانی دەسبەجێ بڕۆن بۆ پشکنینیماڵی محەمەد ئاغاو، هەرچییەکیان دۆزییەوە بەعەرزی بگەیەنن. لەماڵەکەی محەمەد ئاغادا چەندین حوکمیان دۆزییەوە ئامادەیان کردبو بەکوردەکانی بفرۆشن، لەماڵی کوردەکانی تریشدا ئەو جلوبەرگە سوپاییانەی کڕی بۆیان لەگەڵ حوکمەکانیان دۆزییەوەو، هەواڵەکەیان گەیاند. فەرمان دەرچو هەمویان گرتنو، نازناوی پاشاییو میوئالاییان لێ سەندنەوە. ژنەکەی محەمەد ئاغایان نەگرت بو، خۆی هاوێشتە ماڵی شێخ ئەبو الهدیەوە بەست نشین بو. پاش مانگێ فەرمانی بەردرانی محەمەد ئاغاو هەمو کوردەکانی تر دەرچو، هەندێ خەرجییان دانێ تا بڕۆنو خۆیان بگەیەننەوە چەهریق))[٨١]

بەیتبێژێکی نەناسراو روداوی کوژرانی جەعفەر ئاغای کردۆتە گۆرانی، لەبەرئەوەی تێکستە ئەسڵییەکەی دەس نەکەوت، لێرەدا لەفارسییەوە ئەی هێنینەوە سەر کوردی:

((ئای، ئەی ئاغای لاو، کە لەچەهریقی رەنگینا دانیشتوی، ئەو شوێنەی لەناو دۆڵێکی قوڵ دایە، روبارێکی بەناوا ئەڕوا

نەخۆشی تاعون بڵاوبۆتەوە، ئومێدەوارم بچێتە ماڵی شازادە وەلیعەهدی ئێرانەوە! کەنامەیەکی بۆ باوکی گوڵزار نوسی بو: وەرە بۆ لام. لەبەرئەوەی کەئەو ساڵی رابردوو ساڵی پێشو تریش بۆخۆی نیمچە سوڵتانێ بو، ئەو ساڵە لەخاکی عەجەمستاندا مایەوە

ئای، ئەی ئاغای لاو!
تۆ ئەڵێی لەنگەری لەزەمیندا چەقیوی، درکی لەچاوی دوژمندا، تۆ پاشای ڕاستەقینەی بیابانی
ئای، ئەی ئاغای لاو ئاسمانو عەرشی بەرینی لەگەڵ ئێمە دوژمنە
باوکی بوزکو، سواری ریشان، کولکو قاپوتەکەی داناو بەرگی قاجاری لەبەرکرد، فانوسقەی ماوزەرەکەی کردە ملی
ئومێدەوارم نەخۆشی تاعون کە لەسەیرانە بکەوێتە ماڵی وەلیعهدی ئێرانەوە
ئەوانە دو گوللەیان نا بەلەشی باوکی بوزکو وە کەسواری ریشان بو، لەکاتێکا ئەویش سێ جار دەستی بۆ بشکوژی دەمانچە شەشتیرەکەی برد، بەڵام بێ هودە
ئەی ئاغا، مەگەر بەڵا هەر سێ رۆژ جارێ ئەبێ بەسەر جیهاندا بباری؟
هێزی یارمەتی لەباوکی بوزکو دورەو ئیتر بەو ناگا
لەتەورێزی کاول بودا جەژنەو شاییە، مژدەیان بۆ ساداتی کەربەلاش بردوە.
ئەی ئاغای لاو، تۆ کە لەناو سواران لەهەمویان ئازا تری. هەدە ئەگری. متهرە، ئەی ژنی بێچارە هەستە سەرپۆشێ بەسەرە جلەکانی باوکی بوزکودا بدە، تا تۆزو خۆڵی لێ نەنیشێ نەخۆشی تاعون کە لەسەیرانە، ئومێدەوارم بچێتە ماڵی وەلیعەهدی ئێران.
بڵێن لوقمانی حەکیم بێ برینەکانی قوڵت، زوخاویان لێ ئەتکێ
ئۆی، ئەی ئاغای لاو، ئەی لەنگەری زەمین، ئەی چقڵی چاوی دوژمن، ئەی پاشای بیابان!
هەڵڵا لەو ئاغای لاو، دڵم بۆ حاڵی ئەسوتێ. هەدە ئەقریشکێنێ. بەسەزمان متهرە!
خوایە تاعونێ کەئێستە لەسەیرانە بکەوێتە ناو ماڵی وەلیعەهدی ئێرانەوە!
ئەوانە دو گوللەیان نا بە باوکی بوزکوی سواری ریشانەوە. ئەو دەمە بۆ باوکی بوزکو کاتێکی تاڵو ناخۆش بو، بۆچی لەو کاتەدا تەمر ئاغاو سمایل ئاغا دەرنەکەوتن؟
مەگەر بەڵا ئەبێ هەرسێ رۆژ جارێ بەسەر ئەم دنیایەدا بباری، هێزی یارمەتی لەباوکی بوزکو وە دورەو نایگاتێ.
لەتەورێزی لەعنەتیدا چراخانە، مژدەیان بەساداتی کەربەلایش داوە)) [٨٢].

٤-چاخی پەهلەوی
١/٤ ئەمیر ئەحمەد
نمونە١٩:
تەئمینی رەزاشاییو، سەرانی ئێلاتی کورد

لەدوای نەمانی دەسەڵاتی شاهەکانی قاجارو هاتنە سەر کاری رەزا خانی پەهلەوی، هەمان نەریتی حوکمڕانی بەرامبەر مەزنەکانی کورد، پیڕەوی ئەکرا. سوپەهبود حسێن فردۆست، یەکێ لەکەسە هەرە نزیکەکانی شاە محەمەد رەزا پەهلەوی، لەیادداشتەکانیدا ئەنوسێ:

لەمەسەلەی سەرکوتکردنی کوردستاندا، ئەمیر ئەحمەدی بەناوی ئەمیر لەشکری نیروهای غرب ناوبانگی دەرکرد بو، لەپاش چەند ساڵ جەنگ، توانی هەندێ لەسەرۆکەکانی کورد بە((تەئمین))فریو بدا. سەرانی شۆڕشیی کورد لەئەمیر ئەحمەدی یان داوا کرد کە رەزا خان هەقی بەسەر ئەوانەوە نەبێو، ئەم مەسەلەیە لەپشتی قورئان بنوسێو ئیمزا بکا. هەرچۆن بێ شۆڕشی کوردەکان پاش چوار ساڵ جەنگ کۆتایی هات. ئەمیر ئەحمەدی وەکو(فاتیحی غەرب)) هاتەوە تاران. رەزا خان کردی بە((سوپەهبود))کەتەنیا سوپەهوبدی سەردەمی رەزا خان بو، وەپاش ماوەیەکی کورت تقاعدی کردو دوایی تر کارێکی بێ ئەهمیەتی پێ سپارد. بەڵام ئەمیر ئەحمەدی کە لەکوردستان خشڵی زێڕی زۆری کۆ کردبوەوە بەچەردەیەك لەو پارەیە توانی سامانی خۆی بگەیەنێتە ٥٠٠ خانوو، کەهەموی لەشەقامەکانو کۆڵانەکانی دەوری چوار رێی حەسەن ئاباد بو. ماڵی خۆیشی هەرلەوێ بو. بەنزیکبونەوەی کەوتنی رەزا خان. ئەمیر ئەحمەدی وەزعی باشتر بو، لەشەهریوەری ١٣٢٠دا بو بەفەرمانداری نیزامی تاران. لەسەردەمی محەمەد رەزا شادا سیناتۆر بو تا مرد.

تقاعدکردنی ئەمیر ئەحمەدی لەدوای فەتحی غەرب هەر لەبەرئەوە بو کەئەو لەئێران دا جگە لەرەزا خان، هیچ ئەستێرەیەکی تر نەدرەوشێتەوە، بەڵام رەزا خان گوێی نەدایە ئەو پارەیەی ئەمیر ئەحمەدی لەکوردستان کۆی کرد بوەوە.[٨٣]

[1] توسکارمان، تحفەی مظفریە، ساخکردنەوەو هێنانەوەی بۆ سەر رێنوسی کوردی: هێمن،(بەغداد: کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٥)، ل٢٠٩-٢١٧.
[2] د. عبدالحسین نوائی، شاه اسمعیل صفوی،(تهران: ارغوان، ١٣٦٨ش)، ل٣١" رحیم زادەی صفوی، زندگانی شاه اسمعیل صفوی، باهتمام یوسف پور صفوی،(تهران: کتابفروشی خیام، ١٣٤١ش)، ل٢٧١.
[3] د. نوائی، شاه اسمعیل.. س ن، ل٣٢-٣٣" رحیم زاده صفوی، س، ن، ل٢٧٢.
[4] امیر شرف خانی بدلیسی، شرفنامە، بکوشش محمد عباسی، چ٢،(تهران: علمی، ١٣٦٤ش)، ل٢١٧، ٢١٨
[5] هـ س، ل٥٣١-٥٣٢
[6] هـ س، ل٢٧٣-٢٧٤.
[7] تاریخ عالم ارای صفوی، بکوشش یداللە شکری، چ٢،(تهران: مؤسسە اطلاعات، ١٣٦٣ش)، ل١٠٣-١٠٨.
[8] رحیم زاده صفوی، س ن، ل١٧٦.
[9] هـ س، ل١٧٧-١٧٨.
[10] هـ س، ل١٩٤.
[11] هـ س، ل١٩٣-١٩٩" مجموعة من الاساتذة، العراق في التاريخ،(بغداد: دار الحرية، ١٩٨٣)، ل٥٦٤-٥٦٦" المحامی عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٣، ط٢،(قم: منشورات الشريف الرضي، ١٤١٠ق/ ١٣٦٩ش)، ل٣٢٦-٣٣٠.
[12] عالم ارای صفوی، ص١٢٤-١٢٦.
[13] بدلیسی، س ن، ص٥٣٧-٥٣٩.
[14] نوائی، س ن، ل١٧٩.
[15] هـ س، ل٢٢٥.
[16] هـ س، ل٢٢١.
[17] هـ س، ل١٧٧.
[18] دەربارەی ژیانی شاه محمد خودا بەندە، بڕوانە: د.عبدالحسین نوائی، شاه عباس، ج١و٢ ،(تهران: زرین، ١٣٦٧ش)، ل٣-٢٨" نصراللە فلسفی، زندگانی شاه عباس، ج١و ٢، چ٤،(تهران: انتشارات علمی، پائیز ١٣٦٩ش)، ل٦٣-١٧٣.
[19] بۆ تێکستی تەواوی نامەکە بڕوانە: نوائی، شاه عباس، ج١و ٢، ل٤٣-٦٣.
[20] اسکندر بیگ ترکمان، عالم ارای عباسی، ج٢،(تهران: امیر کبیر، ١٣٥٠ش)، ل٧٩١-٨٠١، وەرگێڕانی کوردی: هێمن، تحفەی مظفریە.
[21] اسکندر بیگ ترکمان، س ن، ل٨١١-٨١٤، وەرگێڕانی کوردی: هێمن، تحفەی مظفریە.

[22] توسکارمان، س ن، ب١، ل٢٠١-٢٢١.
[23] بدلیسی، س ن، ل ٣٧٢-٣٨٢.
[24] اسـکندر بـیـگ ترکمـان، ل٨١١-٨١٤، وەرگێڕانـی کـوردی، هـێمن راگـوێزراوە لـە: توسکارمان، تحفەی مظفریە، ب١، ل٥٩-٦٥.
[25] بۆ ژیانی شاە سولتان حسێن بڕوانە: مهدی بامداد، شرح حـال رجـال ایـران، ج٢،(تهـران: زوار، ١٣٤٧ش)، ل ٨٠-٨٦" محمد هاشم اصف(رستم الحکما)، رسـتم التـواریخ، بـە اهتمـام محمد مشیری، چ٣،(تهران: امیر کبیر، ٢٥٣٧)" لارنس لکهارت، انقراض سلسلە صفویە، ترجمـە مصطفی قلی عماد، چ٢(تهران: مروارید، ١٣٦٤ش)، ص ٤٠-٥٠.
[26] رستم الحکما، س ن، ل٧٠-٧١.
[27] هـ ج، ص٧٥.
[28] کلودیوس جیمس ریچ، رحلە ریچ الی العراق في عام ١٨٢٠، ترجمة بهاءالدین نوری،(بغداد: ١٩٥١)، ص١٩٩-٢٠٠.
[29] العزاوی، س ن، ج٥، ل١٣٠-١٣١.
[30] هـ س، ل١٤٢
[31] د. عبدالحسین نوائی، اسناد ومکاتبات سیاسی ایران از ١١٠٥ تـا ١١٣٥ هــ ق.(تهـران: مؤسسە مطالعات و تحقیقات فرهنگی، ١٣٦٣)، ص١٢٧-١٣٠.
[32] مستورە، تاریخ اردلان، بەاهتمام ناصر ازاد پور، چاپخانە بهرامی، ص٥٩-٦٢" شـیخ محمـد مردوخ کردسـتانی، تـاریخ کـردو کردسـتان، کتابفروشـی غریقـی، چ٣، ج٢، ص١١٢-١١٣. سالّی شەڕ وقەتلوعامەکە لەهەر یەکێکیاندا بەجۆرێکی جیاواز لەوی تر نوسراوە، بـەگوێرەی شیعرێ کەبەو بۆنەیەوە دانراوەو، لەپەراوێزی مێـژوە چـاپکراوەکەی مەسـتورەدا نوسـراوەتەوە، ئەبێ سالّی ١١١٣بێ.
[33] مستورە، هـ ج.
[34] هامر پورگشتال، تـاریخ امپراطـوری عثمـانی، ترجمـە مـیزا زکـی علـی ابـادی، بـەاهتمـام جمشید کیانفر، ج٤،(تهران: زرین بهار١٣٦٨)، ص٣٠١٠.
[35] مستورە، س ن، ل٦٢.
[36] هامر، س ن، ل٢٨٨٣.
[37] لکهارت، س ن، ل ٣٣٢.
[38] بدلیسی، س ن، ل٤٦٧-٤٦٨.
[39] العزاوي، س ن، ج٥، ل١٨٨" مستورە، س ن، ل٣٦-٣٩.
[40] العزاوي، س ن، ل٢٥٤. ئەمیش رای گوێزراوە لە: حدیقة الزوراء، ص١٤٤.
[41] عبدالرزاق دنبلی، ماثر سلطانیە، بە اهتمام صدر افشـار، چ٢(تهران: ابن سینا، ١٣٥١ش) ص٢٦٢.
[42] بامداد، س ن، ج٦، ل١٩-٢٠" عبـدالرزاق دنبلـی، س ن، لاپـەڕەکانی: ٥٦و ١١٢و ١٦١و ١٧٢و ٢٠٧و ٢٦٣و ٢٧٥.

[43] میرزا رشید ادیب الشعرا، تاریخ افشار، بکوشش محمود رامیـان- پرویـز شـهریار افشـار، (تبریز، چاپخانه شفق، ١٣٤٦ش)، ل١٨٩-١٩١.
[44] توسکارمان، س ن، ب٢، ل٧٤٢-٧٥٩.
[45] سعید نفیسی، تاریخ اجتماعیو سیاسی ایران در دوره معاصر، ج١، ص١٩٥" بامـداد، س ن، ج٢، ل٣٣٦-٣٣٧.
[46] میرزا رشید، س ن، ل٣٥٩-٣٦١.
[47] هـ س، ل٣٦٦-٣٧٠
[48] دەربارەی ژیانی عەباس میرزا بڕوانە: بامداد، س ن، ج٢، ل٢١٥-٢٢٢.
[49] بۆ تێکستی تـەواوی پـەیمانی گولسـتان بڕوانـە: نفیسـی، س ن، ج١، ل ٢٥٤-٢٦١" بـۆ پەیمانی تورکمان چای بڕوانە: هـ س، ج٢، ل ١٧٩-١٨٤.
[50] نفیسی س ن، ج٢، ل٢٠٧-٢١٠.
[51] د. محمد رضا نصیری، اسناد ومکاتبات تاریخی ایران: قاجاریـه، جلـد٢، (تهـران: کیهـان، بهار ١٣٦٨ش)، ج١، ص٥٥.
[52] هـ س، ج٢، ل٩٦.
[53] هـ س، ل٢٣٤.
[54] غلامحسین میرزا صالح، اسناد رسمی در روابـط سیاسی ایـران بـا انگلـیسو روسو عثمـانی، ج١،(تهران: نشر تاریخ ایران، ١٣٦٥ش) ص٢٤٧.
[55] هـ س، ل٢٤٨-٢٥٠.
[56] هـ س، ل٢٥٣.
[57] بدلیسی، س ن، ل٣٥٢-٣٦٢.
[58] دەربارەی میری سۆران محمد بەگ بڕوانە: حسین حزنی، مێژووی میرانی سۆران، چ٢، هـەولێر، ١٩٦٢" محمـد امـین زکـی، کـوردو کوردسـتان، ج٣، ل٤٠١-٤٠٤" د. جـەلیلی جـەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وەرگێڕانی د. کاوس قەفتان، بەغـداد، ١٩٨٧، ل ١٣٣-١٦٣.
[59] بامداد، س ن، ج ٣، ل٢٤٥-٢٤٦.
[60] العزاوي، س ن، ج٧، ل٣٢
[61] نصیری، س ن، ج٢، ل١٢٧-١٢٩.
[62] میرزا صالح، س ن، ج٢، ١٤٤
[63] هـ س، ل١٤٥-١٤٦.
[64] سید بدرالدین یغمائی، منشات قائم مقام فراهانی، (تهران: شـرق، پـائیز ١٣٦٦ش)، ص ٨٩.
[65] واحد نشر اسناد، گزیـده اسـناد سیاسـی ایرانو عثمـانی، ج١، (تهـران: دفـتر مطالعـات سیاسی، بین المللی، ١٣٦٩ش) ص٥٢٩-٥٣٠.
[66] العزاوي، س ن، ل٣٤

[67] میرزا شکرالله سنندجی(فخر الکتاب)، تحفه ناصری، بەاهتمام د. حشمت الله طبیبی، (تهران، امیر کبیر، ١٣٦٦)، ص ٢٧٦. مردوخ س ن. ل١٧٨
[68] هـ س، ل٢٨١-٢٨٤
[69] اسماعیل نواب صفا، شرح حال، فرهاد میرزا معتمد الدوله، (تهران، ١٣٦٦)، ص ٢٠.
[70] شرح حال عباس میرزا ملك ارا، بەکوشش د. عبدالحسین نوائی، چ٢، (تهران: بابك، ٢٥٣٥)، ص ١٥٦-١٥٨.
[71] میرزا رشید، س ن، ل٥٠٤.
[72] هـ س، ل ٥٣٢.
[73] بڕوانە: لێکۆڵینەوەی کۆمیتەی هاوبەشی عوسمانی- ئێرانی لەهەمزاغا لە٢٢ی محرمی ١٢٨٧ لەزینـدانی بەغـداد، گزیدەی اسناد سیاسی ایران و عثمانی، ج٢، ل٦٢١-٦٢٣" هەروەها دەسخەتی ناصرالدین شا دەربارەی راکردنی هەمزاغاو کوشتنی کوڕەکەی، هـ س، ل٦٨٣.
[74] اسکندر غوریانس، قیام شیخ عبیدالله شمزینی در کردستان، بەاهتمام عبدالله مردوخ، (تهران: دنیای دانش، ٢٥٣٦)، ل١٥.
[75] هـ س، ل١٧-١٩.
[76] میرزا رشید، س ن، ل٥٧١-٥٧٢.
[77] علی دهقان، رضائیة یا سرزمین زردشت، (تهران: ابن سینا، ١٣٤٨)، ل٤١٠
[78] فرهنگ معین، ص ١٦٩٨.
[79] سەید عەبدوڵلا سەمەدی، بەیتی هەمزاغای مەنگوڕ، سروە(گۆڤار) ژمارە ٢٨ تا ٣٢، خەزەلوەری ١٣٦٧ تا رەشەمێی ١٣٦٧: ابراهیم افخمی، قیام ملا خلیل و رد فرمان رضا خان، (سقز: انتشارات محمدی، تابستان ٦٨)، ص ١٠٥-١١٠.
[80] احمد کسروی، تاریخ مشروطه ایران، چ ١٤، (تهران: امیر کبیر، ١٣٦٣)، ص ١٤٣-١٤٥" مامۆستا سجادی ئەم رووداوەی کردۆتە کورتە چیرۆکێکی ئەدەبی بڕوانە: علاءالدین سجادی، هەمیشە بەهار، بەغداد، چاپخانەی مەعاریف، ١٩٦٠.
[81] پرنس ارفع الدوله، ایران دیروز،(تهران: ١٣٤٥ش)، ص ٤٣٣-٤٣٥
[82] واسیلی نیکیتین، کردو کردستان، ترجمه محمد قاضی، (تهران: نیلوفر، تابستان ١٣٦٦)، ص ٥٤٦-٥٤٨.
[83] حسین فر دوست ظهور و سقوط سلطنت پهلوی، خاطرات ارتشبد سابق حسین فر دوست، بخش اول، چ٢.

## ٣-سەرەتای خەملینی هۆشی نەتەوەیی کورد

### ١-راپەرینی ١٨٨٠

### ١/١رونکردنەوەی هەندێ وشە

زاراوەکانی نەتەوە، هۆشی نەتەوەیی، بزوتنەوەی نەتەوەیی، دەوڵەتی نەتەوەیی، دەسکەوتی نەتەوەیی، ئامانجی نەتەوەیی، توانای نەتەوەیی، دەوڵەت- نەتەوە، نەتەوە-دەوڵەت، ئەگەرچی تائێستەش نوسەرانی رۆژئاوا لەسەر تەعریفی دیاریکراوی بەتەواوی رێک نەکەوتون، بەڵام لەبیری نوسەرانی ئەواندا چوارچێوەیەکی گشتی هەیە کە لەتەجروبەی تایبەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی گەلانی ئەوروپاوە دەرهێنراوە.

لەدنیای سێیەمدا ئەم زاراوانە ئالۆزییان تێ دایە، چونکە رەوتی گەشەکردن لەئاسیاو ئەفریقاو ئەمریکای لاتینیدا رێگەیەکی جیاوازی لەهی ئەوان پێواوە، ئەگەر لەزۆربەی ولاتانی ئەوروپیدا" دەوڵەت یەکەی سیاسی نەتەوە بێو، یەکگرتنی نەتەوە دەوڵەتی پێك هێنابێو، نەتەوە بەواتای دانیشتوانی دەوڵەتێك بەکاربهێنرێ، ئەوا لەم ولاتانەدا بەهۆی جیاوازیی جۆری گۆڕانو گەشەکردنی هەلومەرجی ئابوری، کۆمەلایەتی، سیاسی، فەرهەنگییەوە لەهەمو شوێنو هەمو جار هەمان تەعریف ناگونجێ لەگەڵ راستییەکانی ژیانی ئەم ولاتانەدا، چونکە دەوڵەت هەیە چەند نەتەوەی تێدایە، دەوڵەتی دو نەتەوە دەوڵەتی یەك نەتەوە، نەتەوەی بێ دەوڵەت. نەتەوەی دابەشکراو بەسەر چەند دەوڵەتدا هەیە. نەتەوەیەك خاوەنی چەند دەوڵەتو، نەتەوەیەك بێ هیچ دەوڵەت.

ئەگەر پێوانەی ناوهێنانی تاقمێکی مرۆڤایەتی گەورە بە نەتەوە بەند بێ بەهەبونی دەوڵەتەوە، ئەوا هەندێ لەو گەلانە ئەبێ بەنەتەوە دانەنرێن

کەیەکێکیان کوردە. ڕەوتی گەشەکردنی گەلان بەرەو توانەوە لەبۆتەی نەتەوەدا لەهەندێ ڕووەوە ئەگەر هەندێ لەیەکچونی تێدابێ، وەڵام بێ گومان چونکە هەر نەتەوەیەك ڕێگەی گۆڕان‌و گەشەکردن‌و پێگەیشتنی تایبەتی خۆی پێواوە ئەوا هەندێ لەیەك نەچونیشی تێدایە. بۆیە ئەو زاراوانەش هەریەکەیان خۆی لەزەمان‌و زەمینی دیاریکراوی خۆیدا ناوەڕۆك‌و تێگەیشتن‌و مانای تایبەتی خۆیان هەیە.

## ٢/١ ئیسلام‌و دەوڵەت

ئیسلام وەکو ئایدیۆلۆجییەکی ژور- نەتەوەیی هاتە دنیاوە، هەوڵیدا گەلانی دنیا بەزۆری چەك بەبێ جیاوازی زمان، ڕەگەز، ڕەنگ.. لەسەر بنچینەی بڕوا هێنان بەیەکێتی خواو پەیامی محەمەدو ڕێوشوێنەکانی ئیسلام، لەچوارچێوەی یەك دەوڵەتدا لەژێر سێبەری یەك دەسەڵاتی سیاسیدا، یەك بخات، پێکهێنانی دەسەڵاتی سیاسی جیاجیای سەربەخۆی لەسەر بنچینەی جیاوازیی ڕەگەز، زمان ڕەنگ.. لەگەڵ بۆچونی فەقیهەکانی ئیسلام نەئەگونجا. فەقیهەکانی ئیسلام نەئەگونجا، فەقیهەکانی ئیسلام دنیایان کرد بوە دو قەڵەمڕەو" یەکێکیان قەڵەمڕەوی((دار الاسلام))کە((دار السلام)بو، وە ئەبو دەوڵەتی هەمو موسڵمانان بێ بەبێ جیاوازی نەتەوەیی‌و، ئەوی تریان، قەڵەمڕەوی((دار الحرب))کە((دار الکفر))بو کەوت بوە دەرەوەی سنوری دەسەڵاتی خەلیفەی کاربەدەستی دار الاسلامەوە.

(امیر المؤمنین))و کاربەدەستانی دارالاسلام ئەبو لەتەقەلایەکی بەردەوامدا بن بۆ سازدانی موسڵمانان لەپێناوی جیهادا بۆ فراوان کردنی سنوری قەڵەمڕەوی دارالاسلام‌و تەسك کردنەوەو داگیرکردنی قەڵەمڕەوی دار الحرب، دابڕینی بەشی لەقەڵەمڕەوی دارالاسلام بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی جیاوازی سەربەخۆ لەدەسەڵاتی خەلیفە-سوڵتان لەسەر بنچینەیەکی نەدینی بە(لەدین دەرچون)ئەژمێردرا، کەئەبو بەزۆر بهێنرێتەوە ژێر باری فەرمانبەریی، ئیمپراتۆریی عەرەبی- ئیسلامی لەسەردەمی سەدری ئیسلام، ئەمەوی، عەباسیدا لەسەر ئەم بنچینەیە دامەزرا بو، دوایی تریش ئیمپراتۆریی تورکی- عوسمانی پێڕەوی هەمان ڕێبازی کردوە، هەڵوێستی عوسمانی لەحکومەتی ئەفغانی نمونەیەکی ئەمەیە.

کاتێ ئەفغانیەکان دەستیان بەسەر ئێراندا گرت‌و ئەشرەف هەوڵیدا دانپیانانی شەرعی سوڵتانی عوسمانی بەدەس بهێنێ‌و، بۆ ئەو مەبەستە چەند

نامەیەکی بۆ نوسین، لەئەنجومەنێکی فراوانی موفتیو مەلا گەورەکانو کاربەدەستانی عوسمانیدا، موفتی بەمجۆرە فتوای دا:

پرسیار: ئایا قوبولکردنی حکومەتی دو ئیمام لەیەك کاتدا جائیزە یا نە؟

وەلام: هەمو فەقیهەکان لەسەر ئەوە رێکن" دو ئیمام لەپاڵ یەکتریدا ناتوانن حکومەت بکەن، ئەبێ کۆسپێ یا لەمپەرێکی گەورەی وەکو موحیتی هیندستان لەبەینیاندا هەبێ.

پرسیار: کەواتە ئەگەر هەمو موسوڵمانان خزمەتو گوێڕایەڵیی ئەعلا حەزرەت، سوڵتانی هەردو دەریاو زەمین، ئەوەی گەورەترین سوڵتانەکانو ئیمامانی یەکەمو، ئەفروتوناکەری هەمو ئەهلی بیدعەت کرد، ئەگەر نەکیرەیەکیش بەزوڵم و فێڵ دەستی گرت بەسەر ناوچەکانی ئەسفەهاندا بەبیانوی ئەوەی کە موتەعەلیقاتی محەللی مەغزوبەو فەتح کراوی ئەوەو، ئەگەر ئەو کەسە ئیدیعای ئیمامەتی بکاو هەندێ لەموسڵمانان بۆی بسەلمێنن، نێردراو بەنامەیەکەوە بۆلای ئەعلا حەزرەت سوڵتان بنێرێ، غروری بەئەندازەیەك بێ لەئەعلا حەزرەت خەلیفە، خوداوەند پایەکانی دەوڵەتەکەی پایەدارو راگرتو بکا، ئیدیعای گێڕانەوەی ویلایەتو مەمالیکی بکا کەسەربازانی سەرکەوتو لەرافزی ئێرانیان گرتوە، حوکمی عادلانە دەرهەقی ئەو کابرایە چیە؟

وەلام: ئەو کابرا نەکیرەیە یەکێکە لەیاخییان ئەبێ لێبخرێ، ئەگەر دەستی هەڵگرت لەئیدیعا سەفیهەکانی خۆیو ملیدا بۆ گوێڕایەڵی وبەندایەتی سێبەری خوا لەسەر ئەرز زۆر باشە، ئەگەر سور بو لەسەربێ ئیتاعەتیو سەرکێشی، حوکمی ئەوە خوداوەندی مەجید لەقورئاندا فەرمویەتی((ئەگەر دەستەیەك بەموخالەفەتی دەستەیەکی تر راپەڕین، یاخیەکان بکوژن تا ئەبنە گوێڕایەڵی خودا))بەپێی حەدیس کەئەفەرموێ((ئەگەر دو ئیمام بەیەك جار ئیدیعای ئیمامەتیان کرد، یەکێ لەو دوانە بکوژن))[1].

دەوڵەتی عوسمانی بو سەلماندنی((شرعیە))تێ بونو دەسەڵاتی ئایدیۆلۆجیی ئیسلامی کردە ئاڵای لەشکرکێشیو دەس گرتن بەسەر هەمو ناوچە موسوڵمان-نشینەکانی ئاسیاو ئەفەریقاو، جیهاد بۆ داگیرکردنی هەمو ناوچە مەسیحی-نشینەکانی ئەوروپا.

خێڵە کوردەکان، پاش ئەوەی نیشتیمانەکەیان لەلایەن هێزی عەرەبی-ئیسلامییەوە لەقەرنی حەوتەمدا فەتح کرا بە کۆمەڵ موسوڵمان بونو

نیشتمانەکەیان بو بەبەشێکی قەڵەمڕەوی دارالاسلامی عەرەبی- ئەمەوی‌و عەبباسی‌و_ دوایی تر تورکی- عوسمانی. کورد بەدرێژایی زەمان، نەیتوانی وەکو گەلەکانی تری ناوچەکە: عەرەب، تورك، فارس، تورکمان، ئەرمەن... دەوڵەتی تایبەتی خۆی پێك بهێنێ، بەڵکو لەچوارچێوەی ئەو ئیمپراتۆرییانەدا بەگوێرەی بەهێزی‌و لاوازی دەسەڵاتی ناوەندیی دینی- سیاسی شام، بەغداد، ئەستەموڵ، ئەمیرنشینە خۆجێییەکانی کورد بەپچڕپچڕی کەم یا زۆر لەکوردستاندا لەناو قەڵەمڕەوی دارالاسلام دا لەژێر دەسەڵاتی روکەشی خەلیفە- سوڵتاندا ماوەتەوە.

ئیمپراتۆریی سەفەوی- ئێرانی کەهەوڵی زیندوکردنەوەی سەرلەنوێی((شاهان شاهێتی))دێرینەی ئێرانی تەدا، ئەویش بۆ سەلماندنی شەرعییەتی بونی دەسەڵاتی خۆی ئایدیۆلۆجیی ئیسلامی کردە ئالای هەوڵ دان بۆ داگیرکردنی ناوچە موسوڵمان- نشینەکانی ئاسیا. وە بۆ سەربەخۆبونی خۆی لەدەسەڵاتی دینیی- سیاسی دەوڵەتی عوسمانی، شیعە" واتە مەزەبێکی جیاواز لەمەزەبی سوننەی عوسمانیەکانی کردە دینی رەسمی خۆی. دو دەوڵەتی ئیسلامی ناکۆك دروست بون. ماوەی چوار قەرن لەململانێ‌دا بون.

کوردستان کەچەندین میرنشینی خوجێیی نیمچە سەربەخۆی تێدا دامەزرا بو، بەڵام لەدوای یەکەمین شەڕی عوسمانی- سەفەوی لەچالدێران(١٥١٤)بەگوێرەی سەنگی تەرازوی هێزەکانی ئەم دو دەوڵەتە دابەش بو. میرنشینەکانی لای رۆژئاواو سەرو وخواروی کوردستان چونە ژێر دەسەڵاتی روکەشی عوسمانی‌و میرنشینەکانی رۆژهەڵاتیشی کەوتنە ژێردەسەڵاتی سەفەوییەوە، بێ ئەوەی هیچ کامیان بەتەواوی ئۆتۆنۆمی خۆیان لەدەس بدەن.

## ٣/١ کوردستان لەژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی رۆم‌و عەجەم‌دا[٢]

لەچارەکی دوەمی قەرنی نۆزدەهەم‌دا، لەلایەکەوە بابیعالی هەمو میراتییە ئۆتۆنۆمەکانی کوردستانی عوسمانی" بتلیس، هەکاری، بۆتان، سۆران، بادینان، بابان‌و، لەلایەکی تریشەوە دەرباری قاجار میراتییە ئۆتۆنۆمەکانی کوردستانی ئێرانی" ئەردەلان، لورستان، موکریانیان تێك داو، دەسەڵاتی ناوەندیی رۆم‌و عەجەمیان تێ‌دا دامەزران.

لەم سەردەمەدا گەلانی ئەوروپی لەمەیدانی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی، سوپایی.. دا بەخێرایی لەپێشکەوتن‌دا بون، ((نەتەوە))ئەبوە

بنچینەی دروست کردنی دەوڵەتی نوێ. نوێنەرایەتی خەڵك لەژیانی سیاسی دەوڵەتدا سیاسی دەوڵەتدا زیادی ئەکرد. بەڵام لەو کاتەدا داوودەزگاکانی عوسمانیو ئێرانی تا ئەهات لەخەڵك زیاتر دور ئەکەوتنەوە، زیاتر بەرەو زۆرداریو داهێزرانو داوەشین ئەچون. دەوڵەتانی ئەوروپا ئەرزی فراوانیان لێ داگیرئەکردن و پەیمانی نابەرامبەرو سەختیان بەسەردا ئەسەپاندن. هەردو دەوڵەت کەوت بونە ژێرباری قەرزی گرانو نفوزی روخێنەری دەوڵەتانی زەنگینو بەهێزی ئەوروپییەوە، نابوتیو زۆرداریو فەسادو بەرتیلخۆری لەسەرەوە تاخوارەوەی داوودەزگاکانیان تەشەنەیان کردبو، ئەوانەی پلەوپایەی کاروباری دەوڵەتو خەڵکیان پێ ئەسپێردرا، شوێنەکانی خۆیان بەنرخی گران لەکاربەدەستە نزیکەکانی بابیعالیو دەربار ئەکڕی. ئیتر((دار الاسلام))و((دار الكفر))نە بەکردەوەو، نەلەڕوی تیۆرییەوە بایەخێکی نەما بو.

لەناوبردنی دەسەڵاتی میرە کوردەکانو دامەزراندنی داوودەزگای دەسەڵاتی ناوەندیی رۆمو عەجەم لەجێی ئەوان، سەرەڕای ئەوەی دەسەڵاتو ئیمتیازاتی لەچینی سەرەوەی کۆمەڵی کورد زەوت کرد، باری ژیانی خەڵکیشی لەجاران خراپو ناخۆش تر کرد. کاربەدەستانی رۆمو عەجەم لەباتی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی نوێی کارامە، دادگا، بەشداری خەڵك لەژیانی گشتیدا، رێگاوبانی نوێ، نەخۆشخانە، قوتابخانە، کارگا، زانستگا، چاپخانەو رۆژنامە... زوڵمی زۆرتریان لەگەڵ خۆیان هێنایە ناو کوردستانەوە[3].

١-کاربەدەستانی نەناسراوی زۆردار لەجیاتی کاربەدەستانی ناسیاوی خۆجێی.

٢-دامەزراندنی قەڵاو پاسگا بۆ روتاندنەوەی خەڵكو ئۆردوگا بۆ هێزە داگیرکەرە سەرکوتکەرەکان.

٣-زیادکردنی رادەی باجو سەرانەو بەرتیل.

٤-گرتنو دورخستنەوەو کوشتنو تاڵان کردنی بێ لێپرسینەوە.

٥-رەشبگیری لاوان بۆ سەربازیی بێ گەڕانەوە.

بەم پێیە گۆڕینی دەسەڵاتی دەرەبەگە کوردەکان بەدەسەڵاتی داگیرکەری رۆمو عەجەم کەبە لەشکرکێشی گەورەی درێژخایانو شەڕو تێکهەڵچونی خوێناوی کرا بو، وە بەهێزی چەکداری سەرکوتکەریش ئەپارێزرا، نەك بۆ پێشەوەچونی لەژیانی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگیی... خەڵکی کوردستاندا بەدی نەهێنا، بەڵکو باری زۆرلێ کردنی ئابوریو کۆمەڵایەتی قورس تر کرد،

چەوسانەوەی نەتەوایەتیشی هاتە سەر، بگرە لەژێر سایەی دەرباری قاجاردا چەوسانەوەی مەزهەبییش بوە سەرباری.

ئەگەر لەسەردەمی شەرەف خان(١٥٤٣-١٦٠٤)و دوایی تر لەسەردەمی ئەحمەدی خانیدا(١٦٥٠-١٧٠٧)هەستی خۆ بەبێگانە زانین لەرۆمو عەجەم، هەستی خۆ بەکورد زانین، هەستی پێویستی یەکبونو پێکهێنانی دەوڵەتی کوردیی سەربەخۆی بەهێز، کە کوردو کوردستان لەدەسدرێژیو ململانێی نارەوای ئەو دو هێزە بێگانەیە بپارێزێ، وەکو بیرو ئاواتی کەسانێکی بلیمەت لەدو توێی((شەرەفنامە))و((مەمو زین))دا مایەوە، لەبەر نەگەیشتنی هەلومەرجی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگیی... کۆمەڵی ئەوسای کورد نەبو بەئایدیۆلۆجیای چینی هەڵبژاردەی کۆمەڵ، وەنەیش بو بەخواستی خەڵكو بزوتنەوەی جەماوەر. وە لەنیوەی یەکەمی قەرنی ١٩هەم دا بەکردەوەی پچڕپچڕو ناتەواوو لەیەك دابڕاو لەتەقەللا ناوچەییەکانی میرەکانی بتلیس، بابان، سۆران، بۆتاندا دەنگی دایەوە. بەڵام لەدواچارەکی قەرنی ١٩هەمدا، هاوزەمان لەگەڵ سەرکەوتنی ئاڵمانو ئیتالیا لەپێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی یەکگرتودا، وە هاوزەمان لەگەڵ پەرەسەندنی خەباتی نەتەوەکانی بالقان: بولغار، سرب، رۆمانی، یۆنان.. دا بۆ رزگاری لەژێر دەستیی تورکو دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆ، لەئەنجامی ئەو گۆڕانە ناوەکییە قوڵانەی لەروی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی...یەوە بەسەر خەڵکی کوردستاندا هات، کە بو بوە ژێر دەستەی راستەوخۆی ئیمپراتۆرییە داوەشیوە زۆردارەکانی عوسمانیو قاجاریو، ئەوانیش بوبونە پاوانی لەوەڕگای دەوڵەتە ئیمپریالیستیە گەورەکانی ئەوروپا، خەباتی کورد بەرابەری گەورە پیاوێکی رۆشنبیرو شۆڕشگێڕ، شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینی(؟-١٨٨٣)چوە قۆناغێکی نوێوە، کەئەگونجێ دابنرێ بەسەرەتای گۆڕانی((هەستی نەتەوەیی))کورد بۆ((هۆشی نەتەوەیی))و دانانی بناغەی سەرەتا گشتیەکانی چوارچێوەی ستراتیجیکاری نەتەوەیی کورد لەپێناوی رزگاریو یەکگرتنەوەو پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆدا[٤].

## ٤/١ کورد لەیەکەمین پارلەمانی عوسمانیدا

٦دەوڵەتی ئەوروپایی لە٣١ی مارتی ١٨٧٧دا بەپرۆتۆکۆلێکی نوسراو داوایان لەبابیعالی کرد بو" لەگەڵ((کێوەڕەش))کەئەو دەمە لەشۆڕشدا بو، بەئاشتی پێك بێ‌و، دەس لەو مەڵبەندەی ئەوێ هەڵ بگرێ بەبیانوی ئەوەی زمانیان

سلاڤی‌و دینیان مەسیحییە. لەهەمان پرۆتۆکۆل دا روسیە هەڕەشەی راگەیاندنی جەنگی لەتورك کردبو، ئەگەر خواستەکەی قبولّ نەکریّ.

لەکۆبونەوەیەکی((مەجلیسی مەبعوثان))دا کە بەتایبەتی بۆ لیّدوان لەو هەڕەشەیە ئەکرا، لەکاتیّکا هەندیّ لەکاربەدەستانی بابیعالی چۆڵی خەزیّنەی دەوڵەت‌و نەبونی پارەو دراویان ئەکردە بیانو، بۆ قبولّ کردنی مەرجە قورسەکانی دەوڵەتانی ئەورووپی، مەبعوسیّکی(نویّنەری هەڵبژیّردراو بۆ پارلەمان) کورد هەڵی دایە وتی:

((ئیّوە ئەڵیّن کاروباری دارایی لەتەنگانەیەکی سەخت دایە، ئیّمە چۆن ئەتوانین بڕوا بەو قسەیە بکەین لەکاتیّکا ئیّوە لەم کەشوفشە دان، جلوبەرگی رەنگاو رەنگ‌و، ماڵی رازاوەی پڕ لەکەلوپەلی جوان‌و، گالیسکەی ئەسپی قەشەنگتان هەیە؟

وەرن بۆ لای ئیّمە بۆ کوردستان بەچاوی خۆتان کوێرەوەری‌و ناخۆشی ژیانی ئیّمە ببینن. تا لەوڵاتی خۆم بوم هەر جلی دڕاوی پینە کراوم لەبەردا بو وەکو خەڵکەکەی تر. بەڵام کەئیّوەم بەو جلوبەرگە رەسمیە نایاب‌و خشڵدارانەوە بینی لەحاڵی خۆم تەریق بومەوە، زۆرم لەخۆم کردو منیش چوم لەبازاڕی دەڵاڵەکان نەك لەکۆگا گەورەکان ئەم جلەم بۆ خۆم کڕی کەوا لەبەرم دایە. جا بۆ سەلامەتی نیشتمان‌و، بۆ ئەوەی ریّ بېڕین لەدەستیّوەردانی بیّگانە لەکاروباری وڵاتەکەمان، من ئامادەم لەکاتی پیّویستدا ئەم جلوبەرگە بفرۆشم‌و جلە پینەکراوە کۆنەکەی خۆم لەبەر بکەمەوە)).[5]

لەقسەی ئەم مەبعوسەدا ئەکریّ چەند مەسەلەیەك دەربهیّنریّ"

١-ئەو جیاوازییە گەورەیەی لەئاستی چینی کاربەدەستی تورك‌و کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا هەبوە.

٢-بەتەنگەوە هاتنی دڵسۆزانەی سەربەخۆیی دەوڵەتی عوسمانی‌و دانانی ریّوشویّنی ملنەدان بۆ خواستی دەوڵەتانی بیّگانە.

٣-داواکردنی هۆشیارانە، بەدەنگی بەرز، بۆ باش کردنی ژیانی خەڵك. ئەمانەش هەمو بەڵگەی هۆشیاریی مەبعوسە کوردەکەیە، کەبیّگومان نمونەیەکی رۆشنبیرانی کوردە لەو سەردەمەدا. ئەم مەبعوسە ئیّستا نازانریّ کیّ بوە بەڵام بەمەزەننە ئەگونجیّ هەر شیّخ عوبەیدوڵڵا بو بیّ.

### ٥/١ دەربارەی شێخ عوبەیدوڵلا

لەوکاتەوە مەولانا خالیدی شارەزوری(١٧٧٧-١٨٢٦)کەوتە ژیاندنەوەی تەریقەتی نەقشبەندی، ئەم تەریقەتە لەناو خاکی کوردستاندا لەماوەیەکی کورتدا پەرەی سەندو بڵاو بووەوە، دەیان مەلای پایەبەرزی ناودار لەشوێنی جیاجیا بون بەخەلیفەی مەولانا بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی تەریقەتی نوێ‌و، بەهەزاران موریدو مەنسوب‌و سۆفییان تێ ئاڵا. لەپاش کۆچی کتوپڕی مەولانا بۆ بەغداد(١٨٢٠)و، دوایی تر لەوێوە بەیەکجاری بۆ شام، دو کەس لەخەلیفەکانی لەهەمو ئەوانی کەزیاتر نفوزیان پەیدا کردو خانەقاکانیان بووە ناوەندی گرنگی((ارشاد))و رابەرایەتی بڵاوکردنەوەی تەریقەت کەیەکێکیان شێخی بیارەو ئەوی تریان شێخی نەهری بو.

بنەماڵەی شێخەکانی نەهری خاوەنی نفوزی دینی‌و دنیایی بون" لەڕوی سەیدایەتیەوە، وەکو خۆیان ئەیان گوت، نەوەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بون[٦]. لەڕوی دینییەوە مەلای چاک‌و ناوداریان تێدا هەڵکەوت بو، لەڕوی ماددیەوە خاوەنی ئاوایی زۆرو ئەرزی فراوانی کشتوکاڵ بون، دەسەڵاتی ئیرشادی تەریقەتیش پایەی دینی، کۆمەڵایەتی، سیاسی لەجاران بەهێزتر کردن.

شێخ عوبەیدوڵلا کوڕی ئەم بنەماڵە دەسەڵاتدارە بەڕێزە بو، جگەلەوەی سەید بو، شارەزای زانستە دینییەکان بو، خاوەنی نزیکەی ٢٠٠ گوند بو[٧].

لەجێگەی سەید تەی باوکی مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندیش بو.((...باسی پیرۆزێتی‌و کارزانی شێخ لەهەمو جێگەیەك دەنگی دابووەوە، بەرادەیەك کەبەرابەری گەلی کورد دائەنرا... هەمو رۆژێ لەدیوەخانەکەیدا میوانداری ٥٠٠ تا ١٠٠٠کەسی ئەکرد، بەتاوناو هەیبەتەوە کارەکانی بەڕێوە ئەبرد... لەناو کوردا بەئەمیرێکی پچوك لەقەڵەم ئەدرا))[٨]

خانەقا شوێنی ئیرشادی شێخ‌و کۆبونەوەی خەلیفەو موریدەکانی‌و سازکردنی((رابطە))بو، شێخ لەوێوە رابەریی رێکخراوەیەکی فراوان‌و بەربڵاوی ئەکرد کەپێك هات بو لەسەدان خەلیفەو موریدو سۆفی لەناوچەی جیاجیای کوردستان‌و وڵاتانی ئیسلامیدا. خانەقا، یا راست تر بارەگای دینیی‌و دنیایی بنەماڵەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بو. نەهریش ئاواییەکی ناوچەی شەمزینان بو لەویلایەتی هەکاری، کە لەڕوی جوگرافیەوە کەوتۆتە ناوەڕاستی کوردستانەوە.

لەکاتی جەنگی روسی- عوسمانیدا(١٨٧٧) سولّتان عەبدولحەمید بانگی جیهادیدا بو بەشداری موسولّمانان لەغەزای روسدا، شێخ عوبەیدولّلا لەگەلّ چەند سەد کەس لەموریدەکانی خۆی، بەدەنگ ئەم بانگەوە، چو بۆ قۆلّی بایەزید کە لەلایەن سوپای روسەوە داگیرکرا بو. لەرۆژانی شەڕدا نزیکەی ٥هەزار کورد کە لەسەرانسەری کوردستانەوە هات بون لەژێرسەرکردایەتی ئەودا کۆبونەوە. ئەگەرچی هێزەکانی میلیشای کورد لەلابەلاکردنی چارەنوسی ئەم جەنگەدا دەورێکی کاریگەر یا باشی نەگێڕا، جەنگ بەسەرکەوتنی روسیاو تێشکانی عوسمانی دوایی هات، بەلاّم پایەی شێخ عوبەیدولّلا لەناو کوردا لەجاران زیاتر بەهێزو جێگیر بو، هۆشیاری سیاسی زیاتر قولّ بو، چاك تر شارەزای دیوی ناوەوەی ئیمپراتۆریی عوسمانیو، لاوازییەکانیو گیروگرفتەکانی بون، سروشتی دینیی دەولّەتو جیهادو غەزای عوسمانی ناسی، نفوزی کاریگەری بێگانەو پێوەندییەکانی نێوان دەولّەتان تێ گەیشت، ناسیاویی زۆرتری لەگەلّ گەورە پیاوەکانی کوردو ناوچەکانی پەیدا کرد، چاك تر ئاشنای هەلومەرجی نالەباری ژیانی خەلّکی کوردستان بو، هەندێ چەكو تفاقی جەنگی دەسکەوت، تەجروبەی جەنگیی بەدەس هێنا.

شوێنی شێخ عوبەیدولّلا لەناو کوردا، ناوبانگی لەناوچەکەدا، نەك هەر وەکو شێخێکی تەریقەت، بەلّکو وەکو رابەرێکی ناسراوی دینی، سیاسی، سوپایی درەوشایەوە.

## ٢- پایەکانی ستراتیجی کاری نەتەوەیی شێخ عوبەیدولّلا

شێخ عوبەیدولّلا لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی روسی-عوسمانی(١٨٧٧)گەڕایەوە بارەگاکەی خۆی لەنەهری. لەئەنجامی هەلّسەنگاندنی هەلومەرجی ناوخۆی کوردستان لەژێردەستی بابیعالی تورکو دەرباری قاجاردا، هەلومەرجی ناوەوەی هەردو ئیمپراتۆریی، دۆخی سیاسی جیهان، کەوتە دارشتنو دانانی پایە سەرەکییەکانی ستراتیجەکەی" ئامانجەکانی، هێزی سەرەکی جێبەجێ کردنی، دۆستو هاوپەیمانەکانی، دوژمنەکانیو شوێنە لاوازەکانیسان، مەیدانەکانی جولاّنی، ئوسلوبەکانی بەدیهێنانی.

هەرچەندە نوسراوێکی دیاریکراو لەشێخ خۆی یا لەراپەڕینی ١٢٩٧/١٨٨٠ بەجێ نەماوە، بەرونی هەمو لایەنە جیاوازەکانی ستراتیجەکە دەربخات. بەلاّم لەپێکەوە نوساندنەوەی سەرلەنوێی تێکڕای بەلّگە ماوەکان وەکو"

وتارەکەی تەمموزی ١٨٨٠ی شێخ لەنەهری،

نامەکانی بۆ اقبال الدولەی موتەسەڕفی ورمێ، د. کوهران، کوردەکانی سنور، گفتوگۆکانی لەگەڵ کلایتون، ئابوت، بێگانەکانی تر،

گفتوگۆی نوێنەرەکانی لەگەڵ دیپلۆماتەکانی روسیاو بەریتانیا لەئەرزڕوم، وان، تەوریز، راپۆرتی سەفیرو دیپلۆماتەکانی تری روسیاو بەریتانیا لەتاران و تەوریزو ئەستەموڵو ئەرزڕوم و وان،

هەروەها هەڵوێستە دیارەکانی لەرووداوەکان...

بەمانە هەموی ئەگونجێ دیمەنی گشتی ستراتیجەکەی سەرلەنوێ بەیەکخراوی بخرێتە بەرچاوان.

ئامانجی ستراتیجیی شێخ((پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان)) بو کە"

١-هەمو کورد بێ گوێدانە جیاوازی خێزان، بنەماڵە، خێڵ، ناوچە، لەهجەی زمان.. لەسەر بنچینەی پێوەندی نەتەوەیی کۆبکاتەوەو، لەدو دەوڵەتی بەناو ئیسلامیان دابڕێ،

٢-دوژمنەکانی کورد: ئیمپراتۆرییەکانی قاجاری و عوسمانی، لەکوردستان دەربکا،

٣-هەردو بەشی ئێرانی و عوسمانی کوردستان لەژێر دەستی بابیعالی و دەرباری قاجار دەربهێنێ و یەك بخات.

٤-ئاسایشی سەرو ماڵی خەڵك، بازرگانی، خوێندەواری، پیشەسازی، شارستانێتی لەکوردستاندا .. دابین بکات،

٥-هاوکاری دۆستانە لەگەڵ گەلانی مەسیحی: ئەرمەنی و ئاسوری، هاونیشتمانی کورد لەسەر بنچینەی لێبوردنی دینی و رێزگرتنی یەکتری دابمەزرێنێ.

٦-هاوپەیمانێتی لەگەڵ گەلانی موسوڵمانی ئێرانی و عەرەب(ولایەتەکانی موسڵ، بەغداد، حیجاز، میسر)دروست بکات.

*٧-دانپیانانی سیاسی و قانونی دەوڵەتانی گەورەی ئەوروپا بەدەس بهێنێ.*

*بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئامانجە گەورانە، ئوسلوبەکانی کاری سیاسی،* دیپلۆماسی، سوپایی بەکاربهێنێ.

### ١/٢ ئەقەللای جێبەجێ کردن: کاری سیاسی

### ١/١/٢ سازدانی خەڵکی کوردستان

کوردستان، بەدرێژایی مێژوی تازەی، ناوەندێکی بەهێزیی دەسەڵاتدارێتی تێدا دانەمەزراوە ببێتە پایتەختی‌و، لەوێوە دەس بەسەر هەمو کوردستاندا بگرێ. تا بەتێ پەڕینی زەمسان بتوانێ زمان‌و فەرهەنگی یەککرتو، جۆری حوکمڕانی سیاسی لەیەکچو، جۆری ڕێکخستنی ئابوری-کۆمەڵایەتی لەیەکچو... بەسەر هەمو ئەوانەدا بسەپێنێ، کەبەکوردی ئەدوێن، یا لەکوردستان ئەژین. بەپێچەوانەوە کوردستان هەمیشە لەژێردەسەڵاتی داگیرکەری بێگانەدا بوە، شاخاوی بونی کوردستان لەلایەک‌و، جۆری پێکهاتنی کۆمەڵایەتی کورد لەلایەکی ترەوە، زەمینەکی لەباریان ئامادە کردوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ داهێزرانی دەسەڵاتی ناوەندی بێگانەدا، هەمو جار، ئەمانیش دەسەڵاتدارێتیی ئۆتۆنۆمی خۆجێیی جیاجیا لەناوچەکانی خۆیاندا دابمەزرێنن. لەوساوە کەخەلافەتی عەبباسی کەوتە لاوازبون‌و دەسەڵاتی بەسەر ناوچە دورەکانی قەڵەمڕەوەکەیدا کەم بوەوە، لەگۆشەو کەنارەکانی ئیمپراتۆریی عەبباسیدا چەندین میرنشینی سەربەخۆ یا ئۆتۆنۆم دامەزران، کەهەر بەناو لەژێر دەسەڵاتی خەلیفە، واتە ئەمیری((دار الاسلام))دا بون.

لەو زەمانەوە لەکوردستاندا چەندین میرنشین دامەزرا. ئەگەرچی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوە مەیدانی لەشکرکێشی‌و تەراتێنی مەغۆل‌و تورکمان، هەندێ لەوانە بەدرێژایی چەند قەرن، هەرمان‌و قەوارەی خۆیان ڕاگرت.

لەسەرەتای قەرنی ١٦هەمەوە، کوردستان بەکردەوە بو بەدو بەش، ئێرانی‌و عوسمانی. لەو زنجیرە پەیمان‌و ڕێککەوتننامانەدا کە لەئەنجامی شەڕەکانی عوسمانی- ئێرانیدا ئەبەستران" پەیمانی زەهاو ١٦٣٩، نادرشا ١٧٤٦، پەیمانی ئەرزڕومی یەکەم ١٨٢٣، پەیمانی ئەرزڕومی دوەم ١٨٤٧، بەشێکی درێژو گرنگی سنوری ئەو دو ئیمپراتۆرییە لەسەرەوە تا خوارەوەی بەناو جەرگەی کوردستاندا تێ ئەپەڕێ.

دابەش بونی سیاسی کوردستان بەسەر دەوڵەتێکی سونی‌و دەوڵەتێکی شیعیدا کەدو زمانی ڕەسمی جیاوازو دو فەرهەنگی جیاوازو پێڕەوی دو جۆری ڕێکخستنی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری جیاوازیان ئەکرد. هەروەها دابەش بونی هەر بەشێکی کوردستان بەسەر چەندین میرنشینی

جیاوازدا، سەرەڕای دژخی تۆپۆگرافی نالەباری ئەرزەکەی کەشاخو دۆڵو روبار لەیەکتری دابڕی بو. ئەمانە هەموی نەك هەر یارمەتی کوردیان نەدا بەرەو لەیەکچونی فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، سیاسی بۆ پێشەوە بچێ. بەڵکو دەلاقەکانی جیاوازیو لەیەك نەچونیان لەناو دانیشتوانی کوردستاندا قوڵ تر کردەوە.

گەلی کورد، لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە" دابەش بو بو بەسەرچەندین تیرەو هۆزو خێڵی گەورەو بچوکدا.

لەڕوی ئابوریەوە" بەشێکی گەورەی بەرەوەندایەتی مابوەوە، هەندێکی خەریکی کشتوکاڵ بو لەگوندی دواکەوتودا ئەژیاو هەندێکی کەمی لەشار نیشتەجێ بو.

لەڕوی سیاسیەوە" دەوڵەتی خۆی نەبو، ئەوانی ژێر دەستی عەجەم ئەبو دڵسۆزیی سیاسییان بۆ شاو، ئەوانی ژێردەستی رۆم ئەبو دڵسۆزیی سیاسییان بۆ سوڵتان هەبێو، ئەوانەی ناوچەکانی سنوری هەردو دەوڵەت، بەگوێرەی گۆڕانی روداوەکانو دەسکەوتی خۆیان بەئاسانی باری دڵسۆزی خۆیان ئەگۆڕێ.

لەڕوی فەرهەنگیەوە" ئەگەرچی زۆرایەتی کورد موسوڵمان بون، مەلاکانی کورد ئەبو فێری زمانی عەرەبی بن، بەڵام دەسەڵاتی ئێرانی-عەجەم فەرهەنگی فارسیو، دەسەڵاتی عوسمانی- تورکی فەرهەنگی تورکییان بەسەرا ئەسەپاندن.. فەرهەنگی رۆشنبیرەکانی کورد بەگوێرەی دابەش بونیان ئەکەوتە ژێر کارتێ کردنی فەرهەنگی۳ نەتەوەی جیاوازەوە، هیچ کام لەلەهجەکانی زمانی کوردی" گۆرانی، کرمانجی، بابانی نەیتوانی ببێتە زمانی فەرهەنگو نوسینی تێکڕای کورد. جیاوازی نێوان لەهجەکانی زیاترو قوڵ تر بو.

لەڕوی دینییەوە" ئەگەرچی زۆرایەتی کورد موسوڵمان بون، بەڵام ئەمیش دابەش بو بو بەسەر مەزهەبی جیاوازدا. سەرەڕای زۆرایەتییەکی سوننی، شیعەو عەلەوی یشی تێدا بو. لەپاڵ موسوڵماندا بەشێکی کورد هەر لەسەر ئولی یەزیدی مابون.

لەم کۆمەڵە پچڕپچڕەدا، دڵسۆزی بۆ بنەماڵە، دڵسۆزی بۆ خێڵ، دڵسۆزی بۆ ناوچە، دڵسۆزی بۆ دین، دڵسۆزی بۆ مەزەب، ئەکەوتە سەرو هەمو دڵسۆزییەکی تری وەکو دڵسۆزی بۆ نەتەوە، یا دڵسۆزی بۆ دەوڵەتەوە. ئەوەش بو بو بەمایەی دوبەرەکی و ناکۆکیو خۆخۆری کە بەگەورەترین دەردی کورد ئەژمێردرێ. شەرەف

خان‌و ئەحمەدی خانی‌و حاجی قادرو هەمو رۆشنبیرەکانی تری کورد لەدەس ئەو دەردە سکالآیان کردوە، بەداخ‌و پەژارەوە لێی دواون، هەمو نوسەرانی بێگانەش وەکو بەشێك لەشەخسیەتی کورد باسیان کردوە.

تەنیا دڵسۆزیی ئارەزومەندانە کەهەندێ جار ئەی توانی لەسنوری بنەماڵە، خێڵ، لەهجە، ناوچە... تێ بپەڕێ، دڵسۆزی بو بۆ شێخی تەریقەت. لەکوردستان دو تەریقەت باوبو، یەکێکیان قادری‌و ئەوی تریان نەقشبەندی. لەدوای مردنی مەولانا خالید، تەریقەتی نەقشبەندیش یەکێتیی سەرکردایەتی تێدا نەماو، دابەش بو بەشەر چەندین شێخی بنەماڵەی جیاوازدا لەناوچەو شوێنی جیاوازدا.

شێخ عوبەیدوڵلا یەکێ بو لەگەورەترین شێخەکانی تەریقەتی نەقشبەندی لەسەردەمی خۆیدا. ئەمەش یارمەتیدەرێکی کاریگەر بو بۆ ئەوەی پێوەندی بەربلاوی لەگەڵ سەدان مەلاو میرزاو ئاغاو سەرۆکی عەشیرەت‌و، لەگەڵ هەزاران کەس هەبێ‌و، کەڵك لەو نفوزە زۆرەی خۆی وەربگرێ بۆ ئامانجە سیاسییەکانی، خانەقاکەی شێخ لەنەهری، جگەلەوەی ناوەندی ئیرشادی تەریقەت‌و پێکەوە گرێدانی ئەو رێکخراوە گەورەیە بو، شێخ کرد بوی بەبارەگای سیاسی‌و سوپایی جوڵانەوەکەی. لەوێ ناودارەکانی کوردی ئەدی. گفتوگۆی لەگەڵ ئەکردن، کۆی ئەکردنەوەو ئامۆژگاری ئەکردن. بەپێی قسەی کیزن رۆژانە ٥٠٠ تا ١٠٠٠کەسی ئەدی[٩].

بەگوێرەی راپۆرتی دیپلۆماتەکانی روس، شێخ لەمانگەکانی تەمموزو ئابی ١٨٨٠دا چەندین کۆبونەوەی لەگەڵ زۆر لەناودارەکانی ئەو زەمانەی کوردستان کردوە، لەکۆبونەوەیەکی مانگی تەممزدا ٢٠٠کەسی لەگەورە پیاوانی کورد، لەوانە سەرخێڵ‌و ئاغاو مەلاو میرزا لەبارەگاکەی خۆی لەنەهری کۆکردۆتەوە، لەو کۆبونەوەیەدا شێخ وتاریکی گرنگی داوە کەئامانجەکانی‌و، بەشێکی پرۆژەکانی کارکردنی رون ئەکاتەوە. شێخ لەناو قسەکانی‌دا وتی:

((٥٥٠ ساڵ لەمەوبەر ئیمپراتۆریی عوسمانی دامەزرا.

عوسمانیەکان بەرێگەی نامەشروع دەسەلآتیان گرتە دەست. پاش ٤٠٠-٥٠٠ساڵ حوکمڕانی وازیان لەدینی ئیسلام هێناو رێگەی کفریان گرت. لەو ساوە ئیتر کەوتە داهێزران. تا دێ لەروخان‌و هەڵوەشان نزیك ئەکەوێتەوە. هەڵوەشانەکەشی ئەوەندە بەخێرایی ئەڕوا گومانی تێدا نیە بەم نزیکانە ئەڕوخێ‌و دوایی دێت.

کوڕە خۆشەویستەکانم!

ئەبێ گوێڕایەڵی راسپێرییەکانی باووباپیرانی خۆمان بین، بەسە ئیتر نابێ باری زوڵم و دیلایەتی تورکی کافر هەڵ بگرین. پێویستە خۆمان رزگارکەین، نە تەنیا ئێمەی کورد لەتورکیای عوسمانی، بەڵکو ئەبێ برا کوردەکانی ئێرانیشمان، لەم دو حکومەتەی رێی پێشکەوتنیان لێ بڕیوین، رزگار بکەین.

باووباپیرانمان داوامان لێ ئەکەن، لەپێناوی دین‌و ئازادی نیشتمانەکەماندا، لەخوێنی خۆمان ببورین.

زانایان گوتویانە: قۆستنەوەی هەلی لەبار زانایی‌و ژیرییە. فارس ئێستە لەگەڵ تورکمان بەشەڕەوە خەریکن. هەمو هێزەکانی خۆیان ناردۆتە سەر ئەوان. ئەمەش بەمەعنای ئەوەی ئێستە هەلومەرج بۆ جوڵانەوەکەی ئێمە دژی حکومەتی ئێران لەبارە. ئەگەرچی ئێمە لەفارس ناترسین، چونکە ئەگەر بەشەڕیشەوە خەریك نەبن، چەندی هێزی گەورەی جەنگیی کۆبکەنەوە لە ۱۰۰ هەزار سەرباز زیاتریان پێ کۆناکرێتەوە، کەئەویش نیوەی زیاتری لەو برا کوردانەی خۆمانن کەحکومەتی ئێران ئەیان چەوسێنێتەوەو، هەمان هەستی ئێمەیان هەیە.

لەبەرئەوەی بەشێکی دەوڵەمەن‌و بەپیتی کوردستان لەژێر دەستی ئێران دایە، ئەبێ ئەو بزوتنەوەیەی خەریکین، لەپێش‌دا بەرامبەر دوژمنە لاوازەکە دەس پێ بکا. بەمەش براکانمان‌و نیشتمانە دەوڵەمەندەکەیان رزگار ئەکەین. ئەمەش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندمان بۆ تەئمین ئەکا. یارمەتیمان ئەدا بو بەگژا چونی دوژمنی دوەمان، کەبەهێز ترە، ئەویش تورکی عوسمانیە..))[۱۰].

لەکاتی ئابلۆقەدانی ورمێ‌دا، خەلیفە کلودیك، پێشەوای دینیی کاتۆلیکەکان خواجە داودی نوێنەری کونسوڵی عوسمانی لەورمێ لەگەڵ قەشە سولومون ناردە لای شێخ عوبەیدوڵڵا، داوای لەشێخ کرد فەرمان بەلەشکرەکەی بدا ئازاری مەسیحیەکان نەدەن. شێخ پێشوازی لێ کردن‌و دوای ئەوەی گوێی لەقەشە سولومون گرت، لەخواجە داودی پرسی: تۆکێی؟ لەوەڵامدا وتی کەنوێنەری شابەندەری عوسمانیە. شێخ وتی: ((من بڕیارم داوە ئێران‌و توران فەتح بکەم‌و ئەم دو وڵاتە لەدەست زیمامدارانی زاڵم دەربهێنم‌و زوڵم لەسەر خەڵك لابەرم. ئەوانەی لێرەدا ئەیانبینی سەرۆکی ئیلاتی خاکی عوسمانی ین لەدەس

زوڵمی کاربەدەستانی عوسمانی هاتونـە لای مـن، دوای تـەواوبونی کـاری ئێـران نۆبەی دەوڵەتی عوسمانی دێ))[11].

شێخ بۆ سازدانی خەڵك هەوڵی ئەدا:

لەڕوی کۆمەڵایەتەوە" یـەککگرتوبن، ناکۆکیـەکانی نـاو خۆیـان بخەنـەلاوە، واز لەدوژمنایەتی یەکتری بهێـنن. نەهێشـتنی دزی، جـەردەیی، تـالان، دەسـدرێژی، پەرەپێدانی دادپەروەری لەراپەڕاندنی کاروباری خەڵكدا، جێگیرکردنـی ئاسـایش، ئاشت کردنەوەی خێڵە ناکۆکەکان لەگەڵ یەکتری، چاك کردنی پێوەنـدیو رەفتـار لەگەڵ مەسیحییەکانی دراوسێیان.ی کردبوە بەرنامەی کاری رۆژانەی خۆی.

لەڕوی سیاسیەوە. هۆشی نەتەوەییان هەبێ، زوڵـمو زۆری کاربەدەسـتانی رۆمو عەجەم،،نارەوایی دەسەلاتی هەردو دەوڵەت، رەوایی ئامانجـەکانی خـۆی لـەبارەی رزگاریو یەککگرتنەوەی کوردستانو پێکهێنانی دەوڵـەتی تایبـەتی خۆیـەوە، تـێ بگەن.

لەڕوی سوپاییەوە، ئامادە بن بۆ خۆچەکدارکردنو خۆرێکخسـتنو پێکهێنـانی لەشکرێکی چەکدار، کەبتوانێ دەسـەلاتی عەجـەمو رۆم لەکوردسـتان رابماڵـێ، نیشتمانەکەی ئازاد بکاو لە دەسدرێژی داگیرکەری بیپارێزێ.

شێخ لەنامەکانیدا بـۆ موتەسـەریفی ورمـێ هـەروەها بـۆ د. کوچـران پـێ لەسەرئەوە دائەگرێ، کەلەهەردو بەشی کوردستاندا نیو ملیۆن بنەماڵەی کـورد هەیە، بەدوبەرەکیو ناکۆکیو کردەوەی خراپ تاوانبار ئەکرێن، گەورە پیاوەکـانی کورد بەڵێنیان داوە بەیەکتری، بۆ ئەوەی کۆتایی بەزۆرداری رۆمو عەجەم بهێـنن، واز لەناکۆکی ناو خۆیان بهێننو یەککگرتوبن[12].

بەجۆرە شێخ عوبەیدوللا هەوڵی ئەدا کەخەڵك سازبدا لەسەر بنچینەی ئەوەی دڵسۆزی بۆ نەتەوەو نیشتمانەکەیان بخەنە سەرو هەمو جۆرە دڵسۆزییەکی ترەوە.

### ٢/١/٢ فاناتیزم یان لێبوردنی دین

### ١-هەڵوێستی لەشیعە

هندی لەوانەی سـەبارەت بـەم بزوتنەوەیـە دواون تـاوانی فانـاتیزم(تعصـبی دینی)ی بـەپاڵ ئـەدەن. بەواتەیـەکی تـر بەجوڵانەوەیـەکی فـەناتیکی دائـەنێن، دەمـارگیری موسـوڵمانیەتی دژی مەسـیحیەتیو دەمـارگیری سـوننەیەتی دژی شیعەیەتی، تەنانەت کابرایەکی ئەفشاری خەلکی ورمێ نوسیوێتی:

((...لەپاش مردنی باوکی سەربەخۆیی گەیاندە ئەوپەڕی، لـەخواو پێغەمبـەر یاخی بو، کەوتە سەر خەیاڵی جەورو ستەم، بو بەسێهەمی فیرعـەونو شـەدداد و ئەی گوت:

باوکم رەوزەی ریزوانی بەدو گەنم فرۆشت
ناخەلەف بم، ئەگەر من بەجۆیەکی نەفرۆشم

بۆ ئەوەی نفوزی خۆی بەسەر خەڵكو عەشیرەتەکەی خۆیدا بسـەپێنیو خـۆی بەمرۆڤێکی خاریقولعادە بناسێنێ کەشفو کەرامەتی پیشان ئەداو خـەوی درۆی رێك ئەخست.

هەندێ جار یەکێکی ئەخستە مەدفـەنی شـێخ تـەهاوەو خـۆی بەجلوبـەرگی سپییەوە ئەهاتە بەرامبەر گۆڕی باوکیو ئەکەوتە پرسـیارو وەڵام بـۆ هـان دانـی خەڵکی عەوام ئەیوت: شێخ تەها ئەڵێ، ئەبێ راپەڕیو عەشـایەر کۆبکەیتـەوەو لەئێراندا ببیتە خاوەنی تاجو تەخت، رافزییەکان لەڕەگو ریشە دەربهێنیو رەواج بەتەریقەتی هەق بدەیتو حوکمی خواو پێغەمبەر دابمەزرێنی.

ئەوسا بۆ هاندانی تێکـڕای عەشـیرەتەکان راگەیانـدنی جیهـادی بـەم جـۆرە نوسیو لەسەرانسەری ولاتدا بلاوی کردەوە: ((شێخی مـازی بـەزار بەکوشـتن و تالانی رافـزی رازیو خـوێنو مـاڵی ئـەوانی بـۆ ئێـوە موبـاح کـردوەو مـژدەی حکومەتو بەهەشتی داوە))[١٣].

لەراستیدا هیچ بەڵگەیەکی مێژویی پشتیوانی لەم چیرۆکەو لەراگەیانـدنی جیهاد دژی شیعە ناکات، بەڵکو روداوەکانو ئەو بەڵگـە نوسـراوانەی هـی ئـەو سەردەمەن، دەری ئەخەن کەشێخ خۆی بەتەمای تاجو تەختی ئێران نەبوە، چونکە داوای لەعەباس میرزای برای ناصرالدین شا کردوە ببێتە شـای ئێـران، هـەروەها لێبوردنی دینی، نـەك فـەناتیزمی کردبـوە بەرنامـەی کـاری خـۆی لەپێوەنـدی بزوتنەوەکەیدا لەگەڵ گەلانی ناوچەکە بەموسوڵمانو ناموسـوڵمانەوەو، هـەوڵی لەگەڵ ئەدان کەرایان بکێشـی بـۆ دۆسـتایەتیو کـاری هاوبـەش دژی دەربـاری قاجـارو بابیعـالی. شـێخ لەناوچـەکانی ژێردەسـەڵاتی خـۆیدا فـەرمانیدا بـو بەهێزەکانی کەرەفتاری باش لەگەڵ هەمو کەس بکەنو بـەهیچ جۆرێـك رێگـەی دەسدرێژی نەداوە بەکـەس. جگەلەمـەش بـۆ سـازدانی گـەلانی ناوچـەکە بـەبێ جیاوازی دین: مەسیحی- موسوڵمان، مەزەب: شیعی- سوننی، داوای لەعـەباس میرزا ملك ئارای(شیعی)و اقبال الدولەی(شیعی)و ئاخوندە شـیعەکانی ورمـێو

مار شەمعونی ئاسوری(مەسیحی)و سەرۆکی کەنیسەی ئەرمەنیەکانی باشقەڵا کرد بۆ هاوکاری. هەروەکو پێوەندی لەگەڵ دیپلۆماتەکانی روس‌و ئینگلیز کرد کەئەوانیش مەسیحی بون.

پێ ئەچێ کەئەو قسانە پڕوپاگەندەی کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی ئێران بێ بۆ مەبەستی سیاسی خۆیان، وەکو هۆیەکی گرنگی تەقاندنەوەی ناکۆکیە کۆنەکانی نێوان کوردو عەجەم‌و، خرۆشاندن‌و سازدانی خەڵکی ئازەربایجان کەلەڕوی مەزەبی‌و نەتەوەییەوە لەکورد جیاواز بون. بۆ ئەوەی گەلی ئازەری شیعە دژی بزوتنەوەیەکی سەربەخۆیی خوازی کورد سوننی هان بدەن. یاخود رەنگە بێ ئاگاداری شێخ‌و کوڕەکانی‌و لێپرسراوەکانی کەسانێك هەبوبن هەڕەشەی لەو بابەتەیان کردبێ. ئەگینا هەمان نوسەر خۆی ناوەڕۆکی چەند نامەیەکی نوسیوەتەوە کەشێخ عوبەیدوڵڵا بۆ هەندێ لەگەورە پیاوەکانی ورمێی نوسیوە کەهەمویان شیعە بون، نەك هەر دورونزیك بونی ئەم جۆرە قسانەی لێ نایەت، بەڵکو دڵنەوایی‌و رێز لێ نانی زۆریشیان تێ دایە.

شێخ عوبەیدوڵڵا لەکاتی ئابڵوقەدانی شاری ورمێدا لەنامەیەکدا بۆ((میرزا حسێن اقا مجتهد))گەورەی ئاخوندە شیعەکانی ورمێ نوسیوێتی:

((... من بۆ دادخوازی عەشایەرو نەهێشتنی زوڵم لەسەر رەعییەت هاتوم.

دو رۆژ لەورمێ میوانی ئێوە ئەبم، لەئێوەش جگە لەسیورساتی لەشکر شتێکی ترم ناوێ‌و، لەمزگەوتی جامیعی ورمێ لەگەڵ ئەهلی ئیسلام نوێژ ئەکەم، هەمو خاوەن کارێ لەسەر کاری خۆی ئەمێنێ‌و، خۆم ئەچم بۆ تەورێز.

ئەگەر سەرکار ئقبال ئەلدەولە گوێڕایەڵ بێ پایەیەکی گەورەی ئەدەمێ، ئەگەر بەقسەی منی نەکرد رێگەی مەدەن بێتەوە ناو شار...

من خۆم بەلەشکرەکەمەوە هاتوم، نەوەکو یەکێکی لەشکر زەرەرێ بەخەڵکی شار بگەیەنێ، چونکە ورمێ وەکو ماڵی خۆم دائەنێم... ئینشائەڵڵا مەحەبەتی زۆر دەرهەقی خەڵك ئەکەم...))[١٤].

لەنامەیەکی تردا کەلەرۆژانی شەڕو ئابڵوقەدانی ورمێدا بۆ اقبال الدولەی نوسیوە، ئەڵێ:

((میری میانی گەورە، دۆستا، میهرەبانا!

مەعلومە خانەوادی ئێوە لەگەڵ دودمانی سید تەهای مەرحوم لەکۆنەوە دۆست بون‌و داعی ئەوپەڕی مەحەبەتم بۆ ئێوە هەیە، ورمێ بەماڵی خۆم ئەزانم‌و،

بەڕشتنی خوێنی موسوڵمانان هیچ وەخت ڕازی نەبوم، چەند جار سەرانی سوپاو عەشایەر ویستیان دەست بەشمشێرو خەنجەر بڕژێنە ناو شار، دۆستدار مانیع بوە نەی هێشتوەو نەم ویستوە کەکوشتن‌و تالان لەناو ئەهلی ئیسلامدا روبدا. ئەگەر خۆڕاگرتنی ئێوە بەنیازی گەیشتنی یارمەتیە، ڕێی یارمەتی بەستراوە، لەهیچ شوێنێکەوە ئیمداد ناگا، ئەگەر دوسێ ڕۆژ لەقەڵادا خۆتان بگرن ئاوو ئازوقەو قورقوشم‌و باروتی ئێوە تەواو بۆ ئەوسا ناچاری گوێڕایەڵی‌و تەمکین ئەبن.

ئەگەر ئەمڕۆ خوێنڕشتن لەناوا بێ دو ڕۆژی تر پەشیمان ئەبیتەوە. باشتر وایە کاری ئەمڕۆ نەخەیتە سبەینێ‌و نەبیتە هۆی دوژمنایەتی. بەسدیقی دڵەوە تەمکین بکەی‌و ئومێدەوارم بەپایەی بڵند بگەیت والسلام))[15].

ئەم نامەیەو چەندین نامەی تری شێخ بۆ سەرانی شیعە باسی هیچ جۆرە سوکایەتیەکی بەرامبەر شیعە تێدا نیە. باسی((رافضی))و((حەڵاڵ کردنی خوێن‌و ماڵ))و((حوکمی جیهاد))ی نەکردوە، وەکو دوژمنەکانی باسی ئەکەن، بەڵکو لەهەمویاندا بەڕێزەوە بەئیسلام ناوی بردون. ئەگەر شێخ عوبەیدوڵڵا نیازی((مباح)) کردنی سەرو ماڵی شیعەکانی ورمێی هەبوایە لەباتی ئەوەی نامەی وەهایان بۆ بنوسێ‌و گفتوگۆیان لەگەڵ بکا، یەکسەر پەلاماری ئەدان‌و، هەلیشی لەدەس نەئەچو.

## ٢-پێوەندی لەگەڵ عەباس میرزا مەلك ئارا

شاهەکانی ئێران، بەدرێژایی مێژو لەپیلان‌و رقە بەری یەکتری ترساون" باوك لەکوڕ، کوڕ لەباوك، برا لەبرا، پیلانی گێڕاوە. مێژوی بنەماڵەکانی سەفەوی، ئەفشار، قاجار، پڕێتی لەکوشتن‌و خەساندن‌و چاو هەڵکۆڵێن‌و دورخستنەوەو گرتن بۆ ئەوەی لەدەست میمل‌و ملۆزمەکانی خۆیان رزگار بن.

محەمەد شاهی قاجار لەپاش مردنی چەند کوڕو چەند کچی لێ بەجێ ما. لەناو کوڕەکانیدا دویان لەوانیتر لەپێشتر بون یەکێکیان ناصرالدین، ئەوی تریان عەباس بو. عەباس میرزا لەدایکەوە کوڕی خدیجە خانمی کچی یەحیی خانی چەهریق بو کەیەکێ بو لەو جاخزادە کوردەکانی چەهریق. بنەماڵەی خەدیجە خانم موریدی شێخ تەی باوکی شێخ عوبەیدوڵڵا بو. کوڕو دایك لەلای محەمەد شا نزیك بون. وەك ئەڵێن، محەمەد شا بەرلەوەی بمرێ بەتەما بو ناصرالدین لەولیعەهدی بخات‌و عەباس میرزا کەنائب السلطنتو هێشتا منال بو لەجێی ناصرالدین بکاتە ولیعەهدی خۆی‌و، لەپاش مردنی ببێتە شای ئێران.

لەپاش مردنی محەمەد شا، ناصرالدین بەشای ئێران. بەڵام ترسی ئەوەی هەبو کەعەباسی باوك برای پیلانی لێ بگێڕێ، بێتە جێگای. جگەلەوەی هەمو سامانو داراییان لەخۆیو دایکی زەوت کرد، مەهد علیای دایکی ناصرالدین ویستی عەباس کوێر بکاو ناصرالدینیش هەوڵی لەناوبردنیدا. لەژێر گوشاری وەزیری موختاری روسو ئینگلیزدا گیانی بەساغی دەبرد. بەڵام دورخرایەوە بۆ((عتباتی عالیات))لەعیراقی عەرەبی ژێردەسەڵاتی عوسمانیو زیاتر لە ٢٥ ساڵ بەدور خراوەیی مایەوە. ئەو ماوەیەش عەباس میرزا هێشتا هەر مایەی پەژارە بو بۆ ناصرالدین شا.

شێخ عوبەیدوڵڵا کەئاگادر ئەم کەینوبەینە بو، هاوکات لەگەڵ دەسپێکردنی لەشکرکێشیدا بۆ سەر کوردستانی ئێران، بۆ ئەوەی ریزی دوژمنەکانی تێك بداو کەڵك لەناکۆکیەکانی ناو خێزانەکەیان لەسەر حوکمڕانی وەربگرێ، بەدو نوێنەری خۆیدا نامەیەکی بۆ عەباس میرزا نارد. لەنامەکەیدا عەباس میرزای بانگ هێشت بو کەبەشداربێ لەشەڕا دژی هێزەکانی ناصرالدین شا بۆ ئەوەی لەپاش سەرکەوتنی راپەڕینەکە تەختی ئێرانی پێ ببڕێ، کورد بونی دایکیشی بەبیر هێنابوەوە.

عەباس میرزا بۆ ئەوەی دڵی ناصرالدین شای برای لەخۆی پاك بکاتەوەو دڵنیای بکا، لەباتی ئەوەی بەدەنگ شێخ عوبەیدوڵڵا وە بچێ، هەردو نێردراوەکەی شێخی بەگیراوی لەگەڵ نامەکەدا تەسلیمی ناصرالدین شا کرد، شا لەپاداشتنی ئەم دڵسۆزیەدا حوکمڕانی قەزوینی بەعەباس بەخشی. عەباس میرزا خۆی روداوەکەی بەدرێژی لەبیرەوەریەکانیدا گێڕاوەتەوە[١٦]

٣-هەڵوێست لەمەسیحیەکان

ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەبەدرێژایی مێژوی مرۆڤایەتی گرنگیەکی تایبەتی هەبوە لەپێکەوە بەستنەوەی ٣ قارە گەورەکەی دنیا" ئاسیاو ئەفریقاو ئەوروپا. لەبەرئەوە رێگە مێژوییەکانی پێکەوە بەستنی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا لەم ناوچەیەوە تێ پەڕیوە، لەشکرە گەورەکانی رۆمانی، یۆنانی، فارسی، عەرەبی، مەغۆلی، تورکی..یش هەر بەوێدا رۆیشتونو، شەپۆلی گەورەی کۆچوڕەوی مێژوی هەندێ گەل روی تێ کردوە، لەبەرئەوە سەرەڕای نەتەوە خۆجییە دێرینەکانی ناوچەکە، هەندێ میللەتی تریشی تێدا جێگیر بونو ناوچەکە بۆتە مۆزاتێکی رەنگاورەنگی رەگەزو زمانو دینی جیاواز.

کوردستان لەناوجەرگەی ناوچەکەدا بوە، هێزێکی ناوەندیی تایبەتی خورتی خۆی نەبوە لەلێشاوی هاتوان بیپارێزێ، ڕەنگە لەهەموان زیاتر کەوتبێتە ژێر گوشارەوە.

لەکوردستاندا، لەکۆنەوە چەند نەتەوەیەك پێکەوە ئەژین، جگە لەکورد گەلی ئاسوریو گەلی ئەرمەنیش لەهەندێ شوێنیدا هاوژینو هاوجێگەبون لەگەڵی.

ئاسوریەکان، کە لەسەدەکانی پێشودا بەنەستوری ناوبراون، خۆیان بەپاشماوەی ئیمپراتۆریی ناسراوی ئاشوری دائەنێن. لەدوای تێکچونی ئیمپراتۆریی ئاشوریو وێران بونی پایتەختەکەیان دەربەدەر بونو خۆیان خزاندۆتە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانەوە. کۆمەڵی گەورەو بچوکی لەیەکچویان لەناوچەکانی هەکاری، وان، بتلیس، ئورفا، دیاربەکر، ماردین، نسیبین، قارس، موسڵ، سەلماس، تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ، ورمێ... پێکەوەناو گوندو ئاوایی تایبەتی خۆیان دامەزراندو پارێزگاری قەوارەی تایبەتی خۆیان کرد.

ئەرمەنیەکان، لەنەتەوە هەرە کۆنەکانی ناوچەکەن، خاوەنی شارستانێتی کۆنو مێژویەکی دوورودرێژن. خاوەنی دەوڵەتی بەهێزبونو لەسەردەمێکدا بەشێکی کوردستان لەژێردەستی ئەواندا بوە. تا ئەم چەرخانەی دوایی هەندێ بەشی کوردستان لەسەر ئەرمەنستان دانراوە. لەقەرنی رابردودا لەگەڵی ناوچەی کوردستاندا بەتایبەتی وان، بتلیس، دیاربەکر، قارس، ئەرزڕوم، ئەرزنجان، هەکاری بەژمارەی زۆر نیشتەجێ بونو، ئاوایی گەورەو ئاوەدانیان هەبو.

لەژێرسایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا، دینی مەسیحی بەرەسمی ناسراوە، بەلام هەرگیز مەسیحەیەك هەمو ئەو مافانەی نەبوە کەموسوڵمانێك هەیبوە، زۆرجار جیاوازی دینیان لێ کراوە بە بەهانەی چەوساندنەوەو ئازاردانو کوشتنو تالان کردن. لەقەرنی ١٧هەمدا، دەوڵەتانی ئەوروپی چەوسانەوەی مەسیحیەکانیان کرد بەبیانوی خۆخزاندنە کاروباری ناوچەکە. میسیونێری دینی بەناوی یارمەتی دانو پارێزگاریەوە بنکەی بەهێزیان تێدا دامەزران. پاشتریش دەوڵەتە ئەوروپاییەکان مەسیحیەکانی ناو ئێرانو عوسمانیان کردە بنکەی دەسوەردانە کاروباری ناوچەکە بۆ دابین کردنی دەسکەوتەکانی خۆیان. کەڵکی زۆریان لەوان وەرگرت. لەو شارانەدا کەلەنێوان روسیە- ئێرانو، لەنێوان روسیە-عوسمانیدا ئەبو، روسەکان کەڵکی زۆریان لەهاوکاریو شارەزاییو ئاگاداری ئەوان وەرئەگرت دژی ئێرانو

تورکیا. دەسەڵاتدارانی رۆم و عەجەمیش ئەوەیان ئەکردە بەهانەی توندکردنی چەوسانەوەی مەسیحیەکان.

کورد گەلێکی موسوڵمانە، هەم بەدین لەئاسوری و ئەرمەنیەکانی هاونیشتمانیان جیا بون، هەم بەزمان و رەگەز جیاواز بون. ناکۆکی بەرژەوەندی ئابوری هەندێ جار ناکۆکی لەنێوان کوردو مەسیحیەکاندا دروست کردوە. جیاوازی دین و زمان ناکۆکیەکەی قوڵ تر کردوە. هەندێ لەمەلاو شێخەکانیش هەندێ جار ئاگری ناکۆکیەکانیان خۆش کردوەو هانی کوردیان داوە لەدژی ئەوان. میسیونێرە ئەوروپی و ئەمریکاییەکانیش هەندێ جار دەوری خراپیان گێراوە لەتیژکردنی ناکۆکیەکان و هاندانی مەسیحیەکاندا دژی کورد. دوایی تریش کۆنسوڵگەکانی بەریتانیاو روسیا نفوزی بەهێزیان تێدا دروست کردبون و بۆ خزمەتی دەوڵەتەکانی خۆیان بەکاریان ئەهێنان. لەسەردەمی راپەرینەکەی بەدرخان بەگدا ((١٨٤٣-١٨٤٧)بەهاندانی میسیونێرە ئینگلیزەکان ئاسوریەکان لەبەدرخان هەڵگەڕانەوە. تێکهەڵچونی خوێناوی لەبەینیاندا رویدا. کونسوڵی بەریتانیا بەقازانجی ئاسوریەکان دژی بەدرخان لەلای کاربەدەستانی عوسمانی کەوتەکار.

روسیاو بەریتانیا کەچاویان بڕی بوە ناوچەکە، یەکێ لەدەسکەلاکانیان، مەسیحیەکانی کوردستان بو، یەکێکیش لەبەهانەکانیان پارێزگاری ئەوان بو لەدەسدرێژی موسوڵمانەکان تایبەتی کورد. پەیمانی بەرلین(١٨٧٨) کە لەدوای جەنگی روسی- عوسمانی، لەلایەن روسیا، بەریتانیا، ئیتالیا، نەمسا، ئەڵمانیاوە بەسەر بابیعالیدا سەپێنرا بو، بۆ رازی کردنی ئەرمەن سەبارەت بەو هاوکاریەی لەگەڵ روس دژی عوسمانی کرد بویان، وە بۆ تۆڵەکردنەوە لەکورد سەبارەت بەو هاوکاریەی لەگەڵ تورك دژی روس کرد بویان، لەمادەی(٦١)دا نوسیویێتی:

((بابیعالی بەڵێن ئەدا، لەناوچە ئەرمەنی نشینەکاندا، رێکخستن و چاککردنی کەپێویستەکانی ناوچەکە ئەیخوازن جێبەجێ بکا، وەسەلامەتی ئەرمەن لەکوردو چەرکەس بپارێزێ. بابیعالی ئەبێ بەردەوام دەوڵەتان لەو رێوشوێنانە ئاگادار بکا کەبۆ ئەم مەبەستە دایان ئەنێ و دەوڵەتەکانیش چاودێری جێبەجێ کردنی ئەو رێوشوێنانە ئەکەن)).

ئەم پەیمانە لەلایەکەوە بو بەهانەیەکی تر بەدەس روسیاو بەرتیانیاوە، بەناوی پاراستنی ئەرمەن و چاودێری داوودەزگاکانی عوسمانی لەجۆری جێبەجێ کردنی

پەیمانەکە، زۆرتر دەس وەربدەنە کاروباری ناوخۆی عوسمانیەوە، لەلایەکی ترەوە چەکێکی برندەی دایە دەس تورك بۆ ئەوەی کورد لەئەرمەن هان بدا. ئەو دو میللەتە بکەن بەگژیەکتریدا و بەیەکتری بترسێنن.

شێخ عوبەیدوڵلا بەدوربینیەکی زیرەکانەوە هەوڵیدا بۆ ئەوەی گەلی کوردو دەس رۆیشتوەکانی نەکەونە ژێرکاتێکردنی پڕوپاگەندەی تورك‌و هەندێ فەناتیکی کوردەوە دژی گەلانی مەسیحی، بەتایبەتی ئەرمەنی. ئامۆژگاری خەلکی ئەکرد کەرەفتاری باش لەگەڵ مەسیحیەکان بکەن. خۆیشی مافەکانی ئەپاراستن‌و ڕێزی لێ ئەگرتن. بەردەوام هەوڵی ئەدا بۆ تێ گەیاندنی کورد لەپێویستی راگرتنی پێوەندی دۆستانە لەگەڵیان. لەهەمان کاتدا لەهەوڵ دانی بەردەوام دا بو بۆ ئەوەی گەلە مەسیحیەکان: ئەرمەنی‌و ئاسوری رابکێشێ بۆ دۆستایەتی‌و پشتیوانی‌و بەشداری لەبزوتنەوەکەدا دژی دەرباری قاجارو بابیعالی. شێخ لای وابو راکێشانی ئەوانە بۆ هاوکاری‌و بەشداربون لەبزوتنەوەکەدا جگەلەوەی بزوتنەوەکەی پێ بەهێزو ڕیزی ناوخۆی پێ پتەو ئەبو، ئارام‌و ئاسایشی لەکوردستاندا باشتر ئەپاراست‌و، پەکی پیلانەکانی تورکیای ئەخست بو نانەوەی دوبەرەکی لەبەینی ئەم میللەتە زۆرلێکراوانەدا. سەرەڕای ئەوانەش گرنگیەکی گەورەی هەبو بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی روسیاو بەریتانیا لەجولانەوەکە، چونکە نفوزی روس لەناو ئەرمەنی‌و نفوزی ئینگلیزی لەناو ئاسوریدا بەهێز بو. هەڵوێست لەوانە یا هەڵوێستی ئەوان لەبزوتنەوەکە کاری سەلبی یا ئیجابی ئەکردە سەر هەڵوێستی هەردو هێزی ئەوروپی لەبزوتنەوەکە.

لەکۆبونە فراوانەکەی تەموزی ١٨٨٠دا لەنەهری، کاتێك چەند کەسێ لەوانەی بەشدار بون بوئەوەی لەپێشدا (جەبهەی داخلی) پاك بکرێتەوە، پێشنیاری ئەوەیان کرد لەسەرەتاوە دەست بکرێ بەکوشتاری ئەرمەنی لەکوردستاندا، شێخ نەك ئەمەی پەسەند نەکرد بەڵکو لەوەڵامدا وتی:

((ئەگەر ئەستەموڵ هەتا ئەوساتە بەسەرزاری پشتی کوردی گرتبێت، ئەوە بەو مەبەستە بوە لەگاورەکانی ئەنەدۆڵ راستیان بکاتەوە، خۆ ئەگەر هاتو ئەرمەنەکان لەئەنجامی ئەو هەڵوێستەدا تیاچون ئەوسا کورد لای کاربەدەستانی عوسمانی نرخیان نامێنێ‌و بەفلسێك نایان کڕێ... ئەگەر راپەڕینی کورد ئاراستەی ئەرمەنی بکرێ، ئەوسا دەوڵەتە ئەوروپاییەکان لەکورد راست ئەبنەوە...))[١٧].

شێخ چەند جارێ نامەو نوێنەری خۆی ناردە لای سەرۆکی کەنیسەی ئەرمەنیەکان لەباشقەلا بۆ ئەوەی((چاویان بەیەك بکەوێ، لەسەر دۆخی وڵات بدوێن‌و رێوشوێنی بەکەڵك بدۆزنەوە))[18].

هەروەها چەند جارێ نامەو نوێنەری خۆی ناردە لای مار شەمعونی گەورەی ئاسوریەکان[19].

لەم هەمو تەقەللایە مەبەستی ئەوە بو ئاسوریەکان‌و ئەرمەنیەکان وەکو کورد بەشداری جوڵانەوەکەی بن دژی دەوڵەتەکانی ئێران‌و عوسمانی، بۆ ئەوەی لەکوردستانی سەربەخۆدا لەچەوسانەوە رزگار بن‌و بەمافەکانی خۆیان بگەن.

شێخ عوبەیدوڵڵا لەکاتی هەڵاتنی‌دا لەئەستەموڵەوە بۆ شەمزینان بەهەندێ لەناوچە ئەرمەنی نشینەکان‌دا تێ پەڕی، پیاوە گەورەکانی بینین، سەردانی کەنیسەکانی کرد، گفتوگۆی لەگەڵ کردن. ئەگەرچی شێخ نەیتوانی گەورە پیاوەکانی ئەو دو گەلە رازی بکا" ئەوانیش شان بەشانی کورد بەشداری تەقەللای دیپلۆماسی- چەکدار بن بۆ بەدیهێنانی ستراتیجەکەی چونکە کاربەدەستانی روس‌و ئینگلیز لەئەرزرۆم، وان، تەوریز، ورمێ.. هەر یەکە لەلای خۆیەوە ئامۆژگاری ئەرمەنی‌و ئاسوریەکانیان ئەکردو زۆریان بۆ ئەهێنان" بەشداری بزوتنەوەکە نەبن، یارمەتی نەدەن‌و هاوکاری نەکەن، بەڵکو لێی دور بکەونەوە[20].

بەڵام شێخ ئەگەر نەیتوانی بێ دۆستایەتی ئەو گەلانە بەدەس بهێنێ، ئەوا هیچ نەبێ توانی وایان لێ بکا لەململانێی کوردو دوژمنەکانی‌دا بێ لایەن رابوەستن.

### ٣/١/٢ پێوەندی لەگەڵ گەورە پیاوانی عەرەب

لەو کاتەوە لەشکری عەرەبی ئیسلامی فەتحی کوردستانی کرد، گەلی کورد بەدڵسۆزی موسوڵمان بو. زمانی عەرەبی کەزمانی قورئان بو وە گەلی عەرەب کە لەهەندێ قۆناغی مێژودا نەتەوەی دەسەڵاتدارو کاربەدەست بو لەناو کوردا لەچاو میللەتانی تردا رێزی تایبەتی‌و پایەی بەرزی هەبوە. ژمارەیەکی زۆر لەخێزانی سەیدو شێخ‌و مەلاو پیرو گەورە پیاوەکانی کورد، بەراست یا بەهەڵبەست، رەچەڵەکی خۆیان ئەبردەوە سەر عەشیەت‌و بنەماڵەو گەورە پیاوە مێژوییەکانی عەرەب. شەرەفنامە دەیان نمونەی باس کردوە. گەلی کورد لەلای رۆژئاواو خواروی نیشتمانەکەیەوە هاوسێی عەرەب بو. جگەلە پێوەندی هاودینی‌و هاومەزەبی،

پێوەندی فەرهەنگیو بازرگانی بەهێزیش لەنێوان هەردو میللەتدا هەبوە. بگرە لەهەندێ شوێن تێکەڵاوی پێوەندی خزمایەتیش لەنێوان عەشیرەتەکانیاندا هەبوە.

شێخ عوبەیدوڵلاش گرنگی میللەتی عەرەبو گرنگی کاری شوێنو ناوەندە پیرۆزەکانی ئیسلامی لەولاتانی عەرەبیدا زانیوە بەتایبەتی چونکە خۆی کابرایەکی دینی بوە، بزوتنەوەکەشی دژی دەسەڵاتدارانی بوە، کەخۆیان بەپارێزەری موسوڵمانانی دنیا داناوەو هەمو راپەڕینو یاخی بونێك لەحوکمڕانی خۆیان بە(لەدین دەرچون)ژماردوە، لەبەرئەوە شێخ عوبەیدوڵلا پێویستی بەوە بوە رەوایی بزوتنەوەکەی خۆیو دەرچونی کاربەدەستان لەرێوشوێنەکانی ئیسلامەتی بۆ ئەوان بسەلمێنێنێو، هەوڵ بدا پشتیوانی مەعنەوی- سیاسی گەلانی عەرەبو پشتیوانی گەورە پیاوەکانیان بەدەس بهێنێ. بۆ ئەم مەبەستە پێوەندی لەگەڵ چەندین شوێن کردوە، نامەو نێردراوی ناردۆتە لایان، لەوانە:[21].

-شەریفی مەککە[22]. کەزێوانی گۆڕی پێغەمبەرو شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام بوە، وەهەمو ساڵ دەیان هەزار کەس لەسەرانسەری ولاتانی ئیسلامیەوە بۆ بەجێ هێنانی ئەرکی حەج رویان تێ کردوە، کاریگەرترینو گرنگترین، ناوەندی کۆبونەوەی ساڵانەی موسوڵمانانی دنیا بوە. لەمەش دیارە مەبەستی بەدەسهێنانی پشتیوانی مەعنەوی-سیاسی کاربەدەستی پیرۆزترین ناوەندی ئیسلامی جێگەی رێز لێ نانی هەمو موسڵمانی دینا بوە.

-خدیوی میسر[23]ئەگەرچی لەو سەردەمەدا لاواز بو بو، کەوت بوە ژێر نفوزی دەوڵەتانی ئەوروپیەوە، بەڵام میسر گرنگیەکی گەورەی فەرهەنگی هەبو، جگەلەوانە گرنگترین زانستگەی دینی- ئیسلامی(جامعە الازهر)لەقاهیرەدا بو.

-هەندێ لەگەورە پیاوانی عەرەب لەولایەتەکانی موسڵو بەغداد کەهاوسۆزی نفوزی سیاسیو دینی خۆی بون. هەندێ سەرچاوە وا رائەگەیەنن لەدوا راپەڕینەکەی شێخدا نزیکەی ٥ هەزار عەرەبی ولایەتەکانی بەغدادو موسڵ لەناوچەکانی هەکاری بۆ هاوکاریو یارمەتی دانی شێخ عوبەیدوڵلا کۆبونەتەوە[24].

ئەگەرچی ئەم ژمارە گەورەیە رەنگە جۆرێ لەپێوەنانی تێدابێ، بەڵام لەسەرێکەوە بەڵگەی نفوزی بەهێزی شێخە لەناو موسوڵمانی عەرەبدا، وە بەڵگەی رادەی پشتیوانی کردنی ئەوانە لەجولانەوەکەی شێخ دژی دەسەڵاتی عوسمانیو ئێرانی.

### ٢/٢ تەقەڵلای جێبەجێ کردن: کاری چەکدار

#### ١/٢/٢ هێزەکانی کورد

هێزی چەکدار لەسەردەمی جەنگ‌و لەسەردەمی ئاشتی‌دا گرنگی گەورەی هەیە بۆ گەلان‌و دەوڵەتان، بەڵکو فاکتەرێکی هێزی نەتەوەو هێزی دەوڵەتە. هەبون‌و نەبون، خورتی‌و لاوازی‌و چۆنایەتی‌و چەندایەتی هێزی چەکدار دەوری بڕیاردەری هەیە لەسەرکەوتن یا لەتێشکانی کاری سیاسی‌و کاری دیپلۆماسی‌دا، وە لەبەدیهێنانی ئامانجەکانی نەتەوە یا دەوڵەتێکدا. دەوڵەتان بۆ سەرکوتکردنی یاخی بونی ناوەکی، بۆ پاراستنی خۆیان لەدەستدرێژی دەرەکی، بۆ دەستدرێژی کردنە سەردەوڵەتانی تر هەمیشە پەنایان بردۆتە بەکارهێنانی زۆرو توندوتیژی‌و هێزی چەکدار. دەوڵەتان بۆ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی ڕزگاری خوازانەی نەتەوەکانی ژێردەستەیان و گەلانی ژێردەستەش بۆ بەدەسهێنانی مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆیان، شان بەشانی کار لەمەیدانەکانی ترا، پەنایان بردۆتە بەر چەك‌و هێزی چەکدار.

بزوتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کوردیش لەسەرەتاوە هەر ئەو ڕێگەیەی گرت‌و کردی بەشێوەی سەرەکی کاری خۆی بۆ بەدەسهێنانی ئامانجەکانی، بەڵام چونکە کورد دەوڵەتی نەبوە، نەریتی پێکهێنانی سوپاو لەشکرو جەنگیی نیزامییشی نەبوە، هەروەها بزوتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی گەلی کورد لەو قۆناغەدا هێزێکی چەکداری ڕێکخراوی نەبوە. لەناو کوردا نەریتی شەڕی ناوخۆی خێڵەکان لەگەڵ یەکتری، نەریتی بەرەنگاری هێزی دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان، نەریتی جەردەیی‌و ڕێگری‌و یاخی بون لەکاربەدەستانی بێگانە هەمیشە هەبوە، چەك خشڵی خورازاندنەوەی پیاوان بوەو نرخێکی کۆمەڵایەتی- سیاسی تایبەتی هەبوە لەلای هەمو کەس. ئازایەتی‌و نەترسان‌و لەخوبران، جوامێری‌و دلێری‌و بوێری ڕەوشتی پەسەند بون. لەکۆنەوە خەڵك هەوڵی خۆ چەکدارکردنیان داوە، بەتایبەتی خۆپاراستن ئەرکێ بوە هەر کەسە لەملی خۆی بوە، چونکە دەسەڵاتدارانی ڕۆم‌و عەجەم سەرو سامانی خەڵك‌و ئاسایشی وڵاتیان نەپاراستوە. دەرەبەگەکانی کورد، ئاغاکانی چ ئەوانی ڕەوەندو چ ئەوانی نیشتەجێ بون، سەرەڕای ئەوەی خۆیان چەکدارو دەستەیەك نۆکەری کەم یا زۆری چەکداری تایبەتی خۆیان هەبوە. زۆریان لەپیاوەکانی خێڵەکەیان کردوە بۆ کڕین‌و پەیداکردنی چەك. هەبونی

ژمارەی زۆرتری چەکدار. نیشانەی پایەی بەرزو زۆریی دەسەڵاتی ئاغاکە بوە لەناوچەکەو لەناو دراوسێکانیدا.
کوردستان وڵاتێکی پیشەسازی نەبوە. کارگەی دروستکردنی چەکی تیا نەبوە. لەنیوەی یەکەمی قەرنی ١٩هەمدا بەدرخان پاشا لەجزیرەی بۆتانو میر محەمەدی سۆران لەرەواندوز بناغەی کارگەی دروستکردنی چەك: خەنجەر، دەمانچە، تفەنگ، تۆپ.. یان دانا. بەڵام لەپاش داگیرکردنەوەی کوردستان ئەو کارگانەش نەمان. کارگەی دروستکردنی چەك لەئێرانو تورکیاش نەبوە. ئەوانیش تۆپو تفەنگیان لەدەوڵەتانی ئەورووپی کڕیوە. چەکی شانی کورد بەگشتی خراپو دواکەوتو وکۆن بوە، مەگەر تاکوتوك چەکی باشو نوێیان هەبو بێ. چەکەکانیان تفەنگی کۆنی پلیتەدار، هەندێ تفەنگی لەبابەتی ئەوانەی دەستی رۆمو عەجەم، خەنجەر، زەرگ، کوتەك... بوە.
لەتەموزی ١٨٨٠ەوە شێخ عوبەیدوڵڵا دەستی کرد بەسازدانی هێزی چەکداری خێڵەکانی شەمزینان، گەوەر، مەرگەوەڕ، تەرگەوەڕ، شنۆ، سەردەشت، سابڵاخ.. بەتایبەتی خێڵەکانی مەنگوڕ، مامەش، پیران، زەراز، شکاك، گەورك، موکری" دیبوکری.
ئەم هێزانە کەسەرچاوەیەکی ئاگاداری وەکو ظل السلطان[٢٥] بە ٣٠هەزار سوارەو پیادەی خێڵەکوردەکانی تەقدیر ئەکا، کەموکوڕی کوشندەیان هەبو:
١-هەبونەتی ئەرکان یا سەرکردایەتیەکی شارەزای زانستەکانی جەنگو تەجروبەی جەنگینی نیزامی نەبو.
٢-لەدەستەو تیپی لەیەکچودا بێ گوێدانە خێڵو ناوچە کۆنەکرابونەوەو رێك نەخرا بون، بەڵکو هێزی هەر خێڵە پێکەوە بەفەرماندەیی سەرۆکی عەشیرەتەکەیان کۆبوبونەوە.
٣-نەفەرماندەکانی هێزەکەو نەجەنگاوەرانی لەشکرەکە مەشقی جەنگی دانەدرا بون.
٤-چەکی قورسیان نەبو، چەکەکانی تریان بەزۆری خراپو کۆنو بەشێکیشیان چەکی ئاگرداریان هەر نەبو.
٥-خۆراكو جلوبەرگو پێویستیەکانی تریان ئەبو لەلایەن خۆیانەوە دابین بکرێ.
٦-لەشکرێکی نارێکوپێك، مەشق نەدیو، بێ دیسپیلین، بێ تەجروبە... بەئارەزوی خۆیان کۆبوبونەوەو بەئارەزوی خۆیشیان بڵاوەیان لێ کرد.

### ٢/٢/٢ قشونی ئێران

ئێران لەچەند قەرنی پێشەوە خاوەنی قشون بو. لەسەرەتای قەرنی ١٩هەمدا لەجەنگی روسی-ئێرانیدا عەباس میرزا سەرکردایەتی هێزەکانی ئێرانی ئەکرد، بۆی دەرکەوت جەنگ لەگەڵ دەوڵەتێکی ئەوروپی بەبێ فێربونی زانستی جەنگو چەکو مەشقی نوێی ئەوروپیەکان کارێکی دژوارە. ناپلیۆن دەستەیەك ئەفسەری فەرەنسی بۆ رێکخستنەوەی قشونی ئێرانو مەشق پێ کردنی بۆ ناردن، بەریتانیا بۆ ئەوەی نفوزی فەرەنسە نە تەنێتەوە بۆ ناوچەکە کارێکی وای کرد کە لەباتی فەرەنسیەکان ئەفسەرانی ئینگلیزی بێنە ناو قشونی ئێرانەوە. بەپێی باشو خراپی پێوەندیەکانی دەرباری قاجار لەگەڵ دەوڵەتانی ئەوروپی" ئەفسەرانی ئینگلیزی، ئیتالی، فەرەنسی، مەجارستانی، روسی، نەمسەیی هاتون بۆ ئێران بۆ رێکخستنەوەی قشونی ئێرانی لەسەر شێوەی سوپاکانی ئەوروپا[٢٦].

لەدوا چارەکی قەرنی ١٩ هەمدا هێزە چەکدارەکانی ئێران ٣ جۆر بون"

١-سوارەی میلیشیا، کەپێك هات بو لەهێزی تیرەو خێڵی شوێنە جیاوازەکانی ئێران بەسەرکردایەتی سەرۆکەکانی خۆیان کۆئەکرانەوە.

٢-قشونی ئێران لەسوارە، پیادە، تۆپخانە کەبەلاسایی کردنەوەی سوپاکانی ئەوروپا رێك خرابون، مەشق درابون چەکدار کرابون.

٣-هێزێکی تری شێوە نیزامی تفەنگدار کەبۆ پاراستنی سەرو سامانی کاربەدەستان لەخەڵکی ناوشارەکان پێك هات بو.

قشونی ئێرانی ئەبو لەنزیکەی ١٠٠ هەنگ پێك بێ. هەر هەنگێکیش ئەبو ٨٠٠ تا ١٠٠٠ کەس بێ. بەڵام لەراستیدا وەکو کیرزن ئەڵێ لە٦٠٠تا ٧٠٠ کەس پێك ئەهاتن. ئەو شوێنانەی ئەم هەنگانەیان لێ دائەمەزرێنرا بریتی بون لە:٢٦ هەنگ لەئازربایجان، ١٢ هەنگ لەخۆراسان، ٧ هەنگ لەمازندەران، ١٠هەنگ لەگەیلان، ٥ هەنگ لەئەسفەهان، ٥ هەنگ لەخەمسە، ٤ هەنگ لەدەماوەند، ٣ هەنگ لەقەزوین، ٤ هەنگ لەکرماشان، ٦ هەنگ لەکزازو زاهان، ٤ هەنگ لەهەمەدان، ٢ هەنگ لەلورستان، ١ هەنگ لەهەریەکێ لەگەروس، گوڵپایەگان، مەلایەر، نەهاوەند، کوردستان.

ناوەندی پادگانەکانی قشون لەم شوێنانە دامەزرابون: تەورێز، تاران، میاندواو، ئەردەبیل، سابلاغ، مەشهەد، سەرخەس، توستاباد، نەسرەت ئاباد،

قاین، ئەنزەلی، ئەسفەهان، موحەممەرە، کەلات، بوشەهر، بەندەر عەبباس، شیراز، سنوری بلوجستان، سنوری کوردستان، سنوری روسیا[27].

دەزگا ئێرانیەکان لە((سالنامە))ی رەسمی خۆیاندا، تێکڕای هێزی چەکداری ئێرانیان دائەنا بە٢٠٠هەزار کەس لەوانە ١٥٠ هەزار نیزامیو ٥٠ هەزار میلیشیا، کێزن ئەم ژمارە گەورەیە بەخۆهەڵ کێشانێکی ناڕاستی دامودەزگاکانی ئێران دا ئەنێ، چونکە خۆی هێزەکانی ئێران، ئەوی کەبەکردەوە لەڕیزی قشوندا بون، بە٣٠هەزار کەس تەقدیر ئەکا.

لەچەکی قورسدا تۆپخانەی ئێران خاوەنی ١٦٤ تۆپی باشو بێ کەڵکی جۆراوجۆر بوە بۆ پێگەیاندنی ئەفسەریش لەسەر ڕێوشوێنی فەرەنسی((کۆلیجی سەڵتەنەتی)) هەمو ساڵ چەندین ئەفسەری پەروەردە ئەکرد[28].

## ٣/٢/٢ دانانی ڕێوشوێنەکانی ڕاپەڕین

### ١-هەڵبژاردنی مەیدانی ڕاپەڕین

شێخ عوبەیدوڵڵا پلانی ڕاپەڕینەکەی وەها دارشت کەهێزە چەکدارەکانی لەپێشدا هەوڵی ئازادکردنی کوردستانی ئێران بدەن، ئینجا هەوڵی رزگارکردنی کوردستانی عوسمانی بدەن، لەبەرئەم هۆیانە:

١-ئێران لەتورکیا لاوازترە.

٢-هێزەکانی ئێران لەو کاتەدا(بەپێی ئاگاداری شێخ) بەشەڕی خێڵە تورکمانەکانەوە خەریکە.

٣-بەشێکی هێزەکانی ئێران کوردن، بەهیوای ئەوە بوە ریزی دوژمن بەجێ بێڵن بێنە پاڵ لەشکرەکەی ئەو.

٤-کوردستانی ئێران ئەرزێکی دەوڵەمەنو بەپیتە، ئەتوانێ ببێتە بنکەیەکی باش بۆ خۆسازدان بۆ ئازادکردنی کوردستانی عوسمانی.

٥-هەروەها زوڵمو زۆری عەجەم، باجو سەرانەی زۆر، جەریمەکردنو سزادانی ناڕەوا، ئابڕوبردنو سوکایەتی پێ کردن، کوشتنو لێدانو راونان... لەکوردستانی ئێراندا گەیشتۆتە رادەی تەقینەوە.

شێخ ناوچەکانی خوارو رۆژئاوای دەریاچەی ورمێی هەڵبژاردو بۆ مەیدانی لەشکرکێشیو ڕاپەڕین دژی دەسەڵاتی ئێرانی، ئەو ناوچانەی تێکەڵاوبون لەکوردو ئازەری کەمایەتی دینیو، لەکۆنەوە مەیدانی ناکۆکی سەختی مەزهەبیی: سوننی- شیعیو، ململانێی خوێناوی نەتەوەیی: کورد- ئازەری بو.

بۆچی ئەم مەڵبەندەی، کەوەکو موزائیکی دین‌و مەزەب‌و زمانی جیاواز بۆ هەڵبژاردو ناوچەیەکی تری کوردستانی ئێرانی هەڵنەبژارد کەتەبایی نەتەوەیی‌و دینی‌و مەزەبیی تێدا بێ؟ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئاسان نیە.

**٢-جوڵاندنی هێزو قۆڵەکانی**

هێزەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا بریتی بو لەپیاوگەلی هۆزە کوردەکانی شەمزینان، تەرگەوەر، مەرگەوەر، زەرزا، پیران، مامەش، مەنگوڕ، گەورك، موکری، دیبوکری...

شێخ لەماوەیەکی کورتدا هەمویانی سازداو لەدو قۆڵەوە جوڵاندنی، قۆڵێکیان بەناو موکریاندا بەسەر بناو و میاندواو نەغەدەو بەرەوژورو، ئەوی تریان بەناو برادۆستدا بۆ سەر ورمێ‌و بەرەوژورو[٢٩].

قۆڵی یەکەمیان: بەسەرکردایەتی شێخ عەبدولقادر(١٨٥٧-١٩٢٥)کوڕی یەکەمی شێخ‌و هەمزاغای مەنگوڕ بە١٥٠سوارەوە لەشەمزینانەوە بەڕێ کەوتن بۆ مەرگەوەڕو لەوێوە بۆ شنۆ. لەسەر داوای هەمزاغا ٨٠٠ سواری مەنگوڕ بەسەرۆکایەتی کاکەللای برای‌و ٣٠٠ سواری پیران بەسەرۆکایەتی مامەنداغاو ٣٠٠ تفەنگچی بەسەرۆکایەتی رەسول ئاغا کۆبونەوە لەشنۆ. هەمزاغا هەوڵی‌دا هەمو سەرۆکی هۆزەکان‌و هۆزەکانیان لەژێر ئالای شێخدا کۆبکاتەوە. هەوڵی زۆری لەگەڵ محەمەد ئاغای مەزنی مامەش‌و بیوك خانی گەورەی قەرەپاپاخدا کەئەوانیش بەشداری راپەڕینەکە بن. محەمەد ئاغا لەسابلاخ هەوڵێکی زۆری‌دا کاربەدەستانی عەجەم لەمەترسی‌و گەورەیی بزوتنەوەکە هۆشیار بکاتەوە، بۆ ئەوەی هەر لەسەرەتاوە رێی تەشەنەکردنی بگرن. دوای ئەوەی لەوان نائومێد بو، راپەڕینەکە پەرەی سەند ئەوسا ئەویش بەناچاری تێکەڵاو بو.

ئەم هێزە لەشنۆوە بەرەو لاجان، پیران، سابلاخ بەڕێ کەوتن. بەدرێژایی رێگا خەڵك ئەهاتن بەپیریانەوە، پیاوەکانیان تێکەڵاوی لەشکرەکە ئەبون، خەڵکی سابلاخ بەدەهۆڵ‌و زوڕناو بەئالاوە چون بۆ پێشوازی شێخ هێزەکەی. هەمو مەڵبەندی موکریان بەبێ بەرەنگاری هێزی ئێرانی ئازاد بو. شێخ عەبدولقادر بارەگای سەرکردایەتی لەکەناری چەمی سابلاخدا دامەزران. چەندین هەزار کەسی پیرو لاوی چەکدارو بێچەکی تێکەڵاو لەدانیشتوانی سەرانسەری ناوچەکە لەشێخ عەبدولقادر کۆبونەوە. بەپێی هەندێ سەرژمێر لەماوەی ئەو چەند رۆژەدا

٩هەزار سوارو ٨ هەزار پیادەو چەند هەزارێکیش بۆ تالآن کۆبونەوە. ئەم ژمارەیە ئەگەر پێوەنانیشی تێدا بێ ئەندازەی جەماوەری بونی راپەڕینەکە دەرئەخەن.

شێخ عەبدولقادر، میرە بەگی خالۆی بە٢٠٠ سوارەوە وەکو بەرایی لەشکر رەوانەی میاندواو کرد. میرە بەگو سوارەکانی لەرێگا کەوتنە بۆسەی عەلی خانی حاکمی مەراغاوە. میرە بەگ کوژراو سەریان بڕی. هێزەکانی کورد لەمە زۆر تورە بون. هێرشێکی توندیان کردە سەر میاندواو.

٢٦ی شوالی ١٢٩٧میاندواو دوای شەڕێکی خوێناوی گیرا. لەم شەڕەدا چەند سەد شیعە کوژران. هەندێ لەخانوو بازاڕی میاندواو دوای تالآن کردن سوتێنران.

٤ زی ئەلقعدە هێزی کورد لەمەلەك کەندیەوە بەرەو بناب بەڕێ کەوت. خەڵکی بناب چونکە هەواڵی کوشتارو سوتاندنی میاندواویان بیست بو هەمو خۆیان بۆ بەرگری ئامادە کرد بو. مەلا عەلی قازی، کەئاخوندێکی شیعە بو، کەوت بوە هاندانو سازدانی خەڵکی بنابو بۆ بەرهەڵستی کورد. خەڵکی بناب بەرگرییەکی ئازایانەیان لەخۆیانو شارەکەیان کرد. چەند هێرشی کوردەکانیان شکاند. هاوزەمان لەگەڵ سەرنەکەوتنی ئەم هێرشانەدا، هێزێکی ئێرانی بەسەرکردایەتی ئعتماد ئەلسەڵتەنە کەپێك هات بو لە٦ هەزار پیادەو ٢٥٠٠سوار گەیشت بونە نزیك بنابو بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە. هێزەکانی شێخ لەگرتنی بناب نائومێد بونو کەوتنە بڵاوە لێ کردنی نارێکوپێك. شێخ عەبدولقادر کشایەوە مەلەك کەندیو لەوێوە بۆ سابلآخ.

٢٧ زی ئەلقعدە کونسوڵی ئینگلیز، ئابوت لەورمێوە گەیشتە سابلآخ. نامەی شێخ عوبەیدوڵلآی هێنا بو لەوێوە رەوانەی تەورێزی بکەن. شێخ عەبدولقادر بۆ پاراستنی هەمزاغای فەتاحی بە١٥٠ سوارەوە لەگەڵ نارد تا نزیك بناب بەڕێیان کرد. ئابوت لەوێ فەرماندەی هێزەکانی ئێرانی دیو هەرچی ئاگاداریەکی لەسەر هێزەکانی راپەڕینەکە هەبو بەئێرانیەکانی وت.

لەسەرەتای زی ئەلحجەدا قشونی بەسەرۆکایەتی ئعتماد ئەلسەڵتەنە لەبنابەوە بەرەو سابلآخ جولا بۆ دوکەوتنی هێزی شۆڕش. لەهەمان کاتدا ٥٠٠ کەسی شاهسیۆن بەسەرۆکایەتی فرجی خانو نەجەفقلی خانی یورتچی کەلەتەورێزەوە بۆ یارمەتی دانی هێزی دەوڵەت هات بون تاگەیشتنە سابلآخ بەهەر کوێدا رائەبوردن تالآنیان ئەکرد.

هێزەکانی عەبدولقادر نەیان توانی لەبەردەم هێزەکـانی دەوڵـەتدا رابوەسـتن. کەوتنە کشانەوە بەرەو شنۆ.

قۆڵی دوەمیان: بەسەرکردایەتی شێخ عوبەیدوڵلا خۆی.

شێخ پێشتر هێزێکی بەسەرکردایەتی شـێخ محەمـەد سـدیق کـوڕی دوەمـیو خەلیفە محەمەد سەعید نـارد بـوە ناوچـەکە بـەهاوکاری شـێخ محەمـەد ئـەمین کەیەکێ لەگەورەکانی کوردی ئەوێ بون، کەوت بونە سازدانی هێز.

١٤ی زی ئەلقعدەی ١٢٩٧ شێخ عوبەیـدوڵلا بـەهێزێکی گـەورەی ئیلاتـەوە لەمەرگەوەڕەوە بەرەو ورمێ بەڕێ کەوت. بۆ حەسانەوە چەند سەعاتێ لەبارانـدوز لایدا. لەوێوە راستەوخۆ چو بۆ گوندی سـیری نزیکـی شـاری ورمـێ. هێزەکـانی نزیکەی ١٢ هەزار کەس ئەبو. لەوکاتەدا هێزێکی ئەوتۆ لەورمێ نەبو بیپارێزێ. فەوجەکانی ئەفشار بەفەرماندەیی ئقبال ئەلدەولە لەقەڵای بدلبو هـەڵیاندا بـو. شێخ ئەو هەلەی لەدەسدا. لەباتی ئـەوەی یەکسـەر هەڵبکوتێتـە سـەر ورمـێو بیگرێ. لەوێ راوەستاو رۆژی دوایی دو نامەی نوسی" یەکێکیان بۆ مـیر جـەمال ئەلدین ئاغای شێخ ئەلسلامی ورمێو ئەوی تریان بۆ میرزا حسێن ئاغای مجتهد. شێخ لەنامەکانیدا داوای لێ کرد بون هاوکاری لەگەڵ بکـەن. شـار بـەبێ شـەڕ بەدەستەوە بدەن، سیورساتی لەشکرەکەی دابین بکەن، ئاگاداری کرد بـون، تـەنیا دو رۆژ لەوێ ئەمینێتەوە لەمزگـەوتی جـامعی نوێـژیان لەگـەڵ ئـەکاو لـەوێوە ئەچێتە سەر تەورێز.

ئەوانەش کەڵکیان لەنامەکەی شێخ وەرگرت بـۆ دواخسـتنی هێرشـەکەی تـا رێوشوێنی پاراستنی شارەکەیان دابنێنو ئاگادری ئقبال ئەلدەولەو کاربەدەستانی تری ئێران بکەن، لەوەڵامدا داوایان لەشێخ کرد ٣ رۆژ مۆڵەتیان بداتێ بۆ ئـەوەی خەڵك ئاگادارو خۆیان بۆ پێشوازی ئامادە بکەن. شێخ دو رۆژ مۆڵەتی دان، بەڵام ئاخوندەکانی ورمێ لەباتی ئەوەی شار بۆ پێشوازی شێخ ئامـادە بکـەن، کەوتنـە خۆسازدانو قایم کردنی دیوارو بورجو باروی شار بۆ بەرهەڵستیو نامەشـیان بـۆ ئقبال ئەلدەولە نارد بەزویی بگەڕێتەوە، مشـوری پارێزگـاری ورمـێ لەهێرشـی چاوەڕوانکراوی شێخ بخوا.

هێشتا مۆڵەتی شێخ تەواو نەبو بوو ئقبال الدولەو فەوجەکانی بەر فـەرمانی گەیشـتنەوە ورمـێ. شـێخ محەمـەد ئـەمینو خەلیفـە محەمـەد سـەعیدیش بەهێزەکانیانەوە گەیشتنە لای شـێخ. ئـەو هێزانـەی لەشـێخ کۆبوبونـەوە، وەکـو

هەندێ سەرچاوە ئەڵێن، خۆی لە ٣٠ هەزار کەس ئەدا[٣٠]. ئەم ژمارەیە ئەگەر پێوەنانیشی تێدا بێ دیسان رادەی قوڵی رەگی راپەرینەکەی لەناو گەلی کوردا دەرئەخا.

ئقبال ئەلدەولە دەسبەجێ کەوتە دانانی رێوشوێنی پارێزگاری شار. مزگەوتی یورد شای کردە بارەگای فەرماندەیی. جگە لەهێزە نیزامییەکانی، هەمو ئاخوندو بازرگانو گەورەکانی ورمێ لەگەڵ دانیشتوانی شارەکە دەستیان دایە چەكو بەسەر دەروازەو بورجو بارو وگەرەکەکانی شاردا دابەش بون بۆ بەرهەڵستی هێرشی کورد. ناکۆکیەکە بەتەواوی رەنگی مەزهەبییو نەتەوەیی بەخۆیەوە گرت بو. هەمو کوردی سوننە لەلایەكو هەمو عەجەمی شیعەش لەلایەك. بۆچی راپەرینی رەوای کورد بەو جۆرە لەلایەن گەلی ئازەرییەوە دوژمنایەتی کراو بەرلەوەی هێزەکانی دەوڵەت سەرکوتی بکەن ئەوان بەرەنگاری راوەستان؟ رەنگە وەڵامی ئەمە لەبەشەکانی یەکەمو دوەمی ئەم باسەدا دەربهێنرێ.

شێخ عوبیدوڵلا تێ گەیی مۆڵەتەکەیان بۆ بەدەستەوەدانی شار نەبو، بەڵکو بۆ تەفرەدانی ئەوو بۆ بەسەربردنی کات بوە تا خۆیان بۆ بەرگری ئامادە بکەن.

شەوی ١٨ ی زی القعدە یەکەمین هێرشی کورد بۆ سەر ورمێ دەستی پێ کرد. ئقبال ئەلدەولەو هێزەکانیو خەڵکی ورمێ زۆر بەتوندی بەرپەرچی هێرشەکەیان دایەوە. هێرشەکە هیچ سەرکەوتنێکی بەدەس نەهێنا.

هەرچەندە لەنێوان شێخ عوبەیدوڵلاو ئقبال ئەلدەولەدا چەند جارێ نامە ئاڵوگۆڕ کراو، چەند جارێ نوێنەرانی خەڵکی ورمێ چونە لای شێخ بۆ مۆڵەت وەرگرتنو کونسوڵی ئینگلیزیش ویستی ناوبژی بکا، بەو هۆیانەوە جاروبار شەڕ رائەوەستا، بەڵام پێکادان وەکو لەشەوی ١٨ی مانگەوە دەستی پێ کرد بو تا رۆژی ٢٨ی زی ئەلعقدە لەبەردەمی دیوارو قەڵاو بورجو باخەکانی ورمێدا درێژەی کێشا، بێ ئەوەی هێزەکانی کورد بتوانن شارەکە یاهەندێ گەرەکی بگرن. ئقبال ئەلدەولە بەهیوای گەیشتنی هێزی یارمەتی ئێران ئەی ویست کاتەکە بەسەر بەرێ. هێزەکانی کورد زیانی گیانی زۆریان لێ کەوت بو. هەر لەهێرشی شەوێکیاندا وەکو عەلی ئەفشار نوسیوێتی ئەبێ نزیکەی ٢٥٠٠کورد کوژرا بێ.

٢٩ی زی ئەلعقدە ئەمیر تیمور پاشا خانی سەرداری ماکۆ بە٦ هەزار سوپاییانی خویو سەلماسو ماکۆ لەچیمەنی درشکی سەلماسەوە بەرەو ورمێ جوڵاو هەمان رۆژ گەیشتە قوشچی. شێخ عوبەیدوڵلا هەمو هێزەکانی بردە قەڵای

ئیسماعیل ئاغا بۆ ئەوەی رێ لەتیمور پاشا خان بگرێ. یەکەمین پێکدادانی هێزەکانی ئەمیر تیمورو شێخ عوبەیدوڵلا لەقیزلار قلعە بەقازانجی ئێران تەواو بو. ئەمیر تیمور بەرەو ورمێ کەوتە رێو لەدەرەوەی شار بارگەی خست. هێزەکەی تیمور پاشا هەر ئاواییەکی لەسەر رێدا بوو تالانی کردو هەمو ئەوانەشی سەر بڕی کە لەهێزەکەی شێخ بە دیل گرت بونیو، کەللەکانی وەکو نیشانەی سەرکەوتنی خۆی نارد بۆ تەورێز.

شێخ هێزەکانی رێك خستەوە. لەئێوارەی ٤ زی ئەلحجەدا لەکێوی جهودلرەوە کەئەیڕوانی بەسەر ئۆردوگاکەی تیمور پاشا خاندا هێرشێکی سەرنەکەوتویان کرد. هێزی عەجەم هێزەکانی راپەڕینەکەی شکاندو بەرەو دواوە راوی نا. هێزەکانی شێخ جارێکی تریش لەهەمان شوێنەوە پەلاماری ئۆردوگاکەیاندا، بەلام ئەمجارەش بێ هودە بو.

هاوزەمان لەگەڵ بەخۆکەوتنی جەنگیی دەرباری قاجارو سازدانو بەرێ کردنی قشونو میلیشیای ئیلات بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینەکە، تەقەللا دیپلۆماسیەکانی شا سەرکەوتنی بەدەس هێنا. لەلایەکەوە ئەلیکسەندەری دوهەم فەرمانیدا بەهێزەکانی روسیە لەقافقاس بچێتە سەرسنوری ئازەربایجانی خوارو، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا بەقازانجی ئێران خۆیان لەجەنگ هەڵقورتێنن. لەلایەکی ترەوە گەلە کۆمەکیی دیپلۆماسی، روسی، بەریتانی، ئێرانی لەئەستەموڵ توانی بابیعالی ناچار بکات، هێزەکانی خۆی لەموش، بتلیس ئەرزرۆم، ئەرزنجان، وان کۆبکاتەوە بەرەو هەکاریو مەڵبەندەکانی راپەڕینی بنێرێ، شوێنی ستراتیجیەکان بگرنو سنوری ئێرانی- عوسمانی قایم بکەن.

### ٤/٢/٢ کشانەوەو تێشکان

هێزەکانی هەردو قۆڵەکە پشێوی تەواویان تێ کەوت. هەندێکی دوای بەدەس هێنانی تالان بێ پرس گەڕانەوە ماڵی خۆیان. هەندێ ورەی بەرداو لەترسی گەیشتنی هێزەکانی ئێران بلاوەیان لێ کرد. هەندێکیشیان بەنهێنی یا بەئاشکرا ریزی راپەڕینیان بەجێ هێشتو. دایانە پاڵ دوژمن.

هێزەکانی ئێران کەوت بونە راونانی هێزەکانی راپەڕین. لەهەمان کاتدا بەتوندی کەوتنە سزادانی بەکۆمەڵی خەڵك. دانیشتوانی گوندەکانیان بەزۆری ئەکوشت. ماڵو داراییان تالان ئەکردنو ئاواییەکانیان ئاگر ئەدان، ئەو خەڵکەی توانی لەپەلامار رزگار ببێ پەنایان بردە بەر ناوچە شاخاویەکانی سەرسنوری

عوسمانی- ئێرانی. هێزەکانی هەردو قۆڵەکەی لەشکری شێخ بەناڕێکوپێکی بڵاوەیان لێ کرد. شێخ عوبەیدوڵلاو عەبدولقادرو محەمەد سدیقی کوڕی لەگەڵ هەندێ لەهێزەکانی لەمانگی زی الحجە ١٢٩٧(تشرینی دوەمی ١٨٨٠)لەسنور پەڕینەوە بۆ ناو خاکی عوسمانیو گەڕانەوە بۆ ناوچەی شەمزینان. هەمزە ئاغاش بەچیای قەندیلدا ئاوای دیوی مەنگوڕایەتی بو.

پلانی جەنگی ئازادکردنی کوردستانی ئێران بەتێشکان دوایی هات. لەشکری راپەڕین نەیتوانی سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێ لەئازادکردنی شاری گرنگ یا شوێنی ستراتیجیدا، تەنانەت راپەڕینەکە نەتەنیەوە بۆ ناوچەکانی سنەو کرماشان کەبەشێکی گرنگو فراوانی کوردستان بو.

هەروەها لەبەر ناڕێکوپێکیو بێ دیسپلینیو بێ سەروبەری نەیتوانی لەچەن هەفتەیەك زیاتر خۆی رابگرێ چ بۆ هێشتنەوەی ئەو شوێنانەی ئازادکرا بونو لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بون. چ بۆ بەرەنگاری شکاندنی هێرشی قشونی ئێران.

لەبەر نەشارەزایی لەزانستەکانی جەنگو تاکتیکەکانیدا نەیتوانی جەنگی نیزامی لەگەڵ قشونی ئێران بکا. هەروەها نەیتوانی درێژە بەکاری چەکدار بدات بەشێوەی جەنگی پارتیزانی.

قشونی ئێران وەکو کیزن نوسیوێتی کەپێکهات بو لە٢٠هەزار کەسو چەند عەرادەیەك تۆپ بەسەرکردایەتی حشمت الدولە[31] کەوت بوە رێ بۆ دامرکاندنەوە راپەڕینەکە. حشمت الدولە لەرێگا مرد. لەبەرئەوە ناصرالدین شا فەرمانیدا بەمیرزا حسێن خان سەرکردایەتی عملیاتەکە بگرێتە ئەستۆ. چەند ئەفسەرێکی نەمسەییش لەناو قشونی ئێراندا بون. سوپاسالار گەیشتە سلدوز. کۆتایی هێنا بەسزادانی بەکۆمەڵی خەڵك" کوشتارو تاڵانو ئاگردانیماڵو ئاوایی. رۆژی ١٢ی محەڕەم ئەلحەرام گەیشتە ورمێ. لەوێ کەوتە رێکخستنەوەی کاروباری ناوچەکە. میرزا رەزا خانی سەرتیپو معین الصدارە ومیرزا هاشم خانی سەرپەرشتی ئەرمەنیەکانی نارد بۆ گفتوگۆ لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانی دەربارەی شێخ عوبەیدوڵلاو هاوکارەکانی[32].

### ٥/٢/٢ گفتوگۆ لەگەڵ تورك

کاربەدەستانی تورك ئەیان ویست شێخ بەخۆشی بخەنە داوەوە. کەوتنە هاتوچۆ بۆ لایو گفتوگۆ لەگەڵی بۆ ئەوەی بیبەن بۆ ئەستەموڵ" شێخ ئەبێ خۆی هیوای

بەبەڵێنەکانی تورك هەبو بێ. چونکە بەو بۆنەیەوە ئەم نامەیەی بۆ کوردەکانی سنورو بۆ ئاوارەکان نوسیوە:

((لەپاش پێ ڕاگەیاندنی سەلامی موشتاقانە

هەر کات لەڕوی خۆشەویستیەوە ئەحواڵی ئەم لاپرسن بحمدالله کارەکان لەلایەن لای بڵندی دەوڵەتی باڵاوە بەئارەزوی دڵی خۆشەویستانە. لەمرۆژانەدا جەنابی سەعادەت مەئاب ئەحمەد بەگ یاوەری حزوری هومایۆنی حەزرەتی شاهانە، خلد الله ملکە، بۆ هەندێ کاروباری نهێنی نێردرا بوە ئێرە، هاتو والحمدلله لەهەمو رویەکەوە کارەکان رو بەرێگەو بەپێی مەبەستە. ئەگەر ئیفاقی ئەهالی کوردستان و بێ سەبری ئاوارەکان نەبێ کار بەئەنجام گەیشتوەو دروست بوە. چونکە هەمو دەوڵەتان حکومەتی عەجەمیان بەناهەق دانـاوەو هەقیان بەئێمە داوە. بڕیار وایە کوردستان تەسلیمی خۆمان بکەن. لەبەرئەوەیە عەجەم شڵەژاون و هەوڵی ئیستیمالەتی ئاوارەکان ئەدەن، هەڵبەت ئەوەندەی لەتوانای ئێوەدا بێ ئەبێ هەوڵی ئیتیحادو ئیتیفاقی کوردستانی ئەولا بدەن و ئاوارەکان تەقویەو تەوسیە بکەن کەئارام بگرن و بێ سەبری نەکەن و بەدرۆو دەلەسەی ئێرانیەکان هەڵ نەخەڵەتێن و هەرکەس بێ ئیزن و ئیجازەی ئێمە هاتوچۆ بکاو بگەڕێتەوە بەدوژمنی گەورەی ئێمە دائەنرێ.

چاوەڕوانی وەڵامی سەلامەتی و مەرجوعاتم[٣٣]

کاربەدەستانی تورك هێزێکی زۆریان هێنابوە ناو کوردستانەوە. لەباتی ئەوەی کوردستان تەسلیمی شێخ بکەن وەکو گفتیان پێ‌دا بو، بەگیاوی ڕەوانەی ئەستەموڵیان کردو لەوێ دەسبەسەر دایان نا.

## ٣/٢ ئەفەندیلای جێبەجێ کردن: کاری دیپلۆماسی

### ١/٢/٢ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست: مەیدانی ئەڕاتێنی روس و ئینگلیز

لەدوا چارەکی قەرنی ١٩ هەمدا دەوڵەتە ئەوروپییەکان لەبواری پیشەسازیدا لەپێشکەوتنی خێرادا بون. بۆ بەدەسهێنانی بازاڕی ساخکردنەوەی کەلوپەلەکانیان و، بۆ بەدەسهێنانی کەرەستەی خاوی پێویست. لەململانێیەکی سەختی سیاسی، ئابوری، فەرهەنگی...دا بون لەپێناوی دابەش کردنی وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقادا بەناوچەی نفوزی خۆیان.

بەریتانیا هیندستانی کردبوە کۆلۆنی خۆی. پارو پارو چەندین شوێنی ستراتیجی لەسەر ڕێگای نێوان بەریتانیاو هیندستاندا لەدەوڵەتی عوسمانی

داگیرکرد بو. مالتا(١٨٠٠)، عەدەن(١٨٣٩)، قوبروس(١٨٧٨)، قەناتی سویس(١٨٨٣). دوایی تریش ئەمارەتەکانی تری خەلیجی فارس.

روسیاش لەفراوانخوازی بەرو خواری خۆیدا لەچەند شەڕێکدا ئێرانی شکاند بو. پەیمانی گولستان(١٨١٣)ی بەسەرا سەپاند. لە١٨٢٩دا دیسانەوە روسیە بیانوی بەئێران گرتەوەو کەوتەوە جەنگ لەگەڵی‌و پەیمانی تورکمان چای بەسەرا سەپاند. روسیە لەسالانی ١٨٦٨، ١٨٧٣، ١٨٧٦ خانەکانی بوخاراو خیوەو جوقندی خستەژێر دەستی خۆی. روسیە لەرۆژئاوای دەریای قەزوینەوە گەیشت بوە سەر ئاوی ئاراس‌و لەلای رۆژهەلاتیەوە سەر روباری ئەترەك. لەرۆژهەلاتی سنوری عوسمانیش‌دا لەدوای پەیمانی بەرلین(١٨٧٨)قارس، ئەردەهان، باتومی پێ بڕاو، بەردەوام بو لەهاندانی گەلە مەسیحیەکانی بالقان‌و ئەرمەنی دژی بابیعالی.

روسیاو بەریتانیا دو هێزی سەرەکی بون لەسەر بەهێزکردنی نفوزی خۆیان لەناوچەکەدا لەگەڵ یەکتری لەململانێ‌دا بون. بەلام کەمەترسی هاتنی هێزێکی سێیەم، وەکو ملۆزمی ئەم دوانە، پەیدابو بێ. ئەوسا ململانێی بەینی هەردوکیانی خاوکردۆتەوە تا ئەویان دەرئەکرد.لەسەرەتای قەرنی ١٩هەمدا بەرامبەر مەترسی ناپلیۆن ئەمەیان کرد، هەروەك لەکۆتایی قەرنی ١٩هەمدا لەگەڵ پەیدابونی مەترسی ئەڵمان‌دا هەمان گەمەیان دوبارە کردەوە.

روسیاو بەریتانیا بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان جگە لەسەفارەتەکانیان لەئەستەمولّ‌و تاران، چەندین کونسولگەیان لەشارە گرنگەکانی ئێران‌و تورکیا دامەزراندبو.

هاونیشتمانانی ئەوروپی بەتایبەتی روس‌و ئینگلیز لەسەرانسەری رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بەناوی گەشت، گەڕانی ئارکیۆلۆجی، لێکۆڵینەوەی جوگرافی، کڕین‌و فرۆشتنی کەلوپەلی بازرگانی... زانیاریان لەسەر هەلومەرجی سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابوری، فەرهەنگی گەلانی ناوچەکەو شوێنە ستراتیجیەکانی کۆئەکردەوە بۆ دانانی نەخشەی جێگیرکردنی نفوزی سیاسی‌و ئابوری خۆیان.

بەناوی پارێزگاری‌و یارمەتی دانی مەسیحیەکانەوە میسیۆنیەکان چەندین بنکەیان لەژێر ناوی کەنیسە، قوتابخانە، نەخۆشخانەدا دامەزراند بو. ئەوانیش لەپاڵ دەزگا سیاسی‌و ئابوریەکانی تری ولاتەکەیان خزمەتی ستراتیجی دەوڵەتەکانی خۆیان ئەکرد.

بـەناوی چـاککردنی دەزگـای بەڕێوەبەرایەتیـەوە سـەدان بێگانـە لـەدەزگا ئیداریەکانی عوسمانیو ئێرانیدا کاریان ئـەکردو بـەناوی ڕێکخسـتنەوەی هێـزە چەکدارەکانی هەردو دەوڵەتەوە سەدان ئەفسەری ئەورروپایی لـەڕیزی سـوپاکانی ئێرانو تورکیادا کاربەدەست بون.

هاونیشـتمانانی ئـەورروپایی لەگەڵـەمرەوی ئـەم دو دەوڵەتـەدا مـافی کاپتیولاسیون واتە مافی دادگای کونسـوڵیان هـەبو کـەهیچ هاونیشـتمانیەکی خۆیان نی بو.

روسیا خاوەنی گەورەترین هێزی زەمینـی ئەوسـای دنیـا، گـەورەترین هێـزی ناوچەکەش بو، هاوسنور بو لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمـانیو هاوسـنور بـو لەگـەڵ دەوڵەتی ئێران، نفوزی سیاسی، ئابوری، جەنگیی بەهێزی تێدا کردبون.

بەریتانیاش خاوەنی گەورەترین هێزی دەریایی ئەوسـای دنیـا، بـەهۆی بـونی لەهینـدو بنـەککانی لـەماڵتا، قـوبروس، عـەدەن، شـێخ نشـینەکانی خـەلیج، ئەگەرچی هاسنوری هیچکام لەتورکیاو ئێران نەبو بەڵام نفوزی سیاسی، ئابوری، جەنگیی بەهێزی لەناویاندا هەبو.

ئاڵمانیاش کەتازە دەوڵەتی یەکگرتوی نەتەوەیی خۆی دروست کرد بـو، وەکـو هێزێکی پیشەسازی گرنگی دنیا، هات بوە مـەیدانی ململانێوە لەناوچەکەدا بـۆ ئەوەی ئەویش جێگە پێی خۆی بکاتـەوە. هـەر بـەو پێیـەش فەرەنسـا، ئیتاڵیـا، نەمسە...

سەرزەمینی ئێرانو عوسمانی بو بون بەمەیدانی ململانێیەکی سەخت لەنێوان دەوڵەتانی ئەورروپیدا، بەڵام روسیا لەلایەكو بەریتانیا لەلایـەکی تـرەوە کـەهێزە نفوز دارەکانی ناوچەکە بون هەوڵیان ئەدا ڕێ بگرن لـەهاتنی نفـوزی هێزەکـانی تر. بەهۆی پێشکەوتنی خێـرای ئـەورروپاو مانـەوەی ڕۆژهـەڵات بەدواکـەوتویی، بەهۆی بەسترانەوەی ئابوری دواکەوتوی ناوچەکە بەئابوری پێشکەوتوی دەوڵەتانی ئەورروپییەوە، دەلاقەیەکی گەورە لەنێوان ئەم قاڕەیەدا دروست بو. تەنگوچـەڵەمەی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی.. ئێرانو تورکیا قوڵ تر بو. داوودەزگا دەوڵەتیەکان زیاتر بەرەو فەساد ئەڕۆیشتن. زوڵمی زۆرتریـان لەخـەڵك ئـەکرد. زۆرتـر ئـەبون بەژێرباری قەرزی دەوڵەتانی دەوڵەمەنی ئەورروپاوە. زیاتر ئەکەوتنـە ژێرهەرەسـی نفوزی ئەوانەوە, چارەنوسی مـەسەلە گرنگەکانی ناوەویان لەلایەن ئەوانەوە بڕیـار ئەدرا.

### ٢/٣/٢ بۆچونەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا

شێخ عوبەیدوڵڵا لەناو ئەو هەلومەرجە ناوەکیو دەرەکییەدا کەوتە کارکردن بۆ جێبەجێ کردنی ستراتیجەکەی. گرنگی دەوری دەوڵەتانی ئەزانی لەبڕیاردانی چارەنوسی گەلاندا، بەتایبەتی خۆی بەشداری جەنگی روسی-عوسمانی(١٨٧٧)بو، ئەو شەڕەی روسیا بەبیانوی لەسەرکردنەوەی نەتەوە مەسیحیە زۆرلێکراوەکانی بالقانەوە دژی عوسمانی هەڵی گیرساندو، لەئەنجامی سەرکەوتنی روسیاو ژێرکەوتنی عوسمانیدا، پەیمانی سان ستیفانوی بەسەرا سەپاند، کەئەبو دەست لەچەندین ناوچەی فراوانی بالقانو قافقاسو ئاسیای بچوك هەڵبگرێو، دوایی تریش لەباتی ئەو لەپەیمانی بەرلیندا لەژێر گوشاری دەوڵەتانی ئەوروپیدا دەستی لەچەند شوێنی قەڵەمڕەوی خۆی هەڵگرتو دانی نا بەئازادی دینیو ئازادی نەتەوەیی چەندین گەلی ژێردەستەی خۆیدا.

شێخ عوبەیدوڵڵا ئەیزانی دەوڵەتانی گەورەی ئەوروپی ئەتوانن دەوڵەتان بڕوخێننو دەوڵەتان دروست بکەن، بەڵام شارەزای ململانێی ستراتیجیی دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپاو، ململانێی ستراتیجی روسی- ئینگلیزی لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو، ستراتیجی هەریەکەیان لەناوچەکەدا نەبو، کەبێگومان ئەم شارەزاییە ئەی توانی دەورێکی کاریگەری هەبێ لەداڕشتنی ستراتیجی بزوتنی دیپلۆماسی جوڵانەوەکەدا، بەجۆرێکی ئەوتۆ کە بەتەواوی ناکۆكو راستەوخۆ پێچەوانەی یەکتری نەبن.

یەکێ لەئوسلوبە سەرەکیەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ جێبەجێ کردنی ستراتیجەکەی کاری دیپلۆماسی بو، لەبەرئەوە لەپێش کۆکردنەوەی هێزی چەکدارو دەسکردن بەلەشکرکێشی بۆ رزگارکردنی کوردستان لەدەسەڵاتی عەجەمو رۆم کەوتە بزوتنی دیپلۆماسی. کەوتە هەوڵی دروست کردنی پێوەندی لەگەڵ نوێنەرایەتی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان بەناردنی نامەو یادداشت، ناردنی نوێنەری تایبەتی بۆ گفتوگۆو رونکردنەوەی باری سەرنجی خۆی لەسەر هەلومەرجی کوردستانو ناوچەکەو جیهان.

شێخ عوبەیدوڵڵا دەوڵەتی نەبو تاداوودەزگای کاروباری دەرەوەی هەبێ، دیپلۆماتی پسپۆڕو شارەزای کاروباری سیاسەتی جیهانی هەبێ، زانستگەو شوێنیی پێگەیاندنی دیپلۆماتو زانای قانونو سیاسەتو جوگرافیو پێوەندی ناو دەوڵەتانی هەبێ، هەروەها حیزبیشی نەبو کەچەند کەسێکی تەرخان کراوی

هەبێ بۆ لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی کاروباری سیاسی ناوچەکەو جیهان‌و دانانی ڕێوشوێنی کاری سیاسی- دیپلۆماسی، سەرباری ئەمانەش دوا کەوتویی کوردستان لەباری پێوەندییەوە" نەبونی ڕێگاوبان، تەلەگراف، ڕۆنامەو گۆڤار...

شێخ عوبیدوڵلا خۆی سەرکردەی جوڵانەوەکە بو. بیروبۆچونەکانی ئەویش بڕیاردەر بون لەدیاریکردنی ڕێبازو چوارچێوەی پێوەندیەکانی لەگەڵ دنیای دەرەوە. بەلام ئاخۆ هەر ئاوات‌و ئارەزوەکانی شێخ‌و ئایدیۆلۆجی‌و جۆری فەرهەنگ‌و پەروەردە بونی خۆی تەنیا سەرچاوەی دارشتنی چوارچێوەی کاری دیپلۆماسی جوڵانەوەکە بون، یاخود ((بینە))ی ناوەکی کوردستان‌و((بینە))ی دەرەکی-ناوچەیی‌و جیهانی کاریان تێ کردوە؟

بێگومان فاکتەری جیۆپۆلەتیك دەورێکی کاریگەری هەبوە لەدیاریکردنی بۆچونەکانی شێخ عوبەیدوڵلا. هەڵکەوتی جوگرافی کوردستان لەبەینی ئێران‌و عوسمانی‌دا، هاوسنوری لەگەڵ روسیەی بەهێزدا، کەچەندین شەڕی سەرکەوتوانەی لەگەڵ هێزی عوسمانی کردبو و شکاندبوی، تێکەلاوی کۆمەلایەتی، بازرگانی، فەرهەنگی کوردەکانی هەردو دیوی سنوری عوسمانی-روسی، ئێرانی-روسی، نەبونی سنوری سیاسی کوردستان لەگەڵ هیچ دەوڵەتێکی تری دنیا جگە لەروسیا، نەبونی سنوری دەریایی، کەمێ توانای ماددی جوڵانەوەکە، نزمی ئاستی بەرهەم هێنانی خەڵك، نەبونی کارگەی دروست کردنی چەك‌و تفاقی جەنگی، نفوزی بەهێزی روس‌و ئینگلیز لەناو هەردو دەوڵەت‌و لەناو دانیشتوانی ناوچەکەدا.. ئەمانە بێگومان دەوری کاریگەریان هەبوە لەدیاری کردنی بۆچونەکانی‌دا.

### ١-ئامانجی لەبزوتنی دیپلۆماسی

بۆ ئەوەی یەکێ مافی خۆی بەدەست بهێنێ، ئەبێ لێوەشاوەیی خۆی بسەلمێنێ، ئەبێ لەخەڵکی‌تر بگەیەنێ کەبەدەستهێنانی ئەم مافە بۆ ئەو، ئەگەر قازانج بەوان نەگەیەنێ نابێتە هۆی زەرەر لێ دانیان. کوردیش کەخاوەنی دەوڵەت نەبوە، لەریزی دەوڵەتانی جیهاندا جێیەکی نەبوە، بۆ ئەوەی مافی هەبونی دەوڵەت بەدەس بهێنێ ئەبو لێوەشاوەیی خۆی بسەلمێنێ، ئەبو لەدەوڵەتانی تر بگەیەنێ کەنەك زیانی بۆ ئەوان نابێ، بگرە قازانجی لێ ئەکەن. ئەبو بەهانەی بەجێی بەدەستەوە بێ بۆ خۆجیاکردنەوەی لەدەسەلاتی عوسمانی‌و ئێرانی.

کوردستان وڵاتێکی شاخاویە، هەرگیز دەسەڵاتی ناوەندی بەهێزی دەوڵەتێکی خۆجێی تیا دانەمەزراوە. هەمیشە لەژێردەسەڵاتی بێگانەی داگیرکەرا بوە. دەسەڵاتی دادگەری تێدانەبوە. بنەماڵە، هۆز، خێڵ، گوند، پێڕەوانی مەزەب و دین بۆ پاراستنی خۆیان و بەرژەوەندیەکانیان ناچار بون پشت بەهێزی تایبەتی خۆیان ببەستن. ئەرزی کوردستان هەمیشە جێگەی چاوتێ برینی نەتەوە بەهێزەکانی ناوچەکەو مەیدانی زۆرنبازی خویناوی دەوڵەتەکانی ئەوان بوە. ململانێی دەسەڵاتی ناوەندیی رۆم و عەجەم لەگەڵ دەسەڵاتە خۆجێییەکانی بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتی ناوەندی لەکوردستاندا، ململانێی رۆم و عەجەم لەکوردستاندا بۆ دەسکەوتی ئەرزی، ململانێی هۆزو خێڵەکان لەسەر دەسکەوتی ناوچەیی لەناو خۆیاندا... ئاسایشی لەکوردستان بڕی بو. ئەوروپییەکان لەرێگەی ئەو گەشتکەرو گەڕیدانەوە کەهات بونە کوردستان یا بەکوردستاندا تێ پەڕی بون، وێنەی گەلێکی دواکەوتو، نەخوێندەوار، دڕندە، شەڕانی، فەناتیك، جەردە، رێگر، تالانکەر.. کەلێوەشانەوەی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەی خۆی نیە، چو بوە مێشکیانەوە، شێخ عوبەیدوڵلا ئەیویست ئەو وێنەیە چاك بکات و، پێیان بسەلمێنێ کوردیش ئەگەر کاروباری خۆی بەدەست خۆیەوە بێ، لەکوردستاندا ئاسایش جێگیر ئەبێ، جەردەیی و دزی تالان و شەڕشۆڕ نامێنێ، کاروانی بازرگانی بەئەمینی هاتوچۆ ئەکا. خوێندەواری بڵاوئەبێتەوە، لێوەشاوەیی دروست کردن و بەڕێوەبردنی دەوڵەتی خۆی هەیە.

ئەگەر ناوەڕۆکی نامەکانی شێخ عوبەیدوڵلاو وتوێژەکانی خۆی و نوێنەرەکانی لەگەڵ ئەوروپییەکان لێك بدرێتەوە، دەرئەکەوێ کەمەبەستەکانی شێخ لەبزوتنی دیپلۆماسی بەرەو دەوڵەتانی ئەوروپی بریتی بوە لە:

١-خۆشناوکردنی کوردو سەلماندنی رەوایی جیابونەوەی لەئێران و تورکیاو بەدەستهێنانی مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی.

٢-ریسواکردنی زوڵم و زۆری رۆم و عەجەم لەکوردستانداو، بەپاڵدانی هۆی ئەو کردەوە خراپانەی رو ئەدەن بەدەسەڵاتداریێتی ئەوان.

٣-دەرخستنی گرنگی کوردستانی سەربەخۆ بۆ دەوڵەتانی ئەوروپی لەڕوی جێگیرکردنی ئاسایشی ناوخۆو، تەئمینی ئازادی و سەلامەتی بازرگانی و، رەفتاری باش لەگەڵ گەلانی مەسیحی و، گرنگی ستراتیجی شاخەکانی کوردستان لەکاتی جەنگدا.

ئامانجی سەرەکی لەمانەش هەموی، بەدەسهێنانی پشتیوانی مەعنەوی دەوڵەتانی ئەوروپی بو بۆ خەباتی نەتەوەی کوردو، دانپیانانی قانونییان بەدەوڵەتی کوردستانی یەکگرتو و سەربەخۆ لەدەسەلاتی دەرباری قاجارو بابیعالی تورکی.

## ٢-دیپلۆماسی شێرورێوی

لەدوا چارەکی قەرنی ١٩هەمدا دەوڵەتی سەربەخۆ لەدنیادا زۆر نەبون. دەوڵەتە گەورەو گرنگەکانی ئەوروپا بریتی بون لەبەریتانیا، روسیا، فەرەنسا، ئیتالیا، نەمسە... کەلەکاروباری دنیادا، بەتایبەتی لەکاروباری رۆژهەلاتی ناوەراستدا گرنگییان هەبو. لەناو ئەوانەش دا بۆ شێخ عوبەیدوڵلا روسیاو بەریتانیا کەدو هێزە سەرەکیەکەی ناوچەکە بون گرنگیەکی تایبەتییان هەبو چونکە نفوزی سیاسی، ئابوری، فەرهەنگی، جەنگی... یان لەناو ئێران و تورکیادا بەهێز بو. ئەوانەی تر لەپلەی کاریگەری نفوزدا لەناوچەکەدا نەئەگەیشتە ئەو دوانە. شێخ عوبەیدوڵلاش لەکاری دیپلۆماسیدا سەری کردە سەر ئەم دو دەوڵەتە ئەوروپیە. لەناو دوانەشدا پێی وابو((لایەنگیری شێر بێ باشترە نەك هی رێوی))[٣٤] دیارە ئەمەشی لەو پەندە کوردیە مەشهورەوە دەرهێناوە کەئەڵێ: ((شێر بمشکێنێ نەك رێوی بمخوا)). لەلای کورد شێر رەمزی جوامێری و رێوی رەمزی فێڵبازیە. لەشێریش مەبەستی روس و لەرێوی مەبەستی ئینگلیز بوە.

ئەبێ ئەم بۆ چونەی شێخ لەچیەوە هاتبێ؟ کورد خاوەنی دەوڵەت نەبو رەفتاری لەگەڵ ئەم دو دوەڵەتە کردبێ و لەئەرشیفی وەزارەتی کاروباری دەرەوەیدا تۆماری پێوەندیەکانی نێوان کورد- ئینگلیز و، کورد-روسی هەبێ، تا لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی بەراوردی رەفتاری هەردولادا ئەم پێچواندنە دابرێژێ. هەروەها تەجروبەی پێشوتری جولانەوەی کوردیش لەگەڵ روس و ئینگلیز بایی ئەوە نابێ هەڵسەنگاندنێکی وەهای لەسەر دابمەزرێ.

### ٣/٣/٢ ستراتیجی ناوچەیی روسیا

ئامانجە سەرەکیەکانی ئیمپراتۆریی روسی لەقەرنی ١٩هەمدا لەرۆژهەلاتی ناوەراست، درێژەکێشانی هەمان راسپاردەکانی پەتروسی گەورەو کاترینا بو:

١-هەوڵ دان بۆ تەئمین کردنی دەرەتانێکی دەریایی لەسەر ئاوی گەرم.

٢-هەوڵ دان بۆ دەسگرتن بەسەر بوغازەکانی نێوان دەریای رەش‌و دەریای سپی‌دا.
٣-گەشەپێدانی بازرگانی.
٤-رێ گرتن لەتەنینەوەی نفوزی فەرەنسی، ئینگلیزی‌و دوایی‌تر ئەڵمانی[٣٥].

بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەش چاوی بڕی بوە تەرزەکانی جنوبی روسیە کەهەندێکی لەژێر دەستی عوسمانی‌و هەندێکی بەشێکی سەرزەمینی ئێران بو. هەوڵی ئەدا لەرێگەی نزیك بونەوە لەئێران‌و ئەفغانستانەوە مەترسی بۆ سەر هیندستان دروست بکات‌و بەریتانیا بخاتە پەژارەوە. بەتێپەڕبونی زەمان‌و بەشێنەیی سنوری خۆی گەیاندە لێواری سەروی دەریای رەش، ئەمرمەنستان، گورجستان، ئازەربایجان، تورکمانستان، تارتارستانی گرت‌و، روبارەکانی ئاراس‌و ئەترەك بونە سنوری خواروی. جێ پێی ئابوری‌و سیاسی تەنانەت سوپایی خۆی لەئێراندا قایم کرد.

ئەو ململانێیەی لەنێوان روسیەو دەوڵەتە ئەوروپییە گەورەکاندا بو، لەدوا چارەکی قەرنی ١٩هەمدا، دەستەبەری سەرەکی مان‌و پاراستنی ئیمپراتۆریی ئێرانی‌و ئیمپراتۆریی عوسمانی بو. هیچ کام لەدەوڵەتانی ئەوروپی بۆ ئەوەی ئەوی تریان بەهێزتر نەبێ. رازی نەبو یەکێ لەم دو دەوڵەتە داگیربکاو بیخاتە ژێردەسەڵاتی راستەوخۆی خۆیەوە، ئێران لەنێوان دەسەڵاتی روس‌و نفوزی ئینگلیزا دەوری ناوچەی لەمپەری ئەبینێ. بۆ ئەوەی رێ لەتەماعی روسی بگرن، بەست بویانەوە بەهەندێ بەڵێنی دەولییەوە، لەوانە پەیمانی پاریس(١٨٥٦)[٣٦].

**١-کورد و روس**

ئەو سەردەمەی کوردستان دابەش بو بو بەسەر دەوڵەتانی ئێران‌و عوسمانی‌دا گەلی کورد لەلای سەروی ئێران‌و لەلای رۆژهەلاتی عوسمانییەوە هاوسنور بو لەگەڵ قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی روس.

روسیە لەتەقەلای فراوانخوازانەی بەرەو خواری خۆیدا لەپاش سەپاندنی پەیمانی گولستان(١٨١٣)دوایی تر پەیمانی تورکمانچای(١٨٢٨)بەسەر ئێراندا، وە لەپاش سەپاندنی پەیمانی سان ستیفانو(١٨٧٧)و دوایی تر پەیمانی بەرلین(١٨٧٨)بەسەر دەوڵەتی عوسمانی‌دا، هەندێ شوێنی کوردستان‌و هەندێ خێڵی گەورەی کورد کەوت بونە ژێر دەستیەوە. مەیدانی سەرەکی هەندێ

لەجەنگەکانی روسی-ئێرانیو روسی- عوسمانی لەکوردستاندا بوە. بەشێ لەهێزەکانی ئێرانیو عوسمانی لەو شەڕانەدا کورد بون.

لەکاتی جەنگدا، روس بۆ ئەوەی کەڵك لەکورد وەربگرێ، دژی ئێرانو عوسمانی بەکاریان بهێنێ هەندێ تیپی لەسوارەو پیادەی کورد پێك هێناو، پێوەندی دۆستانەی لەگەڵ هەندێ ئاغاو دەسەڵاتداری کورد دروست کرد. لەجەنگی ۱۸۲۹دا روسیە ٤ تیپی موسڵمانی پێك هێنابو لەوانە یەکێکیان کورد بو. لەشەڕی کریمەدا(۱۸٥٤-۱۸٥٦)دو تیپیان پێك هێنا بو یەکێکیان لەکوردەکانی قارسو ئەوی تریان لەکوردەکانی یەریڤان. لەشەڕی ۱۸۷۷دا تیپێکیان لەکورد پێك هێنابو کە۱۳۰۰کەس بو[۳۷].

بەجۆرە نزیکیی کوردستان لەدەوڵەتی بەتوانای روسیا، تێکەڵاوی سیاسی، بازرگانی، کۆمەڵایەتی، جەنگی.. کورد لەگەلی، نفوزی بەهێزی روسی لەئێرانو عوسمانیدا، دەسوەردانی بەردەوامی لەکاروباری گرنگی ناوچەکەداو، چاوتێ برینی بۆ دەس بەسەراگرتنی... بۆتە هۆیەکی کاریگەری دارشتنی جۆری هەڵوێستی بزوتنەوەی رزگاری-نەتەوەیی گەلی کورد لەهەڵبژاردنی دۆستایەتی روسدا.

هەلکەوتی جوگرافی کوردستان جۆرێ بوە، ئازادی لەسەرکردەکانی کورد سەندۆتەوە، کەبەپێی دەسکەوتی نەتەوەیی دۆستو دوژمن هەڵبژێرن. لەسەرەتای دەسپێکردنی بزوتنەوەی رزگاری- نەتەوەیی گەلی کوردەوە، هۆی جیۆپۆلەتیکی فاکتەری سەرەکی بڕیاردەری دیاریکردنی دۆستو دوژمن بوە.

**۲-بزوتنی دیپلۆماسی بەرەو روسیا**

شێخ لەدوای گەڕانەوەی بۆ نەهری(۱۸۷۸)کەوتە تەقەللا بۆ پێوەندی کردن لەگەڵ کاربەدەستانی روس. نوێنەری ئەنارده لایانو نامەی بۆ ئەنوسین، بۆ ئەوەی باری سەرنجی خۆیان پێ رابگەیەنێ[۳۸]

چەندین جار نوێنەری خۆی نارده لای ئوبەر میللەری کونسوڵی روس لەئەرزڕوم کاتێ کونسولگەی روسی لەوان کرایەوە، شێخ ئەو نزیك کەوتنەوەیەی بەهەل زانی دوجار یوسف ئاغای باوەڕپێکراوی خۆی بەپێشنیارەوە نارده لای کامسارکان. هەروەها لەتشرینی یەکەمی ۱۸۷۹دا بەنوێنەرایەتی خۆی سەید محەمەد سەعیدی بۆ گفتوگۆ نارده لای کامسارکان لەوان. سەید محەمەد سەعید لەقسەکانیدا بەکامسارکانی راگەیاند:

((شێخ گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی، ئیمپراتۆریی عوسمانی لەتواناىدا نەماوە ئەمن و ئاسایشی میللەتەکانی ژێر دەستی بپارێزێت و ئەمەش هەڕەشەیە بۆ ماڵ و ملکی خەڵکی ولاتەکە. لەبەرئەوە شێخ راپەڕین لەپێناوی چاکەو سودی میللەتدا بەکارێکی راست و بەئەرکی سەرشانی خۆی دائەنێ، میللەتیش ئەو بەپارێزەری راستەقینەی خۆی ئەزانێ.

شادەماری هەمو خراپەیەك لەتەماعکاری دەزگا ئیدارییەکانەوە دەست پێ ئەکا. لەنوێنەرانی پلەی هەرە خوارەوە. واتە لەزەبتیەکانەوە دەست پێ ئەکات و لەپلەکانی سەرەوەی دەزگاکان کۆتایی دێ، ئەوانەی دوا دڵۆپی خوێنی میللەت ئەمژن، ئەو میللەتەی داخ و زۆرداری چەشتنی گەیشتۆتە سەری لوتی وەڕەی بەرداوە، نەك هەر مەسیحییەکان بەڵکو کوردەکانیش خوێنیان دەمژرێت. هەر لەبەر کردەوەی خراپ و نارەوای دەستگاکانی بەڕێوەبەرایەتیە کوردەکان ناچار ئەبن و روبکەنە جەردەیی و روتکردنەوە.

شێخ لەو خەباتەیدا دژی دەوڵەتی عوسمانی بەرپای کردوە، پشتی بەپاراستن و لێپرسینەوەی روسیا ئەستورەو هەمیشە حسابی بۆ ئەکات، وە بیانوی شێخ ئەوەیە... روسیا دراوسێی کوردە لەبەرئەوە هەمیشە زیاتر لەبەریتانیا رێزی لێ گیراوە.

ئەگەر روسیا لەگەڵ تورکیا یان لەگەڵ بەریتانیادا کەوتە شەڕەوە، کورد ئەتوانێ کاربکاتە سەر چارەنوسی شەڕەکە، چونکە هەمو رێگاوبانە شاخاوییە گرنگەکانی وان و دیاربەکر بەدەست کوردەوەیە[٣٩].

تەقەللای شێخ بۆ بەدەس هێنانی پشتیوانی مەعنەوی روسیا دوای ئەوەش کە قۆناغی یەکەمی جوڵانەوەکەی لەکوردستانی ئێراندا سەری نەگرت و بەدەسبەسەری برایە ئەستەموڵ هەر بەردەوام بو. لەپاش هەڵاتنی لەئەستەموڵ و گەیشتنەوەی بۆ کوردستان. جارێکی تریش عەلی قاسمی بەنوێنەرایەتی خۆی ناردەوە لای نوێنەری روس و لەزمانی شێخەوە پێی راگەیاند: ((لەمە زیاتر ناتوانین فەرمانڕەوایی رەقی تورك قبوڵ بکەین، لەخەباتدا دژی ئەستەموڵ داوای پشتگیری لەروسیە ئەکەن. ئەگەر روسیە قایل بێ ئەوا شۆڕشێکی سەراپای کوردی بەرپا ئەکا))[٤٠].

تەقەللاکانی شێخ لەگەڵ دیپلۆماتەکانی روس لەناوچەکەدا کەڵکی نەبو ئەگەرچی دیپلۆماتەکانی روس و جاسوسەکانیان لەهەردو دیوی کوردستان

بەوردی چاودێری هەڵسوکەوتی شێخو جموجوڵو، ئامانج پێوەندیەکانیو، روداوەکانیان ئەکردو، ئاگاداری هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی ناوچەکە بون. بەڵام هەڵسەنگاندنی ئەوان بۆ جوڵانەوەکە کەلەزۆر لاوە رەنگدانەوەی ستراتیجی روسیە بو لەناوچەکەدا، وەرەنگدانەوەی سیاسەتی دەرەوەیان بوو بەرامبەر دەوڵەتانی عوسمانیو ئێرانی، ئیجابی نەبو.
لەراپۆرتەکانی خۆیاندا بۆ سەروتر دەری ئەخەن:
١-پشتی داواکانی کورد نەگیرێ، خواستەکانیان رەت بکرێتەوە.
٢-پشتی حکومەتە مەرکەزیەکان بگیرێ.
٣-لەباتی کورد پشت بەمەسیحیەکان ببەسترێ، کەپێشکەوتوترو زیرەك ترنو زوتر شت فێر ئەبنو دەوڵەمەن ترن[٤١].
٤-پیشان دانی جوڵانەوەکە کەدەستی ئینگلیزی تێدایەو لەوانەیە ئینگلیز بۆ دەسکەوتی خۆی بیقۆزێتەوە. ئەمەش بۆ شێواندنی لەلای دەزگاکانی سەرو خۆیان.
هەڵسەنگاندنی دیپلۆماتە پچوکەکانی ناوچەکە، ئەگەرچی لەدیاری کردنی هەڵوێستی دەوڵەتەکانیاندا رەنگە هۆیەکی بڕیاردەر نەبێ، بەڵام بێگومان ئەتوانێ کاری ئیجابی یا سەلبی بکاتە سەر. بەم پێیە هەڵوێستی نادۆستانەی دیپلۆماتەکانی روس لەناوچەکەدا، دەوری هەبوە لەهان دانی دەزگاکانی سەروترا بۆ بڕیاردانی خێرا لەدژی.

### ٤/٣/٢ ستراتیجی ناوچەیی بەریتانیا

ئامانجە سەرەکیەکانی ئیمپراتۆریی بەریتانی لەقەرنی ١٩هەمدا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەکورتی وەکو لینچوفسکی نوسیوێتی بریتی بو لە:
١-پاراستنی هیند.
٢-پاراستنی سەلامەتی رێگەکانی پێوەندی میترۆپۆلو ئیمپراتۆری.
٣-گەشەپێدانی بازرگانی بەریتانی.
٤-تەئمین کردنی لایەنی کەمی هەلومەرجی ژیانی مرۆڤایەتی.
بۆ دیهێنانی ئەم ئامانجانەش، بەریتانیا سیاسەتێکی دیاریکراوی داڕشت بو کەلەسەر چەند بنچینەیەك دامەزرا بو" یەکەمینیان پاراستنی سەربەخۆییو یەکێتی ئەرزی هەردو ئیمپراتۆریی ئێرانیو عوسمانی بو دژی هەڕەشەو چاوتێ بڕینی روسیو، دوایی‌تر ئاڵمانی[٤٢].

داگیرکردنی قوبرس‌و مالتاو قەناتی سویس‌و عەدەن، کەبەشێکی سەرزەمینی عوسمانی بون، ئەگەرچی بەروکەش پێچەوانەی ئەم ستراتیجە بون، بەڵام بەریتانیا بەگونجاوی دائەنان بەبیانوی ئەوەی رێگەی هیند تەئمین ئەکەن.

بەریتانیا نەینەویست تورکیا یا ئێران داگیربکاو بیخاتە ژێردەسەڵاتی راستەوخۆی خۆیەوە، هەروەها نەیشی ئەهێشت دەوڵەتانی تر داگیریان بکەن، بەڵکو ئەیویست وەکو قەوارەی سیاسی لەژێر نفوزی کاریگەری خۆیدا بەسەربەخۆیی لەبەرامبەر دەوڵەتەکانی تردا بمێنن. وەئێران ناوچەی لەمپەری نێوان هیندو روسیابێ. لەبەر ئەو هۆیانە لایەنگری ریفۆرم‌و چاککردنی هەلومەرجی ناوەوەیان‌و دژی روخاندن‌و دابەش کردنیان بو، بەرەنگاری هەر مەترسیەکی راستەقینەی ئەکرد کەلەناوەوە یان دەرەوە هەرەشەی لەقەوارەی ئەو دەوڵەتە بکردایە.

## ١-کوردو ئینگلیز

لەهیچ پارچەیەکی نیشتمانەکەیدا کورد هاوسنوری دەسەڵاتی بەریتانی نەبوە. هەرچەندە لەکۆنەوە گەریدەو زانای ئینگلیزی هاتوچۆیان بەکوردستاندا کردوەو بەناویا گەراون‌و، لەچەندین جێگەش کونسولگەو ناوەندی بازرگانییان دامەزراندوە، بەلام هیچ کات تێکەڵاوییەکی فراوانی بازرگانی، سیاسی، فەرهەنگی، یا سوپایی، لەنێوان کوردو ئینگلیزدا دروست نەبوە.

پێوەندی بەریتانی- تورکی‌و پێوەندی بەریتانی-فارسی لەچەند لایەکەوە راستەوخۆ کاری لەکورد کردوە"

یەکێکیان، کاربەدەستانی بەریتانی هەمیشە گوشاریان بۆ سەر بابیعالی‌و دەربار ئەبرد بۆ هەندی ریفۆرم‌و چاکردن لەکاروباریی بەرێوەبەرایەتی‌و دارایی‌و سوپایی ناو ولاتەکانیاندا بۆ ئەوەی ئەوەندە کلۆر نەبن روس بتوانێ بەئاسانی هەڵیان بلوشێ. ئەنجامی ئەم گوشارە لەتورکیا بە((تەنزیمات))شکایەوە. یەکێ لەبەندە سەرەکییەکانی((تەنزیمات))دەسکاری کردنی رێکخستنی بەرێوەبەرایەتی((ولایەت))ەکان بو، کەئەبو بەهۆی لەناوچونی یەکجاری ئەمارەتە ئۆتۆنۆمەکانی کوردستان. دیپلۆماتەکانی ئینگلیز زۆریان بۆ بابیعالی هێنا لەشکر بکێشێ بۆ سەر محەمەد بەگی میری سۆران‌و بۆ سەر بەدرخان بەگی میری بۆتان‌و، دەسەلاتی راستەوخۆی تورک لەشوێنی ئەوان دابمەزرێنن.

دوەمیان، ناوبژی کردنی بەردەوام لەنێوان بابیعالیو دەربارەدا بۆ ئەوەی ناکۆکیەکانیان بەڕێگەی گفتوگۆی هێمنانە چارەسەر بکەن. ئەنجامی ئەم ناوبژییە رێکەوتنی یەکەمو دوەمی ئەرزڕومی لێ شین بو، کەدوایی هێنا بەململانێی چەکداری دوورودرێژی نێوان ئەم دو دەوڵەتەو، بناغەی سیاسەتی هاوبەشی بەرامبەر مەسەلەی کورد دانا.

## ٢-بزوتنی دیپلۆماسی بەرەو بەریتانیا

شێخ عوبەیدوڵڵا لەپێوەندی دیپلۆماسی خۆیدا لای وابو ئەبێ قورسایی خۆی بخاتە سەر روسیە، بەڵام گرنگی بەریتانیا لەسیاسەتی دەولیداو، نفوزی زۆری بەریتانیای لەناو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانیدا ئەزانی، لەبەرئەوە هەروەکو بایەخیدا بو بەروسیا بەو رادەیەش بایەخی دابو بەدروستکردنی پێوەندی باش لەگەڵ کاربەدەستانی ئینگلیزو هەوڵی ئەدا پشتیوانییان بەدەست بهێنێ.

ئینگلیزەکان خۆیان داوودەزگای دیپلۆماسی، بازرگانی، جاسوسی بەربڵاویان هەبو لەناو هەردو دەوڵەت داو لەهەردو دیوی کوردستاندا، هەر کەبۆنی جموجۆڵی سیاسی شێخیان کرد کەوتنە گەڕانو لێکۆڵینەوەو کۆکردنەوەی دەنگوباسو ئاگاداری.

لە١٨٧٧دا رامسان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری چوبۆ باشقەلان لەهەکاری.

لە١٨٧٩دا کروفدیرو فوزیر بۆ لێکۆڵینەوە لەو دەنگوباسانەی دەربارەی راپەڕینی خەڵك هەبو چونە ولایەتەکانی رۆژهەڵات لەوانە ساسون، ئەماسیە، سیواس، ئەرزنجان، موش، بتلیس، وان، مەلازگر، ئەرزگرد، ئەرزڕوم.

هەر لە١٨٧٩دا کلایتۆن سەردانی ناوچەی هەکاری کرد، چوە بارەگاکەی شێخ عوبەیدوڵڵا لەوێ دیدەنی شێخی کردو گفتوگۆی لەگەڵ کرد. کلایتۆن نامەیەکی لەشێخەوە بۆ کاربەدەستانی بەریتانیا برد بو. لەو نامەیەدا شێخ رای گەیاند بو: ((... دانیشتوانی هەمو کوردستان ئەیانەوێ یەك بنو نابێ بەدابەشکراوی بمێننەوە))[٤٣].

لەگەرمەی لەشکرکێشی شێخ عوبەیدوڵڵادا بۆ سەر کوردستانی ئێران لەکاتێکا هێزەکانی کورد لەبەر دیوارەکانی ورمێدا خەریکی جەنگین بون، ئابوت کونسوڵی بەریتانی لەتەورێز لەئەیلولی ١٨٨٠ گەیشتە ورمێ. لەوێوە چوە سەردانی شێخو کەوتە ناوبژی لەنێوان ئقبال ئەلدەولەو شێخ عوبەیدوڵڵادا. لەبەر نائەمینی ناوچەکە بەیارمەتی شێخ لەناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕشەوە

چوە سابڵاخ‌و لەوێ شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ و هەمزاغای مەنگوڕی دی ئینجا گەڕایەوە بۆ تەورێز.

شێخ عوبەیدوڵڵا لەم دیدەنیانەدا هەوڵی داوە زوڵم‌و زۆری تورکیاو ئێران، چەوساوەیی گەلی کورد، یەکبونی گەلی کوردو ئامانجی لەجوڵانەوەکە "دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستانیان بۆ رون بکاتەوە. هەروەکو ئابوت نوسیوێتی: ((ئەوەی شێخ ئەیەوێ یەك شتە، ئەویش پشتگیری مەعنەوی دەوڵەتە ئەوروپییەکانە))و ئەیەوێ دەوڵەتە ئەوروپییەکان((بڕوا بەنیاز چاکی‌و پێوەندی چاکە خوازی شێخ بکەن.))[٤٤].

هەروەها شێخ عوبەیدوڵڵا چەندین نامەی بۆ بێگانەکان نوسیوە لەوانە دو نامە بو د. کوچران کەپزیشکی دەستەی میسیونێری ئەمریکی بو لەورمێ، شێخ لەنامەی ٥ی تشرینی ١٨٨٠دا بۆ د.کوچرانی نوسیوە ئەڵێ:

((مەلا سمایلم ناردوە بۆ ئەوەی بەنهێنی وەك پێم وتوە، دۆخی ئێرەتان بۆ رون بکاتەوە، تکاتان لێ ئەکەم دۆخی کوردستان‌و سەفەری کوڕەکەم بۆ سنە(راستیەکەی سابڵاخە، وەرگێڕی کوردی بەهەڵە وەری گرتوە)بەراستی بەحکومەتی بەریتانیا بگەیەنن‌و رونی بکەنەوە.

((گەلی کورد کە لە٥٠٠هەزار بنەماڵە پێك هاتوە، میللەتێکی تایبەتیە، ئاینەکەیان(ئەبێ مەبەستی مەزەب بێ نەك ئاین)لەئاینی ئەوانی تر جیاوازە. خاوەنی نەریت‌و رەوشت‌و خوی تایبەتی خۆیانن. لەناو میللەتاندا بەنەتەوەیەکی تورەو کەللە رەق‌و درۆ بێ رەوشت ناو ئەبرێن. بەو جۆرە لەکوردستان ئەدوێن. ئەگەر یەکێکیان کردەوەیەکی ناڕەواو ناشیرینی لێ بوەشێتەوە، ناوی هەزارەها پیاوچاکی لەگەڵدا لەکەدار ئەکرێ. با لاتان ئاشکرا بێت، ئەم هەمو سیفەتە خراپانە لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانی‌و ئێرانەوە بەخۆڕایی بۆ کورد دروست کراون‌و بەزۆر پێوەی ئەلکێنن.

کوردستان لەنێوان ئەو دو دەوڵەتەدا دابەش کراوە. ئەو دو دەوڵەتە ئەوەندەیان لەبار نیە چاك‌و خراپ لەیەك جیابکەنەوە. ئەگەر یەك کەس خراپەیەك بکا ئەوە هەزاران کەسانی بێتاوان بەهۆی ئەوەوە توشی ئازاو دەردیسەری ئەبن. بەم جۆرە کەسە خراپەکان ئەمێننەوەو خەڵکە چاکەکانیش تیا دەچن.

بێگومان ناوی.. بیستوە، ئەوی ناوی بەکردەوەی خراپ‌و ناڕەوا دەرکردوە، ئەوەی وەك چۆن ئەزیەتی خاوەنی.. بێگانەکانی ئەدا وەهاش دەسدرێژی ئەکردە سەر

موسڵمانەکانیش. هەردو دەوڵەتەکە ئاگایان لەکردەوە خراپەکانی بو. جا ئەگەر دەسەڵاتی ئێران قایمتر ببێتو زەبروزەنگیش پەیدا بکات، ئەوە خەڵكو خوا کەهەرگیز وەك جاران دور لەشارستانیەتو بەدوا کەوتوییو دڕەندەیی ئەمێننەوە.

تاوانەکەی خێڵی... کەلەدەوڵەتی عوسمانیدا ئەژی دیارو ئاشکرایە، حکومەتی عوسمانی وەك ئێران یان خۆی لەپێشخستنی ئەم میللەتە گێل ئەکات، یاخود بەچاوێکی نزمەوە سەیری ئەکا.

هەمیشە بەسوکیەوە سەیری کوردستان ئەکرێ. یەکێتی نیە. سەرۆكو بەڕێوەبەرەکانی کوردستانی عوسمانیو ئێرانیو هەمو دانیشتوانی کوردستان گەیشتونەتە بڕیارێك و لەوەدا یەك ئەگرنەوە کەلەتواناندا نەماوە لەژێر سایەی ئەو دو دەوڵەتەدا بژینو ئەبێ شتێ بکەن دەوڵەتە ئەوروپاییەکان ناچار بکات لەدۆخەکە ورد ببنەوەو تێی بگەیەنن.

ئێمەش میللەتێکی دابەش کراوین، ئەمانەوێ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوەوەی وڵاتەکە بەدەست خۆمانەوە بێ. ئەمانەوێ خۆمان سزای ئەوانە بدەین کە لەڕێی ڕاست لائەدەن. ئەو مافانەمان هەبێ کەمیللەتەکانی تر هەیانە. خۆ ئەگەر هاتو کردەوەیەکی ناڕەوا رویدا. ئەوە بەڵێن بێ ئەو کردەوانە زیانی بۆ هیچ میللەتێکی تر نابێ.

((... میللەت لەتوانایدا نەماوە لەوە زیاتر زۆرداریو خراپەی بێ وچانی ئەو دو دەوڵەتە هەڵ بگرێ)) [٤٥].

خواستەکانی شێخ عوبەیدوڵڵا کە لەم یادداشتەدا بەڕونی باس کراون، نەیتوانی سەرنجی کاربەدەستانی بەریتانیا رابکێشێ. تەنانەت دیپلۆماتەکانی ئینگلیز لەناوچەکەدا، لەهەردو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی لەبۆچونەکانی خۆیاندا، ئەگەرچی هەلومەرجی نالەباری ناو هەردو دەوڵەتو هەلومەرجی خراپی گەلی کوردیان لەهەردو دیوی نیشتمانەکەیدا ئەزانێ، چونکە بۆچونی دیپلۆماتەکانی ئینگلیز لەناوچەکەدا ڕەنگدانەوەی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا بۆ بەرامبەر دەوڵەتانی ئێرانیو عوسمانی، وە ڕەنگدانەوەی ستراتیجی ناوچەیی بەریتانیا بو، لەبەرئەوە دیپلۆماتەکانی بەریتانیا، لەنامەو ڕاپۆرتەکانی خۆیاندا بۆسەرو تری خۆیان، بۆچونی خۆیان بەجۆرێکی نادۆستانە دەرئەبڕی:

١-خواستە نەتەوەییەکانی کورد پشتگیری نەکرێ.

٢-داوا لەکورد بکرێ گوێ رایەڵی حکومەتە مەرکەزیەکان بێ.

٣-گەلە مەسیحیەکان لەبەشداری کردنی جولاّنەوەکە دوربخرێنەوە.

٤-ناوبانگی جولاّنەوەکە بشێوێنرێ، تاوانی هان دانی روسیەو ئاگاداریو پشتیوانی سولّتانی تورکی بەپالّ بدرێ، بۆئەوەی گوایە ئێران لاواز بکرێو روس ئەو هەلە بقۆزێتەوە.

٥-دەنگوباسە نهێنییەکانی جولاّنەوەکە بدرێتە کاربەدەستانی عوسمانیو ئێرانی بۆ ئەوەی لەپلانی دامرکاندنەوەیدا کەلکی لێ وەربگرن.

هەڵبەت هەندێ لەم هەڵسەنگاندانە ئەگەڕێتەوە بۆ جۆری بیرکردنەوەی دیپلۆماتەکان خۆیان، بەلاّم رێچکەی سەرەکی بۆچونەکان نوندنەوەی ستراتیجی ناوچەیی بەریتانیایە لەو سەردەمەدا.

## ٥/٣/٢ نەگونجاندنی کوردستانی سەربەخۆ لەگەڵ ستراتیجی-رۆژهەلاّتی ناوەڕاستی بەریتانیو روسی

لەرۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا، کەدو دەوڵەتی دێرینەی عوسمانیو ئێرانی تێدا بو، ستراتیجی بەریتانی هەروەها ستراتیجی روسی لەناوچەکەدا لەسەر بنچینەی پاراستنی قەوارەی سیاسی روکەشی ئەو دو دەوڵەتە دامەزرا بو.

ئێرانو تورکیا هەردوکیان لەلایەن دەوڵەتانی ئەوروپییەوە بەڕەسمی ناسرا بون، ئەگەرچی مەسەلەی رۆژهەلاّت، واتە مەسەلەی چاوبڕینە سەرزەمینی ئەم دو دەوڵەتە لەکۆنەوە بوبو بەمایەی ململانێ لەناویاندا، بەلاّم ئێرانو تورکیا بوبونە بەشێکی سیستەمی دەولی ئەو سەردەمە، کەلە سەربنچینەی راگرتنی هاوسەنگی تەرازوی هێزەکانی نێوان دەوڵەتە ئەوروپییەکان دامەزرا بو. مافی ئێرانو تورکیا بوبوە کۆڵەکەیەکی گرنگی راگرتنی ئەو هاوسەنگیە، کەباری هێمنایەتیو شەڕنەبونی لەئەوروپا پاراست بو. هەوڵ دانی هێزێکی ئەوروپایی بۆ داگیر یا دابەش کردنی یەکێ لەم دوو دەوڵەتە، یاخود هەوڵ دانی هێزێکی ناوخۆی بۆ جیاکردنەوەی بەشێکیو پێکهێنانی دەوڵەتێکی نوێ لەناوچەکەدا یاروخاندنی، ئەبو بەهۆی لەرزاندنی نزامی دەولیو تێکچونی هاوسەنگی تەرازوی هێزەکانو، لەئەنجامدا شێواندنی ئاسایشی ئەوروپاو سەر دەرهێنانی مەترسی هەڵگیرسانی جەنگ.

ئامانجی شێخ عوبەیدوڵلا کەبریتی بو لەجیاکردنەوەی بەشێکی گرنگو گەورەی سەرزەمینو دانیشتوانی هەردو دەوڵەت، بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی نوێ لەناوچەکەدا، کەدانپیانانی کۆمەڵەی دەوڵەتانی ئەوروپی بەدەس بهێنێ، واتە

لاوازبونی دو هێزی ناوچەیی‌و پەیدابونی هێزێکی ناوچەیی نوێ کەچارەنوسی نەئەزانرا، لەناوچەیەکی گرنگی دنیادا کەمەیدانی ململانێی سەختی هەمو دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکانی ئەوروپا بو، لەگەڵ ستراتیجی ناوچەیی دەوڵەتە ئەوروپیە گەورەکاندا نەئەگونجا.

دەوڵەتە گەورەکان بەتایبەتی روسیاو بەریتانیا کەدو هێزی گەورەی ئەو سەردەمەی دنیا بون، نەك هەر پشتیوانی مادی‌و مەعنەوییان لەم تەقەللایە نەکرد، نەك هەر ئامادە نەبون بیناسن‌و دانپیانانی قانونی، سیاسی، دیپلۆماسی پێشکەش بکەن، بەڵکو کەوتنە هەوڵ دانی دامرکاندنەوەی، سەرەڕای هەمو ناکۆکیەکانی بەینی خۆیان ناڕاستەوخۆ لەسەرئەوە رێك کەوتن" نەهێڵن تەقەللای یەکگرتنەوەی کوردستان‌و دەوڵەتی سەربەخۆ لەسەر حسابی ئێران‌و تورکیا سەر بگرێ.

### ٣-گەلە کۆمەکێی ٤ قوڵی بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕین

### ١/٣ رێوشوێنەکانی شا بۆ بەرەنگاری

هەواڵەکانی کوردستان، شۆڕشی خەڵك‌و رامالێنی خێرای دەسەلاتی عەجەم لەبەشێکی کوردستان‌و پێشڕەوی بۆ پاککردنەوەی ناوچەکانی ترو دروستکردنی دەوڵەتی کوردستان لەلایەن شێخێکی تەریقەتەوە، هەڕەشەکردن لەتەوریز کەدوای تاران دوەم شاری گرنگی ئێران بو، هاندانی عەباس میرزای برای شا بۆ هەڵگەڕانەوەو بەشداری لەشۆڕشدا، ئەمانە مەترسیەکی گەورەیان دروست کرد بۆ سەرتەختی سەڵتەنەتی ناصرالدین شا کەخۆی لەخۆیدا لەتەنگوچەڵەمەیەکی گشتی قوڵدا بو.

بزوتنەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا لەکۆڕو نوسینە رەسمیەکانی دەربارى قاجاردا بەفیتنە، غائیلە، شۆڕش، طغیان.. ناوئەبراو شا بەهەڕەشەیەکی راستەقینەی دانا کەئەبێ چارەیەکی خێراو بنەڕەتی بکرێ. کیزن ئەڵێ[٤٦].. شا داوای یارمەتی لەروسیا کرد، پرس‌و راوێژی بەئینگلستان کرد، داوای تەعویزی لەتورکیا کرد.((شورای دەوڵەت))ی کۆکردەوەو بۆ دانانی رێوشوێنی دامرکاندنەوەی، تەلگرافی لێدا بۆ شارەکان بۆ سازدان‌و ئامادەکردنی سوپا. میرزا حسێن خانی سوپا سالاری تەعزەم کەدەستی لەکارکێشرابوەوەو دورخرابوەوە بۆ قەزوین لەلایەن شاوە بانگ کرایەوە بۆ پرس‌و راوێژ دەربارەی چۆنیەتی کوژاندنەوەی جوڵانەوەکە.

شاهێزێکی گەورەی ڕێك خست، کەبەگوێرەی هەندێ سەرچاوە پێك هات بو لە ٢٠هەزار سەربازی نیزامی‌و چەندین عەرادە تۆپ[٤٧] بەسەرکردایەتی حشمت الدولە بەرەو کوردستان ختیەڕێ. حشمت الدولە کەپێشتر ئەرکی کوژاندنەوەی یاخی بونی خێڵە تورکمانەکانی پێ سپێردرا بو بەرلەوەی لەگەڵ هێزەکەدا بگاتە کوردستان لەرێگا مرد. میرزا حسێن خان کەدوای راوێژ گەڕابوەوە قەزوین، لەلایەن شاوە لەجێگەی حشمت الدولە کرایە سەرکردەی سوپای ئێران بۆ دامرکاندنەوەی راپەڕینەکەی شێخ عەبەیدوڵلا.

شا لەفەرمانەکەیدا بۆ میرزا حسێنخانی نوسیوە:

((ئاوت بەدەستەوە بێ نەیخۆیتەوە برۆ بۆ ئازەربایجان. ئەم کێشەیە بەخێرایی لەناوبەرە. سەرەڕای ماندوێتی‌و کاری زۆر ناچار بەخەتی خۆم دەستور ئەلعملێکی کورتم بۆ نوسین... ئەم دەستور ئەلعەمەلە دەسبەجێ بدە بەولیعەهد بیخوێنێتەوە. بەڕاستی من لەسەر ئەو باوەڕەم ئەگەر لەرێکخستنەوەی هێمنایەتی ئازربایجاندا هاوڕێیەتی ئێوەنەکاو لەسەرپیوڕا کۆنەکانی خۆی بێ، ئەوا ئەیکێشمەوە بۆ تاران... مەملەکەت هێمنی ئەخوازێ. کردەوەی ئەم کوردانە بەد بوە. هەر بەگەیشتنیان تەگبیرێ بکەن‌و بیرێ بکەنەوە" بەپەلە لەناویان ببەن))[٤٨].

هەڵبژاردنی میرزا حسێن خان کەئەوروپای دیوەو سەردەمێ سەفیری دەرباری قاجار بو بۆ لای بابیعالی‌و ماوەیەك وەزیری کاروباری دەرەوەو سەردەمێکیش سەدری ئەعزەمی ئێران بو، بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، هەروەها ناوەڕۆکی فەرمانەکەی شا، دەری ئەخەن کەناصرالدین شا تا چ رادەیەك لەپەژارەی ئەم شۆڕشەدا بوە. ترسێکی چەند گەورەی هەبوە لەپەرەسەندن‌و درێژەکێشانی.

شا بەتەنیا بەلەشکرکێشی بۆ سەرکوتکردنی چەکداری دانەکەوت. بەڵکو لەهەمان کاتدا بزوتنێکی دیپلۆماسی چالاکی دەست پێ کرد بۆ گەمارۆدانی سیاسی‌و دیپلۆماسی‌و جەنگی جوڵانەوەکە لەگەڵ سەفیرەکانی روسیاو بەریتانیا. هەروەها فەرمانی‌دا بەمحسن خانی سەفیری خۆی لەلای بابیعالی کەئەویش بکەوێتە گەڕ.

ناصرالدین لەوتنەکانیدا لەگەڵ زینوفیفی سەفیری روسیا تێی گەیاند، ئێران وازی لەهەمو جموجۆڵێك هێناوە لەئاسیای ناوەڕاستدا، ئەویش تکای وایە روسیا لەم گیروگرفتەدا دژی تورکیا پشتی بگرێ. هەروەها داوای لێ کرد، روسیە هێز بنێرێتە سەرسنوری ئازەربایجان بۆ رێگرتن لەشۆڕشگێڕانی کوردو یارمەتی دانی

سوپای ئێران لەکاتی پێویستدا، وە زۆر لەدەوڵەتی عوسمانی بکا ئاژاوەی کوردەکان بکوژێنێتەوە سەرکردەکانیان تەمێ بکا، زەرەرو زیانەکانی لەم شەڕەدا لەئێران کەوتوە تورکیا بۆی ببژێرێ[49].

زینوفیف بەپێڕەوی لەسیاسەتی روسیای قەیسەری، لای وابو بێ هێزبونی ئێران زەرەری بۆ روسیە هەیە، بەڵێنی بەشادا کەخواستەکانی بەپیتەربورگ بگەیەنێ و ئومێدی یارمەتیشی پێدا.

ناصرالدین شا داوای لەتومسونی سەفیری بەریتانیاش کرد زۆر لەتورکیا بکا بکەوێتە شەڕەوە دژی کوردەکان و هاوکاری ئێران بکا بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشەکەیان.

لەئەستەموڵ میرزا محسنخانی سەفیری دەرباری قاجار لەلای بابیعالی کەوتە تەقەللای دیپلۆماسی لەلایەك لەگەڵ کاربەدەستانی بابیعالی کەهاوکاری لەگەڵ ئێران بکا سەرکوتکردنی جولانەوەکەو، هێز بنێرێتە سەرسنوری ئێرانی-عوسمانی بۆ ئەوەی پشت لەجولانەوەکە بگرێ و، لەلایەکی ترەوە لەگەڵ سەفیرەکانی روسیاو بەریتانیا کەتین ببەن بۆ بابیعالی دەس لەپشتیوانی جولانەوەکە هەڵبگرێ و ئاژاوەی کوردەکان بکوژێنێتەوەو سەرکردەکانیان تەمێ بکا.

کورد لەسەر سنورەکان کەهەمیشە هۆیەکی گرنگی تیژبونی ناکۆکیەکانی نێوان هەردو دەوڵەت بون بەجۆرێ هەندێ جار بۆتەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی خوێناوی لەبەینی هەردولادا. بزوتنەوەی ۱۸۸۰ تەنگوچەڵەمەیەکی دیپلۆماسی لەبەینا دروست کردن، بەڵام لاوازی ناوخۆی هەردو دەوڵەت و هەوڵ دان و ناوبژی کردنی روسیاو بەریتانیا نەی هێشت بگاتە جەنگ، هەر بەڕێگەی دیپلۆماسی بڕییانەوە.

ئەم دو دەوڵەتە بەهۆی ململانێی دێرینەوە بڕوایان بەیەکتری نەبو. کێشەو گیروگرفتی قوڵیان لەبەیندا بو بەتایبەتی کێشەی ناوخۆو گێچەڵیان بۆ یەکتری دروست ئەکرد. شای ئێران و هاوکارەکانی هۆی راپەڕینەکەیان نەئەبردەوە بۆ هەلومەرجی خراپی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی.. ناوخۆی ئێران و بۆ خەملێنی هۆشی رزگاری- نەتەوەیی گەلی کورد، بەڵکو ئیمپراتۆریی عوسمانییان تاوانبار ئەکرد بەهاندانی شێخ عوبەیدوڵلاو کوردەکان بۆ پەلاماردانی خاکی ئێران. بزوتنەوەکەیان بەدەسکردی عوسمان و بەریتانی لەقەڵەم ئەدا. میرزا محسن خان

لەنامەیەکی خۆیدا بۆ تاران نوسیویەتی: پاش ئەوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریی عوسمانی لەئەوروپا کەم بۆتەوە، ئەیەوێ لەسەر حسابی ئێران چی لەدەست چوە بیهێنێتەوە، بۆ ئەمەش یەکخستنی موسوڵمانانی کردوە بەبیانو. ئەیەوێ گەلە سوننیەکان بخاتە ژێردەستی خۆیەوە. ئەستەموڵ کوردەکان هان ئەدا بۆ راپەرینەوە[50].

## ٢/٣ هەڵوێستی روسی

دیپلۆماتەکانی روس لەدوای گەڕانەوەی شێخەوە بۆ نەهری چاودێری جموجۆڵەکانی ئەویان ئەکرد. هەر زو کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی خۆیان ئاگادار کرد، کەشێخ کەوتۆتە پێوەندی لەگەڵ دەسڕۆیشتوەکانی کوردو سەرۆکەکانی ئەرمەن‌و ئاسوری‌و شەریفی مەککەو خدێوی میسر.

دیپلۆماتە بچوکەکان لایانْ وابو پشتیوانی لەداواکانی کورد نەکرێ‌و پشتی حکومەتە مەرکەزیەکان بگیرێ. تەنانەت نوفیکوف سەفیری روس لەبابیعالی داوای لەموچە خۆرانی کونسوڵگەکانی کرد کەهیچ جۆرە پێوەندیەك نەکەن لەگەڵ نوێنەرانی شێخ بۆ ئەوەی کاربەدەستانی عوسمانی وا تێنەگەن پشتیوانی لەراپەرینەکە ئەکەن.

زینوفیف لەنامەکانیدا وا ئەگەیەنێ" ئێران ئەو تواناو چەکەی نیە بتوانێ بەخێرایی ئاژاوەکە بکوژێنێتەوە. ئینگلیز پشتی کوردەکان بۆ شۆڕش. ئەستەموڵ‌و تاران ئاگایان لەوەیە کەئینگلیز دەستی لەئاژاوەی کوردەکاندا هەیە. ئینگلیز کەڵکەڵەی یەکخستنی ناوچە کوردیەکانی خستۆتە مێشکی شێخ عوبەیدوڵلاوە.

لە١٨ی تشرینی ١٨٨٠دا ئەلەکسندەری دوەم موافەقەتی کرد کەوەزارەتی کاروباری دەرەوە بریاری روسیا بەزینوفیف رابگەیەنێ بۆ ئەوەی شای لێ ئاگادار بکا کە: روسیە ئامادەیە یارمەتی بدات، داواشی لەلەشکری قافقاس کرد لەسەرسنوری ئازەربایجانی خوارو بار بخات‌و لەکاتی پێویستدا دەستی یارمەتی بۆ لەشکری ئێران درێژ بکات. هەروەها داوای لەسەفیری خۆی کرد لەئەستەموڵ کە: هەمو هەوڵێك بدات بۆ ئەوەی تورکیا هان بدات لەشەڕا دژی کورد بەشداری بکات. لەئەنجامی گوشاری بەتینی روسیادا، تورکیا ئۆردوی نارده کوردستان. کاربەدەستانی روس هەوڵی زۆریاندا بۆ دورخستنەوەی مەسیحیەکان لەبەشداری شۆڕش[51].

### ٣/٣ هەڵوێستی بەریتانی

ئینگلیزەکانی ئاگاداری زۆریان لەسەر جولاّنەوەکە کۆکردەوە، دژی جولاّنەوەکە بون: ئامۆژگاری شێخیان کرد دەست هەلگرێ لەراپەڕین. ئامۆژگاری مەسیحیەکانیان کرد بەشداری نەکەن. دەنگوباسی راپەڕینەکەیان ئەگەیاندە کاربەدەستانی عوسمانیو ئێرانیو هانیان ئەدان بۆ دانانی نەخشەی لەناوبردنی.

میجەر تروتیر کۆنسوڵی بەریتانیا لەئەرزڕوم لەنامەیەکیدا بۆ سەفیری خۆیان لەئەستەموڵ، گلەیی لەپاشاکانی تورك ئەکا کەنازانن بزوتنەوەکە هەڵ بسەنگێننو ریشوێنی لەناوبردنی دابنێن. دان بەوەدا ئەنێ ئەو هەواڵو دەنگوباسە گرنگەی دەربارەی نهێنیەکانی بزوتنەوەکە پێی گەیشتون، داویتیە کاربەدەستانی تورك. هەروەها خۆیشی ماوەیەکی درێژ لەئەرزڕوم مایەوە بۆ ئەوەی بەشداربێ لەئامادەکردنی رێوشوێنی لەناوبردنی جولاّنەوەکەدا.

ناصرالدین شا لە١١ی تشریندا لەدیتنی تۆمسۆن سەفیری بەریتانیا لەدەرباری قاجار، داوای لەسەفیر کرد حکومەتی بەریتانیا زۆر لەتورکیا کەدژی کورد بکەوێتە شەڕەوە.

تومسۆن ئاگاداری سەروتری خۆی کرد" سەرکەوتنی کورد لەئێران ئەبێتەهۆی دەستێوەردانی راستەوخۆی روسیە لەئێران. شا لەوە ئەترسێ روسیا بەبیانوی ئەوەی ئێران ناتوانێ بەرژەوەندی هاونیشتمانانی روس لەئێران بپارێزێ، راستەوخۆ تەدەخول بکا. لە٣٠ی تشرینی ١٨٨٠ ئاگاداری وەزیری دەرەوەی بەریتانیای کرد کەشێخ عوبەیدوڵلاّ نامەی بۆ ئقبال ئەلدەولەو رێکخراوە ئەمریکیەکان ناردوە، لەنامەکانیدا ئاگاداری کردون، سەرۆك هۆزەکانی کورد یەکیان گرتوە بەنیازی یەکخستنو کەوتنە گفتوگۆ بەو نیازەی توانای هەردولایان بۆ لێدانی بزوتنەوەی کورد یەك بخەن. تومسۆنی سەفیری بەریتانیا لەتاران بەردەوام لەوێوە لەندەنی لەهەمو ئەو هەوڵو تەقەلایانە ئاگادار ئەکرد. سەفیری بەریتانیا لەئەستەموڵ داوای لەکاربەدەستانی عوسمانی کرد" یان خۆی سزای عوبەیدوڵلاّ بدات یان تەسلیمی ئێرانی بکا[٥٢].

### ٤/٣ هەڵوێستی بابیعالی

بابیعالی ئەگەرچی لەزەوە ئاگاداری جموجوڵی خۆڕێکخستنی سیاسی شێخ عوبەیدوڵلاّ بو، بەلاّم چونکە بەهۆی تێشکانی لەجەنگی روسدا(١٨٧٧)هێشتا

لەڕوی عەسکەریەوە لاوازو بێ هێزبو بو، سەرگەرمی ئەو پەیمانە گرانە بو کەوڵاتانی ئەوروپی لەبەرلین دەربارەی دابڕینی ناوچەکانی بالقان لەقەڵەمڕەوی عوسمانی بەسەریاندا سەپاندبو. هەروەها ناکۆکی دێرینەی عوسمانی- ئێرانیو زیندوبونەوەی ئەو ناکۆکیە لەسەر هەڵوێستی ئێرانی لەشەڕی روسی- عوسمانیدا داواکردنەوەی هەندێ ناوچەو ئەرزی سەرسنور لەقوتورو زەهاو لەلایەن ئێرانەوە.. بابیعالی لەسەرەتاوە بەلاقرتیوە سەیریان ئەکرد، هەوڵیاندا بەڕێگەی گفتوگۆی سیاسیو بەڵێندانی چەور شێخ لەشۆڕش پەشیمان بکەنەوە. لەدواییدا لەژێرکارتێ کردنی گەورە بونی مەترسی روداوەکەو لەژێر گوشاری سەختی دەوڵەتانی ئەوروپیدا کەوتنە بەکارهێنانی هێزی چەکدار بۆ تێشکاندنی جوڵانەوەکەو گرتنو دورخستنەوەی سەرکردەکانی. کیزن ئەڵێ: ((ئەو کارەی لەمانگی سەپتەمبەردا بەمژدەیەکی زۆرەوە دەستی پێ کرد لەمانگی نۆڤەمبەردا بەڕیسوایی دوایی هات، بەهۆی پێ داگرتنی دەوڵەتانی ئەوروپاوە بابیعالی سەرەنجام عوبەیدوڵڵای گرت))[٥٣].

روداوەکانی ١٨٨٠ بو بەتەنگوچەڵەمەیەکی دیپلۆماسی لەنێوان دەرباری قاجارو بابیعالیدا. دەرباری قاجار عوسمانیەکانی تاوانبار ئەکرد بەهان دانی کوردەکان بۆ دەسدرێژی کردنە سەر ئێرانو راپەڕین. بابیعالی ئێرانی تاوانبار ئەکرد بەوەی زەرەرو زیانی لەشێخ داوە.

پاش ئەوەی کاربەدەستانی عوسمانی شێخیان بەگیروای بردە ئەستەموڵ، ویستیان کەڵك لەم روداوە وەربگرن وەکو عامیلی زەغت بۆ سەر ئێران. لەکۆتایی تشرینی ١٨٨١دا سەفیری تورکیا لەتاران، فەخری بەگ داوای لەئێران کرد" هەر زیانێ لەسالانی ١٨٧٠، ١٨٧٦، ١٨٨١ ئێران لەشێخی داوە بۆی ببژێرن. هەڕەشەی ئەوەی ئەکرد، کە ئەگەر خواستەکانی شێخ جێبەجێ نەکرێ لەوانەیە سەرلەنوێ راپەڕینێکی تر بقەومێ[٥٤]. بەڵام میرزا سەعید خان، وەزیری دەرەوەی ئێران، بەئامۆژگاری زینوفیف سەفیری روسیا، نوتەکەی تورکیای رەت کردەوە، بەبیانوی ئەوەی، ناوچەکانی شێخ داوای ئەکا هیچی موڵکی ئەو نەبون بەڵکو بەکرێی گرتونو هەندێکی بەتاپۆی ساختە داگیرکردوە. لەئەنجامی یاخی بونەکەیدا دەست بەسەر هەمویا گیراوە. سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی لەوەی تورکیا پشتی عوبەیدوڵڵا ئەگرێ لەدوژمنایەتیدا بەرامبەر ئێران. ئێرانیش داوای بژاردنی ئەو زەرەرانەی کرد کەبەهۆی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵاوە لێی کەوت بو.

خواستەکانی شێخ کەسیاسی بونو هەردو دەوڵەتی ئەگرتەوە. لەئەنجامی تێشکانی جوڵانەوەکەو دەستێوەردانی راستەوخۆی ئینگلیزو روسیەدا سەری نەگرت. عوسمانی کردی بەبەهانە بۆ داواکاری مادیو دواخستنی جێبەجێ کردنی بەندی ٦٠ی پەیمانی بەرلین دەربارەی گێڕانەوەی قوتورو ناوچەکانی دەوروبەری بۆ ئێران.

لەتشرینی دوەمی ١٨٨٠دا هاوکات لەگەڵ لەشکرکێشی ئێران بۆ سەرناوچەکانی ورمێ، موکریان، تورك دەستی کرد بەلەشکرکێشی بۆ سەر کوردستانی عوسمانیو داوای لەشێخ کرد بڵاوە بەهێزەکانی بکاو بچێتە ئەستەموڵ.

شێخ بەرێزێکی زۆرەوە، بەگیاوی برایە ئەستەموڵ. ئەگەرچی لەوێ پێشوازی شاهانەی لێ کرا، بەڵام خواستە سیاسیەکانی پشت گوێ خراو خۆیشی بەدەست بەسەری لەوێ لەجێگەیەك دانرا.

شێخ عوبەیدوڵڵا کەنائومێد بو لەبابیعالی سەرلەنوێ بەنهێنی کەوتەوە هەوڵدانی رێکخستنەوەی هێزەکانی، پێوەندی لەگەڵ لایەنگرەکانی پێوەندی لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتانی بێگانە نوێ کردەوە. لەئابی ١٨٨٢دا بەپاسپۆرتێکی دروست کراو بەناوی بازرگانەوە ڤیزای روسیای وەرگرت. لەرێگەی دەریای رەش، تفلیس، یەریڤان، بایەزید، ئالاشگر، هەکاری گەڕایەوە بارەگاکەی خۆی بۆ درێژەپێدانی خەبات.

هەڵاتنی شێخ پەژارەی زۆری لەلای دەرباری قاجار دروست کرد. ئێران داوای لەبابیعالی کرد کەبیگرێو دوری بخاتەوە هەروەها داوای لەروسیەو بەریتانیاش کرد کەپشتی بگرن. ئێرانو روسیەو بەریتانیا بابیعالیان ناچار کرد کەچارەی سوپایی مەسەلەکە بکات. هێزە چەکدارەکانی تورك لەهەکاری چونە سەر شێخ عوبەیدوڵڵا لەکۆتایی تشرینی یەکەمی ١٨٨٢دا بەدیل گیراو بەهێزێکیی گەورەوە لەگەڵ ١٠٠ خێزانی لایەنگری رەوانەی موسڵ کرا. لەموسڵەوە رەوانەی ئەسکەندەرونە، ئینجا بیروتو پاشان دورخرایەوە بۆ حیجاز, لەوێ گلیان دایەوە تا لەساڵی ١٨٨٣دا کۆچی دوایی کرد[٥٥].

**٥/٣ دامرکانەوە**

رێوشوێنەکان جێبەجێ کردنی بەرنامەی کاری دەرباری ئێرانی بۆ کوژاندنەوەی راپەڕینەکە لەمەیدانی جەنگی، دیبلۆماسی، سیاسیدا سەری گرت.

لەبواری جەنگی‌دا، شا جگەلەوەی توانی هێزێکی رێکوپێکی مەشق دیوی بەدیسپلین بەفەرماندەیەتی سەرکردەیەکی سیاسی- سوپایی لێوەشاوەو بەهاوکاری ئەفسەری شارەزای نەمسەیی رەوانەی کوردستان بکا. هەروەها هێزێکی گەورەی میلیشایی خێڵە تازەری‌و کوردەکانی ئازەربایجانی لەسەرکۆکردنەوە. لەهەمان کاتدا توانی روسیەش والێ بکا هێزەچەکدارەکانی خۆی لەسەرسنوری ئازەربایجان مولّ بدا بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا بەقازانجی هێزەکانی شا خۆی لەشەرەکە هەڵبقورتێنێ. هەروەها توانی سوڵتانی عوسمانیش ناچار بکا هێزە چەکدارەکانی خۆی بنێرێتە کوردستانی عوسمانی‌و بارگەو مەخفەر لەناوچە گرنگەکان‌و لەسەرسنور دابنێ. بەم جۆرە جوڵانەوەکەی گەمارۆی سوپایی‌دا.

بەمەش لەماوەیەکی کورتدا ورەی هێزەکانی شێخ روخان‌و توشی تێشکانی کردن.

لەبواری دیپلۆماسی‌دا، شا توانی وا لەحکومەتەکانی روسیاو بەریتانیا بکا کەنەك هەر پشتیوانی مەعنەوی یاسیاسی لەجوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵا نەکەن‌و دانی پیانەنێن، بەڵکو توانی وایان لێ بکا گوشاری بەتین بۆ سەر بابیعالی بەرن کەناچاری بکا هەوڵی سیاسی بدا بۆ بڵاوە پێکردن‌و دەسهەڵگرتنی شێخ عوبەیدوڵڵا لەشەڕو هەوڵی سوپایی بدا بۆ ئەوەی دەس بگرێتەوە بەسەر ناوچە شێواوەکانی کوردستان‌و سنوری هەردو دەوڵەتدا لەئەنجامدا شێخ بەگیراوی لەکوردستان دوربخەنەوە.

لەبواری سیاسی‌دا، شا توانی جوڵانەوەکە لەزۆرایەتی کوردی ئێرانی دابڕێ. شۆڕشەکە نەیپەرژایە سەرئەوەی بتەنێتەوە بۆ ناوچەکانی سنەو کرماشان، بەڵکو هێزی کوردەکانیشی لەسەر کۆکردەوە بۆ بەگژاچونی.

هەروەها توانی هەستی شیعەیەتی ئازەریەکان لەدژی شێخ‌و جوڵانەوەکەی کەسوننی بون بورروژێنێ‌و لەشەڕێکی مەزهەبی خوێناویانەوە بگلێنێ نەك هەر دژی شێخ‌و لایەنگرەکانی بەڵکو دژی هەمو کوردو سوننیەکانی موکریان.

لەبەرامبەر ئەوەدا تەقەللاکانی شێخ عوبەیدوڵڵا بۆ جێبەجێ کردنی لایەنە سیاسی، دیپلۆماسی، جەنگیەکانی ستراتیجەکەی سەریان نەگرت.

لەبواری جەنگی‌دا، بەهۆی نابەرامبەریەوە لەژمارەی هێزەکان‌و چەکی هێزەکان‌و جۆری رێکخستن‌و مەشق‌و دیسپلین‌و سەرکردایەتیەوە، جوڵانەوەکە

نەیتوانی هیچ سەرکەوتنێکی کاریگەر چ بەوەی دەست بگرێ بەسەر شارو شوێنی گرنگو ستراتیجیدا، چ بەوەی شکستێکی سەخت بەهێزێکی گەورەی ئێرانی بدا، بەدەس بهێنێ، بەڵکو بەشێکی هێزەکەی لەپاش چەند سەرکەوتنێکی بچوك، بەهۆی نارێکوپێکیو بێ دیسپلینیەوە بەهەندێ کالای بێ بایەخەوە بلاوەیان لێ کردو پاشماوەی هێزەکەش لەگەڵ دەرکەوتنی بەرایی هێزە نیزامیەکەی ئێراندا بەتێشکاویو نارێکوپێکی کەوتە کشانەوەو بلاوە لێ کردن.

لەبواری دیپلۆماسیدا، نەك هەر نەیتوانی پشتیوانی مەعنەوی-سیاسی یاپشتیوانی ماددیو دانپیانانی قانونیو سیاسی دەوڵەتێکی گەورەی وەکو بەریتانیا یاروسیە بەدەس بهێنێ، کەلەسەری هەڵبداتێو پارێزگاری لێ بکا، بگرە لەدوا قۆناغی بزوتنەوەکەدا گەلەکۆمەکیی دیپلۆماسی روسی-ئینگلیزی-ئێرانی دژی کورد کەوتنە زۆرهێنان بۆ تورکیا کەبەرێگەی تەدەخولی عەسکەری کۆتایی بەراپەرینەکە بهێنێو سەرکردەکانی بگرێو لەکوردستان دوریان بخاتەوە.

لەبواری سیاسیدا، بزوتنەوەکە نەیتوانی گەلی کورد یەك بخات، دواکەوتویی گشت لایەنەی کۆمەڵی کوردستان، لەئەنجامی ئەوەشدا دواکەوتویی هۆشی نەتەوەیی کورد لەزۆربەی ناوچەکانو لەناو زۆربەی عەشیرەتەکاندا، کەهێشتا دڵسۆزی بۆ بنەماڵە، عەشیرەت" دڵسۆزی بۆ مەزهەبو دین لەسەرو دڵسۆزییەوە بو بۆ نەتەوە... زۆربەی ناوچەکان دورە پەرێز راوەستاونو هەندێ لەوانەش کەسەرەتا بەشداربون زو پەشیمان بونەوەو هەڵگەرانەوە.

هەروەها نەیتوانی پشتیوانی نەتەوە مەسیحیە چەوساوەکانی ئەرمەنیو ئاسوری، پشتیوانی نەتەوە چەوساوەکانی ئازەریو عەرەب، پشتیوانی دەسەڵاتدارەکانی فارسو تورك بەدەست بهێنێ.

ئەمانە، لەلایەك زەمینەی سەرکەوتنی دەرباری قاجارو بابیعالییان بۆ دامرکاندنەوەی جوڵانەوەکە خۆش کردو لەلایەکی ترەوە زەمینەی تێشکانو دوایی هاتنی راپەرینی ١٨٨٠ی گەلی کوردیان ئامادە کرد.

### ٦/٣ ئەنجامەکانی تێشکانی بزوتنەوە ١٨٨٠

١-لەکوردستانی ئێران، هێزە چەکدارەکانی ئێران: نیزامیو میلیشیا بەتوندوتیژیەکی ئەوتۆ کەوتنە سەرکوتکردنی خەڵكو سزادانی بەکۆمەڵیان بۆ ئەوەی چاوترسێن بنو جارێکی تر زانی هەڵگەرانەوەو راپەرین نەکەن، کەتوانای

مرۆیی‌و ئابوری لەخەڵکی ناوچەکە بڕی. بەقسەی سەرچاوەیەکی ئاگاداری وەکو مەسعود میرزا زل ئەلسلتانی کوڕی ناصرالدین شا لەو چەند هەفتەیەدا سەد هەزار کەس کوژران‌و سەد هەزار کەس دەربەدەر بون‌و دو هەزار گوندی گەورەو بچوك وێران کران[٥٦] ئەمەش زەرەرێکی ئەوەندە قورس بو لەکورد کەوت تانزیکەی ٣٠ساڵ وزەی جوڵانی لەبزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی ئێراندا نەهێشت.

٢-لەکوردستانی عوسمانیدا، سوڵتان عەبدولحەمید بەپێچەوانەی ئێرانەوە هەوڵیدا گەلی کورد بەلای خۆیدا رابکێشێ‌و بیکاتە هێزێکی گەورەی رێکخراو بۆ پاراستنی سەڵتەنەتی خۆی‌و بەکارهێنانی لەسەرکوتکردنی ئەرمەنیەکان‌و بەکارهێنانی لەشەڕدا دژی ئێران‌و روس. سوڵتان عەبدولحەمید لەگەڵ شێخ‌و مەلاکانی کورد پێوەندی نزیکی دروست کرد، موچەی بۆ زۆربەیان بڕییەوە. کوڕو نەوەی ئەمیرە کوردە لێخراوەکانی لەئەستەمول لەخۆی نزیك خستەوە. هەندێ قوتابخانەی لەهەندێ جێگای کوردستان دامەزران لە١٨٨٥یشەوە دەستی کرد بەنزیك خستنەوەی ئاغاور شێخ‌و مەلاکانی کورد لەخۆی بۆ پێکهێنانی تیپە حەمیدییەکان((حەمیدیە سواری الایلری))لەخێڵ‌و هۆزەکانی کورد.

بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بەتێپەڕینی زەمان ناوەڕۆکە سیاسییەکەی چاکتر خەملی کەدوایی تر لەشێوەی هۆشی نیشتمانی، پەیدابونی گۆڤارو بڵاوکراوە، دامەزراندنی یانەی رۆشنبیری‌و رێکخراوی سیاسی، زیادبونی دەوری کورد لەبابیعالیدا... خۆی نواند.

٣-بزوتنەوەی نەتەوەیی ١٨٨٠لەجاران زیاتر سەرنجی دەوڵەتە ئەورووپییە گەورەکانی بۆلای کورد راکێشا. گرنگی ئەم گەلە لەناوچەکەدا، بەتایبەتی گرنگی جیۆپۆلەتیکی نیشتمانەکەی بۆ ئەوان دەرکەوت. هەولیان دا زیاتر لەجاران نفوزی خۆیان لەکوردستاندا بەهێزبکەن. گەڕیدەو ئەفسەرو ئارکیۆلوگ‌و جاسوس.. سەردانی کوردستانیان ئەکرد. لێکۆڵینەوە لەزمان‌و فەرهەنگ‌و مێژو، لەلایەنی سیاسی، کۆمەڵایەتی ژیانی خەڵکی کوردستان‌و جوگرافیای وڵاتەکەیان لەلایەن دەزگا زانستیەکانی روسیاو بەریتانیاو ئەڵمانیاوە پەرەی سەندو زۆرتر بو، کەئەمەش بەڵگەی بایەخ دانی ئەو دەوڵەتانەیە بەکوردو شوێنی ژیانی.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم:

[1] هامر پورگشتال، تاریخ امپراطوری عثمانی، ترجمه میزا زکی علی ابادی، باهتمام جمشید کیان فر، ج٤،(تهران: زرین، بهار١٣٦٨ش)، ل٣١٢.

[2] ڕۆم بۆ دەوڵەتی عوسمانیو عەجەم بۆ دەوڵەتی ئێران لێرەدا بەپێڕەوی لەشاعیرانی کورد: ئەحمەد خانی ١٦٥١-١٧٠٧، سالم ١٨٠٠-١٨٦٦، حاجی قادری کۆیی ١٨١٧-١٨٩٧، بەکارهێنراوە، هەروەکو لەسەر زمانی ئەو سەردەمەی خەڵکی کوردستانیش باوبوە.

[3] بۆ نمونە بڕوانە قەسیدەکەی سالم لەوەلامی قەسیدەکەی نالیدا ١٨٠٠-١٨٥٦ سەبارەت بەنەمانی دەسەلاتی میرنشینی بابانو دامەزرانی دەسەلاتی ڕاستەوخۆی عوسمانی.

[4] جرج ن. کرزن، ایران وقضیه ایران، ترجمه و غ. وحید مازندرانی، ج١ چ٢،(تهران: مرکز انتشارات علمیو فرهنگی، ١٣٦٢) ص٧٠١" میزا شکرالله سنندجی(فخر الکتاب) تحفه ناصری، مقابلهو تصحیح از: د. حشمت الله طبیبی،(تهران: امیر کبیر، ١٣٦٦)، ص ٥٣١" واسیلی نیکتین، کردو کردستان، ترجمه، محمد قاضی، (تهران: نیلوفر، ١٣٦٦) ص٤١٣، مینورسکی، الاکراد، ترجمه د.معروف خزنەدار، (بغداد:١٩٦٩).

[5] روحی بك الخالدی المقدسی(الانقلاب العثمانی وترکیا الفتاة)(مجلة الهلال)، الجزء و الاولی، السنه ١ ،١٧ کانون اول ١٩٠٨، ص٨١.

[6] بۆ شەجەرەی بنەماڵەکەیان بڕوان: نیکتین، س ن، ل٤٩٩.

[7] د. جەلیلی جەلیل، ڕاپەڕینی کوردەکان ساڵی ١٨٨٠، وەرگێڕانی د.کاوس قەفتان،(بەغداد: ١٩٨٧)، ل٨٠.

[8] کرزن، س ن، ل٧٠١.

[9] هەمانجی

[10] د.عزیز شەمزینی، الحرکة القومیة التحرریة للشعب الکردی، من منشورات الاتحاد الوطنی الکردستانی، مطبعة الشهید ابراهیم عزو، نیسان ١٩٨٦، ص ٦٢" هەروەها هەندێ بڕی ئەم وتارە لە:خالفین، خەبات لەڕێی کوردستان دا وەرگێڕانی جەلال تەقی،(سلێمانی: چاپخانەی ڕاپەڕین، ١٩٧١)، ل١٧٩: جەلیل، س. ن، ل١١٤. ئەمانیش هەموویان لەئارشیفی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ڕوسی دەریان هێناوە.

[11] علی دهقان، رضائیه یا سرزمین زردشت،(تهران: ابن سینا، ١٣٤٨)، ل٤١٠.

[12] جەلیل: س ن، ل١٧١و١٧٤.

[13] علی افشار، رسالەی شۆڕش شێخ عبیدالله، ضمیمه و: میزا رشید ادیب الشعرا، تاریخ افشار، بەتصحیحو اهتمام پروزی شهریار افشار- محمود رامیان،(تبریز: چاپخانه شفق، ١٣٤٦)، ص٥٢٩-٥٢٠.

[14] هـ س، ل٤٠٦-٤٠٧.

[15] هـ س، ل٥٥٤.

[16] عباس میزا ملك ارا، شرح حال، بەکوشش دکتر عبدالحسین نوائی، چ٢،(تهران: بابك ٢٥٣٥)، ص١٥٣-١٥٨ هەرچەندە عباس میزا لەژیاننامەکەیدا باسی نوسراوەکەی شێخ عوبەیدوڵلا ئەکا بەلام تێکستی نامەکەی نەنوسیوەتەوە، چونکە وەکو خۆی ئەڵێ داوێتی بەناسرئەلدین شا.

[17] جەلیل، س ن، ل١١٥" نیکتین، س ن، ل؟

[18] جەلیل، س ن، ل١٠٨

[19] هـ س، ل١٠٩

[20] هـ س، ل٩١و٩٢ و١٠٩

[21] هـ س، ل٨٦

[22] هـ س، ل١٦٧" خالفین، س ن، ل١٦٦و ١٦٧

[23] هـ ج

[24] هـ س، ل١٤٧و ١٩٣

[25] ظل السطان راگوێزراوە لەتحفه ٥٣٠

[26] کرزن، س ن، ل٧٤٦

[27] هـ س، ل٧٦٢

[28] هـ س، ل٨٤٨-٧٤٩و٨٣٦

[29] روداوەکـانی لەشکرکێشـی شـێخ عوبەیـدوڵڵا لەلایـەن دو کەسـەوە کـەخۆیان شـایەتی روداوەکانی بون هەر لەو سەردەمەدا نوسراوە:
یەکەم، اسکندر غوریانس، قیام شێخ عبیدالله شمزینـی در کردسـتان، بـە اهتمـام عبداللـە مردوخ، (تهران: دنیای دانش،٢٥٣٦)
دوەم، علی افشار، شۆڕش شێخ عبادالله، ضمیمه: میرزا رشید ادیـب الشـعرا، تـاریخ افشـار، بەتصحیح و اهتمام پرویز شهریار افشار-محمود رامیان،(تبریز، چاپخانه شفق، ١٣٤٧ش)
یەکەمیان زۆرتر لەسەر روداوەکانی قۆڵی سابڵاخە چونکە خۆی لەو رۆژانەدا لەسـابڵاخ بـوە. دوەمیشیان زۆرتر لەسـەر قـۆڵی ورمییـە چـونکە ئـەویش خـۆی لـەورمێ بـوە. هەرچـەندە هەردوکیان بەگیانێکی زۆر دوژمنانە روداوەکان ئەگێڕنەوە، بـەڵام زانیـاری مێـژویی بـەنرخ و ناوازەیان تێدایە. زۆری زانیارییەکانی ئێرە لەوێ دەرهێنراون.

[30] افشار، س ن، ص٥٣٦.

[31] کرزن، س ن، ل٧٠١.

[32] افشار، س ن، ل٥٧٠.

[33] ابراهیم صفائی، مدارك تاریخی، (تهران: چاپ شرق، ١٣٥٥)، ص١١٣.

[34] جەلیل، س ن، ل٨٣.

[35] لینچوفسکی

[36] دەربارەی ستراتیجی ناوچەیی روسی و بەریتانی بڕوانە: پیو- کارلو تیرینزیو، رقابتهـای روس و انگلیس در ایران وافغانستان ترجمه عباس اذین(تهران-چ٢، ١٣٦٣ش)

[37] مینورسکی، س.ن، ل٨٢-٨٣.

[38] جەلیل س ن، ل٨٥" خالفین، س ن، ل١٦٩.

[39] جەلیل، س ن، ل٨٤-٨٥" خالفین، س ن، ل١٦٩-١٧٠.

[40] خالفین، س ن، ل٢٠٦.

[41] هـ س، ل١٧٠.

[42] لینچوفسـکی، رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت لـەکاروباری دنیـادا،(چـاپی ١٩٧١ی ئینگلیـزی، ل٦٥٣).

[43] خالفین، س ن، ل۱۷٦.
[44] هـ س، ل۱۳۰
[45] جەلیل، س ن، ل۱۷٦.
[46] کرزن، س ن، ل۷۰۲.
[47] هـ س، ل۷۰۱
[48] مرتضی راوندی، تاریخ اجتماعی ایران، ج۲،(تهران: امیر کبیر)، ص۵۸۳.
[49] هـ س، ل۲۰۲و ۱۸۵.
[50] هـ س، ل۲۰۱
[51] هـ س، لا۱۷۰و ۱۹۷و ۱۸۵و ۱۸٦و ۱۸۷
[52] هـ س، لا ۹۲و ۹۳و ۱۳٦و ۱۷٦و ۱۱۱و ۱٤۱
[53] کرزن، س ن، ل۷۰۲
[54] خالفین، س ن، ل۱۹۹
[55] بڕوانە ئەو شیوەنەی وەفایی بۆ شێخی کردوە((دیوانی وەفایی))لێکۆڵینەوەو لەسەر نوسینی محمد علی قەرەداخی.
[56] ظل السلطان راگوێزراوە لەتحفە ۵۳۱.

## ٤-شەڕو ئاشتی: هەردوکیان کوێرەوەری

### ١-هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی

تەرازوی ئەو((هاوسەنگی هێز))ەی ماوەیەکی درێژ ئاسایشی نێوان دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپای راگرت بو، دوای تەواوبونی یەکگرتنی نەتەوەیی ئاڵمانیو ئیتاڵیو پێشکەوتنی خێرای پیشەسازی ئاڵمانیاو ئەمریکا، بەجۆرێکی بنەڕەتی تێکچو. دەوڵەتە ئیمپریالیستیە بەهێزەکان ئەیان ویست پارێزگاری دەسکەوتە کۆنەکانی خۆیان بکەنو دەوڵەتە تازە پێشکەوتوەکانیش ئەیان ویست سەرلەنوێ، بەپێی گۆڕانی تەرازوی هێزەکان، دنیا دابەش بکرێتەوە. دەوڵەتانی ئەوروپی کەوت بونە خۆبەهێزکردنو بۆربۆڕێنی خۆچەکدارکردن، چونکە هەمویان چاوەڕێی هەڵگیرسانی جەنگیان ئەکرد.

رۆژی ٢٨ی ژوئینی ١٩١٤ وەلیعەهدی نەمسەو هاوسەرەکەی لەسیراجیفو کوژران.

نەمسە ئەمەی کردە بەهانە، پاش دورۆژ جەنگی لەدژی دەوڵەتی سیرب راگەیاند.

روسیەش، کەخۆی بەپارێزەری گەلانی سلاڤی دائەنا، بۆ پشتیوانی لەسیرب هێزەکانی خۆی سازدا، جەنگی دژی نەمسە راگەیاند.

پاش چەند رۆژێ ئاڵمانیاش بۆ پشتیوانی لەنەمسە جەنگی دژی روسیا راگەیاند.

ئەڵمانیاش دژی فەرەنسەو بەلچیك جەنگی راگەیاند.

بەریتانیاش جەنگی دژی ئاڵمانیا راگەیاند.

هەر لەو رۆژانەشدا ژاپۆن جەنگی لەدژی ئاڵمان راگەیاند.

ئاگری شەڕ سەرانسەری ئەوروپای گرتەوەو دەوڵەتانی هاوبەشی جەنگ دابەش بون بەسەر دو بەرەدا:

بەرەی دەوڵەتانی ناوەند، کەپێك هات بو لەئاڵمانیاو نەمسەو دوایی تر تورکیاش.

بەرەی دەوڵەتانی پێکهاتو، کەبریتی بو لەبەریتانیاو روسیاو فەرەنسەو لەکۆتایی جەنگدا وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاشیان چوە پاڵ.

ئەگەرچی مەیدانی سەرەکی بەلادا خستنی جەنگ ئەوروپا بو، بەڵام ناوچەکانی رۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاست بۆ هەردولای جەنگ، لەڕوانگەی ستراتیجییەوە گرنگییەکی ژیانییان هەبو، هەردولا پێیان وابو، لەدەس دان یا دەس گرتن بەسەر ئەم ناوچەیەدا ئەتوانێ کارێکی کاریگەر بکاتە سەر چارەنوسی گشتی جەنگ[1]. لەبەرئەوە هەم ئەڵمانیاو هاوپەیمانەکانی‌و، هەم ئینگلیزو هاوپەیمانەکانی بەهەمو رێگەیەك هەوڵی تێوەگلاندن یا ئەگەر نەتوانرێ بێلایەن کردنی تورکیاو ئێرانیان ئەدا.

### ١/١ تورکیا: سەرەتا بێلایەنی‌و، سەرەنجام بەشداری تەواو

لەکاتی هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی‌دا، محەمەدی ٥هەم سوڵتانی عوسمانی‌و، سعید حلیم پاشا سەروەزیرانی بابیعالی بو، بەڵام دەسەڵاتی راستەقینە لەدەس سەرکردەکانی حیزبی(اتحاد و ترقی))دا بەتایبەتی لەناو لەپی ٣ سەرە ناودارەکەی ئەو حیزبەدا بو" تەلعەت پاشا، وەزیری کاروباری ناوەوە، ئەنوەر پاشا، وەزیری جەنگ، جەمال پاشا، وەزیری دەریا. ئۆردوی تورکیش بەکردەوە لەژێر دەستی ئەو ٤٢ ئەفسەرە ئاڵمانییەدا بو کە بەسەرکردایەتی جەنەراڵ لیمان فون ساندەرس خەریکی مەشق دادان‌و رێکخستنەوەی بون.

بیروڕای سەرانی حکومەتی تورك بەرامبەر جەنگ وەکو یەك نەبو، لەناو ئەوانەدا هەندێکیان داواکاری بێلایەنی‌و، هەندێکیان لایەنگری هاوبەشی دەوڵەتانی ناوەندو، هەندێکیان لایەنگری هاوبەشی دەوڵەتانی پێکهاتو بون.

بابیعالی لەسەرەتای هەڵگیرسانی جەنگدا، بێلایەنی خۆی لەجەنگ راگەیاند. بەڵام ئەنوەرو تەلعەت، دو لەسەرکردە ئیتحیادییە دەسەڵاتدارەکانی حکومەتی تورك، بەگەرمی هەوڵیان ئەدا ئیمپراتۆریی عوسمانی لەپاڵ هێزەکانی ئاڵمانی‌دا دژی دەوڵەتانی پێکهاتو بەشداری جەنگ بێ. پێیان وا بو، ئاڵمان بەزویی شەڕەکە بەقازانجی خۆی بەلادا ئەخاو، جەنگ ئەباتەوە.

لە٢ی ئابی ١٩١٤دا، کەجەنگ سەرەتای بوو هەندێ لەسەرکردەکانی((اتحاد و ترقی))بەنهێنی، پەیمانێکی سیاسی- جەنگییان لەگەڵ ئاڵمانیا بەست. هەندێ لەسەرانی حکومەتی تورك ئاگایان لێ نەبو.

له۲۹ی تشرینی یەکەمی ۱۹۱٤دا ژێرئاوییەکی ئاڵمانی کەمولکی تورکیا بو، لەدەریای رەشدا پەلاماری ئوستولی روسیایدا.
روسیاش بەدوای ئەمەدا لەرۆژی ۲ی تشرینی دوەمی ۱۹۱٤دا جەنگی دژی تورکیا راگەیاند.
بەدوی روسیەدا فەرەنسەو بەریتانیاش لەرۆژی پێنجەمی هەمان مانگدا جەنگیان دژی تورکیا راگەیاند.
تورکیاش ئیتر بەتەواوی تێکەڵاوی جەنگی جیهانی بو. لەوەشدا مەبەستی ئاڵمان هاتەدی، چونکە بەلای ئەڵمانەوە گرنگ نەبو ئامانجی تورك لەجەنگ چیە یا چی بەسەر دێ، گرنگ ئەوە بو تورك گوشار لەسەر ئەو کەم بکاتەوە، بەشێکی هێزەکانی روس‌و ئینگلیز لەمەیدانی سەرەکی- ئەوروپا دەربهێنێ، بەمەیدانێکی لاوەکیەوە لەئاسیا خەریکیان بکاو ئاسایشی رێگای هاتوچۆی ئیمپراتۆریی بەریتانی لەگەڵ هندستان بخاتە مەترسیەوە.
ئاڵمان بۆ ئەوەی کەڵکی تەواو لەهاوکاری تورك وەربگرێ، داوای لێ کرد" بوغازەکان لەروی کەشتیرانی هەمو دەوڵەتانی ترا دابخاتو، ئاورێکانی قەناتی سویس‌و عەدەن ببڕێو، پەلاماری قافقاس بداو بەشێکی هێزی روسی خەریك بکا،((خەلیفە))ش جیهاد لەدژی دەوڵەتانی پێکهاتو رابگەیەنێ[2].
سەرکردایەتی ئاڵمانی لەلایەکەوە هەندێ دیپلۆماتی کارامەی دانا بۆ کاری سیاسی‌و دیپلۆماسی لەتورکیا، لەلایەکی ترەوە هەندێ ئەفسەری بەتوانای ناسراوی هەڵبژارد بۆ ئەوەی دەس بگرن بەسەر ماشینی جەنگیی تورکدا. ئەفسەرانی ئاڵمانی لەپلە بەرزەکانی ئۆردوی تورکدا کەوتنە کار کردن" جەنەرال لیمان فون ساندەرس سەرپەرشتی رێکخستنەوەی ئۆردوی ئەکرد، جەنەرال فون فالکنهاین سەرکردایەتی هێزەکانی فەلەستین‌و فیلد مارشال گولتس سەرکردایەتی هێزەکانی میزۆپۆتامیایان ئەکرد، جەنەرال فون لوسو، ئەدمیرال هومان نوێنەری هەیئەتی ئەرکانی ئاڵمانی بون لای سەرکردایەتی جەنگیی تورك[3].
سەرکردەکانی(اتحادو ترقی))هیوای زلو زۆریان لەسەر بەشداری تورك لەجەنگدا هەڵچنی بو، بەتەمای سەرکەوتنی گەورەو دەسکەوتی زۆر بون.
ئامانجە سیاسی‌و جەنگییەکانی تورك لەبەشداربونی جەنگدا بریتی بو لە:
۱-رزگارکردنی ئیمپراتۆریی عوسمانی لەنفوزی بێگانەو پەرەپێدانی فەرهەنگی تورك.

٢-سەندنەوەی میسرو قوبروس‌و، ئەگەر توانرا لیبیاو تونس‌و جەزائیر.
٣-ئازادکردنی ناوچە تورك زمانەکانی روسیا وەکو قافقازو تورکستان‌و گرێدانی بەتورکیاوە.
٤-پەرەپێدانی نفوزی خەلیفە لەسەرانسەری ولاتانی ئیسلامدا[٤].

## ٢/١ ئێران: بێلایەنییەکی رێز لێ نەگیراو

لەکاتی هەلگیرسانی جەنگدا، دیپلۆماتەکانی ئالمان، ئینگلیز، روس، چ خۆیان راستەوخۆ، چ لەرێگەی دۆست‌و لایەنگرە ئێرانییەکانیانەوە هەولێکی زۆریاندا بۆ ئەوەی ئێران لەشەڕەوە بگلێنن. بەلام حکومەتی ئێران بەسەرۆکایەتی عەلاء الدولە بەرەسمیی بێلایەنی ئێرانی بەرامبەر جەنگ راگەیاند.

هیچ دەولەتێکی بەشداری جەنگ رێزی ئەم بێلایەنییەی ئێرانی نەگرت‌و، حکومەتی ئێران خۆیشی ئەو هێزو توانایەی نەبو پارێزگاری خۆی بکاو، بێلایەنی خۆی بسەپێنێ یا بپارێزێ.

ئێران، لەو کاتەدا هێزێکی چەکداری نارێکوپێك‌و لاوازی هەبو، خەزێنەکەی خالی بو. دەرباری قاجار لەوپەڕی فەسادو بۆگەنی‌دا بو. هێزەکانی روسیا لای سەرویان داگیرکردبو. هێزەکانی بەریتانیاش پاش چەند حەفتەیەك لەشەڕ لای خواریان گرت، جگەلەوەی پێشتریش هێزی لەئەفغانستان هەبو. شوێنی جیۆپۆلەتیکی ئێران وا هەلکەوت بو، لەلای سەرەوەی هاوسنوری روسی‌و لەلای رۆژئاوای هاوسنوری عوسمانی‌و لەلای رۆژهەلاتی هاوسنوری دەسەلاتی بەریتانی بو. ئێران بەلایەنەکانی جەنگ دەورە درا بو.

کەدەولەتی عوسمانی تێکەلاوی شەڕ بو، رۆژئاوای ئێران بو بەیەکێ لەمەیدانە گەرمەکانی جەنگ. کوردستانیش لەباری جوگرافییەوە وەها هەل کەوت بو، بۆ ئەوەی دەس یادەسکەوتی لەهەلگیرسانی ئەم شەڕەدا هەبێ. بو بەمەیدانێکی سەختی پێکادانی هێزەکانی هەردولای جەنگ، بەتایبەتی روس‌و تورك، کاتێ سولتان جیهادی راگەیاند. داوای لەهەمو موسلمانانی دنیا کرد دژی هێزەکانی دەولەتانی پێکهاتو بجەنگن، ئەم بانگە لەناو کوردو گەلە موسلمانەکانی تری ئێرانیش‌دا دەنگی دایەوە. بگرە تورك توانی کورد لەشەڕێکی خوێناوییەوە بگلێنێ دژی گەلە مەسیحییە هاونیشتمانەکانی.

ئۆردوی تورکی، بێ ئەوەی گوێ بداتە بێلایەنی ئێران، لەلایەکەوە لەشکرکێشی بۆ سەر قافقاز دەس پێ کردو، رژایە ناو ئەرزی ئازەربایجانەوە، لەلایەکی ترەوە کەوتە هان دان‌و یارمەتی ئێلەکانی کوردو، ئەو ئێرانییانەی لەدەس زولم‌و زۆری دەسەلاتدارانی روسی هەلاتبون بۆ ناو خاکی عوسمانی،

بەناوی جیهادو غەزاوە بەرەنگاریی هێزەکانی روس لەناو ئێراندا بکەن. بەم بۆنەیەوە حکومەتی ئێرانی کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ کاربەدەستانی روسیو، عوسمانی، داوای لەروسیا کرد سوپاکەی لەشارەکانی ئێران بکێشێتەوە بۆ ئەوەی لایەنەکانی تری جەنگ بیانویان بەدەستەوە نەمێنێ لەشکر بهێننە ناو ئێرانەوە، داوای لەعوسمانیەکانیش کرد رێگە لەئاژاوەنانەوەی کورد بگرێو، لەسنورەکانی ئەودا ئۆردو کۆ نەکاتەوە. تورك ئەیوت ئەگەر روس سوپاکەی خۆی لەئازەربایجان بکێشێتەوە، ئەویش خواستەکەی ئێران بەجێ ئەهێنێ. بەڵام روسەکان ئەیان وت، ئەوان سوپاکەی خۆیان لەئازەربایجان کێشاوەتەوە، جگە لەچەند دەستەیەکی کەم کەبۆ پاراستنی هاوولاتییەکانی خۆیان، کەسێکی تریان لەوێ نەهێشتۆتەوە.
هیچ لایەکیان قازانجی لەوەدا نەبو گوێ لەخواستەکانی ئێران بگرێ، بەڵکو هەردولا، هەریەکیان بەشێوەی خۆی، هەوڵی جێگیر کردنی خۆی ئەدا.

**٢- پلانی جەنگیی تورك‌و مەیدانەکانی**

بۆ بەجێهێنانی ئەو ئامانجە زلانەی بەتەمای بون، سولتان لە٢٣ی تشرینی دوەمدا بانگی جیهادیدا، داوای لەهەمو موسلمانانی دنیا کرد بەشداری شەڕ بن. سەرکردایەتی جەنگیی تورکیش هێزی مرۆیی هەمو گەلانی تورکیای سازداو، سەربازگیری لەناو مەسیحییەکانیشدا کرد. بەهاوکاریو راوێژی ئەفسەرانی ئەڵمانی پلانێکی جەنگیی فراوانی دانا. هێزەکانی خۆی لەدو مەیدانی سەرەکیدا بۆ هێرش سازدا:
مەیدانی یەکەم: جەبهەی سینا، بەسەرکردایەتی جەمال پاشاو یارمەتی جەنەرالێکی ئاڵمانی، ئەبو قەناتی سویس‌و میسر لەئینگلیز بگرێ. میسر لەهێزی بەریتانی پاك بکاتەوە، لەوێوە هەڵ بکوتێتە سەر سودان‌و لیبیاو سەرلەنوێ بیانخاتەوە سەر تورکیا.
مەیدانی دوەم: جەبهەی قافقاز، بەسەرکردایەتی ئەنوەر پاشاو بەیارمەتی جەنەرال شیلیندۆرف، ئەبو بەرەو ئازەربایجان‌و گورجستان‌و هەرچوارلای دەریای خەزەر بکشێ. بەهیوای ئەوەی گەلانی ئازەری، تورك، تورکمان، تاتار لەژێردەستی روس دەربێنێ. نەتەوەی تۆران یەك بخرێتەوەو ساز بدرێ بۆ پێکهێنانی سوپایەکی چەکداری مەزن‌و هەمو گەلە موسلمانەکانی روسیاو ئێران‌و ئەفغانستان‌و هیندستان... بەرەو پیری بێن‌و، بەدەنگ بانگی جیهادی سولتانەوە دژی روس‌و ئینگلیز راپەڕن.
ئۆردوی تورك لەسەرەتادا هەتا باتۆم‌و تەورێز پێشڕەوی کرد. بێ ئەوەی رێزی بێلایەنی ئێران بگرێ، ناوچە کوردنشینەکانی خۆراوای ئێرانی داگیرکرد.

له((ساری قامیش))سوپای روسی شکاند. بەڵام لەناوەڕاستی زستانی ١٩١٤-١٩١٥دا سوپای روسی کەوتە هێرشی پێچەوانە بۆ سەر ئۆردوی تورك. بەتێشکاوی تا سەر سنور راوی نا. ئینجا چوە ناو قوڵایی ئەرزی عوسمانییەوە.
پلانی جەنگیی تورك سەری نەگرت. لەباتی ئەو دو مەیدانەی سەرکردایەتی تورك ئەی ویست بیانکاتە مەیدانی سەرەکی. دەوڵەتانی پێکهاتو توانییان چەندین مەیدانی جەنگیی چاوەڕوان نەکراوی لێ بکەنەوە، لەوانە: دەردەنیل، سینا، میزۆپۆتامیا، عەرەبستان، قافقاس بۆ ئەوەی بەدیوارێکی ئەستوری هێزی هاوپەیمانەکان لەلای ئەرمەنستان، کوردستان، عەرەبستانەوە گەمارۆی بدەن.
لەناو جەبهەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ٣ یان راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ لەگەڵ کورد پێوەندییان هەبو.

### ١/٢ جەبهەی قافقاز

تورکیا بۆ جێبەجێ کردنی پلانی جەنگیی خۆی، بێ ئەوەی گوێ بداتە بێلایەنی ئێران لەسەرەتای جەنگەوە بەناو ئازەربایجانی ئێرانیدا بەرەو قافقازو دەریای قەزوین کەوتە جوڵان. لەسەرەتادا هەندێ سەرکەوتنی بەدەس هێنا توانی هەندێ لەئازەربایجانی ئێرانیو قافقاسی روس داگیر بکا. لەناوەڕاستی زستانی ١٩١٤-١٩١٥دا سوپای روسی کەوتە هێرشی پێچەوانە. هێزەکانی تورك بەتێشکاوی بەرەو سنوری روسی- عوسمانی پاڵ پێوەنراو کەوتە پێشڕەوی لەناو خاکی عوسمانیدا. تەرابزون. ئەرزرۆم، ئەرزنجان، وان، بتلیس، موش.ی داگیر کرد. مەیدانی ئەم جوڵانە سەرەنجام درێژ بوەوە بۆ بەشی خواروی کوردستان، سوپای روس لەکانونی یەکەمی ١٩١٥دا تەوریزو لەمایسدا ورمێ دوایی تر شنۆ، سابڵاخ، بانەی گرتو لەشوباتی ١٩١٦دا گەیشتە کرماشان، لەبەهاری ١٩١٦دا لەسنوری ئێران- عوسمانی لە٣ لاوە: رەواندز، پێنجوین، خانەقین بەرەو کوردستانی جنوبی کشا.
رەفتاری هێزە چەکدارەکانی روس بەگشتیو تیپە چەکدارەکانی ئەرمەنیو قازاخ بەتایبەتی، لەکوردستاندا زۆر خراپ بو. لەکوشتنی خەڵكو تاڵان کردنی ماڵو دارابیان، لەوێران کردنی شارو ئاوەدانی دەستیان نەئەپاراست.
خێڵەکانی کورد بۆ پاراستنی سەرو سامانی خۆیان لەزۆر شوێن ناچار بون بەرهەڵستی نائومێدانەی پێشڕەوی هێزەکانی روسیا بکەن.
لەم جەبهەیەدا ئامانجی پلانی جەنگیی تورکیا نەهاتە دی، بەڵکو توشی تێشکانێکی کاریگەر بو، بەشێکی قەڵەمڕەوی خۆی لەدەسدا، بەڵام ئامانجی

ئاڵمان، کەئەی ویست جەبهەیەکی نوێی جەنگ لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بۆ خەریك کردنی بەشێ لەهێزەکانی روس بکاتەوە، هاتەدی.
ئەم مەیدانە ئەگەرچی لەمێژودا بەجەبهەی قافقاز ناوئەبرێ. لەراستیدا ئەبو ناوی جەبهەی کوردستان بێ" چونکە شەڕگەی سەرەکی ئەم مەیدانەو زۆری شەڕو تێکهەڵچونە سەختەکانی نێوان هێزەکانی روسی- عوسمانی لەسەر ئەرزی کوردستان رویداو، ژمارەیەکی زۆری قوربانییەکانی، چ وەکو سەرباز لەریزی ئۆردوی عوسمانیداو، چ وەکو دانیشتوانی ناوچەکە کورد بون.

### ٢/٢ جەبهەی میزۆپۆتامیا

لە٦ی تشرینی دوەمی ١٩١٤دا هێزەکانی بەریتانیا لەفاو دابەزین و لە٢٢مانگ دا چونە ناو بەسراوە، ئامانجی ئەم کارە جەنگییە پارێزگاری بیە نەوتەکانی لای خواروی رۆژئاوای ئێران بو لەمەترسی پەلاماری دوژمن. ئەنجام دانی ئەم هێرشە ئەوەندە ئاسان بو سەرکردایەتی هێزەکەی هاندا پێشنیار بکەن بۆ سەروتری خۆیان رێگەی پێشڕەوی بدرێن بەرەو بەغداد.
هێزەکانی بەریتانیا لە٣ی حوزەیرانی ١٩١٥دا عەمارەو لە٢٥ی تەموزدا ناسریەو لە ٣٠ی ئەیلولدا کوت الامارەیان گرت. لەکۆتایی تشرینی دوەمدا شەڕ گەیشت بوە نزیك سەلمان پاك لە٣٠ کیلۆمەتری شاری بەغداد. هێزەکانی عوسمانی بەسەرکردایەتی جەنەرالی ئاڵمانی گولتس لەوێ هێزی بەریتانییان بەتێشکاوی ناچاری کشانەوە کرد بۆ کوتو لەوێش گەمارۆیان دان.
لە٢٥ی نیسانی ١٩١٦دا هێزی بەریتانی لەکوت شکستی خواردو ١٣ هەزار کەسی لێ بەدیل گیرا. بەڵام هێزەکانی بەریتانی بەهێنانی هێزی نوێ سەرلەنوێ بەهێز کرانەوەو ئامادەکران بۆ پێشڕەوی بەرەو بەغداد. ئامانجی جوڵانی ئەم جارەیان ئەوە بو کە لەگەڵ هێزی روسی، کە لەناو خاکی ئێرانەوە بەرەو میزۆپۆتامیا کەوت بوە پێشڕەوی، یەك بگرنەوە. لە١١ی مارتی ١٩١٧دا هێزەکانی بەریتانی بەسەرکردایەتی جەنەراڵ مود گەیشتنە شاری بەغداد.
رەفتاری هێزی بەریتانی لەگەڵ خەڵکی ناوچە داگیرکراوەکان لەگەڵ رەفتاری هێزی روسی جیاواز بو. هێزەکانی بەریتانیا لەگەڵ ئەوەی هەوڵیان ئەدا بەرێگەی کاری جەنگی دەس بەسەر ناوچەکاندا بگرن، لەهەمان کاتدا هەوڵی بەدەسهێنانی دۆستایەتیو پشتیوانی دانیشتوانی ناوچە داگیرکراوەکانیشیان ئەدا. بەڵێنی رزگاریی لەدەسەڵاتی رەشی تورکو چاکردنی باری ژیانو دابین کردنی هێمنیو ئاسایشیان پێ ئەدان. جەنەرال مود لەبەیانێکی درێژدا کە لە١٩ی مارتی ١٩١٧دا بۆ خەڵکی بەغدادی بڵاو کردەوە، نوسی بوی: ((...هێزەکانی

ئێمە وەکو داگیرکەر یا دوژمن نەهاتونەتە ناو شارو خاکی ئێوە، بەڵکو وەکو رزگارکەر هاتون..))[٦] وە داوای لەپیاوە ناسراوەکانی ئەوێ کرد بوو هاوکاری لەگەڵ ئەفسەرە سیاسیەکانی هێزەکەی بکەن بۆ رێکخستنەوەی کاروباری خۆیان.

کاربەدەستانی بەریتانی لەبەغداد لە٤ی تەموزی ١٩١٧ دا دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی رۆژنامەی عەرەبی زمانی((العرب))ئەم رۆژنامەیە جگە لەوەی هەواڵی سەرکەوتنی هاوپەیمانەکانو تێشکانی تورکو ئاڵمانی بڵاوئەکردەوە، هەوڵی ئەدا هەستی نەتەوەیی عەرەب دژی تورك بوروژێنێ، دۆستایەتی عەرەب بەدەس بهێنێ، بەڵێنی هاوپەیمانەکانی دەربارەی مژدەی ئازادی گەلان بەعەرەب ئەگەیاند.

ئامانجی ئەم هێزە بۆ یەککگرتنەوەی لەگەڵ سوپای روس هاتە دی. لەلای خانەقینەوە هەردو هێز لێکیان دایەوە، بەتەمای ئەوەی هەردوکیان پێکەوە بەرەو موسل پێشرەوی بکەن.

هەڵگیرسانی شۆڕشی شوباتی ١٩١٧ دژی قەیسەر پشێوی خستە ناو ریزەکانی سوپای روسی. لەئۆکتۆبەری هەمان ساڵدا کاتی بولشەویك دەسەڵاتی گرتە دەست، لەگەڵ تورك جەنگی راگرتو کەوتە دانانی رێوشوێنی کێشانەوەی یەکجاری هەمو هێزەکانی لەناوچە داگیرکراوەکان.

دەرچونی روسیا لەجەنگ بەریتانیای لەبیری داگیرکردنی موسل پەشیمان نەکردەوە. خۆی بەتەنیا کەوتە ئامادەکردنی زەمینەی سیاسیو جەنگیی جێبەجێ کردنی پلانەکەی لە١ی کانونی دوەمی ١٩١٨دا کاربەدەستانی بەریتانی لەبەغداد بۆ پڕوپاگەندە لەناو کورداو، بۆ بزواندنی هەستی نەتەوەیی کورد دژی تورك دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی رۆژنامەی کوردی زمانی((تێگەیشتنی راستی))[٧].

نیشانەکانی هەرەس رۆژ بەرۆژ زیاتر لەهێزەکانی عوسمانیدا دەرئەکەوت. بەریتانیا درێژەی بەهەڵکشانی خۆیدا بەرەوژور. لە٢٨ی نیسانی ١٩١٨دا گەیشتە توزخورماتو، رۆژی دوایی تر کفریو کەرکوکی داگیرکرد. ئەمەش سەرەتای دەرکردنی یەکجاری دەسەڵاتی تورك بو لەکوردستانی جنوبی.

### ٣/٢ جەبهەی عەرەبستان

لەگەرمەی جەنگدا حسێن شەریفی مەککە، ئەمیر عەبدوڵڵای کوڕی ناردە لای لۆرد کیچنەری بەریتانی لەقاهیرە بۆ ئەوەی پێی رابگەیەنێ کەئەو ئامادەیە هاوکاری بەریتانیا بکا دژی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرامبەر رزگاری عەرەبو بەدی هێنانی ئاواتەکانیدا. لەسەرەتادا بەریتانیا گوێی نەدایە ئەم پێشنیارە.

له ۱۹۱٥دا بەریتانیا بەچاکی زانی سود لەعەرەب وەربگرێ دژی تورك. سێر هینری ماکماهون نوێنەری بەریتانیا لەقاهیرە پێوەندی لەگەڵ حسێن کرد. چەند نامەیەك لەنێوان هەردوکیاندا ئاڵوگۆڕکرا حسێن لەنامەی رۆژی ١٤ی تەموزی ۱۹۱٥دا کەخواستەکانی خۆی بۆ ماکماهون رون ئەکاتەوە، لەنوقتەی یەکەمیدا نوسیوێتی:

((۱-بەریتانیا دان بنێ بەسەربەخۆیی وڵاتانی عەرەبیدا کەسنورەکەی" لەلای سەرویەوە لەمیرسینو ئەدەنەوە دەس پێ ئەکا تا ئەگاتە خەتی ۳۷ لەبیرەجیك، ئورفا، ماردین، میدیات، جزیرەی ئیبن عومەر، ئامێدی تا سنوری ئێران. لەلای رۆژهەڵاتیەوە لەسنوری ئێرانەوە تا خلیجی بەسرە. لەلای خوارویەوە موحیتی هیندی، جگە لەعەدەن کەوەکو خۆی ئەمێنێتەوە لەلای رۆژئاوایەوە دەریای سور، دەریای سپی ناوەڕاست تا میرسین.

ئینگلیز خەلافەتی عەرەبی بۆ ئیسلام بسەلمێنێ))[٨].

حسێن لەم دیاری کردنەدا بەشێکی گەورەی نیشتمانی نەتەوەیی کوردی خستۆتە ناو ئەو سەرزەمینەوە کەداوای ئەکرد، کەچی هەمو وڵاتانی عەرەبی ئەفریقای لێ دەر هاویشتوە. چاوتێ بڕینی نەتەوە پەرستەکانی عەرەب لەئەرزی کورد لەو سەردەمەوە دەس پێ ئەکا.

بەریتانیا بێ ئەوەی بەڵێنێکی تەواو و رون بدا بەحسێن توانی لەگەڵی رێك بکەوێ بەشداری جەنگ بێ دژی دەوڵەتی عوسمانی. لە ٥ی حوزەیرانی ۱۹۱٦دا حسێن شۆڕشی عەرەبی دژی دەسەڵاتی تورك راگەیاند، داوای لەهەمو عەرەب کرد کەریزی سوپای تورك بەجێ بهێڵنو بێنە ریزی هێزەکانی ئەوەوە. بەریتانیا کولونیل لورەنسو چەند ئەفسەرێکی تری بۆ سەرکردایەتیو رێکخستنی کارە جەنگییەکانی شۆڕشەکە نارده حیجاز. هەروەها هەندێ لەو ئەفسەرە عەرەبانەی دیلی ئینگلیز بون ئازاد کران بەو مەرجەی لەو شۆڕشەدا بەشدار بن. هێزەکانی عەرەب کەوتنە پەلاماردانی سەربازگەکانی ئۆردوی تورك لەحیجاز بەنیازی پاك کردنەوەی. حسێن ناوی لەخۆی نا مەلیکی عەرەب. بەڵام لەبەرئەوەی بەریتانیا ئەم ناوەی پێ پەسەند نەبو، گۆڕی بۆ مەلیکی حیجاز.

لەم جەبهەیەدا ٦٥ هەزار سەربازی تورك بەشۆڕشی عەرەبەوە خەریك بون. سەرەنجام شۆڕشەکە رێی تەخت کرد بۆ دەرکردنی هێزەکانی تورك لەحیجازو سوریاو فەلەستین.

### ٣-هەڵوێستی گەلانی نە تورك

بەدی هێنانی ئامانجەکانی ئەنوەر پاشاو هاورێکانی پێویستی بەستراتیجێکی سوپایی- سیاسی هەبو. لەپێش هەمو شتێکا بەندبو بەڕادەی یەکگرتنی گـەلانی عوسمانیو دڵسۆزییانەوە بـۆ ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی. تورکیـا وڵاتێکـی فـرە- نەتەوەیی فـرە- دیـن بـو. بـەگوێرەی هەنـدێ سـەرژمێری دانیشـتوانی ئەوسـای سەرزەمینی عوسمانی ٢٥ ملیۆن بو. لەوە تەنیا ١٠ ملیۆنی تورك بو کە لەنیوەی کەمتری تێکڕای دانیشتوانی ئـەکرد. ئـەوی تـر ١٠ملیـۆن عـەرەبو ٢ ملیـۆن ئەرمەنیو ١,٥ ملیۆن کوردو ئەوی تریشی نەتەوەی جیاجیا بـو. تورکیـا تـەبایی دینیو تەبایی نەتەوەیی تێ دا نەبو.

حکومـەتی عوسمـانی بەدرێـژایی زەمـان سیاسـەتی چەوسـاندنەوەی دینـی بەرامبەر گەلانی ناموسڵمان گرت بـو. لـەدوای هـاتنی((تورکـانی لاو))یشـەوە سیاسەتی چەوساندنەوەی نەتەوەیی بەرامبەر گەلانی نەتورك گرت بو. هەوڵ دانی تورکانی لاو بۆ تواندنەوەی گـەلانی نـەتوركو نەموسـوڵمان لەبۆتـەی نەتـەوەیی توركدا، لەچەرخێکا کەئازادی دینو مەزهەبو نەتەوە لەدنیادا بو بو بـەباو، دڵـی هەمو گەلانی نە تورکی ناو خاکی عوسمانی لەحکومەتی تورك رەنجاند بو.

کوردو عەرەب ئەگەر پێوەندی هاودینی لەگەڵ تورك کـۆی ئەکردنـەوە، ئـەوا گەلانی مەسیحی نەپێوەندی هاودینیو نەپێوەندی هاونەتەوەییان لەبەیندا نـەبو، بەڵکو هەمیشە لەژێر باری زوڵموزۆری دینیو نەتـەوەییدا بـون، ئەمـەش پـاڵی پێوە ئەنان کەپەنا بۆ دەوڵەتی دەرەوە ببەن بۆ ئەوەی بیان پارێزنو لەهەمو هەلێك کەڵك وەربگرن لەجەهەننەمی چەوسانەوەی عوسمانی رزگاریان ببێ.

لەناو گەلە مەسیحیەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا ٣ یان گرنگی تایبەتییان هەبو: ئەرمەنیو ئاسوریو یۆنانی.

یۆنانیەکانی ژێردەستی تورکیا ئەگەرچی هەمیشە لەگەڵ دەوڵەتانی ئـەوروپی هاوکار بون دژی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەڵام لەسـاڵانی ١٩١٤- ١٩١٨دا هـیچ گیروگرفتێکی دژواریان بۆ تورك دروست نەکرد. ناکۆکی یۆنانی- تورکی لـەدوای راگرتنی جەنگ تەقییەوە.

#### ١/٣ ئەرمەن

نەتەوەی ئەرمەن لەمێژ بـوو سـەربەخۆییان لـەدەسدا بـو. لەبـەینی روسـیاو تورکیادا دابەش کرابون، هەروەها کەمایەتیـەکی پەرتوبڵاویشـیان لـەئێران بـو. بزوتنەوەی نەتەوەیی ئەرمەن لەپێش بزوتنەوەی نەتـەوەیی گەلـە موسـڵمانەکانی عەرەبو کوردا گەشەی کرد بو. ئەرمەن بەهیوا بون بەیارمەتی روسیا بەئامانجی

نەتەوەیی خۆیان بگەن. لەو شەڕانەدا کە لەبەینی روس‌و تورکدا ئەقەوما ئەرمەنیەکان بەنهێنی‌و بەئاشکرا هاوکارییان لەگەڵ روس دژی تورک ئەکرد. ئەمەش بو بو بە بەهانەیەکی مێژویی بەدەس تورک‌و فەناتیکەکانەوە بۆ زیاتر ئازاردان و ناوبەناو سزادانی بەکۆمەڵی ئەرمەن.

کەجەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرسا، ئەرمەنیەکان بەشداربونی تورکیان لەجەنگدا بە((هەستێکی تێکەڵاو لەترس‌و هیوا))وە وەرگرت((ترس لەتۆڵەسەندنی چاوەڕوان کراوی تورک کەهیچ گوشارێکی دەرەکی نەی ئەتوانی بەری بگرێ))و((هیوای تێشکانی تورکیاو سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان بەتایبەتی روسی))[9].

کەنیسەکانی ئەرمەن رایان گەیاند کەقەیسەری روسیا پارێزەری هەمو ئەرمەنیەکانی جیهانەو داوایان لەهەمو ئەرمەنیەك کرد هەر یارمەتیەکی شەخسی یا مادی لەدەس دێ پێشکەشی سوپای روسی بکا. روسیاش بەیانێکی رەسمی دەرکرد. هانی ئەرمەنیەکانی ئەدا بۆ راپەڕین لەدژی تورک‌و بەڵێنی رزگاری پێ ئەدان. ئەرمەنیەکان بەدەنگ ئەو بانگەوازانەوە چون. ریزی ئۆردوی تورکیان بەجێ ئەهێشت‌و بەکۆمەڵ ئەیان دایە پاڵ سوپای روس، یارمەتی روسیان ئەدا بۆ پێشڕەوی، هێزی داگیرکەریان وەکو رزگارکەری خۆیان پێشوازی ئەکرد.

تورکیا بەرەقی بەرپەرچی هەڵوێستی ئەرمەنی دایەوە بەتوندی تۆڵەی لێ سەندن. لەحوزەیرانی ١٩١٥-دا بڕیاری راگوێزانی ئەرمەنی‌دا لەناوچەی رۆژهەڵاتەوە بۆ ناوەوەی ئەنەدۆڵ. تەلعەت پاشا وەزیری کاروباری ناوخۆی تورکیا خۆی راستەوخۆ سەرپەرشتی جۆری راگوێزانی ئەرمەنی ئەکرد لەساڵانی ١٩١٥-١٩١٦دا. جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارە بو بەهۆی ئەوەی ولایەتەکانی رۆژهەڵات لەئەرمەنی چۆڵ بن. بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەی جێی باوەڕ ئەبێ ٢ ملیۆن ئەرمەنی توشی ئەم کوێرەوەریە بوبن لەوانە ٦٠٠ هەزاریان مردون[10]. ئەم کارەساتە لەمێژودا بە((کوشتاری ئەرمەن))ناسراوە.

روسیا هەندێ تیپی چەکداری لەئەرمەن دروست کردبو. تۆڵەی لێقەومانی خۆیان لەخەڵکی ئەو ناوچە کوردنشینانە ئەکردەوە کەسوپای روسی داگیری ئەکردن. کاربەدەستانی روسی لەباتی ئەوەی هەوڵی ئاشت کردنەوەی گەلی ئەرمەنی‌و گەلی کورد بدەن. تیپە چەکدارەکانی ئەرمەنیان ئازاد کرد بو بۆ تۆڵەسەندن لەکوردو قوڵ کردنی ناکۆکی نێوان ئەم دو گەلە دراوسێیە.

سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کشانەوەی روس لەکوردستانو وازهێنانی لەپشتیوانی کردنی ئەرمەنو هەڵوەشاندنەوەی تیپە چەکدارەکانیان، کوێرەوەری گەلی ئەرمەنی سەخت تر کرد.

**٢/٣ ئاسوری**

ئاسوریەکان بەئەندازەی ئەرمەنی توشی مەینەتی نەبوبون، بەلاّم ئەوانیش لەژێر باری زوڵمی دینیو کۆمەلاّیەتیو ئابوریدا بون. پاش ئەوەی سوپای روسی بەناو کوردستاندا پێشڕەوی کرد، ئاسوریەکانی هەکاری لەتورک راپەڕین. لەهاوینی ١٩١٥دا بەتێشکاوی بەکۆمەڵ کۆچیان کرد بۆ ناوچەکانی ژێردەسەلاّتی سوپای روسی لەخوی، سەلماس، ورمێ. چەندین هەزار کەسیان چونە ریزی سوپای روسەوە. کاربەدەستانی روسی هەندێ تیپی تایبەتییان لێ پێك هێنا. لەسەرەتای ١٩١٨دا ژمارەیان ئەگەیشتە نزیکەی ١٢ هەزار چەکدار لەژێر سەرکردایەتی ئاغا پەتروسدا[11]. ئەم هێزانە شان بەشانی سوپای روسی بەشداری جەنگ بون دژی عوسمانی بەو هیوایەی بەئامانجەکانی خۆیان بگەن لەئازادیو سەربەستی.

سمکۆی سەرخێڵی شوکاك مارشیمۆنی پێشەوای دینی ئاسوریەکانی کوشت. ئەوەش بو بەهۆی دروست بونی ناکۆکیەکی خوێناوی لەبەینی ئاسوریو کوردا. هەردولا بەکۆمەڵ کوشتاریان لەیەکتری ئەکردو دەستیان لەیەکتری نەئەپاراست.

لەدوای کشانەوەی روس لەئێران ئاسوریەکان بێ پشتو پەنا مابونەوە. تورك بەبیانوی تەمێ کردنی نەستوریەکانی هەکاریەوە کەهاوولاّتی عوسمانی بون هێرشی کردە سەر ناوچەی ورمێ. روس لەناوچەکەدا نەما بو، بەریتانیاش ئاگاداری نەستوریەکانی کرد بەتەمای هێزی یارمەتی بەریتانی نەبنو پشت بەخۆیان ببەستن[12]. لەژێر گوشاری تورکا بەشەڕ لەخواروی گۆمی ورمێوە کشانەوە بەرەو ناوچەکانی ژێردەستی بەریتانیا لەهەمەدانو لەوێشەوە گوێزرانەوە بۆ بەعقوبە.

ئاسوریەکان توشی کوێرەوەریەکی نەتەوەیی بون. لەنیشتمانی خۆیان هەڵکەنرانو بەولاّتانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاستو ئەوروپاو ئەمریکادا بەدەربەدەری بلاّوبونەوە.

**٣/٣ عەرەب**

بەژمارە ئەوەندەی تورك یاخود زیاتر ئەبون. هاودینی تورکو کورد بون. لەناو ئۆردوی تورکو داوودەزگاکانیدا چەندین ئەفسەری پلە بەرزو کاربەدەستانی گەورەی عەرەب هەبو.

سیاسەتی((مەرکەزییەت))و تورکاندن کەحکومەتی ئیتیحادیەکان لەناوچە عەرەبیەکاندا پێڕەویان ئەکرد، نابەرامبەری لەنوێنەرایەتی((مەجلیسەکان))دا، تەنگ هەڵ چنین بەرێکخراوە فەرهەنگی‌و سیاسیەکانی عەرەب، لەناو رۆشنبیرانی عەرەبدا هۆشی جیابونەوەخوازی دروست کردبو. لەسالانی دوای ئینقیلابی عوسمانی تا هەڵگیرسانی جەنگ لەئەستەمبوڵ، قاهیرە، دیمەشق، بیروت، بەغداد، پاریس.. چەند رێکخراوێکی عەرەبی نەتەوەیی ئاشکراو نهێنی دروست بوبون بۆ بەدی هێنانی خواستە نەتەوەییەکانی عەرەب، کە بەپێی جیاوازیی بۆچونی رێکخراوەکان جیاواز بو. هەر لەوەی هەندێکیان داوای((لامەرکەزییەت))یان ئەکرد لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا تا ئەوەی داوای جیابونەوەی هەمو نەتەوەی عەرەب‌و دروست کردنی دەوڵەتێکی یەکگرتوی عەرەبییان ئەکرد.

کاتێك جەنگ هەڵگیرسا سەرکردایەتی تورك گومانی لەدڵسۆزی عەرەب نەبو. هەڵگیرسانی شۆڕشی عەرەب بەهاوکاری ئینگلیز لەحیجاز دژی دەسەڵاتی عوسمانی(١٩١٦) بۆ کاربەدەستانی تورك شتێکی چاوەڕێ نەکراو بو.

شۆڕشی عەرەب بەسەرۆکایەتی حسێن جەزرەبەیەکی کوشندە بو لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سیاسەتەی تورکیا گرتی بۆ سزادانی بەکۆمەڵی ئەرمەنی بەهۆی دەس تێکەڵاوکردنیەوە لەگەڵ روسیا دژی تورك، ئەگەرچی عەرەبیش هەمان رێگەی گرت بو، کەچی تورك سیاسەتی سزادانی بەکۆمەڵی بەرامبەر عەرەب نەگرت بەهۆی دەس تێکەڵاو کردنیەوە لەگەڵ ئینگلیز.

جەمال پاشا سەرکردەی هێزەکانی تورك لەسوریاو فەلەستین لەناو عەرەبدا بەجەمال السفاح ناسراوە چونکە سەرکردەیەکی بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەبی لەشام لەسێدارەدا، لەسەر ئەوەی ناوەکانیان لەئارشیفی کونسوڵگەی فەرەنسیدا لەبیروت دۆزرا بوەوە. تورك رێگەی سەرکوت کردنی دڕندانەی نەگرت وەکو بەرامبەر ئەرمەن گرت بوی. بەڵکو سیاسەتی گفتوگۆی لەگەڵ شەریف حسێن گرت بو. جەمال پاشا هەوڵی زۆری لەگەڵ حسێندا بۆ ئەوەی لەهاوکاری ئینگلیز پەشیمانی بکاتەوە، لەبەرامبەر سەلماندنی خواستەکانی نەتەوەی عەرەبدا. هەرئەویش حسێنی لەکەینوبەینی رێکەوتنی نهێنی هاوپەیمانەکان بۆ دابەش کردنی ولاتانی عەرەب ئاگادار کرد. بەڵام ئیتر تێ پەڕی بو. قسە خۆشەکانی جەمال پاشا کاری لەشەریف حسێن نەکرد. حسێن نەك هەر گوێی نەدایە بەڵێنەکانی جەمال پاشا دەربارەی پاشەڕۆژی ولاتانی عەرەب بەڵکو بۆ ئەوەی

بڕوای ئینگلیز بەخۆی بەهێزتر بکا، نامەکانی جەمال پاشای بۆ ئەوان نارد وەکو بەڵگەی دڵسۆزیو نیاز پاکی خۆی بەرامبەر بەریتانیای گەورە[13].

### ٤/٣ کورد

کوردیش هاودینی تورکو عەرەب بو. ئەگەرچی هەمیشە بەرەنگاری دەسەڵاتی تورکی کردوە بەڵام لەساڵانی جەنگدا بەدڵسۆزی مایەوە، لەکاتێکا جگە لەکورد هەمو نەتەوەکانی تر" عەرەبو ئەرمەنیو ئاسوری لەتورك هەڵگەڕانەوەو لەڕویدا ڕاپەڕین. تەنانەت ئەو چالاکیە سیاسی، فەرهەنگی، ڕێکخراوەییەی لەساڵانی پێش جەنگدا بۆ بەدەسهێنانی مافی نەتەوەیی ئەکرا لەساڵانی جەنگدا کپ بو. کورد هیچ گیروگرفتێکی سوپایی یا سیاسی کاریگەری بۆ کاربەدەستانی تورك دروست نەکرد. ئەفسەرو سەربازەکانی کورد لەڕیزی ئۆردوی تورکدا لەهەمو مەیدانەکانی جەنگدا بەشداربون. ئەبێ هۆی ئەمە چی بێ؟ بۆچی سەرکردەکانی کوردیش وەکو شەریف حسێن کەڵکیان لەهەلومەرجی زەمانی جەنگ وەرنەگرت، کەهەلێکی لەباری بۆ هەڵ خست بون، بۆ ئەوەی تەقەللاکانی خۆیان نوێ بکەنەوە لەپێناوی هێنانەدی ئامانجی نەتەوەیی خۆیاندا، بەڵکو بەپێچەوانەی هەمو ڕابردو بەدڵسۆزی مانەوە بۆ عوسمانی؟

ڕەنگە هەندێ کەس پێیان وابێ" ((فتوای خەلیفە))بۆ((غەزاو جیهاد)) واتە هەستی دینیی پاڵی بەکوردەوە ناوە لەماوەی جەنگدا بەدڵسۆزیو هێمنی لەخزمەتی تورکدا بمێنێتەوە، بەشداری قەتڵوعامی مەسیحییەکان بێ. بێ ئەوەی هیچ شۆڕشێ یا هەڵگەڕانەوەیەك لەو هەلە زێڕینەدا لەکوردستان ڕوبدا. لەکاتێکا کورد، بەر لەجەنگ، هەمیشە لەحاڵی یاخی بونو شۆڕشدا بوە. ئەمە لێکدانەوەیەکی یەکلایەنەیە. زۆر لەپیاوە ناسراوەکانی کورد، لەوانە چەندین شێخو مەلای تاینپەروەر، لەپێش هەڵگیرسانی جەنگو لەساڵانی جەنگدا، ئامادەیی خۆیانو گەلی کوردیان دەربڕی، بۆ هاوکاری هەم لەگەڵ ڕوسو هەم لەگەڵ ئینگلیز، بەرامبەر پشتیوانی ئەوان لەخواستە نەتەوەییەکانی کورد. هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر لەشێخو مەلاکانی کوردستان لەسەرەتای جەنگ دا بەدەنگ بانگی جیهادەوە چونو خەڵکیان هاندا بۆ غەزای کافران، بەڵام زۆری نەخایان ئەو کەفوکوڵە نیشتەوە. لەهەمان کاتدا چەندین شێخو مەلای کورد هیچ باوەڕێکیان بەجیهادو غەزای عوسمانی نەبو، دژی ڕاوەستانو لەسەر ئەوە توشی ئازارو سزا، بەڵکو توشی کوشتنو هەڵواسین بون وەکو شێخ بابا سەعیدی

غەوس ابادی، شێخی تەریقەتی قادری لەموکریان[14]. چەندین شاعیری کوردیش دژی ئەو شەڕە شیعریان هۆنیوەتەوە[15].

هەندێکی تر هۆی ئەم رەفتارە((راستە!((ی کورد ئەگێڕنەوە بۆ ئەوەی کەتورك زیرەکانە توانیوێتی ئارەزوی پشێوی خوازانەی کورد ئاڕاستەی مەسیحییەکانی دراوسێیان" ئەرمەن‌و ئاسوری بکاو بەشەڕی ئەوانەوە خەریکیان بکا.

ئەشێ ئەمە هۆیەکی گرنگی ئەو رەفتارە بێ بەڵام ناشێ هەموی هەر ئەمەبێ. بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لەو سەردەمەدا سەرکردایەتییەکی یەکگرتوی شارەزای کاروباری دنیاو خاوەنی رێکخراوێکی فراوانی نەبوە کەبتوانێ پایەکانی ستراتیجی گشتی بزوتنەوەکە دابڕێژێ‌و، خەڵکی کوردستان بۆ جێبەجێ کردنی ساز بداو کەڵك لەهەلومەرجی نیشتمانیی- کوردستان، هەلومەرجی ناوچەیی-رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەلومەرجی جیهانی- دەوڵەتانی ئەوروپی‌و ئەمریکا، وەربگرێ هاوپەیمانەکانیش لەو کاتەدا بەهێزو توانای خۆیانەوە ئەنازین، پێیان وابو پێویستیان بەهێزی گەلانی ناوچەکە نیە، خۆیان ئەتوانن داگیرو دابەش بکەن بەپێی ئەو رێکەوتنە نهێنییانەی خەریکی ئامادەکردنی بون.

بەر لەهەڵگیرسانی جەنگ" هەمو هەوڵەکانی سەرکردەو پیاوە ناسراوەکانی کورد لەگەڵ کاربەدەستانی روسی بۆ دامەزراندنی پێوەندی دۆستایەتی‌و هاوکاری کوردی- روسی‌و، بەدەسهێنانی پشتیوانی روسی بۆ ئامانجی نەتەوەیی بزوتنەوەی رزگاری کورد، سەری نەگرت. لەوانە:

-چونی عبدالرزاق بەدرخان بۆ قافقازو مۆسکۆ[16].

-چونی شێخ عبدالسلام بارزانی‌و سمکۆ بۆ تفلیس(١٩١٤)[17].

-پێوەندی سەرانی راپەڕینەکەی بتلیس: مەلا سەلیم ئەفەندی‌و هاوڕێکانی لەگەڵ دیپلۆمات‌و، کاربەدەستانی روسی(١٩١٤)[18].

کاربەدەستانی روسی لەباتی گرنگی دان بەلایەنی سیاسی لەپێوەندییەکانی خۆیاندا لەگەڵ مەزنەکانی کورد، هەوڵی پەیداکردنی نۆکەرو جاسوس‌و کڕینی پیاوە ناسراوەکانی کوردیان ئەدا، بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا بەکاریان بهێنن.

هاوپەیمانەکان لەسەرەتای جەنگدا هیچ گرنگییەکیان بەهاوکاری‌و پشتیوانی جەنگیی گەلی کورد نەدا.

لەگەرمەی جەنگدا دیسانەوە هیچ تەقەلایەکی گەورەکانی کورد لەگەڵ روس‌و ئینگلیز سەری نەگرت. نە ئینگلیز بەدەنگ ئەم داوایەوە هات، بەبیانوی ئەوەی چونکە ئەوسا کوردستان لەسنوری ناوچەی گرنگی پێدانی ئەوا نەبو، وە نە

روس بایەخێکی پێدا، چونکە ئەویش گرەوی لەسەر هاوکاری مەسیحییەکانی کوردستان، ئەرمەنیو ئاسوری، کردبو. لەوانە:
-دو تەقەلای شەریف پاشا لەگەڵ ئینگلیز، جاری یەکەمیان ساڵی ١٩١٤ لەسەرەتای دەسپێکردنی شەڕداو، جاری دوەم ساڵی ١٩١٨ دەورووبەری کۆتایی جەنگ[١٩].
-تەقەلای کامیل بەگو حەسەن بەگی بەدرخان لەگەڵ روس[٢٠].
دەوڵەتانی هاوپەیمان لەو کاتەدا بەدەنگ ئەم بانگانەوە نەچون، چونکە روسیا نەی ئەویست دان بەمافی نەتەوەیی کوردا بنێ بەڵکو ئەی ویست بەهاوکاری گەلانی مەسیحی ناوچەکە داگیر بکا. بەریتانیاش نەی ئەویست ئەرکی سەرشانی خۆی قورس بکا بەوەی((لێپرسراوەتیەکەی درێژ بێتەوە بۆ ئەو شوێنانە))ی کەئەبو ببنە ناوچەی نفوزی روسیو فەرەنسی.
نیکیتین لەو بارەیەوە شتێ ئەگێڕێتەوە کەخۆی لەبەینا بوە:
((ئەزانین کە کەمال بەگی بۆتان، یەکێ لەبنەماڵەی بەدرخان، لە١٩١٦دا لەتفلیس تەقەلایەکی زۆریدا بۆ ئەوەی مەسەلەی ئامانجی نەتەوەیی کورد بەگراند دوك نیکولا، نائب السلطنه ی قافقازو سەرفەرماندەی هێزەکانی روسیا لەجەبهەی تورك، بسەلمێنێ. بەهەر حاڵ پێ ناچێ لەو سەردەمەدا حکومەتی روسی پێڕەوی سیاسەتێکی دیاری کراوی بەرامبەر کورد کرد بێ. مەسەلەی کورد لەگەڵ دورنمای ئەرمەنستانێکی سەربەخۆ بەهەڵە تێکەڵاو بوبو. لەکۆتایی ساڵی ١٩١٧دا لەلایەن((جەمعییەتی ئیستیخلاصی کوردستان))ەوە پەیکێ هاتە لام، لەبارەگای کونسوڵگەری خۆم لەورمێ بینیم. ئەم پەیکە نامەیەکی لەسەید تەهاوە دایە دەستم، کەتێیدا داوای لەمن کرد بو رێوشوێنێ بۆ یەکتربینینی ئەو وفەرماندەکانی سوپای روس رێك بخەم، بۆ ئەوەی پێکەوە لەسەر کاری هاوبەش دژی تورك بەمەبەستی ئازادکردنی کوردستان رێك بکەون. سەید تەها کە لەبەندی دیلایەتی روس هەڵات بو، برازای شێخ عەبدولقادر بو. شێخ خۆیشی کەتا ١٩١٧ لە ئەستەموڵ مابو، دوایی لەوێوە هەڵات و چو بۆ لای مەلیك حسێن...))[٢١].
سیاسەتی کوردیی روسیا لەو سەردەمەدا، لەژێر کارتێکردنی چەند لێکدانەوەیەکدا، هێشتا لەسەر بۆچونێکی رونو دیاریکراو ساخ نەبو بوەوە" یەکێکیان، چونکە روسیا خۆی وڵاتێکی فراوانی فرەنەتەوە بو، چاوی بڕی بوە داگیرکردنی قەڵەمڕەوی ئێرانیو تورکیو، نەی ئەویست هیچ نەتەوەیەکی تری ناوچەکە هاوبەشی بن، بەڵکو ئەی ویست خۆی بەتەنیا ئەو شوێنانە بکاتە

بەشێکی ئەرزەکانی" ئەوی تریان، روسیا پارێزگاری گەلانی سلاڤیو مەسیحییانی ئۆرتودوکسی ژێر دەستی عوسمانی کرد بوە یەکێ لەبیانوەکانی ستراتیجی فراوانخوازی خۆی، بۆ ئەوەش خۆی وەکو پارێزەری مەسیحییەکان پیشان ئەدا، نەی ئەویست بەنزیك خستنەوەی کوردو سەلماندنی خواستە نەتەوەییەکانی، مەسیحییەکان کە لەو سەردەمەدا لەگەڵ کورد ناکۆك بون، برەنجێنێ.

بەدەسهێنانی پشتیوانی کورد هەتا درەنگ لەبەرنامەی هاوپەیمانەکاندا نەبو. بەڵکو هێزەکانی روسیا بەوپەڕی درندایەتیەوە لەگەڵ کورد ئەجولانەوە. هەندێ لەسەرکردەو دیپلۆماتەکانی روس بەتایبەتی شاخوفسکی، گردینسکی، مینورسکی لەراپۆرتەکانی خۆیاندا بۆ دەزگا دەسەڵاتدارەکانی سەرو هەوڵێکی زۆریاندا بۆ ئەوەی قانعیان بکەن لەباتی بەکارهێنانی شێوەی زەبروزەنگ بۆ سەرپێ دانەواندنی کورد، شێوەی بەدەسهێنانی دۆستایەتیو پشتیوانی گەلی کورد بگرن لەرێگەی باش کردنی رەفتاری هێزە داگیر کەرەکانی روسیا لەکوردستانو دروست کردنی پێوەندی لەگەڵ سەرکردەکانی کوردو دانی بەڵێنی دابین کردنی مافی نەتەوەییان. بەڵام تازە درەنگ بو، چونکە ئەم بیروبۆچونە نوێیە دەربارەی مەسەلەی کورد لەناو کۆڕە دەسەڵاتدارەکانی روسدا کاتێ گەڵاڵە بو، کەئیتر رژێمی قەیسەری خۆی لەروخان نزیك ئەبوەوە. ئەوە بو لەئۆکتۆبەری ١٩١٧دا روسیای سۆڤێتی بەیەکجاری دەستی لەجەنگ هەڵگرتو ئەو بیروبۆچونانە هەرگیز جێبەجێ نەکران.

جەنەرال نیسل فەرماندەی میسیۆنی فەرەنسی لەروسیا، لەراپۆرتێکا کەچەند رۆژێکی کەم بەر لەشۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ بۆ حکومەتی فەرەنسی نوسیوە، هەندێ لایەنی ئەم مەسەلەیە رون ئەکاتەوە. لەراپۆرتەکەدا نوسیوێتی:

((هەرکارێکی جەنگیی دژی تورکیا ئەتوانیو ئەبێ پشت ببەستێ بەئاژاوەی سیاسی لەم ئیمپراتۆرییە فرەنەتەوەیەدا. هاوپەیمانەکان کاتی خۆی رایان گەیاندوە ((عەرەبستان هی عەرەبە)) ئەوان ئەبێ بەراگەیاندنی ((کوردستان هی کوردە)) درێژە بەم سیاسەتە بدەن. ئەمە لەو کارە کاریگەرانەیە کەئەتوانێ لەجەبهەی قافقاز بکرێ، لەکاتێکا وا دێتە بەرچاوان کاری جەنگیی روس خەریکە نرخی پێشوی لەدەس ئەدا. هەمو تەقەللاکانی روس بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی کورد لەخۆیان سەری نەگرت.. ئەو تاڵانیو کوشتارەی قازاخەکان کردویانە هۆی گەورەی ئەوە بوە)).

بۆ ئەنجامدانی ئەم سیاسەتە کوردییە نوێیە نیسل پێشنیار ئەکا هاوپەیمانەکان کۆبونەوەیەك بکەنو نوسیوێتی:

((ئەرمەنەکان لەم کارەدا یارمەتی مان ئەدەن هەرچەندە دوژمنایەتی زۆر کۆنی بەینی ئەم دو گەلە شتێکی مێژوییە, بەڵام ئەرمەنیەکان پەی بەوە ئەبەن کەدروست کردنی کوردستانی ئۆتۆنۆم دەستەبەرێکی نوێ ئەبێ بۆ جێبەجێ کردنی راستەقینەی سەرەتای نەتەوەکانو دروست کردنی ئەرمەنستانی ئۆتۆنۆم لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا))[٢٢].

حکومەتی فەرەنسی لە١٣ی کانونی یەکەمی ١٩١٧دا لەوەڵامی جەنەرال نیسل دا بەتەلەگرام نیسلو هەمو کاربەدەستانی تری ناوچەکەی ئاگادار کرد کە:

((حکومەت وەهای بەراورد ئەکا کەهاوکاری ئەرمەنیو مەسیحیەکانی قافقاز بەخەرجێکی کەم ئەتوانرێ دابین بکرێ... لەبەرامبەر ئەمەدا، نیشان دانی نزیکی بەرامبەر ئیلاتی کورد هەستی دوژمنانەی مەسیحیەکان بەرامبەر ئێمە ئەوروژێنێ، لەئەنجام دا حکومەت لای وانیە کەئەگەر بەپێی بەرنامەی باس کراو لەراپۆرتی جەنەرال نیسلدا بەئاشکرا موافەقەت بکرێ لەسەر دروست کردنی کوردستان شتێکی لەبار بێ... لەگەڵ ئەوەشدا، حکومەت لای وایە بەپێی ئەو ئیمکاناتەی لەبەر دەس دایە یارمەتی جەنگیی خێڵەکانی کورد بەدەس بهێنن. ئەکرێ کۆلۆنیل شاردینی بکرێتە لێپرسراوی دۆزینەوەی رێگەی گفتوگۆ لەگەڵ سەرۆکەکانی کورد))[٢٣].

ئەگەرچی کورد تەنیا نەتەوەی گەورە بو کە لەساڵانی جەنگدا بەدڵسۆزی بۆ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مایەوە، بەڵام لەچاو هەمو نەتەوەکانی ترا، جگە لەئەرمەن، ئازارو کوێرەوەری لەهەمویان زیاتر بەدەس تورکەوە بینی. سەرباری ئەوەی کوردستان بو بەکەلاوەیەکی گەورەو، جگە لەوانەی لەمەیدانی شەڕدا یا بەهۆی شەڕەوە کوژران، کاربەدەستانی تورک ٧٠٠ هەزار کوردیان بەبیانوی ئەوەی ناوچەکانیان بۆتە مەیدانی شەڕ بەزۆر لەکوردستانەوە بۆ ناوەوەی ئەنەدۆڵ راگوێزا،ماڵو داراییان زەوت کردن، بەشێکی لەڕێگا مردنو ئەوی تریشی هەژارو دەربەدەر بون. کەشتێکی ئەوتۆی لەکوێرەوەری گەلی ئەرمەنی کەم تر نیە، لەکاتێکا کوێرەوەری ئەرمەن لەسەرانسەری دنیادا دەنگی دایەوە، کەچی کەسێ لەسەر کوێرەوەری کورد هەڵی نەدایە.

## ٤- پلانی ژێر بەژێر بۆ دابەش کردنی رۆژهەلاتی ناوەڕاست

روسیەو بەریتانیا لەسیاسەتی ناوچەییاندا لەرۆژهەلاتی نزیکو ناوەڕاستدا ناکۆك بون. قازانجەکانیان لەگەڵ یەك نە ئەگونجا. ستراتیجیان بەرامبەر هەمو ناوچەکە بەگشتیو، بەرامبەر بەپارێزگاری قەوارەی ئیمپراتۆرییەکانی ئێرانیو عوسمانی یا دابەشکردنی جیاواز بو. ئەم دو هێزە ناکۆکەی کەهەردوکیان چاویان

بڕی بوە ناوچەکەو، هەریەکەیان بەگوێرەی ستراتیجی ناوچەیی خۆی و، بەشێوەی تایبەتی خۆی، لەپەیجۆری جێبەجێ کردنی ئامانج و دەسکەوتی تایبەتی خۆیدا بو، تەنیا دوجار لەسیاسەتی ناوچەییان دا توانییان یەك بکەون.

جاری یەکەمیان، لەتاو هەڕەشەی تەنینەوەی شۆڕشی فەرەنسی و گەورەبونی مەترسی ناپلیۆن پۆناپارت.

جاری دوەمیش، لەتاو هەڕەشەی ئاڵمانی و پەرەسەندنی نفوزی ئاڵمانی لەئەوروپاو ئاسیادا.

بەریتانیاو روسیا، بۆ بەربەستی مەترسی ئاڵمانی، لەسەر لابەلا کردنی کێشە کۆنەکانیان لەناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نزیکدا، پاش ۱۵ مانگ گفتوگۆی بەردەوام رێك کەوتن. لە۳۱ی ئابی ۱۹۰۷دا وەزیری کاروباری دەرەوەی روسی، ئەلیکساندەر ئیزولسکی و، سەفیری بەریتانی لەپیتەر بۆرك، سیر ئارتور نیکلسون، پەیمانێکی دو قۆڵییان بەست. لەم پەیمانەدا پێکهاتن لەسەر ئەوەی:

۱-تیبەت بەبێلایەنی بمێنێتەوە، هیچ لایەکیان دەستی تێ وەرنەدەن.

۲-هەلومەرجی هەبو( ستاتوس کۆو) لەئەفغانستان وەکو خۆی بمێنێ، واتە بەناوچەی نفوزی ئینگلیزی بمێنێتەوە.

۳-ئێران دابەش بکرێ بەناوچەی نفوزی ئینگلیزی و، روسی و، مەڵبەندێکی بێلایەن لەبەینی هەردو ناوچەدا.

بەگوێرەی ئەم پەیمانە ئەرزی ئێران ئەبو بە۳ بەش:

ناوچەی نفوزی روسی:

هەمو ئازەربایجان، خۆراسان، گورگان، مازندەران، گەیلان، ئەراك، قوم، ساوە، یەزد، نائین، ئەسفەهان، بروجەرد، تاران، قەزوین، زەنجان، هەمەدان، کرماشان، کوردستان، قەسری شیرین.

ناوچەی نفوزی ئینگلیزی

کرمان بیرجوند، سیستان، بلوچستان، کەنارەکانی تەنگەی هورمز، چاە بەهار، بەندەر عەباس.

مەڵبەندی بێلایەن:

قاینات، خوزستان، فارس، لوڕستان، چەهار مەحالی بەختیاری، بوشەهر[٢٤].

لە۱۹۱۱ەوە بەگوێرەی ئەم رێکەوتنە هێزەکانی روسی و بەریتانی چو بونە ناو ئێرانەوە. کەجەنگیش هەڵ گیرسا سوپاکانی روس و ئینگلیز بێ ئەوەی رێزی سەربەخۆیی و بێلایەنی ئێران بگرن، یا ئێران خۆی بەرەنگاری بکا، بەکردەوە داگیریان کرد.

شەڕ هێشتا لەهەمو مەیدانەکانی ئەوروپاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەگەرمی بەردەوام بو، چارەنوسی جەنگ دیار نەبو بە چ لایەکدا ئەکەوێ، کەدەوڵەتانی ئیمپریالیستی ئەوروپا لەناو خۆیاندا کەوت بونە گفتوگۆو سەودا بۆ ڕێك کەوتن لەسەر جۆری دابەش کردنی سەرزەمینی عوسمانیو ئێرانی. هەر لەسەردەمی جەنگدا بەنهێنی لەسەر جۆری دابەش کردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕێك کەوتن. ڕێوشوێنەکانی ئەم پێکهاتنە گشتیە بە٤ قۆناغی سەرەکیدا تێ پەڕی: ڕێکەوتنی ئەستەموڵ، ڕێکەوتنی لەندەن، ڕێکەوتنی سایکس- پیکۆ، ڕێکەوتنی سان جین دەمورین.

### ١/٤ڕێکەوتنی ئەستەموڵ

لەمانگەکانی مارتو نیسانی ١٩١٥دا چەند نامەیەك لەنێوان پیتەربورگو پاریسو لەندەندا ئاڵوگۆڕ کرا. لەئەنجامدا روسیا لەلایەکو بەریتانیاو فەرەنسە لەلاکەی تر گەیشتنە ڕێکەوتنی نهێنی ئەستەموڵ، بەپێی ئەم ڕێکەوتنە ئەبو[٢٥].

ئەستەمول، لێواری ڕۆژئاوای بوسفۆر، دەریای مەڕمەڕە، دەردەنیل بخرێنە سەر روسیا، هەروەها تراسی جنوبی تا خەتی ئینوس- میدیا، کەناری ئاسیای بچوك لەبەینی بۆسفۆڕو روباری ساخاریاو شوێنی لەسەر خەلیجی ئیسمید دوایی تر دیاری بکرێ، جزیرەکانی ناو دەریای مەڕمەڕەو جزیرەکانی ئیمبروسو تیندۆس.

لەبەرامبەر ئەوانەدا روسیاش دانی بەهەندێ لەخواستەکانی بەریتانیاو فەرەنسادا نا"

١-دەربارەی تورکیا

ا-ئەستەمول ببێتە مینایەکی ئازاد بۆ هاوپەیمانەکانو ئازادی کەشتیوانی لەبوغازەکانیدا دابین بکرێ.

ب-روسیا دان ئەنێ بەمافە ئایبەتیەکانی بەریتانیاو فەرەنسە لەتورکیای ئاسیاییدا لەڕێکەوتنێکی جیاوازا.

ج-شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلام لەتورکیا جیابکرێتەوە لەگەڵ عەرەبستان بخرێتە ژێر حوکمێکی ئیسلامی سەربەخۆ.

٢-دەربارەی ئێران

ا-روسیا مل ئەدا بۆ ئەوەی ناوچەی بێلایەن، وەکو لەڕێکەوتنی ئەنگلو- روسیدا دیاری کراوە، بخرێتە سەر ناوچەی نفوزی بەریتانی.

ب-ئەبێ ٣ گۆڕین لەو ڕێکەوتنەدا ڕەچاو بکرێ: یەکەم، ئەو شوێنانەی هاوسێی شارەکانی ئەسفەهانو یەزدن بخرێنە سەر ناوچەی روسی. دوەم، بەشێکی ڕۆژهەڵاتی دوری ناوچەی بێلایەن کەهاوسێی قەڵەمڕەوی ئەفغانیە بخرێتە سەر

ناوچەی روسی. سێیەم، روسیا ئازادی تەواوی کاری هەبێ لەناوچەی نفوزی خۆیدا (واتە ئازادی داگیرکردنی یەکجاری ئەو شوێنانەی هەبێ).

### ٢/٤ رێکەوتنی لەندەن

لەساڵی یەکەمی جەنگدا ئیتالیا دو دڵ بو لەبەشداری جەنگو لەوەی کەخۆی بەلای کام لایەنی جەنگدا ساخ بکاتەوە. هەوڵی ئەدا بزانێ لەکام لا دەسکەوتی زۆرتری پێ ئەبرێ. سەرەنجام هاوپەیمانەکان توانییان بیخەن بەلای خۆیاندا بەوەی لەدەسکەوتەکانی جەنگ بەشی بدەن.

لەنیسانی ١٩١٥دا لە لەندەن، بەریتانیاو فەرەنساو روسیا پەیمانێکیان لەگەڵ ئیتالیا بەست، هاوپەیمانەکان خواستە ئەرزیەکانی ئیتالیایان لەسەروی ئەفریقاو رۆژئاوای ئەنەدۆڵی سەر دەریای سپی ناوەڕاست سەلماند، بەرامبەر بەوەی ئیتالیا شان بەشانی ئەوان هاوبەشی جەنگ بێ. ئیتالیا لە٢٠ی ئابی ١٩١٥دا جەنگی دژی تورکیا راگەیاند.

### ٣/٤ رێکەوتنی سایکس- پیکۆ

لە١٩١٥دا بەریتانیاو فەرەنسە کەوتنە تەگبیر بۆ دابەش کردنی سەرزەمینی ئاسیایی تورکیا. لەلایەن بەریتانیاوە سیر مارك سایکسو لەلایەن فەرەنسەوە جۆرج پیکۆ بۆ سەوداو گفتوگۆ دانرا بون. پاش ئەوەی چەندین نامەیان لەگەڵ یەکتری گۆڕییەوە لەبەینی خۆیاندا رێك کەوتن. بۆ ئەوەی رەزامەندی روسیاش بەدەس بهێنن لەبەهاری ١٩١٦دا چون بۆ گفتوگۆ لەگەڵ سازانۆف وەزیری دەرەوەی روسیا. سازانۆفو پالیو لوگ، سەفیری فەرەنسی، لەنیسانی ١٩١٦ دا لەسەر خواستەکانی روسیا پێك هاتن.

بەجۆرە پێکهاتنی گشتی بەریتانیو فەرەنسیو روسی، لەسەر جۆری دابەش کردنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو بەشی هەریەکەیان، تەواو بو کەتێکڕا بریتی بون لە١١نامەو، لەمێژودا بەرێکەوتنی سایکس- پیکۆ ناسراوە.

بەپێی ئەم رێکەوتنە ئەبو:[٢٦]

١-ا. ئەم ناوچانە بخرێنە سەر روسیا" ئەرزڕوم، تەرابزون، وان، بتلیس، تا جێگایەك لەرۆژئاوای تەرابزون لەسەر دەریای رەش.

ب-ئەم ناوچانەش ببنە بەشی روسیا" ناوچەی کوردستان لەجنوبی وانو بتلیس لەنێوان موش، سیرت" ئاوەڕۆی دیجلە، جزیرەی ئیبن عومەر، ئەو زنجیرە چیایەی بەسەر ئامێدیدا ئەڕوانێ، تا ناوچەی مەرگەوەڕ.

٢-ئەم ناوچانەش ببنە بەشی فەرەنسا" ناوچەی کەنار دەریاکانی سوریا، ولایەتی ئەدەنە، ئەو سەرزەمینەی لەجنوبەوە بەخەتێك لەعەینتابو ماردینەوە تا

سنوری روسیاو لەشیمالەوە بەخەتێك لەئالاداخەوە بەناو قەیسەری، ئاك داخ، جیلو داخ، زازا بۆ ئیجن- خەرپوت دا تێ ئەپەڕێ.

٣-ئەم ناوچانەش ببنە بەشی بەریتانیا" ناوچەکانی خواروی میزۆپۆتامیاو بەغداد، هەروەها میناکانی حەیفاو عەککا لەفەلەستین.

٤-لەو شوێنانەدا کە ئەکەونە بەینی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی فەرەنسیو بەریتانی کۆنفیدراسیۆنی چەند دەوڵەتێکی عەرەبی یا دەوڵەتێکی عەرەبی تێدا دروست بکرێ. ئەویش دابەش بکرێ بەناوچەی نفوزی فەرەنسیو ناوچەی نفوزی بەریتانی.

بەم پێیە سوریاو ولایەتی موسل ئەبونە ناوچەی نفوزی فەرەنسیو ئەو سەرزەمینەش کە لەفەلەستینەوە درێژ ئەبێتەوە بۆ سنوری ئێران ئەبو بەناوچەی نفوزی بەریتانی.

٥-ئەسکەندەرونە ببێتە مینایەکی ئازاد.

٦-فەلەستین(تدویل) بکرێ.

دوایی تر لەنیسان- ئابی ١٩١٧دا ئەم ڕێکەوتنانە بەهەندێ دەسکاری کەمەوە لەلایەن بەریتانیاو فەرەنسەو ئیتالیاوە سەرلەنوێ لەسان جین دەمورین دوبارە کرانەوە.

## ٤/٤ ڕێکەوتنەکانو ئاواتەکانی گەلان

لەم ڕێکەوتنانەدا. بەڵێنە ئاشکراکانی کاربەدەستانی ئەم دەوڵەتانە بەگەلانی ناوچەکە بە تەواوی خرابونە پشت گوێو ئاواتە نەتەوەییەکانی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێ شێل کراون.

### ١/٤/٤ ئاواتەکانی عەرەب

هاوزەمان لەگەڵ گفتوگۆی ژێربەژێری دەوڵەتە ئەوروپییەکان بۆ پێکهاتن لەسەر جۆری دابەش کردنی ناوچەکە، مەکتەبی بەریتانی لەقاهیرە خەریکی ئاڵوگۆڕی نامە بو لەگەڵ شەریف حسێن بۆ ئەوەی شۆڕش دژی ئیمپراتۆریی عوسمانی بەهاوکاری بەریتانیا رابگەیەنێ لەبەرامبەر بەڵێنی سەلماندنی سەربەخۆیی ولاتانی عەرەبیدا.

حسێن لەشکرێکی چەکداری پێکەوەنا، شان بەشانی هێزەکانی حکومەتی بەریتانی مەسیحی دژی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئیسلامی ئەجەنگان بەو هیوایەی لەدوای جەنگ بەئامانجەکانی خۆیان بگەن.

لەم ڕێکەوتنانەدا ئەگەرچی باسی((کۆنفدراسیۆنی چەند دەوڵەتی عەرەبی یا دەوڵەتێکی عەرەبی))و باسی((جیاکردنەوەی شوێنە پیرۆزەکانی ئیسلامو

عەرەبستان لەتورکیاو دانانی لەژێر حوکمێکی ئیسلامی سەربەخۆدا))کراوە، بەڵام ئەوانە هەرگیز لەگەڵ ئەو بەڵێنانە نە ئەگونجان کە ماکماهون لەباتی حکومەتی بەریتانی دابوی بەشەریف حسێن و لەگەڵ ئامانجی نەتەوەیی عەرەب جوت نە ئەبون. سەرەڕای ئەمانەش بیلفور، وەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا، بەڵێنیدا بە((ڕێکخراوی جیهانیی سەهیۆنی))بۆ پشتیوانی کردنیان لەدروست کردنی نیشتمانی نەتەوەیی جولەکە لەفەلەستین، کەدوایی تر بو بەگەورەترین کێشەی گەلانی عەرەب.

## ٢/٤/٤ ئاواتەکانی ئەرمەن

هاوکاری ئەرمەن لەگەڵ روسیا دژی ئیمپراتۆری عوسمانی لەپێناوی سەربەخۆیی نەتەوەیی دا، هەمیشە یەکێ بوە لەبەهانەکانی تورك بۆ چەوساندنەوەی ئەرمەن و کوشتنی بەکۆمەڵیان. لەسەرەتای جەنگدا قەیسەری روس بەڵێنی ئازادی و سەربەخۆیی بەگەلی ئەرمەنیدا، بەرامبەر بەوەی ئەوان دژی تورك راپەڕن و هاوکاری روسیا بکەن. ئەرمەنیەکان تیپ و دەستەی چەکداریان دروست کرد لەریزی سوپای روسیدا دژی تورك ئەجەنگان بەو هیوایەی لەدوای جەنگ بەئامانجی نەتەوەیی خۆیان بگەن. کەچی لەو رێکەوتنانەدا ئامانجەکانی نەتەوەیی ئەرمەن بەتەواوی پشت گوێ خرا بو نیشتمانەکەی و ئەو شوێنانەی کوردستان کەئەوانی لێ ئەژیان خرا بونە سەر ئەرزی روسیا.

## ٣/٤/٤ ئاواتەکانی کورد

رێکەوتنی سایکس- پیکۆ لەلایەن چەند کەسێکەوە دارێژرا بو کەشارەزای کاروباری کوردستان و ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابوری سیاسی گەلی کورد بون. سێر مارك سایکس خۆی گەشتێکی درێژی بەکوردستاندا کرد بو. لەنزیکەوە دیدەنی خێڵەکانی کوردی کرد بو. چەند لێکۆڵینەوەی لەسەر نوسی بون. سازانۆف لەنزیکەوە شارەزای مەسەلەی کورد بو. گوێی لەکوردی وەکو عەبدولرەزاق بەگی بەدرخان گرت بو.

هەرچەندە هیچ کام لەدەوڵەتانی ئەوروپی نەچوبونە ژێر باری سەلماندنی ئامانجی نەتەوەیی کوردەوەو هیچ بەڵێنێکی تایبەتییان نەدا، بۆیە لەم رێکەوتنانەشدا ئاواتەکانی کورد بەتەواوی پشت گوێ خرا بون.

دەوڵەتانی ئەوروپی بەبایبونی ئیمپریالیستیەوە نەخشەی دابەش کردنی ناوچەکەیان کێشا بو. جگە لەدەسکەوتی تایبەتی خۆیان، گوێیان نەدابوە هیچ نرخێکی سیاسی، ئابوری، فەرهەنگی، نەتەوەیی، دینی و زمانیی گەلانی ناوچەکە

نیشتمانی نەتەوەیی عەرەبو کوردو ئازەریو ئەرمەنیان لەناو خۆیاندا دابەش کردبو.

کوردستان بەپێی ئەم ڕێکەوتنانە ئەبو بەشێکی گەورەی لەرۆژهەلاتی دیجلە بکەوێتە ژێر دەستی روسیاوە، وە بەشێکی لەرۆژئاوای دیجلە بکەوێتە ژێر دەستی فەرەنسەوە، بەشێکی بچوکی لای خوارویشی بکەوێتە ژێر دەستی بەریتانیاوە.

### ٥-دوا سالی جەنگ

#### ١/٥کاری دەرچونی روسیا لەجەنگ بۆ سەر چارەنوسی کورد

لەشوباتی ١٩١٧دا شۆڕش دژی قەیسەر لەروسیا هەلگیرسا. لەو کاتەدا سوپای روس لەرۆژهەلاتی کوردستان: ورمێ، سابلاخ، کرماشانو لەکوردستانی سەرو: ئەرزروم، ئەرزنجان، وان، بتلیسو لەکوردستانی خوارو: خانەقین، پێنجوین، رەواندزی لەژێردەستدا بو. لەگەلّ هێزی بەریتانی لەلای خانەقینەوە خەریکی یەکگرتنەوەو دانانی پلانی هاوبەش بون بۆ داگیرکردنی موسل. بەشێکی زۆری ئەو ناوچانەی، بەگوێرەی ڕێکەوتنە نهێنیەکان، ئەبو بکەوێتە ژێر دەسەلاتی خۆی یا ناوچەی نفوزی بێ، بەکردەوە داگیری کردبون.

روداوەکانی شوباتو مانگەکانی دوایی تر ریزەکانی سوپای شلەژان. لەئۆکتۆبەری ١٩١٧دا کە بولشەویك دەسەلاتی گرتە دەست سیاسەتی روسی بەرامبەر جەنگ لەبنەڕەتەوە گۆڕا.

((کۆنگرەی نوێنەرانی کرێکارانو سەربازانو جوتیارانی سەرانسەری روسیا)) لە٨ی تشرینی دوەمی ١٩١٧دا بڕیاریدا" هەمو ئەو ڕێکەوتنە نهێنییانەی روسیای قەیسەری لەگەلّ دەولەتانی ئیمپریالیستی بۆ دابەش کردنی دنیا کردویەتی دەسبەجێو بەبێ هیچ مەرجێکی پێشەکی هەلّ بوەشێنێتەوە. لەرۆژنامەکانی روسیادا دەستی کرد بەبلاوکردنەوەی تێکستەکانیو ئاشکرا کردنی بەندە نهێنییەکانی.

لەکۆتایی تشرینی دوەمدا ((ئەنجومەنی کۆمیسارەکانی گەل))داوای لەلایەنەکانی جەنگ کرد" بۆ راگرتنی جەنگو جێگیر کردنی ئاشتی لەناو گەلاندا لەگەلّ روسیای سۆڤیێتی گفتوگۆ بکەن.

حکومەتی سۆڤیێتی بانگەوازی بۆ گەلە موسلمانەکانی رۆژهەلات دەرکرد. داوای لەگەلانی فارسو تورکو عەرەبو هیند ئەکرد دژی ئیمپریالیزم راپەڕن. لەم بانگەوازەدا ناوی ژمارەیەکی زۆر لەمیللەتانی ناوچەکە هاتوە، بەلام ناوی کوردی تێدا نیە.

لە ٥ی کانونی یەکەمی ١٩١٧دا، واتە چل رۆژی دوای سەرکەوتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر، رژێمی نوێ بەیانێکی بەئیمزای لینین، سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمیسەرانی گەل، بۆ گەلانی ئیسلامی رۆژهەلات بلاوکردەوە، لەبەیانەکەدا نوسرا بو:

((هاورێیان! برایان!

لەروسیا گۆرانی گرنگ لەرودان و ئەنجام دان دایە، جەنگی خوێناوی ئێستا کە بەنیازی دەسدرێژی بۆ سەر ئەرزی بێگانەو دابەش کردنی خاکی میللەتانی تر دەستی پێ کرد، لەتەواو بون نزیك ئەبێتەوە. دنیایەکی تر پێی ناوەتە مەیدانی بونەوە. ئەو دنیایەش، دنیای رەنجدەران و گەلانی ئازادە. لەدوای ئەو شۆرشەوە کە لەروسیەدا قەوماوە، حکومەتێ دامەزراوە، کە بەویستی کرێکاران و جوتیاران لەدایك بوە.

ئەی موسلمانانی رۆژهەلات! ئەی ئێرانییان! ئەی تورکان! ئەی عەرەب ئەی هیندو! روی قسەی ئێمە لەئێوەیە: لەگەل ئێوە کەژیانتان، گیانتان، مالو ناموستان، چەند قەرنە لەژێر پێی تالانکەرانی ئەوروپایی دایەو، پێشێل کرا بو.

ئێمە بەرەسمی رای ئەگەیەنین، کەهەمو ئەو پەیمان و رێکەوتنە نهێنییانەی قەیسەری لێخراوی روسیە لەگەل ئینگلیزو فەرەنسە ئیمزای کرد بو، بەپێی ناوەرۆکی ئەوانە ئەبو ئەستەمول لەدوای برانەوەی جەنگ بەروسیا بدرێ و، حکومەتی لێخراوی((کیرنیسکی))یش ئەو پەیمانانەی سەلماند بو، هەمویان هەلوەشێنرانەوە، بە نەبو دائەنرێن و نرخێکیان نەماوە.

کۆمارە سوسیالیستەکانی روسیەو، حکومەتەکەی کەفەرمانەکانی جێبەجێ ئەکا، واتە ئەنجومەنی کۆمیسارەکانی گەل، هەردوکیان دژی داگیرکردنی ئەرزی ولاتانی ترن. ئێمە بەرەسمی رای ئەگەیەنین ئەستەمول هی تورك خۆیەتی و، ئەبێ وەکو رابوردو لەدەس موسلماناندا بمێنێتەوە.

ئێمە بەرەسمی رای ئەگەیەنین کەپەیماننامەو رێکەوتنە کۆنەکانی روسیاو بەریتانیا کەئێرانی لەنێوان دو ولاتی ئیمپریالیستی دا دابەش کردوە، بەهەلوەشاوە، وەکو نەبو دائەنرێت و نرخیان نەماوە.

ئەی ئێرانییان! بەلێنتان ئەدەینێ هەر بەکۆتایی کارە جەنگییەکان، سەربازەکانی ئێمە، خاکی ولاتەکەتان بەجێ ئەهێلن و، ئێوە خۆتان خەلکی ئێران مافی ئەوەتان هەبێ بەئازادی چارەنوسی داهاتوی خۆتان بریار بدەن)).

حکومەتی سۆڤیێتی دەستی کرد بەپێوەندی لەگەل حکومەتی تورك بۆ دانانی رێوشوێنەکانی راگرتنی جەنگ و کێشانەوەی هێزەکانی. نوێنەرانی روس و تورك

لەدوایی مانگی ١٩١٧ لەموسل ئاگربڕیان کرد. لە٣ی مارتی ١٩١٨دا نوێنەرانی روسی‌و تورکی لە((بریست- لیتوفسك)) رێکەوتنێکیان دەربارەی راگرتنی جەنگ ئیمزا کرد. بابەتە گرنگەکانی ئەم رێکەوتنە" کشانەوەی هێزەکانی روسیا لەناوچە داگیرکراوەکانی عوسمانی بۆ سنورەکانی پێش جەنگ ئیمزا کرد. هەڵوەشاندنەوەی تیپە چەکدارەکانی ئەرمەن، دیاری کردنەوەی سنوری روسی- عوسمانی وەکو سنوری پێش جەنگی ١٨٧٨، دەس هەلگرتن لەقەرزی روسی لەسەر تورکیا، ئازاد کردنی دیلەکانی جەنگ[٢٧].

حکومەتی سۆڤێتی رێکەوتنی روسی- بەریتانی ١٩٠٧ی دەربارەی دابەش کردنی ئێران هەڵوەشاندەوە. لەگەڵ حکومەتی ئێرانی دەستی کرد بەگفتوگۆ بۆ رێکخستنەوەی پێوەندییەکانی هەردولا. لە٢٦ی حوزەیران تا ٢٧ ی تەموزی ١٩١٨ دەستی هەڵ گرت لەهەمو ئەو ئیمتیازو قەرزو سەرمایانەی روسیای قەیسەری لەئێران هەی بو، وە دایەوە بەگەلی ئێران[٢٨] ئەمەش یارمەتییەکی گەورەی ئابوری بو بۆ دەرباری قاجاری نابوت‌و قەرزار.

ئاشکراکردنی رێکەوتنە نهێنەکانی هاوپەیمانەکان لەدنیادا دەنگی دایەوە، تەنانەت لەناو دەوڵەتە ئەوروپیەکانیش دا. جەمال پاشا، ، شەریف حسێنی لەرێکەوتنەکان ئاگادار کرد، وە ئەوەی بەهەل زانی بۆ ئەوەی حسێن لەنیازی بەریتانیاو بەڵێنە ناڕاستەکانی هۆشیار بکاتەوە، بەشکو واز لەهاوکاری ئینگلیز بهێنێ. کاربەدەستانی بەریتانی ویستیان وا لەحسێن بگەیەنن کەئەوە پیلانی کومۆنیستەکانە بۆ تێکدانی نێوانی عەرەب لەگەڵ ئینگلیز. لەهەمان کاتدا کاربەدەستانی هاوپەیمانەکان کەوتنە دوبارەکردنەوەی بەڵێنەکانی پێشویان کەهاوپەیمانەکان لەو شەڕەدا مەبەستیان رزگاڕی گەلانی ژێر دەستەی تورکە.

روسیای سۆڤێتی لەسەرەتادا توشی کێشەی شەڕی ناوخۆی بو، لەسەر ئاستی جیهانییش لەلایەن دەوڵەتە ئیمپریالیستەکانی دنیاوە گەمارۆ درا بۆ روخاندنی. مەسەلەی پارێزگاری رژێمی سۆڤێتی پلەی یەکەمی گرنگیی هەبو لەسیاسەتی ناوەکی‌و ناوچەیی‌و جیهانی دەوڵەتی سۆڤێتی‌و کاربەدەستەکانی‌دا. دەوڵەتی سۆڤێتی ئەگەرچی هانی گەلانی رۆژهەڵاتی ئەدا بۆ خەبات دژی ئیمپریالیزم، لەپێناوی سەربەخۆیی‌و مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆیاندا، بەڵام هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی سۆڤێتی لەبزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی گەلانی ناوچەکە کە ئەوان بەئاشکرا هانیان ئەدان‌و لەدەوڵەتانی ناوچەکە کەئەوان بەرەسمی پێوەندی باشیان لەگەڵ دائەمەزراندن، دەری ئەخەن ئەوە زۆرتر لایەنی پڕوپاگەندەی هەبوە، چونکە سۆڤێت لەسیاسەتی دەرەوەی‌دا دروست کردنی

پێوەنـدی باشـی بازرگـانی، ئـابوری، فەرهـەنگی، جـەنگیی لەگـەڵ دەوڵـەتانی ناوچەکە بێ گوێ دانە سروشتی سیاسی رژێمـەکانیو هەڵوێسـتی ئـەو رژێمانـە لەگەلەکانیان، بەتایبەتی لەگەڵ دەوڵـەتانی دراوسـێی لای خـوارووی‌دا، لەپلـەی یەکەمی گرنگی‌دا دانا بو، نـەك لەگـەڵ گـەلانی ناوچـەکە. وە لـەئازادی مـافی بڕیاردانی چارەنوس مەبەستی مافی دەوڵەتان بـو نـەك هـی گـەلان، بەتایبـەتی گەلانی بێ دەوڵەت. ئەگەر جاریّ پشـتیوانی لەخـەباتی شۆڕشـگێڕی نەتەوەیـەك کردبێ. ئەوە بۆ گوشار بردن بوە بۆ سەر دەوڵەتەکە کەناچار بێ پێوەنـدی باشـتری لەگەڵ دابمەزرێنێ. ئەوە بـوە نـەریتێکی نـەگۆڕاوی سیاسـەتی دەرەوەی سـۆڤیێتی لەقۆناغەکانی دوایی تریش‌دا.

لەئێران لەکاتێکا لەبەشی سەرەوەی‌دا جولآنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بەهێزی تێ‌دا بو، وە لەتاران حکومەتێکی کۆنەپەرستی لێ بو، حکومـەتی سـۆڤیێتی جولآنـەوە شۆڕشگێڕییەکەی پشت گوێ خستو کردی بەفاکتەری گوشار بۆ سەر حکومەتـە کۆنەپەرستەکە تا ناچار بێ پێوەندی باش لەگـەڵ یـەکێتی سـۆڤیێت دابمـەزرێنێ. لەتورکیاش جگە لەوەی دەستی لەئەرمەنو ئاسوری هەڵ گرت بۆ ئەوەی بە تەنیا روبەڕوی چارەنوسی نائومێدانەی خۆیان بـبن. هـەر بـۆ رازی کردنـی حکومـەتی تورکی هیچ پشتیوانییەکی لەخەباتی گەلی کورد نەکردو وەڵامی هیچ هـاوارێکی یارمەتی دانی کوردی نەدایەوە، بەڵکو لەتەقەلایـەکی گـەرم‌دا بـو بـۆ دروسـت کردنی باشترین پێوەندی لەگەڵ حکومـەتی تورکیـاو پاشـتریش حکومـەتی تـازە دروستکراوی عیراق.

حکومەتی سۆڤیێت زنجیرەیەك پەیمانی دەسدرێژی نەکردنو ئاسایشو بازرگـانی لەگەڵ ئێرانو تورکیاو ئەفغانستان ئیمزا کرد. لێرەدا جێـی خۆیـەتی یـەکێکیان وەکو نمونە بۆ ئەوانی تر باس بکرێ.

لە٢٦ ی شوباتی ١٩٢١دا((پەیمانی دۆسـتایەتی ئێـرانو روس)) ئیمـزا کـرا. بەگوێرەی ئەم پەیمانە جگە لـەوەی حکومـەتی سـۆڤیێتی((هـەموو ئـەو پـەیمانو رێککـەوتنو بەڵێننامانـەی کەحکومـەتی روسـیای قەیسـەری لەگـەڵ ئێـران بەسـتویەتیو، مـافی میللـەتی تـێ‌دا فـەوتاوە، هـەڵ ئەوەشـێنێتەوەو بەنـەبو دائەنێ))و((هەمو ئەو رێکەوتنو پەیمانانەی حکومەتی پێشـوی روسـی لەگـەڵ دەوڵەتانی سـێیەم بـەزەرەری ئێـران بەسـتویەتی هـەڵ ئەوەشـێنێتەوەو بـە نـەبو دائـەنێ)) ئێرانـی لەهـەموو قـەرزەکانی زەمـانی قەیسـەر بەخشـیو، هـەمو سـەرمایەی لەگوێزانـەوە هـاتوو و لەگوێزانـەوە نـەهاتوی((بـانکی ئستقراضـی ئێران))و دراوی نەختینە، شتومەکی هێڵا، جادە، رێگای ئاسنین، سەکۆو عـەمارو

کەشتیو هۆکانی گوێزانەوە لەگۆمی ورمێو بەندەری ئەنزەلی، هێڵی تەلەفونو تەلەگراف، خانو و تەلارەکان، کارگای کارەبا، کە موڵکی حکومەتی روسیو کۆمپانیو هاوولاتیەکانی بون بەخۆڕاییدا بەحکومەتی ئێران.

مادەی چوارەمی ئەم پەیمانە ئەڵێ: ((هەردو پەیمانکاری بەرز گفت ئەدەن کە:

١-لەخاکی خۆیاندا رێ نەدەن بەپێکهێنان یا جێ کردنەوەی هیچ رێکخستنو تاقمێ بەهەر ناوێکەوە بێ یا کەسانێ تەنیا کەئامانجیان خەبات بێ دژی ئێرانو روسیا یا دژی ولاتانی هاوپەیمانی روسیا، هەروەها بەوەرگرتنیکەسانی لەشکر یاگوێزانەوەی کەلوپەلی نەفەرات بۆ ریزەکانی لەشکر یا هێزە چەکدارەکانی رێکخستنی گۆڕین.

٢-نابێ رێ بدرێ بەهیچ رێکخستنێ، بەهەرچی ناوێکەوە بێ ئەگەر بیەوێ دژی پەیمانکاری بەرز خەبات بکا، ئەو شتانەی ئەگونجێ دژی پەیمانکارەکەی تر بەکار بهێنرێ ببرێتە خاکی هیچ کام لەم دولا پەیمانکارە بەرزەوە یا لەوێوە بگوێزرێتەوە.

٣-بەهەمو هۆیەکی کە لەبەردەسدا بێ رێ لەمانەوەی سوپا یا هێزی چەکداری دەوڵەتی سێیەم لەخاکی خۆیو هاوپەیمانەکانیدا بگرێ ئەگەر لەوانە بێ مانەوەی هێزی ناوبراو ببێتەمایەی هەڕەشە لەسنور یا بەرژەوەندی یا ئاسایشی پەیمانکارە بەرزەکەی تر)).

مادەی شەشەم ئەڵێ((هەردو پەیمانکاری بەرز پێکهاتن هەر کاتێ دەوڵەتانی سێیەم بیانەوێ لەرێیی خۆتی هەڵقورتاندنی چەکدارەوە سیاسەتێکی داگیرکەرانە لەئێران بگرن یا خاکی ئێران بکەن بەمەڵبەندی پەلاماردانی چەکداری روسیاو ئەگەر مەترسی هەڕەشە لەسنوری دەوڵەتی سۆڤێتی یا هاوپەیمانەکانی بکاو حکومەتی ئێران دوایی راگەیاندنی لەلایەن روسیاوە نەی توانی خۆی لەم مەترسییە دور بخاتەوە، حکومەتی سۆڤێتی مافی هەیە سوپای خۆی بباتە ناو خاکی ئێرانەوە تا بۆ پاراستنی خۆی رێوشوێنی سوپایی پێویست دابنێ. حکومەتی روسیای سۆڤێتی بەڵێن ئەدا پاش نەمانی مەترسیەکە سوپاکەی بەبێ دواکەوتن لەسنوری ئێران بباتە دەرەوە))

یارمەتی نەدانی دوژمنانی ناوەوەو دەرەوەی یەکتری، واتە بۆچونی ستراتیجی سیاسیو جەنگی بەسەر گیانی پەیمانەکاندا زاڵ بون.

-حکومەتی سۆڤێتی لەناکۆکی بزوتنەوەی کەمالی لەگەڵ دەوڵەتانی ئەوروپیو لەململانێدا لەگەڵ بابیعالی پشتگیرییەکی کاریگەری مستەفا کەمالی بەچەکو پارە کرد. پێوەندی بازرگانی، سیاسی، دیپلۆماسی، جەنگی لەگەڵ

دامــەزران‌و چــەند ڕێکــەوتنی گرنگــی لەگــەڵ ئیمــزا کــرد، لەوانــە((پــەیمانی دۆستایەتی‌و هاوکاری ڕوسی- تورکی)) مارتی ١٩٢١.

ئەگەر ئەم ڕێکەوتنانە لەباری سەرنجی سۆڤیێتیەوە قازانجی بۆ گــەلانی ئــەم دو دەوڵەتە هەبو بێ، ئــەوا قــازانجی زۆرتــری بــەم دو حکومەتــە گەیانــد کــەخۆیان جێگیرو بەهێزتر بکەن لەکاتێکا شەپۆلی نارەزایی گەلانی ناوچەکە لەهەڵچــوندا بو. سیاسەتی سۆڤیێتیش هەر ئەوە بو کەدراوسێکانی لای خواروی ئێران‌و تورکیاو ئەفغانستان بەیەکگرتویی بمێنن‌و حکومەتەکانیان بەهێز بــن بــۆ ئــەوەی خۆیــان لەبەر گوشاری دەوڵەتانی دوژمنی ڕوس‌دا ڕابگرن‌و، نەکەونــە ژێردەســت یــا ژێــر نفوزی ئەوانەوەو لەوێوە مەترسی بۆ سەر یەکێتی سۆڤیێت دروست بکەن.

نوسەرە پێشکەوتنخوازەکانی کــورد بەستایشــێکی زۆرەوە هەمیشــە لــەکاری ئیجابی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بۆ سەر بزوتنەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد دواون[٢٩] ئــەم بۆچونانە زۆرتر لەژێر کار تێ کردنی ئایدیۆلۆجی سیاســی‌دا دروســت بــون نــەك لەئەنجامی هەڵسەنگاندنی بابەتیی ڕوداوەکانی مێژوی ئــەو ســەردەمەدا. ئــەگینا دیارە کەسەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر کــاری ســەلبی کردۆتــە ســەر پاشــەڕۆژی سیاسی نەتەوەی کورد. لەئەنجامی ڕوخانی ڕژێمی قەیسەری‌و هاتنی بولشــەویك‌دا هەردو دوژمنی دێرینەی گەلی کورد" دەوڵەتی ئێران‌و دەوڵەتی تورکیا لــەڕوخان‌و هەڵوەشان‌و پارچەپارچە بون ڕزگار بون. کوردستان بەشێکی لەژێر دەستی ئێران‌و بەشەکەی تریشی لەژێردەستی تورکیاو عیراق‌و ســوریادا لەحاڵــەتێکی سیاســی‌و قانونی(نامەعلوم))دا مایەوە. کــە نــەئازادو، نەفیــدراڵی‌و، نــە ئۆتۆنــۆم بــو، وە نەبەشــــداربو لەحکومــــەتانی ئــــەو دەڵەتانــــەدا، وە نەمانــــداتی ئــــەوان‌و نەموستەعمەرەشیان بو. لەکاتێکا ئەگەر نەخشەکانی ڕژێمی قەیسەری جێبــەجێ ببوایە: یەکەم، دەوڵەتەکانی ئێران‌و تورکیا یا ئەتەکان یا ئەبون بــەدو دەوڵــەتی بچوك لەناوچەکەدا و، دوەم: کوردستان لەخراپترین حاڵەتدا، حاڵــەتی مــەعلومی موســــتەعمەرەی ڕوســــی‌و فەرەنســــی‌و ئینگلیــــزی وەرئــــەگرت، کــــەهیچ نــــەبێ ئیمپریالیزمێکی پێشکەوتوتر بون لەچاو دەوڵەتانی داگیرکەری دواکەتوی ئێــران‌و تورکیاو عیراق‌دا، ئەوسا هەلی سەرکەوتنی جولانەوەکەی لەپێناوی سەربەخۆیی‌دا، وەکو هەمو شوێنەکانی تری دنیای ژێر دەستی ئیمپریالیزم زۆرتر ئەبو.

### ٢/٥ هێزی بەریتانی لەکوردستان

لەسەرەتای جەنگەوە سوپای بەریتانی مینای فــاوی گــرت بــو، پــاش ئــەویش بەچەند ڕۆژێ بەســرە. ماوەیــەکی درێــژ چــەند تێکهەڵچــونی خوێنــاوی لــەنێوان

بەریتانیاو تورکدا روی دا تا ئینگلیز توانی لەمارتی ۱۹۱۷دا شاری بەغداد داگیر بکا.

دوای کشانەوەی روس لەمەیدانەکانی جەنگ هێزەکانی بەریتانیا بەتەنیا لەمەیدانەکانی رۆژهەلاتی ناوەراستدا مابونەوە دژی تورك ئەجەنگان. بەریتانیا بەپێی هەلومەرجی نوێی ناوچەکە، کە لەئەنجامی دەرچونی روسیا لەجەنگو گۆرانی بنەرەتیی رژێمەکەی دا هات بوە کایەوە، ئەبو چاو بەپلانەکانی خۆیدا بخشێنێتەوە. ئەگەر پێشتر لەپەیمانی سایکس- پیکۆدا چاوی لەهەندێ شوێن پۆشی بو بکەوێتە ژێر دەسەلاتی فەرەنسیەوە بۆ ئەوەی ببێتە ناوچەی لەمپەری بەینی دەسەلاتی روسیو دەسەلاتی بەریتانی، ئیتر ئەو خۆلادانە هیچ بەهانەیەکی نەما بو، بەتایبەتی پسپۆرەکانی ئینگلیز دلنیا بو بون لەدەولەمەندیی پەترۆلجارەکانی کەرکوکو ئەیان ویست بەهەر نرخێ بێ بکەوێتە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە.

بەریتانیەکان هەولیان ئەدا بۆ راکێشانی عەرەبو کورد. لەئەی تەموزەوە دەستیان کرد بەبلاوکردنەوەی رۆژنامەی عەرەبی زمانی ((العرب))لەبەغداو لە۱ی کانونی دوەمی ۱۹۱۸ەوە کەوتنە بلاوکردنەوەی رۆژنامەی کوردی زمانی((تێگەیشتنی راستی))لەبەغدا. ((تێگەیشتنی راستی))و((العرب))هەردوکیان تەرخان کرا بون بۆ پرۆپاگەندە دژی تورکو ئالمانیا و دوایی تر بولشەویکیش، وە بۆ هان دانی پیاوە ناسراوەکانی کوردو عەرەبو خێلەکانی دانیشتوی ناوچەکە بۆ راپەرین دژی دەسەلاتی تورك. قاتوقریو برسێتیو مردنی بەکۆمەلی خەلك، زولم و زۆری هێزەکانی تورك، زەمینەیەکی لەباری ئامادە کردبو بۆ پرۆپاگەندەی ئەم رۆژنامانە کە لەسایەی هاتنی هێزی بەریتانیەوە خێرو خۆشی بکەوێتە ناوچەکەوە. بەمەش ئەیان ویست زەمینەی سیاسی پێشرەویی جەنگیی بۆ داگیرکردنی کوردستانی جنوبیو موسل خۆش بکەن. لەهەمان کاتدا کەوتنە پێوەندی لەگەل پیاوە ناسراوەکانی کوردو چەندین ئەفسەری ئینگلیزی شارەزای کاروباری کوردستانیان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کرد.

لە۲۸ی نیسانی ۱۹۱۸دا سوپای بەریتانی کفریو رۆژی دوایی تر توزخورماتوی داگیرکرد. بەمجۆرە بەرایی هێزەکانی بەریتانیا گەیشتنە سەرزەمینی کوردو درێژەیاندا بەهەلکشان بەرەو ژور. لە۷ی مایسی ۱۹۱۸دا کەرکوکیان گرت. بەلام زۆری لێ بەند نەبونو کشانەوە. عەلی ئیحسان پاشای سەرکردەی ئۆردوی شەشەمی عوسمانی، کاروباری سلێمانی سپارد بو بەشێخ

مـەحمودی حەفیـد کەئەوسـا ناسـراوترین سـەرکردەی کـورد بـو لەکوردسـتانی جنوبیدا. ئینگلیزەکان هێشتا لەکفری بون شێخ مـەحمود بـۆ جـاری دوەم نامـەو نوێنەری ناردە لایان. داوای لێ کردن" بەریتانیا کوردستانی جنوبی لەریزی گەلانی ئازاد دەرنەهێنێ. شێخ مەحمود راگەیاندنی ١٤ نوقتـەیی سـەرۆکی ئـەمریکایی ویلسۆن و بەڵێنەکانی سـەروەزیرانی بـەریتانی لوید جـۆرجی بیسـت بـو. دەس پێشـکەری شـێخ مـەحمود لەچـاو قۆناغـەکانی جـەنگدا درەنـگ بـو، چـونکە نیشانەکانی تێشکانو هەرەسی تورك دەرکەوت بو[٣٠].

لەپێش راگرتنی جەنگدا هێزی بەریتانی لەموسل نزیك کـەوت بـوەوە. پـاش ئاگربڕ سوپای بەریتانی هێزەکانی تورکی لەموسڵ ناچار کرد بـەجێی بهـێڵن بـۆ هێزی بەریتانی. کوردستانی جنوبی کەبەشێکی لەسەر ولایەتی موسلو بەشێکی لەسەر ولایەتی بەغداد بو، بەتەواوی کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەوە.

### ٣/٥ زەرەرەکانی کورد بەهۆی شەڕەوە

بونی کوردستان بەمەیدانی جەنگ، لەشکرکێشی تورك، ئینجا لەشکرکێشـی روسیو تەراتێنی تیپە چەکدارەکانی ئەرمەنو، پاشـان لەشکرکێشـی بـەریتانی، شەڕو پێکادانی سەختی ئەم هێزانە لەگەڵ یەکتری، بەرەنگاری پچڕ پچڕی کورد... زەرەری گیانیی گەورەیان بەدانیشتوانی کوردستان گەیاند.[٣١] هێزەکـانی داگیرکـەر دەستیان لەکەس نە ئەپاراست. ئۆردوی تورك لـەکاتی پـەلاماردانی کوردسـتانی ئێراندا سەرباری ئەوەی ولاتەکەی تالان و وێران کرد هەزاران کەسی بێ تاوانیشی کوشت. لەشکری روسو تیپەکانی قازاخو ئەرمـەنو ئاسـوری کوشـتاری زۆریـان لەخەڵکی ناوچەکانی ئەرزڕوم، ئەرزنجان، بتلیس، وان ئالاشکر. بایەزیـد، ورمـێ، سابلاخ، خانەقین، رەواندز کردو ئاواییەکانیان وێران کردن.

کاربەدەسـتانی تـورك تـەعلیماتێکی نهێنییـان دەربـارەی راگـوێزانی کـورد لەکوردستان دابو بەلێپرساوەکانی خۆیان، لەو تەعلیماتەدا هـات بـو: ((ئـەبێ دانیشتوانی ئەو ناوچـانەی کوردیـان بەچـڕی لێیـە رابگـوێزرێنو لەشـوێنەکانی خۆیان دوربخرێنەوەو ناچار بکرێن لەو ناوچانەدا دابنیشن کە بەچڕی تـورکی لێیـە بەو مەرجەی نیسبەتیان لە ٥٪ی تێکڕای دانیشتوانی تورکی ئەسڵی ناوچەکە تـێ نەپـەڕێ. سـەرۆکو پێشـەواو شـێخەکانی کـورد ئـەبێ لەکۆمـەڵو لایـەنگرو هۆزەکانیان دوربخرێنەوەو ناچار بکرێن بەجیاو دور لەیەکتری لەناوچە تورك نشینە دورەکاندا دابنیشن، نابێ بهێڵرێ منالو لاوەکانیان لەگەڵ بێو تێکەلاوی یـەکتری بنو ئەبێ هەمو جۆرە پێوەندیو تێکەلاوییەکەیان لەناوا نەهێلرێ، ئـەبێ زۆریـان

لێ بکرێ هەر بەتورکی بدوێن‌و واز لەنەریت‌و خوورەوشتەکانی خۆیان بهێنن، ئەبێ بەزۆر بەکۆمەڵ بکرێن بەتورك))[٣٢]

لەئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتەدا، لەسەرەتای جەنگەوە تا کۆتایی، ئۆدروی تورك بەبیانوی ئەوەی ئەو ناوچانە بونەتە مەیدانی شەڕ ٧٠٠هەزار کوردیان بەزۆر بۆ ناوەوەی ئەنەدۆڵ راگوێزا. ئەمانە بەپێ‌و لەزستان دا بەرێ کران، لەبەرئەوە لەرێگا لەبەر بەفرو سەرما، برسێتی، نەخۆشی‌و ماندوبون بەشێکی گەورەیان مردن‌و نەگەیشتنە جێ[٣٣].

کەم بونەوەی دەستی کار بەهۆی بردنیانەوە بۆ مەیدانی جەنگ، زەوت کردنی هۆکانی بەرهەم هێنان، بەتایبەتی ولاخ، بۆ گوێزانەوەی پێویستیەکانی ئۆردوی تورك، دەس بەسەرا گرتنی خواردەمەنی‌و زەخیرەو بنەتۆوی خەڵك‌و جوتیاران، بڕینی لێرەوارو سوتاندنی کێڵگەکان‌و تالاَن کردن‌و خواردنی مێگەلەکان.. تەنگوچەڵەمەیەکی قوڵی لەکوردستاندا خوڵقاند کە بوو بەهۆی قاتوقڕی، برسێتی، داکەوتنی نەخۆشی‌و مردنی بەکۆمەڵی دانیشتوان.

سەرەڕای ئەمانەش، بەشی گەورەی هێزی مرۆیی کورد لەریزی ئۆردوەکانی توركدا سازدرا بون. جگە لەپاشماوەی ئالا حەمیدیەکان کە لەسەرەتای جەنگدا ٤ فیرقەو ١ لیوا(بەگشتی ١٣٥ بلوك)بون، ژمارەیەکی زۆری سەربازەکانی ئۆردوی ٦(بەغداد) ئۆردوی ٩(ئەرزڕوم)، ئۆردوی ١٠(سیواس)، ئۆردوی١١(مەعمورە تولعەزیز)، ئۆردوی ١٢(موسل)کورد بون‌و بەشی هەرە زۆریان لەشەڕدا فەوتان. جگە لەم ئۆردوانە لەهەمو هێزەکانی عوسمانیدا لەهەمو جەبهەکاندا کورد وەکو سەربازو ئەفسەر بەشدار بون. محەمەد ئەمین زەکی کەخۆی ئەفسەرێکی عوسمانی ئاگادار بو. ژمارەی ئەو سەربازە کوردانەی لەشەڕا فەوتاون بە٣٠٠هەزارو لەگەڵ دانیشتوانی نە سوپاییدا بە٥٠٠ هەزار کەس دائەنێ[٣٤]. عەبدولعەزیز یاملکی، ئەفسەرێکی کوردی تری عوسمانی ئاگادار بە٧٠٠ هەزار کەسی دائەنێ[٣٥].

کورد نەدەستی هەبو لەهەڵگیرساندنی جەنگدا وە نە دەسکەوتی هەبو، بەلاَم یەکێ بو لەگەورەترین زەرەرمەندەکانی ، بەماڵی وێران‌و کوڕی کوژراوەوە لەجەنگ هاتە دەرێ، سەرباری ئەمانەش توشی کوێرەوەرییەکی سیاسی لەبڕانەوە نەهاتو بو.

رەنگە هۆی گەورەی بەدبەختی کورد ئەوەبێ کەشوێنێکی خراپی بۆ ژیانی خۆی لەسەر ئەرز هەڵ بژاردوە، ناوچەی رۆژهەلاَتی ناوەڕاست بەدرێژایی مێژو گرنگیەکی جیهانیی هەبوە چونکە ٣ قارە گەورەکەی دنیا" ئەورووپاو ئاسیاو ئەفریقا پێکەوە ئەبەستێ و رێگەی بازرگانی‌و لەشکر کێشی مێژوی ئەرزی‌و

ئاوی، لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاواو بەپێچەوانەوە، بەم ناوچەیەدا تێ پەڕیوە، کەکورد لەناو جەرگەیدا دانیشتوە.

جگە لەکورد بەدرێژایی مێژو چەند نەتەوەی لەخۆی بەهێزترو پێشکەوتوتری تێدا ژیاوە. لەلای رۆژهەڵاتیەوە دراوسێی ئەرمەنیو ئازەریو فارس بوە، لەلای خوارویو بەشێکی رۆژئاوایەوە دراوسێی عەرەب بوە، لەلای سەرویو بەشی سەروی خۆرئاوایەوە دراوسێی بیزەنتیەکانو دوای ئەوان دراوسێی تورك بوە. کوردستان بەدرێژایی مێژو لە٣ ناوەندی بەهێزەوە لەژێر گوشارێکی توندا بوە، ناوەندی رۆژهەڵاتی- فارسی، ناوەندی رۆژئاوای- بیزەنتیو دوایی تورك، ناوەندی خوارویـ عەرەبی.

بەدبەختی کورد لەگرنگی هەڵکەوتی جوگرافی شوێنی ژیانیدا دەرئەکەوێ. هەمو تێکهەڵچونە مێژوییە گرنگەکانی چارەنوسی ناوچەکەیان بڕیار داوە لەسەر ئەرزی ئەو روی داوە.

تێکهەڵچونی داریوشی هەخامەنشیو ئەسکەندەری یۆنانی لەگوگامیلی نزیك هەولێر(٣٣١-پ.ز)کەکۆتایی بەدەسەڵاتی ئێرانی هێناو سەرەتای دەسەڵاتی چەند سەدەیی یۆنانی بو لەناوچەکەدا.

تێکەڵچونی لەشکری عەرەبی- ئیسلامیو لەشکری ساسانیەکان لەجەلـەولاو حەلەوانی نزیك خانەقین(٦٤١)کە کۆتایی بەدەسەڵاتی ئێرانی هێناو سەرەتای دەسەڵاتی چەند سەدەیی عەرەبی بو لەناوچەکەدا.

تێکهەڵچونی لەشکری عەبباسیو لەشکری ئەمەوی لەسەر ئاوی زێی گەورە(٧٥٠)کەکۆتایی بەدەسەڵاتی ئەمەوی هێناو سەرەتای دەسەڵاتی چەند سەدەی عەبباسی بو.

تێکهەڵچونەکانی مەغۆل لەشوێنە جیاجیاکانی کوردستان کەکۆتایی بەدەسەڵاتی عەبباسی هێناو سەرەتای کوێربونەوەی شارستانیێتی ناوچەکە بو.

تێکهەڵچونی شا ئیسماعیل سەفەویو سوڵتان سەلیمی عوسمانی لەچاڵدێران نزیك بایەزید (١٥١٤)کەناوچەکەی تا جەنگی جیهانی یەکەم کردە دوبەش.

هەروەها چەندین پێکادانی گەورەی خوێناوی لەنێوان هێزەکانی بێگانەدا لەناو کوردستاندا، وە لەنێوان هێزەکانی بێگانەو خەڵکی کوردستاندا.

هەریەکێ لەم تێکهەڵچونە گەورانە ئەبێ چ زەرەرێکی گیانیو مادی بەکورد گەیاندبێ، بێ ئەوەی دەستی لەهەڵگیرساندنی یا لەکوژاندنەوەی دا هەبوبێ؟ جەنگی جیهایی یەکەمیش هەر بەو جۆرە بەشێکی گرنگی ململانێی هێزەکانی لەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، تێکهەڵچونەکانی لەسەر ئەرزی کوردستان

قەوماون. جەبهەی قافقاسی شەڕی روسی- تورکی هەر بەناو قافقاز بو ئەگینا ئەگەر مەیدانی تێکهەڵچونەکانو قوربانییەکانی شەڕەکە رەچاو بکرایە ئەبو ناوی جەبهەی کوردستان بێ.

ئەگەر لەسەردەمەکانی پێشودا گرنگی ستراتیجی- جەنگیو، ئابوری- بازرگانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هۆی بزواندنی هێزەکانی بێگانە بو بێ بۆ پەلاماردانی، ئەوا لەکۆتایی سەدەی ١٩هەمو سەرەتای سەدەی ٢٠هەمدا هۆیەکی تر پەیدا بو کەزاڵ بو بەسەر هەمو ئەوانی ترا، ئەویش پەترۆڵ بو.

پەترۆڵ لەزۆر کۆنەوە گەلان ئەیان ناسی، بەڵام رەنگە هیچ گەلی وەکو ئینگلیز پەی بەگرنگی ئەم مادەیە نەبرد بێ. لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە بەریتانیا دەستی کرد بەگۆڕینی وزەی بەگەڕخستنی پاپۆڕەکانی لە خەڵوزی بەردینەوە بۆ نەوت. شارەزاکان لەجنوبی ئێرانو کرماشانو خانەقینو کەرکوك زۆر شوێنیان دیاری کرد بو کەئەبێ نەوتی تێدا بێ. کاتێ جەنگ هەڵگیرسا نەوت سەرچاوەی سەرەکی بەگەڕخستنی ئوستولی جەنگیی بەریتانی بو. هەر لەبەر ئەوەش هێزەکانی بەریتانیا بەپەلە بیرە نەوتەکانی خواروی ئێرانیان داگیر کرد.

نەوت دەورێکی ئەوەندە گرنگی هەبو لەبڕیاردانی چارەنوسی جەنگدا لۆرد کیرزن لەو بارەیەوە وتویەتی: ((رۆژێ دێ ئەڵێن هاوپەیمانەکان بەسەر دەریای نەوتدا بۆ سەرکەوتن چون))هەروەها هینری بیرانجەی نوێنەری فەرەنسە لەو کۆبونەوە تایبەتیەدا کەبۆ باسی نەوت لە١٩١٨دا لەرۆما کرا بو وتی: ((نەوت لەو جەنگە دا وەکو خوێن وابو بۆی، ئەو سەرکەوتنەمان بەدەس نە ئەهێنا ئەگەر خوێنێکی تریش نەبوایە، واتە خوێنی ئەرز کەپێی ئەڵێن نەوت))[٣٦].

جا ئەگەر نەوت لەبردنەوە یا دۆڕاندنی جەنگی جیهانیی یەکەمدا ئەو دەورەی هەبو بێ، ئەوا لەماوەی کۆتایی جەنگو پاش جەنگدا بو بەفاکتەرێکی بڕیاردەر لەچارەنوسی سیاسی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. لەباتی ئەوەی ئەم مادە بەنرخە ببێتە مایەی خێروخۆشی گەلان، بو بە بەڵای سەریان، بەتایبەتی بوو بەلەعنەتێکی مێژویی بەچارەنوسی کوردەوە، چونکە گەورەترین پەترۆڵجاڕی ناوچەکە لەکوردستان دۆزرایەوە. راپۆرتێکی سەرکردایەتی هاوبەشی هێزەکانی بەریتانیا لەئێرانو عیراق دان بەم راستیەدا ئەنێ: ((ئەوی نەختێ زیرەکی تێدا بێ ناشێ بڵێ بەریتانیا لەبەر خاتری خەڵکی تر لێپرسراوەتی لەعیراق گرتۆتە ئەستۆ، وەختی خۆی وتراوە کەبەریتانیا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرژەوەندی هەمیشەییو سەرەکی هەیە، بگرە ئامانجێکی سەرەکی هەیە کە لەجەنگی ١٩١٤-١٩١٨دا گیانێکی زۆری لەپێناودا کردۆتە قوربانی. ئەو سەرەتایەش

بریتیە لەوەی رێگە بەهیچ دەوڵەتێکی دوژمن نادرێ هەرەشە لەرێگەی پێوەندی ئیمپراتۆری بکا. هەروەها بەریتانیا قازانجی ئابوری زۆر گەورەی هەیە لەوێ، کەگرنگ ترینیان پەترۆڵجارەکانی کەرکوکە..))[٣٧].

### ٤/٥ راگرتنی جەنگ

پاش چەند رۆژ دانوستان لەنێوان نوێنەرانی تورک‌و بەریتانیدا، لەرۆژی ٣١ی تشرینی یەکەمی ١٩١٨دا لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە ئەدمیرال کارلسوربو لەلایەن حکومەتی تورکەوە حسێن رووف بەگ، رەشاد حکمەت بەگ، سەعدوڵلا بەگ بەڵگەنامەی ئاگربڕیان لەناو کەشتی ئینگلیزیدا ئاگامەمنون لەمینای مودروس لەدەریای ئیجەدا ئیمزا کرد. بەپێی ئەم رێکەوتنە جەنگ لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرەسمی راگیرا.

رۆژی ئیمزا کردنی بەڵگەی ئاگربڕ ئەنوەر پاشاو تەلعەت پاشاو سەرکردەکانی تری تورکانی لاو هەڵاتن بۆ ئاڵمانیا. حکومەتێکی نوێ، بەڵگەنامەکەی پەسەند کرد. بەڵگەنامەی راگرتنی جەنگ زیاتر لەوەی رێکەوتنێکی دولایەنی بەرامبەر بێ، مل دانی عوسمانی بو بۆ مەرجەکانی هاوپەیمانەکان، بەتایبەتی بەریتانیای سەرکەوتو، وەجۆرێ بو لەخۆبەدەستەوەدانی کەساسانە. ناوەڕۆکی ئاگربڕی مودروس بریتی بو لە:[٣٨]

-بەدەستەوەدانی دەردەنیل، بوسفۆر، هەمو سەربازگەکانی حیجاز، عەسیر، یەمەن، سوریا، میزۆپۆتامیا، هەروەها کەشتیە جەنگیەکانی تورکیا، ئەفسەرانی تورك لەتەرابلوس، کشانەوەی هێزەکانی تورکیا لەشیمالی غەربی ئێران بۆ سنوری پێش جەنگ، چۆڵ کردنی ناوچەکانی ئەودیو قافقاز، بەجێ هێشتنی سیلیسیا.

-هەبونی مافی داگیرکردنی هەر شوێنێکی ستراتیجی کەهاوپەیمانەکان بەپێویستی بزانن بۆ دابین کردنی ئاسایشی خۆیان‌و داگیرکردنی ٦ ولایەتە ئەرمەنیەکەی رۆژهەڵاتی تورکیا ئەگەر پشێوییان تێ کەوت.

-بڵاوە پێکردنی هێزەکانی سوپای تورکی جگەلەوەی بۆ پاراستنی سنورو ئاسایشی ناوخۆ پێویستن.

-پاکردنەوەی مەیدانەکانی مینی زەمینی‌و دەریایی‌و ئازادی بەکارهێنانی میناکانی تورکیا بۆ کەشتیگەلی هاوپەیمانەکان.

-کۆنترۆلی تەلگراف، رێگای ئاسنین، تونێلی تۆرۆس‌و چاودێری وەزارەتی تەموین.

-بەردانی بێ مەرجی هەمو دیل‌و گیراوەکانی هاوپەیمانەکان‌و ئەرمەنیەکان.

-بڕینی پێوەندی لەگەڵ ئاڵمانیاو نەمسەو دەرکردنی هەمو هاوڵاتییانی مەدەنی و عەسکەرییان لەخاکی عوسمانی.

سەپاندنی مەرجەکانی هاوپەیمانەکان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا ناڕاستەوخۆ بەگشتی کاری ئەکردە سەر گەلی کوردیش کەیەکێ لەنەتەوە سەرەکیەکانی ژێردەستی تورك بو. بەڵام مادەکانی" حەوتەم دەربارەی داگیرکردنی هەر شوێنێکی ستراتیجی کە بەپێویستی بزانن.: پانزەهەم، کێشانەوەی دەسبەجێی ئۆردوی تورك لەسەروی ڕۆژئاوای ئێران. شانزەهەم، بەدەستەوەدانی سەربازگەکانی میزۆپۆتامیاو، مادەی بیستوچوارەمین دەربارەی داگیرکردنی ٦ولایەتی بەناو ئەرمەنی ڕۆژهەلاتی تورکیا ئەگەر پشێوییان تێ کەوت. ئەمانە ڕاستەوخۆ لەگەڵ کوردستانو مەسەلەی کورد پێوەندییان هەبو.

لەدوای ڕاگرتنی جەنگ هێزەکانی بەریتانی، فەرەنسی، ئیتالی، یۆنانی ڕژانە خواروی ئەنەدۆڵو داگیریان کرد. هێزێکی هاوبەش دەستی بەسەر ئەستەمولدا گرت.

سەپاندنی ئەو مەرجە قورسانە هۆیەکی گرنگ بو بۆ وروژاندنی هۆشی نەتەوەیی گەلی تورکو سەرهەڵدانی بزوتنەوەی کەمالی.

### ٦-کۆبونەوەی براوەکان بۆ دابەشکردنی دەسکەوتەکانی جەنگ

لەکانونی دوەمی ١٩١٩دا لایەنە سەرکەوتوەکانی جەنگ بۆ باس کردنی ڕێوشوێنەکانی ئاشتی لەپاریس کۆبونەوە[٣٩] لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دو جۆرە کێشەیان لەبەردەمدا بو ئەبو بیخەن بەلادا" یەکێکیان، بڕیاردانی چارەنوسی شوێنە داگیرکراوەکان بو. ئەوی تریان جۆری جێبەجێ کردنی ڕێکەوتنە نهێنیەکانی سەردەمی جەنگ بو.[٤٠]

لەسالانی جەنگدا ولایەتە عوسمانیەکانی بەسرا، بەغداد، بەشی زۆری ولایەتی موسل، سوریا، فەلەستین بەشەڕ لەلایەن بەریتانیاوە داگیر کرا بون. لەپاش ڕاگرتنی جەنگ هێزەکانی هاوپەیمانەکان هەندێ لە ولایەتەکانی تریشیان داگیرکرد. هێزی بەریتانی چوە سیلیسیاو ئەدەنەو، پاش ماوەیەك بەجێی هێشت بۆ هێزی فەرەنسی، هێزی ئیتالیاش لەئەدالیا بارگەی خست. ئەستەمول لەلایەن هێزی هاوبەشەوە دەستی بەسەرا گیرا بو.

ئەو شوێنانەی سەرزەمینی عوسمانی کەبەشەڕ گیرا بون، جگە لەدیمەشق کەماوەیەکی کورت ئەمیر فەیسەڵ بەڕێوەی ئەبرد.ئەوانی تری ڕاستەوخۆ لەلایەن هێزەکانی بەریتانیاوە بەڕێوە ئەبران.

ئێران ئەگەرچی لەجەنگدا بەشدار نەبوبو، بەڵام ئەویش لەلایەن هێزەکانی روسیاو بەریتانیاوە داگیرکرا بو. لەپاش کشانەوەی سوپای روسی ئێران بەکردەوە لەژێردەستی هێزی بەریتانی‌دا بو.

کێشەی دوەم پێوەندی بەرێکەوتنە ئیمپریالیستیە نهێنیەکانەوە هەبو. ئەم رێکەوتنانە بەئاشکرا پێچەوانەی ئەو بەڵێنانە بون کەهاوپەیمانەکان بەگەلانیان دا بو، پێچەوانەی پرنسیپەکانی سەرکۆماری ئەمریکا ویلسۆن‌و، لەگەڵ مافو ئامانجی گەلاندا نە ئەگونجان. ویلسون لەسەر ئەوە پێی دائەگرت" ئەو رێکەوتنانە لەپاش قوبوڵ کردنی پرنسیپەکانی ئەو لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە هەڵوەشاونەتەوە. چونکە بەپێی پرنسیپەکانی ئەو ئەبو ئیتر دیپلۆماسی ئاشکرا جێگەی دیپلۆماسی نهێنی بگرێتەوەو، مافی ئازادی چارەنوسی گەلانی ژێردەستی تورك بسەلمێنرێ. بەریتانیاو فەرەنسا ئامادە نەبون دەس لەو رێکەوتنانەو لەدەسکەوتەکانی سەردەمی جەنگ هەڵ بگرن، نەشیان ئەویست بکەونە ناکۆکیەوە لەگەڵ ئەمریکا، بەڵکو ئەیان ویست شێوەیەك بدۆزنەوە هەم بەرژەوەندیەکانی خۆیان دابین بکاو هەم ئەمریکاش دژی رانەوەستێ.

لە ٣٠ی کانونی دوەمی ١٩١٩دا ئەنجومەنی بەرزی کۆنفرەنسی ئاشتی بڕیاریدا:((هاوپەیمانەکان‌و ئەو دەوڵەتانەی چونەتە ریزی ئەوانەوە رێك کەوتن لەسەر ئەوەی ئەرمینیا، سوریا، میزۆپۆتامیا، کوردستان، فەلەستین، نیوە جزیرەی عەرەب بەیەکجاری لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی جیا بکرێنەوە)) [٤١].

## ١/٦ داواکانی گەلان لەکۆنفرەنسی ئاشتی

دەوڵەتە گەورەکان خەریکی سەودا بون لەناوخۆیاندا بۆ دابەشکردنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەوڵەتە بچوکەکانی ناوچەکەش لەتەقەللای فراوان کردنی قەڵەمڕەوی خۆیاندا بون لەسەر حسابی دەوڵەتی تێشکاوی تورك، گەلانی ژێر دەستەی ناوچەکەش بەهیوای بەدەس هێنانی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی خۆیان‌و پێکهێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ بون. ئەم خواستە جیاوازانە کەرەنگدانەوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی جیاوازی لایەنەکان بو، پێکەوە نە ئەگونجان.

### ١/١/٦ خواستەکانی یۆنان

بەر لەکۆتایی جەنگ بەماوەیەکی کورت حکومەتی یۆنان جەنگی دژی دەوڵەتی عوسمانی راگەیاند. لەدوای راگرتنی شەڕ حکومەتی یۆنان دەستەی نوێنەرایەتی خۆی بەسەرۆکایەتی ڤینزەلوس نارد بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی.

ڤینزەلوس داوای داگیرکردنی ئیزمیرو ناوچەکانی دەوروبەری ئەکرد. خواستەکانی خۆی لەسەر بنچینەی ئیسنی‌و مێژویی دامەزراند بو [٤٢]. ئیسنی

سەبارەت بەو زۆرایەتیە یۆنانیەی لەکۆنەوە لەو ناوچانەدا جێگیر بون، بیانوی مێژوییشی ئەوە بوو کەناری رۆژئاوای دەریای ئیجە لەگەڵ کەناری رۆژهەڵاتی پێوەندی مێژوییو یەکێتیی ئابوورییان هەیە.

بەریتانیا پشتیوانی لەخواستی یۆنان کرد. ئەنجومەنی بەرزی هاوپەیمانەکان دەسەڵاتی‌دا بەیۆنان ئیزمیر داگیر بکا. لە ١٥ی مایسی ١٩١٩دا هێزەکانی یۆنان لەئیزمیر دابەزین و کەوتنە پێشڕەوی بۆ ناوەوە.

### ٢/١/٦ خواستەکانی ئێران

ئێران بەشداری جەنگ نەبو. تەنانەت کەهێزی روسی لەلای سەروی‌و هێزی بەریتانی لەلای خواروی و هێزی تورکی لەلای رۆژئاوای جولان بۆ داگیرکردنی. هێزەکانی ئێران هیچ بەرەنگاری یا رێگرییەکیان لێ نەکردن. کاتێ جەنگ راگیرا ئێران بەکردەوە لەلایەن بەریتانیاوە داگیرکرابو. بەریتانیا ئەی ویست بەر لەکێشانەوەی هێزەکانی پەیمانێکی نابەرامبەری بەسەردا بسەپێنێ کە بەکردەوە ئێرانی ئەکردە مانداتی ئینگلیز. لەو هەلومەرجە سەختەدا ئێران تێشکانی دەوڵەتی عوسمانی دوژمنی دێرینەی‌و، ئامادە نەبونی روسیای ملۆزمی دێرینەی لەکۆنفرەنس‌دا، بەهەل زانی بۆ ئەوەی بەناوی دەسکاری کردنی سنورەکانیەوە خواستە ئەرزیە کۆنەکانی لەکوردستان‌و شوێنەکانی تر سەر لەنوێ بهێنێتەوە کایە. لەمەش‌دا پشت ئەستور بو بەدۆستایەتی بەریتانی بەتایبەتی ئەی ویست لەباتی قبوڵ کردنی ئەو پەیمانە نابەرامبەرە ئەو دەسکەوتە ئەرزییانە بەدەس بهێنێ.

فیروز میرزا نەسرولدەولە وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران چەند یادداشتێکی دەربارەی خواستە ئەرزیەکانی ئێران‌دا بەحکومەتی بەریتانی. خۆیشی چوە لەندەن بۆ سەردانی لۆرد کیزن، بۆ ئەوەی هەوڵ بدا کەرەزامەندی بەریتانی‌و پشتیوانی ئەو لەخواستەکانی ئێران بەدەس بهێنێ. بۆ ئەوەی کاتێ ئێران خواستەکانی خۆی خستە بەردەمی کۆنفرەنسی ئاشتی پشت ئەستور بێ بەلایەنگری بەریتانی.

ئێران ئەی ویست سنورەکانی لەگەڵ روس‌و تورکیا دەسکاری بکا. نەسرولدەولە لەیادداشتی رۆژی ١٧ی تشرینی دوەمی ١٩١٩دا بۆ لۆرد کیزنی نوسیوە ئەڵێ:

((.. سەبارەت بەکورد، بەسەر ژمارەیەکی زۆر خێڵ‌و هۆزدا دابەش بون، لەگەڵ یەکتری ناکۆکن، ئەم خێڵانە نەتەوە پێك ناهێنن، هەروەها لەتوانای خێڵ‌دا نیە یەکەیەکی سیاسی دروست بکا. بەمجۆرە کورد ئەگەر بخرێتە سەر ئێران، ئەوە چارەسەری ئەم گیروگرفتە دژوارە ئەکا. چونکە ئێران کاری لەبەشێکی گەورەی

کورد کردوه وەکو کوردەکانی موکری و گەروس کەئێستە جێگیر بون و نیشتەجێن و شێوەی ژیانیان گۆڕاوە. کورد هەرگیز سەر بۆ دەسەڵاتی ئەرمەنی دانانەوێنێ. بگرە کۆمەڵی نەتەوەیی و زمان دینەکەیان وایان لێ ئەکا بەجۆرێکی سروشتی زۆرتر لەگەڵ ئێرانیەکان بگونجێن)). ئینجا پێشنیار ئەکا سنوری رۆژئاوای ئێران بەجۆرێ چاك بکرێ بگاتە لای رۆژئاوای گۆمی وان. ئێران خواستە ئەرزیەکانی خۆی لەکوردستاندا لەسەر بنچینەی بیانوی مێژویی، رەگەز، زمان و دینی کورد دامەزراندوە.

خواستەکانی ئێران لەلایەن بەریتانیاوە پشتیوانی لێ نەکرا. لەبەرئەوە لەکۆنفرەنسی ئاشتیدا باس نەکرا. بەریتانیا نەی هێشت ئێران لەکۆنفرەنسی ئاشتیدا بەشدار بێ بەبیانوی ئەوەی لەجەنگدا بەشدار نەبوەو بێلایەن بوە. بەلام لەراستیدا بەریتانیا ئەیویست ئێران دور بخاتەوە لەهەمو جۆرە هاوبەشییەك لەکاروباری باس کردنی پاشە رۆژی سیاسی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا[٤٣].

### ٣/١/٦ خواستەکانی عەرەب

لەجەنگدا عەرەب هاوکاری هێزەکانی بەریتانی کرد دژی دەوڵەتی عوسمانی. ئەوەش لەئەنجامی رێکەوتنی حسێن و ماکماهوندا بو. ماکماهون لەباتی حکومەتی بەریتانی بەڵێنی بەحسێن دابو کە ئەگەر بەشداری جەنگ بن دژی تورك، پشتیوانی لەئامانجە نەتەوەییەکانیان بکەن. ئەمیر فەیسەڵ لەباتی باوکی، مەلیکی حیجاز حسێن، لەگەڵ دەستەیەکی نوێنەرایەتی ٣ کەسی، هاورێ لەگەڵ لورەنسی بەناوبانگ گەیشتنە پاریس. لە١ی کانونی دوەمی ١٩١٩دا یادداشتێکیدا بە ئەنجومەنی بەرزی کۆنفرەنسی ئاشتی[٤٤].

لەم یادداشتەدا فەیسەڵ داوای لەهاوپەیمانەکان کردبو کەبەڵێنەکانی خۆیان لەبارەی دانپیانانی مافی سەربەخۆیی عەرەب بهێننە جێ. داوای کردبو کەدەولەتێکی یەکگرتو بۆ هەمو عەرەبەکانی ئاسیا دروست بکرێ. لەئەسکەندەرونەوە بەرەو رۆژهەلات تا سەر سنوری ئێران و بەرەو خوار تا سەر موحیتی هیندی.

فەیسەڵ خواستەکانی خۆی لەسەر بنچینەی لەیەکچونی رەگەزی سامی، زمانی عەرەبی، دینی ئیسلامی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی داوای ئەکرد، دامەزراند بو. هەروەها بەڵێنی دابو کە ئەگەر داواکانی بێتە دی وابکا بەزویی کەلك لەسامانی میزۆپۆتامیا وەربگرن.

فەیسەڵ لەداوا ئەرزیەکانیدا دەسدرێژی کردبوە سەر مافی کورد، چونکە بەشێکی ئەو شوێنانەی ئەو لەئەسکەندەرونەوە بۆ سنوری ئێران داوای کرد بوو

نیشتمانی نەتەوەیی کوردە، لەهەندێکی عەرەبی لێ نەبوو لە هەندێکی کەمایەتیەکی عەرەبی لێ بوو لەگەڵ زۆرایەتییەکی کورد ئەژیان. کەچی فەیسەڵ لەم یادداشتەدا دانی بەهەبونی نەتەوەی کوردا نەناوە، نەوەکو نەتەوەیەکی سەرەکیو نەوەکو کەمایەتییەك کەلەو ناوچانەدا هەبن. هەروەها بەڵێنی دابین کردنی هیچ مافێکیشی نەداوە کەئەگەر خرانە ژێر دەستی ئەوەوە[٤٥].

### ٤/١/٦ خواستەکانی جولەکە

جولەکە ئەوسا دەوڵەتی نەبو تا بەناوی ئەوەوە بەشداری کۆنفرەنس بکا.((رێکخراوی جیهانیی سەهیۆنی)) دەستەیەکی نوێنەرایەتی تێکەڵاوی لەجولەکەی ئەوروپاو ئامریکا بەسەرۆکایەتی وایزمان پێك هێنابو کە لەپاریس شوێن ئامانجەکانی بزوتنەوەی سەهیۆنی بکەوێ.

سەهیۆنیەکان ئەیان ویست دانپیانانی(دولی)بۆ بەڵێنەکەی بیلفۆر بەدەس بهێنن کە لەبارەی دروست کردنی نیشتمانی نەتەوەیی جولەکەوە لەفەلەستین درابو، وئەیان ویست ئەو دەسکەوتە بخرێتە ناو پەیمانی ئاشتیەوە.

سەهیۆنیەکان دژی ئەوە بون فەلەستین بخرێتە سەر دەوڵەتێکی عەرەبی.

هەروەها دژی سەرەتای ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی گەلان بون کەئەگەر لەفەلەستین جێبەجێ بکرایە لەبەر زۆرایەتی ژمارەی عەرەب، فەلەستین ئەبوە دەوڵەتێکی عەرەبی.

لەهەمان کاتدا دژی(تدویل)ی فەلەستین بون کە لەرێکەوتنی سایکس-پیکۆدا بڕیاری لێ درابو.

ئەیان ویست فەلەستین راستەوخۆ لەژێر دەسەلاتی بەریتانیدا بێ[٤٦].

### ٥/١/٦ خواستەکانی ئەرمەن

دەستەی نوێنەرایەتی ئەرمەن لەلایەن بوغوس نوبار پاشاوە سەرۆکایەتی ئەکرا. ئەرمەن داوای ئەکرد لەئەرمەنستانی تورکیا، کە مەبەستیان لە٦ ولایەتەکەی رۆژهەلاتی عوسمانی واتە" ئەرزرۆم، ئەرزنجان، وان، بتلیس، خەرپوت، دیاربەکر بو، دەوڵەتێکی ئەرمەنی دروست بکرێ.

ئەم داوایە لەسەر بنچینەی بەهانەی مێژویی دامەزرابو، کە لەکاتی خۆیدا ئەرمەن زۆرایەتی دانیشتوانی ئەو شوێنانە بون، بەلام لەکاتی دەربڕینی ئەم خواستەدا ئەرمەن کەمایەتییەکی بچوکی دانیشتوانی ئەو شوێنانە بون[٤٧].

داواکانی ئەرمەن لەگەڵ ئامانجەکانی کورد ناکۆك بون. چونکە ئەو شوێنانەی ئەوان داوایان ئەکرد دەوڵەتی ئەرمەنی لەسەر دروست بکرێ، کورد بەنیشتمانی نەتەوەیی خۆی دائەنا، نە لەپێش کوشتاری بەکۆمەڵی ئەرمەنو نەدوای ئەوەش

ئەوان زۆرایەتی دانیشتوانی ناوچەکە نەبون. بەڵکو بەدرێژایی مێژوی چەند سەدەی دوایی لەزۆری ئەو شوێنانەدا ژمارەی کورد لەئەرمەنی زۆرتر بوە.
ناکۆکی خواستەکانی کوردو ئەرمەن کۆسپێکی گەورە بو لەبەردەم هەردولادا. سەرەنجام بوغوس نوبار پاشا بەنوێنەرایەتی ئەرمەنو شەریف پاشا بەنوێنەرایەتی کورد لەسەر ئەوە پێك هاتن" جیاکردنەوەی سنوری نەتەوەیی هەردو نیشتمان بەدادوەریی کۆنفرەنسی ئاشتی بسپێرن.

### ٦/١/٦ خواستەکانی ئاسوری

لەتەموزی ١٩١٩ دا دو کەس بەناوی سەعید سادق‌و رۆستەم نەجیب بەناوی دەستەی نوێنەرایەتی ئاسوری- کلدانیەوە یادداشتێکیاندا بەکۆنفرەنسی ئاشتی. لەم یادداشتەدا داوای دروست کردنی دەوڵەتێکی گەورە یان ئەکرد لەهەندێ لەولایەتەکانی رۆژهەلات‌و خواروی تورکیا، کەحەلەب‌و دیرەزورو موسلیشی بخرێتە سەرو، دەرگایەکیش بۆ ئەم دەوڵەتە لەسەر دەریا تەرخان بکرێ. دەوڵەتانی گەورە دەستەبەری بن‌و لەژێر مانداتی یەکێکیاندا بێ.
دەستەی نوێنەرایەتی ئاسوری داواکانی خۆی لەسەر بنچینەی بەهانەی مێژویی‌و زۆریی ژمارەی ئاسوری لەچاو ئەرمەنی‌و ریچەڵەکی ئاسوریانەی هەندێ لەخێڵەکانی کوردو عەرەب، دامەزراند بو.
ئەم داوایانە لەگەڵ راستی جوگرافی‌و مێژوییدا نە ئەگونجان. لەگەڵ ئامانجەکانی کوردو ئەرمەنی‌و عەرەب ناکۆك بو، بەتایبەتی چونکە ئاسوری هەمیشە لەو ناوچانەدا کەئەوان داوایان کردبو کەمایەتیەکی بچوکی دانیشتوان بوە.

### ٧/١/٦ خواستەکانی کورد

جەمعییەتی تەعالی کوردستان کەتازە لەئەستەمول کەوت بوە چالاکی جەنەرال شەریف پاشای راسپارد سەرۆکایەتی دەستەی نوێنەرایەتی کورد بکا. شەریف پاشا لە٢٢ی ئازاری١٩١٩دا((یادداشتی دەربارەی خواستەکانی گەلی کورد))ی‌دا بەئەنجومەنی بەرزی کونفرەنسی ئاشتی لەپاریس.
لەم یادداشتەدا شەریف پاشا داوای دروستکردنی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆی کردبو لەولایەتە کوردنیشینەکانی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا.
شەریف پاشا خواستەکانی خۆی لەسەر بنچینەی بەهانەی مێژویی، جۆری ژیانی کوردو، زمانەکەی‌و شوێنی ژیانی دامەزراندبو، هەروەها لەسەر بنچینەی بەڵێنی هاوپەیمانەکان دەربارەی سەلماندنی مافی گەلان لەئازادی بریاردانی چارەنوسی خۆیاندا. لەم یادداشتەدا باسی پێوەندی کوردی لەگەڵ ئەرمەن کردبو.

لەبەرئەوەی کوردستان هەرگیز دەوڵـەتێکی تایبـەتی نـەبوە خـاوەنی سـنوری سیاسی یا جوگرافی دیاری کراو بێ، سنوری کوردسـتان جێگـەی مشـتومڕ بـو. خواستەکانی کورد لەلایەك لەگەڵ خواستەکانی ئەرمەن‌و عـەرەب تێکـەڵاو بـو، چونکە هەندێ لەو شوێنانەی ئەرمەنی‌و هەندێ لەو شـوێنانەی عـەرەب داوایـان ئەکرد کـورد بەنیشـتمانی خـۆی ئـەزانی‌و، لەلایـەکی تـرەوە لەگـەڵ تـەماعی بەریتانی‌و فەرەنسی تێکەڵاو بو، چونکە هەندێ لەو شوێنانەی کورد داوای ئەکرد ئەوان ئەیان ویست خۆیان دەستی بەسەردا بگرن.

شـەریف پاشـا لەگـەڵ نوێنـەرانی ئەرمـەن رێـك کـەوت" کێشـەی سـنوری نیشتمانی هەردو گەل بخرێتـە بـەردەمی کۆنفرەنسـی ئاشـتی بـۆ بڕیـار لێ دان‌و هەردوکیان بەو بڕیارە رازی بن.

### ٧-تەقەللاکانی کورد بۆ سەربەخۆیی

لەسـالانی جـەنگدا بەشـەکانی رۆژهـەلات‌و سـەرو وخـواروی کوردسـتان لەئەنجامی جەنگدا بوبو بەکەلاوەیەکی گـەورە. سـەرکردەکانی بزوتنـەوەی کـورد لەتورکیا پێ ناچێ بواری چالاکی سیاسی، فەرهەنگی، جەنگیی زۆریان بەقازانجی بزوتنەوەی رزگاریی نەتەوەیی کورد هەبو بێ. لەئێران تـەنیا لـەرۆژئاوای ورمـێ جولانەوەیەکی چەکدار بەسەرکردایەتی سمکـۆ هـەبو. ئـەویش لەشـەڕی نـاوخۆوە گلابـو هـەم لەگـەڵ مەسـیحیەکان‌و هـەم لەگـەڵ عەجـەم. کردەوەکـانی سمکـۆ بەتایبەتی رەشەکوژی مەسیحی‌و عەجەم، تالانی ئاوایی‌و راووڕوتی خەڵك، بەرگی سیاسی لەجولانەوەکەی داماڵی بو وەکو باندی تـاوان‌و جـەردەیی سـەیری ئـەکرا. نەی ئەتوانی بڕواو پشتیوانی هیچ کام لەدەوڵەتانی هاوپەیمان بەدەس بهێنێ.

لەپێش راگرتنی جەنگدا بەماوەیەکی کورت‌و راستەوخۆ لەدوای ئاگربڕ، واتە لەدوای تێشکانی عوسمانی لەجەنگدا بزوتنەوەی نەتەوەیی کـورد لەکوردسـتانی جنوبی‌و هەندێ ناوچەی کوردستانی شیمالی‌و ئەستەموڵ وەکو فاکتەرێکی چـالاك لەسەر شانۆی سیاسی ناوچەکە سەرلەنوێ سەری هەڵ دایەوە.

### ١/٧ تەقەللاکانی سلێمانی

هێشتا ئاگربڕی مودروس نەکرابو کاربەدەستانی تورك کاروبـاری سـلێمانییان بەشێخ مەحمودی حەفید سپاردبو. شێخ محمود لەوکاتـەدا ناسـراوترین سـەرکردەی کوردبو لەکوردستانی جنوبی‌دا. لەدوای کوژرانی شیخ سـەعیدی بـاوکی‌و شـێخ ئەحمەدی برای لەموسڵ(١٩٠٨) کـە لەلایـەن حکومـەتی ئیتیحادیەکانـەوە دور خرابونەوە بۆ ئەوێ، بەکردەوە بوبو بەسەرۆکی بنەماڵەی ساداتی بەرزنجەو شێخانی ناوچـەکە. لەسـالانی جـەنگدا سـەرکردایەتی(موجاهیـدان)ی کـوردی کردبـو

لەشەڕی تاریدەری پێنجوێن‌دا دژی سوپای روسی‌و لەشەڕی شعیبەدا دژی سوپای بەریتانی. شێخ محمود نفوزێکی کاریگەری لەناو عەشیرەتەکانی ناوچەکەدا هەبو.

شێخ محمود کەجاری یەکەم نامەی بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز نوسی. نامەکەی کەوتە دەست تورك‌و لەسەر ئەوە گیراو حوکمی ئیعدام درا. زۆری نەمابو ئیعدامی بکەن. بەڵام رەوتی روداوەکانی جەنگ بەجۆرێ رۆیشت، تورك هیچ قازانجێکی لەکوشتنی‌دا نەدی، بەڵکو ئازادی کردو کاروباری سلێمانییان پێ سپارد.

بۆ جاری دوەم، لەتشرینی یەکەمی ١٩١٨دا شێخ محمود, عیزەت تۆپچی‌و ئەحمەد فائقی بەنوێنەرایەتی خۆی بەنامەیەکەوە ناردە لای کاربەدەستانی بەریتانی لەکفری. لەنامەکەی‌دا داوای لەبەریتانیا کردبو" گەلی کوردیش لەڕیزی گەلانی ئازادا دابنێ‌و بەریتانیا دەستەبەری ئەوەبێ لەهیچ هەلومەرجێکا ڕێگەی گەڕانەوەی دەسەڵاتی تورك بۆ کوردستان نەدا، لەبەرامبەر ئەوەدا ئەویش ئامادەیی خۆی دەر ئەبڕێ بۆ هاوکارییان.[٤٨]

بەریتانیا لەوکاتەدا پێویستی بەوە بو بو کوردستان ئارام بێ‌و، گەلی کورد بەلای خۆی‌دا رابکێشێ ئارنۆڵد ویلسون حاکمی عامی عیراق میجەر نوئیلی نارد بۆ سلێمانی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ شێخ محمودو دانانی بەحاکمی ناوچەکەو هاندانی عەشیرەتە کوردەکانی بەینی زێی بچوك‌و روباری سیروان کەبۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان یەکێتیەك پێك بهێنن بەسەرۆکایەتی شێخ محمود.[٤٩] لە ١٦ی تشرینی دوەمی ١٩١٨دا نوئێل گەیشتە سلێمانی لەوێوە بەبروسکە ئاگاداری حاکمی گشتی کرد:(ئەمڕۆ گەیشتمە سلێمانی. پێشوازییەکی شاهانە کرام. نوێنەرانی گوندەکان بەدرێژایی ڕێگا راوەستابون، بەگەیشتنی ئێمە شادی خۆیان دەرئەبڕی... من دژواری زۆر نابینم لەدوارۆژا لەرێگەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەژێر سەرپەرشتی خۆمان‌و دەسەڵاتی ئەفسەرە سیاسیەکانمان‌دا بەو مەرجەی دەسبەجێ رێوشوێنی بۆ دابنرێ)[٥٠]

لەسلێمانیش لەکۆبونەوەیەکی جەماوەری‌دا نوئێل بەناوی حکومەتی بەریتانیەوە دانانی شێخ محمودی بەحکومدار راگەیاندو بەڵێنی خۆشی بەخەڵکدا. کەوتە پێوەندی بۆ رێکخستنی کونفرەنسێکی ٤٠-٥٠ کەسی پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە.

سلێمانی لەوکاتەدا شارێکی دواکەوتوی بچوك بو. تازە لەبرسێتی‌و پەتای رشانەوە هەستابوەوە. لەهەمو سلێمانی‌دا خانویەکی باشی تێدا نەبو. بەشی زۆری بوبو بەکەلاوە. رۆشنبیرەکانی لەناو سوپای عوسمانی‌و داودەزگاکانی ترا بون دور لەسلێمانی. زوڵمی کۆمەڵایەتی هەندێ لەدەسەڵاتدارانی شارو ناوچەکە، دزی‌و

جەردەیی‌و کوشتنی ناڕەوای خەڵك ناوچەکەی بەتەواوی نائارام‌و ژیانی خەڵکی ناخۆشکردبو.

لە١ی‌کانونی یەکەمی ١٩١٨دا حاکمی عامی عێراق ویلسون بەفڕۆکە خۆی چو بۆ سەردانی سلێمانی. ویلسون کابرایەکی گرنگ بو لەداڕشتنی سیاسەتی ناوچەیی بەریتانیادا. چونی ئەو خۆی لەخۆی‌دا گرنگیەکی سیاسی هەبو. ئەمە هەلێکی باش بو بۆ ئەوەی شێخ محمودو پیاوە گەورەکانی تری کورد لێوەشاوەیی سیاسی خۆیان‌و گەلەکەیان لەبەڕێوەبردنی کاروباری ناوچەکەدا بۆ ویلسون بسەلمێنن. چونکە ویلسون ئەی توانی دەوری کاریگەری هەبێ لەبڕیاردانی جۆری چارەنوسی کوردستانی جنوبی‌دا.

لەسلێمانی ویلسون شێخ محمودو چەند گەورە پیاوێکی تری بینی. لەم کۆنفرەنسەدا ویلسون بەدرێژی گفتوگۆی لەگەڵ کردن. حکومەتێکی کوردی کاتیی لەسلێمانی بەرەزامەندی ویلسون دامەزرا کەشێخ محمود بەنوێنەرایەتی بەریتانیا حوکمداری بێ. ئەوانەی لەکۆنفرەنس‌دا بەشداربون، ئەگەرچی پیاوە دەسەلاتدارەکانی ناوچەکە بون، بەلام لەبەرئەوەی زۆریان سەرۆکی عەشیرەتی نەخوێندەوارو نەشارەزای کاروباری سیاسی‌و بەڕێوەبەرایەتی بون، بیروڕای جیاوازیان دەربارەی پاشەڕۆژی ناوچەکە دەربڕی. ویلسون خۆی لەسەر ئەم کۆبونەوەیە نوسیویتی:

((هەندێ لەوانە بەڕێوەبەرایەتیەکی کاریگەری بەریتانییان ئەویست لەکوردستان داو هەندێکی تریشیان دژی ئەمەبون، هەندێکیان سوربون لەسەر ئەوەی کوردستان راستەوخۆ بەلەندەنەوە ببەسترێ، هەندێکیشیان بەدزییەوە پێیان وتم نایانەوێ شێخ محمود سەرۆکیان بێ، بێ ئەوەی کەسی‌کەیان لەبیر بێ.))[51]

لەکۆتایی گفتوگۆکان‌دا شێخ محمود بیرخەرەوەیەکی‌دا بەویلسون ٤٠ کەس لەگەورە پیاوەکانی ناوچەکە مۆریان کردبو، تیایا بەڵێنەکانی بەریتانیایان دوبارە کردبوەوە دەربارەی رزگاری گەلان لەدەسەلاتی تورك‌و یارمەتی دانیان بۆ دروست کردنی قەوارەی سەربەخۆ، ئەوانیش سەبارەت بەوەی نوێنەری گەلی کوردن تکا لەحکومەتی بەریتانی ئەکەن کورد لەو بەڵێنانە بێ بەش نەکاو، پێوەندییان لەگەڵ عێراق رێك بخا.[52]

زۆری نەبرد شێخ محمود لەگەڵ نوێنەرانی بەریتانی لەسلێمانی تێك چو. شێخ محمود سنوری قەڵەمڕەوەکەی بەتەسك‌و دەسەلاتەکانی خۆی بەکەم ئەزانی. خۆی بەنوێنەری هەمو کوردەکانی ولایەتی موسڵ‌و هەندێ لەعەشیرەتە کوردەکانی ئێران دائەنا. بەریتانیەکان لەرەفتاری شیخ محمودو جۆری بەڕێوەبردنی کاروباری

ناوچەکەو خواستەکانی رازی نەبون. لەئەنجامدا شێخ محمود پەنای بردە بەر بەکارهێنانی چەك دژی هێزی بەریتانی. لەشەڕێکی بێ هودەدا لەدەربەندی بازیان لە١٨ی حوزەیرانی ١٩١٩دا بەبرینداری بەدیل گیراو درایە دادگا, حکومەتەکەی سلێمانی تێك چو. هێزی بەریتانی سلێمانی داگیرکردو ئەفسەرانی ئینگلیز راستەوخۆ ئەرکی بەڕێوەبردنیان گرتە ئەستۆ.

### ٢/٧ تەقەللاکانی ئەستەموڵ

لەمانگە دواییەکانی ١٩١٨دا نیشانەکانی تێشکانی دەوڵەتی تورك لەدەرکەوتنا بو. سەرکردەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لەئەستەموڵ کەوتنە خۆڕێکخستنەوە. سەید عەبدول قادری شەمزینی بەهاوکاری ئەمین عالی بەدرخانو چەند گەورە پیاوی تری بنەماڵەی بەدرخانو بابانو چەند کوردی ناسراوی دیاربەکر، مەلاتیە، دیرسیم، خەرپوت، سلێمانی، سابلاخ، سنە..((جەمعییەتی تەعالیی کوردستان))ی دامەزراند. داگیرکردنی ئەستەموڵ لەلایەن هێزی هاوبەشی هاوپەیمانەکانەوە ئازادییەکی زۆرتری چالاکی سیاسی، فەرهەنگی، دیپلۆماسی بۆ دابین کردن.[٥٣]

پرۆگرامی ج ت ك لەبەردەستدا نیە. لەیادداشتەکانیدا بۆ کاربەدەستانی بەریتانیو. هاوپەیمانەکانو بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی، و لەگفتۆگۆی سەرکردەکانیدا لەگەڵ نوێنەرانی بەریتانیو بابیعالیدا دەرئەکەوێ کەئامانجی ج ت ك پێکهێنانی کوردستانی سەربەخۆ بوە بەیارمەتی هاوپەیمانەکان، بەتایبەتی بەریتانیا. بۆچونی ج ت ك بۆ سەربەخۆیی کوردستان بە تەواوی رون نیەو دیاری نەکراوە، چونکە لەیادداشتو گفتوگۆکاندا باسی کوردستانی سەربەخۆ لەهەمو جۆرە دەسەڵاتێ، کوردستانی سەربەخۆ لەژێر مانداتی بەریتانی، کوردستانی ئۆتۆنۆم لەژێر دەسەڵاتی بەریتانی، کوردستانی ئۆتۆنۆم لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا، کراوە. لەمانەش هەموی مەبەست سەربەخۆیی یا جۆرێ لەسەربەخۆیی بوە.

جەمعییەت بۆ دەربڕینی بیرو بۆچونەکانی لە٧ی تشرینی دوەمی ١٩١٨دوە گۆڤاری کوردی-تورکی((ژین))ی بەلێپرسراوەتی حەمزە موکسی بڵاو ئەکردەوە.[٥٤] و هەوڵی ئەدا لەشارەکانی کوردستاندا کلوبو کۆمیتەی جەمعییەت دابمەزرێنێ. و بۆ بایەخ دان بەخوێندەواریو بڵاوکردنەوەی کتێبی کوردیو رێکخراوی فەرهەنگیی((کرد تعمیم معارفو نشریات جمعیتی)) دامەزراند.

ج ت ك بایەخێکی تایبەتیدا بەڕێکخستنی ژیانی کوردو چاکردنی ژیانی کرێکارانی کورد لەئەستەموڵو هەوڵی ئەدا بۆ گەڕانەوەی ئەو کوردانەی

لەسـالآنی جـەنگدا بـەزۆر لەکوردسـتانەوە بـۆ شـوێنە دورەکـانی ئەنـەدۆڵ دورخرابورنەوە.

ج ت ك بۆ بەدەستهێنانی مافی نەتەوەیی کـورد لـە٣ لاوە ئـەجولآ" پێوەنـدی لەگەڵ هاوپەیمانەکان. هەوڵدان لەکۆنفرەنسی ئاشتی. گفتوگـۆی سیاسـی لەگـەڵ بابیعالی.

## ١/٢/٧ تەقەللا لەگەڵ هاوپەیمانەکان

لەسەرەتای کانونی دوەمی١٩١٩دا لەکاتێکا کۆنفرەنسی ئاشتی لەپاریس تازە خەریکی کۆبونەوەکانی بو. دەستەیەکی نوێنەرایەتی کورد بەسـەرۆکایەتی سـەید عەبدوالقادری شەمزینی چون بۆ دیدەنی ئەدمیراڵ کـارلشـورب مـەنـدوبی سـامی بەریتانی لەئەسـتەمولْ بـۆ گفتوگـۆو، بۆئـەوەی یادداشـتی جـ ت ك دەربـارەی خواستەکانی گەلی کوردی بدەنێ.

لەباتی مەندوبی سامی میستەر ریان ئەم دەستەیەی بینی. هەیئەتی کـوردی پەژارەی خۆی دەربڕی لەپشت گوێ خستنی خواسـتەکانی کـورد. وتـی زۆرایـەتی دانیشتوانی ناوچەکانی رۆژهەلآتی تورکیا کوردن هەروەها لەودیو سنوری ئێران ، لورستانو ئەو شوێنانە بەتەواوی یاخود بـەزۆری کـوردن. وتـی پێوەنـدی کـوردو ئەرمەن لەهەلومەرجی ئاساییدا باش بوە، تێکچـونی ئـەو پێوەندیـە لەهەنـدێ کاتی دیاری کراوا ئەگەڕێتەوە بـۆ کردەوەکـانی حکومـەتی عوسمـانی، هـەروەها پێوەندی لەگەڵ نەستورییەکانیش ئاسایی بوە. بۆ سەلماندنی ئەوەش تەرجومـانێکی مەسیحییان لەگەڵ خۆیان بردبو.

بـەپێی هەڵسـەنگاندنی ریـان، قسـەکانیان دەربـارەی سـنوری کوردسـتانی ئۆتۆنۆمی چاوەڕێ کراو رون نەبوە، پێیان باشتر بوە ئەمە بهێڵرێتـەوە بـۆ بڕیـاری رەوای کۆنفرەنسی ئاشتی. هەیئەتەکە داوای کـرد بـوو کارئاسـانییان بـۆ بکـرێ نوێنەری کورد بنێرن بۆ ئەوروپا تا خۆیان بەرگری لەمەسەلەی کورد بکەن.

هەیئەتەکە یادداشتێکی پێ بـو، رۆژی ٢ی کـانونی دوەمـی ١٩١٩ لەلایـەن سەرۆکی کۆمیتەی کوردستان سەید عەبدوالقادرو، سـکرتێری کۆمیتـە خـەلیل بەدرخانو، سید عەبدوللآ شەمزینی، مستەفا پاشا، عەبدولعـەزیز بابـان، مـەلا سەعید بەدیع الزمان، مەلا عەلی رەزا ئیمزا کرابو.

ئەم یادداشتە راستەوخۆ بۆ مەنـدوبی سـامی نوسـرابو، تکایـان لـێ کردبـو بیگەیەنێ بە حکومەتی بەریتانی. لەم یادداشتەدا نوسی بویان:

((سەرکردەکانی کورد هەمیشە پشتی خەلیفەو شا و سـوڵتانەکانیان گرتـوە، بەڵام هەردو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی بەشێوەیەکی زۆر ناڕەوا کوردستانیان لەناو

خۆیاندا دابەش کردوە... کورد لەگەڵ تورکیاو ئێراندابووە بەگشتی ئەگەڕێتەوە بۆ ترس لەوەی کەروسیا لە دواییدا هەڵیان بلوشێ...

((... هەڵوێستی کورد لەجەنگا بەتەنیا کردەوەکانی سوڵتان دیاری نەکرد بو، بەڵکو کردەوەکانی روسیاش بەوەی کەمایەتیە نە موسڵمانەکانی لێ هان ئەدانو هەڕەشەی داگیرکردنی نیشتمانی کوردی ئەکرد. روسیا هەڕەشەی نەهێشتنی لەکورد ئەکرد. پاش ون بونی روسیا لەمەیدانو سەرکەوتنی هاوپەیمانەکان، هیچ هۆیەك نەماوە گەلی کورد ئازار لەدەس چەوسێنەرە کۆنەکانی بچێژێ...

((... کورد هەمو ئەو ڕەوشتانەی تێ دایە کەلێوەشاوە بێ بۆ ئەوەی جێگەی خۆی لەڕیزی گەلانی دۆستدا بگرێو سەرەتای ڕەوای مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوس بەدەس بهێنێ.

((لەناو کوردا ژمارەیەکی باش خوێندەوار هەیە. دانیشتوانی کورد بەلایەنی کەمەوە ٥ ملێون ئەبن.

((کۆمیتە بەهیوای یارمەتی حکومەتی بەریتانیە بۆ پێش خستنی کوردستان.))

لە١٢ی مایسدا سەید عەبدولقادر سەردانێکی تری ئەدمیراڵ ویبی کرد. ئەمجارە سەرەڕای دوبارە کردنەوەی خواستەکانی پێشوی، تکای لێ کرد بەریتانیا گوشار بۆ حکومەتی عوسمانی بهێنێ" ڕێگە بدا بەو سەدان هەزار کوردەی لەسەردەمی جەنگدا دور خراونەتەوە بۆ شوێنی دور بگەڕێنەوە نیشتمانەکەی خۆیان.

لەدیدەنیەکی ترا سەید عبدولقادر میستەر هوهلەری دی. سەید لەم دیتنەدا وتی:

((کورد خۆیان لە هەلومەرجێکی نالەباردا ئەبینن، بگرە لەهەلومەرجێکی ترسناکدا)). هوهلەر لەراپۆرتەکەیدا نوسیویتی، کاربەدەستانی ئەستەمول بەسەرۆکایەتی سەدری اعظم فەرید پاشا هەندێ پێشنیاری گونجاویان بۆ کردبو، بەڵێنیان دابویە ئۆتۆنۆمی تەواو بەکورد بدەن لەژێر سایەی حکومەتی تورکیادا. لەزمانی سەید عەبدولقادرەوە ئەنوسێ" فەرید پاشا بەڵێنی زۆریدا، بەڵام تا لەسەرکاربو هیچیانی جێبەجێ نەکرد. حکومەتەکەی ئێستاش بەسەرۆکایەتی عەلی رەزا گفتی داوە((ادارەی ذاتی))بۆ کورد جێبەجێ بکا، بەڵام لەهەمان کاتدا تەنگیان بەخۆی هەڵ چنیوە. لەبەر ئەوەی مەترسی مستەفا کەمال لەزیاد بون دایە، حکومەت ئەیەوێ پشتیوانی کورد بەدەس بهێنێ. سەید عەبدولقادر ئەیەوێ هاوئاهەنگی تەواو لەگەڵ هاوپەیمانەکان بکا بەتایبەتی بەریتانیا چونکە

لای وایه" پاشه رۆژی کورد بەسیاسەتی حکومەتی بەریتانیاوە بەستراوە. هەروەها بەگرنگی پێ دانەوە هەواڵی ڕێکەوتنی کوردو ئەرمەن لەتورکیاو لەپاریسی پێ راگەیاند.

سەید عەبدولقادر بە هوهلەری وت: ((راستە ئەبێ کورد بەهیوا بن لەرێگەی کۆنفرەنسی ئاشتیەوە ئامانجەکانیان بێتەدی نەك لەرێی حکومەتی عوسمانیەوە لەئەستەمول، هەروەها لەوانەیە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا هەندێ هەلی تر هەڵ بکەوێ... بەڵام ئەو زیرەکانە ئەو دژوارییانەی رون کردەوە کە بەرەنگاری کورد ئەبن لەبەدی هێنانی ئامانجی ئازادیدا ئەگەر هاوپەیمانەکان هێزی تەواویان نەبێ بۆ گوشار هێنان بۆ عوسمانی کە هەمو بەندەکانی پەیمانی ئاشتی قبوڵ بکا.

لەم ماوەیەدا لەئەستەمول جگە لەدیدەنیەکانی سەید عەبدولقادرو هاوکارەکانی لەکاربەدەستانی بەریتانی بۆ رون کردنەوەی باری سەرنجی کوردو، جگە لەیادداشتەکانی شەریف پاشا بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی لەپاریس. هەر لەئەستەمول چەندین یادداشتی نوسراو دراوەتە بەریتانیاو هاوپەیمانەکانی، هەروەها کەکۆمیسیۆنی کینگ-کرەین گەیشتە ئەستەمول چەند کەسێ بەناوی حیزبی دیموکراتی کوردەوە چونە لایو داوای سەربەخۆیی کوردستانیان لێ کرد. چالاکی سیاسی کورد لەئەستەمولّ بە چەشنێکی هەست پێ کراو پەرەی سەندبو، بەرادەیەك کەمەندوبی سامی لەئەستەمول لەوەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانی پرسی هەڵوێستی لەچالاکی کوردەکان چی بێ؟ میستەر بیلفور ئاگاداری کرد:

((ئامۆژگاریەکانت بۆکورد ئەوەبێ کەپارێزگاری هێمنی بکەنو نەهێڵن پشێوی روبدا، چاوەڕوانی بڕیارەکانی کۆنفرەنسی ئاشتی بن، چونکە باری سەرنجی کورد لەلای کۆنفرەنس ئیتر زانراوە.))

کاربەدەستانی ئینگلیز بەگشتی لەسەرئەوە ریك بون هەندێ مافی نەتەوەیی کورد بسەلمێنرێ، بەڵام لەسەر هەندێ مەسەلەی گرنگ لەناو خۆیاندا نەگەیشت بونە ئەنجامێکی یەکگرتو، بەتایبەتی: یەکەمیان، جۆری ئەو مافە چی بێ" سەربەخۆیی بەیارمەتی دەوڵەتێکی گەورە، فیدراڵی، فیدراڵی چەند ناوچەیەکی ئۆتۆنۆم لەناو یەك دەوڵەتدا، ئیدارەی ذاتی... دوەمیان، مافی کورد لەکام ناوچەی جوگرافیدا بسەلمێنرێ، بەواتەیەکی تر کوردستان کوێیە؟ سێیەمیان، لەناو کوردا کێ نوێنەرایەتی کورد ئەکا تا سەودای لەگەڵ بکرێ؟

بەریتانیا بەخۆشیەوە هەواڵی ئاشت بونەوەی کوردو ئەرمەنیان وەرگرت. کاربەدەستانی بەریتانی هانی نوێنەرانی هەردو گەلیان ئەدا بۆ قوڵ کردنەوەی تەبایی و ئاشتی.

سیاسەتی بەریتانی لەکوردستاندا ئەوەبو کەئاسایش‌و هێمنی جێگیر ببێ. ئامۆژگاری سەرکردەکانی بزوتنەوەی کوردیان ئەکرد نفوزی خۆیان بەکار بهێنن بۆ پاراستنی ئاسایش‌و رونەدانی هیچ پشێوییەك. ئەمەش بەکردەوە هەلێکی مێژویی بۆ مسەفا کەمال هەلْ خست بەئازادی لەکوردستاندا، بێ ئەوەی توشی بەرەنگاری سیاسی یا چەکداری کورد ببێ، کار بکات‌و رێوشوێنی دامەزراندنی تورکیای نوێ‌و سەربرینی مەسەلەی کورد دابنێ.

**٢/٢/٧ کوردو ئەرمەن: ئاشتبونەوە لە پەراوێزی کۆنفرەنسی ئاشتیدا**

لە٢٢ی ئازاری ١٩١٩دا جەنەراڵ شەریف پاشا بیرخەرەوەیەکی لەژێر ناوی((یادداشتێ دەربارەی خواستەکانی گەلی کورد))دا بە ئەنجومەنی بەرزی کۆنفرەنسی ئاشتی لەپاریس.

لەم یادداشتەدا مێژوی کوردو سنوری جوگرافی کوردستان‌و خواستەکانی‌و پێوەندی لەگەڵ ئەرمەن رون کرا بوەوە.

مەسەلەی ئەرمەنیەکان لەدو لاوە بوبوە جێگەی گرنگی پێ دانی دەوڵەتانی ئەوروپی" یەکێکیان، وەکو گەلێکی مەسیحی کەچەند قەرن بەچەوساوەیی دیلی دەسەلاتی دەوڵەتێکی ئیسلامی زۆردار بو. دوەمیان، کوشتاری بەکۆمەڵی نارەوای سەدان هەزار کەسی ئەم گەلەو دەربەدەر بونی پاشماوەکەی. خواستەکانی ئەوان‌و هی کورد بەهۆی پێکەوە ژیانی دورو درێژ لەناوچەیەکی هاوبەش داو، دوایی تر کوشتاری بەکۆمەڵی یەکتری، ئالاّ حەمیدیەکانی کورد دژی ئەرمەنی‌و تیپە چەکدارەکانی ئەرمەنی دژی کورد، جۆرێ لەناکۆکی قوڵی دروست کردبو کەبێ دۆزینەوەی چارەیەك بۆ ئەوە دژواربو خواستەکانی ئەم دو گەلە بەتایبەتی هی کورد بێتە دی.

تاوانی کوشتاری بەکۆمەڵی ئەرمەنی لەئەوروپا دەنگێکی گەورەی دابوەوە. ئەگەرچی ئەمە راستەوخۆ لەژێر سەرپەرشتی، تەلعەت پاشا، وەزیری کاروباری ناوەوەی تورکیادا ئەنجام درابو، بەلاّم چونکە ئالاّ حەمیدیەکان تیا بەشدار بوبون، تورك ئەیویست ئەم تاوانە بخاتە پاڵ گەلی کورد بۆ ئەوەی ناوی بزرێنی‌و وەکو گەلێکی درەندەی دواکەوتوو بیخاتە بەرچاوی جیهان. تۆفیق پاشا کەچەند جارێ وەزیرو ماوەیەك سەفیری تورکیا بو لەبەریتانیا، دوا بەدوای راگرتنی جەنگ لە لەندەن گوتبوی:

((ئەوانەی ئەرمەنیان کوشت کورد بون. تورك‌و حکومەتی تورکیا لەوکارە بەرین. ئەگەر پێویستیەکانی جەنگ‌و خەریك بونی بەشەرەوە نەبوایە، حکومەت ئەی توانی نەهێڵێ ئەو کارە روبدات‌و تاوانبارە راستەقینەکانی سزا ئەدا.))[٥٥]

کورد نەخۆی هۆی ڕاگەیاندنی هەبوە نە داوودەزگای دیپلۆماسی کەبتوانێ ئەم کارە لەسەر خۆی لاببا‌و تاوانباری ڕاستەقینە لـەلای ڕای گشـتی جیهـان ئاشـکرا بکا. گەلێ لـەکۆڕو کۆمەڵـەکانی دنیـا ئەمـەیان بەسـەر کـوردا ئـەهێنا. لـەو سەردەمەدا دو شایەتی بێگانە کە یەکێکیان خودی ئەرمەنیـەکان‌و ئـەوی تریـان ئەفسەرێکی ئینگلیز بو، نەختێ لەهەوری ئەم پڕوپاگاندەیەیان ڕەواندەوە.

دەستەی نوێنەرایەتی ئەرمەن بەسەرۆکایەتی بوغوس نوبار پاشا لـەحوزەیرانی ١٩١٨دا((بیرخەرەوەیـەکیان دەربـارەی مەسـەلەی ئەرمـەن))[٥٦] بەهـەمو گـەورە پیاوانی دنیادا . لەوێدا تۆباڵی هەمو ئەو کوێرەوەرییەی بەسەر گـەلی ئەرمـەنی هاتوە خراوەتە گەردنی سوڵتان عبدالحمیدو کاربەدەستانی تری تورك.

هەروەها میجەر نوئێل لەو ڕاپۆرتەدا کەدوای گەشتە درێژەکەی بەکوردستانی تورکیادا دەربارەی مەسەلەی کورد نوسی بوی، شایەتی ئەدا کەتۆباڵی ئەو تاوانە لەئەستۆی کاربەدەستانی تورك دایـە نـەك هـی کـورد ، بـەڵکو کـورد ئەوەنـدی لەدەستی هاتوە هەوڵی ڕزگار کردنی گیانی ئەرمەنی ڕاونراوی داوە.[٥٧]

سەرکردەکانی بزوتنەوەی کورد گرنگی ڕێکـەوتنیان لەگـەڵ گـەلی ئەرمـەنی ئەزانی. یەکەمیان لەبەر ئەوەی وەکـو دو نەتـەوەی دراوسـێی یـەکتری کـە ئـەبێ ڕێگەی پێکەوە ژیانی بەئاشتی هەڵ ببـژێرن. دوەمیـان بـۆ ئـەوەی تێکـەڵ بـونی خواستە ئەرزیەکانی ئەم دو گەلە نەبێتە بەهانەی پشت گوێ خستنی مافەکانیان لەسـەر ئاسـتی جیهـانی چـونکە کاربەدەسـتانی دەوڵـەتانی ئـەورپی لەهـەمو بۆنەیەکدا ئەیان گوتەوە.

پاش دانوستانێکی زۆر لەنێوان شـەریف پاشـا بەنوێنەرایـەتی گـەلی کـوردو بوغوس نوبار پاشا بەنوێنەرایـەتی گـەلی ئەرمـەنی‌و ئۆهانجیـان بەنوێنەرایـەتی حکومەتی ئەرمـەنی لـەقافقاس ڕێکـەوتنێکیان ئیمـزا کـرد کـەبۆ زۆر کـەس، تەنانەت لەکاربەدەستانی دەوڵـەتانی ئـەورپیش، شـتێکی چاوەڕێ نـەکراو بـو. ڕێکەوتنەکە بەم جۆرەی لای خوارێ لەهەردو لاوە نێردرا بۆ سـەرۆکی کۆنفرەنسـی ئاشتی:

پاریس ٢٠ی تشرینی دوەمی ١٩١٩

جەنابی سەرۆك

بەختیارین بەوەی وێنەیەکی ئەو نامەیەتان بدەینێ کەبۆ کۆنفرەنسـی ئاشـتی نوسراوە، وە لەلایەن ئێمەوە نوێنەرایەتی یەکگرتوی ئەرمەنی‌و نوێنەرایەتی کورد لەکۆنفرەنسی ئاشتی‌دا ئیمزا کراوە.

بەڕێزتان ئەبینن بەپێچەوانەی قسەی دوژمنەکانمان کە ئەڵێن ئەرمەنیو کورد ناتوانن پێکەوە بەئاشتی بژین، پەیمانی ئاشتیمان بەست، لەبەر تیشکی بەدی هاتنی ئامانجە نەتەوەییەکانماندا کەپێوانەی پاشەڕۆژە.

تکایە ڕێزی بێ ئەندازەمان قبوڵ بکەن

| | |
|---|---|
| سەرۆکی نوێنەرایەتی کورد | سەرۆکی نوێنەرایەتی نەتەوەیی |
| لەکۆنفرەنسی ئاشتی | ئەرمەن |
| شەریف | بوغوس نوبار |

ئەمەش تێکستی ڕێکەوتنی پەیمانی ئاشتی هەردو نوێنەرایەتی:

١٢ شەقامی سەرۆك ویلسون، پاریس

٢٠ی تشرینی دوەمی ١٩١٩

نوێنەرایەتی یەکگرتوی ئەرمەن

ئێمە ئەوانەی لەخوارێ ئیمزامان کردوە، نوێنەرانی گەلانی ئەرمەنو کورد، ئەو شەرەفەمان پێ براوە کۆنفرەنسی ئاشتی ئاگادار بکەین ، کەهەردو گەلەکانی ئێمە هەمان بەرژەوەندیان هەیە، وە بۆ هەمان ئامانج تێ ئەکۆشن، پەی بەئازادیو سەربەخۆیی خۆیان ئەبەن بەتایبەتی بۆ ئەرمەنو ڕزگارییان لەدەسەلاتی سەختی حکومەتی عوسمانی، واتە ڕزگارییان لەئیتحادو تەرەقی.

ئێمە هەمومان پێك هاتین لەسەر ئەوەی داوا لەکۆنفرەنسی ئاشتی بکەین بەپێی سەرەتای نەتەوەکان بڕیاری دامەزراندنی ئەرمینیای یەکگرتوی سەربەخۆو کوردستانی سەربەخۆ بدات بەیارمەتی یەکێ لەدەوڵەتە گەورەکان.

| | |
|---|---|
| شەریف | سەرۆکی نوێنەرایەتی کورد بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی |
| بوغوس نوبار | سەرۆکی نوێنەرایەتی نەتەوەیی ئەرمەن |
| د.ئوهانیانیان | سەرۆکی کاتیی نوێنەرایەتی کۆماری ئەرمەن |

ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بو، هەڵوێستی نوێنەرانی هەردو گەلی لەکۆنفرەنسی ئاشتی داو لەناو دەوڵەتاندا بەهێز کرد. هاوپەیمانەکان بەخۆشیەوە ئەم هەواڵەیان وەرگرت، بەتایبەتی بەریتانیا. کیرزن ئاگاداری مەندوبی سامی کرد لەئەستەموڵ کە هانی ئەمە بدات.

بابیعالی هەروەها جوڵانەوەی کەمالی کە لەرۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا لەپەرەسەندن دابو ئەم هەنگاوەیان پێ ناخۆش بو. بەهاندانی مستەفا کەمال و لەژێر گوشاری لایەنگرەکانیدا چەندین بروسکەی نارەزایی لەلایەن سەرانی خێڵەکانی کوردەوە،

بەتایبەتی ئەوانەی لەتاوانی کوشتاری ئەرمەنیدا بەشداربون، لەکوردستانەوە دژی نوێنەرایەتی شەریف پاشاو رێکەوتنی ئەرمەنی- کورد نێردرا بۆ کۆنفرەنسی ئاشتیو بابیعالی.

### ٣/٢/٧ دانوستانی سیاسی: تێکچونی ریزەکانی کورد

ج ت ك کە هاوزەمان لەگەڵ ئەو چالاکیە گەرمەی لەمەیدانی پێوەندی ناو دەوڵەتاندا ئەی نواند، رێگەیەکی تریشی گرت بو" رێگەی گفتوگۆو دانوستانی سیاسی لەگەڵ بابیعالی بو دۆزینەوەی چارەیەك بۆ گیروگرفتی نەتەوەیی کورد.

دوای راگرتنی جەنگ کورد تەنیا نەتەوەی گەورە بو لەژێر دەستی حکومەتی تورکدا مابو. ئەی ویست هەرچۆنێ بێ ئەویش لەدەست نەدا، بەتایبەتی لەوکاتەدا سەرکردەکانی کورد کەوتبونە خەباتێکی سیاسی بەتین بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانی بزوتنەوەی کورد، زەمینەی(دولی)یش تارادەیەك بۆ ئەوە لەبار بو. بابیعالی ئەی ویست مەسەلەی کورد(تدویل) نەبێ بچێتە ناو کۆڕو کۆمەڵە جیهانیەکانەوە، بەڵکو هەوڵی ئەدا وەکو مەسەلەیەکی ناوخۆی تورکیا بمێنێتەوە. بۆ ئەنجامدانی ئەم سیاسەتە کەوتە مناوەرە. رۆژنامەکانی تورکیا وتاری بەسۆزیان ئەنوسی لەسەر پێویستی یەکێتیی هەردو گەلی موسڵمانو ئەو کوێرەوەرییەی بەسەر هەردوکیان دێ ئەگەر کورد لە دەوڵەتی عوسمانی جیا ببێتەوە.

بابیعالی کەوتە هەوڵ دان بۆ نزیك خستنەوەی هەندێ لەسەرکردەکانی کورد لەخۆیو، پلەو پایەی بەرزی پێ ئەسپاردن.

لە١ی حوزەیرانی ١٩١٩دا بابیعالی دەستەیەکی لەسەرکردەکانی جەمعییەتی تەعالی کوردستان بانگ کرد بۆ دانوستانی سیاسی لەگەڵ هەیئەتێکی وەزارەتی عوسمانی.[٥٨]

لەلایەن کوردەوە سەید عەبدولقادری شەمزینی، ئەمین عالی بەدرخان، موراد بەدرخان.[٥٩]

لەلایەن بابیعالیەوە شەیخ الاسلام ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری، ئەحمەد عبوق پاشا وەزیری ئیشغال، عەونی پاشا وزیری حەربیە، لەدانوستاندا بەشداربون.

لەپاش چەند کۆبونەوەی هاوبەش بابیعالی بەڵێنی بەدەستەی نوێنەرایەتی کورددا:

١.ئۆتۆنۆمی بدرێ بەکوردستان بەو مەرجەی لەجامیعەی عوسمانیدا بمێنێتەوە.

٢.رێوشوێنی کاریگەر دابنرێ بۆ راگەیاندنی ئەم سەربەخۆییە، دەسبەجێ دەس بکرێ بەجێبەجێ کردنی.[٦٠]

لەکاتی سەردانی سەدری اعظم فەرید پاشاو، وەزیری کاروباری دەرەوە تۆفیق پاشا بۆ پاریس، شەریف پاشا بەپێی بۆچونەکانی سەرکردایەتی جەمعیەت زنجیرەیەك گفتوگۆی لەگەڵ کردنو هەمان بەڵێنەکانی پێشویان بۆ ئەویش دوبارە کردەوە.

دواخستنی جێبەجێ کردنی ئەم گفتانە لەلایەن وەزارەتی فەرید پاشاوە. دەستی دەستی پێ کردنی وەزارەتەکەی دوای ئەویش بێ ئەوەی هەنگاوی جێبەجێ کردنی بنرێ، هەر لەسەرەتاوە گومانی لەراستیی نیازی کاربەدەستانی تورك لەدڵی سەرکردەکانی کوردا، بەتایبەتی لەدڵی سەید عەبدولقادرا دروست کرد. سەرکردەکانی کورد لایان وابو مەبەستی بابیعالی تەفرەدانی کوردە نەك دابین کردنی مافەکانی. چونکە لەوکاتەدا تا ئەهات مەترسی بزوتنەوەی کەمالییەکان زیادی ئەکرد، پێویستی حکومەتی ئەستەمولیش بە پشتیوانی کورد زیادی ئەکرد.

گفتوگۆی ج ت ك لەگەڵ بابیعالی بۆ سەلماندنی مافی ئۆتۆنۆمی کوردستان لەچوارچێوەی جامیعەی عوسمانیدا ناکۆکی لەریزی سەرکردایەتی جولانەوەی کوردا دروست کرد.

سەرکردەکانی بزوتنەوەی کورد بۆچونیان بۆ جۆری چارەسەرکردنی گیروگرفتی کورد جیاواز بو، هەندێکیان بە ئۆتۆنۆمی کوردستان لەچوارچێوەی جامیعەی عوسمانیدا رازی نەئەبون، ئەیان ویست کوردستان سەربەخۆ یا ئۆتۆنۆم بێ، جیاواز بێ لەدەولەتی عوسمانیو لەلایەن دەولەتێکی ئەوروپایی گەورەوە یارمەتی بدرێ. هەروەها بۆچونیان بۆ جۆری هەڵوێست لەتورك جیاواز بو، هەندێکیان لایان وابو کەئەبێ کەڵکی تەواو لەلاواز بونی حکومەتی تورك وەربگیرێ بۆ ئەوەی کورد خواستە نەتەوەییەکانی خۆی بسەپێنێو بە یەکجاری لەم دەولەتە زۆردارە جیا ببێتەوە، بۆ ئەوەش هەمو رێگەیەکی سیاسی، دیپلۆماسی، چەکدار بگیرێ. کەچی هەندێکی تریان لایەن وابو کەئەبێ کورد لەو تەنگانەیەدا گیروگرفت بۆ تورك دروست نەکاو یارمەتییان بدەن بۆ ئەوەی خۆیان لەو کوێرەوەرییە رزگار بکەن.

جیاوازی بۆچونە سیاسیەکان تێکەڵاو بو لەگەڵ جیاوازی دەسکەوتی تایبەتیو خێڵەکیو ناوچەیی، وەبو بەهۆی جیابونەوەی چەند کەسێ لەسەرکردەکانی ج ت كو دروست کردنی چەند رێکخراوی سیاسی نوێ. ئەمین عالی بەدرخان((جەمعییەتی تەشکیلاتی ئیجتیماعیە))ی دروست کرد. مەمدوح سەلیمو هاورێکانی((پارتی دیموکراتی کورد))یان پێك هێنا. ئەحمەد ثریا

بەدرخان لەقاهیرە((حیزبی استقلالی کوردستان))ی دامەزراند. ئەمانە هەر یەکە خۆی بەجیا لەوی تر کەوتە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتانو کۆڕە جیهانییەکان.

بابیعالی سەرکەوتنێکی باشی بەدەس هێنا لەتێکدانی ریزەکانی سەرکردایەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا. بەڵێنەکانیشی هەرگیز نەهێنایە دی.

سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد ئەستەمولی کردبوە مەڵبەندی چالاکییەکانی. گرنگییەکی تایبەتی نەدابو بەکوردستان. کوردستانی شمالی بوبو بەمەڵبەندی خۆرێکخستنەوەی کەمالییەکان. تەقەللاکەی شێخ مەحمود لەسلێمانی سەری نەگرت. کوردستانی جنوبی کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاو بەشی خواروی رۆژئاوای کوردستان کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسییەوە. لەبەشی سەروی رۆژهەڵاتی کوردستان سمکۆ خاوەن دەسەڵات بو. جەمعیەتو رێکخراوەکانی تر هەرچەندە هەوڵیاندا لق لەکوردستان بکەنەوە، بەڵام ئەو هەوڵانە لەئاستی پێویستیەکانی ئەو کاتەی بزوتنەوەی کوردا نەبو.

ج ت ك لەهەڵسەنگاندنی روداوەکاندا ئەبێ توشی ژور-هەڵسەنگاندنی سەڵتەنەتی عوسمانیو ژێر-هەڵسەنگاندنی بزوتنەوەی کەمالی بوبێ، بایەخی زۆری دابو بەخەلیفەو بابیعالی کەچی مستەفا کەمالو بزوتنەوەی کەمالی پشت گوێ خست بو. نەك هەر هەوڵی نەدا هیچ جۆرە لەیەك گەیشتنو گفتوگۆیەکی لەگەڵ دروست بکا، بەڵکو ئەوەندەی بۆی بکرایە دوژمنایەتی ئەکرد. سەرکردایەتی کورد لەسەرەتاوە گرەوی لەسەر حکومەتێکی دۆڕاوی بێ پاشەڕۆژ کردبو.

ج ت ك تەرکیزی کردبوە سەرکاری دیپلۆماسی، بەتایبەتی نوسینی یادداشت بۆ کاربەدەستانی هاوپەیمانەکانو پێوەندیو گفتوگۆ لەگەڵ ئەوان پشت ئەستور بەپرنسیپەکانی سەرۆك ویلسۆنو کاربەدەستانی بەریتانیو فەرەنسی. بەهیوای ئەوەبو ئەوان ئازادی بەکورد بدەن بێ ئەوەی خۆی مشورێکی راستەقینەی سازدانی سیاسیو چەکداری خەڵکی کوردستان بخوا. کوردستانی بەجێ هێشت بو بۆ مستەفا کەمال. کەمال پاشا لەوێوە هێزە چەکدارەکانی نوێ کردەوە، داودەزگا دەولیەتەکانی رێك خستەوە، رێو شوێنی هێشتنەوەی کوردستانی لەژێر دەستی تورکیاو، رێوشوێنی دەستگرتنەوەی بەسەر سەرانسەری تورکیادا دانا.

سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد، جگە لەبەڵێنی هاوپەیمانەکان، پشتیوانێکی جەماوەری فراوان، رێکخراوێکی سیاسی پتەو، داوودەزگایەکی دیپلۆماسی بەکار، یا دامەزراوێکی چەکداری نەبو، تا بتوانێ لەپاڵ تەقەللای دیپلۆماسیدا بۆ بەدەس هێنانی دانپیانانی دەولی بەمافی نەتەوەیی کوردا، تەقەللای سیاسیو

چەکداری جێبەجێ کردنی بدا لەکوردستاندا . سەید عەبدولقادر لەیەکێ لەدیدەنیەکانیدا، دان بەمەدا ئەنێ" کەئەگەر هاوپەیمانەکان هێزی تەواو تەرخان نەکەن بۆ جێبەجێ کردنی بەندەکانی پەیمانی ئاشتی دەربارەی مافی نەتەوەیی کورد، ئەوا کورد توشی هەلومەرجێکی دژوار ئەبێ. جەمعییەت هەر وەکو ئەوانەی نەبو، وەتەرکیزی کردبوە سەر کاری دیپلۆماسی، نەی توانی دەزگایەکی دیپلۆماسی هەمیشەیی دروست بکا بۆ ئەوەی بێ بچڕان شوێن خواستەکانی گەلی کورد بکەوێ لای رێکخراوە جیهانیەکانو دەوڵەتە زلەکانی ئەوروپا.

## ٨. رێ خۆشکردنی پێکهاتن

### ١/٨کۆبونەوەی سان ریمۆ

کێشەیەکی دژوار کەلەو ماوەیەدا لەسەری رێکەوتن، دابەشکردنی نەوتی کوردستان بو. بەر لەهەڵگیرسانی جەنگ حکومەتی تورکیا ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی کوردستانی دابو بە((کۆمپانیی نەوتی تورك)) کە ٧٥٪ی سەرمایەکەی بەریتانیو ٢٥٪ی ئاڵمانی بو. لەدوای هەڵگیرسانی جەنگ بەریتانیا دەستی بەسەر بەشەکەی ئاڵمانیاشدا گرتبو.

لەکانونی یەکەمی ١٩١٨دا لەو سەردانەدا کلیمانسو بۆ لەندەنی کرد، لەگەڵ لوید جۆرج رێك کەوت" ولایەتی موسل لەناوچەی نفوزی فەرەنسییەوە بگوێزرێتەوە ناوچەی نفوزی بەریتانی بەرامبەر گوێزانەوەی ولایەتی سوریا لەناوچەی نفوزی بەریتانیو تەرخان کردنی بەشی لەنەوتی کوردستان بۆ فەرەنسا. کلیمانسو، کاتێ ئەم سەودایەی کرد، نرخی نەوتی کوردستانی نەزانی بو.

لە١٨ نیسانی ١٩١٩دا بیرینگەر لەباتی فەرەنساو، والتەر لۆنگ لەباتی بەریتانیا رێکەوتنێکیان ئیمزا کرد دەربارەی دابەشکردنەوەی نەوتی کوردستان. بەپێی ئەم رێکەوتنە ٢٥٪ی، واتە بەشەکەی ئاڵمان کەئینگلیز دەستی بەسەرا گرت بو، درایە فەرەنسا. فەرەنسا ئەبو رێگا بدا لەئێرانو میزۆپۆتامیاوە بەپایپ لاین یاخود بەرێگای ئاسنین لەناوچەکانی ژێر مانداتی فەرەنسیەوە نەوت بۆ سەر دەریای سپی ناوەڕاست بگوێزرێتەوە.[٦١]

لە٢٤ی نیسانی ١٩٢٠دا کۆنفرەنسی ئاشتی لەسان ریمۆ کۆبوەوە بۆ دۆزینەوەی چارەیەکی ناوەنجی لەنێوان سەرەتای مافی داگیرکردنی ولاتان((حق الفتح))کە دەوڵەتانی ئەوروپی پێڕەوییان ئەکردو لەرێکەوتنە نهێنەکانی سەردەمی جەنگدا گونجاند بویان، وەسەرەتای مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی گەلان کەسەرۆك

ویلسۆن لەراگەیاندنەکەی سەردەمی جەنگدا گفتی دابو، وە لەکۆبونەوەکانی پاریسدا پێی لەسەر دائەگرت.

بۆ بەلادا خستنی ئەم ناکۆکیە، سەرەتایەکی نوێیان هێنایەکایەوە، ویلسۆنی سەرکۆماری ئەمریکاش پەسندی کرد، ئەویش سەرەتای((ماندات))بو، کە جۆرێ لە بەڕێوەبردن بو بۆ ئەو ولاتانەی لەسەر زەمینی دەوڵەتی عوسمانی دائەبڕانو بۆ ئەو موستەعمەرانەی لەئالمانیا ئەسێنرانەوە. ئەم سەرەتایە لەبەندی ٢٢ هەمی پەیمانی((کۆمەڵەی گەلان))دا چەسپێنرا. بەهانەی داهێنانی ماندات ئەوەبو، هێشتا ئەو گەلانە نەگەیشتونە قۆناغێکی پێشکەوتوی ئەوتۆ بەبێ یارمەتی دەوڵەتێکی گەورە((مانداتور))بتوانن خۆیان بەڕێوە ببەن. ئەبێ دەوڵەتی ماننداتور یارمەتی ماندات بدا بۆئەوەی بۆ پێشەوە بچێ تا بگاتە رادەی ئەوەی لێ وەشانەوەی بەڕێوەبردنی خۆیو سەربەخۆیی پەیدا بکا.

لەراستیدا ماندات جۆرێ بو لەگونجاندنی سەرەتای مافی داگیرکردن بەلام لەژێر ناوێکی تىرا. ئەمریکاش لەسەرەتادا دژی داگیر کردنی ئیمپریالیستی سەرزەمینی دابڕاوی عوسمانی بو، بەلام بەم سەرەتایە رازی بو، وەلەبەر گیروگرفتی ناوخۆی بەشێنەیی لەکۆبونەکانی کۆنفرەنسی ئاشتی ئەکشایەوە بەرەو گەڕانەوە بۆ گۆشەگیری دێرینە لەسیاسەتی دەرەوەیدا.

لەکۆبونەوەکانی سان ریمۆدا چەند کێشەی گرنگ بەلادا خران. سەلماندنی سەرەتای ماندات رێگەی تەخت کرد بۆ جێبەجێ کردنی رێکەوتنە نهێنیەکانی سەردەمی جەنگ. لەسەر دابەش کردنی دەسکەوتەکان پێك هاتن. ولایەتەکانی لوبنان، دیمەشق، حەلەب، ئەسکەندەرونە خرانە ژێر ماننداتی فەرەنسیو ولایەتەکانی موسل، بەغدا، بەسرا، فەلەستین خرانە ژێر ماندانی بەریتانیەوە.

ئەگەرچی ئەم بڕیارە ناڕەزایی زۆری لەولاتانی عەرەبیدا دروست کرد، بەلام بەکردەوە بەردی بناغەی دامەزرانی چەند دەوڵەتیکی عەرەبی دانا کە ئەبو لە پاشەڕۆژا سەربەخۆ بن. هەروەها ئاواتی سەهیۆنیەکانیشی هێنایە دی، چونکە دانانی فەلەستین لەژێر ماننداتی بەریتانیدا بەکردەوە بەڵێنەکەی بیلفۆری جێبەجێ ئەکرد.

### ٢/٨ پەیمانی سیڤەر

دابەشکردنەوەی ئەوتی کوردستانو دابەشکردنی ئەرزە داگیر کراوەکانی دەوڵەتی عوسمانی زۆر لەناکۆکیەکانی نێوان دەوڵەتە سەرکەوتوەکانی جەنگی بەلادا خستو رێی تەخت کرد بۆ ئەوەی کۆبونەوەکانیان ئیتر بەئەنجام بگا. لە١٠ی ئابی ١٩٢٠دا هاوپەیمانەکان لەلایەکو حکومەتی عوسمانی لەلایەکی ترەوە،

پەیمانی سیڤەریان ئیمزا کرد. بەگوێرەی ئەم پەیمانە تورکیا چوە ژێر باری گفتو بەڵێنی زۆر قورسەوە، وەکو لینچوفسکی کورتی کردۆتەوە:

١. بڕیاری ئەرزیی

أ. ئەرزە عەرەبیەکان. هەمو ئەرزە عەرەبیەکانی لێ بسێنرێتەوە. حیجاز ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. سوریا، فەلەستین، میزۆپۆتامیا لەژێر دەستی دەربهێنرێو چارەنوسیان بەدەوڵەتانی گەورە بسپێردرێ.

ب. تورکیای ئەورووپی. تراسی رۆژهەڵات تاخەتی شاتالجا هەروەها تراسی رۆژئاوا بدرێتە یۆنان. بەم پێیە ئەستەمول ئەکەوتە ٣٠ کیلۆمەتری سنوری یۆنانەوە.

ج. ئیزمیرو جزیرەکانی ئیجە. شاری ئیزمیرو دەوروبەری بۆ ماوەی پێنج ساڵ بسپێردرێ بەیۆنان، دوای ئەو ماوەیە بۆئەوەی بە یەکجاری بخرێتە سەری پرس بەبیروڕای گشتی دانیشتوان بکرێ. جزیرەکانی ئیمبروسو تەنەدۆس بخرێنە سەر یۆنان. جزیرەکانی دودکانزو جزیرەی ستراتیجی رودنیز بدرێنە ئیتالیا.

د. ئەرمینیا. سەربەخۆیی ئەرمینیا دانی پێدا بنرێو جیاکردنەوەی سنوری هەردو دەوڵەت بەحکومەتی ویلسۆن بسپێردرێ.

هـ. کوردستان. لەبەشی سێیەمی پەیمانی سیڤەردا ٣بەند بۆ کورد بەجۆرەی لای خوارەوە تەرخان کرابو:

بەند٦٢: کۆمیسیۆنێك کە لەئەستەمول لە٣ ئەندامو لەلایەن دەوڵەتەکانی بریتانیا، فرانسەو ئیتالیاوە دانرا بێت، لەدوا مێژوی بەجێهێنانی ئەم پەیمانە بەشەش مانگ موختارییەتێکی ناوچەیی ئامادە ئەکا بۆ ئەو جێگانە کە ئەکەوێتە رۆژهەڵاتی فوراتو جنوبی غەربی سنورێك کە لەدواییدا ئەکێشرێت بۆ ئەرمەنستانو شیمالی سنورێك کەتورکیا لەسوریەو میزۆپۆتامیا جیا ئەکاتەوەو نەژادی کوردی تیا زاڵ بێ، بەپێی تەعلیماتێك کە لەبەند... دا دراوە. لەکاتێکا کە لەلایەن هەندێ مەسائیلەوە لەئارادا پێکهاتن سەرنەگرێت، ئەندامەکانی کۆمیسیۆن هەر یەکە ئەبێ دەنگ لەحکومەتی خۆی بگێرێتەوە. ئەم جۆرە پێکهاتنە پێویستە رێ بدا بەدەرخستنی ئەوە کەنەژادە کەمەکانی قەومیو مەزەبی وەکو نەستوریەکانو ئەوانی تر کەلەم هەرێمەدا ئەژین بەتەواوی دڵنیا بن کە لەژێر باڵی ئەمینیو پارێزگاریدا ئەبن. بۆ ئەم مەبەستە کۆمیسیۆنێك لەئەندامانی بریتانیاو فەرەنسەو ئیتالیاو ئێرانو کورد ئەگەڕێت بۆ پشکنینو بڕیاردانی راست کردنەوە کە ئەگەر پێویست بو بکرێت لەو سنورانەدا کە بەپێی ئەم پەیمانە بۆ تورکیا دانراوەو ئەنوسێت بەسنوری ئێرانەوە.

بەند٦٣: حکومەتی عوسمانی لەم سەعاتەوە گفت ئەدا کە لەمێژوی راسپێریو پێ وتن بەخۆی تا ٣مانگ بەڵێنی بەجێهێنانی ئەو بڕیارانە بدا کە لەلایەن ئەو کۆمیسیۆنەوە رائەسپێررێت کە لەبەندی ٦٢ی سەرەوەدا باس کرا.

بەند٦٤: ئەگەر لەماوەی ساڵێك دوای مێژوی دەس پێ کران بە بەجێهێنانی ئەم پەیمانە، لەو هەرێمانەدا کە لەبەندی٦٢ ناو براوە، قەومی کورد مراجەعەت بەکۆمەڵی ئەقوام بکەنو تێیان بگەیەنن کەبەشی زۆری کوردە دانیشتوەکانی ئەم هەرێمە ئەیانەوێت لەتورکیا جیابنەوەو سەربەخۆ بن، وەلەحاڵێکا کە کۆمەڵی ئەقوام لەو باوەڕەدا بێ کەکوردەکان هەڵدەگرن سەربەخۆییان بدرێتیو راسپێری ئەمە بکا. تورکیا هەر لەئێستەوە بەڵێن ئەدا بەم راسپێرییەو بەدانی ئیستیقلال بەقەومی کوردو بەدەسهەڵگرتن لەهەمو حوقوقو ئەقالیدێکی کە بەسەر ئەم هەرێمانەوە هەیەتی. ئەم هاتنە خوارەوەی حکومەتی عوسمانی لەحوقوقو ئەقالیدی خۆی بەدوورودرێژی لەگفتوگۆیەکی تایبەتیداو لەبەینی هێزی سوێند خۆرەکانو تورکیادا باس ئەکرێ. دوای ئەم هاتنە خوارەوەیەش کە باسکرا، هیچ جۆرە بەرهەڵستێك ناخرێتە پێشەوە بەرامبەر بەمەیلی کوردەکانی ولایەتی موسل لەلایەن خستنی بەشی کوردستانی موسل بۆ سەر کوردستانی تورکیاو ئەو حکومەتی کوردە کەلێی دروست ئەکرێت[٦٢].

و. بوغازەکانو ئەستەمول. بوغازەکان بخرێنە ژێر سەرپەرشتی دەولییەوەو، ناوچەکانی دەورو پشتی چەك بکرێن. ئەستەمولّ لەژێر دەسەڵاتی تورکیدا بمێنێتەوە.

٢-تەحدیدی سیادەی تورکی

أ.کەم کردنەوەی ئۆردوی تورك. بکرێتە ٥٠ هەزار کەس. سەربازگیری هەڵبوەشێتەوە. ئەندازەی چەکی دیاری بکرێ. بخرێتە بن چاودێری پشکنەری هاوپەیمانان یا دەوڵەتانی بێلایەن. ئوستولّ نابێ لە ئەندازەیەکی دیاری کراو تێ بپەڕێ. هاوپەیمانەکان کۆمسیۆنێ دائەنێن بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارانە.

ب. بڕیاری دارایی. تورکیا بخرێتە بن چاودێری کۆمیسیۆنێکی تێکەڵاو لەنوێنەرانی بەریتانیاو، فەرەنسا، ئیتالیا، کەدەسەڵاتی تەواوی هەبێ بۆ کۆنترۆڵی قەرزی نیشتمانی، بودجەی حکومەت، دراو، قەرزی دەوڵەتی، ئیمتیازات، گومرگو باجی ناراستەوخۆ.

ج.کاپیتولاسیون. سەرەڕای مانەوەی رژێمی کاپیتولاسیون، هەندێ بەندی نوێی قورسی بخرێتە سەر.

د.کەمایەتیەکان. مافو ئیمتیازاتی کەمە نەتەوەییو دینیەکان، بەتایبەتی ئەرمەن، یۆنانی، ئاسوری، کلدانی، کوردو بەگشتی مەسیحیەکان بیسەلمێنێ.[٦٣]
هاوزەمان لەگەڵ پەیمانی سیڤەر، رێکەوتنێکی ٣ قۆڵی لەنێوان بەریتانیاو فەرەنسەو ئیتالیا کراو" تورکیای دابەش ئەکرد بەسەر ناوچەی نفوزی فەرەنسیو ئیتالیدا.
پەیمانی سیڤەر تورکیای ئەکردە دەوڵەتێکی بچوکی خاوەن سەربەخۆییەکی ناتەواوی بەستراوە. کەمالییەکان لەوکاتەدا، کەپەیمانی سیڤەری تێدا بەسترا، بوبونە هێزێکی گەورە. دەستیان بەسەر چەند ولایەتی ئەنەدۆڵدا گرت بو. هەر لەسەرەتاوە ئەو دەستەیەی نوێنەرایەتی حکومەتی ئەستەمولی ئەکرد ئەمان قبوڵیان نەبو. لەبەرئەوە پەیمانی سیڤەریان رەتکردەوە. بەڵکو کردیانە کەرەسەیەکی باش بۆ هاندانی نەتەوەی تورکو سازدانی بۆ((جەنگی سەربەخۆیی)).
دەرچونی روسیا لەجەنگ هەلێکی گەورەی بۆ مانی تورکیا رێك خست، چونکە هاوپەیمانەکان کە ئەیانویست بە ئەڵقەی ناسینی دەوڵەتانی سەرکەوتو گەمارۆی تورکیای تێشکاو بدەن، بۆئەوەی مەرجەکانی خۆیانی بەسەرا بسەپێنن، دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ویستەکەیان نە ئەتوانرا بەتەواوی بێتە دی. هاوپەیمانان ئەیان توانی ویستەکانی خۆیان لەئەستەمولٚ، بوغازەکان، ولایەتە عەرەبیەکان، بەشی خواروی ئەنەدۆڵ، کە لەژێر دەستی خۆیان دابون، بسەپێنن. بەڵام ناوەراستی ئەنەدۆڵو خواروی رۆژهەڵاتی ئازاد بون لەگوشاری دەرەکی. لەباتی روسیای قەیسەری دوژمنی دێرینەی تورکیا، یەکێتی سۆڤیەتی شۆرشگێری دوژمنی سەرسەختی دەوڵەتانی ئیمپریالیستی جێگەی گرتبوەوە، کەدەستی لەهەمو دەسکەوتەکانی خۆی لەتورکیاو ئێران هەڵگرت بو، هاوکاری تورکیای کەمالی ئەکرد. مستەفا کەمال لەوێوە کەوتە خۆ ئامادەکردنو لەوێوە پەیمانی سیڤەری پوچ کردەوە.

### ٩. مستەفا کەمال، پاشای کوردستان

هاوزەمان لەگەڵ هەوڵی سەرکردەو گەورە پیاوەکانی کورد لەئەستەمولٚ، سلێمانی، ورمێ، پاریس، قاهیرە بۆ دروست کردنی کوردستانی سەربەخۆ، مصطفی کمال لەکوردستانەوە کەوتە هەوڵی دامەزراندنی تورکیای نوێو پەکخستنی تەقەللاکانی نەتەوەیی کورد.
لەمایسی ١٩١٩دا مستەفا کەمال بەرەزامەندی سوڵتان وحیدالدین لەلایەن بابیعالیەوە دانرا بەپشکنەری گشتی ئۆردوی سێیەم لەرۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵ. کەمال

پلانێکی گەورەی بەدەستەوەبو بۆ هەڵساندنەوەی تورکیای تێکشکاو، دەسگرتن بەسەر هێزە چەکدارەکانی تورکیا، رێ نەدان بە لەدەس دانی هیچ پارچە ئەرزێکی تری ژێردەستی تورکیا، بەگژاچونی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوەیی کوردو ئەرمەن، دەرکردنی هێزە داگیرکەرەکانی یۆنانی، فەرەنسی، ئیتالی، بەریتانی.

مستەفا کەمال بێ ئەوەی گوێ بداتە فەرمانی بانگکردنەوەی بۆ ئەستەمول و دوایی لێخستنیو ئنجا حکوم دانی بەئیعدام، هەوڵیدا پاشماوەی هێزەکانی تورکیا بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە. هێرشێکی فراوانی پڕوپاگاندەی دەس پێ کرد بۆ ژیاندنەوەی گیانی نەتەوە پەرستیی تورك.

مستەفا کەمال ئەبو بۆ ئەنجام دانی پلانەکەی ناوچەیەك بکاتە مەڵبەندی کاری خۆی کە لەژێر دەستی هێزەکانی تورك خۆی دابێ، لەدەسەلاتی هێزی هاوپەیمانەکانەوە دور بێ، لەروسیاوە نزیك بێ کەئەویش لەگەڵ دەوڵەتانی ئیمپریالیستی ئەوروپادا لەناکۆکی دابو، ئەو مەڵبەندەش کوردستانی شیمالی بو لەدوای کشانەوەی سوپای روسی کەوت بوەوە ژێر دەستی تورك. مستەفا کەمال خۆی بیرەوەریەکانی ئەو دەمی ئەگێڕێتەوە:

((لە١٩ی مایسی ١٩١٩دا لەمینای سامسۆن دابەزیم. دۆخی وڵات بەم جۆرەبو: لەهەمو مەیدانەکانی جەنگدا ئۆردوی عوسمانی تێك شکێنرابو. ئاگربڕی بەچەند مەرجێکی سەخت ئیمزا کردبو. سوڵتانی لێخراو وحیدالدین بۆ رێگەیەك ئەگەڕا خۆیو تەختەکەی رزگار بکا. ئەو وەزارەتەی فەرید پاشا سەرۆکایەتی ئەکرد کەساس بو. ئازا نەبو. وڵات بوبوە تالانی داگیرکردنی فەرەنسی، ئینگلیزی، یۆنانی، ئیتالی. تاقمە نە موسڵمانەکان بەگەرمی لەچالاکیدا بون بەهەمو رێگایەك بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستە تایبەتیەکانی خۆیانو پەلەیان لەروخانی ئیمپراتۆرییەت ئەکرد.. رێکخراوێکی یۆنانیەکان بەناوی ماودیمیا چەتەی دائەمەزراند...

بەلام لەرۆژهەلات یەکێتییەك دامەزرا بۆ پاراستنی مافی نیشتمانیی ولایەتەکانی رۆژهەلات لەئەرزرۆمو ئەلعەزیز، ناوەندەکەی لەئەستەمول بو. ئامانجی یەکێتی پارێزگاری مافی موسڵمانان بو لەو ولایەتانەدا. لقی ئەرزرۆم بەگەرمی کاری ئەکرد بۆئەوەی بۆ دنیای رون بکاتەوە کە خەڵك لەدوای کۆچی ئەرمەن هیچ دەسدرێژییەکیان نەکردوە، دارایی ئەرمەنیەکانیان پاراستوە تا داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن روسەوە. کۆمیتەی پارێزگاری لەئەرزرۆم پاش لێکۆڵینەوەی مەسەلەی تورکی، مەسەلەی کوردیو مەسەلەی ئەرمەنی لەروی

زانستی‌و مێژووییه‌وه بڕیاریدا تێکۆشانی خۆی له پاشەڕۆژا تەرخان بکا بۆ ئەم نوقتانه:

١.کۆچ نه‌کردن له‌هیچ هه‌لومه‌رجێکا.

٢.دروست کردنی ڕێکخستنی زانستی، ئابوری، دینیی به‌زوبی.

٣.یه‌ککرتن بۆ پاراستنی بچوکترین به‌شی ولایه‌ته‌کانی ڕۆژهه‌ڵات که له‌وانه‌یه لێی جیابکرێته‌وه.

ناوه‌ندی کۆمیته‌ی پارێزگاری خۆش بین بون به‌و سه‌رکه‌وتنه‌ی له‌ڕێگه‌ی بزواندنی هه‌ستی دینییه‌وه به‌ده‌ستیان هێنابو. پێ ئه‌چێ ترسی لکاندنی ولایه‌ته‌کانی ڕۆژهه‌ڵات به‌ئه‌رمینیاوه هۆی دروست بونی ئه‌م کۆمیتانه بوبێ. مه‌ترسییه‌کی تریش هه‌بو سه‌رچاوه‌که‌ی یۆنانیه‌کان بو...ڕێکخراوو ده‌زگای تریش له‌سه‌ر شانۆ ده‌رکه‌وتن. له‌ولایه‌ته‌کانی دیاربه‌کرو بتلیس‌و ئه‌لعه‌زیزو ئه‌وانی تر کۆمه‌ڵی هۆشیاری‌و ژیانه‌وه‌ی کورد په‌یدابو که‌ناوه‌ندی سه‌رکردایه‌تیه‌که‌ی له‌ئه‌سته‌موڵ بو. ئامانجی ئه‌م کۆمه‌ڵه دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌تی کوردی بو له‌ژێرسه‌رپه‌رشتی بێگانه‌دا. له‌قونیه‌ش کۆمه‌ڵه‌ی ژیانه‌وه‌ی ئیسلام هه‌بو. یه‌کێ له‌کۆمه‌ڵه گرنگه‌کان کۆمه‌ڵه‌ی دۆستانی ئینگلستان بو...

له‌هه‌لومه‌رجێکی وه‌هادا ئه‌توانرێ ته‌نها یه‌ك بڕیار بدرێ ئه‌ویش دروست کردنی ده‌وڵه‌تی تورکیای نوێیه، چونکه کارکردن بۆ مانه‌وه‌ی ئیمپراتۆرییه‌تی عوسمانی داته‌پیو ئه‌بو به‌هۆی سزادانی ناڕه‌وای گه‌لی تورك.

له‌و نامه‌یه‌دا که به‌چیفره له‌١٨ی حوزه‌یرانی١٩١٩دا بۆ جه‌عفه‌ر ته‌یار به‌گی سه‌رکرده‌ی ئۆردوی یه‌که‌م له‌ئه‌درنه‌م نارد، وت بوم: تۆ ئه‌زانی ده‌وڵه‌تانی گه‌وره‌ی هاوپه‌یمان که‌سه‌ربه‌خۆیی نیشتمانیمان ئه‌خنکێنن چی ئه‌که‌ن... هه‌روه‌ها ملکه‌چی حکومه‌ته‌که‌ی ئێمه‌و گوێ پێ نه‌دانی. بڕیارم داوه ئه‌نه‌دۆڵ به‌جێ نه‌هێڵم. بۆ به‌رزکردنه‌وه‌ی وره له‌تراقیه له‌بروسکه‌که‌دا ئه‌وه‌شم نوسی بو: به‌سه‌رکه‌وتویی به‌ره‌نگاری ئه‌و پروپاگه‌نده‌یه کرا که‌بۆ دامه‌زراندنی کوردستانی سه‌ربه‌خۆ ئه‌کرا، لایه‌نگرانی ئه‌م جوڵانه‌وه‌یه بڵاوه‌یان لێ کرد. کورد هاتنه پاڵ تورك.))[٦٤]

یه‌که‌مین کۆنگره‌ی که‌مالیه‌کان له‌ڕۆژانی ٢٣ی ته‌موز تا ٧ی ئابی ١٩١٩ له‌شاری ئه‌رزروم به‌سترا. جگه له‌کۆمیته‌کانی پارێزگاری مافی ولایه‌ته‌کانی ڕۆژهه‌ڵات، ژماره‌یه‌ك له‌گه‌وره پیاوه‌کانی کورد به‌تایبه‌تی سه‌رۆکی عه‌شیره‌ت‌و شێخه‌کانی به‌شداری کاریگه‌ریان تێدا کرد. که‌مال خۆی نامه‌ی بۆ هه‌ندێکیان

ئەنوسیو هەستی ئیسلامەتی ئەبزواندنو هانی ئەدان لەمەترسی ئەرمەنی.
کۆنگرەی ئەرزروم بڕیاری دابو:
((ولایەتەکانی ئەرزروم، سیواس، دیاربەکر، خەرپوت، وان، بتلیس... یەکەیەکی پێکەوە بەستراون بەهیچ بەهانەیەك لەدابەش کردنو جیاکردنەوە نایەت لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی... موسڵمانانی. ئەم ناوچانە جیاوازی رەگەزو کۆمەڵایەتی ئەو تاقمە موسڵمانانە رەچاو ئەکا کە هەمویان نەتەوەیەك پێك ئەهێنن، هەمویان خۆیان وا دائەنێن کە لەیەك دایكو باوك کەوتونەتەوە.))
کۆنگرێسی سیواس(٤-١١ئەیلول) سەرەتاکانی لەکۆنگرێسی ئەرزرومدا بڕیاریان لێ درا بوو قوڵ تر، وە زۆرتر بەگیانی نەتەوە پەرستی توركی دوبارە کردەوە، لەرۆژانی ئەم کۆبونەوانەدا مێجەر نوئیل هاورێ لەگەڵ جەلادەتو کامەران بەدرخانو ئەکرم جەمیل پاشا لەگەشتە درێژەکەیاندا گەیشت بونە مەلاتیە. ئەم گەشتە پەژارەیەکی زۆری بۆ مستەفا کەمال دروست کرد. ئەترسا لەراپەرینی کورد. فەرمانی گرتنی دەرکردن. بەڵام لەبەر ئەوەی هێشتا بەتەواوی جێگیر نەبو بو کاربەدەستانی ئەوێ بەبیانوی جۆراوجۆر فەرمانەکەیان جێبەجێ نەکردو، نوئیلو هاورێکانی هەڵاتن بۆ حەڵەب. مەستەفا کەمال فەرمانی دەرکرد بۆ هەمو کاربەدەستانی تورك لەکوردستان کە لقەکانی جەمعییەتی تەعالی کوردستانو رێکخراوە کوردیەکانی تر دابخەنو بەتوندی بەربەرەکانی هەمو چالاکیەکی نەتەوەیی کورد بکەن.
((ئەنەدۆڵو رۆم ئێلی مودافەعەی حقوق جەمعیەتی)) بەکردەوە بو بوە بزوتنەوەیەکی سیاسی بەهێز. لە٢٣ی نیسانی ١٩٢٠دا یەکەمین کۆبونەوەی ئەنجومەنی نەتەوەیی گەورە لەئەنقەرە کرا. ئەنقەرە ئەوسا شارێکی بچوك بو. لەم ئەنجومەنەدا چەندین نوێنەری پارلەمانی عوسمانیو هیتر بەشدار بون. دەسەڵاتی حکومەتەکەی سوڵتانی پشت گوێ خستو رای گەیاند حکومەتی ئەستەمۆڵ دیلێکی کەساسی هاوپەیمانەکانە ناتوانێ هیچ بڕیارێ بەقازانجی تورکیا بدات زۆرتر تاقمێ لەنوێنەرە نەتەوە پەرستەکانی ناو پەرلەمانی عوسمانی لەئەستەمۆڵ پرۆگرامێکی ٦ بابەتییان لە٢٨ی کانونی دوەمی ١٩٢٠دا دانابو، ئەنجومەنی ئەنقەرە بە((پەیمانی نەتەوەیی))دانا.
ئەگەرچی لەوکاتەدا مەسەلەی کورد لەتورکیا بوبو بە یەکێ لەمەسەلە گرنگەکانی تورکیاو، کەوتبوە ناو کۆرە دەولیەکانەوە، بەڵام لەپەیمانی نەتەوەیی تورکا مەسەلەی نەتەوەیی کورد بەتەواوی پشت گوێ خرابو. لەمادەی پێنجەمیدا باسی رێزگرتنی مافی کەمایەتییەکانی کردبو بەو مەرجەی دەوڵەتانی دراوسێ

بەهەمان چەشن رەفتار لەگەڵ کەمایەتییە موسڵمانەکان بکەن. لەمەش مەبەستیان کەمایەتی دینی بو نەك نەتەوەیی.

مستەفا کەمال بۆ جێبەجێ کردنی پەیمانی نەتەوەیی کەوتە کاری جەنگو دیپلۆماسی. ئەفسەرە گەورەکانی سوپا هاودەنگ بون لەگەڵی، دەستی گرت بو بەسەر هێزەکانی لەرۆژهەڵاتی ئەنەدۆڵدا کە یەکێکیان ئۆردوی نۆیەمی قافقاس بو، بەناوبانگ ترین هێزی تورك کە لەجەنگا شکستی نەخواردبو. ئەم هێزانەی بەدیلەکانی جەنگ کە لەروسیا گیرا بونو دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئازاد کران، وە بەو ١٣٠ هەزار دیلەی دوای پەیمانی سیڤەر هاوپەیمانەکان ئازادیان کردن، بەهێز کردەوە. کەمال ئۆردویەکی نوێی لێ رێك خستنەوە. روسیای سۆڤێتیش بەشێکی پێویستیەکانی چەكو تفاقی جەنگیی بۆ دابین کردن. بەگیانی نیشتمان پەروەریو نەتەوە پەرستی بۆ جەنگی سەربەخۆیی تورکیا پەروەردەیٔ کردن.

ئۆردوی نوێی تورك ئەبو بەرەنگاری ٥ دوژمنی دەرەکی رابوەستێ" ئەرمەن لەرۆژهەڵات، فەرەنسا لەسیلیسیا، ئیتالیا لە ئەدالیا، یۆنان لەئیزمیر، بەریتانیا لەئەستەمول.

یەکەمین کاری جەنگی لەسەرەتای ١٩٢٠دا دژی هێزی فەرەنسی لەسیلیسیا دەستی پێ کرد، لەبەهارا توانی دەریان بکا بۆ حەڵەب. فەرەنسا لەوکاتەدا لەکۆبونەوەی سان ڕیمۆدا تەقەللای ئەدا حەلەبو ئەسکەندەرونەو دیمەشقو لوبنان بکەوێتە ژێردەستیو، ئەی ویست خۆی لەسوریا بچەسپێنێ لەبەرئەوە ئەبو کۆتایی بەشەڕ بهێنێ لەگەڵ مصطفی کمال. لە ٣٠ی مایسی ١٩٢٠دا لەئەنقەرە رێکەوتنی ئاگربڕ لەبەینی هەردولادا ئیمزاکرا.

کەمال خەمی فەرەنسای نەما. توانی هێزەکانی خۆی لەجەبهەی ئەرمەنی کۆبکاتەوە. پەیمانی سیڤەر ولایەتەکانی ئەرابزون، ئەرزرۆم، موش، وان...ی دابو بەجمهوریەتی ئەرمەنی کەتازە لەئەریڤان دامەزرا بو. دەسەڵات درابوە سەرۆك ویلسۆن سنوری نێوان تورکیاو ئەرمینیا جیا بکاتەوە. هێزەکانی تورك، کەبەشێکی گەورەی لەکورد پێکهاتبو، بەسەرکردایەتی جەنەراڵ کاظم قەرەبەکر کەوتە پێشڕەوی بەرەو ئەرمەنستان. لەتشرینی دوەمی ١٩٢٠دا قارسی گرت. لەهەمان کاتدا هێزی سۆڤێت هەڵی کوتایە سەر ئەریڤانو گرتی. بەپێی رێکەوتنی ئەلیکسەندەر پول لە٣ی کانونی یەکەمی ١٩٢٠دا، تورکیا قارسو ئەردەهانی وەرگرتەوە بەڵام باتومی لەدەسدا. ئاواتی ئەرمەنیەکان کە هەندێکی لەپەیمانی سیڤەردا دانی پیانرا بو لەچاڵ نرا.

بەجۆرە لەکۆتایی ۱۹۲۰دا مستەفا کەمال مەترسی فەرەنسی‌و ئەرمەنی بەلادا خست‌و کەوتە دانانی پلانی جەنگیی دەرکردنی یۆنانیەکان لەناوچە داگیر کراوەکانی تورکیا.

لەپاڵ ئەم سەرکەوتنە جەنگییانەدا کەمال ۳سەرکەوتنی دیپلۆماسی بەدەس هێنا:

۱. لە۱۳ی مارتی ۱۹۲۱ پەیمانێکی لەگەڵ ئیتالیا بەست. ئیتالیا گفتیدا ئەنەدۆڵ چۆڵ بکا بەرامبەر بەچەند ئیمتیازی ئابوری. لەحوزەیراندا هێزی ئیتالی لەخاکی تورکیا کشایەوە.

۲. لە۱٦ی مارتی ۱۹۲۱دا پەیمانی دۆستایەتی‌و هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیت مۆرکرد. کێشەکانی سنوری لابەلا کرد. تورکیا رازی بو باتوم لەدەس روسیادا بمێنێتەوە، لەبەرامبەر ئەوەدا روسیاش دانی‌نا بەدەسەلاتی تورکیادا بەسەر قارس‌و ئەردەهاندا هەردولا گفتیان بەیەکتری‌دا هاوکاری سیاسی بکەن دژی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا، هاوئاهەنگی جەنگیی لەگەڵ یەکتری بکەن.

روس بەردەوام چەك‌و تفاقی جەنگی ئەدا بە کەمالیەکان.

۳. لە۲۰ی تشرینی یەکەمی ۱۹۲۱دا رێکەوتنێکی لەگەڵ فەرەنسا ئیمزا کرد. لەبەرامبەر چەند ئیمتیازی ئابوری باشدا فەرەنسە بەڵێنی‌دا سیلیسیا چۆڵ بکا. هۆی ئەمەش ناکۆکی قازانجی فەرەنسی‌و ئینگلیزی بو. پشتیوانی بەریتانی لەپێشڕەوی یۆنان ئەبوە هۆی بەهێز بونی دەسەلاتی بەریتانی لەدەریای ئیجەداو لەئەنجامدا دەسەلاتی بەریتانی بەسەر بوغازەکاندا[٦٥] ئەمەش لەگەڵ قازانجی فەرەنسا نە ئەگونجا، لەبەرئەوە فەرەنسا هێزەکانی خۆی لەتورکیا کێشایەوە بۆ ئەوەی مستەفا کەمال بتوانێ درێژە بەجەنگ بدا دژی یۆنان.

بەگوێرەی ئەم پەیمانە هێڵی جیا کردنەوەی سنوری تورکی‌و دەسەلاتی فەرەنسی دیاری کرا. لەئەنجامی ئەمەدا هەندێ پارچەی لەیەك دابڕاوی کوردستان‌و بەشێکی گەلی کورد کەوتە ژێر دەسەلاتی فەرەنسیەوە، کەدوایی بۆ دەوڵەتی سوریا مانەوە.

مستەفا کەمال دوای ئەوەی یارمەتی سۆڤێتی‌و بێلایەنی فەرەنسی‌و ئیتالی تەئمین کرد، هەمو تواناى خۆی تەرخان کرد بۆ جەنگی یۆنان. لەوکاتەدا کەتورك لەجەبهەی ئەرمەنی خەریکی شەڕبون، هەندێ ناوچەی تری تورکیایان گرت بو. لەمارتی ۱۹۲۱دا هێرشی یۆنانی دەستی پێ کردەوە. چەند شوێنێکی تریان

گرتو لەئەنقەرەی پایتەختی کەمال نزیك کەوتنەوە. پێکدادانە خوێناویەکانی سەر روباری سەخاریا لەئابەوە تا ئەیلول بەقازانجی تورك شکایەوە. لەپاش زنجیرەیەك تێکهەڵچونی سەخت هێزەکانی یۆنان بەتێشکاوی ناچاربون بەرەو دەریای سپی بکشێنەوە.

مستەفا دەستی گرت بەسەر بەشی گەورەی تورکیاو کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ ئازادکردنی ئەستەمول. لەدوای شکانی یۆنانو هەڕەشەی کەمال لەئەستەمول، سەرۆوەزیرانی بەریتانی، لوید جۆرج، داوای لەهاوپەیمانەکانی کرد بوغازەکان بپارێزن. فەرەنساو ئیتالیا، هەردوکیان لەگەڵ کەمالیەکان رێك کەوت بون، لەبەرئەوە وەڵامی سەلبییان دایەوە. هێزی بەریتانی خۆی بەتەنیا لەکەناری ئاسیایی دەردەنیل دابەزی. هێزی تورکیو هێزی بەریتانی بەرامبەر یەك راوەستا بون. بەڵام لەباتی ئەوەی ئەمە شەڕی لێ هەڵ بگیرسێ، لە۱۱ی تشرینی یەکەمدا رێکەوتنی مودانیای لێ سەوزبو. رێکەوتنەکە کۆتایی بەگرژی هێنا. تراقیای رۆژهەڵاتو ئەدریانوپولی ئەگێرایەوە بۆ تورکیا بەرامبەر بەسەلماندنی کۆنترۆڵی دەولی بەسەر بوغازەکاندا.

سەرکەوتنەکانی مستەفا کەمال گیانی لەپەیمانی سیڤەر کێشا. لەلایەکەوە روسیای دوژمنی دێرینەی تورك ئەی ویست تورکیای نوێ بهێنێو بەهێز بێ بۆئەوەی خۆی لەبەر گوشاری دەوڵەتانی ئیمپریالیستی دوژمنی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا رابگرێو ببێتە ناوچەی لەمپەری نێوان هەردولا، لەلاکەی تریشەوە دەوڵەتانی هاوپەیمان ئەیان ویست تورکیا بهێنێو بەهێزبێ بۆ ئەوەی لافاوی کۆمۆنیزم رای نەماڵێ. تا ئەهات زیاتر زەمینەی دەولی پەیمانێکی نوێی ئاشتی، لەباتی پەیمانی سیڤەر، خۆش ئەبو.

لە۲۰ی تشرینی دوەمی ۱۹۲۲دا کۆنفرەنسی ئاشتی سەر لەنوێ، ئەمجارەیان بەئامادە بونی عصمت پاشای نوێنەری تورکیای نوێ، لەلۆزان بەسترا. ئەم روداوە خۆی لەخۆیا بەڵگەی دان نانی هاوپەیمانەکان بو بە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی سیڤەرو، بەحکومەتی تورکیای کەمالیو، بەئامادەیی بۆ بەستنی پەیمانێکی ئاشتی نوێ.

کاتێ کە هێزی کەمالیەکان لە ئەستەمولٚ نزیك کەوتەوە چەند مانگ بو چالاکی سیاسی جەمعییەتی تەعالی کوردستانو رێکخراوە کوردییەکانی تر کز بوبو. هەندێ لە ئەندامەکانی هەڵات بون بۆ ئەملاو ئەولاو هەندێکی تریان

دەستیان لەکاری سیاسی هەڵ گرت بو. لەکۆبونـەوەکانی لـۆزاندا سـەرکردەکانی بزوتنەوەی کورد لە ئەستەمول، وەئـەو دەسـتەیەی نوێنەرایـەتی بەسـەرۆکایەتی شەریف پاشـا لـەپاریس بـو، هـیچ جـۆرە چـالاکیەکیان نەنوانـد. کەسـێ نـەبو خواستەکانی کورد لەلۆزان بهێنێتەوە پێشەوە. بەڵکو بەپێچـەوانە عصـمت پاشـا چەند کوردێکی لەگەڵ خۆی بردبو بۆ لۆزان بۆئەوەی بەهاوپەیمانەکانی بسەلمێنێ" کورد جیابونەوە یا مافی نەتەوەیی ناوێو، ئەیەوێ لەگەڵ تورکیا بمێنێتەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم

[1] لینچوفسکی، تاریخ خاورمیانه، ترجمه د. هادی جزایری، تهران: اقبال، تیرماه ۱۳۳۷ش، ص ٤٨ ئەم کتێبە کراوەتە عەرەبیش بڕوانە: جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤون العالمية، ترجمة جعفر خياط، بغداد دارالكشاف، بلا.

[2] هـ ج

[3] هـ ج

[4] هـ س، ل٥٣-٥٤

[5] احمد کسروی، تاریخ هیجده ساله آذربایجان، ج۲، چ۹، تهران: امیر کبیر، ۲۵۳۷، ص۶۰۰" علی دهقان، رضائیه یا سرزمین زردشت، تهران: ابن سینا، اسفند۱۳٤۸ش، ص٤٦٣.

[6] بۆ تەواوی بەیانەکەی مود بڕوانە: عبدالرزاق الحسني، تاريخ العراق السياسي الحديث، ج۱، ط٦، بيروت: مطبعه دار الكتب، ۱۹۸۳، ص١١٤-١١٥.

[7] بۆ زانیاری زۆرتر دەربارەی ڕۆژنامەی((تێگەیشتنی ڕاستی)) بڕوانە: د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی‌و شوێنی لەڕۆژنامەنوسی کوردیدا، بەغداد:کۆڕی زانیاری کورد، ۱۹۷۸.

[8] هورەویتز، دیپلۆماسی لەڕۆژهەڵاتی نزیك‌و ناوەڕاستدا، ب۲، ل۱۳-۱٤((ئینگلیزی)).

[9] لینچوفسکی، س، ن، ل٦٠.

[10] هـ، س، ل٥٨.

[11] دانیال متی، ((رویدادهای ارومیه‌و کردستان شمالی-دسامبەر ۱۹۱۷ تا ژوئیه۱۹۱۸ در ارشیوهای نظامی فرانسه)) مجله مطالعت کردی. دراسات كردية، ش۱، پاریس: مرکز تحقیقات انستیتو کرد، کانونی دوەمی ۱۹۸٤، ص٤٦.

[12] هـ س، ل٥٣.

[13] الحسني، س ن، ل٨٥.

[14] دهقان، س ن، ل٥١١.

[15] بۆ نمونە بڕوانە شیعرەکانی مەلا حەمدون، مەلا عارفی صائیب‌و مەلا کەریمی ناطیق لە: د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژوی ئەدەبی کوردی‌یەوە، بەغداد، ۱۹۸٤، ل١٥١-١٥٧.

[16] دەربارەی پەیوەندی عبدالرزاق بەدرخان لەگەڵ روس بڕوانە: جليلي جليل، نهضة الاكراد الثقافية... ترجمة باقي نازي، بيروت، ۱۹۸٦، ص١٦١-١٨٩" اسماعيل حقى شاوەيس،((میر عبدالرزاق بەدرخان))، گۆڤاری ڕۆژی نوێ، ژ۷، سلێمانی: تشرینی یەکەمی ۱۹٦۰، ل٥٠-٥٣.

[17] ف. نیکیتین، العائلة البارزانية، ترجمة د. كاوس قفطان، مجلة شمس كردستان، ع٥، س۲، بغداد، اب ۱۹۷۳، ص١٩-٢٢" مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية، انتفاضه بارزان الاولى،۱۹۳۱-۱۹۳۲، مطبعة خەبات، ۱۹۸٦، ص٢١-٢٢.

[18] دەربارەی مەلا سەلیم‌و ڕاپەڕینەکەی بتلیس بڕوانە: اسماعیل حقی شاوەیس،((مەلا سەلیم ئەفەندی))، گۆڤاری ڕۆژی نوێ، ژ۸، سلێمانی: تشرینی دوەمی ۱۹٦۰، ل٢١-٢٨.

[19] بۆ تەقەلاكانی شەریف پاشا لەگەڵ ئینگلیز بڕوانە: درایڤەر، کوردو کورستان، ١٩١٩، ل٧٧-٧٩((ئینگلیزی))" مس بیل، فصول من تاریخ العراق القریب، ترجمة جعفر خیاط، طبعة بیروت.
[20] متی، س ن، ل٣٥.
[21] ڤاسیلی نیکیتین، کردو کوردستان، ترجمه محمد قاضی، تهران: نیلوفر، ١٣٦٦، ص٤١٦.
[22] متی، س ن، ل٣٧.
[23] ه ج
[24] د. محمد جواد شیخ الاسلامی، سیمای احمد شاه قاجار، ج١، تهران: گفتار، ١٣٦٨، ص٤٢٢-٤٢٤.
[25] هورەویتز، س ن، ل٧.
[26] ه س، ل١٨-٢٣.
[27] ه س، ل٣١-٣٣
[28] ه س، ل٣٤-٣٥.
[29] بۆ نمونە هەڵسەنگاندنی کاری ئیجابی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەسەر مەسەلەی کورد بڕوانە: د. سەید عزیز شەمزینی الحرکة القومیة التحرریة للشعب الکردي، منشورات الاوك، ١٩٨٦، ص ٧٧" جلال طالبانی کردستان والحرکة القومیة الکردیة، بیروت: دار الطلعیة، ١٩٧١" د. عبدالرحمن قاسملو، کوردو کورستان، وەرگێڕانی عبدالله حسن زادە، بنکەی پێشەوا" د. کمال احمد مظهر، ((ئوکتوبەرو مەسەلەی کورد)) گۆڤاری برایەتی، ژ ٩، س١، خولی ٢، بەغداد، سەرەتای کانونی یەکەمی ١٩٧٠، ل٤-٢١.
[30] رفیق حلمی، یادداشت بەشی یەکەم، چاپکردنەوەی محمدی، ل٥١.
[31] ڕەنگە لەهەمو کەس باشتر محەمەد ئەمین زەکی لەسەر ئەمەی نوسی بێ، بڕوانە: محەمەد ئەمین زەکی کوردو کوردستان، چاپکردنەوەی سیدیان، ل٢٤٥-٢٥١" هەروەها: رفیق حلمی، یادداشت، بەشی یەکەم، چاپکردنەوەی محەمەد، ل ٢٥-٣٣" د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لەساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا، بەغداد: کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٥" شەمزینی ، س ن، ل٧٥.
[32] شەمزینی ل٧٥، ئەویش رای گوێزاوە لە: عبدالعزیز یاملکی، کردستان وکرد اختلاللری، تهران، ١٩٤٦، ص٦٢.
[33] نیکیتین کرد... س ن. ل٤١٧: ئەمین زەکی، س ن، ل٢٤٨: شەمزینی س ن، ل٧٥.
[34] امین زکی، س ن، ل ٢٥١
[35] شەمزینی، س ن، ل٧٥.
[36] الحسنی، س ن، ج١، ل٧٢.
[37] هـ س، ل٧٦.
[38] هورەویتز، س ن، ل٣٦-٣٧.

[39] دەربارەی ئەم قۆناغەی خەباتی کورد بڕوانە زنجیرە وتارەکانی: د. احمد عوسمان ابوبکر، کردستان فی عهد السلام، گوڤاری((الثقافة الجدیدة))ی بەغدادی، ژمارەکانی ساڵانی ١٩٧٩-١٩٨٤. نوسەر لەم وتارانەدا پشتی بەستوە بە دوکومینتە بڵاوکراوەکانی ئارشیفەکانی بەریتانیا. لەهەندێ شوێنی ئەم باسەدا کەلکی زۆریان لێ وەرگیراوە.

[40] لینچوفسکی، س ن، ل٩١.

[41] د. احمد عثمان، س ن.

[42] لینچوفسکی، س ن، ل٩٣.

[43] بۆ ئەو دۆکومێنتانەی پێوەندییان بەخواستەکانی ئێرانەوە هەیە دەربارەی دەسکاری کردنی سنورەکانی ئێراني- تورکیو ئێراني- روسی بڕوانە: د. جواد شێخ الاسلامی، اسناد محرمانە وزارت خارجه بریتانیا دەربارە قرارداد ١٩١٩ ایران وانگلیس ل١١١و ١١٨و ١٢٦و ١٢٨و ١٤٦و ١٨٥و ٢٠٤.

[44] هوروویتزز، س ن، ل٣٨-٣٩.

[45] سلیمان موسی، الحرکة العربیة- المرحله الاولی للنهضة العربیة الحدیثة ١٩٠٨-١٩٢٤، بیروت: دار النهار، ١٩٨٦، ص ٤٦١-٤٧٩.

[46] لینچوفسکی، س ن، ل٩٣.

[47] هـ س، ل٩٤.

[48] د. احمد عثمان ابوبکر، س ن، حلمی، یادداشت، بەشی یەکەم، ل٤٩-٥٩.

[49] ویلسون، ل١٢٧-١٢٨.

[50] د. احمد عثمان، س ن.

[51] ویلسون، میسوپوتامیا ١٩١٧-١٩٢٠، ل٨٧.

[52] هـ س، ل١٢٩.

[53] دەربارەی ج ت ك ورێکخراوە کوردییەکانی تری ئەو زەمانە بڕوانە: جلال طالبانی، کردستان والحرکة القومیة الکردیة بیروت: دار الطلیعه، ١٩٧١" د. عزیز شمزيني، الحرکة القومیة التحرریة للشعب الکردی، من منشورات الاوك، نیسان ١٩٨٦، ص ٨٣-٨٦. د. عبدالستار طاهر شریف، الجمعیات والمنظمات و الاحزاب الکردیة فی نصف قرن١٩٠٨-١٩٥٨. اسماعیل حقی شاوەیس، خەباتی گەلی کورد لەرۆژەکانی جەنگی گیتی یەکەمین لەدەرەوو ناوەوەی کوردستان، گۆڤاری رۆژی نوێ، ژ٩، سلیمانی، کانونی یەکەمی ١٩٦٠، ل٢٤-٣٠.

[54] وەکو مامۆستا شاوەیس ئەڵێ نەتەوەپەرستەکانی تورك ناویان لەم گۆڤارە نا بو((جن)) واتە جنوکە، هەندێ لەژمارەکانی((ژین)) سەرلەنوێ لەلایەن محەمەد ئەمین بوزارسلانەوە لەسوید چاپ کروانەتەوە.

[55] د. بلەج شێرکۆ، القضیة الکردیة، طبعة بیروت، ص ٧٨.

[56] نوێنەرایەتی نەتەوەی ئەرمەن، یادداشتێ دەربارەی مەسەلەی ئەرمەن، لەندەن، ١٩١٨.

[57] میجەر نوئێل تێبینی دەربارەی دۆخی کوردستان، ١٩١٩.

[58] شێرکۆ، س ن، ل٨٠.

[59] سەرچاوە بەریتانیەکان ئەڵێن نوێنەرایەتی کورد" سەید عەبدولقادر، مولان زادە رەفعەت بەگ، ئەمین عالی، ئەمین بەگ، بون.
[60] شێرکۆ، هـ ج.
[61] لینچوفسکی، س ن، ل٩٨.
[62] تیکستی کورد ئەم بەندانە لەیادداشتەکانی رفیق حلمی وەرگیاوە، زۆر لەنوسەرانی کورد دەربارەی ئەم بەندانەی پەیمانی سیڤەر شتیان نوسیوە، لەناو ئەوانەدا هەندێکیان جێگەی تێ رامانن، بۆ نمونە بڕوانە: محەمەد ئەمین زەکی، س ن، ل٢٥٢-٢٥٥" د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، ((سەرنجدانێکی نوێ بەرامبەر پەیمانی سیڤەرو مەسەلەی کورد)) گۆڤاری برایەتی، ژ٧، س١، خولی٢، بەغداد، ناوەڕاستی تشرینی یەکەمی ١٩٧٠، ل١٥-١٩.
[63] لینچوفسکی، س ن، ل١٠٧-١٠٩.
[64] بۆ ئەم بەشە کەڵك وەرگیاوە لە: ریچارد رابینسون، جمهوری اول ترکیه، ترجمه ایرج امینی، تهران، کتابفروشی تهران، ٢٥٣٦، محمد توفیق، کەمال ئەتاتورك ـ ترجمه اسمعیل فردوسی فراهانی، چ٢، تهران، نشریات نامه عراق، ١٣١٨" زنجیرە وتارەکەی د. احمد عثمان ابوبکر.
[65] لینچوفسکی، س ن، ل١٠٥.

## ٥ ئاسورییەکانی کوردستان

### ١. پێشینەی مێژویی

### ١/١ ڕەچەڵەکی ئاسوری

گومانی تێدا نیە، ئاسورییەکان لەگەڵە کۆنەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن.
بەڵام ئاسورییەکان کێنو، لەکەیەوە بەم ناوەوە ناسراون؟
ئەوەی کام نەتەوەنو، لەگەڵ کام نەتەوەی تری ناوچەکە یەك ئەگرنەوە؟
لەکەینەوە هاتونەتە ئەم ناوچەیەو، بۆچی پەرتو بڵاوبونەتەوە؟
ئەم پرسیارانە هێشتا بەتەواوی وەڵام نەدراونەتەوە.

گەلی ئاسوری خاوەنی دەوڵەتی تایبەتی خۆی نەبوە. ئەم گەلە کلۆڵە هەمیشە لەژێر باری چەوسانەوەی دینییو کۆمەلایەتیدا بوە. چەندین جار کەوتۆتە بەرکوشتاری بەکۆمەڵ، دیرەکانی کاولو نوسراوەکانی سوتێنراوە: لەژیانی ناوچەکەشدا قازانجێکی گەورەی بۆ دەوڵەتو هێزە زلەکان نەبوە. لەبەرئەوە نەخۆیان توانیویانە مێژوی خۆیان بەشێوەیەکی زانستی بنوسنەوە، نەداوودەزگا زانستییەکانی هیچ دەوڵەتێکیش بایەخێکی ئەوتۆیان پێداون. بۆیە مێژوی ئاسوری تائێستەش جێگەی مشتومڕو لێکدانەوەی جیاوازە.

لەسەر ڕەچەڵەکو ناوو نیشتیمانی ئاسورییەکان تیۆریو بیروڕای جیاجیا هەیە" تیورییەکیان بۆ ئەوە ئەچێ کەئەوانە ئەوەی کلدانییەکانی ئەرزی دو چۆمان((میزۆپۆتامیا))ن، لەسەردەمێکی زودا پاش تەنگ پێ هەڵچنینیان ناوچەکانی خواروی عیراقی ئێستەیان بەجێ هێشتوەو، لەژێر گوشاری دراوسێکانیاندا بۆ مەڵبەندە شاخاوییەکانی کوردستان هەڵکشاون. تیورییەکیتر بەپاشماوەی ئەو ئێلە مەسیحییانەیان دائەنێ کەدوای هێرشی مەغۆل لەکوشتنی بەکۆمەڵ ڕزگاربونو لەدەشتەکانی موسڵەوە ڕویان کردۆتە شاخەکانی لای

هەكاریو ورمێ. تیورییەكیتر رەچەڵەكیان ئەباتەوە سەركورد، بەڵام پاش ئەوەی ئەوان چونەتە سەر دینی مەسیحی بەتێپەڕینی زەمان جیاوازییان لەگەڵ كورد قوڵ بۆتەوە.[1]

لەناو ئەم بیروڕا جیاوازانەدا، دو تیورییان جێگەی بایەخو سەرنج دانن:

تێوری یەكەم- ئاسورییەكان بەپاشماوەی ئیمپراتۆریی ئاشوری دائەنێ، كە لەقەرنی ١٠ هەمی(پ. ز.) گەشەی كردو پەرەی سەند. پاشان لەلایەن گەلە ئێرانییەكانەوە روخێنراو نەینەوای پایتەختی كاولكرا. پاشماوەكەشیان لەچیاكانی كوردستاندا جێگیر بون.[2]

لەناو ئەوانەدا كە لەسەر ئەو بڕوایەنو چەند لێكۆڵینەوەیان لەسەر نوسیوە" گەڕۆكی ئینگلیزی، لایارد، لەكتێبەكەیدا بەناوی((نەینەواو پاشماوەكانی)) كە لە ١٨٤٨دا بڵاوی كردۆتەوە.[3] دواییتر میسیونێری ئینگلیزی ویگرام لەچەندین باسو لێكۆڵینەوەدا تەقەلای سەلماندنی ئەم تیورییەی داوە.[4]

ئاسورییەكان خۆشیان لەسەر ئەم باوەڕەن. لەلێكۆڵینەوەكانیاندا هەوڵی سەلماندنو ساخ كردنەوەی ئەم تیۆرییە ئەدەنو پێی لەسەر دائەگرن. لەوانە نوسەری ئاسوری- رەگەزی سۆڤێتی ماتڤییڤ.[5] ئاسورییەكان خۆیان باوەڕیان وایە كاتێ ئێلە ئێرانییە شاخاوییەكان نەینەوایان داگیركردو، كۆتاییان بەدەسەڵاتی ئیمپراتۆریی ئاشوری هێنا، ئاشورییەكان بەتێشكاوی لەچیاكانی كوردستاندا بەتایبەتی لەناوچەكانی نێوانی گۆلی وانو دەریاچەی ورمێدا گیرسانەوەو، چەند جێگایەكیان كردە مەڵبەندی ژیانی خۆیان.

تیۆری دووەم_ ئاسورییەكان بەپاشماوەی ئەو ١٠ ئێلە جولەكە بزرە دائەنێ كەئیمپراتۆریی ئاشوری(٩١١-٦١٢پ.ز.) لە٣ هێرشی یەك لەدوای یەكدا، پاش لەناوبردنی مەملەكەتی ئیسرائیل، بەدیل گرتونیو بەزۆر لەفەلەستینەوە رای گواستون بۆ ناوچەكانی ژێردەسەڵاتی ئاشوری. لەوێش بۆئەوەی بەیەكجاری لەوڵاتەكەی خۆیان دابڕێنو نەتوانن جارێكیتر یەك بگرنەوەو بیر لەگەڕانەوە بكەنەوە، لەناوچەی شاخاوی لەیەك دورو دابڕاودا نیشتەجێیان كردون.[6] لەپاش بڵاوبونەوەی دینی مەسیحی دەسیان لەدینە كۆنەكەی خۆیان هەڵگرتوەو چونەتە سەر دینی مەسیحیو پاشان چونەتە سەر مەزەبی نەستوری، بەڵام پارێزگاری هەمان زمانو زاراوەیان كردوە كەئەو سەردەمە لەفەلەستین پێی دواون.

ئەم تیۆرییە لەسەرەتادا لەلایەن د. گرانتەوە باسكراوەو لەسەری نوسراوە.[7] پاشان زانای عیراقی د. ئەحمەد سوسە، ئیتر چ بۆ مەبەستی سیاسی بێ یا بۆ

مەبەستی زانستی، چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەرنوسیوەو، تەقەلایەکی زۆری داوە بۆ سەلماندنی ئەم تیۆرییە.[8]

هەروەکو رەچەڵەکی ئاسوری مشتومڕی زۆری لەسەرە، ناوی ئەم گەلەو ژمارەو شوێنی ژیانیشیان کێشەی لەسەرە.

لەسەدەکانی پێشودا ئەم گەلە ناوێکی یەکگرتوی نەبوە. بەچەند ناوی جیاوازەوە ناو براوە. هەندێ جار بە نەستوریو، هەندێ جار بەکلدانیو، هەندێ جار بەنەسرانی، جگە لەو ناوانە بەئاسورو تیاریو جیلو وفەلەو کافرو گاوریش ناو براون. هەندێ کەس، لەوانە ئەحمەد سوسە، لایان وایە ئینگلیز بۆ مەبەستێکی سیاسی ناوی((ئاسوری)) داهێناوەو، بۆ یەکەمین جار سەرۆکی قەشەکانی کانتەربیری ساڵی ١٨٨٦ ئەم ناوەی لەم گەلە ناوە.[9] ئەم قسەیە لەگەڵ راستی یەك ناگرێتەوە. سەرچاوە کلاسیکەکانی نوسەرانی ناوچەکە ماوەیەکی زۆر لەپێش ئەوساڵەدا ناوی((ئاسوری)) یان لەنوسینەکانی خۆیان داهێناوە، لەوانە((شەرەفنامە)) کە لە ١٠٠٥ی کۆچیدا بەرامبەر ١٥٩٦ زایینیدا نوسراوە.[10]

ناوبرانی ئاسورییەکان بە((نەستوری)) ئەگەرێتەوە بۆ مەزەبەکەیان. نەستوریوس، یەکێ لەپێشەوا گەورەکانی مەسیحییەکانی شاری ئورفا لەساڵی ٤٢٤دا باوەڕێکی نوێی هێنایە ناو دینی مەسیحییەوە. ئەمەش یەکەمین دابەش بونی قوڵی لەناو ئەم دینەدا دروست کرد. نەستوریوس باوەڕی وابو کەعیسا خاوەنی دوکسایەتی جیاوازە" کسایەتییەکی مرۆیی((کور))و کسایەتییەکی خوایی((باوك)). نابێ مریەم بەدایکی خوا دابنرێ چونکە ئەویش مرۆڤەو، مەسیحی لێ بوە. مەسیحیش لەسەر چلیپا مردوە. ئەم باوەڕە نەگونجاو بو لەگەڵ باوەڕە باوەکانی ناو دینی مەسیحی، لەبەرئەوە پێشەوا ئایینییەکانیتر بەتایبەتی ئەوانی رۆماو ئەسکەندەرییە کەوتنە دژایەتی ئەم باوەڕە. بەشتێکی تازە داهێنراوی نەگونجاو لەگەڵ باوەڕی مەسیحیو بە لەدین دەرچونیان دانا.[11] بەڵام نەستوریوس لەگەڵ رۆژگاردا لایەنگرێکی زۆری پەیداکردو بەشێکی مەسیحییەکان باوەڕیان پێهێنا، لەوانە مەسیحییەکانی کوردستان، کەئیتر بەو هۆیەوە بەنەستوری ناو ئەبران. جیابونەوەی کەنیسەی نەستوری لەکەنیسەی رۆمیی رۆژئاواو، سەربەخۆیی دینییان، شاهەکانی ئێرانی لەدڵسۆزییان دڵنیاکردو، لەئەنجامی ئەوەشدا راونانو ئازاردانیان لەسنوری ئیمپراتۆریی ئێرانیدا کەم تربوەوە. لەسەرەتادا بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی باوەڕی نەستوری لەئورفا بو، دواییتر لەمەداینو شارە

گرنگـەکانی تـری ئێـراندا بنکـەیان دامـەزران.[12] ئاڵوگۆڕەکـانی هەلومـەرجی سیاسیو جەنگیو دینی ناوچەکە ناچاری جێگۆڕکێی کردون.

پێشەوایەتی دینـی نەسـتورییەکان لـەناو بنەماڵەیەکدا بـەمیرات ئەمێنێتـەوە. پێشەوای دینیی پێی ئەگوترێ((مار شیمون)) مار شـیمون ماوەیـەك لەئەلقوشـی نزیك موسڵو دوای ئەوێ لەعەینکاوەی نزیـك هـەولێرو پاشـان مـار شـیمونی ١٣ هەم(١٦٦٠-١٧٠٠) گوێزرایەوە گوندی قوچـانس نزیـك جولـەمێرگ لەچـیاکانی هەکاری.[13]

نەسـتورییەکانی ناوچـە شـاخاوییەکان پارێزگـاری زمـان، نـەریتی دینـیو کۆمەڵایەتی تایبەتیخۆیان، تەنانەت رێکخراوی خێڵەکیی تایبەتی خۆیـان کـردوە. جیلو، تیاری، بازی، تخومی، تاشوتی... ناوی هەندێ لەئێڵە بەهێزەکانی ئـەم گەلـە بون. مەترانێکی ئاسوری لەموسل ناوی ئێڵە مـەسـیحییە نەسـتورییەکانی بـەجۆرە بۆ ریچ ژماردوە: تیاری، تکوب(تخومی)، جەلودی(جیلـو)، لی وی نـی، بـەرواری، نیرویی. نیرویی بـەرواری تێکـەڵاو بـون لەموسـڵمانو مـەسـیحی.[14] هەریـەکێ لـەم ئێلانـە سـەرۆکێکی هـەبو، سەرپەرشـتی کاروبـاری دنیـایی ئـەکردن، پێیـان ئەگوت(مەلیك) قەشەیەکیش لەلایەن مار شیمونەوە دائەنرا سەرپەرشتی کاروباری دینیی ئەکردن. سـەرۆکی دینـیو دنیـایی هـەمویان مارشـیمون بـو کەبارەگاکـەی لەگوندی قوچانس بو لەهەکاری. هاتنی میسیونی دینیی جیاواز تەبایی مـەزهەبیی تێکداو لەناو ئەوانیشدا کاتولیك، پروتستان، ئورتودوکس... پەیدابون .

ئاسورییەکانی ژێردەسەڵاتی عوسمانی، لـەناو سـنوری ئەمارەتـەکانی هـەکاری، بۆتان، بادینان، سۆراندا ئەژیان کەسەر بەولایەتەکانی وان، دیاربەکر، موسل بون. ئەوانی ژێر دەسەڵاتی ئێرانیش لەورمێو ئاواییەکانی دەوروبـەریدا ئـەژیان کەسـەر بەئیالەتی ئازەربایجان بو. لۆرد کـیرزن لـە١٨٩١ دا ژمـارەی هـەمویانی بـە١٠٠-٢٠٠ هەزار کەس قەبڵاندوە لەوانە ٤٠ هەزاریان لـەئازەربایجان بـون.[15] سـەرژمێری ئاسورییەکانی ئازەربایجانیش، کە بەزۆری لەناوچە کوردنشـینەکاندا بـون، بـەجۆرە نوسیوە:

ناحیەی سەلماس ٧٠٠ خێزان
سومایو چرا ١٠٠ خێزان
ناحیەی ورمێ ٣٦٠٠ خێزان
سولدوز ٤٠٠ خێزان
باراندوز ١٠٠ خێزان
تەرگەوەڕ ٥٠٠ خێزان

مەرگەوەڕ ١٠٠ خێزان
هەموی ٥٥٠٠ خێزان[١٦]

ئاسورییەکان بەزمانی سریانی ئەدوێن کەئەچێتەوە سەر ئارامی، ئەویش وەکو عەرەبیو عیبری لەخێزانی زمانە سامییەکانە. د. سوسە لای وایە کە ئەو زمانەی ئاسورییەکانی کوردستان لەناو خۆیاندا قسەی پێ ئەکەن هەمان زمانە کەمەسیحو جوەکانی فەلەستین لەسەردەمی خۆیدا پێی دواون. هۆی خۆڕاگرتنو مانەوەشی، سەرەڕای ئەوهەمو گۆڕانەو قولانەی بەسەر ناوچەکەدا هاتون، ئەگێڕێتەوە بۆ دابڕانیان لەناوچەیەکی شاخاوی سەختدا.[١٧]

تا ئێستەش لەچەند جێگەی کوردستان شوێنەواری دێرینەی ئاشوریو، دێری مێژویی ئاسوری ماون. توێژینەوەی زمانەوانی دەری ئەخەن، بنجی زمانەوانی ناوی هەندێ لەگوندو ئاواییو چیاو روبارەکانی کوردستان سریانییە.

## ٢/١ پێوەندییان لەگەڵ کورد

ئایدیۆلۆجی ڕەسمی هەردو ئیمپراتۆریی عوسمانیو ئێرانی، دینی ئیسلام بو. کاروباری دەوڵەتی عوسمانی لەدەس تورکی سوننەو کاروباری دەوڵەتی ئێرانی لەدەس ئازەری شیعەدا بوە. کورد نەخاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی بوەو، نەبەشداری بڕیاردانی سیاسی دەوڵەتانی ئێرانو تورکیا بوە. لەهەردو دەوڵەتدا ژێر دەستەبوە. دین یا مەزهەبێکی تایبەتی خۆی نەبوە، تێکەڵاوی ئایدیۆلۆجی نەتەوەیی کورد بوبێ تا ببێتە هاندەری بۆ لەشکرکێشیو داگیرکردنی وڵاتانی ترو سەرپێ دانەواندنی گەلانی دراوسێی. لەناو نەتەوەی کوردا((تەبایی دینی )) نەبوە. ئەگەرچی زۆرایەتی کورد موسوڵمان بون، بەڵام هەمویان لەسەر یەك مەزهەب نەبون. موسوڵمانەکان دابەش ئەبون بەسەر سوننیو شیعیو عەلەوی...دا. لەپاڵ ئیسلامدا ژمارەیەك لەئێلەکانی کورد لەسەر ئۆلی یەزیدی بون. لەهەندێ جێگەش کاکەیی یاخود وەکو پێیان ئەڵێن((عەلی ئیلاهی)) هەبون. سەرەڕای ئەمانە، مەسیحیو جولەکەشی لێ بوە. بەڵام مێژوی رابوردوی کورد باسی هیچ جەنگێکی دینیی ناوخۆی ناگێڕێتەوە، بەڵکو بەگشتی پێکەوە ژیانی بەئاشتیو هێمنایەتی زاڵبوە بەسەر پێوەندییەکانی نێوان ئەو مەزهەبو دینانەدا.

شەرەف خان چەن روداوێکی مێژویی دەربارەی هاوکاری کوردی موسوڵمانو ئاسوری مەسیحی دژی دەسەڵاتی ئێلە تورکمانەکانی ئاق قوینلو ئەگێڕێتەوە":

روداوی یەکەم، لەرۆژانێکا کەئێلە تورکمانەکانی ئاق قوینلو بەسەرکردایەتی سۆفی خەلیلو عەرەبشا بەگ ناوچەی هەکارییان لەدەس میرەکانی هەکاری دەرهێناو مەڵبەندی هەکارییان داگیرکرد، ئاسورییەکانی دزە ئەبو رۆژانی شەمو،

دارو کەلوپەلی پێویست بەکۆڵ بگوێزنەوە بۆ ناو قەڵای دزە، کەناوەندی دەسەڵاتدارێتی هەکاری‌بو. میرەکانی هەکاری هەریەکەیان بەلایەکدا پەرەوازە بوبون. چەند ئاسورییەك بۆکارکردن رێیان ئەکەوێتە میسرو شام. لەوێ عزەدینی زێرین چنگ، کەیەکێ لەمیرە پەرەوازەکانی هەکاری‌بو، ئەدۆزنەوە. داوای لێ ئەکەن بەنهێنی بگەرێتەوە ناو ئەوان بۆ ئەوەی مەڵبەندی هەکاری ئازاد بکەن. عزەدین لەسەرگفتی ئەوان ئەگەرێتەوە هەکاری‌و لەناو ئێلەکانی ئەواندا خۆی ئەشارێتەوە تا رێوشوێنی گرتنەوەی ناوچەکە دائەنێن.

لەشەمەیەکدا، کە ئەبو ئاسورییەکان، بەکۆڵەدارەوە بۆ بێگار بچن بۆناو قەڵا، لەناو کۆڵەکانیاندا چەکیان حەشارداو، عزەدینیش جلی ئەوانی لەبەرکردو، لەگەڵ ئەواندا چوە ناو قەڵاوە، ئەوسا کۆڵەکانیان فڕێداو، تاوی چەکیاندا. عزەدین دەستی گرتەوە بەسەر قەڵاکەداو، کۆتاییان هێنا بەدەسەڵاتی ئاق قوینلو. دەسەڵاتی میرەکانی هەکاری بەیارمەتی ئاسورییەکان سەرلەنوێ دامەزرایەوە.[18]

رووداوی دوەم، هەر لەسالانی دەسەڵاتی ئاق قوینلودا، لەکاتێکا مەزنەکانی ئێلی رۆژکی خەریکی دانانی پلانی ئازاد کردنی بتلیس بون لەدەسەڵاتی داگیرکەر، محەمەد ئاغای کەلهوکی، کەمیرەکانی بەتلیسی بەنهێنی لەقومەوە هێنایەوە بۆکوردستان، ئەوەندە متمانەی بەئاسورییەکان ئەکرد، لەناو ئەواندا لەهەکاری‌دا حەشاری دان.[19]

کوردو ئاسوری هەردوکیان لەژێر دەسەڵاتی بابیعالی‌و دەرباری ئێرانی‌دا بون. شەریعەتی ئیسلام بناغەی قانون‌و جۆری رێکخستنی کاروباری هەردو دەوڵەت بو. لەژێر سایەی هیچ کام لەم دو دەوڵەتەدا موسڵمان‌و ناموسڵمان وەکو یەك‌و بەرامبەر نەبون. موسڵمان هاولاتی تەواو و، ناموسڵمانەکان بەتایبەتی مەسیحی‌و جو کەهەردوکیان بە((ئەهلی کتاب)) دانراون، لەرێزی ((ئەهل الذمـة))دا بون، ئەرك‌و مافەکانیان بەو پێیە دیاری کراوە. نەستورییەکان وەکو بەشێکی مەسیحییەکان رەفتاریان لەگەڵ کراوە. ئەو قانونانەی بەسەر مەسیحییەکاندا سەپێنراوە، بەرامبەر بەوانیش جێبەجێ‌کراوە. مەسیحییەکان بەگشتی لەژێر باری چەوسانەوەی دینی‌و سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌و ئابوری‌دا بون. لەگەڵ ئەوەش‌دا پێوەندی نێوان موسڵمانانی کوردو ناموسڵمانەکانی دانیشتوی کوردستان، بەگشتی هێمن‌و ئاسایی‌بوە. جەنگی مەزەبی‌و جەنگی دینی تێدا نەقەوماوە تاسەدەی ١٩هەم.

ئاسورییەکانی کوردستان لەسنوری ئەمارەتە ئۆتۆنۆمەکانی هەکاری، بۆتان، بادینان سۆراندا بەئاسودەیی ژیاون. مەلیکەکانی ئاسوری، خۆیان بەرپرسی ئێلەکانی خۆیان بون. ئەوان لەباتی هەمو ئێلەکانی خۆیان راستەوخۆ لەبەرامبەر

میرەکانی کورد یاخود راستەوخۆ لەبەرامبەر والی‌و کاربەدەستانی عوسمانی‌دا بەرپرسبون لەکۆکردنەوەی باج‌و سەرانەو سازدانی شەرکەرانی هۆزەکانیان لەکاتی پێویستدا. ئەمیرەکانی کورد دەستیان نەئەخستە کاروباری ناوخۆی دینیی، کۆمەلایەتی، ئابوری، فەرهەنگییانەوە.

ریچ لەتێبینییەکانی خۆی‌دا لەسەر ئەوان نوسیوێتی: ((بۆگەیشتن بەئاسیای بچوك بەم رێگەیەدا، پیاو ئەبێ بەو ناوچە سەختانەدا تێ بپەرێ کەئێلە کلدانییە مەسیحییەکانی لێ ئەژین، ئەوانەی لام وایە" تەنیا مەسیحین لەرۆژهەلاتدا سەربەخۆیی خۆیان لەبەرامبەر موسلمانەکاندا پاراستوە، بە بەهێزی خۆیان بۆ ئامادە کردوە.

هەر ریچ لەیادداشتەکانی‌دا ئەنوسێ: ((کێوی ترین ئێلەکانی جولە مێرگ یا هەکاری کەدابراون کلدانییەکانن، ئەوانیش چوارن. گوێ نادەنە میری هەکاری، ژیانێکی تەواو درندانە ئەژین، دینیان مەسیحییەو سەربە نەستوریوسن، پیاوەکانیان بەخورتی گەورەیی قەلافەتو ئازایەتی بەناوبانگن، ئەلێن تێپەرین بەناوچەکانی ئەماندا مەترسی زۆرترە وەك لەناوچەی ئێلە موسلمانەکان. ئەوانە لەناوچەکانی نێوان ئامێدی‌و جولە مێرگدا دانیشتون، جگە لەوان تەنیا یەك ئێلی موسلمانی لێیە، جاروبار هەندێ باج بەمیری هەکاری ئەدەن، ئەگەر رازی‌کردن یا دلی نەرم‌کردن، بەلام بەزۆر نا))[20].

ریچ لەشوێنێکی تری گەشتنامەکەی‌دا نوسیوێتی: ((جولەمێرگ پایتەختی ناوچەی هەکاری کوردییە. قوچانسی بارەگای پاتریارکی کلدانی لەوێیە، ئەو(پاتریارك-و.) لەهەر شەرێکا کە لەنێوان میری هەکاری‌و ئێران بقەومێ، خۆی سەرکردایەتی تیپی لەشکرئەکا... بەلێزانی بەکارهێنانی تفەنگ و شمشێر بەناوبانگە، هەروەکو هەمو دزەکانی سەربەو بەچاکی ئەیزانن.[21] کاتێ تەتەرەکەی ریچ ئەیەوێ بەناوچەی هەکاری‌دا رابورێ بۆ ئەوەی پۆستە بۆ ئەستەمبوڵ ببا، زوبێر پاشای میری بادینان، ئامۆژگاری تەتەرەکە ئەکا: ((.. هەرچییەکیان لێ وەرئەگرێ نرخەکەی بدا، رەزیلی لەدانی نرخی هیچ خواردنێکا نەکا کەبۆی دائەنێن، بەلکو هەرچییان بۆدانا بیخواو ستایشی بکا، چونکە ئەوانەی ئەو بەناوچەکەیاندا ئەروا، لەهەموکەس درترو، تورەترن... بچوك ترین دەسدرێژی بۆ سەریان ئەبێتە هۆی تیاچونی))[22]

یەکێ لەتاکتیکەکانی بابی عالی‌و دەرباری ئێرانی بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی خۆیان، نانەوەی دوبەرەکی‌و دروست کردنی دوژمنایەتی‌بو لەناو بنەمالەو هۆزو ئێل‌و گەل‌و نەتەوەو دین‌و مەزەبە جیاوازەکانی ناو قەلەمرەوەکانیاندا. سونییان

ئـەکرد بەگـژ شـیعەداو، موسـولّمانیان لەمەسـیحیو جـو هـانئـەدا. ئێلـەکانیان بەرئەدایە یەکتریو پیاوەکـانی خێزانێکیـان ئـەکرد بـەدوژمـنی یـەکتری. دزەکردنـی دەوڵەتانی ئەوروپی بۆ خۆ خزاندنە ناوچەکەوە، دوایی‌تر نـاردنی میسـیۆنی دینیـی ئاگری ناکۆکی دینیی مەسیحی- موسولّمانی خۆشترکرد.

لـەکاتی راپەرینەکـەی بـەدرخان بـەگدا، پەیوەنـدی کـوردو ئاسـوری بـەفیتی دیپلۆمـاتو میسیۆنەکانی بێگانە تێکچـو. پێکـادانی خوێنـاوی قـوما(١٨٤٣). پ. روندو، لەسەر ئەو روداوانە نوسیویێتی: ((... ئەم تێکهەڵچونانەی نێوان کـوردو مەسیحییانی کێونشین، کە لەروی کۆمەڵایەتییەوە زۆر لەیـەك ئەچـن، پێوەنـدییان بـەکاروباری خێڵەکییـەوە هـەبوە نـەك بـەکاروباری دینییـەوە))[٢٣] بـەڵام دوای ئـەوە پێوەندییەکان سەرلەنوێ ئاسایی بونەوەو چوەوە دۆخی جارانی.

لەکاتی شۆڕشەکەی یەزدانشێردا، هەندێ لەنەستورییەکان، بەشداربون.[٢٤]

شێخ عوبەیدوڵڵا لەکاتی خۆئامـادە کردنـی‌دا بـۆ شـۆڕش دژی تـورکو عـەجەم تەقەلایەکی زۆری‌دا بۆ ئـەوەی بیـانکـات بەهاودۆسـتو هاوپـەیمانی خۆی. لەگـەڵ ئەوەی تەقەلاکانی سـەری نـەگرت. ئاسورییەکان، بـەپێی ئامۆژگـاری دیبلۆمـاتو میسیۆنیرەکان، لەجوڵانەوەکەی شێخ بێلایەن راوەستان. شێخ رێـزی بێلایەنییەکەی گرتن. لـەو جەنگـە خوێناوییـەدا کـە لـەورمێو دەوروبـەری‌دا قـوما نـەی هێشـت مەسـیحییەکان توشـی زەرەرو زیـان بـبن. تەنانـەت هەنـدێجار مەزنـەکانی مەسیحییەکان بۆ ناوبژی ئەکەوتنە بـەینی شێخو کاربەدەسـتانی ورمـێوە. بگـرە لەگەرمەی شەڕەکاندا کاتـێ نوێنـەرانی مەسـیحییەکانی ورمـێ چـونە لای شـێخو داوای پارێزگاری سەرو سامانی مەسیحییەکانیان لێ کرد، شێخ بێ دودڵی گفتـی سەلامەتی سەروسامانی پێدانو، بەڵێنەکانی خۆیشی بەجێهێنا.[٢٥] شێخ نەیهێشـت ئاسورییەکان لەشەڕەوە بگلێن، یا توشی‌کوشتنو تالاّن بن.

لەسـالانی ١٨٩٤ تـا ١٨٩٦ کـاتێ بابیعـالی فـەرمانی کوشـتاری بەکۆمـەڵی ئەرمەنیەکانی دەرکرد، ئۆردوی تورك بێ بەزەییانە کەوتە جێبەجێ کردنی ئەوکارە. لەوەش‌دا ئالاّ حەمیدییەکان، کە لەهۆزەکانی کـورد پێـك هـات بـون، بەشـداربون. بەڵام ئاگری ئەم مەینەتییە ئاسورییەکانی نەگرتەوە. بەڵکو پەیوەندی کورد لەگـەڵ ئاسوری ئاسایی بو. شێخ عەبدالسلام بارزانی کاتێ لەبەر هێرشی فراوانی ئـۆردوی تورك‌دا خۆی پێ رانەگیراو ناچاربو لەناوچەی بـارزان بکشـێتەوە، مـاوەیـەك خۆی لەشـوێنێکی ئـەمین‌دا حەشـاربدا، رویکـردە بارەگـای سـەرەکی ئاسـورییەکان، قوچانس. مـارشیمۆن لەوێ دالّدەی داو شـاردیەوە تـا سـەرلەنوێ هێزەکـانی خـۆی رێکخستەوە.[٢٦]

## ٣/١ دەسوەردانی دەوڵەتانی ئەوروپی لەکاروباری ناوخۆی رۆژهەلات

لە سەرەتای سەدەی ١٩ هەمدا دەوڵەتانی بەهێزی ئەوروپی چاویان بڕیبوە رۆژهەلاتی ناوەڕاست، ئەیان ویست چارەنوسی ئیمپراتۆریی عوسمانی، کەچوبوە قۆناغی لاوازیو داوەشینەوە، دیاری بکەن. هەر لەو زەمانەوە لەناو سیاسیەکانی ئەوروپادا زاراوەیەك بەناوی ((کێشەی رۆژهەلات))ەوە کەوتە سەر زمان. بەریتانیا((پارێزگاری رێگەی هیندستان))و روسیا((گەیشتن بەدەریای ئازاد))و، فەرەنسە((پاراستنی کاسۆلیکەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی))یان، کردبوە بنچینەی جموجوڵی سیاسی، جەنگی، ئابوری، خۆیان لەناوچەکەدا. دەوڵەتانی ئەوروپی لە پەیجوری قازانجەکانی خۆیان دا ناکۆك بون لەسەرئەوەی" سەربەخۆیی ئیمپراتۆریی عوسمانی بپارێزرێ یا قەڵەمڕەوەکەی دابەش بکرێو، مەسیحییەکانی ئەوێ لەژێردەسەلاتی سوڵتانی عوسمانیدا بێننەوە یا بەگوێرەی جیاوازی نەتەوەکانیان داوودەزگای تایبەتی خۆیان هەبێ. ئەم ناکۆکیانە لەسیاسەتی دەرەوەی بەریتانیاو روسیاو فەرەنسەدا رەنگی ئەدایەوەو کاری ئەکردە سەرگەلی کوردو جوڵانەوە نەتەوەییەکەی کەتازە خەریکی گەشانەوەو گەلاڵە بون بو. لەئەنجامی ئەو سیاسەتەدا، دوکێشە تێکەلاوی مێژوی کوردو گەلە مەسیحییەکانی هاونیشتمانو دراوسێی بون" یەکێکیان، دەوڵەتانی ئەوروپی کەئیتر بەهێز بوبون، کەوتبونە پەلهاوێشتن، چاویان بڕیبوە قەڵەمڕەوی عوسمانیو ئێرانی، بۆ ئەم مەبستەش کەوتبونە هاندانی ناردنی میسیۆنی دینیو، بەکارهێنانی مەسیحییەکانی هاوولاتی ئەم دو دەوڵەتە بۆ دەسوەردانە کاروباری ناوخۆی رۆژهەلاتی ناوەڕاستو، بەهێز کردنی جێگە پێی سیاسی، ئابوری، فەرهەنگی خۆیان لەناوچەکەدا. ئەویتریان، هاندانی بابیعالی بۆ نەهێشتنی دەسەلاتی گەورەکانی کوردو لەناوبردنی ئەمارەتە ئۆتۆنۆمەکانیانو چەسپاندنی دەسەلاتی ناوەندیی تورك لەجێگەی دەسەلاتی ئەوان.

### ١/٣/١ هاتنی میسیۆنی دینی

یەکێ لەتاکتیکەکانی دەوڵەتانی ئەوروپی بۆکردنەوەی جێگە پێی خۆیان لەناوچەکەدا ناردنی میسیۆنی دینیی بو. بۆ پەرەپێدانی جوڵانەوەی میسیۆنیی چەندین داوودەزگاو رێکخراو لەئەوروپاو ئەمریکا دامەزرا بون.

ئەم دامەزراوە دینییانە چاویان بڕیبوە ئاسورییەکانو، هەوڵیانئەدا کەڵك لەهەلومەرجی نالەباری ژیانی ئەوانو چەوسانەوەی دینیو کۆمەلایەتیو ئابورییان وەربگرنو، لەناو ئەواندا جێگەی خۆیان بکەنەوەو، لەرێگەی ئەوانەوە پەل بهاون. چەند جار نوێنەری خۆیان نارد بۆ هەڵسەنگاندنی هەلومەرجی چالاکی خۆیان

لـەناو ئاسـورییەکانی کوردسـتاندا. گرانـت، پزیشـکێکی میسـیۆنێرلە ١٨٣٩ دا سـەردانێکی کوردسـتانیکرد، لـەو سـەردانەدا سـەری ئاسورییەکانیشـیدا، هـەر لەئەنجامی ئەم سەفەرەدا ناوەندێکی گەورەیان لەئاشیتا لەهەکاری دامەزران.

میسـیۆنی فەرەنسـی، روسـی، بـەریتانی، ئـەمریکایی، هـی فاتیکـان، لەسەرانسەری ناوچەکەدا کەوتبونە جموجوڵو، دامەزرانـدنی ناوەنـدی میسـیۆنیری، خوێندنگا، نەخۆشخانە. لەهەندێ شوێن ئەم ناوەندانەیان دەکردە قـەڵای جەنگیو، ئەبو بەهۆی دروست بونی ترس وبەژارە لـەدڵی گـەورەکانی کـوردا، کەموسـوڵمان بون ولەبن تەئسیری هاندانی دینیی مەلاکاندا بون.

ورمێ بوبوە ناوەندێکی گرنگـی میسـیۆنە مەسـیحییەکان، تەنانـەت فاتیکـان لەباتی ئەوەی سەفیری خۆی لەتاران دابنێ، کەپایتەختی ئێرانبو، لـەورمێ بارگـەی خستبو. لەوێوە سەرپەرشتی هەمو دەزگا کاتۆلیکییەکانی ئەکرد.[٢٧] لەقەڵـەمڕەوی عوسمانیشدا، میسیۆنە مەسیحییەکان کەوتبونە چالاکییەکی فراوان، بەتایبـەتی چـونکە ژمـارەی مەسـیحی لـەوێ زۆرتـرو، مەترسـی عوسمـانی بـۆ سـەر ئـەوروپا کاتیخۆی لەهی ئێران گەورەتربو.

### ١. میسیۆنی فەرەنسی

ئێران لەجەنگی روسی-ئێرانیدا(١٨٠٣-١٨١٣) شکا، لەوکاتەدا فەرەنسـەش لەجەنگدابو لەگەڵ روسیا. کاتێ فەتح عەلی شای ئێران بەوەی زانی نامـەیەکی بـۆ ناپلیۆن نوسی. داوای هاوکاری لـێ کـرد دژی روسـیا. لەئـەنجامی ئـەوەدا پـەیمانی فینکن شتاین(١٨٠٧) لەنێوان ئێـرانو فەرەنسـەدا بەسـتراو نـاپلیۆن دەسـتەیەکی بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ گاردان نارده ئێران(١٨٠٧). لەناو ئـەم دەسـتەیەدا، لـەپاڵ ئەفسەری پسپۆری جەنگیو هەندەسەو پزیشکیدا، دو قەشەی جەزەویتیان لەگەڵبو. ئەم قەشانە ورمێیان کردە بارەگای خۆیان، ئەرکی سەرەکییان ئـەوەبو بەرهەڵسـتی چالاکی روسو ئینگلیـز بکـەن لـەئێراندا. هـەر لەسـەرەتاوە کەوتنـە دامەزرانـدنی پەیوەندی لەگەڵ نەستورییەکان.

ئاڵوگۆڕەکانی ناو فەرەنسە، تەگەرەی لەکاری کەنیسەکان نەداو ئەوان درێـژەیان بـە تەقـەلاکانی خۆیـاندا. میسـیونی فەرەنسـی لـە١٨٤١ دا لـەورمێ جێگیربـو، سـەرەتا ٣ فێرگـەی لەئاوایییـەکانی ئەردشـاهیو باریـاریو موانـە لـەنزیك ورمـێ کردەوە، هەمـان ساڵ دو خوێندگا، یـەکێکی کوڕانـەو یـەکێکی کچانەشـیان لـەناو شاری ورمێ دامەزران.[٢٨] زۆری نەخایان ٣٥ خوێنـدنگایان لەگونـدەکانی ورمـێدا کـردەوە. لـەم خوێندنگایانـەدا جگـە لەدەرسـی دیـن، زمـانی فەرەنسـیو زمـانی فارسیشیان فێرئەکردن.

میسیونی فەرەنسی چاپخانەیەکیان لەورمێ دامەزران بۆ چاپی کتێب بەزمانو پیتی کلدانی. لە ١٨٩٦ەوە کەوتنە چاپو بلاوکردنەوەی مانگنامەی((کالا دشرارا))واتە((دەنگی راستی))[٢٩]

## ٢. میسیۆنی ئەمریکایی

سالی ١٨٢٩ دامەزراوێکی دینیی ئەمریکی بۆ ناسینی هەلومەرجی ژیانی نستورییەکانو هەوالی دانانی بارەگای میسیونی ئەمریکایی دوکەسی بەناوی سمیسو دوایت ناردە ناوچەکانی ژیانی ئەوان. پاش گەشتەکەی ئەمان لە ١٨٣٢دا میسیونێکیان بەسەرۆکایەتی پیرکینز ناردە ورمێ.[٣٠] پیرکینزو تاقمەکەی سەر بەرێبازی پریسبیتریانی نیویورك بون.[٣١]

پیرکینز لە ١٨٣٦دا خوێندنگایەکی لەورمێ دامەزرانو کەوتە هەولدانی پەرەپێدانی خوێندەواری، پاش ٣ سال ژمارەی خوێندنگاکانی گەیشتە ١٢ولە ١٨٤٠دا لە ٧٠ گوندا خوێندنگای دامەزراند بو.

هەر لەو ساڵەدا یەکەمین چاپخانەی لەورمێ دامەزراند کەخاوەنی تیپی سریانی، عەرەبی، ئینگلیزیبو، یەکەم کتێبی بەزمانو تیپی سریانی پێ چاپ کرد.[٣٢] بەم پێیە ورمێ لەدوای تەورێزو تاران، سێیەمین شاری ئێران بو کەدەزگای چاپی تێدا دابمەزرێ.[٣٣]

یەکەمین رۆژنامە لەئێراندا لە ١٢٥٠ی کۆچیدا لەتارانو پاش ١٧ سال دوەمین رۆژنامەی رەسمی بەناوی((وقائع اتفاقیە)) لە ١٢٦٧ دا هەر لەتاران بلاوکراوەتەوە. لەهەمان ساڵدا، هەمان میسیون لە ١ی کانونی یەکەمی ١٨٥١ەوە کەوتە بلاوکردنەوەی گۆڤاری((تحریرا دی باحرا، واتە پرشنگی روناکی)). بەم پێیە سێیەمین رۆژنامە لەسەرانسەری ئێراندا لەورمێ لەلایەن ئەمانەوە بەزمانی کلدانی دەرچوە.[٣٤]

میسیونی ئەمریکایی توانای دارایی لەمیسیونەکانیتر زۆرتربو. بۆ ئەوەی نفوزی خۆی لەناو مەسیحییەکاندا بەهێزتر بکا ئەی توانی لەوانی کەزیاتر بایەخ بەدامەزراندنی فێرگەو نەخۆشخانە بدا. ورد بونەوەیەك لەئاماری خواری رادەی بایەخدانی میسیونی ئەمریکایی بەخوێندەواری دەرئەخا:

| سالانی | ژمارەی فێرگە | ژمارەی قوتابی |
|---|---|---|
| ١٨٣٧ تا ١٨٤٧ | ٢٤ | ٥٣٠ |
| ١٨٤٧ تا ١٨٥٧ | ٥٠ | ٤٩٨ |
| ١٨٥٧ تا ١٨٦٧ | ٥١ | ١٠٩٦ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٨٦٧ تا ١٨٧٧ | ٥٨ | ٢٠٢٤ |
| ١٨٧٧ تا ١٨٨٧ | ٨١ | ١٨٣٣ |
| ١٨٨٧ تا ١٨٩٥ | ١١٧ | ٢٤١٠ [٣٥] |

جگە لەکاروباری دینی، جوگرافیا، مێژوی گشتی، فێربونی زمانەکانی سریانی، ئینگلیزی، فارسی، تورکیشیان خستبوە بەرنامەکانی خوێندنەوە.[٣٦]

دکتۆر کاکران پاش تەواوکردنی خوێندنی پزیشکی لەئەمریکا، نەخۆشخانەیەکی لە ١٨٧٩دا لەورمێ دامەزراند، لەوێدا سەرەڕای تیمارکردنی نەخۆش، دەرسی پزیشکی بەهەندێ لەخوێندکارەکانیش ئەگوت.[٣٧]

### ٣. میسیۆنی ئینگلیزی

لەکاتی شۆڕشی بەدرخان بەگدا، ئاسورییەکان لەشەڕەوە گلان. دیپلۆماتەکانی ئینگلیز لەلایەکەوە هانی نستورییەکانیاندا دژی بەدرخان رابوەستنو، لەلایەکی ترەوە هانی کاربەدەستانی تورکیاندا جولانەوەکەی بەدرخان دابمرکێننەوە. لەو هەلومەرجە ئالۆزەدا پێشەوای نستورییەکان لە ١٨٤٣ دا داوای یارمەتی لەسەرۆکی قەشەکانی کانتەربەری کرد.[٣٨] ئەگەرچی مارشیمون دەستدرێژی کوردی کردبو بە بەهانە، بەلام هۆی راستەقینەی ئەم خواستە ترسی مارشیمون بو لەپەرەسەندنی نفوزی مسیونەکانیتر. لەم بارەیەوە ئوژن ئوبن، سەفیری فەرەنسی نوسیوێتی:((مارشیمون بۆ پاراستنی خۆیو میللەتەکەی لەکار تێ کردنی نفوزی کاسۆلیکی فەرەنسیو پریسپیترا‌ینی ئەمریکایی داوای یارمەتی لەکونسولی ئینگلیز کرد لەموسل، بەهۆی ئەوەوە سەرۆکی قەشەکانی کانتەربیری هەیئەتێکی ناردە بارەگاکەی مارشیمون بۆ قوچانس هەروەها لە وانو ورمێ بنکەیان دامەزران))[٣٩]

بەریتانیا قازانجی لەوەدا نەبو مەسیحییەکان لەژێر ناوی کاسۆلیکێتیدا خۆیان بخەنە ژێر چەتری پارێزگاری فەرەنسییەوە، لای بابی عالی ئەوەی کرد بە بەهانەی دەسوەردانە کاروباری نستورییەکان. ئیرل کلارندون، وەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا لەنامەیەکیدا سالی ١٨٥٧ بۆ سیر ستراتفور کانینگ، سەفیری بەریتانی لەتورکیا نوسیوێتی: ((حکومەتی خاوەن شکۆ بەخۆشییەکی زۆرەوە گەرەکێتی رادەی سەرکەوتنی ئەو تەقەلایانە بزانێ کەئەتوانن بەقازانجی ئەو میللەتە چەوساوەیە بیدەنو سەرەنجام ئاواتەکانیان چیە)). پێشەوای دینیی نستورییەکان راستەوخۆ نامەیەکی بۆ شاژن ڤیکتۆریا نوسی، لەهەردو ئەنجومەنی لۆردەکانو خەلکدا خوێنرایەوە، کۆڕە رەسمییەکانی بەریتانیا بەگرنگی پێدانەوە وەریان گرت.

لۆرد راسل نامەیەکی بۆ نوێنەری بەریتانیا لای بابیعالی نارد، تییا نوسیبو: ((بەعەلی پاشا رابگەیەنە کە بەختیاریو چاکەی نستورییەکان کارێکە بەلای حکومەتی خاوەن شکۆوە زۆرگرنگە، ئەبێ ئاگاداری بکەی کەدەسبەجێ رێوشوێن دابنێن بۆ لابردنی زوڵم لەسەریان))[40]

سەرۆکی قەشەکانی کانتەربیری بەنوێنەرایەتی کەنیسەی ئەنگلیکانی دەستەیەکی نارد بۆ لێکۆڵینەوەی هەلومەرجی نستورییەکان. ئەم دەستەیە لەناوچەی جولەمێرگ پێشەوای نستورییەکانی بینی، هەروەها ٨ قەشەی لەتورکیاو ٣ قەشەی لەئێران بینی. لەپاش گەڕانەوەی ئەم دەستەیە لە ١٨٨٦ دا میسیونێکی هەمیشەیی بەسەرۆکایەتی کوتس نارده چیاکانی هەکاریو دوکتۆر ولیام براون ی بەراوێژکاری مارشیمۆن لەقوچانس دانا، براون ماوەی ٢٥ساڵ لەلای مارشیمون مایەوە، هاوزەمانی دو ماربو تا لە ١٩١٠ دا لەوێ مرد.[41]

٤. میسیۆنی روسی

روسیا لەسەردەمی پیتەری مەزنەوە چاوی بڕیبوە داگیرکردنی ئێران، بۆ ئەو مەبستەش هەوڵیئەدا کەڵك لەمەسیحییەکان وەربگرێ. لەساڵانی جەنگەکانی روسی-ئێرانی دا(١٨٢٦-١٨٢٨ ) هەندێ لە نستورییەکانی وەکو رێبەرو چاوساغ بەکارهێنا. پاش ئەو شەڕانە سەدان خێزانی نستوری ناچاربون بەکۆمەڵ کۆچ بۆ قافقاز بکەن. پەیوەندی روسی- نستوری پتەوتر ئەبو. لەچلەکانی سەدەی ١٩ هەمدا، شیلمون ئاراجان، یەکێ لەقەشە نستورییەکان لەئێرانەوە چو بۆ دیتنی حاکمی قەفقاز، فورتنسوف. قەشە داوایلێ کرد رێ بدرێ بەهەمو نستورییەکانی ئێران بەکۆمەڵ بگوێزنەوە بۆئەوێ، بەڵام فۆرتنسۆف ئەم خواستەی نەسەلماند، چونکە پێی وابو ئەگەر لەمەڵبەندەکانی خۆیان دا بمیننەوە ئەتوانن زۆرتر خزمەتی روسیە بکەن. لەم بارەیەوە نامەیەکی بۆ وەزیری کاروباری دەرەوە، نیسلرود، نوسی تێیدا ئەڵێ: ((ئێمە ناتوانین رێ بە نستورییەکان بدەین بگوێزنەوە بۆ قافقاز، بەڵام ئەبێ پەیوەندی باشیان لەگەڵ ببەستین‌و، ئەبێ لەبەرامبەر حکومەتی ئێرانیدا پارێزگارییان بکەین، بۆ ئەوەی باوەڕو دڵسۆزییان بەدەس بهێنین، چونکە لەدوارۆژدا کەڵکێکی گەورەیان لێ وەرئەگرین))

لەکاتی جەنگی قرمدا(١٨٥٣ - ١٨٥٦ ) پێشەوای نستورییەکان ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ هاوکاری لەگەڵ روسیەو کەوتە گفتوگۆ بۆ ئەوەی کەنیسەی نستوری بخرێتە سەرکەنیسەی سلاڤی روسی. لە ١٨٩٨دا مارێۆنان بەنوێنەرایەتی پێشەوای نستورییەکان چو بۆ پیتەربۆرگ، لە ئەنجامی ئەوەدا روسیەکان لە ١٩٠٠وە دەستەیەکی گەورەی ئورتودوکس یان ناردە ورمێو بەگەرمی کەوتنە

چالاکی. لەلایەن مەسیحییەکانی ئەوێشەوە بەگەرمی پێشوازی کرانو، ئەوانیش ئەوێیان‌کردە بنکەی چالاکییەکانی خۆیان.[42]
لە ١٩٠١ەوە گۆڤاری کلدانی زمانی ((ئورمیێ- ئورتودوکسانا)) یان بڵاوکردەوە.[43]

### ٢/٣/١ ئەنجامی کاری میسیۆنەکان

بەدرێژایی سەدەی ١٩ هەم دەوڵەتانی ئەوروپی لەهەوڵدانێکی بەردەوامی سیاسیو جەنگیو ئابوری دا بون بۆ ئەوەی جێگە پێی خۆیان لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بەگشتیو، لەناو سەرزەمینی ئێرانیو عوسمانیدا بەتایبەتی قایم بکەن. هەریەکەیان لەپەیجوری جێبەجێ کردنی ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیو لەسۆراخی دابین کردنی قازانجەکانی خۆی دابو. ئامانجەکانی دەوڵەتانی ئەوروپیو قازانجو دەسکەوتەکانیان لەناوچەکەدا هەمیشە لەگەڵ یەك جوتوگونجاو نەبون. روسیا چەندی بۆی بکرایە هەوڵی پەلهاوێشتنی لە ئەرزی عوسمانیو ئێرانیدا ئەدا، قازانجی لەقوت دانی هەردو دەوڵەت دا بو، بەڵام بەریتانیا قازانجی لەمانی ئەم دو دەوڵەتەدابو، بۆ ئەوەی وەکوکۆسپ لەبەردەم روسیادا بوەستنو نەهێڵن سنوری دەسەڵاتی روسی بگاتە سەرئاوی گەرمی دەریا ئازادەکانو قازانجەکانی بەریتانیا لە هیند بخاتە مەترسییەوە. فەرەنسەش لەلایەکەوە بۆ بەرەنگاری روسی پێویستی بەمانی ئەم دو دەوڵەتەو لەلایەکی ترەوە بۆ هەرەشەکردن لەبەریتانیا پێویستی بەجێگە پێو بنکە بو لەم وڵاتانەدا. ئەم دەوڵەتانە هەریەکەیان بەشێوەی تایبەتی خۆی هەوڵی بەجێ هێنانی ئامانجەکانی ئەدا. یەکێ لەرێگەکانی دزەکردن بۆ ناوچەکەو جێگیربون تێیدا گرنگی دان بو بەناسینو کۆکردنەوەی زانیاری جۆراوجۆر لەسەر ئەم وڵاتانە. لەوەشدا هەروەکو گەرۆكو زاناکانی مێژو، ئارکیۆلۆجی، جوگرافیا، زمانەوانی کەلکی زۆریان بۆ دەوڵەتەکانی خۆیان هەبو. میسیۆنە دینییەکانیش، بەهۆشیاری یالەروی بێ ئاگاییەوە، دەوری کاریگەریان هەبو لەجێبەجێ کردنی ئەوئەرکەدا.

لەناو مسیۆنێرەکاندا رەنگە مرۆڤی چاکەخواز، لەخۆ بوردو، خۆنەویست، خواپەرست زۆر بو بنو رەنگە زۆربەیان بەنیازی پاکی گەیاندنی پەیامی پیرۆزی مەسیحو پێشکەوتنی ئەوروپاو یارمەتی دانی گەلە مەسیحییە دواکەوتوە چەوساوەکانی ناوچەکە هاتبنو، ساڵانی درێژی تەمەنی خۆیان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردبێ. ئەوانە لەچەندین شوێنی دوروو دواکەوتودا فێرگەو نەخۆشخانەیان دامەزراند. چەندین لێکۆڵینەوەی بەنرخیان لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ژیانی گەلانی ناوچەکە نوسی. خوێندەواریو رۆشنبیریان لەسنورێکی دیاری کراودا

بلاوکردەوە. چەندین چاپخانەیان دامەزراندو چەندین کتێبو گۆڤاریان چاپکرد بەلاَم هەمو هەوڵو تەقەلای خێرخوازانەی ئەمانە لەدوا هەڵسەنگاندندا ئەرژایە ناو هەولْی جێبەجیْ کردنی ستراتیجی دەوڵەتانی ئیمپریالیستی ئەوروپییەوە کەچاویان بڕیبوە دەس بەسەراگرتنو داگیرکردنی ناوچەکە. لەوەشدا هەم میسیونێرەکان بون بەیەکیْ لەدەسکەلاکانی جێبەجیْ کردنی ئامانجی ناڕەوای دەوڵەتەکانیانو، هەم مەسیحییەکانی ناوچەکەش بون بەقوربانییەکی بیْ دەسکەوتی ئەو ستراتیجە، چونکە بون بە هۆی:

### ١. تێکدانی تەبایی مەزەبی

کەنیسەکانی ئەو دەوڵەتانەی میسیونی خۆیان ئەنارده ناو مەسیحییەکان لەمەزەبدا یەکگرتو نەبون، بەڵکو لەسەرمەزەبی جیاواز بون. کەنیسەکان لەگەڵ یەك جیاوازو ناکۆك بون. هەریەکەیان هەوڵی ئەدا باوەڕی خۆی بباتە ناو مەسیحییەکانەوە. لەوەشدا ئاسورییەکان لەچاو گەلە مەسیحییەکانی تردا لەهەمویان زیاتر توشی زەرەربون. باوەڕی مەزەبیو نەتەوەیی لەلای ئەرمەنییەکان تێکەڵاو بوبو، دینو مەزەبی بێگانە بەئاسانی نەی ئەتوانی کاریان تیْ بکا. بەلاَم ئاسورییەکان هێشتا لەپلەیەکی نزمی پێشکەوتنی فەرهەنگییو کۆمەلاَیەتیو ئابوریو سیاسیدا بون، بەژمارە کەمو لەیەك دورو دابڕاوبون ، میسیونە جیاوازەکان بەئاسانی ئەیانتوانی ریزەکانیان کون بکەنو مەزەبیان پیْ بگۆڕن. لەئەنجامی کاری میسیونە جیاوازەکاندا تەبایی مەزەبیی لەناو ئاسورییەکاندا نەما. ئەگەر لەپێشدا هەمویان یازۆرایەتییان نستوریو کەمایەتییەکیان کاسۆلیکی سەر بەرۆمابون، ئەوا دوای هاتنی ئەوانە ئەم گەلە بچوکە دابەشبو بەسەر چەند مەزەبی جیاوازی ناکۆکی وەکو پرۆتستانتی، کاسۆلیکی، ئەنگلیکانی، ئارتۆدۆکس...

### ٢. تێکدانی پێوەندی ئاسوری- کوردی.

لەپێش هاتنی میسیونە ئەوروپییەکاندا پێوەندی ئاسوری- کوردی تا ئەندازەیەکی باش ئاسایی بوە. مێژوی ناوچەکە باسی هیچ پێکدادانێکی خوێناوی گەورەی نێوان ئەم دو گەلە ناگێڕێتەوە. بێگومان ئاسورییەکان لەبەرئەوەی مەسیحی، یاوەکو پێیان گوتون((غەیرە دین))و((کافر)) بون، لەمافی دینی، سیاسی، ئابوری، کۆمەلاَیەتی... دا وەکو یەك نەبون لەگەڵ کورد یا لەگەڵ موسوڵمانەکانیتر، ئەوانە لەریزی ئەهلی زیممەدا بونو ئەبو((جزیە)) بدەن. مەزنەکانی کورد هەروەکو دانیشتوانو ئێلەکانی ژێردەستی خۆیان ئەچەوساندەوە، ئەبیْ ئاسورییەکانیان زیاتر چەوساندبێتەوە، لەوەشدا جگە لەدواکەوتنی گشتی

سیاسی‌و کۆمەڵایەتی هەموکورد، هەستی دینی‌و هاندانی مەلاکانی کورد دەورێکی کاریگەریان هەبوە. ئەگەرچی تەبایی دینی‌و مەزەبی هەرگیز لەناوکوردا نەبوە. لەکوردستاندا ئیسلام‌و مەزەبە جیاوازەکانی، کاکەیی- ئەهلی هەق، پیڕەوانی ئولی یەزیدی، مەسیحی، جو... هەبونو لەپاڵ یەکدا ژیاون. بەڵام لەمێژوی کوردا باسی جەنگی دینی‌و مەزەبی زۆر نیە، چەند جارێ قەتلوعامی یەزیدی کراوە، بەڵام باسی شەڕو پێکادانی دین‌و مەزەبەکانی‌تر نیە، بەتایبەتی شەڕی مەسیحی-موسوڵمان تا هاتنی میسیونەکانی بێگانە.

میسیونێرەکان دەورێکی کاریگەریان هەبو لەهاندانی ئاسوریەکاندا دژی گەلە موسڵمانەکانی دراوسێیان، بەتایبەتی دژی گەلی کورد کە نەخۆی دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبو، وە نە هیچ دەوڵەتێکی بێگانەش پشتیوانی لێ ئەکرد. هەر بۆ نمونە یەکێکیان لەنامەیەکی‌دا ساڵی ١٨٣٦ کەبۆ مارشیمۆنی نوسیوە، ئەڵێ: ((ئەوکوێرەوەرییەی خۆتو گەلەکەت لەم ناوچەیەدا، بەدرێژایی ئەوماوەیە بەسەرتان هاتوە، هەموی لەئەنجامی زوڵمی ئیسلامی‌دایە ... ئەوەش بەزەیی‌و هاودەردی برا مەسیحییەکانی ئەمریکاتانی وروژاندوەو سەرنجی راکێشاون بۆ مەسەلەکەتان))[٤٤]

ئەم جۆرە پەروەردە کردن‌و راهێنانە، لەو خوێندنگایانەی ئەمانە دایان ئەمەزران‌و، لەئامۆژگاری دینی ناو دیرەکان‌و، لەرەفتاری رۆژانەیاندا رەنگی ئەدایەوەو، کاری ئەکردە سەر دروست کردنی دوژمنایەتی لەبەینی مەسیحییەکان‌و موسڵمانەکاندا.

لەکاتێکا میرەکانی بۆتان، هەکاری، بادینان خەریکی خۆسازدان بون بۆ بەرهەڵستی هێرشی تورك بۆ سەر کوردستان، ناکۆکی لەبەینی کوردو مەسیحی‌دا ئەقییەوە.

بەریتانیا نەی ئەویست تورکیا لاواز بێ، یا هیچ بەشێکی لێ جیاببێتەوە، لەترسی ئەوەی نەوەکو کزی عوسمانی ببێتە هاندەری روسیا بۆ داگیرکردنی، بۆیە ئینگلیزەکان دژایەتی هەمو بزوتنەوەیەکی سەربەخۆیی- خوازی کوردیان ئەکرد. بۆ ئەو مەبەستەش" لەلایەکەوە نفوزی خۆیان لەناو مەسیحییەکاندا، بەتایبەتی لەناو ئاسورییەکاندا، بەکار ئەهێنا کە لەهیچ بزوتنەوەیەکی کوردا دژی حکومەتی عوسمانی بەشدار نەبن، بەڵکو ئەگەر بۆیان بکرێ ئەگەرەی لێ بدەن‌و دژی بوەستن. کەچی لەلاکەی ترەوە، زۆریان لەبابی عالی ئەکرد بۆ پاراستنی هێمنی‌و ئاسایش‌و، سەلامەتی ئاسورییەکان، لەشکر بنێرێتە سەرکوردستان‌و دەسەڵاتی میرو مەزنەکانی کورد نەهێڵێ.

لەكاتی خۆ ئامادەكرنی بەدرخان بەگدا بۆ بەرهەڵستی پەلاماری تورك، نوراللە بەگ مەزنی هەكاری كەیەكێ لەهاوكارە نزیكەكانی بەدرخان بەگ بو نامەیەكی بۆ مارشیمون نارد بۆ ئەوەی یەكتری ببینن‌و، گفتوگۆ بكەن بۆ بەلادا خستنی ناكۆكیەكانو، دانانی رێوشوێنی پێكهاتن‌و هاوكاری، كەچی میسیونێری ئینگلیزی بادجەر نەك نەیهێشت مارشیمون، نوراللە بەگ ببینێ، بەڵكو وای لێ كرد پەنا بۆ بابیعالی ببات، داوای سەركوت كردنی كوردەكانی لێ بكا.[45] كونسوڵی بەریتانی لەموسڵ بەناوی پارێزگاری نستورییەكانەوە لەدەستدرێژی كورد داوای لەكاربەدەستانی تورك كرد بەدرخان‌و بزوتنەوەكەی لەناوببەن.

بادجەر لەراپۆرتێكا بۆ((كۆمەڵی بڵاوە پێدانی ئینجیل)) نوسیوێتی: ((نوراللە بەگ میری هەكاری سەربەخۆیی لەنستورییەكان زەوت كردوە، ئەگەرنەو یارمەتییە كاتییە نەبوایە كەئێستە ئەیان درێ، كوردەكان سەریان پێ دانەواندبون بۆ قانونەكانی خۆیان كەقانونی جەنگەڵە))[46]

كونسوڵی ئینگلیز لەموسڵ‌و وان هانی ئاسورییەكانیاندا دژی بزوتنەوەكەی بەدرخان بەگ رابوەستن‌و، باجی نەدەنێ. ئەوەش بو بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕێكی خوێناوی لەنێوان كوردو ئاسوریدا(١٨٤٢-١٨٤٣) ئاسورییەكان لەو شەڕانەدا توشی زەرەری گیانیی‌و ماڵی زۆربون. نوێنەرانی دەوڵەتە مەسیحییەكانی ئەوروپا بەتایبەتی دیپلۆماتەكانی ئینگلیز ئەوەیان كردە بەهانە بۆ خۆتێ هەڵقورتان‌و بۆگوشار بۆ سەر بابیعالی‌و، داوای تەمێ كردنی كوردو، پاراستنی مەسیحییەكان لەكوردو، دامەزراندنی دەسەڵاتی ناوەندیی تورك لەناوچەكەدا.

هەڵوێستی دوژمنانەی نوێنەری بەریتانیا لەبەدرخان بەگو هاندانی بابی‌عالی بۆ لەشكر كێشی بۆ سەر بۆتان، لەدوای‌ترا بەجۆرێ لەبۆچونی سەركردەكانی كوردا، وەكو شێخ عوبەیدوڵلای شەمزینی‌و كوڕانی بەدرخاندا، رەنگی‌دایەوە كەهەرگیز باوەڕیان بە بەریتانیا نە ئەكردو، ئەیان ویست لەبەرامبەر بەریتانیادا پشتیوانی روسیا بەدەس بهێنن.

هەر لەئەنجامی هاندانی میسیونێرە بێگانەكاندا، ئاسورییەكان لەبەدرخان بەگ هەڵگەڕانەوە. لەجوڵانەوەكەی یەزدانشێردا بەشدارییەكی كەمیان كرد. سەرەڕای ئەوەی شێخ عوبەیدوڵلاش هەوڵێكی زۆری لەگەڵدان بۆ ئەوەی لەشۆڕشەكەی‌دا بیان‌كاتە هاودەنگ، بەڵام ئەوان لەسەر ئامۆژگاری میسیونێرو دیپلۆماتە ئەوروپییەكان بێ لایەن راوەستان. شێخیش رێزی بێلایەنییەكەی گرتن. لەو شەڕە خوێناوییەدا كە لەنێوان كوردو عەجەمدا، لەناوچەیەكا كەئاسورییەكانی لێ ئەژیان، قەوما ، رێگەی نەدا هیچ زەرەرێ لەئاسورییەكان بكەوێ.

### ٣. تێکدانی پێوەندی ئاسوری لەگەڵ حکومەتەکانی ناوچەکە.

روسیا لەململانێ دابو لەگەڵ دەوڵەتانی عوسمانیو ئێرانیدا. ناو بەناو ئەم ململانێیە ئەبو بەجەنگی سەختو، هەموجارێ ئەبو بەهۆی داگیرکردنی بەشێك لەئەرزی عوسمانی یا لەئەرزی ئێرانی. قەیسەری روسیا هەموجار بۆ مەبەستی فراوانخوازانەی تایبەتی خۆی هەوڵیئەدا کەڵك لەچەوسانەوەی دینی مەسیحییەکان وەربگرێ. هانی ئەدان بۆ هاوکاری لەگەڵ روسیا دژی عوسمانیو ئێران. هەموجار ئەمەش ئەبو بەبیانو بەدەس کاربەدەستانی بابی عالیو دەرباری قاجارەوە بۆ سزادانی قورسی مەسیحییەکان. بەڵکو هەندێ جار کوشتاری بەکۆمەڵیان. سەرەنجام هەردو گەلی ئەرمەنیو ئاسوری لەباتی ئەوەی بگەن بەمافی ئازادی دینیو نەتەوەیی، بونە قوربانیی سیاسەتی ئیمپریالیستی روسیەو، توشی لەناوچونی بەکۆمەڵو، ئاوارەبونی بەکۆمەڵ بون.

### ٢. ئامانجی نەتەوەیی گەلی ئاسوری.

ئاسورییەکان لەگەلە کۆنەکانی رۆژهەلاتی ناوەراستن. ئێستەش لەکاتی گەرانی ئارکیۆلۆجیدا لەزۆر شوێنی لەیەك دوری ناوچەکەدا شوێنەواری ئاشوری ئەدۆزرێتەوە، کەئەوان بەباووباپیری خۆیانی ئەزانن. هەروەها ناوی هەندێ مەڵبەندو شارو گوندو شاخو روباریش رەگەکەی ئەگەرێتەوە بۆ زمانی سریانی، کەئەوان بەزمانی خۆیانی ئەزانن.

ئاسورییەکان ماوەیەکی درێژ لەگۆشەی فەرامۆشی دابون. لەرووداوەکانی ناوچەکەدا دەورێکی دیاریان نەبوە. بەڵام لەناوەراستی سەدەی ١٩ هەمەوە، وەکو فاکتەرێکی دیار لەکوردستان، چ لەو بەشەی لەژێردەستی تورکو، چ ئەو بەشەی لەژێردەستی ئێراندابو هاتنە ناوانەوەو، لەسالآنی یەکەمین جەنگی جیهانییدا وەکو مەینەتییەکی گەورەی گەلێکی زۆر لێکراوی ئازادیخواز تەقییەوە.

ئەم میللەتە بەدرێژایی زەمان توشی کوێرەوەری بوە. لەژێرباری قورسی چەوسانەوەی دینیدا ژیاوە. پێشەوا دینییەکانی موسوڵمانەکانو کاربەدەستانی هەردو دەوڵەتی ئێرانو تورکیا، دەورێکی زۆریان هەبوە لەخرۆشاندنی هەستی دینی کوردا دژی ناموسوڵمانەکان، لەوانە ئاسوری. هەمیشە بەچاوی سوك سەیریان کردون. لەهەندێ قۆناغدا ناچاریان کردون کەنیشانەیەکی تایبەتی هەڵبگرن بۆ ئەوەی لەموسوڵمانەکان جیا بکرێنەوە. لەئەنجامی ئەمەشدا لەروی ئابورییەوە روتێنراونەتەوەو، لەروی کۆمەڵایەتییەوە پلەیەکی نزم تریان هەبوە لەکۆمەڵانی خەلکی موسوڵمان. لەهەندێ شوێنی کوردستان، مەسیحییەکانی کە بە((فەلە)) ناو براون، بۆ خۆپاراستن لەچەوسانەوەی جۆراوجۆر ناچار ئەبون خۆیان

بهاوێژنــه پــەنای ئاغایــەکی دەســەڵاتدارەوە. ئــەو ئاغایــەش بەرامبــەر بــەباج‌و سەرانەیەکی تایبــەتی ئــەبو لەبەرامبــەر دەســدرێژی ئاغایــانی تــرا بیــان پـارێزێ. سەرەڕای هەمو ئەمانە، مێژوی پەیوەنـدی کـورد-ئاسـوری تاسـەدەی رابـردو هـیچ روداوێکی خوێناوی ئەوتۆی تێدا نیە کەشایەنی گێڕانەوە بێ.

کـوردیش وەکـو ئاسـوری لـەژێرباری چەوسـانەوەو، هەمیشـە لەشـۆڕش‌و یـاخی بون‌دابوە. خاوەنی دەسەڵاتی سیاسی، سوپایی، دارایی تایبـەتی، تەنانـەت خـاوەنی دەسەڵاتی دینی‌و فەرهەنگیی خۆیشی نەبوە تا ئۆبـاڵی چەوسـانەوەو زەوت کردنـی مافی سیاسی‌و دینی، یا ئازادی‌و سەلماندنی مافی سیاسـی‌و دینـی گـەلێکی تـری لەئەسـتۆدا بـێ. بـەڵکو هەنـدێ دەوڵـەت‌و میللـەتی دەسـەڵاتداری‌تر ناکۆکییـان لەبـەینی هەردوگـەلی هاوسـێدا بـۆ قـازانجی خۆیـان دروسـت ئـەکرد، بـۆ ئـەوەی هەردوکیان لەژێر دەستی خۆیاندا بهێڵنەوە.

ئاسوری لەگەڵە کۆنەکانی ناوچەکەیە، مێـژوش رەنگـە بـەوردی لـەبیری نەیـەت لەکەیەوە نیشتەجێی ئەوێن. دەسەڵاتی حکومەتـە ئیسـلامییەکان بەدرێـژایی چەن قەرن، بەشێوەی جۆراوجۆر، لەژمارەی مەسیحییەکانی بەگشتی کەم‌کردۆتـەوە. ئـەم ناوچەیەش زیاتر لە ٤ قەرن لەژێردەستی دو هێزی زلدا بون، کە یەکێکیان شیعەو ئەوی تریان سوننە بوە ئایدیۆلۆجی رەسمیی دەوڵەتو، بەهانەی هەبون‌و کارەکـانی. ئەم دو ناوەندەش بەدرێژایی ٥ قەرن لەململانێدا بون. لـەم مـلملانێیـەش‌دا هـەمو رێگەیەکیان بەکارئەهێنا. لەوانە، لەناوبردنی بەکۆمـەڵی خەڵکو، بەگژ یەکا کردنی گەلان‌و هۆزو تیرە وبنەماڵـە. ئـەو دو هێـزە هـیچ کامیـان نـەی‌توانی ئـەوی تریـان لەناوببات. بـەڵکو هـەردوکیان یـەکتریان شـڕو لاوازکـردو ناوچـەکەیان لـەکاروانی پێشـکەوتنی دنیـا دواخسـتو، بـون بـەهۆی وێرانـی وڵاتـو دواکـەوتن‌و هـەژاری گەلەکانی خۆیان‌و، رەخساندنی هـەل بـۆ دەوڵـەتانی مەسـیحی ئـەوروپی، کـەپێش بکەون‌و دەوڵەمەندو بەهێز بن‌و، چاو ببڕنە قەڵـەمڕەوی ئـەم دو دەوڵەتـە. ئـەمانیش لەئەنجامی ململانێی بـەردەوامی درێـژخایانی بـەینی خۆیـاندا هەرچـی تینوتـاوو هێزیان هەبو داچۆڕابو.

لەســەدەکانی رابــردودا ئاســورییەکان داوای جیابونــەوەیان نــەکردوە. هــەوڵی دروست کردنی دەوڵەتی سەربەخۆیان نەداوە. هەمیشە لەتەلاشی ئەوەدابون بەچاوی یەکسانی لەگەڵ هاوڵاتییانی موسوڵمان سـەیر بکـرێن‌و رەفتاریـان لەگـەڵ بکـرێ. بەڵام ئەوانیش خۆیان بەهۆی لەیەك دابڕان‌و دوری‌و دواکەوتنەوە، تەبایی مەزهەبی‌و فەرهەنگی‌و زمانی‌یان نەبوە. ئاسورییەکانی هەکاری‌و بۆتان‌و بادینان کـەپێك‌هـات بون لەچەند تاقمێکی خاوەن رێکخستنی خێڵـەکی وەکـو ئێلـەکانی جیلـو، بـازی،

تخـومی، تیـاری، ئاشـیتی لەگـەڵ کلدانـەکانی شـەقلاوەو عـەینکاوەی هـەولێرو هەرمۆتـەی کۆیـەو شـوێنەکانیتری موسـل وەکـو یـەك نـەبون. هـەروەها لەگـەڵ ئاسـورییەکانی ورمـێیش جیـاوازبون. هـاتنی میسـیونی دەوڵـەتو کەنیسـە جیاوازەکان ناکۆکییەکانی ناوی قوڵتر کردنو، کێشەی پێوەندییەکانی ئەوانی هەم لەگەڵ دەوڵەتانی ئێرانیو عوسمانیو، هەم لەگەڵ گەلانی دراوسێیان زیاتر ئاڵۆزان.

میسـیونێرە ئـەمریکی، فەرەنسی، روسـی، ئینگلیزییـەکان لـەئێرانو تورکیـا بەناوی یارمـەتی دانو پێش خستنی مـەسیحییەکانی کوردستانەوە دامـەزرابون. ئەگەرچی دەیان نەخۆشخانە، خوێندنگا، چاپخانە، شوێنی فێرکردنی کارپیشە ... یان بۆ دروست کـردنو لـەم رووەوە خزمـەتێکی گـەورەیان کـردن. بـەلام دەوڵـەتانی ئـەوروپایی هـەوڵیانئـەدا، هـەم میسـیونەکانی خۆیـانو، هـەم مـەسیحییەکانی کوردسـتان، بـۆ مەبەسـتی تایبـەتی خۆیـانو، بـۆ دەسـوەردانە کاروبـاری نـاوخۆی ئێرانو تورکیاو، چەسپاندنی جێگە پێی خۆیان لەناوچەکەدا بەکار بهێنن.

میسـیونەکان بـەهۆی بلاوکردنـەوەی خوێنـدەواری، کردنـەوەی قوتابخانـە، دامەزرانـدنی دەزگـای چـاپ، بلاوکردنـەوەی کتێـبو گۆڤـارو رۆژنامـە، هۆشـی نەتەوەییان لەناو ئاسورییەکاندا ئەبوژانەوە. هۆشـی نەتـەوەیی تێکـەلاوی هەسـتی دینـی ئـەبو. ئەگـەر جـاران بەسـەلماندنی مـافی ئـازادی دینـی دابـین ئـەبون، ئـیتر خواستی سیاسـیو فەرهەنگییشـیان هـەبو. ئـەیان ویسـت لـەکاروباری دەوڵـەتیدا نوێنەری خۆیان هەبێو بەشداربن، بەزمانی خۆیان بیخوێننو فەرهـەنگی تایبـەتی خۆیـان گەشـە پـێ بـدەن، جیـاوازی لـەنێوان ئـەوانو هاولاتییـانی موسـوڵماندا نـەمێنێ. بەشـێنەیی وایلـێ ئـەهات، مـەسیحییەکان بەگشـتی، دڵسـۆزییان بـۆ دەوڵەتانی ئەوروپی بەهێزتر ئەبو لەچاو دڵسـۆزییاندا بـۆ دەوڵەتـەکانی خۆیـانو، ئـەوانیان بـەپارێزەرو دالـدەی خۆیـان ئـەزانی. ئـەوانیش گوشـاریان بـۆ بابیعـالیو دەرباری قاجار ئـەهێنا کـەمافی مـەسیحییەکان بسـەلمێننو زوڵـمو زۆریـان لەسـەر لاببەن.

لـەدوای تێشـکانی دەوڵـەتی عوسـمانی لەبـەردەمی روسـیەدا( ١٨٧٧ ) کاتـێ دەوڵەتانی ئەوروپی پەیمانی بـەرلینیان بەسـەر تورکیـادا سـەپاند، لەچەند مـادەدا پاراسـتنی مـەسیحییەکانو سـەلماندنی مافـەکانیان تێخسـتبـو. ئـەم گوشـارە ئەوروپییە بۆ سەر عوسمانیو، ئەم جۆرە دەسـوەردانە کاروبـاری نـاوخۆو، هەوڵـدانی روسیا بۆ کەڵك وەرگرتن لەمەسیحییەکانی ئێرانو تورکیـا لـەکاتی جەنگـەکانیدا لەگەڵ ئەم دو دەوڵەتەو، هاوکاری کردنی کەموزۆری مـەسیحییەکان لەگەڵ روسـیاو بەریتانیا دژی تورکیاو ئێران، زەمینەی دوژمنایەتی لـەناو داوودەزگـای دەوڵـەتیی

رۆمو عەجەمو، لەناوگەلانی هەردو دەوڵەتدا خۆش ئەكردو، ئەبویە بەهانە بەدەستیانەوە بۆ ئازاردانی زیاتریان.

كە((ئینقلابی عوسمانی)) لەژێر دروشمەكانی حوریەت، عەدالەت، مساواتدا، هەڵگیرساو، سەرلەنوێ دەستوری هێنایەوە مەیدانی كارپێ كردنو، مافی هەموگەلانی عوسمانی بێ گوێدانە جیاوازی دین، زمانو نەتەوە، سەلماند(١٩٠٨)، خۆشی خستە ناو دڵی هەموگەلە زۆرلێكراوەكانی عوسمانییەوە. بەڵام ئەو خۆشییە زۆری نەخایاند، چونكە سەركردەكانی((اتحادو ترقی)) لەسیاسەتی نەتەوەییدا كەوتنە جێبەجێ كردنی پلانی توركاندنی نەتەوە نەتوركەكان پێڕەویو ئامانجی پان-تۆرانیزمو، لەسیاسەتی دینیدا كەوتنە پەیڕەوی ئامانجی پان _ ئیسلامیزم. ئەو هیوایەی گەلە نەتوركو نەموسوڵمانەكان بەشۆڕشەكەیان هەبو نەهاتە دی. جیاوازی دینیو جیاوازی نەتەوەیی لەجاران زیاتری كرد.

ئاسورییەكانیش، وەكو ئەرمەن، هەواڵی تێوەگلانی بابیعالییان لەیەكەمین جەنگی جیهانییەوە بەخۆشیو پەژارەوە وەرگرت" بەخۆشیەوە چونكە بەهیوای ئەوەبون دەوڵەتی عوسمانی لەجەنگدا بشكێو، قەڵەمڕەوەكەی پارچە پارچە ببێو، ئەوانیش لەدەس زۆرلێكرانی دینیو نەتەوەییو رزگاربن. بەپەژارەوە چونكە لەچارەنوسی خۆیانو، تۆڵەی دڕندانەی توركو گەلە موسڵمانەكانی تر ئەترسان.

قەیسەری روسی داوای لەگەڵ مەسیحییەكانی ژێردەستی تورك كرد، بەتایبەتی لەگەڵانی ئەرمەنیو ئاسوری، كرد" دژی دەسەڵاتی عوسمانی راپەڕنو شۆڕش بكەنو هاوكاری هێزە چەكدارەكانی روس بكەن، بەرامبەر بەوەش بەڵێنی ئازادیو سەربەخۆیی پێدان لەپاش بردنەوەی جەنگ. مەسیحییەكان، بەدەنگ بانگەوازی قەیسەرەوە چون، بەسەدانیان ریزەكانی ئۆردوی توركیان بەجێ هێشتو چونە پاڵ سوپای روسیو، لەمەیدانەكانی جەنگدا هاوكاری جۆراوجۆری روسیەیان كرد. سەركردەكانی((اتحادو ترقی)) خۆیان لەبەهانەبون لەمەسیحییەكان، بەوەش بیانویەكی بەهێزی قەڵاچۆكردنی بێ بەزەییانەیان دەسكەوت.

تورك ئەوەی كردە بەهانەو كەوتە كوشتاری بەكۆمەڵی ئەرمەنیو ئاسوری. لەو سەردەمەدا ژمارەی ئاسورییەكانی دەوڵەتی عوسمانی بە١٥٠هەزار كەسو ئاسورییەكانی ورمێو دەورو بەری بە٥٠ هەزاركەس ئەخەمڵێنران. هێزەكانی تورك چونە سەریان، ئەوی نەكوژراو دەربازبو بەناچاریو تێشكاوی نیشتمانی دێرینەی خۆی بەجێ هێشتو رویكردە ورمێ، كەئەوسا لەژێردەسەڵاتی سوپای روسی دابو.

نیكیتین سەبارەت بەئامانجی نەتەوەیی ئاسورییەكان نوسیوێتی:

((...نستوریيەکانی تورکیا...چاوەڕێ بون دوای جەنگ ئازادو سەربەخۆبن، ئەوانەشیان کەهاوڵاتی ئێران بونو لەورمێ ئەژیان...ئومێدەواربون دوای جەنگ هەلومەرجی ژیانیان بگۆڕێو، لەژێردەسەڵاتی دەوڵەتانی ئیسلامی دەربێن...))[47]

نوسەرێکی ئێرانی لەژێر سەرناوی((بیری پوچی ئاسوریيان))دا نوسیوێتی:

((بەو جۆرەی ئەزانرێ مارشیمون سەرۆکی دینیی ئاسوریيان بیری ئازادیو فەرمانڕەوایی لەسەردا بو، وە بەتەمابو کەڵك لەهەلومەرجی شێواوی دنیا وەربگرێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی ئاسوری لەبەشێکی خاکی ئێرانو عوسمانیدا. ئەو بینی بوی کەعوسمانییەکان بۆ پاکردنەوەی نەژادو خاکی خۆیان ئاسوریيەکانیان کوشت بو، ئەوانەی لەکوشتن رزگاریانبو رایان کردبو بۆ ئێران، خۆیشی یەکێ بولەوانە. سیاسەتی ئەودەمی هاوپەیمانەکان پێکهێنانی لەشکرێ بو لەمەسیحییەکان لەئازەربایجان، ئەویش ئەیویست ئەو هەلە بقۆزێتەوەو، ئەوەندەی بتوانێ ئەو ناوچانە لەبونی موسڵمانان پاك بکاتەوەو نەیان هێڵێ، وەپایەکانی حکومەتی پاشەڕۆژی خەیاڵیی خۆی قایم بکا. لەبەرئەوە لەگەڵ ئەوەی مارشیمون پێشەوایەکی دینیبو، ئەبو بەڕاستی لەگەڵ کوشتو کوشتار نەبێ، کەچی ئاسوریيەکانو مەسیحییەکانی هانئەدا بۆ کڕینی چەکو خۆچەکدارکردنو خۆئامادەکردن بۆ جەنگ.[48]

بۆ ئەوەی لەئامانجی نەتەوەیی ئاسوریيەکان لەو قۆناغەدا تێبگەین چەند بەڵگەیەك لەبەر دەسدایە. یەکێکیان بریتییە لەو مەرامنامەیەی((کۆمیتەی ئازادی ئاسوری)) لە٢٧ یحوزەیرانی ١٩١٧ دا لەکاتی پێکهێنانی تیپە چەکدارەکانی ئاسوریدا لەورمێ بڵاوی کردۆتەوە. ئەوی تریان ئەو یادداشتەیە کەدەستەیەکی نوێنەرایەتی بەناوی گەلی ئاسوریو کلدانیەوە لەپاریس پێشکەشی کۆنفرەنسی ئاشتی کردوە.

لەمەرامنامەکەدا نوسراوە:

((١. ئامانجی سەرەکی کۆمیتەی ئازادی ئاسوری، پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتییەکی سەربەخۆیە لەمەڵبەندەکانی: ورمێ، موسل، تور عابدین، نسیبین، جزیرە، جولەمێرگ، بەو مەرجەی لەکاروباری بازرگانیو جەنگیدا هاوپەیمانی روسیای ئازادی مەزن بێ.

٢. ئەنجومەنێکی نەتەوەیی بنچینەی ئەم سەربەخۆییە ئەبێ، قانون دائەنێ، وەزیرانو سەرکۆمار لەجێبەجێ کردنیدا بەشدارئەبن.

٣. هەڵبژاردنی نوێنەرانی ئەنجومەنی ناوەندی بەم ٧ مەرجانەی لایخوارو ئەنجام ئەدرێ: مەرجەکانی حەقانییەت، وەکیەکی، جیاوازی نەکردن بەهۆی مەزەب،

وەجاخزادەیی، رەسەنی، رەگەز، زمان ئەوانەی ۲۰ساڵی تەواون، مافی هەڵبژاردنی نوێنەرانی ئەو ئەنجومەنەیان هەیە. تەمەنی ئەوانەی کاندید ئەکرێن‌و هەڵ ئەبژێردرێن نابێ لە۲۵ ساڵ کەمترو لە۶۰ بەرەوژور بێ.

٤. دەوڵەت دەس ئەگرێ بەسەر ئەرزی زەویدارەکاندا، بۆ ئەوەی بەپێی بەرنامەی کاربەدەستانی دەوڵەت بەسەرگەلدا دابەش بکرێ.

٥. زەویوزاری کەسانێ کەسەدان ساڵە دەسیان بەسەر ئەرزەکاندا گرتوە، ئەبێ بێ‌گوێدانە مەزنایەتی نەتەوەو رەگەز لەلایەن کاربەدەستانی دەوڵەتەوە زەوت بکرێ‌و، بەیەکسانی بەسەر رەنجبەراندا دابەش بکرێ، بەروبومەکەشی بۆ خۆیان ئەبێ بۆ دابین کردنی پێویستییەکانی خۆیان، هیچ جۆرە زەوییانەیەکیان لێ ناسێنرێ. زەویدارەکانیش، بەگوێرەی پێویستییەکانی خۆیان، پارچە ئەرزیان ئەدرێتێ. ئەبێ پەیڕەوی ئەمانەی خوارێ بکرێ:

یەکەم: ئەو ئەرزانەی هی زەویداربون، یا خاوەنەکەی بەپارەی خۆی کڕیونی، پاش لێکۆڵینەوەی قەباڵەو بەڵگەکانی‌و سابت بونی، دەستی بەسەرا ئەگیرێ‌و نرخەکەی ئەبژێردرێ‌و بەخاوەنەکەی ئەدرێ.

دوەم: هەموکانەکان، کانی ئاو وهی‌تر، لێڕەوار، بۆ کەڵکی گشتی لەخاوەنەکانی ئەسێنرێ‌و ئەخرێنە ژێرسەرپەرشتی کاربەدەستانی دەوڵەتو بەڕێوەبەرایەتی ناوەندییەوە.

٦. هەمو ئاشورییان، نێرو مێ، بێ جیاوازی چینایەتی" لەبەردەمی قانوندا وەکیەکن.

٧. ئازادی دەربڕین، نوسین، دین، کۆبونەوە، باوەڕ ئەدرێ بەو مەرجەی زەرەر لەشەرەف نەدا.

٨. هەموکەس بەپێی دەرامەتی خۆی باج‌ئەدا، باج لەهەمو خەڵك بەبێ جیاوازی وەرئەگیرێ.

٩. منالانی خوار تەمەنی ۱۱ ساڵ بۆ خوێندن‌و فێربون ئەبێ ببرێنە خوێندنگا.

۱۰. کاروباری دینی بەتەواوی لەکاروباری سیاسی جیا ئەکرێتەوە، روحانییەکان مافی دەسوەردانە کاروباری سیاسی‌و حقوقییان نیە.

۱۱. ئەبێ کەڵك لەرێکخستنی سۆسیال دیموکرات وەربگیرێ، ئەم پارتییە ئەبێ بەگوێرەی بەرنامەی کارل مارکس دەسکەوتو بەرژەوەندییەکانی رەنجدەران دابین بکا.

١٢. ڕاگرتنی ئەو باجە ناڕەوایانەی باری شانی خەڵکو ڕەنجدەرانی قورس کردوە.
١٣. هەمو ئەو گەلو نەتەوانەی لەدەوڵەتی ئازادی ئاشوری‌دا ئەژین، ئەتوانن بەئازادی بەپێی دینو مەزەبی باووباپیریان بژین، بەلاّم ئەبێ مل بدەن بۆ قانونەکانی دەوڵەتی جمهوری ئاشوری، کەئەنجومەن دایان ئەنێ.
١٤. لەهەمو شوێنەکانی ولاّتدا، هەمو زانستەکان بەزمانی سریانی ئەخوێنرێن.))[٤٩]
هەروەها لەو بیرخەرەوەیەدا کە لەتەموزی ١٩١٩دا سەعید سادقو نەجیب ڕۆستەم بەناوی گەلی ئاسوریو کلدانیەوە داویانە بەکۆنفرەنسی ئاشتی پاریس، داوای دروست کردنی دەوڵەتێکی ئاسوری سەربەخۆیان کردوە لەسەر زەمینێکی فراوانی ولایەتەکانی ڕۆژهەلاّتو خواروی تورکیا لەگەڵ حەلەبو دیرەزوورو موسڵ بەو مەرجەی دەرویەکیشی لەسەر دەریا هەبێ. دەستەی نوێنەرایەتی گەلی ئاسوری ئەوەی کردبو بەبیانوی خواستەکانی کەزۆرایەتی دانیشتوانی ئەو شوێنانە ئاسورینو ڕەچەڵەکی هەندێ لەئێلەکانی کوردو عەرەب ئاسوریە.
دیاری‌کردنی ئامانجی ئاسورییەکان بەو جۆرەی لەم بەڵگانەدا باسی‌کراوە لەچەند لاوە توشی بەرەنگاری ئەبو:
یەکەم-لەئاستی ناوچەی‌دا" چونکە لەگەڵ ئامانجی نەتەوەیی گەلانی تورکو کوردو عەرەبو ئازەری لەیەکی ئەداو، ئەو سەرزەمینەی ئەوان ئەیان ویست دەوڵەتی ئاشوری تیا دابمەزرێنن هیچ یەکێ لەم گەلانە بەهی ئاسوورییان نەئەزانی، بەڵکو هەندێ لەو نەتەوانە لە ناوخۆیاندا ململانێییان بو لەسەر خاوەنێتی هەندێ لەو شوێنانە.
دوەم-لەئاستی دەوڵەتانی ناوچەکەدا" ئەو شوێنانەی ئاسورییەکان لەبەرنامەی خۆیاندا دیارییانکردوە، بەشێکی قەڵەمڕەوی ئێرانیو بەشێکی قەڵەمڕەوی عوسمانی‌بو. هەم حکومەتی ئێرانو هەم حکومەتی تورك بەتوندی دژی ئەم پرۆژەیە ڕائەوەستان، چونکە ئەبو بەهۆی دابڕینو جیاکردنەوەی هەندێ لەئەرزی ئەم دو دەوڵەتە.
سێیەم-لەئاستی جیهاندا" خواستێکی لەو بابەتە نەی ئەتوانی پشتیوانیی ڕاستەقینەی هیچ‌کام لەدەوڵەتە گەورەکانی جیهان بەدەس بهێنێ. تاپێش یەکەمین جەنگی جیهانی هەمو دەوڵەتە گەورەکانی ئەوروپا، جگە لەروسیە، بۆ ڕاگرتنی((هاوسەنگی هێز)) مانی ئێرانو تورکیایان بەپێویست ئەزانیو، ڕێگەی هەڵوەشانو داگیرکردنیان نەئەدا، دوای جەنگیش دابەش‌کردنی ناوچەکە بەو پێیەی لەسەردەمی جەنگدا لەزنجیرە ڕێککەوتنە نهێنیەکانی ئەستەمول، لەندەن،

سایکس-پیکۆ...که دوایی‌تر سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسیا هەندێ گۆڕینی ناچاریی بەسەر هێنا، جێگەیەکی تیا نەبو بۆ دەوڵەتێکی لەو بابەتە.

کۆسپی هەرەگەورەی سەرنەکەوتنی ئەم پرۆژەیە خودی گەلی ئاسوری بو، چونکە لەهەمو ئەو شوێنانەدا کەئەوان بەتەمای دروستکردنی دەوڵەتی تایبەتی خۆیان بون تێیدا، کەمایەتی دانیشتوانیان پێك ئەهێنا، بگرە لەزۆرێ ئەو شوێنانەدا کەمایەتییەکی بچوك بون.

جێبەجێ‌کردنی پرۆژەی دەوڵەتی ئاسوری لەتوانای گەلی لێقەوماوی ئاسوری خۆی بەدەربو. هیچ نەتەوەیەکی ناوچەکەو، هیچ دەوڵەتو هێزێکی ناوچەییو جیهانییش قازانجی لەیارمەتی‌دانو دروستکردنی‌دا نەبو، جا لەبەرئەوە داڕشتنی ئامانجی نەتەوەیی ئاسورییەکان بەو شێوەیە نەك هەر خواستە رەواکانی ئەم گەلە لێقەوماوەی نەهێنایە دی، بەڵکو مەسەلەکەیانی زیاتر ئاڵۆزانو کردی بەقوربانیی سیاسەتی دەوڵەتە ئمپریالیستیەکانی روسیاو بەریتانیا.

### ۳. تورکو مەسیحی

### ۱/۳کێشەی دینیو نەتەوەیی لەتورکیا

تا دوا چارەکی قەرنی ۱۹هەم ئیمپراتۆریی عوسمانی هێشتا یەکێ‌بو لەدەوڵەتە فراوانەکانی دنیا. لەناو ئەم قەڵەمڕەوە فراوانەدا، رەگەز، زمان، نەتەوە، دین، مەزهەبی جیاوازی تێ‌دابو. داوودەزگای بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی نمونەی دواکەوتنو زۆرداریو بەرتیلخۆریو فسادبو. هەلومەرجی سیاسی، ئابوری، کۆمەلایەتی، فەرهەنگی وڵات لەوپەڕی دواکەوتنو خراپی‌دابو. دەستور یا قانونێك نەبو مافو فرمانەکانی هاوولاتییان داین بکاو، پێوەندی نێوانی هاوولاتیو دەوڵەت رێك بخاو، مافی نەتەوەییو دینییو مەزهەبی‌گەلو نەتەوەو دینە جیاوازەکان دیاری بکا.((رەعییەت)) بەگشتی، توێژێکی کەمی نەبێ، هەموی لەژێرباری چەوسانەوەو زۆرلێکراندا ئەی ناڵاند. دەسەلاتی بێ سنوری سوڵتانو، لاساری کاربەدەستانی بابیعالیو، توێژی کۆنەپەرستی داوودەزگای بەڕێوەبەرایەتی، سەرباری ئەمانەش، دواکەوتنی کۆمەلانی خەڵك، کۆسپێکی گەورەبون لەبەردەم هەمو ئەو ریفۆرمیستو چاکەخوازو رۆشنبیرانەی ئەیان ویست هەلومەرجی وڵات باش بکەن.

دنیا بەرەو گۆڕان ئەچو. هۆشی سیاسی لەناو گەلانی زۆرلێکراوی عوسمانی‌دا ئەخەملا. خەڵك داوای ئازادی سیاسیو دینیو فەرهەنگییان ئەکرد. کاروباری دەوڵەت، ئیتر نەئەتوانرا وەکو کۆن، بەڕێوە بچێ. یا ئەبو گۆڕانی بنەڕەتی لەژیانی ناوخۆی‌دا بەدی بهێنێ، سەرلەنوێ مافی هاولاتییان وەکو تاکو، مافی گەلان

وەکو کۆمەڵانی دینی، مەزەبی، نەتەوەیی جیاواز بسەلمێنێو، پێوەندییان لەسەر بنچینەی وەکیەکیو ڕێزگرتنی یەکتری لەگەڵ دەوڵەت ڕێك بخاتەوە. یا ئەبو خۆی ئامادەبکا بۆ ئەوەی هەر ساڵەی گەلێکی لێ جیا ببێتەوە، پارچەیەکی لێ دابڕێو، شۆڕش لێرەو لەوێ هەڵ بگیرسێ.

پاش ململانێیەکی زۆر ئازادیخوازانی عوسمانی توانییان سوڵتان عەبدولعەزیز لێ بخەنو، بەهیوای سەلماندنی قانونی ئەساسی((دەستور)) لەجێگەی ئەو، برازاکەی، مرادی پێنجەم بسوڵتان دابنێن(١٨٧٦). پاش چەند حەفتەیەك مرادیش لێ خرا، چونکە دەرکەوت((عەقڵ))ی ناتەواوە. لەجێگەی ئەو عەبدولحەمیدی برای لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانرا بەو مەرجەی خواستەکانی ئازادیخوازانی عوسمانی بسەلمێنێ" کە یەکەمینیان بلاوکردنەوەی دەستوری بو، کۆتایی بە((حوکمی ئیستیبدادی)) بهێنێو بنچینەی((حوکمی دەستوری)) دابمەزرێنێ.[٥٠]

کاتێ عبدولحەمید سەڵتەنەتی وەرگرت(١٨٧٦) ئەگەرچی ئیمپراتۆریی عوسمانی لەتەنگوچەڵەمەیەکی قوڵابو، بەلام هێشتا ئەرزێکی پانو بەرینی لەئاسیاو ئەوروپاو ئەفریقا لەژێر دەستابو:

لەئاسیا" ولایەتەکانی ئزمیر، بروسە، بیغا، قستمونی، ئەنقەرە، قونیە، ئەدەنە، سیواس، تەرابزون، ئەرزڕوم، مەعمورتولعەزیز، دیاربەکر، بتلیس، وان، موسل، بەغداد، بسرا، حەلەب، ئەلزور، سوریا، بیروت، قودس، لوبنان، حیجاز، یەمەن، ئەحسا.

لەئەوروپا" ولایەتەکانی فلاخ، بغدان(ڕۆمانیا). سیلستریا، ودین، نیش(بولغاریا). سیرب، بوسنە، هرسك، چیای ڕەش، ئەلبانیا، یانیا، سەلانیك. جزیرەکانی کریت، رودس، قوبروس، مدللی، ساقس، بتمس...هتد

لەئەفریقا" میسر، سودان، تەرابلوسی غەرب، بەنغازی، تونس[٥١]

عەبولحەمید وەکو بەڵێنیدابو دەستوری بلاوکردەوە.((مەجلیسی مەبعوسان)) لەئازاری ١٨٧٧ داکۆبوەوە. مەبعوسەکان لەڕوی نەتەوەوە: تورك، عەرەب، سریانی، ئەرمەنی، ئەلبانی، یۆنانی، بولغاری، بۆسنی، سلاڤی، سربی، فلاخی، فارس، کوردو، لەڕوی دینەوە موسوڵمانی سوننی، شیعی، وەهابیو، مەسیحی ئورتودوکس، نەستوری، مارونی، ملکی، لاتینی، یەعقوبی، ئینجیلی، هەروەها جو، دروزو نەسیرییان تێدابو.[٥٢] نە دەستورو نە مەجلیس وانەبون وەکو لیبراڵەکانی عوسمانی، بەتایبەتی مدحەت پاشا، ئەیان ویست. چونکە عبدولحەمید هەر لەسەرەتاوە بەنیازی پیلانگێڕان مەرجەکانی ئازادیخوازەکانی سەلماندبو، بۆ هەل

ئەگەرا دەسکەوتەکانیان لێ بسێنێتەوە. بەڵام وەکو یەکەمین تەجروبەی دەستوریو دیموکراتی لەژیانی دەوڵەتی عوسمانیدا، کارێکی مێژوییو گرنگبو. یەکەمین جاربو نوێنەرانی ئەو هەمو نەتەوە، زمان، رەگەز، دین، مەزەبە جیاوازانە پێکەوە کۆببنەوە، لەکاروباری دەوڵەت بدوێن. باسی گیروگرفتو ناتەواوییەکانی بکەنو، بۆ دۆزینەوەی چارە بگەڕێن.

عەبدولحەمید جەنگی روسی- عوسمانی(١٨٧٧) کردە بەهانەی هەڵوەشاندنەوەی مەجلیسو لەکارخستنی دەستور. رێگەی((حوکمی ئیستبدادی)) گرتەوە. کەوتە لەناوبردنو راونانی ئازادیخوازان. داودەزگای جاسوسی بەهێزی بۆ سەرکوت کردنی نەیارەکانی دامەزراند. هەمو جۆرە ئازادییەکی چ وەکو تاك لەهاولاتییان((رەعییەت))و، چ وەکو کۆمەڵ لەگەلانی عوسمانی زەوت کردەوە.

لەئەنجامی جەنگو سەپاندنی پەیمانی بەرلیندا(١٨٧٨)، دەوڵەتی عوسمانی لەئەوروپا: رۆمانیا، بولغاریا، بۆسنە، هەرسك، چیای رەش، سیرب، قوبرسو، لەئاسیاش: ئەردەهان، باتوم، قارسی لەدەسدا. دوایی تریش تونس، میسر، سودانی لێ دابڕا. شێخ عوبەیدوللا لەهەڵسەنگاندنەکەیدا بەهەڵە نەچوبو" ئەو دەوڵەتە تا ئەهات لەهەڵوەشان نزیك ئەبوەوە.

عەبدولحەمید بەهیچ جۆرێ ئامادە نەبو لەگەڵ چاکەخوازانی عوسمانی بسازێ. بەڵکو تائەهات ترسو تۆقاندنی زیاتر ئەکردو، هەر نیشانەیەکی ئازادی ئەدی کوێری ئەکردەوە. هەموخواستێکی دیموکراتی ئازادیخوازانی تورکو، هەمو خواستێکی ئازادی دینیی گەلانی ناموسوڵمانو، هەمو خواستێکی ئازادی نەتەوەیی گەلانی نەتورکی، بەمەترسییەکی گەورە دائەنا بۆ سەر دەسەڵاتی خۆیو پایەکانی دەوڵەت. جامیعەی ئیسلامی((پان- ئیسلامیزم))ی کردبوە بنچینەی سیاسەتی نزیك خستنەوەی گەلانی موسوڵمانی کوردو عەرەبو ئەلبان. هەر بۆ ڕاکێشانی ئێلەکانی کوردو، بەکارهێنانیان بۆ سەرکوت کردنی هەڵگەڕانەوەی ناوەوەو، شەڕ لەدەرەوەی سنور دژی روسیاو ئێران بەهەزارانی لەرێزی((حەمیدیە سواری ئالایلری))دا سازدا.

ئەگەرچی هەمو گەلانی عوسمانی لەژێر باری زۆرداری عەبدولحەمیدا توشی کوێرەوەری بوبون، بەڵام نەتەوەی ئەرمەنی لەهەموان پتر توشی مەینەتیو کوشتنی بەکۆمەڵو، دەربەدەری بون.

ئازادیخوازانی عوسمانی، کە لەمێژودا بەلاوانی تورك((ژون تورك)) ناسراون، کەوتنە شێوەی جۆراوجۆری خەبات، لەوانە دروست کردنی رێکخراوی نهێنیو، بڵاوکردنەوەی گۆڤارو رۆژنامە لەدەرەوەی وڵات، بۆ گێڕانەوەی دەستور. لەم

خەباتـەدا جگـە لـەئازادیخوازانی تـورك، تێكۆشـەرانی كـورد، ئەرمـەنی، عـەرەب، ئـەلبانی... بەشـداربون، تەنانـەت دو لەدامەزرێنـەرانی((ئیتحـادو تـەرەقی))، ئیسحاق سكوتیو عەبدوڵلا جەودەت، كورد بون.[٥٣]

عەبدولحەمیـد بەخۆشـی ملـی بـۆ هـیچ جـۆرە گـۆڕانێكی دیموكراتی‌نـەدا، تـا سەرەنجام ئەفسەرانی حیزبی نهێنی((ئیتیحادو تەرەقی)) بەجولانێكی سوپایی لـە ژێر ناوی((ئینقلابی عوسمـانی))دا ناچـاریان كـرد دەسـتور بگێڕێتـەوەو، رێگـەی هەڵبژاردنی مـەجلیسی مەبعوسان بداتەوە(١٩٠٨).

كێشـەی جیـاوازی دینیـی، جیـاوازی مـەزەبی، جیـاوازی نەتـەوەیی لەوانـە بـو كەقەوارەی ئیمپراتۆریی عوسمانییان كلۆر كردبـو. هـەمو ئەوانـەی رەگـەز، زمـان، نەتەوە، دین، مەزەبیان جیاوازبو چاوەڕێی ئـەوە بـون لـەژێر سـێبەری ئینقلـیلابـدا بەمافەكانی خۆیان بگەن. چەوسـانەوەیان لەسـەر هـەڵ بگـیرێو، وەكـو یـەك كـەڵك لەمافی هاوڵاتی بونی عوسمانی وەربگرن. بەهیوا بون سەردەمی نوێ رێخۆش بكا بۆ چارەسەركردنی دیموكراتییانەی كێشـەی جیـاوازی نەتـەوەیی، دینیـی، مـەزەبی. هـەمو ئەوانـە بەخۆكـەوتن" رۆژنامـەو گۆڤاریـان بـەزمانی خۆیـان چـاپ كـرد، رێكخراوی سیاسیوكۆمەڵایەتیو فەرهەنگییان پێك هێنا، خوێندنگایان بـەزمانی خۆیان كردەوە، خۆیان ئامادە كرد بۆ بەشـداربون لەهەڵبـژاردنو لـەژیانی سیاسـی دەوڵەتدا.

((مەجلیسی مەبعوسان)) كەئەبو نوێنەری دانیشتوانی دەوڵەتی عوسمانی بێ، پـاش هەڵبـژاردنی كۆبـوەوە، لەئـەنجامی دەس تێـوەردانی ئیتیحادییـەكاندا، تـا ئەندازەیەكی زۆر مافی گەلانی نە توركو نە موسڵمان خورابو.

ژمارەی هەمو مەبعوسەكان ٢٦٠ نوێنەر بو:

لەروی نەتەوەییەوە پێكهاتبوله"

١١٩ تورك

٧٢ عەرەب

٢٣ یۆنانی

١٥ ئەلبانی

١٠ ئەرمەنی

٨ كورد

٤ جو

٤ بولغار

٣ سرب

٢ فلاخ

لەڕوی دینییەوە پێکهاتبولە"
٢١٤ موسوڵمان
٤٢ مەسیحی، هەمویان ڕۆمی ئورتودوکسو ئەرمەنی بون جگەلە ١ کاسۆلیك
٤ جو[٥٤]

دیارە ئەم نوێنەرایەتییە لەگەڵ کەمیو زۆری نەتەوەو دینو مەزهەبە جیاوازەکانی گەلانی عوسمانیدا نەئەگونجا. سەرانی ئیتیحادی هەوڵیاندابو زۆرایەتییەکی تورکی موسوڵمان بۆ خۆیان لەناو مەجلیسدا دابین بکەن، بەجۆرێکی وەها هەرچییەکیان بوێ بیبڕێنن.

هەر زو نیازی ئیتیحادییەکان بۆ هەموان دەرکەت. ئەو دەسکەوتە دیموکراتییانەی گەلانی زۆرلێکراو بەدەستیان هێنابو، لێیان سەندنەوە. ئەو گروپو دامەزراوو ڕێکخراوە سیاسیو کۆمەلایەتیو فەرهەنگییانەی لەسەر بنچینەی هاونەتەوەییو هاودینیی دامەزرا بون قەدەغە کران. ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی بەزمانی نە تورکی دەرئەچونو، ئەو خوێندنگایانەی بەزمانی نەتورکی کرابونەوە داخران. زۆر لەبەرپرسەکانی ئەو چالاکییانە درانە دادگا. لەناو ئەوانەدا((کورد تعالیو ترقی جمعیتی))و ئۆرگانەکانی((هەفتەنامەی کوردی-تورکی: کورد تعالیو ترقی غزتسی))، گۆڤاری((کوردستان))و، ئەو خوێندنگایەی بۆ مندالانی کورد کرابوەوە، قەدەغەکران. دۆخی گەلەکانی تریش لەهی کورد باشتر نەبو.[٥٥]

سەرانی ئیتیحادی بەرنامەیەکی دیموکراتییان نەبو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی جیاوازی دینییو جیاوازی نەتەوەیی. ناوەڕۆکی بەرنامەکەیان((تورکاندن))ی هەموگەلانی عوسمانیبو.

لەلایەك بەندوباوی((جامیعەی عوسمانی))یان ئەهێنایە کایەوە، کەبەو پێیە ئەبو هەمو هاولاتییەکی عوسمانی بێگوێ دانە زمان، ڕەگەز، دین، نەتەوە لەسەر بنچینەی دڵسۆزی سیاسی بۆ دەوڵەتی عوسمانی، هەمو مافەکانی هاولاتی بونی عوسمانی هەبێو، لەبەرامبەر ئەوەشدا ئەبێ هەمو فرمانەکانی هاولاتی بون بەجێ بێنێ. ئەمە ئەی توانی هەمو گەلانی عوسمانی کۆبکاتەوە. لەگەڵ قازانجی گەلە نە تورکەو، نە موسڵمانەکانیش ئەگونجا. هەرچەندە کەسانێ هەبون بەڕاستی باوەڕیان بەم سیاسەتە هەبو، بەدڵسۆزییەوە کاریان بۆ چەسپاندنی ئەکرد، بەلام سەرانی((تورك اوجاقی)) ئەمەیان بۆ تەفرەدانی خەلکی نە تورکەو، نە موسڵمان بەکارئەهێنا.

لەلایەکیترەوە بەندوباوی((جامیعەی ئیسلامی))یان بڵاو ئەکردەوە، کەئەویش لەلایەکەوە بۆ تەفرەدانی گەلانی موسڵمانی نە تورکی ژێردەستی عوسمانیبو، بۆ ئەوەی بەبیانوی دڵسۆزی بۆ دەوڵەتی ئیسلام(دەوڵەتی تورك)و، خەلیفەی ئیسلام(سوڵتان)و، مەترسی نفوزی دەوڵەتانی مەسیحی ئەوروپا، لەخواستە نەتەوەییەکانی خۆیان دوربخەنەوە. لەلایەکیترەوە بۆ پەرەپێدانی نفوزی دەوڵەتی تورك بو لەناو موسڵمانانی دەرەوەی سنوری عوسمانی کە لەو سەردەمەدا هەندێکی کەوتبوە ژێردەستی دەوڵەتانی ئەوروپی-مەسیحییەوە.

لەپاڵ ئەوانەدا بەگەرمی پڕوپاگەندەیان بۆ باوەڕی((پان- تۆرانیزم)) ئەکرد، بەو مەعنایەی هەمو ئەو گەلانەی هاوڕەگەزی تۆرکن لەوڵاتەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی تورکیا، ئەبێ یەك بگرنەوە، رابردوی پڕ لەسەروەریو شانازی خۆیان بژێننەوە.

سەرانی ئیتیحادو تەرەقی هەر یەکێ لەم بەندو باوانەی بۆ مەبەستێکی دیاریکراو بڵاوئەکردەوە. دیارە ئەم باوەڕانە نەك هەر لەگەڵ یەکتری ناسازو ناکۆك بون، بەڵکو ئەبونە هۆی هەڵوەشاندنی یەکێتی گەلانی عوسمانیو، خولقاندنی بەدگومانی لەیەکتریو، نەمانی دڵسۆزی بۆ دەوڵەت. ((جامیعەی ئیسلامی)) گەلە نە موسڵمانەکانی ئەوروژاندو، ((پان- تۆرانیزم)) گەلە نە تورکەکانی دڕدونگ ئەکرد. بەڵام سەرانی ئیتیحادی لەمێژ بو لەپەیڕەوی بیری((پێکهێنانی زۆرداره‌کیی تەبایی نەتەوەییو دینیی)) دانیشتوانی دەوڵەتی عوسمانیدا بون. لایان وابو هۆی دواکەوتنی تورکو، تێشکانی لەهەمو جەنگەکان داو، لەدەس دانی یەك لەدوایەکی ئەرزەکانی لەبالقانو قافقاز، جیاوازی نەتەوەییو دینییە.

لەمانگی ئابی ١٩٠٩دا((مەجلیسی مەبعوسان)) کە لەژێر دەسەڵاتی ئیتیحادییەکاندا بو، مادەی ٤ دەستوری بەجۆرێك دەسکاریکرد" مافی دامەزراندنی ئەنجومەنی لەسەر بنچینەی نەتەوەو دین لەخەڵك سەندەوە. بۆ ئەوەی هاوڵاتییەکی عوسمانی کەلکی لەمافە سەلمێنراوەکانی ناو دەستور وەربگرتایە ئەبو خۆی بەتورك دابنێ. ئەوەش لەگەڵدروشمەکانی((ئینقیلاب))دا،((حورریيەت، عەدالەت، مساوات)) نەئەگونجاو، پێچەوانەی گفتە کۆنەکانی سەرانی((ئیتیحادو تەرەقی)) بوو سەبارەت بەمافی وەکیەکیی موسوڵمانو ناموسوڵمانو، تورکو ناتورك. سەرانی ئیتیحادی ئەیان ویست بەزۆر هەمو نەتەوە نەتورکەکان لەبۆتەی نە تەوەیی تورکدا بتوێننەوە. ئەمەش لەناو دەوڵەتێکی فرە نەتەوە، فرە دین، فرە مەزهەبی وەکو ئیمپراتۆری فراوانی عوسمانیدا ئەبوە هۆی هەڵوەشانو لەیەك ترازان. لەدڵسۆزیی سیاسی نەتەوە نە تورکو، گەلە نە موسوڵمانەکانی کەم

ئەکردەوە، هەروەکو لەسەردەمی جەنگدا، بو بەهۆی هاوکاری عەرەب لەگەڵ ئینگلیزو هاوکاری ئەرمەنو ئاسوری لەگەڵ روس.

ئەرمەنییەکان لەسەردەمی عەبدولحەمیدا بەگەرمی پشتیوانییان لەتێکۆشانی ئیتیحادییەکان کرد. کە((ئینقیلابی عوسمانی)) سەرکەوت(١٩٠٨)، بەهیوابون ئەوانیش لەژێرباری چەوسانەوەی دینییو زۆرلێکرانی نەتەوەیی دەربێن، بەڵام((ئینقیلاب)) هیچ کام لەئاواتە نەتەوەییو دینییەکانی گەلە ژێردەستەکانی تورکی نەهێنایە دی. چەوسانەوەی ئەرمەنی، بگرە هەندێ جار کوشتاری بەکۆمەڵ، هەر بەردەوام بو، بێ ئەوەی کاربەدەستانی تورک هەنگاوی کاریگەرو راستەقینە بنێن بۆچارەسەرکردنی.

مەینەتی گەلی ئەرمەنی کەوتبوە سەر زمانی هەمو سەفیرانی دەوڵەتانی ئەوروپی. روسیا دەس پێشکەریکرد، پرۆژەیەکی بۆ چاکردنی هەلومەرجی ژیانی ئەرمەنیەکان لە ٦ ولایەتی تورکیدا، کە زۆرایەتی دانیشتوانی کورد بون، داناو داوای جێبەجێ کردنی لەبابیعالی کرد. ئەگەرچی کاربەدەستانی تورك بەبیانوی ئەوەی خەریکی دانانی پرۆژەی چاککردنی دۆخی هەمو ولایەتەکانی تورکیان، ویستیان ئەگەرە لەمکارە بدەن، ئەڵمانیاش بۆئەوەی پێوەندی باشی لەگەڵ تورك تێك نەچێ نەیویست هاوبەشی بکا، بەڵام سەرەنجام سەفیرانی دەوڵەتانی ئەوروپی هەمو بەیەك دەنگ داوایان لەبابیعالیکرد، هەلومەرجی ئەرمەنییەکان لە ٦ ولایەتی ئەرمەنی نشینی رۆژهەڵاتیدا باش بکات. بابیعالی لەژێرگوشاری دەوڵەتانی ئەوروپیدا لەشوباتی ١٩١٤ دا بەناچاری ملی بۆ جێبەجێکردنی ئەم خواستەدا. بەپێی ئەو پرۆژەیە ئەبو" ئەرمەنیەکان ئازادی بەکارهێنانی زمانی ئەرمەنییان لەخوێندنگاکانی خۆیانو لەدادگاکاندا هەبێ، ئالآ حەمیدییەکان، کە لەهۆزەکانی کورد پێك هاتبون، چەك بکرێن، ئەرمەنییەکانیش وەکو تورك مافی بەشدارییان لەدەزگاکانی دەوڵەتدا(لەوانە پۆلیسو ژاندارمری) هەبێ. بۆ چاودێری جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە دو پشکنەری بێگانە، یەکێکی هۆڵەندی بەناوی ویستنینكو یەکێکی نەرویجی بەناوی (هوف) ەوە، چونە ناوچەکەو، کەوتنە کار بۆ جێبەجێ کردنی.[٥٦]

سەرکردە ئیتیحادییەکان پێیان وابو هەڵگیرسانی جەنگ، هەلێکی لەبارە بۆ جێبەجێ کردنی بۆچونە تایبەتییەکانی خۆیان لەمەڕ پێکهێنانی تەبایی دینییو نەتەوەیی لەتورکیا، بۆ ئەوەی دینو نەتەوە جیاوازەکان بەیەکتری لەناو ببەن.

بەهەڵگیرسانی جەنگو، دوایيتر بەشداری تورك لەپاڵ دەوڵەتانی ناوەندا، حکومەتی تورك لەگفتەکانی خۆی لەمەڕ جۆری رەفتارکردن لەگەڵ

مەسیحییەکانی ژێر دەستەی عوسمانی ژێـوان بـوەوە، هـەردو پشـکنەری بێگانـەی دەرکردو، ئەو ڕێوشوێنانەی بۆچاکردنی هەلومەرجی ژیانی ئەرمەنییەکان دانرابـو، هەموی هەڵوەشاندەوە، بـەڵکو هـەوڵیدا ڕقو نـاڕەزایی کـورد لەناوچـەکەدا بەگـژ مەسیحییەکاندا بکا.

هەروەها مـافی کاپیتولاسـیون، کـەبوبو بـەکۆتێکی گـران لـەپێی سـەربەخۆیی تورکیادا، ئەویشی هەڵوەشاندەوە.

سـەرکردایەتی تـورك، هـەروەکو هێـزی مرۆیـی هـەمو موسـوڵمانەکانی نـاو ئیمپراتۆری عوسمانی سازدا بۆ جـەنگ، هێـزی مـەسیحییەکانیشـی سـازدا. کەوتـە سەربازگیری لەناو مـەسیحییەکانداو، بەهەزارانی لەئەرمەنیو ئاسورییەکانی کـردە سەرباز لەریزی ئۆردوی تورکدا.

**٢/٣ قەتلوعامی مەسیحی(١٩١٥)**

لەسـەرەتای دەس پێکردنـی جـەنگدا، قەیسـەری روسـیا لەبانگـەوازێکا داوای لەمەسـیحییەکانی نـاو دەوڵـەتی عوسـمانیکرد دژی دەسـەڵاتی تـورك راپـەڕنو، هاوکـاری سـوپایی روسـی بکـەن بەرامبـەر بـەڵێنی ئـازادیو سـەربەخۆیی دوای بردنەوەی جەنگ. هەم سەرۆکی کەنیسەی ئەرمەنییەکان بەدەنگ ئەم بانگەوە چو[٥٧] هەم مارشیمونو، داوایان لەگەلەکانی خۆیانکرد هاوکـاری سوپای روسی بکـەن. بەسەدان سەربازی ئەرمـەنیو ئاسوری بەکۆمـەڵو بەتاك ریزەکانی ئـۆردوی تورکیـان بەجێهێشـتو چـونە پـاڵ هێزەکـانی روسـەوە، وەکـو شـەڕکەر، رێبـەر، چاوسـاغ... هاوکاری روسەکانیان ئەکردو رێگەی داگیرکردنی ئەرزی عوسمانییان پیشان ئەدان.

سەرانی ئیتیحادو تەرەقی، لەکۆنـەوە خۆیـان لەبەهانـە بـون لەمەسـیحییەکان. پەلّپیان پێنەگرتن. ئەیان ویست بیانویەك بدۆزنـەوە بـۆ لـەناو بردنیـان. تێشـکانی سەختی سوپاییان لەقافقاز، باشترین بەهانـەبو بـۆ پـەلّپ گـرتن بەمەسـیحییەکان، بەتایبەتی بەئەرمەنیو ئاسوری. ئۆباڵی ئەو تێشکانەیان لەئەستۆی ئەوان توندکرد. کەوتنە قـەتلوعامیان. سـەرکردە شـۆڤێنییەکانی تـورك توانییـان هەسـتی دینیـی کورد بورووژێننو، ناکۆکی دینیی نێوان گەلی موسـوڵمانی کـوردو مەسـیحییەکان تیژ بکەنو، سەرەنجام بەریان بدەنە گیانی یەکتری بۆ ئـەوەی بەکوشـتنی یەکترییـەوە خەریکیان بکەنو، دوژمنایەتییەکی لەچارەکردن نەهاتوی ئەوتۆیان لەناوا دروسـت بکەن، کەئیتر نەپەرژێنە سەر ئـەوەی کـەڵك لەهەلکـەوتنی هـەلی جـەنگ وەربگـرن بەرامبـەر دوژمنـی هاوبەشـیان، کەدەسـەڵاتی تورکیبـو. دواییتـریش کەوتنـە راگوێزانی بەکۆمەڵی هەردو نەتەوە لەولایەتەکانی خۆرهەڵاتەوە بۆ ناوەوەی تورکیا. سەرەتا ئەرمەنی بەبیانوی((خیانـەتی نیشـتمانی))و دەس تێکەڵاوکردنـەوە لەگـەڵ

روسیای دوژمنی تورکو، دوای ئەوان ئینجا کورد بەبیانوی ئەوەی ولایەتەکەیان بەهۆی پێشڕەوی روسەوە، بۆتە مەیدانی جەنگ. تورک لەسالآنی ١٩١٤تا ١٩١٨ بەقسەی نیکیتین، لەو ناوچانەوە ٧٠٠هەزار کوردیان بەنیازی گۆڕینی نەتەوایەتییان بەکۆمەڵ راگوێزرا، زۆریان فەوتان.[٥٨]

### ٣/٢ئاسورییەکانی هەکاری

هێشتا ئیمپراتۆریی عوسمانی نەچوبوە مەیدانی جەنگەوە، کاربەدەستانی تورکیا ئەو مەترسییەیان هەبو، کەئاسورییەکان لەو جەنگەدا بەلای روسیادا دابشکێنن. لە٢٢ی ئابدا حاکمی وان، لەسەر داوای حکومەتەکەی خۆی، بنیامین مارشیمونی بۆ گفتوگۆ بۆ وان بانگ کرد. لەم گفتوگۆیەدا حاکمی وان داوای لەمارشیمون‌کرد پشتیوانی لەروسیا نەکاتو، بەدڵسۆزی بۆ تورکیا بمێنێتەوە، بەرامبەر بەوەش بەڵێنی پیّدا، ئاسورییەکان چەکدار بکەنو، رێگەیان بدەن لەخوێندنگاکانی خۆیاندا بەزمانی خۆیان بخوێنن. هەندێ دیاریشی دایە. مارشیمون هیچ گفتێکی دیاری‌کراوی نەدا بەکاربەدەستانی تورک. مارشیمون لەگەڕانەوەدا بەنامە ئاگادری سەرانی میللەتەکەی خۆی کرد کەپارێزگاری هێمنی بکەنو، فەرمانەکانی حکومەتی تورک جێبەجێ بکەن.[٥٩]

بەشداربونی تورک لەجەنگ‌داو، بانگی جیهاد دژی کافرانو، راپێچانی لاوانی هەمو گەلانی موسوڵمانو مەسیحی عوسمانی بۆ سەربازی بەناوی سازدانی گشتییەوە، دوای‌تر تێشکانی سەختی ئۆردوی تورک لەبەردەمی سپای روسی‌دا لەقافقازو ئازەربایجانو، هەلاتنی بەکۆمەڵی سەربازە مەسیحییەکان لەریزی ئۆردوی تورکو، خۆش‌کردنی ئاگری بێ ئامانی ناکۆکیی دینیی مەسیحی- ئیسلامی لەلایەن سەرکردایەتی تورکییەوە، ئاسورییەکانیشی لەشەڕێکی خوێناوییەوە گلاند. قەتڵوعامی ئەرمەنی، بوبو بەبەشێکی سیاسەتی جەنگی تورک. ئاسورییەکان، وەکو گەلێکی مەسیحی نزیکی روداوەکان نەیان ئەتوانی خۆیان لەو گەردەلولە بپارێزن، گێچەڵی تورکی ئەوانیشی گرتەوە. کاربەدەستانی تورک هانی موسوڵمانەکانیان ئەدا دەسدرێژییان بکەنە سەر. دەیان ئاوایی ئاسوری نشینی هەکاری پاش تالآن‌کردن، سوتێنران. سەدان ئاسوری، بێ‌ئەوەی هیچ تاوانێکیان کردبێ کوژران.

سوپای روسی سەروی خۆرئاوای ئێرانی گرتبو، کەوتبوە پێشڕەوی لەکوردستاندا، گەیشتبوە وانو، تا ئەهات لەمەڵبەندی ژیانی ئاسورییەکان نزیکتر ئەبوەوە. لەنێوان کاربەدەستانی روسی‌و مارشیمونو سەرانی تری ئاسوری‌دا ئاشنایەتی دێرینە هەبو. لەماوەی هەڵگیرسانی جەنگ‌دا، جگە لەبانگەوازی

ئاشکرای قەیسەر بۆ گەلانی مەسیحی ژێردەستی تورك کەداوای شۆڕشو ڕاپەڕینی لێ ئەکردن، کاربەدەستانی روسی خەریکی پێوەندی بەردەوام بون لەگەڵ مەزنەکانی ئاسوری. هەستی دینییان ئەبزواندنو، دژی تورك هانیان ئەدانو، هەوڵیان ئەدا رایان بکێشن بۆهاوکاریو یارمەتی دانی سوپای روسی. چەند نامەیەکیان بۆ ئەو مەبەستە بۆ خودی مارشیمون نوسی. لەنامەیەکدا بۆیان نوسیبو کەئەوان بۆ رزگارکردنی ئاسوری لەزوڵمی عوسمانی هاتونو، داوایان لێ کردبو ئەویش چارەنوسی خۆی بەهاوپەیمانەکانەوە ببەستێ.

لە ١٢ ئازاری ١٩١٥ دا مەزنەکانی ئێلە ئاسورییەکان، بەسەرۆکایەتی پێشەوای دینییان، مارشیمون، کۆبونەوە بۆ دیاری کردنی هەڵوێستیان لەلایەنەکانی جەنگ، بەتایبەتی لەتورکیاو روسیا. بەشدارانی ئەم کۆبونەوەیە دو بۆچونی جیاوازیان هەبو" یەکێکیان پێی لەسەرئەوە دائەگرت کەدژی دەسەڵاتی تورك راپەڕن، بەهەمو تواناوە هاوکاری سوپای روسی بکەنو، ئەو هەلە بقۆزنەوە بۆ رزگارکردنی نیشتمانەکەیانو، دامەزراندنی دەوڵەتی تایبەتی خۆیان بەیارمەتی روسیاو هاوپەیمانەکانی. ئەوی تریان لای وابو، تورك لەبیانوە لێیان، لەبەر ئەوە هەرچی گێچەڵێکیان پێ بکەن، ئەبێ ئەوان دان بەخۆیان دابگرنو، لەو شەڕەدا بێلایەن رابوەستن بۆ ئەوەی هیچ بەڵگەیەك نەدەن بەدەس تورکەوە، بیکا بەبیانوی لەناوبردنی بەکۆمەڵو دەرکردنی گشتییان لەنیشتمانی دێرینەی خۆیان.[٦٠]

زۆرایەتی سەرانی ئاسورییەکان، لەناو ئەواندا مارشیمون خۆی، بۆ چونی یەکەمیان بەرێگەی رزگاریو سەرکەتنی گەلی ئاسوری ئەزانی. ئەم بۆچونە دور نەبون لەکارتێکرانی رووداوەکانی ئەو ماوەیەی ناوچەکەو، کەڵەکە بونی داخی چەند قەرنی چەوسانەوەی قورسی دینییو زۆرلێکرانی سەختی نەتەوەیی لەژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانیدا. شکانی تورکو پێشڕەوی سوپای روسیو، نزیك کەوتنەوەیان لەناوچەکانی ئەوان، هیوایەکی زۆری لەلا دروست کردبون. تەجروبەکانی پێشویان لەگەڵ کاربەدەستانی تورك، تەنانەت هی سەردەمی چەند ساڵ پێشوتری((ئینقیلاب))، هیچیان جێگەی دڵخۆشیو مایەی هیوا هەڵچنین نەبون. بەڵکو هەموی یەك لەیەك تاڵترو هۆی نائومێدی بون. مارشیمونو سەرانیتری ئاسوری لەکێشانی هێزەکانی خۆیاندا توشی چەوت- هەڵسەنگاندن بون" جۆری پەروەردەکردنی جەنگیی ئازایانەی پیاوەکانی ئێلەکانیانو، هەڵکەوتی جوگرافی شوێنەکەیانو، سروشتی دژواری مەڵبەندەکەیانو، باوەڕی پتەو بەهاوپەیمانە دینییەکانیان... وای لێ کردبون توانای روکشی خۆیان لەتوانای راستەقینەی خۆیان زیاتر دابنێن. نەمرود، خاوەنی بۆچونی بێلایەنی، خزمایەتی نزیکی لەگەڵ

مارشیمون دادیئەدا، بیروڕا نەگونجاوەکانی لەگەڵ بۆچونی زۆرایەتی سەرانی گەلەکەی بونە مایەی تیاچونی سەری. هاونەتەوەکانی خۆی لەنرخی دەربڕینی بیروڕاکانیدا لەشیرین خەودا سەرییان بڕی.[61]

مارشیمون، بنیامین، پێشەوای دینیی گەلی ئاسوری لەقوچانس، بارەگای پیرۆزی نەستورییەکان، هەمان کاری هەڵبژارد کەشەریف حسێن کوری عەلی، لەمەککە، بارەگای پیرۆزی موسوڵمانەکانی دنیا دوایی‌تر کردی.

مارشیمون، دوای ئەم کۆبونەوەیە هێزەکانی خۆی سازدا، شۆڕشی دژی تورک ڕاگەیاند. نامەی بۆ کاربەدەستانی تورك نوسی، کەئیتر ئەوان پێوەندی سیاسی خۆیان لەگەڵ حکومەتی تورك ئەبڕن. نامەی بۆ کاربەدەستانی روسیاش نارد، کە گەلەکەی ئەویش شان بەشانی هێزەکانی روسیاو دەوڵەتانی هاوپەیمانی هاوبەشی جەنگ ئەبن دژی تورك، بەهیوای ئەوەی بەئامانجەکانی خۆیان لەپێکهێنانی دەوڵەتی ئاسوریدا بگەن.

لەمانگەکانی‌ئازار، نیسان، مایسو حوزەیراندا شەڕی خوێناوی لەنێوان چەکدارانی ئاسوریو هێزەکانی تورك بەهاوکاری لەگەڵ ئێلەکانی کوردا، قەوما. سیتو ئاغای ئورەماریو ئیسماعیل ئاغای ئەرتوشی بەشداری کاریگەریان کرد لەپەلاماردانی ناوچەکانی جیلو، باز، تیاری ژورو.[62] تەرازوی هێزەکانی هەردولا نابەرامبەرییەکی گەورەی تیّدابو. هێزەکانی ئۆردوی تورك، پشت ئەستور بەهۆزەکانی کورد، لەهەمو لایەکەوە گوشاریان بۆ سەر ناوچەی ئاسورییەکان زیاتر ئەکرد. ئەگەرچی مەڵبەندی ژیانی ئاسورییەکان سەختو شاخاویبو، بەڵام ناوچەیەکی تەسکبو، لەهەمو لایەکەوە بەدوژمن دەوری درابو. مارشیمون چەند جارێك داوای یارمەتی لەسەرکردەکانی سوپای روس‌کرد بەدەنگیانەوە بچن، بەڵام بێ هودەبو. مارشیمون خۆی دو جار چو بۆ سەردانی کاربەدەستانی روسی، بۆ ئەوەی پشتیوانییان بەدەس بهێنێو، یارمەتییەکی ئەوتۆی بدەن لەناوچەکانی خۆیاندا بتوانن بمێننەوەو، درێژەبە بەرەنگاریی بدەن.

جاری یەکەم، لە ٢٨ حوزەیرانی ١٩١٥دا بەرەو ورمێ کەوتە رێ، لەسەرەتای تەموزدا گەیشتە ئەوێ. ئەگەرچی کاربەدەستانی روسی گفتی هەمو جۆرە یارمەتییەکیان پێداو، دەستەیەك سەربازی روسیو هەندێ تفەنگو تفاقی جەنگییان لەگەڵ نارد بۆ قوچانس، بەڵام کارێکی ئەوتۆیان نەکرد گوشاری تورکییان لەسەر لابچێ یا کەم ببێتەوە.

جاری دوەم، لەکاتێکا کەهێرشی تورك تا ئەهات توندتر ئەبو لەسەریان بەجۆرێ لەهەندێ شوێن هەڵیان کەندبون. مارشیمون لەگەڵ دەستەیەك

لەنوێنەرانی گەلی ئاسوری لە١٠ی ئابی ١٩١٥دا لەرێگەی باشقەلاوە بۆ دیتنی چرنوزوبوف چوە سەلماس. لەوێشەوە مەلیك خوشابەی ناردە تەورێز بۆ بینینی کاربەدەستانی روسی. بەلام کاربەدەستانی روسی لەباتی ئەوەی بەدەنگ گەلی هاوپەیمانی خۆیانەوە بچن‌و، یارمەتییان بدەن لەو شوێنە ستراتیجییەدا بمێننەوە، کەئەی توانی کار لەرەوتی روداوەکانی جەنگ بکا، بەتایبەتی لەناوچەی موسلدا، کەچی کاربەدەستانی روسی ئامۆژگاری مارشیمونیان‌کرد" خۆی، لەبەر سەلامەتی گیانی، لەگەلّ سوپای روسی‌دا بمێنێتەوەو، ئاسورییەکانیش هەکاری چۆلّ بکەن‌و بکشێنەوە بۆ سنوری ئێران.[٦٣]

لەمانگی ئابی ١٩١٥وە ئاسورییەکانی هەکاری لەنیشتمانی نەتەوەیی خۆیان هەلّکەنران‌و، کۆچی بەکۆمەلّی یەکجارییان دەستی پێ‌کرد.

روسەکان، وەکو دوایی پێکهاتنە نهێنییەکانی نوێنەرانی ئینگلیزو فەرەنسە" سایکس‌و بیکۆ، لەگەلّ وەزیری کاروباری دەرەوەی روسیا، سازانۆف، دەری خست، هیچ بەرنامەیەکیان نەبو بۆ یارمەتی‌دانی گەلی ئەرمەنی یا ئاسوری بۆ بەدی هێنانی مافی ئازادی بریاردانی چارەنوسی سیاسی‌و دروست‌کردنی دەولّەتی تایبەتی نەتەوەیی خۆیان، یا تەنانەت بۆ جۆرێ لەئۆتۆنۆمی. بەلّکو سیاسەتی روسی بریتی‌بو لەبەکارهێنانی ئەم دو گەلە، وەکو دەسکەلایەك، بۆ ئەوەی پلانەکانی خۆی لەداگیرکردنی ئەرزی ئێرانی‌و عوسمانی‌دا بەدی بهێنێ، بەو شێوەیەی ژێر بەژێر لەگەلّ دەولّەتانی هاوپەیمانی لەسەری رێك کەوتبو.

### ٤. روس‌و ئاسوری

### ٤/١روس‌و ئاسورییەکانی ورمێ

روسیە پێش بینی هەلّگیرسانی جەنگی لەگەلّ تورك ئەکرد، بەکەلّك وەرگرتن لەپەیمانی روسی- ئینگلیزی(١٩٠٧)، لە١٩١٢وە کەوتە دانانی پلانی دەسگرتن بەسەر ناوچەکانی نفوزی خۆی‌دا بەتایبەتی شوێنە ستراتیجییەکانی دەوروبەری دەریاچەی ورمێ، بۆ ئەو مەبەستەش یەکێ لە تاکتیکەکانی ناردنی کونسولّبو بۆ هەمو ناوەندە گرنگەکان، لەگەلّ هەریەکێ لەوانە بەناوی پارێزگارییەوە هێزێکی چەکداریشی لەگەلّ ئەناردن، کە بەکردەوە ئەوان لەوێ دەسەلاتیان لەباتی نوێنەرانی دەسەلاتی لاوازی ناوەندیی ئێران ئەگرتە دەست.[٦٤] لەهەر جێگەیەکی دەسەلاتی روسی لێ‌بو، کاربەدەستی ئێرانی لایەنگری خۆیان لێ دائەنا.

ناوچەی ورمێ یەکێکە لەناوچە تێکەلاوەکانی کوردستان، بەهۆی روداوەکانی چەند سەدەی دواییەوە گۆرانی بنەرەتیی بەسەر هەلومەرجی دیموگرافی‌دا هاتوە، لەناوچەکەدا ئازەری، کورد، ئاسوری، کلدانی، ئەرمەنی ئەژین. ئاوژن ئوبن،

سەفیری فەرەنسی، لەگەشتنامەکەی ساڵی ١٩٠٧ی‌دا بەناو ئێراندا دەربارەی ورمێ نوسیویتی:

((دەشتی ورمێ ٣٥٠ ئاوایی تیایە. کێوی تاقانەی(( بیزوداغ)) دەشتەکە لەدەریاچەکە جیا ئەکاتەوە، چیای گەورەتر دەوری ئەوی داوە. تەنگەو چەمی((شەهرچایی)) لەو کێوانەوە هەڵ ئەقوڵێ. هەمو جێگەیەك ئاوو هەمو جێگەیەك سەوزە...

(( ...لەداوێنی چیاکاندا، دانیشتوانی ئاواییەکان تورك(زمان)و شیعەن. بەلاَم لەبەرزاییەکاندا خەڵکی گوندەکان کوردو سونین. لەگەڵ ئەوەدا کەورمێ ناوەندی سروشتی ژمارەیەکی زۆری دەستەی جیاوازی دینین، بەلاَم کەمایەتیەکی جێگەی سەرنجی ئەرمەنی، کلدانی موسوڵمان بون.

((لەناوشاردا، مەسیحیەکان لەدو گەڕەکی((کوردی شەهر))و((مارت مریەم))(مریەمی پیرۆز، ناوی کلیسایەکی کۆنی نەستوریەکان کەئێستا ئەوگەڕەکە بەو ناوەوە ناو ئەبەن) دانیشتون. لەدەرەوەی شار، ژمارەی ئەرمەنییەکان لە٦٠٠٠ کەس کەمترەو لە٣١ گونددا بلاَوبونەتەوە، بەلاَم ژمارەی کلدانیەکان ئەگاتە٣٠٠٠٠ کەس، بەم جۆرە ناوەندی سەرەکی کلدانیەکانی دانیشتوی ئێران، ئەبێ لەم ناوچەیەدا دابنرێ. لەمەزەبە جیاوازە دینیەکان، هیچ کامیان وەکو مەسیحییەکانی کلدانی لەگەڵ یەك مشتومڕو کێشەیان نیە))[٦٥]

ئەگەرچی ئازەریو کورد هەردوکیان بەدین موسوڵمانن، بەلاَم ئازەرییەکان شیعەو کوردەکان بەزۆری سوننە بون. بەهۆی سیاسەتی ناوەندی دەوڵەتی ئێرانەوە ناکۆکیەکی نەتەوەیی‌و ناکۆکیەکی مەزەبی لەنێوان هەردوگەلی ئازەری‌و کوردا دروست بوبو کەریشەکەی ئەگەڕایەوە بۆ چەند سەدەی رابردو، هاتنی سوپای روسی بۆ ئازەربایجان‌و دوایی‌تر هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی ناکۆکیەکی تری لەناوچەکەدا خولقاند کەناکۆکی دینی مەسیحی- موسوڵمان‌بو، لەنێوان کوردو ئازەری لەلایەك‌و ئەرمەنی‌و کلدانی‌و ئاسوری لەلایەکی ترەوە.

لەسەرەتای سەدەی ٢٠ هەمەوە میسیۆنێکی دینیی روسی لەورمێ بنکەیان دامەزراندبو، تا رادەیەك کاریان کردبوە سەر ئاسورییەکان‌و چەن هەزار کەسێکیان هێنابوە سەر مەزەبی ئورتودوکس‌و، گۆڤاری ئورومی- ئورتودوکسایان بەزمانی خۆیان بۆ دەرئەکردن، روسەکان هەوڵیان ئەدا ئەوان بهێننە ژێر باڵی خۆیانەوە ئەوانیش روسیایان بەپارێزەری خۆیان دائەنا.

لەدوای ساڵی ١٩١٢ەوە کەهەندێ لەهێزە چەکدارەکانی روسی چونە شارەکانی سەروی رۆژئاوای ئێران، ئەوان بەگەرمی پێشوازیان لێ کردن. ئاسورییەکان خۆیان

بەوانەوە بەست بوەوە، ئەوانیش چەکو پارەیان ئەدانێو، لەبەرامبەر کاربەدەستانی ئێرانی، لەدەسدرێژی ئەیان پاراستن.[٦٦]

کەشمەر دەستی پێکردو، سوپای روسی بۆ بەهێزکردنی جێگاکانی خۆی لەئێراندا هێزی تری ناردە ئازەربایجان، ئاسورییەکان بەخۆشییەوە هەواڵەکەیان وەرگرتو، وەکو بەشێکی ئەوان کەوتنە هاوکاری سوپای روسیو بەرهەڵستی چالاکی عوسمانیو لایەنگرەکانی.

لەوشوێنانەی روس دەستی ئەرزیشت لایەنگرانی خۆی بەحوکمران دائەنا، لەکاتی هەڵگیرسانی جەنگدا حاجی صمدخان شجاع الدولەی مەراغەیی حاکمی ئازەربایجان بو، صمدخان((بەیارمەتی سەربازانی روسی هەمو رۆژێ بەتاوانی ئازادیخوازی چەند کسێکی لەدار ئەدا، یا ورگی هەڵئەدرین، یاسەری ئەبرین))، حاکمی ورمێیش، اعتمادالدولە بو، کەیەکێ بو لەهاودەستە نزیکەکانی صمدخان.[٦٧]

**٢/٤هێرشی تورك بۆ ئازەربایجان(تشرینی دوەمی١٩١٤)**

لەگەڵ هێرشی گەورەی تورکدا بۆ سەر قافقاز، لەچەند جێگایەکەوە پێشرەوی لەئەرزی ئێراندا دەستی پێکرد" لەسنوری بازرگانەوە بۆ لای ورمێو، لەسنوری بانەوە بۆ لای سابلاخ. لەهەردو قۆڵەوە پێشەنگی هێرشەکان، بەگوتەی کسروی: ((موجاهیدانی ئێرانو کورد))بون. سوپاییانی عوسمانی لەدوایی ئەوانەوە ئەگەیشتن.[٦٨] لەنێوان ئۆردوی تورکیدا، بەهاوکاری هەندێ لەئێلە کوردەکانو ئازادیخوازانی ئێران، وسوپای روسیدا چەند پێکدادانو پێکهەڵچونێك رویدا، سەرەنجام هێزەکانی عوسمانی توانییان دەس بەسەر سابلاخ، میاندواو، مەراغا...دابگرنو چەند کسێکیان لەپیاوە ناسراوەکانی کورد، لەوانە: پیری تەریقەت شێخ بابا سەعیدی غەوس ابادی، سەیفەدین خانی ئەردەلان حاکمی سەقز، حەمەخانی حاکمی بانە، حەمەحسێن خانی سەرداری بۆکان سەرداری موکری بەبیانوی دۆستایەتی روسەوە کوشت.[٦٩]

ئۆردوی تورك لەمەراغاو سوپای عوسمانی لەتەورێز بارەگایان خستبو. هەر لەو ماوەیەدا ئۆردوی تورك لە((ساری قامیش)) سەرکەوتنێکی بەسەر سوپای روسیدا بەدەس هێنا. لەئەنجامی ئەوەدا بۆ ئەوەی هێزەکانی روس توشی گەمارۆدان نەبن، فەرمانی پاشەکشەیان پێدراو، کتوپر ئازەربایجانیان چۆڵکرد، لەوانە شارەکانی تەورێزو ورمێ. صمدخان کەیەکێ لەدەسنێژەکانی روسبو، هەروەها سەدان ئێرانی تری سەربە روسیا لەبابەتی اعتمادالدولەی حاکمی ورمێو، ژمارەیەکی زۆر لەئاسورییەکان بەرەو ناوچەکانی ژێردەستی روس هەڵاتن.[٧٠]

### ٣/٤مەینەتی ئاسورییەکانی ورمێ

ئاسورییەکانی ورمێ چارەنوسی خۆیان بەهێزەکانی روسییەوە گرێ دابو، لەبەر ئەوە خۆشیو ناخۆشییان بەندبو بەسەرکەوتنی یا ژێرکەوتنی ئەوانەوە. لەناو ئێرانییەکانیشدا کەم نەبون ئەوانەی بوبونە کوتەکی دەستی سوپای روسیو، هاوکارییان ئەکردنو، پاشەڕۆژی خۆیان بەدەسەلاتی ئەوانەوە گرێدابو. لەئەنجامی پێشڕەوی لەناکاوی ئۆردوی تورکو، کشانەوەی کتوپڕی سوپای روسی لەورمێ(١٦ای سەفەری ١٣٣هـ کانونی یەکەمی ١٩١٤) ئاسورییەکانو ئێرانییەکانی سەر بەروس، کە لەژێر سایەی دەسەلاتی روسیدا ئازاری هاولاتییانی خۆیان دابو، دوای کشانەوەی روس، ئیتر ئەوانیش نەیان ئەتوانی وەکو جاران لەناوچەکەدا بمێننەوە. لەترسی گیانی خۆیانو، تۆڵەی تورکو کسانی ئازاردراو کەوتنە هەوڵی خۆ دەربازکردن.[٧١]

کسروی لەو بارەیەوە نوسیوێتی:

((...رۆژی ١١ هەمی دیماه بو روسەکان کتوپڕ ئەوێ(ورمێ)یان چۆڵکردو بەشێکی سوپاکەیان شاری بەرداو بەرەو سنور پاشەکشەیان کرد، بۆ بەیانی ١٢هەم پاشماوەی سوپاکەیان چوە دەرێ.

بەلام ئەم پاشەکشەیەی ئەوان، لەگەڵ روداوێکیتر هاوکات بو، کەئەویش کۆچی ئاشوریو ئەرمەنییەکان بو، چونکە ئەوانە کەخۆیان بەروسەکانەوە بەستبوەوەو بەپشتیوانی ئەوان لەگەڵ هاولاتییەکانی خۆیان بەد رەفتارییان کردبو، لەچەند مانگی دواییدا دەستیان کردبو بەخوێنرێژیو تالان، لەم دەمەدا لەگیانی خۆیان ئەترسانو جێی مانەوەیان نەئەدی، ئەوەبو هەرکە لەرۆیشتنی ناکاوی روسەکان ئاگاداربون، بەتوندی شڵەژانو، لەگەڵ ئەوەی زستان بو زۆریان جگە لەهاوڕێیەتی روسو کۆچکردن لەئێران هیچ چارەیەکی تریان بەدی نەکرد. ئەوەبو بەپرتاو بەخۆکەوتنو ژیانی خۆیان تێکداو ئەوی توانیان بیبەن هەڵیان گرتو ئەوی نەیان توانی بەجێیان هێشت. نزیکەی ١٠ هەزار کسیان لەپیاوو ژنو منداڵ لەخودی شارو ئاواییەکانی دەرەوەی بەرێ کەوتن. لەبەر ئەوەی زۆریان عەرەبانەو چوارپێیان نەبو سواری بن، بەپێ بەسەر بەفرو بەناو قوڕدا ئەرۆیشتن. هەندێ جار خواردنیشیان دەس نەئەکەوت. لەرێگا ژنانو منالان زەرەرێکی زۆریان بینی زۆریان نەیان توانیو لەپێکەوتن. چوارپێیەکی زۆر لەناو قوڕو چڵپاودا فەوتان... کسانێکی هەزار ساڵ لەولاتێکا ئاسودە ژیابونو، لەگەڵ هەمو جیاوازییەکی دینیدا، هەمو جۆرە دڵنەرمییەکیان لەخەڵك دیبو، چی وای لێ کردن نمەك نەناسی بکەنو، هەرکە پێی بێگانەیەك گەیشتە ولات، بدەنە پاڵیانو، لەگەڵ

هاوولاتییەکانی خۆیان خراپە بکەنو، بەدڵخوازی بێگانەکان دەس بدەنە تفەنگ خوێنی خەڵکی بڕێژن؟ ئەبێ سزای قورسی ئەو جۆرە کسانە بدرێو، ئەوەی ئەیان دیو ئەیان چێشت کەمبو، ئەوەی ئازاری دڵی ئێمەی ئەدا حاڵی ژنەکانو منالّەکان بو کەهیچ گوناهێکیان نەبو.

... وەکو وتمان پاشەکشەی روس کتوپڕبو، بۆیە هەمو مەسیحییەکان پێیان نەزانی، ئەگەر پێشیان زانی بێت دەرفەتی رۆیشتنیان نەبو، لە٤٥٠٠٠ کەس کەموزۆر کەژمارەی ئەوانەبو لەو دەوروبەرانە، تەنیا ١٠٠٠٠ کەس یا کەمتر توانیان لەگەڵ روس بڕۆن، ئەوانیتریان کەمابونەوە هەرکە لەچۆنایەتییەکە ئاگاداربونو لەو لاشەوە هاتنی کوردو تورکیان ئەبیست، لەگوندەکان خانوەکانی خۆیان بەجێ ئەهێشت، لەگەڵ ئەوەی ئەیان توانی لەگەڵ خۆیان بیهێنن لەگاو مەڕو کەلوپەلو خواردن رویان ئەکردە شارو، ئەچونە باخی نەخۆشخانەی ئەمریکایی یاپەنایان ئەبردە بەر سەرای میسیۆنی فەرەنسی، تەنیا دو گوندی کوگ تەپەو گلپاشین چۆڵ نەبو کەداستانی ئەوانیش ئەبینین.

ئێرانییەکان لەو هەلومەرجەشدا لەیارمەتیو دڵنەرمی نەوەستان، ژمارەیەکی زۆریان چ ئەوانەی شارو، چ ئەوانەی گوندەکان بردە ماڵەکانی خۆیان. لەسەلماسیش لەگەڵ ئەرمەنییەکان هەمان رەفتاریان کردو ئێمەش زۆربی زانیارییەکانی خۆمان لەنوسینەکانی مەسیحییەکانەوە وەرئەگرین، ئەمەیان خۆیان نوسیویانە:

هەرکە رۆیشتنی روسەکان زانرا، سوپای عوسمانی کە لەو نزیکانەبو، روی کردە ورمێ. لەپێش ئەوانەوە کوردەکان بەژمارەیەکی زۆر لەچیاکانەوە دابەزین، تاقمێکیان لەگوندەکاندا بڵاوبونەوە، کەوتنە تالانو راوروت، دەستەیەکی زۆریشیان رویان کردە شار، دو رۆژبو روسەکان رۆیشتبون کەئەوان گەیشتنە ورمێ. لەبەر ئەوەی اعتماد الدولەی حکومڕانی ئەوێ لەهاودەستەکانی صمدخان بو، لەزەمانی حوکمڕانی خۆیدا بەئارەزوی روسەکان رەفتاری کردبو، خوێنی بێ گوناهانی رشتبو، لەم کاتەدا لەگەڵ روسەکان رۆیشتبو. کەسێ نەبو ئاگاداری شارو بەرگیری لەکوردەکان بکا. بێ ئەوەی هیچ شەڕێ روبدا هاتنە ناو شارەوە. دەستیان کرد بەتالان. دو شەوو دو رۆژ خەریکی تالانی بازارو ئاژاوە بون. بەدوی ئەواندا رەشیدبەگ فەرمانەدەی عوسمانی بەسوپاکەیەوە گەیشتو بەری تالانو ئاژاوەی گرتو چەند کوردێکی بەگوللە کوشت. ئەو چەند رۆژەی رەشیدبەگ لەشاربو ئارامیو خەڵکی چ مەسیحیو چ موسوڵمان ئاسودەبون. بەڵام لەبەر ئەوەی روسەکان بەر لەپاشەکشەیان خویان گرتبو، لەوێ هێزیان هەبو، رەشیدبەگ بەهێزەکانی خۆیەوە چوەسەریان. لەسەلماس لەشکرێکی رێك خست.

کاروباری شارکەوتە دەست نوری‌بەگو راغب بەگ، کەدو کەس لەسەرکردە بەد ڕەفتارەکانی عوسمانی بون، ئەوانە کەوتنە ستەم کردنو ئازارێکی بێ ئەندازەی مەسیحییەکانیاندا. ئەرشەد همایون تا ئەیتوانی مشوری خەڵکی ئەخوارد، مەسیحییەکان زۆری لێ رازی‌بون. بەڵام لەراغب بەگو لە مجدالسلطنە، کەدابویە پاڵ عوسمانییەکانو دەستەیەك لەموجاهیدانی لەخوی خڕکردبوەوە، لەقوچ عەلی‌خانو ئەوانی‌تر زۆر بەگلەیی بونو، هەندێ داستانیان نوسیوە کە بەئاسانی ناتوانرێ باوەڕی پێ بکرێ. ئێمە نازانین ئەم داستانانە تاچ ئەندازەیەك راستن، بەڵام لەبەر بێلایەنی، ئەیان گێڕینەوە:

• ئەنوسن لەکوك تەپە ۲ هەزارکەس لەئاسورییانی ئەم گوندو ئەو گوند کۆبوبونەوە، ژنەکانو منالەکان پەنایان بردبوە بەرکلێسەکەو پیاوەکانیشیان بەتفەنگەوە لەسەربانەکان پاسەوانییان ئەکرد؟ کوردەکان دەوری ئەوییان گرتو، بو بەپێکادان. لەبەر ئەوەی کوردەکان زۆربون، مەسیحییەکان مردنیان لەبەر چاوبو، نائومێدانە تێ ئەکۆشان. بەڵام لەم کاتەدا دکتۆر پاکاردی ئەمریکایی کە لەگەڵ دوسێ کەس لەشار دەرچوبون بە مەسەلەکەی زانی، لەگیانی خۆی نەترساو بەرەو ئەوێ چو. لەسایەی ئەو ئاشنایەتیو دۆستایەتییەوە کە لەگەڵ هەندێ لەسەرانی کوردی هەبو، توانی رێ لەشەر بگرێو چوە ناو گوندەکەوە مەسیحییەکانی بینیو، وای لێ کردن دەس لەشەر هەڵبگرنو تفەنگو گوللەکانیان دابنێنو، لەئاواییەکە دەربێن. هەموویانی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ شارو، گیانی ۲ هەزارکەسی کڕییەوە. ئەم داستانە لەرۆژە سەختەکانی هاتنی کوردەکاندابو، سێو ئەوەندە رۆژ پاش ئەوە، لەناو خودی شاردا داستانێکی‌تر رویدا، کە ٦٠ کەس لەپیاوە ناسراوەکانی ئاسورییان لەسەرای میسیونی فەرەنسی راکێشابوە دەرەوەو گرتبو، رۆژی دوەمی ئەسفەند (۲۲ی شوبات)، بەشەو هەموویان بردنە دەرەوەی شارو گوللەبارانیان کردن، تەنیا یەکێکیان لەمردن رزگاری‌بو، بەبرینداری خۆی گەیاندەوە مەسیحییەکانو چۆنایەتییەکەی بۆ گێڕانەوە.

دو رۆژ دوای ئەوەش داستانی گلپاشین رویدا. ئەم گوندە کەئاواییەکی ئاسوری نشینی گەورەبو، کاتێ تورك گەیشتنە ورمێ، ئاسورییەکان نوێنەری خۆیان ناردە لایانو، زینهاریان وەرگرت. لەگەڵ‌خۆیان چەند کسێکیان لێ بردنە ناو دێ. بەم جۆرە بەئاسودەی ئەژیان، تا شەوێکیان قوچ عەلی‌خان بەدەستەیەك موجاهیدەوە گەیشتە ئەوێ. بەناوی میوانییەوە لەماڵەکان دابەزین. دوای خواردنو خواردنەوە داوای ۱۵ هەزار تومان پارەیان لەدەوڵەمەندەکانیان کردبو، لەبەر ئەوەی ئەوان نەیان توانی ئەو چەردە پارەیە کۆبکەنەوە ٤٥ کسیان لێ گرتنو شەوانە بردیاننە

دەرێو گوللەبارانیان کردن. لەوانیش چەند کەسێ رزگاربونو چۆنایەتییەکەیان راگەیاند.))[٧٢]

لەم رۆژانەدا ٢٠ هەزار کەس لەم هەڵاتوانە خۆیان هاویشتبوە ناو سەرای نەخۆشخانەی ئەمریکاییەوە، بەهۆی تەنگی شوێنەکەیانو، کەمی خواردەمەنیەوە، نەخۆشی تیفۆئیدو تیفوسیان لەناودا بڵاوبوەوە. ئەم دەردە لەناو شاریش تەنییەوە. وەکو ئەڵێن تەنیا لەمەسیحییەکان ٥ هەزار کەس مردوە، دیارە لەخەڵکی شارو دەوروبەریشی زۆر مردون.[٧٣]

نیکیتین، کونسوڵی روس لەورمێ، لەگێڕانەوەی ئەم روداوەدا ئەنوسێ:

((راپۆرتی میسیۆنێرەکانو ئەوەی بەچاوی خۆم دیومە رێگەم ئەدەن، تابلۆیەکی پچوکی زستانی ١٥-١٩١٤لە ورمێ بکێشم. دیارە رونکردنەوەی درێژی پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی جیاواز هەیە، من تەنیا بەکورتەیەکی ئەوە دائەکەوم، کە لەکاتی رۆیشتنی سوپای روسی لەورمێ لەساڵی ١٩١٤دا کە بەدوی ئەویشدا کونسوڵو میسیونی ئورتۆدۆکس رۆیشتن. مەسیحییەکانی ناوچەکە وەکو شێت بەرەو سنوری قافقاز هەڵاتن، سەختی ئەم کۆچە لەمانگی کانونی یەکەمدا لەهەوای ساردی گەورە بەرزەکانو بەرێگە باریکە دژوارەکان کەپڕبون لەقشونو گاریو دروشکەو مێگەلو گاڕان، وەکو پێویست ناتوانرێ بهێنرێتە بەر چاو.

رێکخستنی ئاماری قوربانییەکانی ئەم روداوانە ناکرێ، کەسانێکی توانیان هەڵێن، خۆشبەخت تربون لەوانەی بەهۆی نەبونی هۆی گوێزانەوە لەئاواییە دورەکاندا بەجێ مابون. ئەم بەدبەختانە، کاتێ کوردەکان هاتنە ناوچەکەو، دەستیان کرد بەکوشتنو تالان، رویان کردە شاری ورمێ، پەنایان بردە بەر میسیۆنەکانی کاتۆلیکیو ئەمریکایی. میسیۆنەکانیش نەیان ئەتوانی چەند هەزار کەس پەنا بدەن، بەهۆی زۆریو ترسو برسێتیو ماندوێتیو نەبونیکاری تەندروستییەوە ژیانیان زۆرخراپ بو. کوشتاری بەکۆمەڵیش رویدا وەکو ئەوەی بەیەکجار ٦٥ کەسیان بەزۆر لەمیسیۆنی فەرەنسی دەرهێناو بەجارێ گوللە بارانیان کردن، لاشەی ئەم قوربانییانە چەند رۆژێ لەو ناوەدا کەوتبو...))[٧٤]

نیکیتین، خۆی شایەتی روداوەکانی ورمێ بوە. لەنوسینێکیتریدا چیرۆکی مەلایەکی کوردی ئەوێ ئەگێڕێتەوە، وەکو هەڵوێستی پێشەوایەکی دینیی کورد بەرامبەر جیهادو قەتلوعامی مەسیحییەکان، کە خۆی لەخۆیا مەعنایەکی مێژویی قوڵی هەیە بەتایبەتی بۆ هەڵسەنگاندنی ئۆباڵی هەر گەلە لەهەڵگرتنی باری لێپرسراوێتی روداوەکانی ناوچەکەدا. نیکیتین نوسیوێتی:

مەلا سەعید لەناوکوردە خوێندەوارەکاندا یەکێبو لەوانەی لەکاتی راگەیاندنی جیهادا بێ ئـەوەی بترسـێ بەرپەرچـی دایـەوە. لەسـەر ئـەوە گرتیـانو، بردیانـە لای حاکمی تورك. بەوە تاوانباریان کردبو فتـوای دژی جیهـاد داوە. مـەلا سـەعید بـەم جۆرەی لای خوارو دیفـاعی لـەخۆی کـرد: ((مـن ئینکـاری ئـەوە ناکـەم کـەفتوای رەتکردنـەوەی جیهـادم داوە، لـەم بابەتـەوە نـە لـەڕوی شـەرعییەوە خـۆم بـەتاوانبار ئەزانمو، نە لەڕوی قانونییەوە، چونکە من لەهیچ جێیەکی شەریعەتی خۆماندا نـەم دیوە، فتـوای کوشـتنی خـەڵکی بێـدیفاعو بێگونـاە درابـێ. لەلایـەکی تریشـەوە، قانونی حکومەت تا ئێستە نەك هەر فەرمانی کوشتنی کەسی دەرنـەکردوە، بگـرە بەپێچەوانەوە، پارێزەری مـافەکانی خەڵك بـوە... بـەڵام دەربـارەی پشـتیوانی فتـواو حوکمی کەبۆ جیهاد دراوە، من پێم وایـە کـەرەحمو مـروەتو عـیلمو مەعریفـەتی شـێخ سـەلامو، عەدالـەتو ئینسـانی خەلیفـە(سـوڵتانی عوسمـانی) زۆر زۆر لـەوە بەرزترە کەفتواو حوکمی کوشتاری رەعییەتی بێچارە(مـسیحیو نەستۆری) بـدەن، ئەو رەعییەتانەی لەزەمانی حەزرەتی محەمـەدی پێغەمبـەری ئیسـلامەوە تـا ئێسـتە دەستیان نەداوەتە چەکو دژی ئێمە نەجەنگیون.)) [٧٥]

## ٤/٤هاتنەوەی روس بۆ ورمێ( مایسی١٩١٥ )

روس تا مەرەند کشـابونەوە لـەوێ لەشـکرگایان دامـەزرانـدبو. تـورك بەرامبـەر بەوان لەسۆفیان بون. لەم لاشەوە تورك لەسابلاخو ورمێو، هێزەکانی روس لـەخوی دامەزرابون. چـەند هەفتەیـەك بـەبێ شـەڕ تێپـەڕی. بـەڵام کـەروس لـەقافقاز دەس پێشکەری گرتەوە دەستو ئۆردوی تورکی تێکشکاند، فـەرمانیان بـۆ چەرنوزوبوف دەرکرد بگەڕێتـەوە شـوێنەکانی پێشـوی لـەئازەربایجان. لـە٢٣ی دیمـاه دا هـەڵیان کوتایە سەر هێزەکانی تورك لەسۆفیانو رۆژی دوایتر تورکیان لەسوالان شـکاند. ئەم هەواڵانە گەیشتنە تەورێز. تورك بەبێ شەڕ لـەوێ کشـایەوە. ٢٥ی مـانگی دەی روس چوە ناو تەورێزەوە.

لەفەروەردینی١٢٩٤دا هێزێکی گەورەی تورك لەئەستەموڵەوە گەیشت. چەند تێهەڵچونێکی خوێناوی لەڕۆژئاوای دەریاچەی ورمێدا روی دا. خەلیل بەگ(دوایی بو بەپاشا) سەرکردەی ئۆردوی تورك لەدیلمانو خوی تێشکا. روس هێزێکـی تـری لـەقافقازەوە بـۆ پاڵپشـتی نـەزەربیگۆف نـارد. سـوپای روسـی، ئـۆردوی تـورکی لەناوچەکانی نێوانی دەریاچەی ورمێو گۆلی واندا راماڵی.

سەرکردایەتی قافقاز پلانێکی دانابو، بۆ چاوترساندنی کورد. بۆ ئـەوەی کـورد بـەدەردێ ببـەن جـارێکیتر نـەوێرێ بداتـە پـاڵ ئـۆردوی تـورکو، زاتـی ئـەوە نـەکا

دەردیسەر بۆ روس دروست بکا. جێبەجێ کردنی ئەم پلانە بەجەنەراڵ شارپانتیە سپێردرا.
کسروی، درێژەی ئەم پلانەی لە((تاریخ نظامی جنگ بین المللی))ەوە بەمجۆرە، وەکوخۆی، راگوێزاوە:
((بۆ جێبەجێ کردنی پەلاماری سوارە نیزام کەفەرماندەی سوپای روس لەدەوروبەری دەریاچەی رەزاییەدا بەتەمای بو، هێزەکانی ژێرو بو: لەشکری سواری قافقازو تیپی٣ی قزاق(زابایکالسکی) بەسەرکردایەتی جەنەراڵ ئستویانوسکی لەژێر فەرماندەیی گشتی جەنەراڵ شارپانتیە فەرماندەی لەشکر سواری قافقاز.
لەنیوەی دوەمی مانگی نیساندا(تەقویمی یولیوسی کۆن بەکارهێنراوە) تیپی٣ی قازاق(زابایکالسکی)و ئاتەشبار٢ بەفەرماندەیی جەنەراڵ ئستویانوسکی لەسنوری قارسەوە بەرێی ئاسنیندا نێردرایە جولفاو تەورێز.
لەکۆتایی نیساندا گوێزانەوەی لەشکرسواری قافقاز بەرێی ئاسنیندا بەرەو جولفا دەستی پێ‌کرد. لەشکری گۆڕین پێك هات بو لەهەنگی١٦ی دراگون(تورسکوی)و هەنگی١٧ی دراگون(نیژگورودسکی) هەنگی١٨ی دراگون(سورسکی)و هەنگی١ی قازاق(خاپیورسکی)و گوردانی تۆپخانەی شاخێ، هەمو سوارنیزامی جەنەراڵ شارپانتیە بریتی بو لە٣٦ ئاسواران، ٢٢ تۆپو ٨ مەترەلوز.
رۆژی ٦ی مایس لەتەورێز کۆبونەوە. هێزی ناوبراو تا١٠ی مایس لەوێ مایەوە، تا بەشی لۆجستیك هۆی گوێزانەوەی ئامادەکردو گوێزانەوەی فیشەکی بەحوشتر دابین‌کرد، چونکە ئیتر جادەیەکی بەکاری پێچکەبێ لەرێدا نەمابو.
٩ی مایس تیپی٣ی قزاق(زابایکالسکی) کەپێشەنگی هێزەکە بو لەتەورێزەوە جولا، ١٠ی مانگ لەشکر سواری قافقاز بزوت.
رۆژی ١١ی مایس تیپی ٣ی قزاق(زابایکالسکی)و رۆژی ١٣ی مایس لەشکری قافقاز گەیشتنە نزیکی میاندواو.
رۆژانی١٢و١٣ هەموی خەریکی پەڕینەوە بون لەچەمی زەرینە(روباری جەغەتو). ئاوی روباری ناوبراو لەبەهارا زیاد ئەکاو پانایییەکەی ئەگاتە٣ کیلۆمەتر. لەبەر ئەوەی پردی لەسەر نەبو هەمو سوارە نیزامی روس بەمەلە پەڕینەوە. بۆ پەڕاندنەوەی تۆپو فیشەکو چەکو شتی‌تر، چەند موهەندیسێ پردێکی قەیاغییان لەسەر بەست.
هێزی سواری ناوبراو پاش پەڕینەوە لەروبار، لەنزیك میاندواو راوەستاو لای شاهین دژ(سایین قەلا)و مەهاباد کەوتە نۆڕین. رۆژی١٥ی مایس هێزی سوارە

بەرەو مەهاباد بزوتو لەنزیکی میاوا لەگەڵ دەستەجاتی کورد تێك هەڵچونو، راویان نانو تا داهاتنی تاریکی بەدویانەوە بون.

رۆژی ١٥ی مایس هێزی سوار پاش پێکدادانێکی کەم لەگەڵ کورد شاری مەهابادی گرت، کەسێکی ئەوتۆ لەشارا نەبو، کونسوڵگەی روس کەکوردەکان ئاگریان تێ بەردابو، هێشتا دوکەڵی لێ بەرز ئەبوەوە. چەند رۆژێ بەر لەداگیرکردنی، سەرهەنگ یاس کە لەوێ مابو، لەلایەن کوردەکانەوە کوژرا بو، کوردەکان سەرەکەیان بەنیزەدا کردبو، بەدێهاتەکاندا گێڕا بویان.

رۆژی١٦ی مایس هێزی سواری روس لەمەهاباد مایەوە، کەوتە نۆڕینی سەردەشتو شنۆ.

رۆژی١٨ هێزی سوار لەشنۆ نزیك کەوتەوە، گوردانی ئەمنیەی عوسمانیو کوردی لێ بون. کوردەکان لەوێ بەرهەڵستییەکی توندیان کرد، بەڵام روس بەزویی لەشار دەری پەڕاندنو، کوردەکان بەرەو موسل هەڵاتن.

هێزی سواری روس رۆژی١٩ی مایس لەنزیك شنۆ راوەستا، کەوتە نۆڕینی لاکانی خۆراواو خوارو. رۆژی٢٠ی مایس بەرەو ژور هەڵکشا. پاش بڕینی دو مەنزڵ رێگەو تێپەڕین لەکوێرەڕێ سەختەکانی چیاکان گەیشتە رەزاییە، نزیکەی هەفتەیەك لەم شارەدا مایەوە.

بەم پێیە هێزەکانی سوارە نیزام کارەکانی خۆی، کەجوڵان بو بەکەناری دەریاچەی رەزاییەدا، ئەنجام دا.

بزوتنی سوارە نیزامی روس بەتۆپخانەو موسەلسەلی زۆرەوە، کارێکی قوڵی لەناو ئێلاتدا کرد، دوای ئەوە تا ماوەیەك لەمەڵبەندی ئازەربایجان واتە لەتەنیشتو پشتەوەی سوپای روسیدا ئارامیی تەواو جێگیر بو، هیچ دەردەسەرێکیان بۆ دروست نەبو.

ئیتر روسەکان ئەیان توانی لەو هێزانەی بۆ ئازەربایجانیان ناردبو، کەم بکەنەوە. بۆیە هەمو پیادە نیزامی ئەو هێزەیان بەرەو مەلازگرد نارد. ئەم کەمکردنەوەیە هیچ کارێکی نەکردە سەر دۆخی ئەوان لەسەروی خۆراوای ئێران.

لەبەر ئەوەی هێزی سوارەی نیزام ئەرکەکانی خۆی بەجێهێنا، فەرماندەی قافقاز فەرمانیدا بەهێزی ناوبراو بچێ بۆ مەڵبەندی وانو بداتە پاڵ سوپای ٤ی قافقاز.

پەلامارەکەی سوارەی نیزام ئەگەرچی ٨٠٠ ڤیرست(ڤیرست ئەندازەیەکی روسییە بۆ پێوانی رێ، نزیکەی هەزار مەترە) رێی پێوابو، بەڵام چونکە بەوردی رێك

خرابو، کاتێ چوه پاڵ باڵی چەپی سوپای ٤ی قافقازەوە، لەدۆخێکی تەواو رێکوپێکدا بو.)) [٧٦]

کسرویش ئەم گێڕانەوەیەی پێ ناتەواوە، چونکە توخنی ئەوکوشتارو کاولکارییە نەکەوتوە کەسوپای روسی لەسەرەڕێی خۆیدا کردویەتی. سەرکردایەتی قافقاز، دەستەی چەکداری لەمەسیحییەکانی کوردستان، بەتایبەتی لەئەرمەنیو ئاسوری، پێك هێنابو، لەهێرشەکانیدا بۆ سەر کوردستان ئەوان ئەبونە پێشەنگی سوپاو، دەستیان لەهیچ تاوانێ نەئەگێڕایەوە.

لەم کەینوبەینەدا هێزەکانی روس، بەگوتەی تەدن((هەر بەگەیشتنیان بۆ سابلاغ، ئەوێیان قەتلوعام کردو، لە٢٢ی مایسدا کوردەکانی شنۆیان بەجۆرێکی وەها سەختو بێ بەزەییانە تەمێ‌کرد، کەئیتر شنۆ تاچەندین ساڵ نەی‌توانی راست بێتەوە)) [٧٧] هەر لەو هێرشە گشتییەدا چەند کەسێکیان لەپیاوە ناسراوەکانی کورد کوشت لەوانە قازی فەتاحی سابلاخیو، چەند کەسێکیان بەگیراوی رەوانەی قافقاز کرد، لەوانە سمکۆی شوکاکو سەید تەهای شەمزینی.

### ٥/٤ تۆڵەی ئاسوری لەخەلکی ورمێ

لەکاتی هاتنی ئۆردوی عوسمانیدا اعتماد الدولە لەگەڵ روسەکان هەڵاتبو، لەجێگەی ئەو عظیم السلطنە بو بەحاکمی ورمێ [٧٨] ناوچەکە هەموی بوبو بەمەیدانێکی سەختی پێکدادانی خوێناوی هێزەکانی روسو تورك. رووداوەکانی ناوچەکە برینە کۆنەکانی ناکۆکییە دینیی، مەزەبی، نەتەوەییەکانی قولتر کردبو. ئەوەش بوبو بەهۆی نەمانی هیچ جۆرە ئاسایشو ئارامیو هێمنییەك. پشێویو ئاژاوە هەمو ناوچەکەی داگرتبو. چارەسەرکردنی ئەو هەلومەرجە ئالۆزاوە لەتوانای هیچ کاربەدەستێکی ئێرانیدا نەبو.

رووداوەکانی ناوچەکە، گۆڕانی یەك لەدوای یەکی حاکمەکانی بەدوادا ئەهات. لەدوای کشانەوەی تورکو هاتنەوەی سوپای روسی حکومەتی ئێران، یمین الدولە، یەکێ لەشازادەکانی قاجاری، لەجێگەی عظیم السلطنە بەحاکمی ورمێ دانا. [٧٩]

ئاسورییەکان، کەتوشی زەرەرو زیانی گیانیو ماڵیو دوچاری ئازارێکی زۆر بو بونو، روسەکان چەکداریان کردبون، پشت ئەستور بەسوپای روس کەوتنە تۆڵە کردنەوە لەخەڵك. داوای بژاردنی ئەو زەرەرانەیان ئەکرد کەلێیان کەوتبو. یمین الدولەش ئەیویست دڵسۆزیو گوێڕایەڵی خۆی بۆ روسەکان دەرببڕێ. کەوتە گرتنی ئەوانەی ئازاری ئاسورییاندا بو. ماڵو ملکی زەوت ئەکردن. نزیکەی٢ هەزار کەسی خستە زیندانەوە. [٨٠] کاربەدەستانی عەجەم هەوڵیان ئەدا کەلك لەم ئالۆزییە وەربگرن بۆ دەوڵەمەند کردنی خۆیان. [٨١] نازناوو کاروباری حکومەتییان بەپارە

لەدەرباری قاجار ئەکرێ، ئەوانیش شوێنەکانی خوار خۆیان بەبێ گوێدانە لێوەشاوەیی‌و شارەزایی بەدراوی زۆر ئەفرۆشتەوە.[82]
هاوزەمان لەگەڵ ئەمەدا، هەندێ لەئەرمەنییەکانی قافقاز هاتبونە ناوچەی ورمێ دەستەی((قاجاغ))یان پێك هێنابو، هەر شەوە بەسەر گوندێکیاندا ئەداو تاڵانیان ئەکرد.[83] پشێوی لەناو ورمێ‌و دەوروبەری‌دا بەئەندازەیەك زیادی کرد، بۆئەوەی ئاسورییەکان دەس لەتاڵان کردنی خەڵکو راوورِوت هەڵبگرن، حکومەت بەناچاری کۆمیسیۆنێکی پێك هێنا بۆ لێکۆڵینەوەی گازندەی مەسیحییەکان، ئەم کۆمیسیۆنە داوای جێبەجێ‌کردنی ئەم خواستانەی کرد:
((١. موسوڵمانەکان ئەبێ کەلوپەلی بەتاڵان براوی مەسیحییەکان بدەنەوە بەخاوەنەکانی"
٢.ئەو کچانەی لەموسڵمانەکان مارەکراونو لەماڵی ئەواندا ئەژین، ئەبێ لەمیسیۆنی روسی‌دا بدرێنەوە دەست خێزانەکانی خۆیان"
٣. ئەبێ ئەهالی دەستەبەری بژاردنی ئەو زەرەرانە بێن کەلەومەسیحیانە کەوتوە کەکۆچیان کردوە))[84]
خواستەکانی ئەم کۆمیسیۆنە ئۆبالی مەسەلەکان ئەخاتە ئەستۆی موسڵمانان، کەدیارە مەبەست عەجەمەکانی ورمێیە، کەچی نوسەرانی عەجەم روداوەکانی ئەو سەردەمە ئەدەنە پاڵ کورد.[85] یەکێ لەوانە، تمدن، لەپەراوێزی ئەم داوایانەدا نوسیوێتی:
((دیار بو کەلابەلا کردنی کێشەکانی سەرەوە، زۆر دژوار بو، بگرە لەلابەلاکردن نەئەهاتن.
یەکەم کەلوپەلی بەتاڵان براو لیستەیەکی نەبو، دوەم تاڵانکەر دیاری کراوو ناسراو نەبو، سێیەم دیار نەبو تاڵانکەر موسوڵمان یا کورد، یا چریکی عوسمانی، یا کەسێکی تربوە.
سەبارەت بەوکچە مەسیحیانەی لەلایەن موسوڵمانەکانەوە مارە کرابون، ئەویش لابەلاکردنی دژواربو، چونکە ئەگەر ئەو کچانە بەزۆر درابونە موسوڵمانان، ئێستە کەمەسیحیەکان هەرچییان بویستایە ئەیان کرد، ئەو کچانەش ئەیان توانی لەماڵی مێردە موسوڵمانەکانیان برِۆنو دارایی مێردەکانیان لەباتی مارەیی ببەنو بەئازادی بگەرِێنەوە بۆماڵی باوکو دایك یا خزمەکانی خۆیان، وەئەگەر ئەم عەقدانە لەرِوی ئارەزوی سروشتی‌و پێوەندی خۆشەویستیەوە بوبێ، کەلەم حاڵەتەدا ناتوانرێ ژنی‌کەسێك بەزۆر لەدەستی بسەنرێ، یا بەزۆر ناچار بکرێ وازی لێ

بهێنێ، بەتایبەتی ژمارەیەکی زۆری ئەوکچانە، لەمێردەکانی خۆیان ئاوس بون، یا منداڵیان هەبو.
لەبابەت بڕیاری سێیەمەوە مەسەلەی بژاردنی زەرەر ئەویش کێشەیەکی دژوار بو چونکە موسوڵمانەکان هۆی کۆچی مەسیحیەکان نەبون، بەڵکومەسیحیەکان خۆیان لەترسی سوپای عوسمانی کۆچیان کردبو، لەلایەکی ترەوە بژاردنی زەرەر بەئەندازەیەکی دیاری نەکراو شتێکی مەحاڵ بو.))[٨٦]
خواستەکانی کۆمیسیۆنی تێکەڵاو، کەنوسەرانی عەجەم خۆیان ئەینوسنەوە، هەندێ روی کێشەکانی ئەو سەردەمە دەرئەخەن، وەکو بەڵگەیەکی مێژویی ئەگونجێ دو راستیان لێ هەڵبهێنجرێ" یەکەمیان، قوڵیو ناخۆشی ئەو مەینەتییە گەورەیەی بەسەر خەڵکی ناوچەکە بەگشتیو بەسەر ئاسورییەکان بەتایبەتی هاتوە. دوەمیان، ئەگەرچی هەمو نوسەرەکانی ئەو سەردەمە لەنوسینەوەی روداوەکاندا بێ لایەنییان بەلاوە ناوەو ئۆبالی گەورەی روداوەکان لەگەردنی کورد توند ئەکەن، کەچی ئەم کۆمیسیۆنە هیچ تاوانێ ناداتە پاڵ کوردو ناوی کوردی بەهیچ جۆرێ نەهێناوەتە ناوانەوە.
لەم هەلومەرجە ئاڵۆزەدا یمین الدولە لێخرا. اعتماد الدولە، کە لەگەڵ کشانەوەی روس کاتی خۆی رۆیشتبو بۆ خۆی، سەرلەنوێ بوەوە بەحاکمی ورمێ.[٨٧] سەرباری نائارامیو پشێوی، کێشەیەکی ناڵەباری تر دروست بو، کاریکردە سەرگوزەرانی خەڵکی. نرخی دراوی روسی شکا بو. مەناتی روسی نرخەکەی بوبوە نیوە، بەڵام ئەفسەرو سالداتەکانی روس بەزۆر بەهەمان نرخی پێشوی لەبازاڕدا کڕینو فرۆشتنیان پێ ئەکرد. ئەوەش بو بەهۆی نابوتی هەندێ لەبازرگانەکان.[٨٨]

### ٦/٤ کۆچی بەکۆمەڵی ئاسوری لەهەکارییەوە بۆ ورمێ

لەمانگی ئابدا کشانەوەی بەکۆمەڵی ئاسوری لەنیشتمانی دێرینەیانەوە بەرەو ناوچەکانی ژێر دەستی سوپای روسی لەسەر سنوری ئێران دەستی پێ‌کرد. ئەم کاروانە گەورە درێژە لەچیاکانی هەکارییەوە کەوتە رێ، ئەبو زیاتر لە١٠٠ کیلۆمەتر بەناو ئەرزی دوژمنەکانیدا بڕواو، دڕ بەو هێزانە بدات کەرێگەیان پێ ئەگرتن. بەدرێژایی رێگە توشی شەڕو پێکادان بون. ئاسورییەکان لەکشانەوەدا درێغییان لەکوشتنی بەکۆمەڵی کوردو، تاڵانی ئاژەڵو داراییو کاول کردنی گوندەکانیان نەکرد. شەڕ، رەنگی شەڕێکی دینی خوێناوی بەخۆیەوە گرت بوو هیچیان دەستی لەوی تر نەئەپاراستو هەرگەلەیان ئەیویست گەلەکەی تر لەڕەگوریشە دەربهێنێ.

بەرایی ئەم کۆچە گەورەیە لەسەرەتای ئەیلولدا گەیشتە سنور. چرنوزوبوف، لە١٥ ئەیلولدا لەباشقەلا سەردانی مارشیمونی کردو، داوای لێ کرد هەرلەوێ بمێنێتەوەو نەگەڕێتەوە قوچانس. سەرکردایەتی روسی ئەیویست، ئاسورییەکان لەناوچە سنورییەکاندا گل بداتەوە، بۆ ئەوەی وەکو قەڵغانێ یەکەم لەبەرامبەر ئۆردوی تورکدا بەکاریان بهێنێ. مارشیمون خەریك بو لەپشتیوانی روسی نائومێد ببێ. ویستی دەستەیەکی نوێنەرایەتی بنێرێ بۆ تاران داوا لەحکومەتی ئەڵمانی بکا لەبەینی ئەوانو تورکدا ناوبژی ئاشتبونەوە بکا.[89] ئەم هەواڵە کاربەدەستانی سوپاییو دیپلۆماسی روسی تەنگاوکرد. لەسەر پێشنیاری ئەوان، گراند دوك نیکۆلای نیکۆلایفیچ، بۆ دڵنەوایی مارشیمونو دڵنیاکردنی، لەکانونی یەکەمی١٩١٥دا مارشیمونی بۆگفتوگۆی سیاسیو سوپایی بۆ بارەگاکەی خۆی لەتفلیس بانگ هێشت کرد. مارشیمون لەگەڵ دەستەیەك لەمەزنەکانی ئاسوری بەرێگای ئاسنین چو بۆ تفلیس. لەوێ پێشوازییەکی گەرم کران. رۆژنامەکان وێنەی خۆیو مێژوی گەلەکەیان بڵاوکردەوە.

مارشیمونو نیکۆلای لەگفتوگۆکانیاندا پێکهاتن لەسەر ئەوەی" ئاسورییەکان لەپاڵ روسیاو دەوڵەتانی هاوپەیمانیدا بەشداری جەنگ بنو، ئاسورییەکان دەوڵەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێننو، هێزێکی چەکدار لەژێر سەرپەرشتی سوپای روسیدا رێك بخەن. لایەنی روسی بەڵێنی بەئاسورییەکاندا، کەئێران چۆڵ نەکا. موچەی مانگانە بۆ هەمو ئاسورییەکان بڕدرایەوە، مارشیمون خۆی مانگی٥٠٠ رۆبڵ، هەمو ئاسورییەکی گەورە ٦ رۆبڵو هەمو منالێکیش٣ رۆبل. ئەنجومەنی وەزیرانی روسی پێکهاتنەکەیان پەسندکردو، ئاسورییەکانی بەهاوپەیمانی خۆیو دەوڵەتانی پێکهاتو دانا. لەرۆژانی گفتوگۆدا قەیسەری روسیا، نیکۆلای دوەم، بروسکەیەکی بۆ مارشیمون کرد، قەیسەر ئارەزوی خۆی تێدا دەربڕیبو، کەپاتریاركو گەلەکەی بەو نزیکانە بەسەرکەوتویی بگەڕێنەوە نیشتمانی خۆیان.[90]

نیکیتین، کونسوڵی ئەودەمی روسیا لەورمێ، خۆی لەم بارەیەوە نوسیویێتی:

((بەداخەوە لەپایزی ١٩١٥دا لێشاوی هۆزەکانی نستوری مارشیمون پاش بەرهەڵستییەکی ئازایانەی کوردو تورك ناچارکرابون چیاکانی خۆیان بەجێ بهێڵنو، بەرەو ئەم ناوچەیە(ورمێ-و.) بێنو ببنە سەرباری هەلومەرجی شێواو.

((ناچار بۆ یارمەتیدانی پەنابەرەکان هەندێ پارەم داواکردو، بۆ پێشگیری لەبلاوبونەوەی نەخۆشی، نەخۆشخانەیەکم دامەزران. پاشەکشەی نستورییەکان بەرەو لای ریزە جەنگییەکانی ئێمە هەلومەرجی سیاسی شێوان. چونکە ئەم هۆزە شاخاوییە چەکدارانە، کە لەگەڵ کوردو تورك جەنگی بون، ئەگەر بەرەسمیش

لەلایەن ئێمەوە بۆ شەڕ دژی تورك بانگ نەكرابون، هیچ نەبێ لەلایەن سەركردایەتی جەنگی ئێمەوە هان درابون. لەبەر ئەوە بەهانویستایە یا نە، لەڕیزی هاوپەیمانانی تێشكاوی ئێمەدا ئەژمێردرانو، مافی ئەوەیان هەبو بێنە ناوهێزەكانی ئێمەوە. لەلایەكی‌ترەوە دیاربو كەروسیا لەجەنگدا دژی توركیا ئەیویست مەبستەكانی خۆی بهێنێتە دی، لەوانە رزگاری ئەرمەنستان. بۆ ئەوەش ئەبو دەس بخاتە چارەنوسی هۆزەكانی ئاسورییەوە بەتایبەتی ئەوانەیان كەبەشێكی دانیشتوانی ولایەتی وان یان پێك ئەهێنا. لەلایەكی تریشەوە دیاربو مارشیمون چوە بۆ تفلیس لەگەڵ گراندوك نیكۆلا لەبابەت سەربەخۆیی‌و ئازادی هۆزەكانی ئاسورەوە گفتوگۆی كردوەو، لەئەنجامدا بەدڵنیاییەوە گەڕابوەوە.

((جگە لەنستورییەكانی توركیا كەچاوەڕێ بون دوای جەنگ ئازادو سەربەخۆ بن، ئەوانەشیان كەهاوولاتی ئێران بون لەورمێ ئەژیان، سەرەڕای جیاوازیی مەزەبیان، لەهەمان رەگەز بون. ئەوانەش چەند هەزار كەس بون ئومێدەوار بون دوای جەنگ هەلومەرجی ژیانیان بگۆڕێو، لەژێر دەسەلاتی دەوڵەتانی موسوڵمان دەربێن. تاقمێ لەوانە دو پشتیان لەبەردەستی میسیۆنەكاندا پەروەردە بوبون، قەشەو مامۆستاو پزیشكیان تێدا پێ‌گەیشتبو، لەڕوی تێگەیشتنو هۆشیارییەوە لەوانی‌تر بەرزتر بون، ئەیان ویست لەبزوتنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی‌دا ببنە سەركردەو پێشەوای گەلی ئاسوریو، لەپەنای قەڵغانی روسی‌دا ئاواتەكانی خۆیان بهێننە دی.))[91]

### ٥.كاری روداوەكانی ناو روسیا لەسەر ئاسوری

### ١/٥ شۆڕشی شویات

هاوزەمان لەگەڵ گفتوگۆ نهێنییەكانی سایكس‌و، پیكۆو، سازانوف بۆ پێكهاتن لەسەر دابەش‌كردنی ئەرزی عوسمانی‌و ئێرانی، لەشكركێشی روسی لەهاوینی ساڵی ١٩١٦دا لەكوردستاندا گەیشتە ئەوپەڕی تین‌و تەوژمی" سوپای روسی لەتوركیا هەمو ناوچە كوردنشینەكانی سەروی كوردستانی داگیركردبو. ئەرزڕوم، ئەرزنجان، وان، بتلیس كەوتبونە ژێر دەستی. لەئێرانیش بەرەو خواروی كوردستان، بۆئەوەی لەگەڵ سوپای بەریتانی لەسەر ئەرزی عیراقی ئێستە یەك بگرێتەوەو پێكەوە بچنە ناو ولایەتی موسڵەوە، كەوتبوە جوڵانێكی‌خێرا. مەڵبەندە كوردنشینەكانی ئێران لەئازەربایجان، موكریان، سنە، كرماشان هەتا قەسری شیرین یەك لەدوای یەك ئەكەوتنە ژێردەستی. سوپای روسی لەژوروی كوردستاندا گەیشتبوە خانەقین‌و پێنجوێن‌و رەواندز. لەم پێشڕەوییەی سوپای روسی‌دا، دەستە چەكدارەكانی مەسیحییەكان، بەتایبەتی ئەرمەنی، پێشەنگی هێزی پەلاماردەر

بونو، بەرقێکی قوڵو قینێکی بێ ئەندازەوە ئەگەیشتنە هەرجێیەکی کوردستان، تۆڵەی قەتلوعامی دڕندانەی ١٩١٥ی ئەرمەنەکانی تورکیایان لەخەڵکی ئەو شوێنانە ئەکردەوە. لەوەشدا فەرمانەدەکانی روس رێیان لێ نەئەگرتن.[٩٢] وەکو مارشیمون لەگەڵ گراندوك نیکۆلای پێکهاتبو، روسەکان دەستیان کرد بەیارمەتیدانو رێکخستنی ئاسورییەکان، چ ئەوانی لەهەکارییەوە هاتبونو چ ئەوانەی لەورمێبون. لەگەڵ ئەوان هەندێ لەئەرمەنییەکانیشیان رێكخست. تا سەرەتای ساڵی ١٩١٧ لەشکرێکی چەکداریان لەورمێ کۆکردەوە.[٩٣] بەڵام ئەم هێزە لەژێرفەرمانی سوپای روسیدا بەکارئەهێنرا.

روسیا توشی داتەپینی ناوەکی بو، لەشوباتی ١٩١٧دا شۆڕشێکی ناوخۆ رویدا، رژێمی قەیسەریی روخاند. بەڵام رژێمی نوێ درێژەی بەجەنگو هاوپەیمانێتی بەریتانیاو فەرەنسەدا. ئەو هێرشە گشتییەی لەبەهاری ١٩١٦ەوە دەستی پێ‌کردبو بەرەو موسڵ بۆئەوەی لەگەڵ سوپای بەریتانیدا یەك بگرێتەوە، سەرەڕای روداوەکانی ناوەوەی روسیا، تا پایزی ١٩١٧ هەر بەردەوام بو.[٩٤] لەمانگی نیساندا هێزەکانی روسو ئینگلیز ماوەیەکی کورت لەقۆڵی خانەقینەوە یەکیان گرتەوە. بەڵام شۆڕشەکە وەها کاری لەسوپا کردبو بەرەوبڵاوە لێ‌کردنو هەڵوەشان ئەچو.[٩٥]

## ٢/٥ پەشێوانی هەلومەرجی ورمێ

رەفتاری خراپی هێزی داگیرکەری روسی لەگەڵ کورد، وەکو پێشو، درێژەی کێشا. بەهارو هاوینی ١٩١٧ ستەمی روسی بەرامبەر کوردو ئازەری گەیشتبوە رادەیەك، کاتێ جەنەراڵ وادبولسکی لەمانگی مایسدا کرایە فەرمانەدەی سوپای حەوتەمی روسی، هەرکە گەیشتە ورمێ((یەکەمین بەندی کارنامەی رۆژانەی خۆی بەسەرکۆنەی رەفتاری خراپی سەربازانی روسی دەس پێ‌کردو، ئەو مەترسییانەی هێنایە بەرچاویان کەرەنگە ئەو جۆرە کردەوانە بیخولقێنێ‌و، هانیدان پێرەوی سەرەتاکانی دادپەروەریو شەریفی بکەن، وەکو هاوولاتی راستو ئازاد بجولێنەوە))[٩٦] ئاتاشیەی سوپایی فەرەنسی لەبارەگای فەرمانەدەیی قافقاز لەمانگەکانی مایسو حوزەیرانی ١٩١٧دا گەشتێکی پشکنینی لەناوچەی ورمێدا کرد. دانیال متی، لەلێکۆڵینەوەکەی خۆیدابو((تێگەیشتنی باشتر لەچۆنایەتی رەفتاری جەنەراڵەکانی سوپای حەوتەمی سەربەخۆی قافقاز لەگەڵ خەڵکی کورد)) لەزمانی ئەوەوە قسەیەك بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:(( ...کاربەدەستانی سوپایی روس تەنانەت ئەوەندەش خۆیان ماندو نەکردوە، ئەو یارمەتییانەی میسیۆنی ئەمەریکایی لەورمێ ئەیخستە

بەردەستیان، بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی ئەوکوردانەی لەهەژارییەکی سەختدا پەلەقاژێیان بو، بگەیەنی ... من خۆم بۆ میسیۆنێرە ئەمریکاییەکان، کە تا ئێستە بێ هیچ بیانویەکی بەجێ، رێیان نەئەدان بچن بۆ ناوچەی سابلاخ، ئیجازەی رۆیشتنم بۆ ناوچەی ناوبراو لەجەنەراڵی فەرماندەی سوپای حەوتەم بۆ داواکردن ... سەرەنجام ئەم یارمەتییە لەلایەن خاچی سوری روسی‌و میسیۆنی ئەمریکاییەوە لەدەرەوەی ناوچەیەکی دانەبڕاوی ورمێ رێك ئەخرێ ... بەتایبەتی لەسابلاخ ... لەم شارە بچوکەدا ژمارەیەکی زۆر پەنابەری کورد هەن کەتوشی هەژارییەکی سەخت بون ))[97]

لەوماوەیەدا حکومەتی ئێران اعتمادالدولەی سەر بەروسیای لێخستبو، معز الدولە معین بوبو بەحاکمی ورمێ. لەکاتێکا کسوپاییانی روس خەریکی گەڕانەوە بون بۆ نیشتمانی خۆیان، بەقسەی نیکیتین((نزیکەی٨٠ هەزار سەربازی روسی لەورمێ بون، کەباش ئەیان خواردو ئەحەسانەوە، کارەکەشیان تەنیا ئەوەبو٣ جار بازاڕی هەژارانەی ئەمشارە تالان بکەن. کەلوپەلی تالانکراو لەگەڵ جلی سوپایی‌و چەکمەکانیان‌و تفاقی جەنگی‌و هەرچیەکی‌تر لێیان داوابکرایە تەنانەت تفەنگ‌و فیشەکەکانی خۆیشیان فرۆشت))[98] سەربازەکانی ئەگەڕانەوە ئەیان ویست پێویستییەکانی رێگە بۆ خۆیان دابین بکەن. نرخی مەناتی روسی ئەوەندە شکا بو، بوبو بەنیوە. سەربازەکانی روس ئەیان ویست بەنرخی پێشوی شتی پێ بکڕن، بەڵام دوکاندارەکانی ورمێ‌و خەڵك ئامادە نەبون بەو نرخە لێیان وەربگرن. لەسەر ئەوە هەمو رۆژێ کێشە لەبازاڕدا دروست ئەبو.[99] تا کار گەیشتە ئەوەی نیوەڕۆی ١٦ رەمەزانی١٣٣٥/١٤ تیرماهی١٢٩٦ سالدات ڕژانە بازاڕەوە. تەقە دروست بو. قازاقێکی ئێرانی کوژراو یەکێکیش برینداربو. خەڵك لەترسی گیانی خۆیان بازاڕیان چۆڵکرد. سالدات‌و قازاق چۆڵیی بازاڕیان بەهەل زانی. کەوتنە شکاندنی دوکانەکان. هەرچییەکی بەنرخیان بەردەستکەوت تالانیانکرد. بۆ شاردنەوەی ئەوتاوانە درەنگانی شەو بازاڕی ورمێیان ئاگردا.[100]

بۆئەوەی وێنەیەکی هەلومەرجی ژیانی خەڵکی ئەو مەڵبەندە لەبەرچاو بێ، هەندێ بەشی سکالانامەی ٨٧ کەسی خەڵکی ورمێ کەبۆ وەلیعەهدی ئێرانیان نوسیوەو، رۆژنامەیەکی ئەو سەردەمە((تجدد)) لەژمارەی رۆژی١٠ی شوالی١٣٣٥/٣٠ی حوزەیرانی ١٩١٧دا وێنەیەکی بلاوکردۆتەوە، لێرەدا ئەنوسینەوە، لەسکالانامەکەدا هاتوە:

((... ئەوەی لەماوەی٣ ساڵی ڕابردودا، لەکوشتن‌و تالان‌و زەرەرو ئەتکی ناموس‌و سوتانی شوێن‌و مسیبەتی گەورەو زوڵمی جۆراوجۆرو دەسدرێژی شەرم

هێنەر، کەپەنجەو قەڵەم لەڕونکردنەوەو پیشاندانی دوچاری شەرمەزاری ئەبێ...
داتمان بەخۆماندا گرت و برینی دڵی سوتاوی خۆمان بەوە ساڕێژو خۆش ئەکرد کەئەلحەمدولیلا لەبێدادو زوڵمی سەردەمی ئیستیبدادی دەوڵەتی دراوسێمان ڕزگارمان بو، ئەوانیش بونە خاوەنی حکومەتی دەستوری‌و، داوای یەکێتی برایەتییان ئەکردو، پیاوە ژیرەکانی قەومی نەجیبی روس خەریکی ڕاکێشانی دڵی خەڵکی ئێران‌و، ئیتر لەوجۆرە دەسدرێژییانەی پێشو رزگارمان بوە، لەناکاو ئەوەی لەسەردەمی بێزراوی ئیستیبدادا چاوەڕێ نەئەکرا، لەزەمانی ئازادی‌دا کردیان"
ڕۆژی چوارشەممە١٤ی ڕەمەزان، سەعاتێکی ئێوارەی مابو، ساڵداتێکی روس بێ هیچ هۆیەك، لەدەروازەی بالآ ٣ کەسی بەگولله کوشت‌و بریندارکرد.
ڕۆژی پێنجشەممە، بخشعلی‌خان ناویان، لەبەردەرگای ماڵی ئاغاکەی‌دا حاجی عەزیزخانی ئەمیر تومان‌دا، کوشت.
ڕۆژی هەینی١٦ی ڕەمەزان ڕژانە بازاڕەوە، چەند تەقەیەکیان‌کرد، قازاقێکی ئێرانییان کوشت‌و چەندکەسێکیان زامارکرد، لەکاتێکا بازاڕ بەتەواوی لەخەڵك چۆڵ بو، سەرەتا لەکاروانسەرای شجاع الدولەوە دەستیان‌کرد بەشکاندنی حوجرەو سندوقی بازرگان‌و سەراف‌و تالآنی کەلوپەل‌و پارەو، بەتەواوی تالآن‌کرا. هەروەها دەستیان درێژکرد بۆ هەمو راستەو دوکان‌و تیجارەتخانەکان، بەعەرەبانەی لەژمارە نەهاتو ئەیان گواستەوە. لەم کاتەدا بو عەسر بەهۆی حکومەتی جلیلەو کارگوزاری کونسولگەری‌و سەرۆکایەتی سوپای روسی داوای ئەمنییەتمان‌کرد، ئەوانیش بەڵێنی ئەمنییەتیان‌دا بەهۆی تاقمێ لەمعاون‌و حکومەت‌و کارگوزاری(تاقمێ لەبەرێزانی شار کە بۆ گفتوگۆ چوبون)، تەنانەت ویستمان پاشماوەی کەلوپەل‌و دەفتەرەکانمان دەربهێنین، سوپاییەکان ڕێگەیان نەداو، وتیان پاشماوەی شتەکان ئەمینەو پارێزگاری بازاڕ لەئەستۆی ئێمە دایە. بەئومێدی ئەوان بەناچاری هەرکسەمان بەنابەدڵی‌و نائاسودەیی لەماڵی خۆماندا ماینەوە. چەند سەعاتێ لەشەو تێ پەڕی بو لەناکاو، پاش‌ئەوەی بەئارەزوی خۆیان تالآنیان‌کرد، بەترومپا نەوتیان بەهەمو راستەو دوکانەکان‌دا رژاندو ئاگریان تێ‌بەردا، بازاڕو هەرچییەکی تێ‌دابو وەکو دڵی خاوەنەکانی بەجۆرێ سوتان کەشوێنەواری نەمێنێ...
ئەو رۆژە ناوەرۆکی(وتضع کل ذات حمل حملها) بۆ ئەم دڵسوتاوانە ڕون بوەوە. ئێمە ئەو شەوەمان ڕۆژ کردەوە، لەکاتێکا هەمومان سەرەتای شەو زەنگین‌و لەکۆتایی شەودا نابوت‌و نەدارا، سەرەڕای ئەو پەژارە لەتوانا بەدەرە کەهەمو سامانمان بەتالآن براوە، خۆمان لەماڵ‌و کۆلآنەکان‌دا بێکارو سەرگەردان، بەشی

زۆرمان شەو بەبرسێتی بسەر ئەبەین، هێشتا لەماڵو کەسوکارو ناموسی خۆمان ئەمین نین.

ئەم کارەی سوپاییەکان، ملهوڕی جیلوو ئەشرارەکانی تری زیادکردوە، ئەوانیش کەوتونەتە دەسدرێژیو تالآنی دێهات. ڕۆژانی١٨و١٩ لەگوندی عەلی ابادی تازە کەند٣١ کەسیان کوشتوەو زامارکردوەو، داراییان تالآنکردون. گوندی یور قانلویان لەپاش تالآنکردن سوتاندوە. گوندی زینالویان تالآنو٤ کەسیان لێ کوشتون. گوندەکانی لوڕ، بالآجو، خانەقایان تالآنو سوتاندوە. گوندەکانی دارقالو، تیزو هیتریان کاولکردوە، لەهەر یەکێکیاندا کوشتنو سوتاندنو تالآنیانکردوە. لەگوندی دیکالە کەلە ئەرزی شاردایەو، مەسیحی نشینە، سوارەیەکی ئێرانییان پارچە پارچەکردوە.

جیلو... هەرچی خەرمانێکیان بەردەس ئەکەوێ ئەیبەن، لەمکاتەدا کەوەرزی هەڵگرتنی بەروبومە، لەم هەلومەرجە نالەبارەدا ئێمەی خەڵکی سەرگەردانو بێ سەروسامان، نازانین زستان چی بخۆین بۆ ئەوەی لەبرسان نەمرین ...))[101]

لەم هەلومەرجەدا هەندێ لەئاسوریو ئەرمەنییەکان لەپیریستاڤەکانی چەند شوێنی وەکوگوندەکانی بیکشلو، باراندوزچای، ڕوزەچای، بۆ پارێزگاری ئارامو ئاسایشی ناوچەکە دامەزرابون. بەڵام ئەوان خۆیان شەوانە ئەیاندا بەسەرگوندەکاندا ڕاووڕوتیان ئەکرد. لەگوندی سەرقلی کندی ڕوداوێکی لەو بابەتە ڕویدا: ئەرمەنییەکو گوندییەك کوژران. ئەمەش دۆخی ناوچەکەی پتر ئاڵۆزانو چەند ڕوداوێکی تری لێ قەوما. ڕوسەکان بۆ ئەوەی زیاتر پەرە نەسێنێ تێکەوتن. نیکیتین لەو بارەیەوە بە٤ زمان((ئیعلان))ێکی بۆ((ئەهالی موحتەرەمی ورمێو ئەتراف))ی چاپکرد. لەئیعلانەکەدا باسی دروست بونی ئاژاوەو پشێوی ئەکا لەدێهاتەکاندا، کەهەندێ مەسیحی تێدا کوژراوە، بەناوی فەرماندەی ڕوسییەوە هەڕەشە لەوانە ئەکا کەئاژاوە ئەنێنەوەو داوا ئەکا((... گوێ لەقسەی مفسدین نەگرن، کەئەیانەوێ ببنە هۆی دوژمنایەتیو نەیاری لەناو خەڵکدا...))[102]

نوسەرانی ئێرانی ڕوداوەکە بەجۆرێکیتر ئەگێڕنەوە. ئەڵێن کابرایەکی ئەرمەنی بەناوی پیریم کەخۆی پیریستاڤی نازلوچای بو، شەو ئەچێتە سەر ماڵی وەهاب سوڵتان لەگوندی سفرقلی کەندی داوای٣٠٠ تومانی لێ ئەکا. وەهاب پارەکەی پێهەڵناسورێ، هەڵدێ. لەو بەزمەدا هەم وەهابو هەم پیریم ئەکوژرێن. سوارەکانی پیریم بەبیانوی ئەوەی پیریم بەگوللەی وەهاب کوژراوە، هەمو خێزانەکەی ئەکوژنو، ماڵەکەی تالآن ئەکەنو، ئینجا ئاگری ئەدەن. بۆ سبەینێ

کەهەواڵی کوژرانی پیریم بەبراکەی ئەدەن، ئەویش بەچەند سوارێکەوە ئەچێ بۆ هێنانەوەی لاشەی پیریم‌و بەدەم ڕێگاوە توشی هەرکەس ئەبێ ئەی‌کوژێ. گوایە پاش ئەوەی کاربەدەستانی روسی داوای لێ ئەکەن، ئینجا دەس لەکوشتن‌و تالان هەڵئەگرێ‌و ئەگەڕێتەوە بۆ شار. بەقسەی تمدن نیکیتین ئەو ئیعلانەی بۆ پاساودانی ئەو ڕوداوە بڵاوکردۆتەوە.[۱۰۳]

تالان، ڕاووڕوت، کوژران، سوتان‌و ئاگرکەوتنەوە... لەناوچەکەدا ئەبێتە ڕوداوی ڕۆژانە، بێ ئەوەی کاربەدەستانی ئێرانی بتوانن چارەی بکەن‌و، بێ ئەوەی دەسەڵاتدارانی روسی لێی بپرسنەوە. خەڵك ترس‌و داخ‌و قینی لەدەروندا کەڵەکە ئەبو.

## ٣/٥ پڕکردنەوەی بۆشایی روسی بەچەکداری ئاسوری

شۆڕشی شوباتی١٩١٧ی روسیە ریزەکانی سوپای روسی شڵەژاند، هەرچەندە هێزەکانی ئینگلیز لەعیراق شکستێکی سەختیان بەتۆردوی تورك‌داو، بەغدادیان داگیرکرد، بەڵام هاوبەشی روسی لەپلانی پەلاماردانی موسڵدا پەکی‌کەوت، چونکە تا ئەهات پەشێوانی ناو سوپا زیادی ئەکرد. سەربازەکان لەناوکەرتەکانی سوپادا کۆمیتەیان بۆ چاودێری فەرماندەکان‌و جوڵانە جەنگییەکان پێکهێنابو. سەربازەکان پاش چەند ساڵ جەنگی خوێناوی‌و دور وڵاتی ئەیان ویست بگەڕێنەوە ناوکەسوکاری خۆیان. بەکۆمەڵ ریزەکانی سوپایان بەجێ ئەهێشت‌وگوێیان نەئەدایە قسەی فەرماندەو دیسیپلینی سوپایی. پەشێوانی ریزەکانی سوپای روسی لەجەبهەی قافقازو کوردستان، فەرماندەیی ئینگلیزی‌و فەڕەنسی خستبوە پەژارەوە. ئەم دورنمایە لەگفتوگۆ ستراتیجییەکانی هاوپەیمانەکاندا سەبارەت بەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست رەنگی دابوەوە. سەرکردایەتی هاوپەیمانەکان بۆ پڕکردنەوەی دروستبونی بۆشایی روسی، بەرنامەی جۆراوجۆریان ئامادە ئەکرد، یەکێ لەگرنگترینی ئەم بەرنامانە، بەرنامەیەك بو لەمانگی ئۆکتۆبەردا، چەند ڕۆژێ بەرلە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری روسی، جەنەراڵ نیسل فەرماندەی میسیۆنی سوپایی فەڕەنسە لەڕوسیا ئامادەی کردبو. نیسل لەم بەرنامەیەدا چەند ڕێگەکاری پێشنیارکردبو، لەناو ئەوانەدا ئەڵێ:((هەرکارێکی جەنگیی دژی تورکیا ئەتوانێ‌و ئەبێ پشت ئەستوربێ بەکاری ئاژاوەنانەوەی سیاسی دژی ئەم ئیمپراتۆرییە چەند- نەتەوەییە. هاوپەیمانەکان بەرلەئێستە رایانگەیاند((عەرەبستان هی‌عەرەبە)) ئەبێ بەڕاگەیاندنی((کوردستان هی‌کوردە)) درێژە بەم سیاسەتە بدەن ...

ئەمە کارێکی کاریگەرە، ئەتوانێ لەجەبهەی قافقازو، لەزەمانێکا کەپێ ئەچێ کاری جەنگیی روس نرخی پێشوی خۆی لەدەس بدا، بەکاربهێنرێ... هەمو تەقەلاکانی روس بۆ بەدەسهێنانی پشتگیری کورد سەرکەوتو نەبو... ئەو تالان‌وکوشتارەی قازاقەکان کردویانە یارمەتی زۆری ئەمەی داوە)) جەنەراڵ نیسل بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە کوردییە نوێیە پێشنیاری کردبو نوێنەرانی هاوپەیمانەکان لەوان کۆببنەوەو، ئەیوت کە:((ئەرمەنییەکان لەمکارەدا یارمەتی‌مان ئەدەن, هەرچەندە دوژمنایەتی دێرینەی نێوان ئەم دوگەلە شتێکی مێژوییش بێ، بەلاّم ئەرمەن پەیان بەوە بردوە، کەدامەزرانی کوردستانێکی ئۆتۆنۆم دەستەبەرێکی نوێ ئەبێ بۆ جێبەجێ کردنی راستەقینەی سەرەتای نەتەوەکان‌و دامەزرانی ئەرمەنستانی ئۆتۆنۆم لەپاشەرۆژێکی نزیکدا))[١٠٤]

ئەم بەرنامەیە لەئاستێکی بەرزی کاربەدەستانی هاوپەیمانەکاندا خرایە بەرلێدوان‌و گفتوگۆ. سەرۆکی ئەنجومەنی فەرەنسی، لەرێگەی مارشاڵ فوشەوە هەمو ناوەندە سیاسییەکانی فەرەنسەی لەوەلاّمی پێشنیارەکانی نیسل بەتەلەگرامی لە١٣ی کانونی دوەمی١٩١٧دا بەم جۆرە ئاگادارکرد:((حکومەت وەهای لێك ئەداتەوە، کە بەدەسهێنانی هاوکاری بەردەوامی ئەرمەن‌و هەمو مەسیحییەکانی قافقاز بەخەرجێکی کەم ئەکرێ... لەبەرامبەر ئەوەدا، دەربڕینی دۆستایەتی لەگەڵ ئیلاتی کورد هەستی دوژمنانەی مەسیحییەکان بەرامبەر بەئێمە ئەوروژێنێ... لەئەنجامی ئەوەدا حکومەت پێی وانییە کەئەگەر بەگوێرەی ئەو بەرنامەیەی لەراپۆرتەکەی جەنەراڵ نیسلّدا رون کراوەتەوە، بەئاشکرا موافەقەت لەسەر دامەزرانی کوردستانی ئۆتۆنۆم بکرێ، شتێکی گونجاو بێ... لەگەڵ هەمو ئەوانەش‌دا حکومەت لەبەرچاوێتی بەکەڵك وەرگرتن لەو توانایەی لەبەردەس دایە، یارمەتی جەنگیی هۆزەکانی کورد بەدەس بهێنێ... ئەتوانرێ کۆلۆنێل شاردینی رابسپێردرێ بۆ دۆزینەوەی رێگەی گفتوگۆ لەگەڵ سەرانی باسکراو...))[١٠٥]

رێنوێنییەکانی مارشال فوش بۆ جەنەراڵ نیسل بەرامبەر کوردو، جۆری پڕکردنەوەی بۆشایی روسی، هیچ لێڵی‌و نادیارییەك لەسیاسەتی کوردیی هاوپەیمانەکاندا ناهێڵێتەوە.

شۆڕشی شوبات دیسیپلینی جەنگی لەریزەکانی سوپای روسی‌دا نەهێشتبو، ئەمەش‌کاری ئەکردە سەر رەوتی‌گشتی جەنگو، کەم‌کردنەوەی گوشاری جەنگیی دەوڵەتانی پێکهاتو لەمەیدانێکی گرنگی ململانێی هەردولای شەرەکەدا. تا ئەهات هێزەکانی سوپای روسی زیاتر لەبەر یەك هەڵئەوەشان. نوێنەرانی سوپایی

ئینگلیزو فەرەنسە لەتفلیس، بارەگای سەرکردایەتی جەبهەی قافقاز، زیاتر هەستیان بەپێویستی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە ئەکرد کەلاوازبونی سوپای روسی دروستی ئەکردو، سەرەنجام گەیشتنە ئەوەی هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بەسازدانو رێکخستنو چەکدارکردنی مەسیحییەکان، بەتایبەتی بەئاسورییەکان بدەن.

### ٤/٥ پێکهێنانی تیپە ئاسورییەکان

شۆڕشی ئۆکتۆبەر ترسی خستە ناو ئاسورییەکانەوە. نیکیتین، لەو بارەیەوە نوسیویەتی:

((پشێوی و یاخی‌بونی ناو سوپای روسیو راگرتنی جەنگ، مەسیحیەکانی خستە ترسەوە، ناچار دەستەیەکی نوێنەرایەتی لەئۆکتۆبەری ١٩١٧دا چو بۆ تفلیس، داوای پشتیوانییان لەکاربەدەستانی دەوڵەت کرد، دوای گەیشتنی ئەم نوێنەرایەتیە یەکسەر جەنەراڵ لیبیدینسکی فەرماندەی هێزەکانی قافقاز بەتەلەگراف ئاگاداری کردم" کەبڕیار دراوە لەورمێ هێزێ لەمەسیحییەکان دروست بکرێ، هەڵبەت ئاتاشیە جەنگییەکانی هاوپەیمانەکانیش وەکوکۆلۆنێل شاردینی، کاپیتەن مارچ، میجەر ئستکس، کۆلۆنێل پایك ئەم بڕیارەیان بەلاوە پەسەندە. ئەم رێکخراوە نوێیە، سەرەڕای پاراستنی مەسیحییەکان، ئەبێ درێژە بەکارە جەنگییەکانی جەبهەی تورك بدا. هاوپەیمانەکان گفتی یارمەتی فەنیو ماڵییان پێ داوین.

((راستەوخۆ٣ ئەفسەری فەرەنسی دەستیان‌کرد بەرێکخستن. بەڵام کۆلۆنێل شاردینی لەکاتی دیتنەکەی‌دا لەورمێ پێی وتم کەبەشداری حکومەتی فەرەنسی لەم رێکخراوە تازەیەدا شتێکی کاتییە چونکە ئێرانو قافقاز بونەتە ناوچەی کاری ئینگلیز، جەنەراڵ دنستروفیل ئەبێ خەریکی کاری ئەم دو وڵاتە بێ.))[١٠٦]

هاوپەیمانەکان، لەهەموکاتێکی کەزیاتر پێویستییان بەهاوکاری مەسیحییەکان بو. بەهەر نرخێ بوایە ئەبو هەوڵی بەدەسهێنانی هاوکاری ئەوان بدەن.[١٠٧] کاپیتەن گرەیسی، کەئەفسەری پێوەندی بو لەگەڵ ئەرمەنییەکان لە وان، لەکۆتایی١٩١٧و سەرەتای١٩١٨دا بەنوێنەرایەتی ئینگلیز چو بۆ سەردانی مەسیحییەکان لەورمێ. لەکۆبونەوەیەکدا کە بەسەرانی ئاسورییەکانی کردو، نیکیتین، سونتاك نوێنەری پاپا، د. شید کونسوڵی فەخری ئەمریکاو، د. کوژل بەرپرسی نەخۆشخانەی فەرەنسی تیا بەشداربون. گرەیسی بەڵێنی بەئاسورییەکاندا ،((لەکۆنفرەنسی داهاتوی ئاشتی‌دا لەپاریس، چارەنوسی گەلەکەیان بەباشترین شێوە باس بکرێ)). لەبەرامبەر ئەوەدا داوای لێ کردن تیپی

چەکدار پێك بهێنن‌و ئەرکی پاراستنی ئەو مەڵبەندە بگرنە ئەستۆ کە لەدەریای رەشەوە تا بەغداد درێژ ئەبێتەوە. گفتی پێدان، پێویستییەکانیان لەچەك‌و، پارەو، کادرو، پشتیوانی بۆ دابین بکا. قەول بو٢٥٠ ئەفسەری روسی بێنە ورمێ بۆ ریکخستنی ئەم هێزە نوێیە.[١٠٨]

سەرکردایەتی ئاسوری ئەبێ پەی بەوگۆڕانە قوڵە نەبردبێ کە لەروسیاو سیاسەتی سۆڤێتی‌دا بەرامبەر جەنگو، دەوڵەتانی ئێرانی‌و عوسمانی روی دابو. چونکە هەر لەوماوەیەدا کەخەریکی کۆبونەوە بون بۆ پێکهێنانی هێزی چەکداری مەسیحی‌و ئەرمەنی بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کشانەوەی سوپای روسی لەجەبهەکانی جەنگ‌دا دروستی ئەکرد، ئاغا پەترۆس، کەدوای مارشیمون دوەمین کسایەتی گرنگی ئاسوری بو، بەبۆنەی پێکهێنانی تیپە چەکدارەکانی ئاسورییەوە لەوتارێکی درێژدا، کەوەکو بەرنامەی کارەکەیان، وای دەرئەخا هێشتا پشت ئەستورە بەروسیا، لێرەدا وەکو بەڵگەیەکی مێژوی تێکرای وتارەکەی ئەنوسینەوە:

((برا ئاسورییەکانم!

((نیشتمانەکەمان بەخوێنی براکانی ئێمە رەنگاوە، ئاواییەکانمان کاول بون، زۆریان سوتاون‌و لەناوچون، ئاژەڵو داراییمان بەجارێ پەراگەندەو، کڵێسەکانمان بەدەستی کوردو تورك بونەتە کەلاوە.

زۆرایەتی ئێمە، بەو دڕندایەتیە دڵسوتێنەی کەناتوانرێ بهێنرێتە بەرچاو، ئەبینین کەهەزاران هەزار تاقم‌و بنەماڵەی بێ گوناهی مەسیحی لەلایەن کوردو تورکەوە، لەپێناوی پاراستنی دین‌و نەتەوەو نیشتمانی خۆیاندا، کوژران.

هەزاران هەزار ئاسوری، لەوانەی لەخەنجەری تورك‌و کورد رزگاربون، روسیای دایکی ئێمە ئەوانەی تا ئەمڕۆ وەکوکوڕی خۆی ژیاندوەو داڵدەی داون، ئایا ئەزانن روسیا وەکو دایکێکی دڵسۆز بەتەنگتانەوە دێ؟ کەواتە لەسەر ئێوەش پێویستە بەرامبەر بەروسیا دڵسۆزو راستگۆبن، هەمو رۆژێ دوعا بۆ میللەتی روس بکەن.

هەروەها نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێتەوە، میسیۆنی ئەمریکی لەورمێ زیاتر لە١٥ هەزار کسی ئێمەی لەکوردو تورك رزگارکردو نزیکەی ٦ مانگ خۆراکی پێ دانو بەخێوی‌کردن.

لەخوا بخوازن کەروسیای دایکمان، توانای خۆی لەدەس نەدا، هەر بەوگەورەیی‌و مەزنی‌و شکۆدارییە تا هەتایە بمێنێ.

برایان! ئاخۆ ئەزانن ئەگەر حکومەتە ئیسلامییەکانی تورکیاو ئێران لەدەسەلاتی روسی نەترسانایە، نەیان ئەهێشت مەسیحییەك لەم دو وڵاتەدا بژین، بۆیە ئەبێ هەمیشە دوعا بۆ سوپاییانی روس بکەن، چونکە ئەوانە لەم سەردەمەدا،

لەرێگەی هەق‌دا، دژی دەوڵەتانی هەق کوژی ئەڵمان، نەمسا، مەجەر، عوسمانی، بولغار ئەجەنگن. دەوڵەتانی مەزنی فەرەنسا، ئینگلیز، ئیتالیا، ژاپۆن، رۆمانی‌و، مشتی میللەتی ئازای سیرب کەهاوپەیمانی روسن، ئەبێ یارمەتی سوپاییانی ئەوانیش بدرێ.

لەپاش سەرکەوتن، بێگومان ئێمەش ئەگەرێینەوە بۆ ناو وێرانەکانی خۆمان، ئەچینەوە بۆ سەر زەویە لەدەس دراوەکانمان ژیانێکی نوێ دەس پێ ئەکەینو، بەئاسودەیی ئەژین. دوعا بۆ سەرپەرشتو پێشەوای گەورەمان مارشیمون بکەن، کەشەوو رۆژ لەرێگەی بەختیاری ئێمەدا تێئەکۆشێ، بۆ ئەوەی هۆکانی حەوانەوەی دوارۆژی ئێمە دابین بکا، کەرزگارییە لەزوڵمو ستەمی موسڵمانان.

برایان! ئەرکی ئێوەیە کەهاوشانی سەربازانی روس بجەنگن. ئەبێ لەهەمو قۆناغەکانی جەنگدا پێرەوی ئەم بەندانەی ژێرەوە بکەنو بەجێیان بهێنن:

١.خوا بناسە، هەموکاتێ لەبیرت بێو، بزانە هەر ئەو ئەتوانێ دوژمن بشکێنێ.

٢.هەمو سوپاییەك ئەبێ تەندروست، ئازا، بەزات، راستگۆو خاوەن شەرەف بێ.

٣.لەرێی پاراستنی نیشتمانو روسیای پیرۆزا بمرە، ئەگەر مای خۆ ئەوە شەرەفو سەروەری راستەقینەیە، ژیانی خۆت بۆکاری چاکو پیرۆز تەرخان کردووە، شەرەفی یادگاری ناوی باشو شانازیت بەدەس هێناوە.

٤.بۆ رزگارکردنی ژیانی هاورێکانت لەمردن خۆت بەکوشت بدە، بۆ ئەوەی ئەوانیش لەرۆژانی تەنگانەدا تۆ رزگار بکەن.

٥. هەرگیز نەترسی، هەمیشە بترسێنە، بەترسانێ ئەتوانی دوژمن ئازا بکەی، دوژمنایەتی کارێکی ئاسان نیە.

٦.نابێ جەنگ بۆ پاداش بکرێ. بەڵکو ئەبێ لەپێناوی ئازایەتیو جوامێریەو سەربەرزیدا بجەنگی. بەبێ رێگەپێدانی سەروی خۆت نابێ مەیدانی شەڕ بەجێ بهێڵی.

٧.ئازاری کسانی ناسوپایی مەدە، تەقە لەکسانی بێ چەك مەکە، منداڵو ژن مەکوژە.

٨.دیل مەکوژە، بەڵکو بەزیندویەتی بیگەیەنە لای سەروی خۆت بۆئەوەی پاداش وەربگری.

٩.هەمیشە ئاگاداری تفەنگەکەت بە، پاکی رابگرە، چونکە بەچەکی رزیوو ژەنگاوی هیچ ناکرێ.

١٠.بەخۆڕایی فیشەك مەتەقێنە، بۆ تۆ ئەوە نرخێکی زۆری هەیە، لەکاتو رۆژی ناخۆش‌دا بەکەڵکت دێ.

۱۱.هەرکەسێ پێڕەوی ئەمانە نەکا سزا ئەدرێ، قانونی روسی سەختە.

۱۲.ئەم فەرمانانە بەجێ بهێنە، بۆ ئەوەی لەنیشتمانی خۆتا سوك نەبیو گەلەکەشت ریسوا نەکەی.

۱۳.خۆت لەتالآن بپارێزە، چونکە تالآنکەر نە تەنیا لەبەرچاوی تالآنکراو بەلکو لەبەرچاوی هەموخەڵك ریسوایە، تالآنکەران ئەبنە هۆی روخانی هێزی خۆیانو هاورێکانیان، سەرکەوتن لەدەس ئەدەن.

۱٤.لەبیرت نەچێ کاری باش پەسن ئەدرێ، بەڵام کردەوەی خراپی یەك کەس ئەبێتە هۆی بەدناوکردنو پەڵەی شورەیی ئەبەدی میللەتێ. هەرکەس خۆی پێڕەوی ئەم رێوشوێنانە بکاو، ئەبیتە خۆشەویستی گەلەکەی. ئەوەی پێچەوانەی ئەم فەرمانەش رەفتار بکاو، هەرخەریکی کاری خراپ بێ ئەبێ چاوەڕوانی سزای توندی قانون بێ.

جارێکی تریش، ئەی برا خۆشەویستەکانم، من روتان لێ ئەنێم، داواتان لێ ئەکەم" هەمیشە ناوی گەلەکەتان بەرز بکەنەوەو، هەرگیز مل بۆکەساسیو سەرشۆڕی مەدەن.

۱٥.بەرە، بەڵام هیچ کات خۆت نەدەی بەدەس کوردو تورکەوە، چونکە ئەوانە زمانو لوتی دیلەکان ئەبڕن، چاویان دەرئەهێنن، دەستو پێیان ئەشکێنن.

۱٦.ئەبێ فەرمانی فەرماندەکان، بێ چەندوچون، بەوپەڕی شەرەفو شانازییەوە جێبەجێی بکەن.

۱۷.نابێ تفەنگی خۆت بۆکەس دابنێیی، مەگەر بۆ ئەفسەرانی روسو، کەسانی سەروی خۆت.

۱۸.ئەگەر یەکێ لەئێوە، لەخۆیەوە لەناو سەد کەسدا رابکا، ئەوپەڕی سزا ئەدرێو، لەوانەیە ئیعدام بکرێ.

۱۹.بەباشی رێنمونی سەربازانی روس بکەو، لەسەر دوژمن ئاگاداری پێویستیان بدەرێ.[۱۰۹]

لەم وتارەی ئاغا پەترۆس دەرئەکەوێ، سەرکردایەتی ئاسورییەکان تا چ ئەندازەیەك لەژور- هەڵسەنگاندنی هێزەکانی خۆیاندا بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە گرانەی پێیان سپێردراوە بەهەڵەدا چون. هەروەها لەهەڵسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەییو جیهانیو، جۆری ریکخستنی پێوەندیان لەگەڵ گەلانی ناوچەکە.

مارشیمون بەنامەیەك کاربەدەستانی ئێرانی لەپێکهێنانی هێزە چەکدارەکەیان ئاگادارکرد.

ئێرانییەکان، نەوەکو دەوڵەتو نەوەکو خەڵك، کارێکی وەهایان پێ قوبوڵ نەئەکرا. ئەمە ترسی لەناو دانیشتوانی موسڵمانی ئازەربایجاندا، بەکوردو عەجەمەوە، دروست کرد. لای خەڵکی ناوچەکە ئەوانە بەبێگانە پەنادراو ئەژمێردرانو، ترسی ئەوەیان هەبو ناوچەکەیان لێ داگیربکەنو بیانخەنە ژێردەستی خۆیانەوە. حکومەتی ئێرانیش، ئەگەرچی دەسەڵاتی نەبوبەری ئەمکارە بگرێ، بەڵام بەهەرەشەیەکی راستەقینەی دائەنا بۆخۆی.

## ٥/٥ کشانەوەی روس لەئێران

لە٥ کانونی یەکەمی١٩١٧دا، واتە چل رۆژی دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، رژێمی روسیای سۆڤێتی نوێ بەیانێکی بەئیمزای لینین، سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمیسەرانی گەل، بۆگەلانی ئیسلامی رۆژهەڵات بڵاوکردەوە، لەبەیانەکەدا هەڵوەشاندنەوەی هەمو پەیماننامە ئاشکراو نهێنییەکانی سەردەمی قەیسەری سەبارەت بەتورکیاو ئێران راگەیاندو بڵاوی کردەوە کە((ئەستەموڵ هی تورك خۆیەتی)) بەڵێنیشی بەگەلی ئێراندا((هەر بەکۆتایی کارە جەنگییەکان، خاکی وڵاتەکەیان بەجێ بهێڵن))

ئەگەر شۆڕشی شوبات دیسیپلینی جەنگیی ریزەکانی سوپای روسی شێواندبو، ئەوا شۆڕشی ئۆکتۆبەر بەیەکجاری شیرازەی تێکدا. سەربازەکان بێ پرسی فەرمانەکانیان تفەنگو تفاقی جەنگیان بەنرخێکی هەرزان ئەفرۆشتو ئەگەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆیان.[١١٠] لەم هەلەدا کوردەکانی ناوچەکە بەتایبەتی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ کەوتە کڕینی چەکو تفاقی جەنگی،[١١١] هەروەها ئاسوریو عەجەم.

ئەرمەنیو ئاسوری کەچارەنوسی خۆیان بەستبو بەروسیاوە، بەو هیوایەی لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگ ئامانجە نەتەوەییەکانی خۆیان لەپێکهێنانی دەوڵەتی ئەرمەنیو دەوڵەتی ئاسوری لەسەر ئەرزی کوردستان، بەدی بهێنن. لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر توشی مەینەتییەکی نەتەوەیی گەورەبون. روسیای سۆڤێتی ئامادە نەبو بەڵێنەکانی سەردەمی قەیسەر بەجێ بگەیەنێ، بەڵکو لەجەنگ دەرچو. ئەیویست لەگەڵ دراوسێکانی بناغەی دۆستایەتی دابمەزرێنێ. لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی پاش چەند رۆژێ لەسەرکەوتنی شۆڕش ئاگربڕی کردو بەڵێنی کشانەوەی بەئێراندا.

روسیا لەرێککەوتنی((بریست لیتوفسك))دا گفتی کشانەوەی هێزەکانی لەئەرزە داگیرکراوەکانی تورکیاو، هەڵوەشاندنەوەی دەستە چەکدارەکانی ئەرمەنی بەتورکدا.[١١٢] بەوگوێرەیە دەستی لەپشتیوانی گەلی ئەرمەن هەڵگرت. لەئەنجامی کشانەوەشدا لەخاکی ئێران دەستی لەپشتیوانی گەلی ئاسوری هەڵگرت. کۆشکی

ئاواتی نەتەوەیی ئەم دوگەلە بچوکە، کەچارەنوسی خۆیان لەسەر گفتەکانی کاربەدەستانی دەوڵەتێکی زل بیناکردبو، هەرەسی هێنا.

لینین و هاوڕێکانی لەشۆڕشدا سەرکەوتن، بەڵام هێزێکی زۆری روسی لێیان هەڵگەڕایەوە، فەرمانەکانی ئەوانی جێبەجێ نەئەکرد. لەناو ئەوانەدا داوودەزگای سەفارەتی روسی لەئێران و، کاربەدەستانی سەرکردایەتی سوپای لەقافقاز. دەوڵەتانی هاوپەیمانی پێشوی روسیا، ناوچەکانی قافقازیان کردە یەکێ لەمەیدانەکانی دژایەتی و پیلان گێڕان بۆسەر شۆڕشی ئۆکتۆبەر.

### ٦.شەڕی ناوخۆی ئاسوری-عەجەم

#### ١/٦هەڵگیرسانی شەڕ

ئاسوربیەکانی هەکاری، خۆیان نمونەی خەڵکی خێڵەکی دواکەوتو بون. تازە لەکوشتاری بەکۆمەڵ رزگاریان بوبو. جگە لەوەی زۆریان لێ کوژرابو، ماڵ و داراییان بەتاڵان چوبو، ئاواییەکانیان داگیرو وێرانکرابو. لەبەر ئەوە لەوکاتەوە کەهاتبونە ئێران و لەورمێ، خوی، سەلماس و، ئاواییەکانی دەوروبەریدا جێگیر بوبون، پشێویان خستبوە ناوچەکەوە. راوڕوت و تاڵانیان ئەکرد. شەوانە ئەیاندا بەسەر دێهات و ماڵاندا. کاروانیان روت ئەکردەوە. دەستیان لەکوشتنی خەڵك نەئەپاراست. تۆڵەی لێقەومانی خۆیان لەخەڵکی موسوڵمانی ئەوێ کردەوە، بەتایبەتی کەئەیان دی دەسەڵاتدارانی روسی چاوپۆشییان لێ ئەکەن.[١١٣] لەباتی ئەوەی هاودەردی و پەرۆش و سۆزی دانیشتوانی ناوچەکە بەدەس بهێنن، نەیاری و ناحەزی و دوژمنایەتی خەڵکیان پێ براببو. دوایی‌تر ئەوەبو بەهۆیەکی گرنگی شێواندنی خەباتی رەوای ئەم گەلەو، لەدەس دانی دۆستایەتی کوردو ئازەری وەکو گەلی هاوژین و هاوسێ و، لەدەس‌دانی پشتیوانی حکومەتی ئێران وەکودەوڵەتی پەنادەر.

گۆڕانی دەسەڵاتی روسی، گۆڕانی حاکمەکانیشی بەدوا داهات. اعتمادالدولە، چونکە جێگەی بڕوای روس‌بو، لەسەردەمی ئەواندا حاکمی ورمێ‌بو. پاش ئاڵوگۆڕەکانی روسیا، ئەویش لێخراو لەتەورێز درایە دادگا. لەجێگەی ئەو کابرایەکی‌تر بەناوی معزالدولە دانرابو. لەو هەلومەرجە شێواوەدا، کەهەم سەربازانی روسی بۆ ئەوەی پێویستییەکانی گەرانەوەی خۆیان دابین بکەن، کەوتبونە شت فرۆشتن و شت سەندن بەزۆر لەخەڵك و، بازاڕی ورمێیان تاڵان‌کرد. هەم دەستە چەکدارەکانی ئاسوری و ئەرمەنی ئاسایشی سەروسامانی خەڵکی ناوچەکەیان نەهێشتبو. معزالدولە کارێکی بۆچاکردنی دۆخی شێواوی ناوچەکە لەدەس نەهات. ئەویش‌لابرا. اجلال الملك بو بەحاکمی ورمێ. ئەم‌کابرایە شارەزای

کاروباری ورمێبو چونکە پێشتریش چەند جارێ کرابوە حاکمی ئەوێ. هێزەکانی ئێران لەچاو مەسیحییەکاندا کەم بون. لەبەر ئەوە لەسەرەتای هاتنیەوە ویستی بەخۆشیو گفتوگۆ لەگەڵ مەزنەکانی دینو نەتەوە جیاوازەکان ئاسایش بگێڕێتەوە بۆ ناوچەکە.

یەکێ لەکارەکانی اجلال الملك بۆ گێڕانەوەی ئاسایش پێکهێنانی((کۆمیسیۆنی تحبیب بین المللی))بو، کەئەبو پێك بێ لەعەجەمو کوردو ئاسوریو ئەرمەنیو جولەکە. لەرۆژی ٢٢ی ئازەری ١٢٩٦دا کۆبونەوەیەکی گەورەیان لەمزگەوتی ئادینە سازکرد. اجلال الملك خۆیو، هەندێ لەمەزنەکانی ئەو گەلانە لەم کۆبونەوەیەدا دەربارەی دۆستیو ئاشتی وتاریاندا.[١١٤] بەڵام برینەکان لەوە قوڵتر بون بەکۆبونەوەیەکی وەها سارێژ ببێ، پشێوی هەرما.

لەم ماوەیەدا تیپە چەکدارەکانی ئاسوری بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی لەکشانەوەی روس دروست ببو بەیارمەتی فەرەنسەو بەریتانیا دامەزرا. حکومەتی ئێران ئەو هەنگاوەی پێ خۆش نەبو، بەڵام ئەوەندە هێزیشنەبو رێگەی دروستبونی بگرێ. هێزی ئێرانیەکان لەورمێ بریتیبو لەهەزار قەزاق لەژێر فەرمانی ئەفسەرانی روسیدا لەدەرەوەی شار بونو ئەمانە گوێیان نەئەدایە فەرمانی حاکمی ورمێ. حاکمی ورمێ بۆ چەسپاندنی ئاسایش داوای لەوالی تەورێزکردبو کەهێزێکی بۆ بنێرێ، ئەویش٢٠٠ سواری قەرەداغی بۆ نارد لەناو شارا جێگیر ببون.[١١٥]

هێزی ئاسورییەکان زۆر زیاتربون لەهی عەجەمو هەمو رۆژ ترسی خەڵك لە هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ زۆرتربو.

گێڕانەوەی روداوەکان وەکو یەك نین. نوسەرانی ئێرانی بەجۆرێکی ئەگێڕنەوە، ئۆباڵی شەڕ ئەخەنە ئەستۆی ئاسورییەکان. کاربەدەستانی تەورێز بەپیلانی دائەنێن کەمەسیحییەکانو کاربەدەستانی بێگانە لەورمێ بۆ چاو ترساندنی موسوڵمانەکان رێکیان خستوە. راپۆرتی سوپاییو دیپلۆماتەکانیش، بەتایبەتی کاربەدەستانی فەرەنسی، بەزۆری پێ لەسەر ئەوە دائەگرن، کەئەوە پیلانێك بوە موسوڵمانەکان سازیان کردوە، بۆ ئەوەی بیکەن بەبیانوی کوشتنی بەکۆمەڵی مەسیحییەکانو بێگانەکانی ورمێ.[١١٦]

١٥ی شوباتی١٩١٨ نزیکەی هەزار شەڕکەری جیلو، لەسەر داوای کاپتەن گاسفیلد هاتبونە ناو شارەوە.[١١٧] ئەمانە لەناو بازاڕدا ئێخەیان بەخەڵك ئەگرت، داوای چەکیان لێ ئەکردن، روتیان ئەکردنەوە. هەر لەو رۆژانەدا دو موسوڵمانو جولەکەیەکیان کوشت.[١١٨]

١٩ی شوبات، روداوێك قەوما، بو بەسەرەتای دەست پێ کردنی شەڕی دینیی خوێناوی. پۆلیسی ئێرانی ئەیانەوێ چەکدارێکی جیلو چەك بکەن، ئەویش خۆی بەدەستەوەنادا. ئەبێ بەپێکادان. کابرای جیلو ئەکوژرێ، بەلاّم هاوڕێکانی لەکاتی هەلاّتن‌دا ٤کەس ئەکوژن. شەڕ ئەتەنێتەوە.[١١٩]

٢٠ ی شوبات، حاکمی ورمێ اجلال الملك، سەرانی مەسیحییەکان‌و، میسوکوژل سەرۆکی نەخۆشخانەی فەرەنسی، سونتاك نوێنەری پاپای، بۆ بارەگای حکومەت بانگ‌کرد. لەسەر روداوەکان ئەدوان. لەوکاتەدا چەن گوندییەك رژانە ناو بارەگاوە، گازاندەیان بو لەوەی تاقمی جیلو لەدەرەوەی شار، رێ بەگوندییەکان ئەگرن، هەرکەسێ ئەبینن، ئەیکوژن. بەشدارانی کۆبونەوەکە بڕیاریان‌دا، دەستەیەك سواری قەرەداخی لەگەلّ دەستەیەك سواری ئاسوری بنێرنە دەرەوەی ورمێ بۆ جێگیرکردنی ئاسایش. ئەو رۆژە ئاسورییەکان نزیکەی ١٠٠ موسولّمانیان کوشتبو.[١٢٠]

٢١ی شوبات لەدەرەوەی ورمێ تاقمی جیلوو دەستەیەك‌قازاقی ئێرانی بو بەشەڕیان.

٢٢ی شوبات لەکاتێکا حاکمی شار لەگەلّ کونسولّی روسی‌و، کونسولّی ئەمریکی‌و، سەر پزیشکی فەرەنسی خەریکی گفتوگۆبو بۆ چەسپاندنی هێمنی، شەڕ بەگەرمی هەلگیرسا راپۆرتی کونسولّی فەرەنسی هۆی هەلگیرسانەوەی شەڕ ئەگێڕێتەوە بۆ ئەو هێرشەی قازاقەکانی ئێران بەسەرکردایەتی رەزاخان کردویانەتە سەر بارەگای فەرماندەیی ئاغا بطرس.[١٢١] کۆچی دهقان، نوسەرێکی ئێرانی ئەلّێ: ((دوکەس لەخەلکی ئازای ورمێ بەناوی قارداش‌و داداش بڕیاریان‌دا خۆیان بڕۆن لاشەی مردوەکان بهێنەوە بۆ شار. دەمەوئێوارێ، لەکاتێکا ئەیان ویست لەشار دەربچن، لەنزیکی دەروازەی هەزاران توشی تاقمی جیلو بون. لەبەینی ئەوانەدا بو بەشەڕ. هەر بەبیستنێ دەسڕێژی تفەنگ، مەسیحییەکانی ناوشار لەهەرکوێیەك بون کردیان بەتەقە. دەرکەوت کەپێشتر رێك کەوتبون بەدەس پێ‌کردنی تەقە، جەنگ دەس پێ بکەن.))[١٢٢]

٢٣ی شوبات، واتە رۆژی دوایی‌تر شەڕگەرمتر بو. ئاسوری گەرەکی عەجەمەکانیان دایە بەرتۆپ، سوارەکانی قەرەداخی کە بۆ پاراستنی شار هاتبون، ئەگەرچی لەرۆژی یەکەمی شەڕدا بەشداربون، بەلاّم رۆژی دوەم کەتۆپ باران دەستی پێ کرد بەکۆمەلّ لەشار هەلاّتن بەرەو سەلماس، لەوێوە گەڕانەوە بۆ تەورێزو قەرەداخ. قازاقەکان بنکەکەیان لەدەرەوەی شاربو، لەژێر فەرمانی ئەفسەرانی روسی‌دا بون، بەلاّم رۆژی یەکەمی شەڕ هاوکاری موسولّمانەکانیان

کردبـو. ئاسـوریەکان هـەڵیان کوتایـە سـەربارەگای قازاقـەکان، هەنـدێکیان لـێ کوشـتنو ئـەوانی تریشـیان رایـان کـرد، چەکو کەلوپەلـەکانیان کەوتـە دەسـت ئاسورییەکان.[123]

پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ تاقمێ لەئاخوندو مەزنەکانی شار بۆ ڕاگرتنـی شەڕو پێکهێنـانی ئاشـتی خۆیـان هاوێشـتە مـاڵی مارشـیمونی پێشـەوای دینیـی ئاسورییەوە. مارشیمون گفتی راگرتنی شەڕی پێدان ئەوانیش بەخـەڵکی ورمێیـان گوت، شەڕ رابگرنو خۆیان بەدەستەوە بدەن.

٢٤ی شـوبات، ئەگەرچـی مارشـیمون ڕۆژی پێشـو، گفتـی راگرتنـی شـەڕی بەخەڵکی ورمێدابو، بـەڵام شـەڕ هـەر رانەوەسـتا چونکە سـەرکردایەتی هێزەکـان بەکردەوە لەدەس ئاغا پەترۆسدابو، نێوانی ئەو دوانەش خۆش نـەبو. ئاسـورییەکان بەردەوام بون لەسەرکوشتنو تاڵانو سوتاندن. بەیانی ئەو ڕۆژە تاقمـێ لەگـەورەکانی ورمێ بەسەرۆکایەتی عظيم السـلطنه سـەردار خۆیـان هاوێشـتە نـاو کونسـولگەی ئەمریکییەوە، بۆ ئەوەی داوا لەمیستەر شید بکـەن، هـەوڵی راگرتنـی شـەڕبدا.[124] بەقسـەی نوسـەرەکانی ئـەو سـەردەمە ئـەڵێن هـەر لـەو ڕۆژەدا ١٠ هـەزار کـەسێتر کوژراون.[125]

لەمشەڕە خوێناوییانەی نێوان مەسیحیو عەجەمدا، کورد بەتایبەتی ئیسـماعیل ئاغـای سمکـۆ هـیچ دەسـتێکیان نـەبو، بـەڵکو لەگەرمـەی تێکهەڵچـوندا ئـەڵێن سمکۆبە٦٠٠ سواری جەنگییەوە بۆ یارمەتیدانی خەڵکی ورمێ کەوتۆتە رێ، بەڵام لەگوندی کەریم ئاباد ئەبیستێ عەجەم خۆیان بەدەستەداوە، لەوێوە ئەگەڕێتەوە.[126]

ئەگەرچی عـەجەم وازیان لەبەرەنگاری هێنـابو، بـەڵام مەسـیحییەکان دەسـتیان لەشەڕوکوشتنو تـاڵان هەڵنـەگرتبـو. مەرجـەکانی خۆیـان بـۆراگرتنی ئـەم شـەڕە، بەهۆی کونسوڵی ئەمەریکیەوە لەورمێکە بوبـو بەپـەناگای مەزنـەکانی شـار، بـەم جۆرە دابو بەموسوڵمانەکان:

(١) ئەنجومەنێکی تێکەڵاو لەمەسیحیو موسوڵمان بۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری شار پێك بێ.

٢.شـار لـەژێر حکومـەتی عەسـکەریدا بـێ، ئەنجومەنـە تێکەڵاوەکـە سـەرۆکی پۆلیس دابنێ.

٣.هەمو ئەو چەکانەی لای موسوڵمانەکانە لەماوەی ٤٨ سـەعاتدا بەدەسـتەوە بدرێ.

٤. ٤ کەسکە لەپیاوە ناسراوەکانی ورمێ بون بەدەستەوە بدرێن: حاجی صـمد، ارشد ملك، ارشد همایۆن، حاجی موید تجار.

٥.ئەگەر کاربەدەستێکی روسی یا فەرەنسی یا سەربازێکی روسی پەلاماری بدرێو بکوژرێ، ئەبێ خەڵکی ورمێ خوێن باییەکەیان بدەن.
٦.قازاقە ئێرانیەکان ئەبێ بچنەوە ژێر فەرمانی ئەفسەرانی روسییەوە))[١٢٧]
خواستەکانی مەسیحیەکان ئەگەرچی قورسو زاڵمانە بون، بەڵام دەری ئەخەن کە لەو روداوانەدا دەستی کوردی تێدا نەبوە، بەڵکو پاکۆکی ئەوان لەگەڵ عەجەم بوە.
مەسیحیەکان دەستیان بەسەر ورمێدا گرت. هەلومەرجی ناوچەکە بەپشێوێو ئاڵۆزاوی مایەوە. گوندەکانی دەوری ورمێ توشی کوشتنو تالان بون. ئاواییە موسوڵمان نشینەکان بەزۆری چۆڵو وێران بوبون.[١٢٨]
کۆمیسیۆنی ١٦ کەسی تێکەڵاو پێك هات. عەزیم ئەلسەڵتەنە سەردار بو بەحاکمی ورمێو، ئاغا بطرس بەرپرسی ئاسایشی لادێکانو، ئیبراهیم خانی ئەرمەنی بوە بەرپرسی ئاسایشی شار.[١٢٩]
بەهۆی تێکچونی ئاسایشی ناوچەکەوە گرانیو قاتوقڕی بەجۆرێ داکەوتبو، کەهەندێ لەبرسییەکان نانیان بەدەس هەرکەسێکەوە بدیایە پەلاماریان ئەداو بەزۆر لێیان ئەسەند. دهقان ئەڵێ:[١٣٠]
((لەوکاتەوە کەحکومەتی شار کەوتە دەست مەسیحیەکان(٥ی ئەسفەند) تا دوایی ئەو مانگە، کەروداوی ناخۆشتر قەوما، دۆخی ورمێ بەجۆرە بو:
دێهاتی موسوڵمان نشین تالانو چۆڵبو، نیشانەی ژیانو ئاوەدانییان تێدا نەئەبینرا، کۆڵانو مزگەوتەکانی شار پڕبون لەهەڵاتوانی گوندەکان.
جیلو رۆژ بەبیانوی گەڕان بەدوای چەکدا، هەر کەلوپەلێکیان بەدڵ بوایە ئەیان برد، ماڵخوێ ئەگەر بەرهەڵستی بکردایە ئەیان کوشت، قاتوقڕیو برسێتی بێ وێنەش لەلایەکیترەوە خەڵکی بۆ مردن ئەنارد.
لەم بیستو چەند رۆژەدا شەوان بەڕاستی کاتی مەحشەرو قیامەتبو، یەك دو سەعات کە لەشەو رائەبورد لەچەند لای شارەوە دەنگی واوەیلا بەرز ئەبوەوە، دانیشتوانی ئەو ماڵانەی کەجیلو هێرشیان کردبوە سەر، رایان ئەکردە سەربانو لەوێوە بەدەنگی بەرز هاواریان ئەکرد، داوای یارمەتیان لەخەڵك ئەکرد، بەڵام کێ ئەیوێرا لەماڵ دەربچێ، مەئمورەکانی شارەبانیو ئەمنیەتی شاریش کەگوێیان بەم ناڵەو هاوارانە راهاتبو، هیچ گوێیەکیان نەئەدایە ئەم هەمو گریانو زاریو ناڵەو هاوارەی خەڵك. جیلو پەلاماردەرەکان بەخەیاڵی ئاسودەوە هەر کەسێکیان بویستایە ئەیان کوشت، هەرچییەکیان بویستایە ئەیان برد، هەندێ جار ماڵەکانیشیان ئەسوتان.

بازاڕ که دوجار لەلایەن روسەکانەوە تالاَنکرابو، ئاگری تێ بەردرابو، هێشتا بەتەواوی ئاوا نەبو بوەوە، سەرلەنوێ تالاَن کرایەوە))[131]

تەقینەوەی ناکۆکی لەنێوان مەسیحیو عەجەمداو، گۆڕانی بەشەڕی خوێناوی، مەسیحییەکانی ناچار ئەکرد کەهەوڵ بدەن بۆ راستکردنەوەی هاوسەنگی هێزەکانی خۆیانو عەجەم، هێزی کورد بەلای خۆیاندا رابکێشن، بەتایبەتی چونکە ژمارەی مەسیحی لەچاو ژمارەی عەجەمدا ئەوەندەکەمبو، لەبەراوردکردن نەئەهات.

کورد، لەسەرەتای دەسپێکردنی جەنگی جیهانیەوە، بەهۆی بانگەوازی سوڵتانەوە بۆ بەشداربون لەغەزای کافران، جیهاد لەپێناوی دینیی ئیسلامدا، لەمزۆر شوێن هاوکاری ئۆردوی عوسمانیان کردبو، بەرەنگاری هێزی روسیو بەریتانی بوبون. هێشتا پڕوپاگەندەی دینی عوسمانی لەبیری کورد نەڕەوی بوەوە. لەهەلومەرجێکی وەهادا کورد کەخۆی بەموسوڵمانێکی خاوەن باوەڕو دڵسۆز دائەنێ، چەند ناکۆك بێ لەگەڵ عەجەم، لەناکۆکی ئاسوری- عەجەمدا، کەرەنگی دینیی بەخۆیەوە گرتبو، ئەبو پشتی عەجەم بگرێ کەبرای دینییبو لەدژی مەسیحیو لەسەر ئەو بکاتەوە.

## ٢/٦کوژرانی مارشیمون

مارشیمون پەیوەندی لەگەڵ ئیسماعیل ئاغاکرد بۆ ئەوەی پێکەوە گفتوگۆ بکەن. سمکۆ ئەوسا یەکێبو لەکوردە هەرە ناسراوە دەسەلاَتدارە بەهێزەکانی ناوچەکە. بارەگاکەی لەگوندی چەهریق حکومەتێکی بچوكبو. لەگەڵ مارشیمون رێك کەوتن لەسەلماس(بەچەند ناوی تریشەوە ناو ئەبرێ" کۆنە شار، شاهپور، دیلمان) یەکتری ببینن. ئەم ژوانە بۆ بەکوشتارگای مارشیمونو دەستو پێوەندەکانی.

کسروی، کوژرانی مارشیمون بەم شێوەیە ئەگێڕێتەوە:

((وەکو وتمان مارشیمون لەبیری هەڵخەڵەتاندنی سمکۆدابو، پەیامی بۆ نارد لەجێیەك پێکەوە دابنیشنو گفتوگۆ بکەن. وا دانرا ئێوارەی رۆژی شەممە ٢٥ ئەسفەند(٣جەمادی الثانی) هەردو بچنە کۆنە شار لەوێ لەخانویەکدا پێکەوە دابنیشن.

کەئەو رۆژە گەیشت مارشیمون بەشکۆو ئارایشەوە کەوتە رێ. خۆی لەگالیسەکەدا دانیشتو ١٤٠ سوارەی هەڵبژاردەی ئاسوری بەرەختو هەوساری لەیەکچوەوە پاشو پێشیان لێگرتبو.کەگەیشتنە کۆ نەشار، مارشیمون دابەزیو چوە ناو خانوەکە سوارەکانیش دابەزینو هەریەکەیان جڵەوی ئەسپەکەی خۆی

گرتبو بەراوەستاوی. لەو لاشەوە سمکۆ لەگەڵ چەند کەسێ لەسوارە هەڵبژاردەکانی هات بەڵام رایسپاردبو کەدەستەیەکیش لەدوای ئەوەوە بێن.

دوبەدو کەدانیشتن مارشیمون کەوتە قسە، ئێمە هەمو قسەکانی ئەو نازانین. ئەوەی لەزمانی خودی سمکۆ دەرچوە ئەوەیە کەمارشیمون بەوی گوتوە: ((ئەم سەر زەمینەی کەئێستە ناوی کوردستانە نیشتمانی ئێمەمانانبو بەڵام جیاوازی لەدیندا ئێمەی لەیەکترکردو بەم حاڵەی گەیاندین ئەبێ ئیتر ببینە هاودەستی یەکترو خۆمان ئەم سەر زەمینە بگرینە دەستو پێکەوە بژین))، وتویەتی: ((ئێمە سوپامان سازداوە بەڵام سوارەمان نیە ئەگەر ئێوەش لەگەڵ ئێمەبن لەبەرئەوەی سوارەی زۆرتان هەیە ئەچینە سەر تەورێزو ئەویش ئەگرین!))

لەمکاتەدا سوارەکانی شوکاك گەیشتبونو پشتی بانەکانیان گرتبو. مارشیمون کەقسەکانی خۆی تەواو ئەکاو سمکۆ مژدەی هاودەستی ئەداتێ، هەڵئەستێ بڕوا، سمکۆ بەڕوی پێکەنیناویەوە بەڕێی ئەکات. ئەو ژورەی لێی دانیشتبون، پەنجەرەکەی روبەڕوی دەرگای حەوشە ئەبێو گالیسکەکەی مارشیمون کە لەبەر دەرگاکەدا راگیرابو لەژورەکەوە ئەبینرا. مارشیمون کە لەدەرگا دەرئەچێو ئەگاتە بەردەمی گالیسکەکەی ئەیەوێ پێ بخاتە ناوی، لەناکاو تەقەی تفەنگی سمکۆ دێو گوللە لەپشتی مارشیمون ئەداو ئەکەوێ، هەر لەو کاتەدا شوکاکەکان لەپشتی بانەکانەوە بەیەکجار دەسڕێژ ئەکەنو ئاسورییەکان کەهەریەکەیان لەپاڵ ئەسپی خۆیدا راوەستابو ئەکەون. وەکوئەڵێن لەیەکدوکەس زیاتر کەسیان لێ دەرنەچوە. مارشیمون کە بەگوللەی سمکۆ کەوتبو هێشتا گیانی تێدامابو عەلی ئاغای برای سمکۆ گوللەیەکیتری پێوە ئەنێو، بێگیانیئەکا.[١٣٢]

محەمەد تەدن، نوسەرێکی تری عەجەم کەهاوزەمانی سمکۆبوە بەجۆرەی ئەگێڕێتەوە:

((لەڕۆژی ٢٨ی جەمادی الاولی١٣٣٦ی کۆچی (٢٥ی ئەسفەندی١٢٩٦ش: ١٩١٨) مارشیمون پێشەوای گەورەی جیلوکان(نەستوری: نەسرانی) بۆ دروست کردنی پێوەندی باش ویەکگرتو لەگەڵ کورد، ئەچێ بۆ لای ئیسماعیل ئاغای سمکۆ(سەر دەستەی ژمارەیەکی زۆر کوردی چەکدار)بۆ سەلماس(کۆ نەشار: شاپوری ئێستا)، بەنامەیەك ئیسماعیل ئاغا کە لەچەهریق دائەنیشت، بۆ سەلماس بانگ ئەکا.

ئیسماعیل ئاغا بانگهێشتنەکەی مارشیمون قوبوڵ ئەکا. ئەچێ بۆ دیتنی مارشیمون. لەنێوان مارشیمونو ئیسماعیل ئاغادا، دەربارەی بەرنامەی دروست کردنی پەیوەندی هاوکاری دۆستانەو هاوبەش لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی

مەسیحییەکانو، زنجیرەیەك گفتوگۆ سەبارەت بەپاشەڕۆژی کۆمەلآیەتیو سیاسیو ئابوری ئازربایجانی غەربی باس ئەکەن.

پاش تەواوبون گفتوگۆ، مارشیمون بەنیازیگەڕانەوە دێتە دەرێ ئەیەوێ سواری دروشکە ببێ، بەلآم ئیسماعیل ئاغا کەپێشتر نیشانەی ئەو خانوەی مارشیمونی لێ دانیشت بو ئەزانیو کون وکەلەبەری شارەزا بو، فەرمانو ئامۆژگاری پێویستی دابو بەسوارەکانی خۆی لەبابەت کوشتنی مارشیمونەوە، ١٠٠کەسی لەچاکترین نیشانچییەکانی لەگەلٚ خۆی بۆ سەلماس هێنا بوو، ئەوانە لەسەر ڕێی دروشکەی مارشیمونو دەوروپشتی خانوەکەی(جێگەی گفتوگۆ) بەپێی تەگبیری پێشەکی وەها دائەمەزرێن، کەمارشیمون لە هەمو لایەکەوە ئابلۆقە بدرێ، ئەوەبو لەکاتێکا مارشیمون ئەیەوێ سواری دروشکەکەی ببێ دەنگی دەمانچەی ئیسماعیل ئاغا بەرز ئەبێتەوە، مارشیمون ئەکەوێو لەماوەیەکی کورت دا دەنگی تفەنگی پاسەوانەکانی سمکۆ بەرز ئەبێتەوەو هەمو ئەوانەی کەلەگەلٚ مارشیمون بون ئەکوژرێن، تەنیا یەکێ یان دوکەس لەهاوڕێکانی مارشیمون ڕزگار ئەبنو هەوالٚی تیرۆری مارشیمون بەهێزە چەکدارەکانی مەسیحییەکان ئەگەیەنن))[١٣٣]

کوشتنی بەم جۆرە پێچەوانەی ڕەوشتی جوامێرانەی کوردو، پەیمان شکێنی کە لەناو کوردا بەڕیسواییەکی گەورە دائەنرێ لەنەریتی کوردەواری دا نەبوە، یا ئەگەر بوبێ دەگمەنو ناپەسەندو دزێوبوە. ئەم کارەی سمکۆ لەمێژوی کوردا نمونەی تری نیە، کەچی لەمێژوی عەجەم دا نمونەی زۆرە، بگرە هەر لەناو بنەمالٚەی سمکۆدا چەند جارێ دوبارە بۆتەوە" ئیسماعیل ئاغای باپیرە گەورەیو، علی ئاغای باپیرەیو جەعفەر ئاغای برایو، محەمەد ئاغای برایو باوکی محەمەد ئاغای، بەو جۆرە بە ناجوامێری لەناو برا بون، سمکۆش لەمەدا لاسایی ئەوانی کردۆتەوە.

لەکاتێکا نوسەرانی عەجەم کوژرانی ناجوامێرانەی گەورەکانی کورد لەمێژوی خۆیان دا بەئازایەتیو زیرەکیو لێوەشاوەیی کاربەدەستەکانی خۆیان دا ئەنێن، ئەم کارەی سمکۆ بە((بەتەواوی بێ ئەقلآنەو ناجوامێرانەو بێ لێکۆلٚینەوە))[١٣٤] دائەنێنو یەکێکیتر ئەلٚێ :((سمکۆ بەبێ گومان لەو کاتەدا لەبیری کارە ڕەشەکانی ئاسورییەکانی ناوچەی ورمێدا نەبوە، تا لەکارەکانی ئەوان دلٚتەنگ بوبێو لە تۆلٚەی ئەوان دا ئەم کارەی کردبێ... ))[١٣٥]

ئەی کەواتە سمکۆ بۆچی مارشیمونیکوشت؟

وەلآمی ئەم پرسیارە هێشتا کەس بەتەواوی نەی داوەتەوە.

رازی یەکتر بینینی سمکۆ- مارشیمونو، گفتوگۆی دو قۆڵیانو، هۆی ئەم پیلانەی سمکۆ، چۆتە ژێرگڵ. چونکە هەروەکو مارشیمون بەو جۆرە کوژرا، سمکۆ خۆیشی بەپیلانێکی وەکو ئەوەی خۆی گێڕای، پاش چەند ساڵێ کوژرایەوە.

بیروڕای نوسەرانی کورد لەهەڵسەنگاندنی ئەم کارەی سمکۆدا جیاوازە.

هەندێ نوسەری کورد، هۆی کوشتنی مارشیمون ئەگێڕنەوە بۆ ناکۆکی نەتەوەیی ئاسوری لەگەڵ کورد، گوایە ئاسورییەکان چاویان بڕیبوە ئەوەی لەسەر ئەرزی کورد دەوڵەتی ئاسوری دروست بکەن، بەکوشتنی پێشەواکەیان ئەم پیلانەش پەکی خرا.[136]

هەندێکیتر ئەڵێن، سمکۆ بەهاندانی ئینگلیز بەرامبەر بەپارە ئەم کارەیکردوە، مەبەستی ئینگلیز لەوەش ئەوەبوە رێگە بۆ سەرکردایەتی ئاغا بطرس تەخت بێ.[137] ئارشیفی ئەو سەردەمەی بەریتانیا ئێستە بەئازادی لەبەردەستی هەمو لێکۆڵەرەوەیەك دایە، بەڵام هێشتا هیچ بەلگەیەکی لەم بابەتەی تێدا نەدۆزراوەتەوە، ئەم قسەیە بسەلمێنێ.

هەندێکیتر ئەڵێن، سمکۆ ئەمەی لەسەر خواستی والی ئازەربایجان کردوە بۆ شکاندنی چاوی ئاسورییەکان، لەتۆڵەی کوشتاری خەڵکی ورمێدا.[138] چونکە هاوزەمان لەگەڵ ئەم کارەی سمکۆدا، والی ئازەربایجان هەزار کەسی ناردبو بۆ مینای شەرەفخانە لەسەر دەریاچەی ورمێ بۆ ئەوەی ئەوانیش لەو قۆڵەوە پەلامار بدەن. سمکۆ خۆی لەوگفتوگۆیەدا کە لەگەڵ مستەفا پاشای یامولکیدا کردویەتی، دان بەمەدا ئەنێ، لەوەلامی پرسیارێکیدا ئەڵێ:

((پرسیار: هۆی تێکچونو شەڕکردنت لەگەڵ ئاسورییەکاندا چیبو، تکایە پێم بڵێ، مارشەمعون، کەئاشتی ویستو دۆستی کوردبو، لەبەرچی کوژرا؟

((وەلام: بێگومان ئاگاداری ئەوەی کەتورکو روس لەجەنگی جیهانیدا چیان بەکورد کرد! حەزدەکەم هۆی کوشتنی مارشەمعونت بۆ رون بکەمەوە" لەو هەرایەی لەباکوری کوردستاندا لەنێوان تورکو ئەرمەنیدا رویدا، ئاسورییەکان چونە پاڵ ئەرمەنییەکانو یارمەتییان دان، دوای شۆڕشی روسیا، روسەکان هێزەکانیان لەسابلاغو ورمێ کێشایەوەو ژمارەیەکی زۆر چەکو جبەخانە، تۆپو رەشاشو تفەنگیان بەجێ هێشتو هەموی بۆ ئاسورییەکان مایەوە. چەند ئەفسەرێکی روسو ئاسورییەکان و هەندێ کاربەدەستانی ئەوروپایی، دەیانزانی ئێران بەهۆی لاوازیو کزیی دەسەڵاتو کەم دەرامەتییەوە ناتوانێت داکۆکی لەخۆی بکات، بۆیە ئاسورییە چەکدارەکان ویستیان ئەم دەرفەتە لەکیس نەدەنو ئازەربایجان کەناوچەیەکی گرنگی نێوانی ئەرمەنو تورکو فارسە-بگرن... دوای

ئەوەی ئاسورییەکان بەسەر فارسەکاندا سەرکەوتنو بانگەوازی سەربەخۆییاندا، هاتنە لامو داوای هاریکارییان لێ کردم، بۆ ئەوەی پێکەوە بچینە ناو ئێرانەوە، منیش بەڵێنی یارمەتیم دانێ... بەڵام ئێرانیەکان بەوەیان زانی، کەئاسورییەکان داوای یارمەتییان لەمن کردوە... نوێنەرێکی ئێران هاتو داوای لێ کردم، کەپشتی ئاسورییەکان نەگرمو بەرامبەر بەمە بەڵێنی پاداشتو چاکە دانەوەیان دامێ. لەبەر ئەوەش دەمزانی ئاسورییەکان نیازیان وایە باکوری کوردستان بخەنە ژێرر کێفی خۆیانەوەو داگیری بکەن، بۆیە مارشەمعونم کوشت. ئێرانیەکانیش لەبەڵێنی خۆیان پاشگەزبونەوە. بۆیە منیش پەلامارم دانو ورمێم گرتو کاربەدەستانی خۆمم لێ دامەزراند.[١٣٩]

### ٣/٦ لەتۆڵەی خوێنی مارشیموندا

هەرچۆنێ بێ ئەم کارەی سمکۆ ئەنجامی خراپی لێ وەشایەوە" لەلایەکەوە ورمێ خۆی بوبو بەمەڵبەندی شەڕێکی دینیی لەبەینی ئاسوریو مەسیحیو عەجەمی موسوڵماندا، کوژرانی مارشیمون کوردیشی تێکەڵاوی شەڕەکە کردو شەڕەکەی لەجاران گەرم ترکرد، لەلایەکی ترەوە ئەمکارە ئاسورییەکانی لەجاران زیاتر وروژانو، کەوتنە شەڕو خوێنرێژی. تۆڵەی کوشتنی مارشیمونیان لەخەڵکی ورمێ کردەوە.

ڕۆژی شەممە ١٧ی مارتی ١٩١٨ مارشیمون کوژرا،

ڕۆژی دوشەممە ١٩ی مارت، ئەم هەواڵە گەیشتە ورمێ، ئاسورییەکان دەستە دەستە ڕژانە ناو شارەوە،

ڕۆژی سێشەممە ٢٠ی مارت، کوشتارییان دەست پێ کردەوە،

ڕۆژی چوارشەممە ٢١ی مارت، گەیشتە پۆپەی تورەبونو خوێنرێژی.

تمدن ئەڵێ:

((... لەبەیانی زوەوە، هێزە چەکدارەکان بەکۆڵانو گەڕەکەکاندا بڵاوبونەوە، لەپڕخۆیان کرد بەماڵی عالمو سەیدو پیاوە ناسراوەکانی شاردا، کەوتنە کوشتنی بەکۆمەڵی خۆیانو خێزانەکانیانو، تالانی کەلوپەلی ناوماڵەکانیان. لەو ڕۆژەدا ژمارەیەکی زۆر لەعالمەکانو مەلاو سەیدەکان... کوژران. لەم ڕوداوەدا زیاتر لە ١٠ هەزار موسوڵمان بەجۆرێکی ناخۆش بەدەستی مەسیحییان کوژرانو شەهیدبون.

جیلوکان لەپاش کوشتنی عولەماو سادات بەربونە تاقمەکانی تری خەڵك، هەرکەسێکیان لەهەژارو دەوڵەمەن، بچوکو گەورە، ژنو پیاو، لەکۆڵانو بازاڕدا بینی دایانە بەرگوللە.

لەم رۆژە ترسناکەدا خەڵکێکی زۆرخویان لەناو چاڵو کارێزو تەنوری ماڵانو پەناو پەسیردا شاردەوە، لەکاتی پەلاماری چەکدارانی جیلودا بۆ سەر ماڵەکان، بەو جۆرە گیانی خۆیان پاراست.

هەر لەو رۆژەدا هەمو کوردەکان(کەپێشتر هێزە چەکدارەکانی مەسیحیەکان چەکداریان کردبون) چەك کرانو کوژران.

لەگوندەکانو دەوری شار، لەهەر جێیەك موسوڵمانێ یا کوردێکیان بدیایە، بێ سڵەمینەوە ئەیان کوشت.

بەم رەفتارە دڕندانەیە، بەڕادەیەك خەڵکیان شڵەژانو ترساند، موسوڵمانەکان لەهەر تاقمێبون، لەماڵەکانی خۆیاندا لەژێراب و بیردا خۆیان شاردەوە. ماوەی۳ رۆژ هیچ کەس زاتی نەئەکرد لەماڵ دەربچێ، کۆڵانەکان چۆڵو گەڕەکەکان لەخامۆشیەکی کوشندەدا بون، شار شێوەی گۆڕستانێکی چۆڵکراوی بەخۆیەوە گرتبو))[١٤٠]

نوسەرەکانی ورمێ ژمارەی کوژراوەکانی ئەو رۆژە خوێناویانە بە١٠ تا١٥ هەزار کەس ئەخەملێنن[١٤١] ئەم ژمارەیە ئەگەر زیادیشی پێوەنرابێ، ئەندازەی رقو تورەبونو، جۆری تۆڵەسەندنی خێڵەکی ئێلەکانی ئاسوری دەرئەخەن.

چەندین هەزارکەس لەخەڵکی ورمێ بۆ پاراستنی گیانی خۆیان پەنایان بردبوە بەر ماڵی میستەر شید، کونسولگەی ئەمریکی، نەخۆشخانەی ئەمریکی، بارەگای میسیونی فەرەنسی.[١٤٢] لەژێرگوشاری کونسولی ئەمریکیدا، ئاغا بطرس فەرمانی بەئاسورییەکاندا کەئیتر دەس لەکوشتنو ترساندن هەڵبگرن.[١٤٣]

نیوەڕۆی۲۲ی مارت فەرمانداری ورمێ، عظیم السلطنه سەردار، جاڕیدا کەئیتر ئاسایش جێگیربوە، هەر مەسیحیەك بچێتە سەر ماڵی کەسێ ئەبێ بگیرێو بدرێتە دەس حکومەت.[١٤٤]

سەرکردایەتی تیپە چەکدارەکانی ئاسوری پلانی پەلاماردانی بارەگاکەی سمکۆی دانا. هەمو هێزەکانی خۆیان سازداو، هەرچی چوارپێی ناوچەکەبو بۆ هەڵگرتنی تفاقی جەنگ کۆیان کردەوە. ئاغا بطرس خۆی سەرکردایەتی ئەو هێزەی ئەکرد کەبۆ گرتنی چەهریق دانرابو. هێزێکی تریش کەئەبو پەلاماری قوشچیو دەوروبەریبدا، گاسفیلدی فەرەنسیو کۆلۆنێلێکی روسی سەرکردایەتییان ئەکرد.

ئاغا بطرس هەر بۆ شکاندنی بەفری رێگاکەی٤٠٠ کەسی قەڵەوی لەگەڵ خۆی بردبو. کتوپڕ هەڵی کوتایە سەر چەهریق. شەڕێکی قورس رویدا. دایکی سمکۆو کچێکی جەعفەر ئاغای برای کوژران. سمکۆ خۆی لەبەر هێرشی ئاسورییەکاندا

پێ نەگیرا. کشایەوە ناو خاکی تورکیا[١٤٥] ئاسورییەکان بەدەم ڕێگاوە هەڵیان کوتایە سەر سەلماس، دیلمان، قوشچی، عەسکەر ئاباد. پەلامارەکەیان ١٠ ڕۆژی خایاند، بەو پەڕی دڵڕەقییەوە کەوتنە کوشتاری کوێرانەی خەڵکی، تالانی ناوچەکە. مەڵبەندی سەلماسیان لەکورد پاککردەوە.[١٤٦]

ڕۆژی ٢٠ی(جمادی الاول) ئاسورییەکان بەبۆنەی گرتنی چەهریقەوە لەخۆشیدا کردیان بەتەقە، لەم بەزمەدا ٤٠ کەسی بێتاوان کوژران.[١٤٧]

بەهۆی ئەو ڕوداوانەوە، بۆ پاراستنی هێمنیو ئاسایشی شار، لەکۆبونەوەیەکدا لەماڵی عظیم السلطنە سەردار، ئەنجومەنێکی تێکەڵاو بەناوی((کۆمیسیۆنی ئەمنییەت))ەوە پێکهات، بەڵام ئەم کۆمیسیۆنە هیچی پێ نەئەکرا، چونکە دەسەڵاتی ڕاستەقینە لەدەس ئاغا بطرسو چەکدارەکانیدابو. حکومەتی ناوەندی ئێران لاوازبو نەیئەتوانی کارێکی کاریگەر بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی ورمێ ئەنجامبدا. ئاسورییەکان ئەیان ویست خەڵکی ورمێ وەکو بارمتە لەگفتوگۆکانی خۆیاندا بۆ دەربازبون لەسزاو جێکردنەوەی خۆیان بەکاربهێنن. کاربەدەستانی تەورێزیش ئەیانویست کاربەسەربەرن، چونکە خۆیان کارێکی ئەوتۆیان پێ نەئەکرا دژی ئاسورییەکانو، هەر لەو ماوەیەشدا واتەواتی هاتنی ئۆردوی تورک بڵاوبوبوەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی سوپای ڕوسی لەولایەتە داگیرکراوەکانی عوسمانی کشابوەوەو، ئۆردوی تورک چوبوەوە بۆ وان، ئەرزڕومو شوێنەکانیتر.

گفتوگۆ لەنێوان کاربەدەستانی تەورێزو ئاسوریەکانی ورمێدا دەستی پێکرد. عظیم السلطنە دەستی لەحاکمی هەڵگرت. لە تەورێزەوە دیسان اجلال الملك کەچەند جارێکیتر حاکمی ورمێبو دانرایەوە. پاش ماوەیەك عظیم السلطنە کوژرا. ئاسورییەکان بکوژەکەیان لەهەمان جێدا هەڵ واسیەوە.[١٤٨]

### ٧. سەرەتای کۆتایی"

### هێرشی تورکو کشانەوەی ئاسوری لەورمێ

ڕوسیای سۆڤیێتی لەجەنگ دەرچو. دەستی لەپشتیوانی ئەرمەنیو ئاسوری هەڵگرت. خەریکی سازینبو لەگەڵ حکومەتی تورك. حکومەتی قافقاز بەشەڕی ناوخۆوە خەریکبو، نەی ئەپەرژایە سەر یارمەتیدانی ئەوان. ئەو هیوایەی هاوپەیمانەکانیش بەپێکهێنانی تیپە چەکدارەکانی ئاسورییان هەبو، بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی ڕوسی لەجەبهەی تورکیدا، نەك هەر بەوان نەهاتە دی، بەڵکو ئەوان خۆیان لەشەڕێکی خوێناوییەوە گلان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە. هاوپەیمانەکان تا ئەهات زیاتر لەئاسورییەکان نائومێد ئەبون" لەلایەکەوە لەعۆدەی ئەو ئەرکە جەنگییە نەئەهاتن کەپێیان سپێردرابو. لەلایەکیترەوە درێژە دان بەهاوکاریو

پشتیوانی تیپەکانی ئاسوری، کە لەگەڵ ئازەریو کوردی دانیشتوی ناوچەکەدا توشی شەڕێکی دینیو نەتەوەیی خوێناوی بوبون، دەوڵەتانی فەرەنسەو بەریتانیاشی توشی ناکۆکی ئەکرد هەم لەگەڵ ئێران وەکو دەوڵەتو، هەم لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە وەکوکوردو ئازەر. لەبەر ئەوە کاربەدەستانی فەرەنسیو ئینگلیزی خۆیان لەیارمەتی دانیان ئەدزییەوەو، خەریکی ئەوەبون بەتەنیا بەجێیان بهێڵن.

ئینگلیزەکان هەر لەسەرەتاوە یارمەتییەکی کەمی ئاسورییەکانیان دابو. شتێکی ئەوتۆیان لەلای ئەوان نەبو لێیان بسێننەوە، یا بیکێشنەوە. فەرەنسییەکانیش لە٢٧ی نیساندا هەمویان ورمێیان چۆڵکرد، جگە لەکاپتەن گاسفیلد، کەئەویش خۆی مایەوە. فەرمانبەرانی روسییش لەسەر داوای حکومەتی قافقاز گەڕانەوە. ئاسورییەکان خۆیان بەتەنیا مابونەوە لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی فەرەنسیو روسی کەئەوانیش بەئارەزوی خۆیان مابونەوە، لەگەڵ میسیۆنی ئەمریکاییو فەرەنسی.[١٤٩]

ئۆردوی تورک کەوتبوە پێشڕەوی بەرەو ئازەربایجان. ئەم هەواڵە دڵی موسوڵمانەکانی خۆش ئەکردو مەسیحییەکانی ئەترساند. لەم لاشەوە هێزەکانی ئینگلیز بۆ پڕکردنەوەی شوێنی روس، هێزەکانیخۆی ئەنارده ئێران. رەوتی جەنگ لەهەمو جەبهەکاندا بەقازانجی بەریتانیا بو. نیشانەی لاوازبونو تێشکان خەریکبو لەناو هێزەکانی تورکدا دەرئەکەوت. بەڵام تورک لەسنوری ئێرانییەوە لەپێشڕەوی دابو. هێزێکی تورک لەشنۆ تێ پەریبو، گەیشتبوە سلدوز جگە لەتیپەکانی ئاسوری هێزێکیتر لەرێگەیان دانەبو. هێزەکانی تورک لەدو لاوە پێشرەوییانکرد" لەبایەزیدو ماکۆوە، هەروەها لەرەواندزەوە بۆ ئەوەی سەرانسەری خۆرئاوای دەریاچەی ورمێ ئابلۆقە بدەن. لەلای سەرەوە سمکۆو لەلای خوارەوە سەید تەها هاوکاری هێزەکانی تورکیانکرد. یەکەمین پێکدادان لەناوەڕاستی نیساندا لەنێوانی تورکو ئاسورییەکاندا لەلای شنۆ رویدا.[١٥٠] لەسەلماسو خوی چەند تێکهەڵچونێکیتر رویدا. ناو شاری ورمێ لەدەس ئاغا بطرسو چەکدارەکانیدابو. ستەمو پشێوی بەردەوامبو. گفتوگۆکانی ئاسورییەکان لەگەڵ کاربەدەستانی تەورێز سەری نەگرت. هەروەها گفتوگۆکانیان لەگەڵ تورکیش بێ هودە بو[١٥١] کاربەدەستانی تەورێز بۆ ئەوەی ئاسورییەکانیان لەکۆڵ ببێتەوە، ئەیان ویست هانیان بدەن بەرەو قافقاز بڕۆن. ئاسورییەکان ئائەهات نائومێدتر ئەبون. گاسفیلد لەو رۆژانەدا نوسیویەتی(( ... ئێمە لەهەمو لایەکەوە گەمارۆ درابوین... تفاقی جەنگی لەکەم بونەوە دابو... دابینکردنی ئازوقە رۆژ بەرۆژ دژوارترئەبو، ناوچەکە لەلایەن سوپای روسییەوە روتێنرا بوەوە، توانای دابینکردنی خواردەمەنی خەڵکی

ئاسایی‌و ٦٥ هەزار پەنابەری( جیلوو ئەرمەنی وان)ی نەبو، قاتوقڕی‌و برسێتی رۆژ بەرۆژ زیاتر هەستی پێ ئەکرا، پەتا گاڵەی پەنێرانی‌و مەسیحییەکان ئەکرد. پشێوی رۆژ بەرۆژ زیاترئەبو، موسوڵمانەکان کەوتبونە تالأن‌و، کوشتاری بەکۆمەڵ ئیتر نەئەبڕایەوە ... ئێمە بڕیارماندا هەڵکوتینە سەر تورك لەناوچەی سەڵماس‌و تا جولفا رایانماڵین تا لەو رێگەیەوە پێوەندی خۆمان لەگەڵ ئەودیو قافقاز دروست بکەین داوای یارمەتییان لێ بکەین))[١٥٢]

لە١٠ی تەموزدا فڕۆکەیەکی ئینگلیزی لەورمێ نیشتەوە. فڕۆکەوانەکە لەلایەن جەنەراڵ دنستروڤیل، فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا لەسەروی ئێران، نێردرابو، بۆ ئەوەی بەئاسورییەکان ڕابگەیەنێ کەئینگلیزەکان هیچ هێزێکی ئامادەیان نییە بینێرن بۆ یارمەتییان‌و، ئیتر ئەبێ پشت هەر بەخۆیان ببەستن‌و، هێزەکانی بەریتانیا لەهەمەدان‌و بەشی سەروی ئەوێدا هەن بۆ ئەوەی ئەوانیش لەخواروی دەریاچەی ورمێوە رێگەیەك بۆ خۆیان بکەنەوە، لەگەڵ ئەوان یەك بگرنەوە.[١٥٣]

لە٢٠ی مانگەوە تاقمێك لەچەکدارەکانی ئاسوری بەسەرکردایەتی ئاغا بطرس کەوتنە تەقەلای کردنەوەی رێگایەك بۆلای بیجارو سایین قەلا بۆ ئەوەی لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز یەك بگرنەوەو هەوڵی هێنانی یارمەتی بدەن. ئۆردوی تورك بەسەرکردایەتی سەلاحەدین پاشا تائەهات لەورمێ نزیکتر ئەبوەوە. ئاسورییەکان ورەیان بەردابو. هیوای مانەوەو بەرەنگارییان نەمابو.[١٥٤] لە٢٩ی تەموزدا، ئەگەرچی سەرکردایەتی هێزە چەکدارەکانی ئاسوری((ئەشتاب))، فەرمانێکی بەزمانەکانی ئاسوری‌و ئەرمەنی‌و روسی چاپ‌و بڵاوکردەوە، داوای لەمەسیحییەکان کردبو" هەمو دەس بدەنە چەك‌و((بێ ترس‌و سڵەمینەوەو دواکەوتن، لەپێناوی گیان‌و ماڵ‌و نیشتمان‌و رێکخراوەکەیاندا بەرامبەر دوژمن رابوەستن بۆ بەرەنگاری))[١٥٥] بەلام هەمان رۆژ ئاغا بطرس، بەتەلەفۆن لەبیجارەوە((ئەشتاب))ی ئاگادارکرد کە" هێزی تورك بەرەو ورمێ ئەکشێن بەلام ئەلقەی ئابلوقەکەیان شکێنراوە، ئەوانیش ئەتوانن لەهەمان رێگاوە بکشێنەوە بۆ بیجار. ورمێ لەژێردەستی خۆیاندابو، بەلام بۆ ئەوەی خەلك بەپاشەکشەیان نەزانی‌و توشی کێشەو شەڕ نەبن، جاڕیان بەناو شارادا کەهاتوچۆکردن ئیتر قەدەغەیەو، هەر کەس هاتوچۆ بکا یاری بەگیانی خۆی ئەکا.[١٥٦]

شەوی چوارشەمە،٢ی ئابی١٩١٨ ئاسورییەکان هەمو عەمارەکانی تفاقی جەنگییان تەقاندەوە، هەندێ لەئازوقەو کەلوپەلەکانی خۆیان سوتان‌و، هەرچی شتێکی پێویستو بەنرخیان پێ هەڵگیا یا بەعەرەبانە پێ بارکرا، بەپەلە پێچایانەوەو، بەکۆمەڵ بەخاوو خێزانەوە بەرەو بیجار بەرێ کەوتن.[١٥٧] بۆ بەیانی

خەڵكی شار تێگەیشتن كەمەسیحییەكان ڕۆیشتون. پاش نیوەڕۆی۳ی ئاب پێشەنگی ئۆردوی تورك، كەبریتی‌بو لەسوارەی كوردو ئازەری گەیشتە ناو ورمێ.
مەسیحییەكان لەهەلومەرجێكی زۆر سەختدا كشانەوە، دهقان نوسیوێتی:
((...ئەم كاروانە چەندین دە هەزار كەسییە نارێكوپێكە هەرچەند ئەیان بیست ئۆردوی عوسمانی نزیكتر ئەبێتەوە ئەوان لەڕۆیشتن زیاتر پەلەیان ئەكرد. بۆ ئاسان‌كردنی ڕۆیشتن كەلوپەلی قورسیان لەڕێگە فڕێ ئەداو ئەیان ویست گیانی خۆیان لەشەڕ بساخی دەرباز بكەن. لەڕێگاو پردەكان كەباریك‌بون لەبەر ئەوەی هەمویان ئەیان ویست زوتر تێ بپەڕن بەزۆری پیرەكان ئەكەوتنە ئاوەوە ئەخنكان. نەخۆشەكانی كەتوانای ڕۆیشتنیان نەبو لەژێر درەختی چۆڵەوانی‌دا بەهیوای خوا بەجێیان ئەهێشتن‌و خۆیان هەڵئەهاتن. ژنان‌و دایكانێ كەمنداڵەكانی خۆیان بزركردبو ناڵەو شیوەنیان ئەكرد. بەكورتی هەلومەرجی ئەوانە زۆر دڵتەزێن‌و لەباس‌كردن نەئەهات، لەهەموشی خراپتر جیلوكان‌و قاچاغەكانی ئەرمەنی كە تائەوسا بوبونە هۆی كوشتنی ئەو هەمو موسوڵمانانە، ئێستە لەگەڵ پیرەمێردو پیرەژنانی مەسیحی‌دا ڕەفتاری خراپیان ئەكرد، ئەوانیان بەكۆسپی خێرا ڕۆیشتنی خۆیان ئەزانی‌و ئەیان ویست بەهەر ڕێگەیەكی بكرێ ڕزگاریان بێ لەدەستیان.[158]
((ئەم كۆچە ناڵەبارە لەهەمو جێگایەك ئەكەوتە بەر هێرشی دوژمنەكانی، كە لەسابلاخ دەرچون نزیكی میاندواو مجدالسلطنە سەرداری ورمێ بۆ تۆڵە سەندنی هاوشارییەكانی خۆی ڕێگەی پێ‌گرتن‌و زۆری لێ كوشتن، ئەوانی‌تریان خۆیان گەیاندە هێزەكانی ئینگلیز لەساین قەلا))[159]
شەڕی ناوخۆی مەسیحی ـ موسوڵمان لەورمێ ڕۆژی هەینی۲۲ی شوباتی ۱۹۱۸ دەستی پێ‌كرد، تا ڕۆژی۱ی ئابی۱۹۱۸ درێژەی كێشا. بەگەیشتنی ئۆردوی عوسمانی تەواوبو. واتە۱۵۹ ڕۆژی خایاند. لەم شەڕەدا بەقسەی نوسەرانی عەجەم۱۳۰ تا۱٤۰ هەزاركەس لەخەڵكی ورمێ‌و سەلماس‌و دەوروبەری كوژراون[160] لەمەسیحیەكانیش تەنیا۵۰ هەزار كەسێكیان گەیشتنە ساین قەلا، ئەوی تریان كەمێكی‌نەبێ لەناوچەكانی پێشوی خۆیاندا مابونەوە، هەمویان لەڕێگە فەوتان.[161]
ژمارەی كوژراوی كورد دیار نیە چونكە كەس سەرژمێری نەكردوە، دیارە ئەویش زەرەری گیانیی گەورەی لێ كەوتوە. سەرەڕای ئەوەی زۆری ناوچەكانی كوردستان بوبونە ڕێپەڵگەی سوپاكانی تورك‌و ڕوس، شەڕی ناوخۆی ئەرمەنی‌و ئاسوریشی بوبوە سەربار. ڕەنگە یەكێ لەشایەتە باشەكان، ئاغا پەتروس خۆی بێ.

ئاغـا پـەتروس لـەو بەیاننامەیـەدا کـە بـەزمانی ئاسـوری‌و فارسـی لـە١٩ی نیسانی١٩١٨ دا بۆ ئاشتبونەوەی مەسیحی‌و موسوڵمان، دەری‌کردوە نوسیویّتی:

((براییـنـە! مـن کورتەیـەکتان لەسـەر هەلومـەرجی شـنۆ بـۆ رون ئەکەمـەوە، کەخۆم بەچاوی خۆم دیومە، چونکە دڵنیام کەدڵی ناسك‌و ویژدانی ئێوە هیچ کاتێ لە هەلومەرجی ئەویّ رەزا نابیّ‌و تەحەمول ناکا، لەوانـە، لەکۆڵانـەکان، ڕێگـەکان، نـاو مـاڵاندا ئـەم دی ئێسـقان گۆشـتی پێـوە نـەماوە، پارچـەکانی سـکەلیت‌و هەیولایان هەڵ نەوەشاوەو وەکوخۆی پێکەوە ماوە.

((لەو ناوچانە ناشتنی مردو، یارمەتی دانی هـەژاران، ئـاودان بـەلیّوی تینـوی سوتاوی نەخۆشان، یا گریـان‌و پرسـە بـۆ مردنـی نـەجیبان‌و ئەعیانـەکانی خۆیـان هەموی وازی لیّ هێنراوەو دەستی لیّ هەڵگیراوە.

((خۆراکی سەگەکانی ئەویّ گۆشتی مرۆڤە، بـەزۆری خـۆراکی مـرۆڤیش لـەویّ گۆشتی پشیلەو سەگ‌و مرۆڤە. دەوڵەمەندەکان گەیشتونەتە دوایـین پـاروی خۆیـان، رەنگ‌و روخساریان لەبرسا زەرد هەڵگەڕاوە، منـالان ئومێدیان بەبەزەیی‌و دڵنەرمی دایکیان نەماوە نانیـان بـدەنیّ هـەمویان لەجێیـەکا خڕبونەتـەوە. لـەژیانی خۆیـان نائومێد بون.

((کەسانێکی زۆرم ئەدی گیایان ئەخوارد، ویستم پرسـیاریان لیّ بکـەم، سـەری خۆیـان رائەوەشـان‌و هـیچ وەلامێکیـان نەئەدامـەوە، زانـیم کـە لـەگیانی خۆیـان بێزاربون، هیچ گوێیان نەئەدایە ئێمەو خەریکی گیا خواردنی خۆیان بون.

((ئەگەرچی رێزلێنانی میـوان لەهەموشـوێنیّ، لەسـەر هەموکـەس پێویسـتە، کەچـی‌کابرایەکی خـەڵکی سـلدوز لەناچـاری‌دا، هـەردو میـوانی بـەرێزی خـۆی کوشتبون، گۆشتی هەردوکیانی خواردبو.

((چەند جار لەبەد بەدتر بینراوە، دایك گۆشتی رانـی منالـە خۆشەویستەکانی خۆی خواردوە)).

((هەی هاوارو داد، براییـنە! هاوارتان لیّ ئەکەم لەپێناوی مرۆڤایەتی‌دا هەرچی زوتـر رۆژگـاری ئاشـتبونەوە تەواوبکـەن بـۆ ئـەوەی سـالی داهـاتو پێویسـتیمان بەخواردنی گۆشتی نەوەی خۆمان نەبیّ ...))[١٦٢]

لەو هێرشەدا بۆ سەر شنۆ، ئاغا پەتروس خۆی سەرکردەی هێـزە چـەکدارەکانی ئاسوری بو.

## پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم:

[1]. الـدکتور احمـد سوسـه، ملامـح مـن التـاريخ القـديم ليهـود العـراق، مرکـز الدراسـات الفلسطينية- جامعة بغداد، ١٩٧٨، ص٥٩" جرج ن. کـرزن، ايـران وقضيه ايران، ترجمه غ. وحيد مازندرانی، جلد اول، چاپ دوم، تهـران: مرکـز انتشـارات علمـی وفرهنگـی، ١٣٦٢ش، ص٦٨٣

[2]. سوسـه، هـ س، ل٦٣" علـی دهقـان، رضـائيه يـا سـرزمين زردشـت، تهـران: ابـن سـينا، اسفند١٣٤٨ش، ص٧٠-٧١

[3]. سوسه، هـ س، ل١١٩

[4]. بۆ ناوی کتێبەکانی ویگرام، بڕوانە: سوسه، ملامح من...س ن، ل٦١

[5]. ك. پ. ماتڤييف- بارمتی، الآشوريون في الازمنـه، المعاصـرة، ترجمـة بنيـامين م. بنيـامين، تموز ١٩٨٤، استراليا. ئـەم نوسـراوە چـەند جـارێ کراوەتـە عـەرەبی، بـەڵام هـەمویان ناتـەواو نارێکوپێکن.

[6]. سوسه، س ن، ل٦٨-٧٠ و ٣٢-٣٣

[7]. هـ س، ل٦٨

[8]. بڕوانە: الدکتور المهندس ئەحمەد سوسه، مفصل العرب واليهـود في التـاريخ، بغـداد، ١٩٨١، ص٥٨٤-٦٠٣هەروەها سەرچاوەی پێشو.

[9]. سوسه، ملامح من التلريخ...ل٦٠

[10]. امير شـرف خـان بدليسـی، شـرفنامه، بەکوشـش محمـد عباسـی، تهـران، علمـی،١٣٦٤ش، ص١٣٠، ٥١٠

[11]. سوسه، س ن، ل٩٤-٩٥" دهقان، س ن، ل٦٨" کرزن، س ن، ل٦٨٣

[12]. دهاقان، س ن، ل٦٨

[13]. سوسه، س ن، ل١٠٢

[14]. کلوديوس جيمس ريچ، رحله ريچ الی العراق في عام ١٨٢٠، ترجمه بهـاءالـدين نـوری، ج١، بغداد١٩٥١، ص١٠٩

[15]. کرزن، س ن، ل٦٨٢

[16]. هـ س، ل٦٩٣

[17]. سوسه، س ن، ل١٠٠-١٠١

[18]. بدليسی، س ن، ل١٣٠

[19]. هـ س، ل٥٠٩

[20]. ريچ، س ن، ل١٩٦

[21]. هـ س، ل١٩٦

[22]. هـ ج

[23]. واسيلی نيکيتين، کردو کردستان، ترجمه محمد قاضی، تهران، نيلوفر، ١٣٦٦، ص٤١٢

[24]. هـ س، ل٤١٣

[25]. اسكندر غوريانس، قيام شيخ عبيدالله شمزينى دركردستان، بـه اهتمـام عبداللـه مـردوخ، تهران: دنياى دانش،٢٥٣٦، ص٩٩
[26]. مسعود البارزاني، البارزاني والحركـه التحرريـة الكرديـة: انتفاضـة بـارزان الاولى١٩٣١-١٩٣٢، مطبعة خبات، ١٩٨٦، ص٢٠
[27]. محمد تمدن، اوضاع ايران در جنگ اول يـا تـاريخ رضـائية، تهـران: چـاپ اسـلاميه،١٣٥٠، ص٩٤
[28]. دهقان، س ن، ل١٥١
[29]. تمـدن، س ن، ل٩٤" دهقـان، س ن، ل٢٢٠" اوژن اوبـن، ايـران امـروز، ترجمـه وحواشـى وتوضيحات از على اصغر سعيدى، تهران: زوار،١٣٦٢ش، ص١٠٤
[30]. سوسه، س ن، ل١٢٢" كرزن، س ن، ل٦٨٨
[31]. اوبن، س ن، ل١٠٠
[32]. سوسه، س ن، ل١٢٢
[33]. دهقان، س ن، ل٢١٨
[34]. دهقان، س ن، ل٢١٩" تمدن، س ن، ل٩٨، اوبن، س ن، ل١٠٤، سوسه، س ن، ل١٢٢
[35]. دهقان، س ن، ل١٤٢
[36]. سوسه، س ن، ل١٢٢
[37]. دهقان، س ن، ل١٤٦
[38]. سوسه، س ن، ل١٢٠
[39]. اوبن، س ن، ل١٠٢
[40]. سوسه، س ن، ل١٢٠
[41]. هـ س، ل١١٩-١٢١
[42]. هـ س، ل١١٧-١١٩
[43]. دهقان، س ن، ل٢٢٠، تمدن، س ن، ل١٠٤
[44]. جليل، نهضة الاكراد الثقافية...، طبعه بيروت، ص١٢٧
[45]. سوسه، س ن، ل١٢٤
[46]. هـ ج
[47]. مسـيوب نكيـتين، ايرانـى كـەمن شـناختەام، ترجمـه علـى محمـد فـروشـي، چ٢، تهـران، معرفت،٢٥٣٦، ل٢٢٤
[48]. دهقان، س ن، ل٤٨٩
[49]. تيكسـتى تـەواوى مەرامنامـە: تمـدن، ل٢٠٤ تـا ٢٠٧" هـەروەها بەشێكى بەناتـەواوى جياوازى لە: بارمتى، ل٨٢-٨٣
[50]. ((الانقلاب السياسى العثماني))، مجلة الهلال، الجزء الاول، السنة١٧، القـاهرة، ١ تشـرين اول ١٩١٨، القاهرة، ص٦

[51]. ((عبدالحميد الثاني: حياته السياسية))، مجلة الهلال، الجزء الاول، السنة ١٧، القاهرة، ١تموز١٩٠٩، ص٥٧١
[52]. مجلة الهلال، ج١، س١٧، ص١٠
[53]. الدكتور عبدالجبار قادر غفور،((المفكر الكردي الدكتور عبدالله جودت١٨٦٩-١٩٣٢))، ترجمة عبدالفتاح علي يحيى، گوڤاري((كاروان))، ژ ٤٦، بەغداد، تەمموزي ١٩٨٦، ل١٤٦-١٥٣
[54]. الهلال، ج٦، س١٧، ١مارت ١٩٠٩، ص٣٧٥-٣٧٦
[55]. د. جەبار قادر،((رۆژنامەی((كورد))و چەند زانیاریيەكی نوێ، گۆڤاری كاروان، ژمارە٣٢، بەغداد، مايسی١٩٨٥، ل٧-١١
[56]. ژان ماری كارزو، ارمنستان١٩١٥، ترجمه فريبرز برزگر، تهران: جاويدان، ابان ماه ٢٥٣٥، ص١٧٥-١٧٦
[57]. لینچوفسكی، س ن، ل٥٧
[58]. نیكیتین، كرد....، ل٤١٧
[59]. ماتثيف، س ن، ل٧١
[60]. هـ س، ل٧٢
[61]. هـ ج
[62]. هـ س، ل٧٤
[63]. هـ س، ل٧٦
[64]. دانيال متى،((رويدادهای اروميەو كردستان شمالی-دسامبر ١٩١٧تا ژوئيه ١٩١٨-در آرشيوهای نظامی فرانسه))، مجله دراسات كرديه-مطالعات كردی، پاريس: مركز تحقيقات انستيتوكرد، ش١، ص٣٨
[65]. اوژان اوبن، ايران امروز، ص٩٩-١٠٠
[66]. كسروی، س ن، ل٥٩٩" تمدن، س ن، ل١١٨
[67]. دهقان، س ن، ل٤٦٠
[68]. هـ س، ل٦٠٠
[69]. بۆ درێژەی ئەم باسە بڕوانە، عبدالقادری دەباغی،((چەند دێڕێك لەمێژو))، بەشی یەكەم، گۆڤاری كاروان، ژ٥٤، بەغداد، نيسانی١٩٨٧، ل٢١-٣٢. بەشی دوەم، ژ٥٥، ئاياری١٩٨٧، ل٢-٧
[70]. كسروی، س ن، ل٦٠٧
[71]. تمدن، س ن، ل١٢٥
[72]. احمد كسروی، س ن، ل٦٠٥-٦٠٨
[73]. دهقان، س ن، ل٤٦٧"تمدن، س ن، ل١١٩
[74]. نیكیتین، ايرانی كەمن...، ل٢٠١-٢٠٢
[75]. نیكیتین، كرد، ل٤٦٦-٤٦٧

[76]. کسروی، س ن، ل٦١٥-٦١٧
[77]. تمدن، س ن، ل١٢٣
[78]. هـ س، ل١٢٥
[79]. هـ س، ل١٣٠
[80]. هـ ج
[81]. هـ ج
[82]. هـ س، ل١٣١
[83]. هـ ج
[84]. هـ ج
[85]. بۆ نموونە بڕوانە: دهقان، س ن، ل٤٨٠"کسروی، س ن، ل٦١٣"تمدن، س ن، ل١١٩
[86]. تمدن، س ن، ل١٣١-١٣٢
[87]. تمدن، س ن، ل١٣٦"دهقان، س ن، ل٤٨١
[88]. دهقان، س ن، ل٤٨١"تمدن، س ن، ل١٣٣-١٣٥
[89]. ماتڤیێف، ل٧٦
[90]. هـ س، ل٧٨
[91]. نیکیتین، ایرانی...، ل٢٢٤-٢٢٥
[92]. متی، س ن، ل٣٦
[93]. هـ س، ل٣٩
[94]. نیکیتین، ایرانی...، س ن، ل٢١٠
[95]. متی، س ن، ل٣٦
[96]. هـ س، ل٤٠
[97]. هـ س، ل٤٠
[98]. نیکیتین، ئێرانی...، س ن، ل٢١١
[99]. تمدن، س ن، ل١٤٢
[100]. هـ س، ل١٤٣
[101]. هـ س، ل١٤٥-١٤٧
[102]. وێنەی بەیانەکە: هـ س، ل١٥٢
[103]. هـ س، ل١٥٣
[104]. متی، س ن، ل٣٧
[105]. راگوێزراوە لەمتی، س ن، ل٣٧
[106]. نیکیتین، ئێرانی...، س ن، ل٢٣٦
[107]. دانیال متی، س ن، ل٤٢-٤٣
[108]. نیکیتین، ئێرانی...، س ن، ٢٣٨" متی، س ن، ل٤٣
[109]. تمدن، س ن، ل١٦٠-١٦٤

[110]. دهقان، س ن، ل٤٨٩
[111]. هـ س، ل٥٠٩
[112]. ژان ماری کارزو، س ن، ل٢٤٢
[113]. دهقان، س ن، ل٤٨٣" کسروی، تاریخ هیجده ساله ئاذربایجان، ج٢، ل٦٨٥
[114]. دهقان، س ن، ل٤٨٧
[115]. هـ س، ل٤٩٥
[116]. متی، س ن، ل٤٧
[117]. هـ س، ل٤٧
[118]. دهقان س ن، ل٤٩٩
[119]. متی، س ن، ل٤٧
[120]. دهقان، س ن، ل٥٠٠
[121]. متی، س ن، ل٤٧
[122]. دهقان، س ن، ل٥٠٠
[123]. هـ س، ل٥٠١
[124]. هـ س، ل٥٠٣
[125]. هـ س، ل٥٠٤
[126]. تمدن، س ن، ل١٨٢
[127]. دهقان، س ن، ل٥٠٥" تمدن، س ن، ل١٨٣
[128]. هـ س، ل٥٠٦
[129]. هـ س، ل٥٠٧
[130]. هـ س، ل٥٠٨
[131]. هـ س، ل٥٠٨
[132]. کسروی، س ن، ل٧٢٦-٧٢٧" دهقان، ل٥١١-٥١٢
[133]. تمدن، س ن، ل١٨٦
[134]. هـ س، ل١٨٧
[135]. دهقان، س ن، ل٥١٢
[136]. عەلائەدین سوجادی، شۆڕشەکانی کورد وەکوردو کۆماری عیراق، بەغداد،١٩٥٩، ل٢٥١-٢٥٤
[137]. راگوێزراوەلە: متی، س ن، ل٤٩
[138]. هـ س، ل٤٩
[139]. ئەم گفتوگۆیەی سمکۆو مستەفای یامولکی لەئازشیفی بەریتانیدا دۆزراوەتەوە، مامۆستا محەمەد رەسوڵ هاوار کردویەتی بەکوردی، لەگۆڤاری((مامۆستای کوردی))ی سویدیدا بڵاوی کردۆتەوە.
[140]. تمدن، س ن، ل١٨٨-١٨٩

[141] . دهقان، س ن، ل۵۱۵" تمدن، س ن، ل۱۸۸-۱۸۹
[142] . دهقان، س ن، ل۵۲۱
[143] . تمدن، س ن، ل۱۹۰
[144] . دهقان، س ن، ل۵۲۱-۵۲۲
[145] . تمدن، س ن، ل۱۹۳" دهقان، س ن، ل۵۲۲-۵۲۳
[146] . متی، س ن، ل۵۰
[147] . دهقان، س ن، ل۵۲۵
[148] . هـ س، ل۵۲۷
[149] . متی، س ن، ل۵۲
[150] . هـ س، ل۵۳
[151] . تمدن، س ن، ل۲٦۷
[152] . متی، س ن، ل۵۳
[153] . متی، هغمانجی" تمدن، س ن، ل۲۹۲
[154] . دهقان، س ن، ل۵۳۲
[155] . تمدن، س ن، ل۲۹۹
[156] . هـ س، ل۳۰۰-۳۰۱
[157] . هـ س، ل۳۰۲
[158] . دهقان، س ن، ل۵۳۷
[159] . هـ ج
[160] . هـ س، ل۵۳۹
[161] . هـ س، ل۵٤۰
[162] . تمدن، س ن، ل۲۱۷

## ٦.سمكۆ؛ یاخیبونی خێڵەکی یا بزوتنەوەی نەتەوەیی

### ١-ئێران لەکاروباری ئەودەمی دنیادا

### ١/١بزوتنەوەی مەشروتە١٣٢٤

زوڵموزۆری بێ لێپرسینەوەی کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران خەلکی بەگیر هێنـا بو. ئاخوندەکانی شیعە لەمینبەری مزگەوتەکانەوە، بەتایبەتی لەبۆنـە دینییـەکانی موحەڕەمو رەمـەزاندا، کەوت بونـە دوان دژی هەنـدێ لەکاربەدەسـتانی گـومرگو سوکایەتی کردنی ئەوانە بەدینو بەئاخوندەکان.

بازرگانەکانی تاران نامەیـەکی سـکالآیان بـۆ عـین الدولـەی، صـدری اعظمـی ئێران، نوسی گلەییان لەزۆریی تاریفەی گومرگو داوای کەم کردنەوەیان کـرد بـو. لەدانیشـتنێکی هاوبەشـی عـین الدولـەو کاربەدەسـتانی گـومرگو نوێنـەرانی بازرگانەکاندا، لەباتی ئەوەی گوێ لەخواستەکانیان بگـرن جنێویـان پـێدانو سـور بون لەسەر هەمان چەردەی تاریفە. بازرگانەکان بـەئاگاداری هەنـدێ لەئاخونـدەکان بازاڕیان داخستو پەنایان بردە بەر عبدالعظیم. لەم ماوەیەدا مظفرالدین شا ئەچو بۆ ئەوروپا. محەمەد عـەلی مـیرزای کوڕی لەتـەورێزەوە هـات بـوە تـاران لەجێگـەی ئەوبێ تا کاتی گەڕانەوەی محەمەد عـەلی مـیرزا بەقسـەی خۆش مانگرتنەکـەی پـێ شکاندنو گفتی پێ دان لەدوای گەڕانەوەی شا خواستەکانیان جێبـەجێ بکـا. لـەو ماوەیـەدا روداوێکـی ئـەوتۆ نەقـەوما جگـە لەکوشـتنی جەوهـەر ئاغـای شـوکاك لەتەورێز بەفەرمانی وەلیعەهد، بـەلآم دو ئاخونـدی گـەورەو خـاوەن نفـوزی تـاران" سەید محەمەدی طباطبایيو سەید عەبدوڵلای بهبهانی لەسەرەتای ساڵی ١٣٢٣ەوە بـە نهێنـی یـەك کـەوت بـون بـۆ بەرهەڵسـتی زوڵـم و زۆری صـدری اعظـمو دەربارییانی تر.

شاو هاوسەفەرەکانی٤ مانگیان پێ چو. ئێران بەتەنگوچەڵەمەیەکی ئابوری دژواردا تێ ئەپەڕی. کەچی ئەوان لەو سەفەرەدا پارەیەکی زۆریان خەرج کرد بو، ئەوە بەسەر زمانی هەمو کەسەوە بو.

عین الدولەو حاکمی تاران بەهۆی مانگرتنی پێشو بەقین بون لەبازرگانەکانی تاران، بۆ هەل ئەگەڕان تۆڵەیان لێ بکەنەوە. گرانی نرخی قەندیان کردە بەهانەو چەند کەسێکیان لەپیاوە ناسراوەکانیان فەلاقە کرد. ئەم کارە بازاڕی جوڵاند. بازاڕییان دوکانیان داخستو لەمزگەوتی((شا))کۆبونەوە دادی خۆیان بردە بەر ئاخوندەکان، ئاخوندەکان دو دەستە بون، دەستەیەکیان، لەناو ئەوانەدا ئیمام جومعەی تاران، پشتیوانییان لەعین الدولەو دەربارییان ئەکرد. دەستەکەی تریان، طباطبایی‌و بهبهانی رابەرییان ئەکردن پشتیوانییان لەبازرگانەکان‌و خەڵك ئەکرد. ئیمام جومعە بەپیلانێکی زیرەکانە کۆبونەوەکەی شێواندو خەریك بو ببێتە ئاژاوەیەکی خوێناوی. طباطبایی‌و بهبهانی‌و دەستوپێوەندەکانیان تارانیان بەجێ هێشت‌و پەنایان بردە بەر عبدالعظیم، دەوڵەت بەزۆر بازاڕی بەخەڵك کردەوە. هەرکەس دوکانی نەکردەوە فەرمان درا تالان بکرێ.

لەعبدالعظیم نزیکەی دو هەزار کەس لەئاخوندو واعیظ طەلەبەی دینی‌و هەندێ بازرگان کۆبونەوە. لەتاران بۆ هاودەنگی لەگەڵ ئەوان جاروبار بازاڕ دائەخرا. کاربەدەستان بەزۆر پێیان ئەکردنەوە. کێشەکە تا ئەهات گەورەتر ئەبو. گفتوگۆی راستەوخۆی مانگرتوەکان لەگەڵ عین الدولە ئەنجامێکی سەرکەوتوی نەبو. لەرێگەی سەفیری عوسمانییەوە یەکسەر خواستەکانی خۆیان بۆ شا نارد. گرنگ ترینیان دامەزراندنی((عەدالەت خانە))بو لەهەمو ئێراندا. سەفیری عوسمانی بەهۆی مشیر الدولەی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێرانەوە خواستەکانی گەیاندە شا. هەرچەندە عین الدولەو دەربارییانی تر پێیان خۆش نەبو، بەڵام شا موافەقەتی لەسەر دامەزراندنی((عەدالەتخانە))کردو بەخەتی خۆی بەمجۆرە فەرمانی دەرکرد:

((جەنابی ئەشرەف ئەتابیکی اعظم

هەر وەکو چەندین جار ئەم نیازەی خۆمان اظهار فەرموە کەرێکخستن‌و دامەزراندنی عەدالەتخانەی دەوڵەتی بۆ جێبەجێ کردنی ئەحکامی شەرعی موطاع‌و ئاسایشی رەعییەت لەهەمو شتێ واجیب ترەو وا بەئاشکرا بڕیار ئەفەرموین بۆ بەجێ هێنانی ئەم نیازە پیرۆزە قانونی مەعدەلەتی ئیسلامیە کەعیبارەتە لەتەعیینی حدودو ئەحکامی شەریعەتی مطهرە ئەبێ لەهەمو مەمالیکی مەحروسەی ئێراندا بەزوویی دابمەزرێ بەجۆرێ کە لەناو هیچ یەکێ

لەچینەکانی رەعییەتدا جیاوازی نەکریٚو لەجێبەجێ کردنی عەدلو سزادان دا بەجۆرێ کە لەنیزامنامەی ئەم قانونەدا ئیشارەتی پێ ئەکەین ملاحظه ی اشخاصو طه رەفداری بێ جێ بەبێ چەندوچونو بەراستی مەمنوع بێ. هەڵبەتە بەهەمان شێوە کیتابچەیە ئەنوسرێ فەصلەکانی بەپێی قانونەکانی شەرعی موطاع رێك بخرێو بەعەرزی بگەیەنە تا لەهەمو ولایەتەکاندا کاری پێ بکرێو تەرتیباتی مەجلیسیش بەشێوەیەکی راست بکرێ، هەڵبەتە ئەم جۆرە موستەدعیاتی عولەمای ئەعلام کەباعیسی دوعاگۆیی زۆرتری ئێمەیە هەمو کات مەقبول ئەبێ. ئەم دەستخەتەی ئێمەش بەعومومی ولایەت رابگەیەنە مانگی ذیالقعده١٣٢٣))[1]

عین الدولەو زۆر لەکاربەدەستەکانی تری دەوڵەت دژی دامەزراندنی عەدالەتخانە بون، دوای نیشتنەوەی خرۆشانی خەڵك نەیان ئەهێشت فەرمانەکەی شا جێبەجێ بکرێ، بەڵکو کەوتنە کوشتنو راونانی ئازادیخوازەکانو دورخستنەوەیان لەتاران. بزوتنەوەی داواکردنی عەدالەتخانە سەرلەنوێ پەرەی سەندەوە. خەڵكو ئاخوندەکان کوشتنی سەیدێکی ئازادیخوازیان کرد بەبیانوی کۆبونەوەو مانگرتن لەمزگەوتی((ئادینە))بۆ داواکردنی دامەزراندنی عەدالەتخانە. هێزەکانی دەوڵەت گەمارۆیان دان نەیان ئەهێشت نانو ئاویان بۆ بچێ. لەژێر گوشاری دەربار دا مانگرتنەکە سەری نەگرت. هەم بازاڕ کرایەوە هەم زۆری ئەوانەی لەئادینە کۆبوبونەوە بڵاوەیان لێ کرد. بەڵام شا رێگای دا بەئاخوندەکان بەئازادی بۆ هەر کوێ ئەیانەوێ بڕۆن. ئەوانیش بەکۆمەڵ کۆچیان کرد بۆ قوم.

لەو سەردەمەدا لەئێران نەریتی((بەست نشینی))هەبو. ئەوەی گیروگرفتێکی هەبوایە پەنای ئەبردە بەر ئیمامزادە، مزگەوت، ماڵی موجتەهیدەکان، تەلگراف خانە، یاخود سەرای سەفارەتو کۆنسۆلگەی دەوڵەتانی بێگانە. گەورەی ئەوێی ئەکردە تکاکار لای دەوڵەت بۆ چارەکردنی کێشەکەی. رۆژی ٢٦ی جمادی الاول ٥٠ کەس لەبازرگانو تەلەبەی دینی پەنایان بردە بەر سەفارەتی بەریتانی لەتارانو((بەست نشین))بون، خەڵك کەدییان سەفارەت داڵدەی ئەوانەی دا رۆژ بەرۆژ زیادیان کرد. هەر چینو توێژێکی کۆمەڵایەتی لەناو باخی سەفارەتدا خێوەتێکی بۆ خۆی هەڵ دا. ژمارەی بەست نشینەکان لە١٣ هەزار کەس تێ ئەپەڕی. بازاڕی تاران بەتەواوی داخرا.

بەست نشینەکان لەڕێی((قائم بالاعمال))ی بەریتانیەوە خواستەکانی خۆیان نارد بۆ دەربار خواستەکانیان لەسەرەتادا بریتی بولە:

١-گێڕانەوەی عولەمای موهاجیر بۆ تاران.

٢-دڵنیا بون لەوەی کەس بەبیانو ناگیریۆ ئەشکەنجە نادرێ.
٣-ئاسایشی وڵات، چونکە ئەمڕۆ کەس خاوەنی ماڵۆ گیانی خۆی نیە.
٤-دامەزراندنی عەدالەتخانە کەعولەماو بازرگانانو پیشەکانی تری تێدا بەشدار بن.
٥-بکوژی دو سەیدی مەزن سزا بدرێن[2].
عەین ئەلدەولە خواستەکانی رەت کردنەوە، مانگرتنی ئەمان لەباخی سەفارەتدا، مانگرتنی ئاخوندەکانو لایەنگرەکانیان لەقوم، داخستنی دوکانو بازاڕی تاران درێژەی کێشا. بەست نشینەکان کاتێ دڵنیا بون لەپشتیوانی خەڵك خواستەکانیان زیاتر کرد. دیسانەوە لەرێی شارژ خواستەکانی خۆیان بەجۆرە دا بە شا:
١-گەڕانەوەی عولەمای ئەعلام.
٢-لێ خستنی شازادە ئەتابیگ.,
٣-دامەزراندنی دارالشوری.
٤-سزادانی بکوژانی شەهیدانی نیشتمان.
٥-گەڕانەوەی دەرکراوەکان[3].
محەمەد عەلی میرزا هێشتا ولیعەهد بو. لەگەڵ عین الدولە ناکۆك بو. عین الدولە ئەی ویست لەجێگای ئەو یەکێکی تر بکاتە ولیعەهد. ئەویش ئەی ویست خۆی ببێ بە شا. بۆ ئەوەی پشتیوانی ئاخوندەکانو خەڵك بەدەس بهێنێ تەلگرافێکی لەتەورێزەوە نارد بۆ شا پشتیوانی لەخواستەکانی بەست نشینەکان کرد. ئاخوندەکانی تەورێزیشی وا لێ کرد. ئەوانیش تەلگراف بۆ پشتیوانی لەخواستی بەست نشینەکان بنێرن بۆ شا. شا موافەقەتی لەسەر داواکەی محەمەد عەلی میرزا کردو بەم فەرمانەی لای خوارو((مەشروتە))ی راگەیاند:
((جەنابی ئەشرەف صدری اعظم
سەبارەت بەوەی حەزرەتی باری تعالی جل شانە سەرڕشتەی پێشکەوتنو خۆشیی مەمالیکی مەحروسەی ئێرانی بەکەفی کیفایەتی ئێمە سپاردوەو شەخسی هومایۆنی ئێمەی کردۆتە پارێزەری مافەکانی هەمو ئەهالی ئێرانو رەعییەتی دۆستەکانمان لەبەرئەوە لەم کاتەدا کەبیرو ویستی هومایۆنی ئێمە هاتە سەر ئەوەی کەبۆ خۆشییو ئاسایشی گشت خەڵکی ئێرانو بۆ دامەزراندنو پتەوکردنی بناغەکانی دەوڵەت ئیصلاحاتی پێویست بەشێنەیی لەدائیرەکانی دەوڵەتیو مەملەکەتی دابکرێ. بڕیارماندا مەجلیسی شورای میللی لەهەڵبژێردراوانی

شازادەکانو عولەماو قاجاریەو ئەعیانو ئەشرافو مەللاکینو توجارو ئەصناف بەهەڵبژاردنی ئەو چینە ناوبراوانە لەدار الخلافەی تاران پێك بێو رێك بخرێ بۆ ئەوەی لەئەرکەکانی کاروباری دەوڵەتیو مەملەکەتیو قازانجی گشتیدا راوێژو لێکۆڵینەوەی پێویست بکاو یارمەتی پێویستی هەیئەتی وەزیرانی دەوڵەتخوای ئێمە بدا لەو ئیصلاحاتەدا کەبۆ بەختیاریو خۆشیی ئێران ئەکرێو بەوپەڕی ئاسایشو دڵنیاییەوە باوەڕی خۆیان بۆ خێری دەوڵەتو میللەتو قازانجی گشتیو پێویستەکانی هەمو ئەهالی مەملەکەت لەرێی شەخسی یەکەمی دەوڵەتەوە بەعەرز بگەیەنێ تا بەموافەقەتی هومایۆنی برازێنرێتەوەو جێبەجێ بکرێ. دیارە بەپێی ئەم دەستخەتە موبارەکە نیزامنامەو تەرتیباتی ئەم مەجلیسەو ئەسبابو پێویستەکانی پێك هێنانی بەپێی سەلماندنو ئیمزای هەڵبژێردراوەکان لەو رۆژەوە ئامادە ئەبێ کە بەسەلماندنی ملوکانە بگاو بعون الله تعالی مەجلیسی شورای ناوبراو کەپاسەوانی عەدلی ئێمەیە دائەمەزرێو دەس ئەکا بەئیصلاحاتی پێویستی کاروباری مەملەکەتو جێبەجێ کردنی قانونەکانی شەرعی موقەددەس. هەروەها بریار ئەدەین کەرونوسی دەسخەتی موبارەك بلاوبکرێتەوە تا هەمو ئەهالی لەنیازە باشەکانی ئێمە کە بەتەواوی دەربارەی پێشکەوتنی دەوڵەتو میللەتی ئێرانە وەکو پێویست ئاگادارو بەخۆشییەوە خەریکی دوعاگۆیی دەوامی ئەم دەوڵەتو ئەم نیعمەتە بێ زەواڵە بن. لەکۆشکی ساحێبقرانیە لەچواردەهەمی مانگی جمادی الثانی ١٣٢٤ی هیجری لەیانزەهەمین ساڵی سەڵتەنەتی ئێمەدا..))[٤].

ئەم فەرمانە بۆ مەشروتەخوازان بەس نەبو، لەبەرئەوە کۆتاییان بەمانگرتنەکەیان نەهێنا تا شا فەرمانێکی تری بەجۆرە راگەیاند:

((جەنابی ئەشرەف سەدری اعظم

بۆ تەواوکردنی دەسخەتی پێشوی خۆمان لە١٤ی جمادی الثانی ١٣٢٤ کە بەصەریحی ئەمرو فەرمانمان بۆ پێکهێنانی مەجلیسی هەڵبژێردراوی میللەت فەرمو بو سەرلەنوێ بۆ ئەوەی هەمو ئەهالیو ئەفرادی میللەت لە بۆچونی تەواوی هومایۆنیمان ئاگاداربن فەرمانو بریار ئەدەین کە مەجلیسی ناوبراو بەپێی دەسخەتی پێشو بەئاشکرا دابمەزرێ پاش هەڵبژاردنی ئەندامانی مەجلیس بەشەکانی نیزامی مەجلیسی شورای ئیسلامی بەپێی پەسەندکردنو ئیمزای هەڵبژێردراوەکان بەجۆرێ کەشایستەی میللەتو مەملەکەتو قانونەکانی شەرعی موقەددەس پێ رێك بخەن کە بەشەرەفی عەرضو بەئیمزای هومایۆنیمان برازێنرێتەوەو بەپێی نیظامنامەی ناوبراو ئەم ئامانجە پیرۆزە ئەنجام بدرێ..))[٥].

لەپاش بڵاوبونەوەی ئەو فەرمانە ئیتر بو بەشایی‌و زەماوەن. بەست نشینەکان کۆتاییان بەمانگرتن هێنا. دوکان‌و بازاڕ کرایەوە، ئاخوندەکان‌و دەستوپێوەندەکانیان بەسەرکەوتویی لەقومەوە گەڕانەوە تاران.

لە٢٧ی جمادی الثانی‌دا نزیکەی دوهەزار کەس لەئاخوند، دەربارییان، وەزیران، سەرانی بزوتنەوەکەو خەڵکی تر لە(مدرسەی نظام)لەتاران کۆبونەوە بۆ دانانی ئەنجومەنێکی کاتی بۆ ئامادەکردنی((نیزامنامەی ئینتیخابات)).

لە١٩ی رەجەبدا شا((نیزامنامەی ئینتیخابات))ی ئیمزاکرد. ئەم نیزامنامەیە خەڵکی دابەش کرد بو بەسەر ٦چیندا، شازادەکان‌و قاجارییان، عالمەکان‌و طەلەبە، ئەعیان، بازرگانەکان، زەویدارو جوتیار، پیشەوەرەکان.

لەمانگی شوالی هەمان ساڵدا لەتاران هەڵبژاردنی گشتی کرا بو((مەجلیسی شورای میللی)). بۆ تاران ٦٠نوێنەر دیاری کرا بو، ٤ بۆ شازادەکان، ٤ بۆ عولەماو تەلەبە، ١٠بۆ بازرگانەکان، ١٠بۆ زەویدارو جوتیارەکان، ٣٢بۆ پیشەوەرەکان.

لە٢٤ی ذی القعدەی ١٣٢٤دا مەجلیس((قانونی ئەساسی))لە٥٠ ماددەدا دانا شاەو، وەلیعەهد محەمەد عەلی میرزا ئیمزایان کرد. بەمجۆرە ئێران لەرژێمی((شایەتیی ئۆتۆکراتییەوە))بو بەرژێمێکی((شایەتیی دەستوری))پاش ئەوە بەچەند رۆژی مظفرالدین شا مرد. محەمەد عەلی لەجێگەی ببو بەشای ئێران.

ئەو روداوە گرنگانە لەتاران بوبو کەچی شارەکانی تری ئێران کشومات بون. بزوتنەوەی مەشروتە نەگەیشت بوە هیچ کامیان. دەربار نەی ئەویست بتەنێتەوە. ئەی ویست هەر لەتاراندا قەتیس بێ. بەڵام دوای هەڵبژاردنی نوێنەرانی تاران، شاری تەورێزیش راپەڕی، بەسەدان کەس خزانە سەرای کونسولگەی بەریتانیەوە داوایان ئەکرد" مەشروتە ئازەربایجانیش بگرێتەوە. شا موافەقەتی کرد لەوێش جێبەجێ بکرێ. ئیتر شارەکانی تریش دەستیان پێ کرد.

بزوتنەوەی مەشروتە لەسەرەتاوە توشی چەند گیروگرفتێکی دژوار بو. ناکۆکی نێوان مەشروتەخوازان‌و دەربارو کاربەدەستانی زۆردار، ناکۆکی نێوان مەشروتەخوازان‌و ئاخوندە مەشروعەخوازەکان، ئەگەرچی بەریتانیا لایەنگری مەشروتە بو، بگرە دیپلۆماتە بەریتانیەکان خواستەکانی گەلی ئێرانیان گەیاند بەشاو دەربار، بەڵام روسیا بەتوندی دژی مەشروتە بو. سەرباری ئەمانە تورك بەبیانوی کێشەی سنورەوە بەهاودەستی هۆزە کوردەکان لەشکری لەلای بانەو سابڵاخ‌و ورمێوە ناردە کوردستانی ئێران.

لەمانگی ربیع الثانی ١٣٢٥دا مەجلیس قانونی((ئەنجومەنی ئیالەتیو ولایەتی))داناو کردی بە بەشێ لەقانونی ئەساسی. بەگوێرەی ئەم قانونە ئێران ئەبو بەچوار ئیالەت، ئازەربایجان، خۆراسان، فارس، کرمان. هەریەکێ لەم ئیالەتانە((ئەنجومەن))ی هەڵبژێردراوی تایبەتی خۆی ئەبو. شوێنەکانی تریش بەولایەت دانرا بون.

کێشەی نەتەوەیی لەئێران وەکو کێشەی نەتەوەیی لەتورکیا دژوار نەبو یاخود هێشتا وەها نەگەیشت بو. لەکاتێکا دوابەدوای((ئینقیلابی عوسمانی))کێشەی نەتەوەییو دینی لەتورکیا تەقییەوە، لەئێران، ئەگەرچی ئەویش وەکو تورکیا وڵاتێکی فرەنەتەوەیی فرەمەزەب بو کەچی کێشەی نەتەوەییو مەزەبی لەدوای((ئینقیلابی مەشروتە))نەتەقیەوەو، سەرکردەکانی ئینقیلابو کاربەدەستانی دەوڵەت هیچ بەرنامەیەکیان نەبو بۆ جۆری رەفتار لەگەڵ کێشەی نەتەوەیی گەلەکانی ئێرانو کێشەی دینییو مەزەبییان.

بزوتنەوەی مەشروتە دەسکەوتێکی دیموکراتیی بو بۆ هەمو گەلەکانی ئێران، بەڵام گیروگرفتی نەتەوەییو مەزەبی کوردی چارەسەر نەکرد. کورد لەروی نەتەوایەتییەوە جیاواز بو لەنەتەوەی دەسەڵاتداری ئێران، لەروی دینیشەوە زۆرایەتی کورد سوننیو مەزەبی رەسمی دەوڵەت شیعە بو. کورد لەهەردو روەوە هەستی بەزۆرلێکراوی ئەکرد. هەر ئەوەش بو زەمینەی بۆ شۆڕش لەناو کوردا خۆش ئەکرد. لەدابەشکردنی ئێراندا بەچوار ئیالەت، ئەکرا وەکو جۆری لەچارەسەر کردنی کێشەی نەتەوەییو مەزەبیی کورد، هەمو ناوچە کوردنشینەکان بکرایەتە ئیالەتی پێنجەمو هەندێ دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی هەبوایە.

### ٢/١رێکەوتنی ١٩٠٧ی ئەنگلۆ- روسی

قەرنێ زیاتر بو ستراتیجی روسیو بەریتانی بەرامبەر ئێران ناکۆك و ناساز بو. روسیا ئەی ویست ئێران هەڵ لوشێو چەندین ناوچەی فراوانی بەشێنەییو لەچەند شەرێ یەك لەدوای یەکدا لێ داگیر کرد بو. بەریتانیاش ئەی ویست دەوڵەتی ئێران وەکو لەمپەرێ لەنێوان نفوزی ئەوو دەسەلاتی روسو لەنێوان روسیاو ئاوە گەرمەکاندا بمێنێ. سەرەنجام هەردوکیان لەتاو مەترسی پەرەسەندنی ئاڵمان پێکهاتن کێشە دێرینەکانیان دەربارەی تیبەت، ئەفغانستانو ئێران بەلادا بخەن. لە٣١ی ئابی ١٩٠٧دا رێکەوتنێکیان لەو بارەیەوە ئیمزا کرد.

لەپێشەکی ئەم رێکەوتنەدا نوسرا بو:

((لەبەر ئەوەی دەوڵەتانی بەریتانیاو روسیا، بەجوتە پاراستنی سەربەخۆییو یەکێتی ئەرزی ئێرانیان گرتۆتە ئەستۆ"

لەبەرئــەوەی هــەردوکیان، بەڕاســتی ئــارەزوی پارێزگــاری ئــارام و ئاســایش لەسەرانسەری خاکی ئەم وڵاتەداو، جێگیربونی هەمیشەیی ئیمتیـازاتی وەکـو یـەك بۆ بازرگانیو پیشەسازی هەمو گەلانی تر لەم بەشەی جیهاندا ئەکەن.

لەبەرئەوەی کە هەریەکێ لەم دو دەوڵەتە، سەبارەت بەهۆی جوگرافیو ئابوری، بایەخێکی تایبەتیان بەپاراستنی ئارامو ئاسایش لەهەندێ لەئیالەتەکانی ئێراندا هەیـە. کەهاوسێی دورو نزیکـی روسـیا یـا بـەریتانیای گـەورەن(لـەلای سـنوری ئەفغانسـتانو بلوجسـتانەوە). هـەروەها لەبەرئـەوەی هـەردو دەوڵـەت(بـەریتانیای گەورەو ئیمپراتۆری روسیا)ئەیانەوێ خۆیـان دوربگـرن لەهـەمو جۆرە هۆیـەك کـە لەوانەیە ببێتە هۆی پێکدادانی بەرژەوەندی تایبەتییان لەو ئیالەتانەدا کە لەسـەرەوە باس کران بۆیە لەسەر ئەم مادەو مەرجانەی خوارەوە پێك هاتن:

م١ دەوڵـەتی بـەریتانیای گـەورە گفـت ئـەدا لـەودیو هێڵێکـەوە کـە لەقەسـری شیرینەوە تا ئەسفەهانو یەزدو خاف درێژ ئەبێتەوە، لـەکۆتاییدا بەنوقتەیـەك ئـەگا کەکەوتۆتە شـوێنی تقـاطعی خطـوطی سـنوری روسو ئـەفغان، داوای هـیچ جۆرە ئیمتیازی سیاسیو بازرگانی-وەکو ئیمتیـازی رێگـەی ئاسـنین، بانـك، تـەلگراف، شـارێ، گوێزانــەوە، بیمــە، شـتی تـر- بـۆ خـۆیو، هاووڵاتییــەکانی خـۆی، یـا هاووڵاتیانی دەوڵەتی سێیەم نەکات، لەهەمان کاتـدا هـیچ جۆرە بەرهەڵسـتیەکی وەرگرتنی ئەم جـۆرە ئیمتیازانـە لەلایـەن دەوڵـەتی روسـیەوە لەناوچـەی نـاوبراودا، راستەوخۆ یا ناڕاستەو، دەرنەبڕێ.

م٢ دەوڵەتی روسیاش گفت ئەدا کە لەو ناوچەیەدا کەوتۆتـە ئـەودیو هێڵێکـەوە کـە لەسـنوری ئەفغانسـتانەوە لەگزێکـەوە دەس پـێ ئـەکا بەبیرجنـدو کرمـان تـێ ئەپـەڕێو لەبەنـدەر عـەباس کۆتـایی دێ، داوای هـیچ جـۆرە ئیمتیـازی سیاسـیو، بازرگانی- وەکو رێگەی ئاسنین، بانك، تەلگراف، شارێ، گوێزانەوە، بیمەو هیتر- بۆخۆیو، هاووڵاتیانی خۆی، یا هاووڵاتیانی دەوڵەتی سێیەم نەکات. وە لەبەرامبەر وەرگرتنی ئەم چەشنە ئیمتیازاتە لەلایەن دەوڵەتی ئینگلیزەوە، لەناوچەی نـاوبراودا هیچ جۆرە بەرهەڵستیەك، راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، پیشان نەدا.

م٣ دەوڵەتی روسیا بەڵێن ئەدا کە بەبێ رێککەوتنی پێشەکی لەگەڵ بەریتانیای گــەورە، هــیچ جــۆرە موخالەفەیــەکی دژی دانــی ئیمتیــاز بــەهاووڵاتییانی بەریتانی(بەهـەر شـێوەیەك بـێ) لـەو ناوچـەیەدا، کـە لـەنێوان ناوچـەکانی نفـوزی هەردولا دایە(ناوچەی بێلایەن)دەرنەبڕێ.

دەوڵەتی بەریتانیای گـەورەش لـەلای خۆیـەوە بـەڵێن ئـەدا کەهـەمان مـاف بـۆ هاووڵاتیانی روسی کەئیمتیازاتیان لەناوچەی بێلایەندا ئەوێ بسەلمێنێ.

هەر جۆرە ئیمتیازێ کە دەوڵەتانی روسیاو بەریتانیا، یا هاووڵاتیەکانیان، لەرابردودا لەناوچەکانی ١و٢(ناوچەکانی نفوزی روسیو بەریتانی)هەیانە، بەهەمان هێزو کاریگەریی پێشو ماوە)).

ئەو مەڵبەندو شارانەی بەگوێرەی ئەم پێکهاتنە ئەکەوتە ناوچەی نفوزی روسیەوە بریتی بو لە: قەسری شیرین، کوردستان، کرماشان، هەمو ئازەربایجان(بەناوچە کورد نشینەکانەوە)، خۆراسان، گورگان، مازندەران،گەیلان، ئەراك، قوم، ساوە، یەزد، نائین، ئەسفەهان، بروجرد، تاران، قەزوین، زەنجان، هەمەدان.

ئەوانەش کە ئەکەوتنە ناوچەی ئینگلیزیەوە بریتی بون لە: کرمان، سیستان، بلوجستان، چابەهار، وناوچەکانی تەنگەی هورمز، بەندەر عەباس.

ئەوانەش کە ئەکەوتنە ناوچەی بێلایەن، لەنێوان ناوچەی نفوزی هەردو دەوڵەتدا، بریتی بون لەقاینات، خوزستان، فارس، لورستان، بەختیاری، چوار مەحال، بوشەهر[٦].

ئەگەرچی ئەم پەیمانە رقو تورەبونی ئازادیخوازانی هەستان، بەڵام روسیە لە١٩١١ەوە هێزەکانی خۆی ناردە ولایەتەکانی شیمالی ئێرانو دەیان کونسولگەو ناوەندی بازرگانی دامەزراندو، هاوڵاتییەکانی کەوتنە کاری بازرگانی. بەریتانیاش هێزی ناردە جنوبی ئێران.

### ٣/١ پرۆژەی دابەش کردنی ئێران

کەجەنگی جیهانی هەڵ گیرسا ئێران بێلایەنی راگەیاند. بەڵام ئەوەندە لاواز بو هیچ لایەکی شەڕ رێزی بێلایەنی ئێرانی نەگرتو، شوێنی جوگرافیشی وەها بۆ کەوت بوە بەینی لایەنەکانی شەڕەوە. لەبەرئەوە بەشێکی فراوانی بو بەمەیدانی لەشکرکێشی تورکی، روسی و ئینگلیزی. بارەگای هێزی بێگانەی تێدا بو. هەردولای جەنگ هەوڵێکی زۆریاندا بۆ تێوەگلاندنی ئێران، هەرلایە، بەقازانجی خۆی. بەڵام حکومەتی ئێرانی سەرەڕای گۆڕانی چەند جارێ وەزارەتەکانی هەر بەبێلایەنی راوەستا تا برانەوەی شەڕ.

دەوڵەتانی ئەوروپی کە لەسەر دابەش کردنەوەی جیهان بەشەڕ هاتبون، لەساڵانی جەنگدا ژێر بەژێر زنجیرەیەك پەیمانی نهێنییان بۆ ئەو مەبەستە بەست بو، هەروەك لەسەر جۆری دابەش کردنی قەڵەمڕەوی تورك پێك هاتن، لەسەر دیاری کردنی چارەنوسی ئێرانیش رێك کەوتن.

لەو نامانەدا کە لەمانگەکانی مارتو نیسانی ١٩١٥دا لەنێوان پیتەر بورگ، لەندەنو پاریسدا گۆڕدرایەوەو بە((رێکەوتنی ئەستەمول)ناو ئەبرێ هەندێ دەسکاری رێکەوتنی ١٩٠٧ی ئەنگلۆ- روسی بەجۆرە کرا:

ا-روسيا ملی‌دا بۆ ئەوەی ناوچەی بێلایەن بخرێتە سەر ناوچەی نفوزی بەریتانی.

ب-لەبەرامبەر ئەوەدا بەریتانیاش ملی‌دا ٣ گۆڕینی بەقازانجی روسیا تیّ‌دا بکرێ" یەکەمیان، ئەو شوێنانەی هاوسێی شارەکانی ئەسفەهان‌و یەزدن بخرێنە سەر ناوچەی روسی. دوەمیان، بەشێکی رۆژهەلاتی دوری ناوچەی بێلایەن کەهاوسێی ئەرزی ئەفغانیە بخرێتە سەر ناوچەی روسی. سێیەمیان، روسیا ئازادی تەواوی کاری هەبێ لەناوچەی نفوزی خۆی‌دا. بەواتەیەکی تر روسیا موافەقەتی هاوپەیمانەکانی خۆی وەرگرت بۆ داگیرکردنی بەشەکەی خۆی لەئێران.

شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ی روسیە، هەمو نەخشەو پلانەکانی روسیاو بەریتانیاو فەرەنسای تێکدا. ئێرانی لەهەلوەشان‌و دابەش بون رزگار کرد. بەلکو بەهێزکردنی حکومەتی ئێران‌و پاراستنی سەربەخۆیی لەدەسەلاتی هێزە ئیمپریالیستەکان بو بە بەشێکی سیاسەتی نوێی سۆڤیێتی لەناوچەکەدا. روسیای سۆڤیێتی قازانجی لەوەدا نەبو ئێران لاواز بێ، یا پارچە بێ بکەوێتە دەس بەریتانیا یا هەر دوژمنێکی تری، بەلکو قازانجی لەوەدا بو کەسەربەخۆو بەهێز بێ‌و بەری نفوزی بەریتانی، فەرەنسی، ئەمریکی بگرێ.

سەرکردەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەرۆژانی یەکەمەوە، هەمو پەیمانە نهێنی‌و ئاشکراکانی نێوان روسیەو دەولەتەکانی تری ئاشکرا کردو هەل وەشاندەوە. شەڕی لەگەل تورك راگرت. هێزەکانی خۆی لەئێران کێشایەوە، بەلێنی‌دا بەئێران کەدەس لەهەمو قەرزو ئیمتیازەکانی سەردەمی قەیسەر هەل بگرێ. گۆڕانی بنەڕەتی سیاسەتی روسی لەناوچەکەدا راستەوخۆ کاری کردە سەر پاشەڕۆژی سیاسی نەتەوەکانی ناوچەکە، بەتایبەتی ئەرمەنی‌و ئاسوری‌و کوردو ئازەری.

گرنگی ئێران وەکو دراوسێی هاوسنوری روسیای سۆڤیێتی، وەکو لەستراتیجی روسیای سۆڤیێتی‌دا زیادی کرد، هەر بەو پێیە لەستراتیجی بەریتانی‌و هەمو دەولەتانی ئیمپریالیستی‌دا زیادی کرد. بەریتانیا کەئیتر، بەهۆی لێ دەرچونی روسیاوە، نەی ئەتوانی رێکەوتنی ١٩٠٧و ١٩١٥ دەربارەی دابەش کردنی ئێران جێبەجێ بکا، ئەیویست رێکەوتنێکی تر بەسەر ئێراندا بسەپێنێ. بەکردەوە بیخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

## ٤/١ بۆچونی ئێران بۆ چارەی کێشەی کورد

دوا بەدوای راگرتنی جەنگ مەسەلەی کورد وەکو مەسەلەیەکی سیاسی دیار هاتە ناوانەوە. لەکوردستانی جنوبی بەپشتیوانی بەریتانیا دەسەلاتێکی کورد کەپایتەختەکەی سلێمانی بو دامەزرا. شێخ محمود بو بەحوکمداری کوردستان. هەندێ لەسەرۆکی هۆزەکانی کوردستانی ئێران هاودەنگ‌و هاوکار بون لەگەل

شێخ محمود. لەتورکیا((جەمعییەتی تەعالی کوردستان))بۆ بەسەربەخۆیی کوردستان کەوت بوە چالاکیو گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرانی هاوپەیمانەکانو بابیعالی لەئەستەمول لەگەڵ کۆنفرەنسی ئاشتی لەپاریس. سمکۆ دەستی بەسەر ناوچەیەکی فراوانی سەروی رۆژئاوای ئێراندا گرت بو. رۆژ بەرۆژ دەسەڵاتی زیادتر ئەبو. نیشتمانپەروەرانی کورد لەئەستەمولو پاریسو سلێمانی بەهیوا بون دەوڵەتی کورد لەهەمو بەشەکانی کوردستاندا دابمەزرێ. ئاواتی نەتەوەیی خۆیان لەگفتوگۆکانیاندا بەئاشکرا ئەدرکانو لای کەس نەیان ئەشاردەوە.

چەند ملیۆن کورد لەئێران ئەژیانو، سەرزەمینێکی فراوانی کوردستان لەسەر ئێران بو، لەبەرئەوە هەمو چالاکیەکی کوردی کاری تێ ئەکرد. دەربارو، کاربەدەستانی تری ئێران هیچ بەرنامەیەکیان بۆ کێشەی نەتەوەیی گەلانی ئێران نەبو. تەنانەت هیچ کام لەئەندامانی((مەجلیسی شورای میللی))هیچ کات ئەو باسەیان نەهێناوەتە کایەوە. لەو سەردەمەدا کەمەسەلەی کورد بەو گەرمیە هات بوە پێشەوە کاربەدەستانی ئێرانی لەبیری ئەوەدا بون کێشەی کورد لەناوچەکەدا بەوە چارە بکرێ، کوردستانی عوسمانیش بخرێتە سەر ئێران.

ئێران بەهۆی شۆرشی ئۆکتۆبەری لەهەلوەشانو دابەش بون رزگاری بو. تورکیای تێکشکاو لەمەترسی هەلوەشانو دابەش بوندا بو. دەوڵەتە براوەکان خەریکی گونجاندنی رێکەوتنە نهێنیەکانی سەردەمی جەنگو جۆری دابەشکردنی قەڵەمرەوی عوسمانیدا بون. دەرباری ئێرانی چاوی بریبوە ئەوەی بەپشتیوانی بەریتانیا لەکۆنفرەنسی ئاشتی پاریسدا دەسکاری سنوری سەرویو لای رۆژئاوای بکرێ بەجۆرێك کەتورکستانو کوردستان بکەوێتە سەر ئێران.

لەدەوروبەری بەستنی قەراردادی ۱۹۱۹دا کاربەدەستانی ئێرانی ئەم کەڵکەڵەیەیان کەوت بوە سەر بەهیوا بون بەریتانیا لەپاداشتی قوبوڵ کردنی ئەو قەراردادەدا، پشتیوانی لەئێران بکا ئەو خواستانە بخاتە بەردەمی کۆنفرەنسی ئاشتی. سێر پرسی کوکس لەباتی حکومەتی بەریتانی لەپاشکۆیەکی قەراردادەکەدا گفتی پێدا بون. نصرت الدولە، وەزیری دەرەوەی ئێران، لەسەردانەکانی لەندەنو پاریسیدا کەوتە پەیجوری ئەم مەسەلەیە.

نصرت الدولە لەسەردانی لورد کێرزندا بەراشکاوی دەربارەی ئەو مەسەلەیە دواوە. کێرزن لەنامەیەکی ۲۵ی ئۆکتۆبەری ۱۹۱۹دا نوسیوێتی:

((وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران، شازادە نصرت الدولە، لەسەردانی ئەم دواییەی لەندەنیدا ،لە شانزەهەمینی هەمان مانگدا هاتە وەزارەتی کاروباری دەرەوەو دەری بری کەدوای هاتنەوەی بۆ لەندەن- لەگەڵ شا- بێگومان ئەتوانێ

دەربارەی چاکردنی هێڵەکانی سنوری ئێران.. لەگەڵ من گفتوگۆو ئاڵوگۆڕی بیروڕا بکا...

١-پایەبەرز لەو دانیشتنەدا دەری بڕی کە بۆ ئاسان کردنی کاری دەوڵەتی ئێران، یەکجار زۆر بەسود ئەبێ ئەگەر دەوڵەتی بەریتانیا پێشەکی باری سەرنجی خۆی دەربارەی دۆخی داهاتوی ئەم دو ناوچەیە:

ا-تورکستان

ب-کوردستان

کەهەردوکیان لەگەڵ ئێران سنوری هاوبەشیان هەیە رون بکاتەوە.

٣-لەبابەت کوردستانەوە، پایەبەرز رای گەیاند بەرای ئەو هەڵەیەکی گەورەیە کەپیاو باسی کوردستانی ئێران یا کوردستانی تورکیا بکات چونکە بەڕاستی تەنیا یەك کوردستان هەیە. بۆیە هەر جۆرە خەتێکی بەاصطلاح سنور لەنێوان ئەم دو ئیالەتەدا بکێشرێ خەتێکی بەتەواوی مەوهوم ئەبێ. شازادە لەناو قسەکانیدا، ئەمەشی وت کەئەگەر حکومەتی بەریتانیا بەرەسمی رای ئەگەیەنێ کە لەروانگەی سیاسەتی ناوچەیی ئەوانە شتێکی تر جگە لەمە- قبوڵ کردنی بونی یەك کوردستان-قابیلی قوبوڵ نیە، ئەوسا ئەو وحکومەتی ئێران هەردوکیان ئامادەن عەزروحاڵی داهاتوی وڵاتەکەیان بەجۆرێ رێك بخەن کەبەتەواوی لەگەڵ باری سەرنجی حکومەتی بەریتانیا بگونجێ بەو مەرجەی کەقسەو نفوزی دەوڵەتی ئێران لەم یەك ناوچەیەدا لەپلەی یەکەمیندا بێ...)).

لە١٣ی نۆڤمبری ١٩١٩دا نصرت الدولە سەردانێکی تری کیرزنی کرد. لەم دیدەنیەدا یادداشتێکی درێژ دەربارەی خواستە ئەرزیەکانی ئێران‌و نەخشەیەکی شوێنە داواکراوەکانی پێشکەش کرد[٧].

لورد کیرزن لەنامەیەکدا کەبۆ سێر پرسی کوکسی نوسیوە لە١٣ی نوڤمبەری ١٩١٩ دەربارەی ئەم یادداشت‌و گفتوگۆیە ئەڵێ:

((..پێشنیاری یەکەمی نصرت الدولە پێوەندی بەدەسکاری هێڵی سنوری ئێران لەلای رۆژئاوای ئەو وڵاتەوە هەبو کەئەبو بەشێکی گەورە لەخاکی کوردستانی عوسمانی ببڕدرێ‌و بخرێتە سەر کوردستانی ئێران. نوقتەی دەسپێکرنی ئەم دەسکاریە، رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ بو کەداوێنی ئەگەیشتە دڵ‌و ناوەندی کوردستانی عوسمانی))[٨].

نصرت الدولە لەیادداشتێکی رەسمیدا کە دابوی بەلۆرد کیرزن وەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا، داوای کردبو، بەریتانیا لەکۆنفرەنسی ئاشتیدا

پشتیوانی لەئێران بکا بۆ ئەوەی بەشێکی فراوانی ئەرزی کوردستانی عوسمانی بخرێتە سەر ئێران[9].

لەنامەیەکی تری نصرت الدولەدا کەئەیەوێ خواستەکانی ئێران بەلۆرد کیرزن بسەلمێنێ سەبارەت بەکورد نوسیویەتی:

((...کورد بەسەر ژمارەیەکی زۆر ئێلاتو عەشایەری بومیدا دابەش بون. هەموویان حەسودی بەیەك ئەبەنو چاویان بڕیوەتە یەکتری. ئەم قەومانەی کورد هەرگیز لەرابردودا میللەتێکیان پێك نەهێناوەو، دورە لەداهاتوشدا بتوانن ئەم ئیمکانەیان هەبێ یا ئەوەی لەناو یەك یەکێتی سیاسیدا پێك بێن. گەڕانەوەی ئەم ناوچە کوردنشینانە بۆ ئێران، واتە ولاتێك کەنفوزی لەناو عەشایەری کوردا کاریگەرو هێزێکی هەست پێ کراوی هەبو، شوێنەوارو ئەنجامی باشی خۆی لەباش کردنی روحیاتی ئەو کوردانەی کە لەناوچەکانی موکری، گەروس، سەحنە نیشتەجێ بون بەجۆرێکی ئاشکرا نیشانی داوە، خۆی ئەتوانێ رێگەیەکی چارەسەرکردنی ئەم کێشە دژوارە بێ. بەتایبەتی لەم روەوە زۆر لەقەومو عەشایەری کورد ئێستە لەسەرانسەری ئێران زەمیندا بلاوبونەتەوە. کورد هەرگیز ناچنە ژێر دەسەلاتی ئەرمەنیەوە. بەپێچەوانەوە. یەکێتی نەژادو مەزهەبو زمانو، پێوەندیەك کە لەم ۳ رێگایەوە لەگەڵ ئێران هەیانە، ئەوانە هەر لەخۆوە لەئێران نزیك ئەکاتەوە))[10].

لۆرد کیرزن، سەبارەت بەمەسەلەی کورد، لەوەلامی یادداشتەکانی ئێراندا، لەنامەیەکی ۲۸ی نۆڤەمبەری ۱۹۱۹دا بۆ سیر پرسی کوکسی نوسیوە ئەڵێ:

((...بەپێی ئەو زانیاریانەی بەئێمە گەیشتون، هەمو شاخەکانی دەوروبەری ورمێ لەژێر دەسەلاتی جەردەی کورد بەناوی سمکۆ دایە کەخەریکی تالانی هەمیشەییە لەناو سنورەکانی ئێرانداو، هەر بەلایەکی بیەوێ ئەتوانێ بەسەر دانیشتوانی ئەم مەڵبەندەی بهێنێ. لەهەلومەرجێکی وەهادا کەدەوڵەتی ئێران تەنانەت لەو بەشەی کوردستاندا کەماڵی خۆیەتی ناتوانێ ئاسایش جێگیر بکا، سەرم سوڕماوە کەحضرت والا چۆن کتوپڕ کەوتۆتە سەر ئەم بیرە، قەڵەمڕەوی ئەرزی ئێران بۆ ناو کوردستانی تورکیا فراوان بکا. لەم روەوەیە کەلام وانیە تەنانەت دورنمای یەکخستنی ئێلە کوردەکانی کە لەهەردو دیوی سنوری ئێستەدا ئەژین. ئەوەندە بۆ کوردانی عوسمانی جازیەی هەبێ کەبیانەوێ لەگەڵ برایانی ئێرانی خۆیاندا کۆمەڵێکی یەکگرتو لەژێر دەسەلاتو حکومەتی ئێراندا دروست بکەن))[11].

### ٥/١ قەراردادی ١٩١٩ی ئەنگلۆ-ئێرانی

لـۆرد کـیرزن وەزیـری کاروبـاری دەرەوەی بـەریتانیا، دامەزرانـدنی زنجـیرەی لـە((وڵاتـانی لەمـپەر))کـە روسـیای سۆڤیتی لەهینـد جیـا بکاتـەوە، بەڵام هـیچ کامیان لـەژێر دەسـەڵات یـا نفـوزی روسـیدا نـەبێ، کـرد بـو بەیـەکێ لەکۆڵەکـە سەرەکییەکانی سیاسەتی((پاراستنی هینـد)) ئێرانـی بـەگرنگ تـرینو لەهـەمان کاتـدا بـەلاوازترین ئەڵقـەی ئـەم زنجـیرەدا ئـەنا کەئـەبو لەمەترسـی هـەمو جـۆرە دەسدرێژیەك بپارێزرێ.

لەسـەردەمی جـەنگدا سـوپاکانی روسـیو ئینگلیـزی ئێرانیـان لەتـەماعی ئەڵمانیو تورکی پاراست. دوای تەواو بونی جـەنگو تێکشـکانی تـورکو ئاڵمـانو دەرچونی روس لەجەنگ هەمو شـوێنە گرنگـەکانی ئێـران لـەژێر دەسـتی سـوپای ئینگلیزیدا بو.

پـاش جـەنگ گـەلی بـەریتانی داوای گەڕانـەوەی رۆڵـەکانیان ئـەکرد لەشـوێنە دورەکانەوە بۆ وڵات، جگە لەوەش خەرجی راگرتنی هێزی سوپایی گەورە لـەدەرەوە بوبو بەبارێکی گران بەسەر شانی باجدەری بەریتانیـەوە. بـۆ حکومـەتی بـەریتانی کارێکی ئاسان نەبو، بۆ پاراستنی ئەو سەرزەمینە فراوانـەی لەسەرانسـەری دنیـادا لەژێر دەستو نفوزیدا بون، هێزو مەسـرەف تـەرخان بکـا. بۆیـە ئـەبو چـارەی تـر بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی هەم ئەو شوێنانە لەدەس نەداو، هەم نەبێتە بارگرانیو نارەزایی گەلی بەریتانی. یـەکێ لـەو چـارانە گرێـدانی ئـەو وڵاتانـە بـو بەخۆیـەوە بەپـەیمانی سیاسـی، سـوپاییو ئـابوری. لەرێگـەی دانـانی راوێـژکاری ئینگلیزیـەوە بـۆ سەرپەرشتیو چاودێری وەزارەتو دامەزراوو دەزگا گرنگەکانی ئـەو دەوڵەتانـە، بـە خەرجی خۆیان، بۆ پارێزگاری نفوزو دەسەڵاتو بەرژەوەندییەکانی خۆی.

لەنێوان وثوق الدولەی سەر وەزیرانی ئێرانو وەزیری موختـاری بـەریتانی سـیر پرسی کوکسدا زنجیرەیەك گفتوگۆ کرا بەئیمزا کردنی رێکەوتنی ٩ی ئوتی ١٩١٩ تەواو بو.

ئەم رێکەوتنە پێك هات بو، لەدو بەشـی سـەربەخۆو چـەند پاشـکۆیەك. بەشـی یەکەمی بەناوی((قـرارداد نیزامـیو سیاسـی میـان ئیرانو بریتانیـا))بریتـی بـو لەدیباچەیەكو ٦ مـادە. بەشی دوەمی بەناوی((قەراردادی مـالی))بریتـی بـو لـە٤ مادە[١٢].

ئـەم رێکەوتنـە کاروبـاری سیاسـیو سـوپاییو دارایـیو فەرهـەنگیو بەڕێوەبەرایـەتی ئێرانـی لـەرێگای ئـەو راوێژکارە ئینگلیزانـەوە کـە لـەوەزارەتو دامەزراوەکانی ترا دائەنران بەکردەوە ئەخستە ژێر دەستی بەریتانیاوە.

لۆرد کیرزن لەو راپۆرتەدا کە لەرۆژی ئیمزا کردنی قەرارادەکەدا پێشکەشی کابینەی لوید جۆرجی کرد، نوسیوێتی:

((ئەگەر کەسێ بپرسێ ئەبێ بۆچی ئێمە قبوڵی مەسئولیەتێکی وا قورس بکەین لەئێران‌و بۆچی لەم وڵاتە پەرپوتە نەگەڕێین بەخێرایی بەرەو لەناوچونی ئەفسانەیی خۆی نزیک بێتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە حاڵی حازر بەسەرنجدانی هەڵکەوتی جوگرافی ئێران‌و گەورەیی بەرژەوەندییەکانی ئێمە لەم وڵاتەدا، هەروەها بەسەرنجدانی ئاسایشی داهاتوی ئیمپراتۆریی ئێمە لەرۆژهەڵات، لێگەڕانی ئەم وڵاتە بەحاڵی خۆی بەکردەوە لەتوانادا نیە، هەروەکو لەماوەی پەنجا ساڵی رابوردو لەتوانادا نەبو. بەریتانیا ناتوانێ خۆی لەهەلومەرجی ئێران کەنار بگرێ‌و گوێ نەداتە ئەو روداوانەی کە لەم وڵاتەدا ئەقەومێن. سەرەڕای ئەوانەش، ئێستا کەئێمە خەریکی قوبوڵ کردنی مەسئولیەتێکی نوێین-ئینتیداب لەمیزۆپۆتامیا-و ئەو مەسئولیەتەش ئێمە لەلای رۆژئاواوە ئەکاتە هاوسنوری ئێران، ئیتر بەهیچ جۆرێ ناتوانین رێگە بدەین لەمەڵبەندێکی وا ناسکدا کە کەوتۆتە نێوان سنوری ئیمپراتۆریی ئێمە لەهیندو سنورەکانی دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراق، بۆشاییەك دروست ببێ بەهۆی خراپی حکومەتەوە ببێتە جێگایەکی لەبار بۆ پیلانگێڕانی دەوڵەتان، ئاژاوەی سیاسی، پشێوی ماڵی.

سەرەڕای ئەوانە ئەگەر وابڕیار بێ کەئێران تەنیاو بێکەس بەرەڵڵا بکرێ، بەدەیان دەلیلی پتەو ئەو ترسە هەیە کەلێشاوی نفوزی بولشەویزم کە لەسنورەکانی لای سەروی ئەم وڵاتەوە هەڵ ئەقوڵێ سەرەنجام سەرانسەری ئێران بگرێتەوە. لەکۆتاییدا، دوایین دەلیل هۆی هەڵ گرتنی مەسئولیەتی ئێمە لەئێران ئەوەیە کەئێمە لەگۆشەی خواروی رۆژئاوای ئەم وڵاتەدا خاوەنی سەرمایەو قازانجی گەورەین وەکو بیرە نەوتەکانی کەسوتەمەنی هێزی دەریایی بەریتانیا لەوێ دابین ئەکرێ‌و ئەمەش جۆری لەگرنگی ناناسایی بەدەوری ئێمە لەم شوێنەی جیهاندا ئەبەخشێ[١٢].

ئامانجی ئینگلیز لەم قەرارادە زۆری لەقسەکانی کیرزندا رون کراوەتەوە. ئەو ئەرکەش کەئەکەوتە سەر حکومەتی بەریتانی بەگوێرەی بەندەکانی ئەم قەرارادە ئەبو سەرلەنوێ((ئەرتەش))ی ئێران نوێ بکەنەوە، باری دارایی‌و ئابوری وڵات رێك بخەنەوە، زنجیرەیەك چاکردن لەکاروباری بەڕێوەبەرایەتیدا بەدی بهێنن‌و دو ملیۆن پاوەنی ئیستەرلینی بەقەرز بدەن بەحکومەتی ئێران.

لەلایەنی ئێرانەوە ئەوی ئەم قەرارادەی بەست بو. وثوق الدولەی سەر وەزیرو، شازادە فیروز میرزا نصرت الدولەی وەزیری کاروباری دەرەوەو، شازادە اکبەر میرزا

صارم الدولە وەزیری دارایی بون. لەنرخی قوبولّ کردنی ئەم پەیمانە قورسە نابەرامبەرەی سەربەخۆیی ئێرانی ئەبەستەوە" یەکەمیان ٢٠٠ هەزار تومان و، دوەم و سێیەمیان هەریەکەیان ١٠٠ هەزار تومان بەرتیلیان لەکاربەدەستانی ئینگلیزی وەرگرت بو[14]. هەروەها بەریتانیا بەلّێنی بەئەحمەد شاو هەر ٣ وەزیردا بو ئەگەر لەئەنجامی جێبەجێ کردنی ئەم رێکەوتنەدا شۆرش لەئێران هەلّ گیرسا، بەریتانیا لەیەکێ لەولاّتانی ژێردەستیدا مافی پەنادانی سیاسییان بداتێ.

ئەمانە جگە لەو دەسکەوتە تایبەتیە بۆ خۆیان، بەلّێنی پشتیوانی هەندێ خواستی ئێرانی پێدا بون" چاوگێرانەوە بەو رێککەوتنە کارپێ کراوانەی نێوان هەردولا، داوای بژاردنی ئەو زەرەرانەی بەهۆی هەندێ دەولّەتەوە لەکاتی شەردا لێی کەوتوە. دەسکاری هەندێ لەسنورەکانی سەروی و لای رۆژئاوای بەقازانجی ئێران[15].

ئازادیخوازانی ئێران بەگشتی دژی ئەم پەیمانە راوەستان. سەرەرای روسیای سۆڤیێتی کە بەتوندی دژی ئەمە بو چونکە نفوزی ئینگلیزی ئەهێنایە سەر سنوری خواروی، ئەمریکاو فەرەنسەش پێیان خۆش نەبو.

ئەم قەرارادادە هەمان پەیمانە کە مس بیل پێی وایە دوای بەستنی ئیتر سمکۆ هیچ هیوایەکی بەپشتیوانی ئینگلیز نەما لەتەقەلاکانی کورد بۆ پێکهێنانی جۆرێ لەیەکێتی نەتەوایەتی لەنێوان کوردەکانی ئێران و عیراق و تورکیا[16].

## ٢-دەرکەوتنی سمکۆ

### ١/٢ پێشینەی مێژویی هۆزی شوکاک

ئێلی شوکاک لەدوای کارەساتی دمدم، جێگیربونی عەجەم لەرۆژئاوای گۆمی ورمێ، رۆلّێکی دیاری لەرووداوەکانی ناوچەکەدا دیار نیە. ئێلی شوقاقی کەبەشێکی راگوێزراوە بۆ خۆراسان و بەشێکی لەژوروی تەورێزدا ماونەوە، لەگەلّ شوکاک یەك ئێل بون یا نە، دیار نیە، چونکە هیچ لێکۆلّینەوەیەك لەو روەوە نەکراوە.

بۆ یەکەمین جار کەناوی ئێلی شوکاك لەرووداوەکانی ناوچەکەدا بەزەقی هاتۆتە ناوان لەکۆتایی سەدەی دوانزەو سەرەتای سەدەی سیانزەهەمی کۆچیدا بو. ئیسماعیل ئاغای سەرخێلی شکەفتی وەکو مەزنی شوکاك لە لەشکرکێشییەکانی عەباس میرزای نائب السلطنەدا بۆ سەر خاکی عوسمانی خزمەتی دیاری کردوە هەروەها لەهێرشەکانی عەجەمدا بۆ تەمێ کردنی ئێلە کوردەکان ئەمیشیان لەگەلّ بو. ئیسماعیل ئاغاو شەرکەرەکانی لەو هێرشە گەورەیەدا کەسوپاکانی ئەفشاری ورمێ و موقەددەمی مەراغە بۆ لەناوبردنی ئێلی بلباس لەبناری قەندیل

کردیان(١٢١٦)ئەم چەرخەچی لەشکرەکەیان بوەو، لەو هێرشەدا کەعەجەم بۆ تەمێ کردنی میری رەواندوز بۆ سەر سیدەکان کردیان(١٢٣١)ئیسماعیل ئاغاو شەرکەرەکانی پێشڕەوی لەشکری عەجەم بون. ئەبێ ئیسماعیل ئاغا تێکەڵاوی زۆریی لەگەڵ پەیدا کردبن چونکە کچی خۆیدا بو بەفرج الله خانی کوڕە گەورەی عەسکەر خانی بەگلەربەگی ئەفشار.

ئیسماعیل ئاغا لەسەر لوتکەی چیای بنابی نازلو قەلایەکی دروست کرد بو. لەو سەردەمەدا ئێران بەگشتیی‌و شوێنەکانی سەر بەئازەربایجان لەژێر باری گرانی باجی دەوڵەتی‌دا ئەیان نالاَن. هەم ئەبوایە پارەیەکی زۆر بۆ روسیەی براوە لەباتی بژاردنی زەرەری جەنگ کۆبکەنەوەو، هەم شازادەو کاربەدەستەکانی عەجەم ئەیان ویست خۆیان دەوڵەمەن بکەن‌و زەویوزاری خەڵك داگیر بکەن. دڵسۆزیی ئاغا بۆ دەزگای حوکمڕانی عەجەم‌و بەشداربونی لەشەڕو لەشکرکێشییەکانی‌دا، هەروەها خزمایەتیشی لەگەڵ عەسکەرخان، یەکێك لەهەرە دەسەلاتدارەکانی ئەو زەمانە، کەهەم لەگفتوگۆکانی ئێرانی-روسی‌دا وەکو یەکێکی دەستەی نوێنەرانی ئێران بەشدار بو، هەم بەسەفیری دەرباری قاجاریش جارێك نێردرا بوە پاریس بۆ لای ناپلیۆن، ئەویش دادی نەدا.

لەسەر باج‌و زەویانە ئیسماعیل ئاغا لەقەلاکەی خۆی‌دا ناچار بو مان بگرێ، بەلاَم عەسکەرخان، بەکەمەندی تەگبیر نە بەجەنگ‌و پێکادان، واتە بە تەفرە دان‌و فرتوفێڵ، توانی ئیسماعیل ئاغا بکوژێ ١٢٣٥، ماڵ‌و دارایی تالاَن بکاو، دەس بەسەر گوندو ئەرزەکانی‌دا بگرێ‌و کوڕەکانیشی" میرزا ئاغا، عەلی ئاغاو یەحیا بەگ هەلاَتن. پایەی سەرخێلیشیان لێ سەنرایەوەو سەرپەرشتی تێلەکەیان درایە دەس مەزنێکی عەجەم[17].

بەجۆرە پێوەندی ئێلی شوکاك لەگەڵ دەزگای دەسەلاتداری عەجەم لەجۆلانەی شەڕو ئاشتی‌دا بوە، تا سەرلە سەر بارێك رانەوەستاوە، هەندێ جار لەخزمەتی دەزگای دەوڵەتی‌دا بون‌و، هەندێ جار لەدەوڵەت یاخی بون‌و، بەهۆی ئەوەی مەڵبەندەکەیان سەخت‌و شاخاوی بوەو، کەوتۆتە سەر سنوری عوسمانی، بەئاسانی دەستی عەجەمیان پێ نەگەیشتوە.

کاتێ لەتارانەوە محەمەد رەحیم میرزا ضیاءالدولە(یەکێ لەکوڕەکانی عەباس میرزا)یان نارد بۆ بەڕێوەبردنی خوی، سەلماس‌و ورمێ ١٢٦٥، ئەویش لەوێوە کەوتە گرتنی مەزنەکانی کورد، بەتایبەتی سەرانی زەرزا، کەچو بون بۆ بەخێرهاتنی. هەر بۆ چاوشکاندنی یاخییانی کورد، عەلی ئاغای کوڕی ئیسماعیل ئاغا کە لەسەر باج‌و زەویانە لەدەوڵەت یاخی بوبو، رێگەی

نێردراوەکانی عەجەمی نەئەدا باجو مولکانە لەناوچەکەی کۆبکەنەوە، هێزەکانی عەجەم بەفەوجێکی ئەفشارو چەند عەرادە تۆپ، لەمەحالی سۆمای برادۆست چونە سەری و راویان ناو تالانیان کرد. دوایی تریش بیرك خان بەقسەی خۆش هێنایە ورمێ، بەگیاوی رەوانەی تارانی کردو، لەجێگەی ئەو میرزا ئاغای برایان کردە سەرخێلی شکەفتی. شوکاك ئیتر لەحالەتی نا فەرمانیدا ئەژیانو ئەوەندە بەدناو بوبون، کەهەندێ گەرۆك پێیان وا بو ئەم ئێلە((پیشەی سەرەکییان راوورِوتە نەك بەخێوکردنی ئاژەڵ)).

عەلی ئاغا لەسەر زەویوزارو زەویانەو روتکردنەوەی کاروان جاروبار لەگەڵ کاربەدەستان رێكو زۆر جار ناکۆكو یاخی بو. هەندێ جار لەدیوی ئێران ئەبو هەندێ جار ئەچوە ناو خاکی عوسمانیەوە[18].

سەرانی ئێلی شوکاك لەراپەرینی ١٢٩٧ی کوردا بەسەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوڵلا بەشدار نەبون.

لەپاش مردنی عەلی ئاغا، محەمەد ئاغای کوری بوە سەرخێلی شوکاك، ناوبانگی ئەویش لەهی باوکی باشتر نەبو. لەگەڵ ئەوەشدا کاربەدەستانی ئێرانی بۆ ئەوەی ئەم ئێلە نەورووژێنن، هەندێ لەگوندەکانی سنوریان پێ بەخشی بون.

مظفرالدین شا چو بۆ سەردانی ئەوروپا، محەمەد عەلی میرزای نائب السلطنەی کەحوکمرانی تەورێز بو لەجێگەی ئەو چو بۆ تاران. ئەمیش نظام السلطنەی بۆ حوکمرانی تەورێز لەجێگەی خۆی دانا. هەواڵەکانی لەقافقاسەوە ئەهاتن، وایان ئەگەیاند کەشەری دینی لەنێوان موسڵمانو ئەرمەنیەکاندا گەرمە. نظام السلطنەش مەترسی هەبو، شەر بتەنێتەوە بۆ ناو تەورێز، لەبەرئەوە جەعفەر ئاغای بانگ کرد بۆ تەورێز کەپاراستنی گەرەکی مەسیحیەکانی پێ بسپێرێ. جەعفەر ئاغاو باوکی لەحکومەت قاچاغ بونو نەیان ئەوێرا بچن. نظام السلطنە بۆ ئەوەی جەعفەر ئاغا دڵنیا بکا کەنیازی لەبانگ کردنەکەی پاکە، قورئانێکی بۆ مۆرو ئیمزا کردو بۆی نارد. جەعفەر ئاغاش بروای پێ کردو لەگەڵ چەند کەسێکی خۆیا چونە تەورێز. نظام السلطنەش پاراستنی گەرەکی ئەرمەنیەکانی پێ سپاردنو، ئەوانیش بەجلوبەرگی فۆلکلۆریی خۆیانەوە بەچەکداری بەناو شاردا ئەسورانەوە. محەمەد عەلی میرزا لەتارانەوە بەتەلەگراف فەرمانی بەنظام السلطنەدا، جەعفەر ئاغا بکوژی. ئەویش ئەنجامدانی ئەم کارەی بەمحەمەد حسێنخانی ضرغام سەرکردەی سوارانی قەرەداغ سپارد. ضرغام جەعفەر ئاغای بانگ کرد بۆ سەراکەی خۆیو لەوێ کوشتنی ١٣٢٣ هاورێکانی کەبوەیان زانی بەتەقە لەشار

هەلاتن‌و هەر کەسێکیان هاتە سەر ڕێگای کوشتیان. لاشەی جەعفەر ئاغاو دو کوژراوی تریان بۆ تەماشا کردنی گشتی چەند ڕۆژێ لەتەوریز هەڵواسی[19].

ئەم ڕوداوە شوکاکی وروژاند، محەمەد ئاغای باوکی جەعفەر ئاغا سەرلەنوێ لەئێران یاخی بو پەنای بردە بابیعالی عوسمانی کەیارمەتی بدەن بۆ شۆڕش‌و تۆڵە سەندنەوە. بەڵام عوسمانییەکان یارمەتییان نەدا. لەو ماوەیەدا لەئەستەمول ڕضوان پاشای شارەوانی ئەستەمول کوژرا. بنەماڵەی بەدرخان بەمە تاوانبار کران. هەندێکیان گیران‌و هەندێکیان دورخرانەوە محەمەد ئاغاش بەفیتی سەفارەتی ئێرانی هەر لەو ماوەیەدا گیراو دورخرایەوە بۆ جزیرەی ڕودس تا لەوێ مرد.

شوکاك لەچاو هەندێ لەئێلاتی کوردا ئێلێکی گەورەو زۆر نەبو. سەرژمێریان بەم جۆرە بوە:

| | | |
|---|---|---|
| لۆرد کیرزن | ساڵی ۱۸۹۲ | ۱۵۰۰خێزان |
| مارتین دان برونە | ساڵی ۱۹۲۰ | ۲۰۰۰خێزان |
| مسعود کیهان | ساڵی ۱۹۳۲ | ۱۵۰۰ خێزان |
| هینری فیلد | ساڵی ۱۹۳۸ | ۱۵۰۰خێزان[20] |

ئێلی شوکاك سەرەڕای پچوکی دابەش ئەبو بەدو تایەفەی کاردارو عەبدویی.

یەکەم- تایەفەی کاردار- ئەم تایەفەیە ۸ تیرە بون:

پز ئاغای کاردار، کەچەڵی، نیعمەتی، مامەدی کاردار، سەکری، ئەدمانی، ئەوری، چەرکۆیی.

پزئاغا لەبرادۆست‌و کەچەڵی لەبرادۆست‌و سۆمای بون. تیرەی چەرکۆیی لەچەند گوندێکا بلاو و ٥ تیرەکەی تر لەچەهریق‌و دەوری سەلماس بون.

دوەم-تایەفەی عەبدویی، ئەم تایەفەیە ۱۳ تیرە بون:

دلان، پزئاغای عەبدویی، دری، هەناری، فنك، خلوف، خدری، بۆتان، نیسان، مامەدی عەبدویی، مقری، پاچك، گەورك.

پزئاغا، دری‌و هەناری لەبرادۆست، خلوف، خدری، بۆتان‌و نیسان لەسۆمای. مقری‌و پاچك لەئەنزل. فنك لەسۆمای. مامەدی عەبدویی لەچەهریق، شپیران‌و ئەنزل بون.

هەمو تیرەیەك سەرۆکی خۆی هەبو.

سەرۆکی هەمو تیرەکانی تایەفەی عەبدویی‌و سەرخێڵی هەمو شوکاك عەلی ئاغاو دوای ئەو محەمەد ئاغای کوڕی‌و دوای ئەویش سمکۆ بو. سەرۆکی هەمو تیرەکانی تایەفەی کارداریش عومەر خانی شەریفی بو[21].

**٢/٢ درەوشانەوەی سمکۆ**

دوای مردنی محەمەد ئاغای سەرۆکی تایەفەی عەبدویی‌و سەرخێلی شوکاك، ئیسماعیل ئاغای سمکۆی کوڕی ناسراوترین‌و بەهێزترین کەسی ناو هەمو ئیلی شوکاك بو. شوکاك لەدوای کوژرانی جەعفەر ئاغا راووڕوت پەلاماردانی عەجەمیان کرد بوە پیشە، لەبەرئەوە ژمارەیەکی زۆر پیاوی شارەزاو جەربەزە لەسمکۆ کۆبوبونەوە.

سمکۆ ناکۆکی دێرینەی کوردو ئازەری بەمیرات بۆ بەجێ مابو. ئەویش بەو کردەوانەی ئەی نواند زیاتر توندو تیژی کردو، تەقاندیەوە. لەبەرئەوە بوو تەقەللا سیاسیەکانی لەناو ئێراندا دۆستێکی نەبو، بەڵکو لەهەموانەوە دوژمنایەتی ئەکراو، بەخراپ لەسەری ئەدوان‌و ئەیان نوسی.

ناوچەی ورمێ لەکۆنەوە کەمەیدانی ململانێ‌و ناکۆکی دوژمنانەی کوردی سوننی‌و عەجەمی شیعە بو، وە بەو هۆیەوە پشێویەکی بەردەوامی تیا بو، هاتنی یەکەمی عوسمانی‌و پەلاماردانی ناوچەکە پشێویەکەی زیادتر کردو، هاتنی روس‌و دەرکردنی عوسمانی ئەویش ئاڵۆزاوتری کردو هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم‌و، لەشکرکێشی ئۆردوی عوسمانی‌و کشانەوەی روس، دیسانەوە لەشکرکێشی بەرفراوانی روسی‌و، هاتنی چەتە ئەرمەنیەکان‌و داگیرکردنی ناوچەکە، کۆچی بەکۆمەڵی ئاسوری لەهەکاریەوە، ئینجا شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کشانەوەی یەکجارەکی سوپای روسی، ئەم روداوانە هەموی لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا، هەلومەرجی ئەم ناوچەیەی برد بوە قۆناغێکی تراجیدیەوە.

سمکۆ بەهۆی مێژوی درێژی بنەماڵەکەی‌و بەهۆی ئەو دەسەڵاتەوە کە لەناو هۆزەکەی‌و لەمەڵبەندەکەی‌دا هەی بو، کەسێکی ناسراو بو لەناو کوردا، پێوەندی لەگەڵ زۆر کەس‌و زۆر سەرۆکی هۆزو زۆر لا هەبو.

پێش هەڵگیرسانی شەڕ سمکۆ لەگەڵ عەبدولرزاق بەگی بەدرخان هاوکارو هاوبیر بو. عەبدولرەزاق بەگ ئەو پرۆژە گەورەیەی دای نابو بۆ بەرپاکردنی شۆڕش‌و دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ، پشتێکی بەسمکۆ ئەستور بو. هەر بەهاوکاری سمکۆش کۆمەڵەی((جیهاندانی))دامەزراند. کەیەکەمین فێرگەی کوردییشی لەخۆی کردەوە، سمکۆ منداڵەکانی هەڵبژارد بۆ خوێندن‌و فێربون لەو فێرگەیەدا.

شێخ عبدالسلامی بارزانی کە لەبەردەمی هێرشی تورکیا کشایەوە ماوەیەك لەناو شوکاکدا بو. لەگەڵ سمکۆ پێکەوە چون بۆ دیتنی جێگری قەیسەری روسی لەقافقاس، بۆ ئەوەی داوای پشتیوانی‌و یارمەتی دانی بزوتنەوەی کوردی لێ بکەن.

شێخ عبدالسلام هەر لەم ناوچەیەدا لەلایەن سۆفی عەبدوڵڵای شوکاکەوە گیراو درایە دەست تورك.

سمکۆ کچێکی شێخ محەمەدی سدیقی هێنابو. شێخ محەمەد سدیق کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینیو برای شێخ عەبدولقادرو، لەراپەڕینی ١٨٨٠دا سەرکردەی قۆڵی ورمێو، باوکی سەید تەها بو. سەید تەها یەکێ بو لەکوردە سیاسیە دەسەڵاتدارە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەو سەردارێکی دەسڕۆیشتوی هەکاری بو. لەدوای ((ئینقیلابی عوسمانی))مەبعوسی ولایەتی هەکاری بو لە((مەجلیسی مەبعوسان))دا. بەم خزمایەتیە هاوکاری بنەماڵەی شێخانی شەمزینان بەتایبەتی سەید تەها و سمکۆ پتەوتر بو.

لەسەرەتای جەنگدا سمکۆ بەهێزێکی ٣ هەزار کەسیەوە لەنزیك خوی بۆ هاوکاری تورك بەرهەڵستی سوپای روسی کرد[٢٢] روس بۆ چەند مانگێ ناوچەکەیان چۆڵ کردو کەوتە دەس تورك. زۆری نەخایاند سوپای روسی ئۆردوی تورکی لەناوچەکە راماڵی. سمکۆ ئیتر خۆی هەڵ نەقورتان لەرووداوەکانی دوایی. بەڵام کاربەدەستانی روسی لەسەرەتادا سمکۆو سەید تەها و چەند کوردێکی تریان دورخستەوە بۆ قافقاس. پاش ماوەیەکی زۆر ئینجا رێگەیاندا بگەڕێتەوە لەخوی دابنیشێ.

بەر لەشۆڕشی ئۆکتۆبەر سەید تەهاو سمکۆو چەند کەسێکی تر((جەمعییەتی استخلاصی کوردستان))یان دروست کرد. داوایان لەکاربەدەستانی روسی کرد بۆ گفتوگۆ دەربارەی هاوکاری کورد روس دژی تورك بەو مەرجەی پشتیوانی لەئامانجی نەتەوەیی کورد بکەن.

سمکۆ وەکو کەسێکی ناودارو بەدەسەڵاتی ناوچەکەو ورمێ وەکو ناوەندێکی گرنگی کاری دیپلۆماسیو پڕوپاگەندەی میسیونێری، لەمژەوە بوبون بەهۆی ناسیاویو هاتوچۆ لەنێوان ئەو و گەلێ دیپلۆماتو پیاوی دینییدا.

پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەرو کشانەوەی تەواوی سوپای روسی ورمێو مەڵبەندەکانی دەوروبەری بۆشایی دەسەڵاتی تێ کەوت. دەوڵەتانی هاوپەیمان ویستیان بەئاسوریەکان پڕی بکەنەوە. سمکۆش لەو هەلەدا دەسەڵاتو هێزی لەناوچەکەدا زۆر زیادی کرد. هەندێ چەکی بەکڕینو هەندێکی بەزەوت کردن لەسوپای کشاوەی روس دەس کەوت. بەکوشتنی مارشیمۆن، پێشەوای دینیی ئاسوری، ناوی زۆر زیاتر دەرکرد.

پێ ناچێ سمکۆ پێوەندی زۆری لەگەڵ گەورە پیاوانی کوردی کرماشان‌و سنەو ئیلام‌و سەرۆکی هۆزەکانی ئەو مەڵبەندانە هەبو بێ. ڕەنگە شوێنی جوگرافی ژیانی سمکۆو زاراوەی زمان لەوەدا دەورێکی گێڕا بێ.

### ٣/٢ کوشتنی مارشیمۆن

لە٩ی جمادی الاولی ١٣٣٦دا، شەڕێکی قورس لەنێوان ئاسورییە مەسیحییەکان‌و عەجەمە موسڵمانەکانی ورمێ‌دا قەوما. لەو شەڕەدا چەند هەزار کەس لەهەردولا کوژرا. هێشتا شەڕ تەواو نەبو بو سمکۆ هێزێکی کۆکردەوە بۆ یارمەتیدانی عەجەمەکانی ورمێ دژی ئاسوریەکان، بەڵام بەرلەوەی ئەو بگاتە ورمێ ئاسوریەکان دەستیان بەسەر ورمێ‌دا گرت‌و موسڵمانەکان خۆیان بەدەستەوەدا، سمکۆ بێ ئەوەی بکەوێتە شەڕەوە گەڕایەوە دواوە.

ئاسورییەکان ئەگەرچی ئەو شەڕەیان بردەوە، بەڵام لەناوچەکەدا خۆیان لەبەرامبەر گەلی تازەری شیعەدا بەتەنها ئەدی. سەرەڕای ئەوەش بەشی زۆری ئەوانە بێگانە بون، هەموی چەند مانگێ بو لەهەکارییەوە هات بونە ورمێ بەژمارەش لەچاو خەلکی ورمێ‌و دەوروبەری‌دا کەمایەتی بون‌و، نەیان ئەتوانی بەبێ پێکهاتن‌و هاوپەیمانێتی لەگەڵ گەلێکی لەخۆیان زۆرتری وەکو کوردا، هاوسەنگیی هێز لەناوچەکەدا ڕابگرن. مارشیمۆن لەگەڵ سمکۆ پێوەندی کردو ڕێکەوتن لەسەرئەوەی بۆ گفتوگۆ لەکۆنە شار(سەلماس)یەکتری ببینن. سمکۆ ئەم دیتنەی بۆ ئەوە بو مارشیمۆنی تێدا بکوژێ. مارشیمون ڕابەری سیاسی‌و سوپایی‌و دینیی ئاسورییەکان بو. لەناو دەوڵەتە گەورەکان‌دا ناسرا بو. هاوپەیمانەکان: بەریتانیا، فەرەنسە، ئەمریکا، ئیتالیا پشتیوانییان ئەکردو پێشتریش روسیە پشتیوانی کرد بو.

سمکۆ لەو دیتنەدا مارشیمۆنی کوشت

سەبارەت بەکوشتنی مارشیمۆن لێکدانەوەی جۆراوجۆر هەیە، بەڵام خۆی وەکو لەگفتوگۆکەدا لەگەڵ مستەفا پاشا ڕونی کردۆتەوە ئەڵێ:

((پرسیار: هۆی تێکچون‌و شەڕکردنت لەگەڵ ئاسوریەکان‌دا چی بو، تکایە پێم بڵێ، مار شەمعون، کەئاشتی ویست‌و دۆستی کورد بو لەبەرچی کوژرا؟

((وەڵام: بێگومان ئاگاداری ئەوەی کەتورک‌و روس لەجەنگی جیهانی‌دا چییان بەکورد کرد! حەز ئەکەم هۆی کوشتنی مارشەمعونت بۆ ڕون بکەمەوە:

لەو هەرایەی لەباکوری کوردستان‌دا لەنێوان تورک‌و ئەرمەنی‌دا ڕوی‌دا، ئاسوریەکان چونە پاڵ ئەرمەنیەکان‌و یارمەتییان دان. دوای شۆڕشی ڕوسیا، ڕوسەکان هێزەکانیان لەسابلاخ‌و ورمێ کێشایەوەو ژمارەیەکی زۆر چەک‌و

جبەخانەو تۆپ رەشاش‌و تفەنگیان بەجێ هێشت‌و هەمووی بۆ ئاسوریەکان مایەوە. چەند ئەفسەرێکی روس‌و ئاسوریەکان‌و هەندێ کاربەدەستی ئەوروپایی، دەیانزانی ئێران بەهۆی لاوازی‌و کزی دەسەڵات‌و کەم دەرامەتیەوە ناتوانێت داکۆکی لەخۆی بکات، بۆیە ئاسوریە چەکدارەکان ویستیان ئەم دەرفەتە لەکیس نەدەن‌و ئازربایجان کەناوچەیەکی گرنگی نێوانی ئەرمەن‌و تورک‌و فارسە بگرن...

دوای ئەوەی ئاسوریەکان بەسەر فارسەکاندا سەرکەوتن‌و بانگەوازی سەربەخۆییاندا، هاتنە لام‌و داوای هاریکارییان لێ کردم، بۆ ئەوەی پێکەوە بچینە ناو ئێرانەوە، منیش بەڵێنی یارمەتیم دانێ... بەڵام ئێرانیەکان بەوەیان زانی کەئاسوریەکان داوای یارمەتییان لەمن کردوە... نوێنەرێکی ئێران هات‌و داوای لێ کردم کەپشتی ئاسوریەکان نەگرم‌و بەرانبەر بەمە بەڵێنی پاداشت‌و چاکەدانەوەیان دامێ. لەبەرئەوەش دەمزانی ئاسوریەکان نیازیان وایە باکوری کوردستان بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو داگیری بکەن، بۆیە مارشەمعونم کوشت. ئێرانیەکانیش لەبەڵێنی خۆیان پاشگەزبونەوە. بۆیە منیش پەلامارم دان‌و ورمێم گرت‌و کاربەدەستانی خۆمم لێ دامەزراند)).

ئەوەی کەسپەهداری والی تەورێز سمکۆی راسپارد بێ بۆ کوشتنی مارشیمۆن‌و بەڵێنی پاداشی پێدا بێ‌و دواییش خۆی لێ نەکرد بێ بەخاوەن، لەهەمو لێکدانەوەکانی تر زیاتر رێی تێ ئەچێ، چونکە لەوە چەند مەبەستی بەدی ئەهێنا، یا وەکو ئەڵێن بەتیرێ چەند نیشانەیەکی ئەپێکا:

١-ئاسورییەکان بەکوژرانی سەرکردەکەیان ئەبو وورە بەر بدەن‌و ئیتر نەك نەتوانن دەس بەسەر ناوچەکەدا بگرن، بەڵکو پەرتۆبڵاو ببنەوە، لەراستیشدا ئەگەرچی کوژرانی مارشیمون چەند هەفتەیەك ئاسورییەکانی دەرکرد، بەڵام سەرەنجام پەرەوازە بون،

٢-شەڕەکە لەکۆڵ عەجەم ببێتەوە، لەشەڕی ئاسوری‌و عەجەمەوە ببێتە شەڕی ئاسوری‌و کورد،

٣-دەوڵەتی ئێران، بەجێگیربونی ئاسورییەکان لەورمێ‌و پێکهێنانی رێکخراوێکی چەکدارو دەسگرتنیان بەسەر ناوچەکەدا لەپەژارەیەکی قوڵدا بو، بەڵام لەو کاتەدا نەخوی هێزێکی چەکداری ئەوتۆی هەبو ئەوانە لەناوچەکە دەربکات، و نە لەهەلومەرجێکی سیاسی پتەوی ئەوتۆدا بو بتوانێ ئۆباڵی کوشتنی کەسێکی وەکو مارشیمۆنی ناودار، کە لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە بەتایبەتی لەلایەن بەریتانیاوە پشتیوانی ئەکرا، بگرێتە ئەستۆی خۆی.

سمکۆ راسپێریی ئێرانییەکانی بەجێ هێنا. مارشیمۆنی کوشت. بەوەش لەجاران زۆر زیاتر ناووناوبانگی دەرکرد. لەناو هەندێ کۆڕو کۆمەڵی نەتەوەپەرستی کوردا، وەکو قارەمانێکی نەتەوەیی سەیری ئەکراو، لەناو عەجەمو کۆڕە جیهانیەکاندا ئەو کارە وەکو کارێکی ناجوامێرانەو خیانەتێکی گەورە باس ئەکرا. کوشتنی بەفێڵ کەهەمیشە یەکێ بوە لەنەریتەکانی حوکمڕانی کاربەدەستانی ئێران‌و، نوسەرانی ئێرانی لەنوسینەکانی خۆیاندا ئەو جۆرە کارە ناجوامێرییانەیان بە(لطائیف الحیل)و((تدبیراتی صائبە))و((کمندی تدبیر))و((وسائل‌و رسائل))و بەزیرەکی‌و ئازایەتی بۆ خۆیان داناوە. تەنانەت ئەوانیش ئەم کارەی سمکۆیان، بە ناجوامێری‌و بێ ئەقڵانەو خوێنڕێژی لەقەڵەمدا.

بەفەرمانی ئاغا پەتروس سەرکردەکانی ئاسوورییەکان کۆبونەوەیەکی جەنگیان کردو هێزەکانی خۆیان سازدا. هێرشێکی کتوپڕیان کردە سەر چەهریق. سمکۆ لەناکاو ئابڵوقە درا. لەم شەڕەدا چەندین کورد کوژران لەوانە دایکی سمکۆو کچێکی جەوهەر ئاغای برای سمکۆ. پاش شەڕێکی سەخت سمکۆ لەگەڵ هێزەکانی کشایەوە ناو خاکی تورکیا[٢٣].

لەپاش پەلاماردانی چەهریق ئاسوورییەکان گەڕانەوە ورمێ. لەهەلومەرجێکی نالەبارا ئەژیان. سمکۆش گەڕایەوە شوێنی خۆی. کورد لەناکۆکیەکی لابەلای ترەوە گلا، کەناکۆکی بو لەگەڵ ئاسوری.

## ٤/٢ ئامانجی سیاسی سمکۆ

لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم مەسەلەی کورد چو بوە قۆناغێکی گرنگەوە. دەوڵەتە براوەکان ئەیانویست رێکەوتنە نهێنیەکانی سەردەمی جەنگ بەگوێرەی تەرازوی هێزەکانی خۆیان لەدوای جەنگ جێبەجێ بکەن، گەلانی ژێر دەستەش ئەیانویست هاوپەیمانەکان، بەڵێنەکانی کاتی جەنگ، بەتایبەتی دەربارەی ئازادی مافی بڕیاردانی چارەنوس جێبەجێ بکرێ.

هێشتا جەنگ کۆتایی نەهات بو شێخ محمود لەسلێمانیەوە دەستەیەکی نوێنەرایەتی ناردە لای دەسەڵاتدارانی ئینگلیزی لەکفری‌و، داوای لێ کردن نەتەوەی کوردیش لەریزی گەلانی ئازاددا بژمێرن بەرامبەر بەوەش گفتی دۆستایەتی‌و هاوکاری پێدان. میجەر نوئیل بەنوێنەرایەتی حکومەتی بەریتانیا چو بۆ سلێمانی‌و خۆی گوتەنی پێشوازییەکی شاهانەیان لێ کردو، لەکۆبونەوەیەکی جەماوەریدا پشتیوانی حکومەتی بەریتانی لەخواستی ئازادی کورد دەربڕی‌و، شێخ محمودی وەکو حوکمداری کوردستان راگەیاند. پاش چەند رۆژێ کولونێل ویلسۆنی مندوبی سامی بەریتانی خۆیشی چوە سلێمانی‌و حوکمدارێتی شێخ

مەحمودی لەنێوان زێی بچوك‌و روباری سیروان‌دا سەلماندو، کۆبونەوەیەکی لەگەڵ سەرەك عەشیرەتە کوردەکان کردو، ئەوانیش مەزبەتەیەکیان دایە سەبارەت بەمافی نەتەوەیی گەلی کورد.

لەئەستەمولْ، راستەوخۆ لەگەڵ تەواو بونی جەنگ‌دا پیاوە گەورەکانی کورد لەوێ((جەمعییەتی تعالی کوردستان))یان پێك هێنا. شێخ عەبدولقادر شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان‌و چەندین شەخسیەتی کوردی ناسراو بەشداربون، کۆمیتە کەوت بوە چالاکییەکی کاریگەری سیاسی، دیپلۆماسی، رۆشنبیری بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردستان.

لەپاریس، شەریف پاشا بەنوێنەرایەتی نەتەوەی کورد داوای لەکۆنفرەنسی ئاشتی‌و دەوڵەتانی دنیا ئەکرد، مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوس بۆ گەلی کورد بسەلمێنن‌و یارمەتی بدەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ لەسەر ئەرزی نیشتمانی نەتەوەیی خۆی.

لەدوای راگرتنی جەنگ ئێران هەوڵی ئەدا بەریتانیا قانع بکا پشتیوانی ئێران بکا بۆ فراوان کردنی قەڵەمڕەوەکەی لەسەر حسابی دەوڵەتی تێشکاوی عوسمانی، داوای ئەکرد بەشێکی گەورەی کوردستانی تورکیا بخرێتە سەر ئێران.

لەکوردستانی ئێران چالاکیەکی سیاسی فراوان نەبو، بەتایبەتی لەئوستانەکانی کوردستان، کرماشان، ئیلام‌دا. سمکۆ ناسراوترین شەخسیەتی کوردی ئێران بو.

**سمکۆ چی ئەویست؟ خواستە سیاسیەکانی چی‌بون؟**

سمکۆ رێکخراوێکی سیاسی نەبو، هەروەها کۆمیتەیەکی سیاسیشی پێکەوە نەنابو، بەرنامەیەکی سیاسی رون‌و دیاری هەبێ. رێکخراوەکانی((جیهاندانی))پێش جەنگ‌و((جەمعییەتی استخلاصی کوردستان))ی سالانی جەنگ، نەمابون. خۆی سەرکردەی جولانەوەکەو دانەری نەخشەو بەرنامەکانی بو. ئامانجی سیاسی سمکۆ لەگفتوگۆکانی‌دا لەگەڵ ئینگلیزو لەو پەیامەدا کەبۆ یەکێتی سۆڤیێتی ناردو داوای پشتیوانی لێ ئەکردن بۆ دروست کردنی دەوڵەتی کوردی رون‌و ئاشکرایە.

کسروی لەبارەی ئامانجی سیاسی سمکۆ ئەڵێ:

((...سمکۆ ئەم سەردەمە سەربەخۆیی(استقلال)ی بۆ کوردستان ئەویست‌و، لەرێگەی ئەم ئارەزوەدا بو کە کەوت بوە ئامادەکردن. یەکێ لەتۆوەکانی ئاشوب‌و زیانکاری کەئەوروپایی لەرۆژهەلاتدا وەشاندویانە ئەم ئارەزوی سەربەخۆییەیە. کارکەرانی ئەوانە سالەها گەڕان‌و چونە ناو کوردو ئەرمەنی‌و تورکمان‌و ئاسوری‌و

بەختیاری‌و هی ترو، ئەم تۆوەیان لەدڵی ئەواندا چاندوە، کوردیش چەندەها ساڵ بو ئەم قسانەی بیست بو، هەوەسمەندانی لەوانە شوێن ئەم ئارەزوە خاوە کەوت بـون‌و، هەندێ جار کتێب‌و وتاریان نوسی بو. ئێستە سمکۆ ئەیویست ئەو ئارەزوە بهێنێتـە دی‌و، بەپێڕەوی لەئازادیخوازانی عوسمانی کە((ژون تورك))ی لێ پەیـدا بـو، و ئـەو کارانەیان کردبـو، بـۆ دروسـت کردنـی دەسـتەیەك بـەناوی ((ژون کـورد))ەوە تـێ ئەکۆشا.

ئەیانوت کەمیستەر دادی ئەمریکایی خستویەتیە سەرییی ئەم کـارە. میسـتەر داد کە لەگەڵ ئەمریکاییەکانی تر، لەگەڵ ئاسوریەکان لەورمێ وە کۆچی کردبـو، چوبو بۆ هەمەدان‌و، هەر لەو رۆژانەدا گەڕایەوە تەوریز لەوێوە چوەوە ورمێ، ئـەیان وت کەچەند جارێ چوە بۆ بینینی سمکۆ. ئەم قسەیە ئەگەر بەڵگەشی نەبوبێ لەگەڵ بەدخوازی‌و کینەتوزی کـە لەمیسـیونێرە ئەمریکاییـەکان بینـرا بـو، ئـەگونجا. زۆر کەس ئەمـەیان قبـوڵ ئـەکردو وایـان ئـەگوت: ((ئـەمریکاییان لەبەرئـەوەی نەیان توانی بەدەستی ئاسوری کارێ بۆ پێشەوە ببەن، ئەیانەوێ بەدەستی کورد کارێ بـۆ پێشەوە ببەن.

هەرچی هەیە ئەم ئارەزوە کەسانی تر خست بویانە دڵی سمکۆوە، هـەر ئـەوانیش دڵیـان دایـەو دلێرییـان کـرد. لـەم ماوەیـەدا کـەعوسمانیان لـەئێران ئەڕۆیشـتن دەستەیەك لەسوپاییان‌و تۆپچیـەکانی ئـەوان کەچـەند سـەد کـەس بـون نەگەڕانـەوە وڵاتی خۆیان بەو تفەنگ‌و تۆپانەوە کەپێیان بو چون بۆ چەهریق‌و چونە ژێر دەستی سمکۆوە. ئەم روداوە دلێری ئەوی چەند جار زیاتر کردو، بەمجۆرە خۆی ئامـادە بینـی ئاڵای نافەرمانی هەڵ بکا، یەکێ لەهاودەستەکانی لەم کـارەدا سـەید تـەها نـەوەی شـێخ عوبەیـدوڵڵا بـو کەبنەماڵەکـەیان لەکوردسـتاندا بـەناوبانگ‌و سـەید تـەها خۆیشی پیاوێکی کۆشاو کاری بو)) [٢٤].

نوسەرێکی مەزنی ئێـران ئاوەهـا ئامـانجی نەتـەوەیی کـورد هـەڵ ئەسـەنگێنێ. ئارەزوی سەربەخۆیی لەکوردا بەتۆوی گەڕیدە ئەوروپیەکاندا ئەنێ.

هەر کسروی خۆی، باسـی مـەلاو بازرگـان‌و پیشـەوەرەکانی تـاران ئەگێڕێتـەوە کەچونە ناو سەفارەتی بەریتانی‌و ئەوانی تەوریز چونە ناو کونسولگەی بەریتانیـەوە لەوێ بەست نشـین بـون. پێشـتر بەسـت هـەر لـەبارەگای پیـاوە دینیـە پیرۆزەکـاندا ئەکراو، ئەو سەردەمە بەریتانیا گـەورەترین ئیسـتعماری دنیـا بـو، کەچـی ئـەلقاب گەلی شیرین بەسەر ئەو((ئـازادیخواز))و((موجاهیـد))انـەدا کەرابـەری ئینقیلابـی مەشروتە بون دابەش ئەکا. هەروەها هەندێ لەو مەشروتەخوازانەی وەکو ستارخان‌و باقرخان کەپەنایان بردبوە بەر شابەندەرخانەی عوسمانی‌و ئەوانەی پـەنایان بـرد بـوە

بەر خاكی عوسمانیو داوای پشتیوانیو یارمەتییان لێكردنو لەگەڵ ئۆردوی توركدا گەڕانەوە بەموجاهیدو ئازادیخواز، كەچی كوردەكان بەجەردە دائەنێ. بەقسەیەكی تر بۆ تێكۆشەرانی ئێرانی پێوەندیو پەنابردن بۆ توركو ئینگلیزو روسو هێزەكانی بێگانە بەڕەواو بۆ تێكۆشەرانی كورد بەكاری خراپ لەقەڵەم ئەدا.

لەو گفتوگۆ راستەوخۆیەدا كەحاجی مستەفا پاشای یاملكی لەگەڵی كردوە، سمكۆ خۆی ئامانجەكانی بەمجۆرە رون ئەكاتەوە:

((پرسیار: لەماوەی ئەم دو ساڵەی رابردودا لەدژی حكومەتی ئێران جوڵاویتەوەو ئەجوڵێیتەوە، مەبەست لەم بزوتنەوەیە چیەو بەتەمای چ جۆرە دەسكەوتێكیت دەسگیر ببێت؟

((وەڵام: فارسەكان(بێگومان سمكۆ وشەی فارسی بەكارنەهێناوە، بەڵكو عەجەمی بەكارهێناوە بەڵام ئەبێ لەوەرگێڕانی ئینگلیزی داوای لێ كرابێ) رقیان لەكوردە، لەبەرئەوە من بەهەمو توانای خۆمەوە هەوڵ دەدەم كوردەكان رێك بخەم، بۆئەوەی لەدەستدرێژی فارس رزگاریان بێت، هەر بۆیە پار شاری ورمێم گرت لەگەڵ ئەو ناوچەیەی كە لەرابردودا كوردی بوە، دواتریش شاری سەلماسو ئەمساڵیش فارسەكانم لەسابلاخ دەرپەڕاند.

((پرسیار: باشە تۆ هەوڵ دەدەی بۆ ئەوەی كورد رزگارو ئازاد بكەیتو سەربەخۆییان بۆ ساز بكەیت؟ ئەی بۆچی پێش هەمو شتێك ناوچەی وانو ئەرزرومو بەتلیسو هەكاری خەرپوت رزگار ناكەیتو ئەو خەڵكە رێك ناخەی، كەماوەیەكە لەژێر جەورو ستەمی تاقمەكەی مستەفا كەمال دان؟

بۆچی ئاڵای تایبەتی خۆت هەڵناكەی، تادەری بخەیت كەوا مەبەستت لەو جوڵانەوەیە خوێن رشتن نیە، بەڵكو مەبەستت سەربەخۆییە؟

بەئاشتیو خۆشی بۆچی هەوڵی رێكەوتن لەگەڵ فارسەكاندا نادەی؟

((وەڵام: من وای بەباش دەزانم كە لەپێشدا لەئێرانەوە دەست پێ بكەم. من هیچ بەچاكی نازانم، لەم رۆژەدا لەگەڵ توركەكاندا تێكی بدەم، چونكە ئەوان بەتفەنگو فیشەك یارمەتیم دەدەن. من هیچ بەپێویستیشی نازانم بۆ بێگانە بەیانو بلاوكراوە بلاوبكەمەوە، چونكە ئەوان زۆر باش شارەزای ئەوەن كەئێمە هێشتا بەشێوەیەكی خێڵایەتی دەژین، جگە لەمەش بیستومە ئەوروپاییەكان لەناوخۆیاندا لەكێشەو مشتومڕدان بۆیە ئێمە پێویستە تێكۆشینو پشتیش بەهێزو دەسەڵاتی خۆمان ببەستینو نەهێڵین فارسەكان بگەڕێنەوە ورمێو سابلاخ. ئێمە بەهیچ جۆرێك كۆڵ نادەینو تا تاقە شوكاكێك مابێ لەم روەوە بەرهەڵستی دەكەین)).

سمکۆ لای وابو ئێران لەو کاتەدا لاوازە. ئەبێ کورد ئەو هەلە بقۆزێتەوە بۆ ئازادکردنی خۆی. کوردی جێگاکانی تریش ئەبێ یارمەتی ئەوان بدەن[٢٥].

لەو گفتوگۆیەدا کە یاملکی لەگەڵی کردوە سەبارەت بەکوردستانی تورکیاش هەر بیروڕایەکی لەو بابەتەی هەبوە:

((جەنابی ئیسماعیل ئاغا! ئەمڕۆ وەکو ڕۆژگاری شێخ عوبەیدوللا نیە، ئەمڕۆ روداوەکانی ناو کوردستان جێی سەرنجی هەمو دەوڵەتە ئەوروپاییەکانە، لێیان ئاگادارن، تەنانەت ئەمریکای یەکگرتوش ئاگادارە، حکومەتێکی گەورەی وەکو بەریتانیا حوکمی سلێمانیو ناوچەکە دەکاتو ئاگای لەهەمو بزوتنەوەیەکی کوردە. ئەگەر هەرشتێك ئەو لێی رازی نەبێتو لەگەڵ سیاسەتیدا نەگونجێت، ئەوا لەروی سیاسیو عەسکەرییەوە لەدژی دەوەستێ... راستە ئێوە کاروبارتان لەگەڵ تورکە نەتەوەییەکانی ئەناتۆلیا رێك خستوە، بەڵام ئەگەر ئەوان لەبزوتنەوەکەیاندا سەرنەکەوتن، ئەوا ئێوەش تیادەچنو کەس بەهاوارتانەوە نایەت، خۆت دەزانیت، بزوتنەوەیەکی وەکو ئەوەی تۆ بەبێ پشتگیریو یارمەتی دەوڵەتێکی ئەوروپایی، بەتایبەتیش ئەمڕۆ کەبەریتانیا بوە بەدراوسێمان، بەبێ ئەوان بەهیچ مەبەستو ئامانجێك ناگەین جەلالەتی سوڵتان بزوتنەوەکەی ئەمڕۆی ئەناتۆلیا بەیاخیگەریو سەرپێچی دادەنێ، هەر لەبەرئەوەشە یۆنانیەکان بەرەو ئەنگۆرە(ئەبێ ئەنقەرە بێ)هاتونو ئامادەن، کەعەمەلیاتێکی تریشیان لەدو بکەن. لەئەناتۆلیاش زۆر کەس پێشوازیان لەهاتنی یۆنانیەکان کردوەو داوایان لێ کردون ناوچەکە داگیر بکەن. چونکە زۆر رقیان لەتورکە نەتەوەییەکانە.. ئەو تورکە نەتەوەییانە دوژمنی کوردنو دەبێ ئەوەت لەبیر نەچێ، کەئەوانە لەساڵی ١٩٠٨ەوە تائێستە چەند زیانیان لەکورد داوە. هەر چۆنێك بێت یۆنانیەکان لەتورکەکان بۆ ئێمە باشترن، چونکە هیچ نەبێ شارستانیو پێشکەوتنخوازنو تورکەکان زۆر دواکەوتوو نەزانن. باشتر وایە لەگەڵ یۆنانیەکاندا پەیوەندی پەیدا بکەیتو لەم بارەشەوە ئینگلیزەکان ئاگادار بکەی، پەیوەندیان پێوە بکەو سود لەهەلو دەرفەت وەربگرە. هەوڵ بدە لەگەڵ ئەو شوێنانەدا رێك بکەوە، کەبەریتانیو ئەوروپایی تێدا نیە، وابزانم ئەگەر ئەو رێگەیە بگریتە بەر ئەوروپاییەکان گوێ لەداواکانت دەگرن...

سمکۆ لەوەڵامدا ئەڵێ: منیش زۆر رقم لەتورکە نەتەوەییەکانە، بۆ کوردیش ئەوان لەفارسەکان بۆ کورد بەدوژمنتر دەزانم. من چەند جارێك نامەم بۆ ئینگلیزەکان ناردوەو ئاگادارم کردون کەمن نامەوێ دژی سیاسەتی ئەوان بمو ئێمە هەمیشە پێویستمان بەیارمەتی بەریتانیا هەیە. بائەوان لایەنگری کورد بکەن، منیش ئامادەم بەپێی ئارەزوی ئەوان بجولێمەوە. ئێمە پێویستمان بەیارمەتی چەكو

فیشەك هەیەو ئەگەر لەم ڕووەوە فریامان نەکەون توشی کێشەو سەریەشە دەبم. سەید تەهام نارد بۆ بەغدا، بەڵام هیچ سودو ئەنجامێکی نەبو، ئەوا منو سەید تەها ئێوە دەکەین بەوەکیل ئەگەر حکومەتی بەریتانیا خۆی، یاخود بەهۆی دۆستە دڵسۆزەکانی پشدەریەوە، بتوانن یارمەتی چەكو جبەخانەمان بدات، بەبێ ئەوەی بماغاتە ژێر ڕەحمی ئەفسەرەکانیەوە، ئەوا دەتوانین وانو ئەرزڕوم سیواسو هەکاری لەتورك پاك بکەینەوەو ئەوسا دەتوانین دەرسێکی گەورەو چاکیش بە ئەوانەی ڕەواندوزو شوێنەکانی تریش بدەین. ئەمە پێشنیاری ئێمەیەو دەتوانین دڵنیات بکەین، کەئێمە لەم گفتوگۆیەماندا ڕاستین. ئێمە دەتوانین ئەنگۆرەش(؟)بگرینو ئەگەر ئینگلیزەکان بێ دەنگ بن، لەماوەیەکی کەمدا شاری سنەش(؟)دەگرین)).

بۆچونی سمکۆ دەربارەی لاوازیی ئێران لەجێی خۆیا بوە. لەلایەك ناکۆکی لەنێوان ئازادیخوازانی ئێران بەگشتیو چینی کۆنەپەرستو شا لەوپەری توندیدا بو، بەتایبەتی دوای بەستنی پەیمانی ئێرانی-ئینگلیزی ١٩١٩کە لەئەنجامی بەرتیل وەرگرتنی وثوق الدولەی سەرۆوەزیرو وەزیرەکانی دەرەوەو داراییدا، ئێرانی ئەکردە ژێردەستەی بەریتانی. لەلایەکیتر ئێران، دەوڵەتی مەرکەزی ئەرتەشی بەهێزی تێدا نەما بو، لەجەنگەل، خوراسان، خوزستان خەڵك هەڵگەرابونەوە لەدەوڵەت. بەڵام ڕوداوێ هات بوە پێشەوە کەبوبو بەپشتیوانی ئێران ئەویش، شۆڕشی ئۆکتۆبەر بو لەڕوسیە. چونکە ئەم ڕوداوە گەورەیە، سەرلەنوێ ئەهمیەتی ئێرانی لەستراتیجی هەمو دەوڵەتە گەورەکانی دنیادا زیاد کردەوە.

لەلایەك بەریتانیاو هاوپەیمانەکانی نەیان ئەویست ئێران لاوازو پارچە پارچە بێ بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لەبەر لێشاوی پەرەسەندنی کۆمۆنیزمدا، کە لەدەوڵەتی دراوسێی لای سەروی ئێرانەوە ئەهات، ڕابگرێ.

لەلایەکی ترەوە، ڕوسیەش ئەیویست دراوسێکەی لای خواروی بەهێز بێو پارچە پارچە نەبێ بۆ ئەوەی دەوڵەتە ئیمپریالیستیەکان، بەتایبەتی بەریتانیا، نەتوانێ دەس بەسەر ئێراندا بگرێ بیکا بەبنکەی پیلانگێران دژی دەوڵەتی ڕوسیای سۆسیالیستی.

لەگەڵ ئەوەی سمکۆ لای وابو ئەبێ خەریکی ئێران بێ، نەیتوانی لەگەڵ کوردەکانی ئێران پێوەندی هاو خەباتی فراوان دابمەزرێنێو، لەگەڵ بزوتنەوەی کورد لەعیراقو تورکیا هیچ کارێکی چەکداری هاوبەشی نەکرد. هەروەها نەیتوانی لەگەڵ ئازادیخوازانی ئێران هیچ کارێکی هاوبەش یا هاوکاریەك بکا.

### ٣- شەڕو شۆڕش

### ١/٣ هەلومەرجی گشتی ئێران

مێژونوسێکی ئێرانی هەلومەرجی ئەو سەردەمە بەجۆرە باس ئەکا:

((مشیر الدوله کاتێ هاتە سەرکار کەدۆخی ئێران بەهۆی روداوەکانی جەنگی جیهانیەوە(١٩١٤)پەرێشانو بێ سامان بو، یاخییانو رێگرەکان لەئەطرافی ولاتدا ئالای هەلگەڕانەوەیان هەلکردبو، هەندێ لەئێلاتو عەشایەر سەرەڕای ئەوەی باجیان نەئەدا، سەرپێچییان لەفەرمانی حکومەتی ناوەندی ئەکرد، حەزیان ئەکرد حکومەتی تاران لاواز بێ یابڕوخێ. باری دارایی ولات زۆر لەرزۆكو بەجۆرێکی گشتی وەرگرتنی دەرامەتی دەولەت تێك چوبو. خەزانە چۆڵو حکومەتی ناوەندی ناتەوان بوبو. دانی مانگانەی فەرمانبەرانی حکومەت بەجۆرێ توشی دواکەوتن ئەبو زۆر جار چەند مانگێ تەلەبکار بون، هەلومەرجی ئەوسای ئەرتەش بێ ئەندازە جێگەی داخ بو. هێزە نیزامییەکانی ئەو زەمانە پێك هات بو لەمانەی خوارێ:

١-یەك فیرقە قازاق کە لەزەمانی پێش جەنگەوە لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەرانی روسیای قەیسەریدا بەڕێوە ئەبران، ئەم ئەفسەرانە بەجۆرێکی ئاسایی لەخزمەتی دەولەتی ئێراندا بون. لەو کاتەدا سەرۆکایەتی فیرقە لەئەستۆی ئەستاروسلسکیدا بو(٨ هەزار کەس بو).

٢-تاقمی ژاندارم کە لەزەمانی میستەر شوستەری ئەمریکایی، راوێژپێکراوی دارایی ئێرانو سەرۆکی خەزانەداری گشتی، بەنیازی کۆکردنەوەی داهاتی دەولەت، دامەزرێنرا بون. ئەم تاقمە لەسالی ١٣٢٩ی قەمەریدا پێك هێنرا بو. دوایی بو بەناوکی سەرەکی بەڕێوەبەرایەتی ژاندارمەری کە بەهۆی کۆلۆنێل یال مارسونو چەند ئەفسەری سویدی تر بەرێکخستنێکی نوێ دامەزرابو. (هەمویان ٨هەزارو ٤٠٠ کەس بون)

لەلای سەروی ئێراندا(کەنارەکانی دەریای خەزەر بەتایبەتی رەشت)هێزی موتەجاسرین خەریکی شەڕبون لەگەل ئۆردوی قازاق، لەئازەربایجان ئیسماعیل ئاغای سمکۆ راپەڕی بو خەریکی پێکادان بو لەگەل بەشێکی ئۆردوی ژاندارم. هەروەها کوردەکانی کوردستانیش بەشێکی تری ئۆردوی ژاندارمیان بەخۆیانەوە خەریك کرد بو لەشەڕ هەلاتندا بون.

لەسەرانسەری ئێراندا تێکهەلچونو پێکادان روی ئەدا...))[٢٦].

سمکۆ لەسەرەتای دەس پێ‌کردنی بزوتنەوەکەیەوە ئاگاداری لاوازی ئێرانو خراپی هەلومەرجی گشتی حکومەتی ئێران بو. لەبەرئەوە لای وابو ئەوە هەلێکە

ئەبێ کورد بۆ سودی خۆی بیقۆزێتەوە. کوردی شوێنەکانی تریش پشتیوانی لەمان بکەن بەئامانجی نەتەوەیی خۆیان بگەن.))[27].

سالّی ١٩١٩ دو روداو بون بەهۆی تەقاندنەوەی ناکۆکی دێرینەی کاربەدەستانی ئێران‌و کورد بەتایبەتی شوکاك لەناوچەی ورمێدا. پیلانی کوشتنی سمکۆو ناردنی حاکمێکی نوێ بۆ رەواندنەوەی کورد لەورمێ.

### ٢/٣ پیلانی کوشتنی سمکۆ

جێنشینی والی ئازەربایجان لەتەورێز کابرایەك بو بەناوی. مکرم الملك پیلانێکی بۆ کوشتنی سمکۆ دانا. بۆمبێکی لەناو قوتویەکی شیرینی‌دا بۆ نارد بۆ ئەوەی لەکاتی هەڵپچڕین‌دا پێی‌دا بتەقێتەوە.

کسروی روداوەکە بەجۆرە ئەگێڕێتەوە:

((مکرم الملك ، نائب الایالە، لەبەرئەوەی سوپایەکی لەبەردەستدا نەبو بینێرێتە سەر کوردەکان، بەناچاری بیری لەچارەیەکی تر ئەکردەوە، ئەوە بو کەبۆمبێ بۆ ئیسماعیل ئاغا بنێرێ‌و لەناوی ببات. سالّی ١٢٧٨ لەکاتی جەنگەکانی تەورێزا حەیدەر عمواغلی‌و کسانێکی تر لەئازادیخوازانی ئەم شارە بۆ کوشتنی شجاع نظام بیریان لەم چارەیە کرد بوەوە. قوتویەکیان بەناوی((ئەمانەت))ەوە بەپۆستەدا بۆ ناردو کوشتیان. مکرم الملکیش ئەیویست هەمان شت لەگەڵ سمکۆ تاقی بکاتەوە.

بۆ ئەم کارەش هاوبیرو هاوکارەکانی بەنهێنی لەئەرمەنەکان بو، بۆمبەکەش ئەوان دروستیان کردو مکرم الملك ناردی بۆ خوی، لەبەرئەوەی خسوی ئیسماعیل ئاغا لەگوندێکی خوی دائەنیشت، بەو ناوەی کەئەوە قوتوی شیرینیە ئەو ژنە بۆ زاواو نەوەکەی خۆی ناردوە. ناردی بۆ چەهریق بۆ ئیسماعیل ئاغا.

بەلاّم سمکۆ لەشجاع نظام هوشیارتر بو خۆی دەرباز کرد. لەزمانی ئەوەوە وائەگێڕنەوە: کەقوتوەکەیان هێنا کوڕەکەم بەناوی ئەوەوە کەئەمە شیرینیەو ئەنکی بۆی ناردوە، پێی لەسەرکردنەوەی داگرت. من داستانی شجاع نظامم بیرکەوتەوە. بەدگومان بوم‌و هۆشیار بومەوە. لەبەرئەوەی لەسەر چیمەن دانیشت بوم وتم لەوێ بیکەنەوە. هەر کەنەخشەکەیان دڕی‌و، رۆشنیەکی کەمی لێ دەرکەوت، من فرسەتم نەداو بەپێ تێم هەڵ داو هاویشتم بۆ دەرو باوەشم بەکوڕەکەم دا کردو خۆم لەسەر سەوزیەکە درێژ کرد. بۆمبەکە چەند هەنگاوێ دور لەئێمە تەقیەوە.

بەجۆرە سمکۆ لەمەرگ رزگار بو. بەلاّم بۆمبەکە لەجێیەك تەقیەوە عەلی ئاغای برای‌و چەند کوردێکی تری کوشت‌و ئەمەش بەهانەیەکی تری دایە دەستی سمکۆ. نظام السلطنە لەسالّی ١٢٨٤دا(یەك سالّ پێش بزوتنەوەی مەشروتە) تەئمینی‌دا

بەجەعفەر ئاغای براگەورەی سمکۆو بەقورئان سوێندی بۆ خواردو هێنایە تەورێز. دوایی ئەوی لەگەڵ دو کەس لەهاوڕێکانی کوشت، ئەوانی تر بەڕاکردن گیانی خۆیان دەرباز کرد.

سمکۆ لەم راپەڕینەدا ئەوانەی کردە بەهانە...))[28]

ئەم پیلانە سمکۆی بەتەواوی دووردۆنگ کرد لەئێران بۆی دەرکەوت هێشتا دەستیان هەڵ نەگرتوە لەپیلانگێڕان‌و کوشتنی بەفێڵ‌و دوژمنایەتی لەپەنای دۆستایەتی‌دا. کەوتە هەڕەشە کردن لەکاربەدەستانی ئێرانی‌و هاندانی کورد بۆ شۆڕش لەپێناوی ئازادی‌دا.

### ٣/٣ دانانی حاکمی نوێی ورمێ

هەر لەو رۆژانەدا کەویستیان سمکۆ بکوژن سپهدار کەبۆ دوەمین جار بوبو بەوالی ئازربایجان، ضیاءالدولەی ئەلبورزی دانا بەحوکمڕانی ورمێ لەجێگەی سەردار فاتیح.

بەقسەی تمدن، ضیاءالدولە هات بو بۆ بەرهەڵستی نفوزی کورد لەورمێ. بەقسەی دهقانیش، هات بو بۆ راگرتنی ئاسایشی ورمێ‌و پاراستنی لەدەسدرێژی کورد. بۆ ئەو مەبەستەش، دوسەد سوارە نیزام‌و تۆپێکی شاخاوی لەرێگەی گۆمی ورمێوە لەگەڵ خۆی هێنا بو. هەروەها هانی خەڵکیشی دا بۆ ئەوەی لەهەمو گەڕەکێکی ورمێ کۆمیسیۆنێکی جەنگی پێك بهێنن بۆ پاراستنی شارەکەیان لەهێرشی کورد[29].

بەر لەهاتنی ضیاءالدولە هەندێ کورد چوبونە ناو ورمێ لەوێ ئەژیان. کەبینیان بەتۆپ‌و سوارە نیزامەوە هات، رەوینەوە.

دوای٥ رۆژ لەگەیشتنی حاکمی نوێ سەر لەبەیانی ٦٠ کورد چوار دەوری خانوی حاکمیان گرت. ئەیان ویست ضیاءالدولە بگرن. تەقە دامەزرا. سەربازەکان بەدەنگ تەقەکەوە هاتن بۆ یارمەتی دانی حاکم. خەڵك کە بەتێکهەڵچونی کوردو سەربازەکانی حکومەتیان زانی، هەرکەس چەکی هەبو تاوی دایەو چون بۆ یارمەتی حاکم. پەلاماری کوردەکان سەری نەگرت. بەتەقە لەشار دەرکران. لەبەرئەوەی خەڵکی ورمێ ئەو کارەی کوردەکانیان بەهاندانی دکتۆر پاکارد ئەزانی، تاقمێکیان هەڵیان کوتایە سەر بارەگای ئەمریکی ٦٠کەس لەو مەسیحییانەیان کوشت. کە لەوێ دالدە درا بون.

سمکۆ ئەی ویست نەهێڵێ ضیاءالدولە جێگیر بێ. لەو رۆژانەدا هەمو رێگە زەمینییەکانی ورمێ گیرا بون. تەنیا رێی بەندەری گوڵماخانە مابو لەسەر گۆمی ورمێ. گوڵماخانە عەماری گەنمی لێ بو. سمکۆ بەهەوالی سەرنەکەوتنی

پەلامارەکەی ورمێی زانی دەستەیەك شوکاکی بەسەرۆکایەتی تاهیر بەگ نارده سەر گوڵماغخانەو گرتیان بۆ ئەوەی لەتەوریزەوە نەتوانن هێز بۆ یارمەتی ضیاءالدولە بنێرن.[30] ورمێ کەوتە ناو ئابڵوقەی کوردەوە.

### ٤/٣ جەنگی پروپاگەندە

چەکدارەکانی کورد لەناو شاری ورمێدا ئەگەڕان. خەڵکی بەگرتنی گوڵماغخانەیان زانی. دوکان و بازاڕیان داخستو چونەوە ماڵەکانی خۆیان. سەرکردەکانی کورد کەئەمەیان دی، کەوتنە هەوڵدانی راکێشانی دانیشتوان.

تمدن، شایەتی ئەو رۆژانە بوە. هەندێ لەهەوڵەکانی کورد بۆ بەدەس هێنانی دۆستایەتی خەڵکی ورمێ ئەگێڕێتەوە. لێرەدا هەندێکی دوبارە ئەنوسینەوە.

چوارشەممە ٣١ اردیبهشت ١٢٩٨(١٠رەمەزان ١٣٣٧/١١مە ١٩١٩)کوردەکان لەشار جاڕیاندا:

((خەڵکینە بزانن‌و ئاگادار بن!

ئێمە هیچ ناکۆکییەکمان لەگەڵ ئێوە نیە. هیچ جۆرە دوژمنایەتییەك لەبەینی ئێمەو ئێوەدا نیە ئێوە دڵنیا بن‌و بڕۆن دوکانەکانی خۆتان بکەنەوەو خەریکی کاروکاسبی خۆتان بن.

ئێمە تەنیا لەگەڵ حکومەتی بێگانە موخالیفین، کە لەدەرەوەی شارەوە هێنراونەتە ئێرەو، لەناو خەڵكدا نیفاق‌و دوبەرەکی بڵاوئەکەنەوە. بەکەڵك وەرگرتن لەدوبەرەکی ئەکەونە پڕکردنی گیرفانی خۆیان. بەگیرفانی خاڵی دێن‌و بەگیرفانی پڕو کەلوپەلی زۆری گرانبەهاوە لەم شارە ئەڕۆن. ئەم جۆرە حکومەتانە هیچ گوێ نادەنە میللەت‌و شار. هەر لەبیری ئەوەدان حەددی ئەعلای ئیستیفادەی نا مەشروع‌و عەییاشی‌و هەرزەگی‌و حەیف‌و مەیل کردنی پولی میللەت دان.

بەڵێ ئێمە لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەی بەڕاستی وەکو زەرو وان دوژمنایەتی ئەکەین.

ئەهالی موحتەرەم!

وەرن غیرەت بدەینە بەر خۆمان‌و فەرماندار لەناو خودی ئەهالی ورمێدا هەڵ بژێرین‌و نەهێڵین بۆ ئێمە لەکون‌و کەلەبەرەوە فەرماندارمان بۆ بهێنن))[31].

هەینی ٢ خرداد ١٢٩٨(٣ رەمەزان ١٣٣٧-١٣ مە ١٩١٩)

لایەنگرەکانی سمکۆ بەردەوام بون لەسەر پێوەندی گرتن لەگەڵ خەڵك، لەبازاڕو لەماڵان‌و بەخەڵکیان ئەوت:

((لێرە بەدواوە ئەبێ فەرماندارەکان لەلایەن خەڵکی ورمێ‌و لەناو خەڵکی ورمێ هەڵ بژێردرێن و دابنرێن. تەنانەت سەرۆکی هەمو دائیرەو لقەکانیش ئەبێ

لەخەڵکی خودی ورمێ بن. ئەی ئەم هەمو ئەعیان‌و ئەشرافی ورمێ کەسەدان ساڵە خەڵکیان بەڕێوە بردوەو مەقاماتی حەساسیان هەبوە. بۆچی ئەبێ ئێستە لەگۆشەو کەنارا رابوەستن‌و فەرماندار بۆ ئێمەو ئەوان لەدەرەوە بێت؟ بۆچی سەرۆکی ئەزمیەو سەرۆکی ژاندارمرییان لەدەرەوە هێناوەو لەدەرەوە ناردوە؟

مەگەر لەخودی ورمێ کەسانی بەسیرو ئاگادار کەمن کەئەو کەسە پوچانەیان بەسەر ئێمەدا سەپاندوە کە بەکیبرو نوخووەت رەفتار ئەکەن. هەوڵ ئەدەن هەمیشە بەینی کوردو عەجەم تێك بدەن. گیرفانی خۆیان پڕ بکەن. بەزەرقوبەرقەوە بژین. مەگەر ئەوانەش خەڵکی ئەم وڵاتە نین. دڵیان بەم ناوچەیە ناسوتێ. تائێستە بەرامبەر بەو هەمو مانگانەیەی کەوەریان گرتوە، بایی دینارێ خەریکی ئاواکردنەوە بون‌و بۆ پێشکەوتنی ئەم بەشە کارێکیان ئەنجام نەداوە))[٣٢] .

ئەم قسانە کەشایەتێکی ئەو سەردەمە ئەیگێڕێتەوە، چونکە بێ بڕواییەکی قوڵ لەنێوان عەجەم‌و کورد، دروست بوبو، خەڵکی ورمێ بەدەنگیەوە نەهاتن تەنانەت کابرای شایەت کەلێی ئەدوێ ئەڵێ:

((دیسانەوە دارودەستەی سمکۆ لەکۆڵان‌و بازاڕدا کەوتنە پێوەندی لەگەڵ خەڵك‌و قسەیان بۆ ئەکردن(مەبەستی ئەو قسانەیە کەنوسراون) بیوڕای خۆیان رون ئەکردەوەو، کەوت بونە بڵاوکردنەوەی. مەعلومە کەکوردەکان لەجێگەیەکەوە تەعلیماتی ئیجتیماعی و ئەفکاری سیاسیان وەرئەگرن‌و تەنانەت وەزیفەی تەبلیغاتیان لەئەستۆ گرتوە))[٣٣] مەبەستی ئەمەن کۆمیسیۆنی ئەمریکاییە کەئەبێ دەرسی‌دا دابن.

لێکدانەوەی قسەی باش لەسەر بنچینەی سوئی نییەت، ئەویش رەنگدانەوەی ئەو پێوەندیە ناتاساییە بو کە لەماوەی چەند قەرنی رابردودا دروست بوبو. لەجوڵانەوەکەی شێخ عوبەیدوڵڵادا تەقی بوەوەو بوە شەڕێکی ئەهلی خوێناوی. لەکاتی جەنگی جیهانی‌و لەشکرکێشیەکانی عوسمانی‌و روسی‌دا دوبارە بو بوەوە. ئێستاش بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد بەرلەوەی ڕوبەڕوی بەرهەڵستی رەسمی‌و هێزی دەوڵەتی ئێران ببێ، روبەڕوی ریستی سەلبی عەجەم ئەبو.

ئەگینا ئەم قسانە، وەکو ئەو قسانەن کە لەسەردەمی مەشروتەدا ئەکران‌و، دوایی تر لەقانونی ئەساسی ئێراندا وەکو بەشێ لەمافەکانی خەڵك بۆ دانانی ئەنجومەنی ولایەتی‌و ئیالەتی نوسرا بون‌و. بەگشتی ئەچونە خانەی بیری دیموکراسیەوە. کەچی تورکە ئازەرییەکان گوێیان لێ نە ئەگرتن‌و، هاوکارییان لەگەڵ نە ئەکردن‌و، نەئەبونە هاودەنگیان.

ئێرانییەکان شێخ محەمەد خیابانی بە یەکێ لەئازادیخوازانی گەورەی ئێران دائەنێن. ساڵێ دوای ئەو روداوانە لەتەوریز((قیام))ی کرد لەوتارێکا کە لەکۆشکی ((تجدد))لەتەوریز بۆ لایەنگرەکانی داوەو، لەرۆژنامەی ((تجدد))ی ئۆرگانی بزوتنەوەکەیاندا بڵاوکراوەتەوە ئەڵێ:

((ئاغایان!

ئێوە ئەزانن بۆچی راپەڕین؟

ئەگەر هەلومەرجی پێش راپەڕین هەڵ بسەنگێنین، حاڵەتی ئەسەف ئەنگێزی مەملەکەتو ئیختیلافاتی بێ حەدو حەسری مالیەو ئیقداماتی بێ ناموسانەو جانبیانەی ئەزمیە(شەهرەبانی)بهێنینە بەرچاو، پێویستی ناچاری راپەڕین هەست پێ ئەکەینو تێ ئەگەین..

ئەو دزانەی کە لەتەوریز دەرئەکرێن(مەبەستی مەئمورینی ئیداریە)نابێ ببنە سەدرنشینی ئەمارەت، جانبیانی کە لەمەرکەزی ئازەربایجان هەڵدێن نابێ جڵەوی حکومەتی شارو ئوستانەکانی تر بەدەس بهێنن، چونکە هەمو خاکی ئازربایجانی ئێران پیرۆزو دیموکراسی ئێران خاوەنی شەخسیەتی حوقوقین...))[٣٤].

ئەم قسانەی خیابانی لەگەڵ قسەی جارچیە کوردەکانی ورمێ جیاوازییان چیە؟ بۆچی ئەبێ وتاری لەهەمان بابەتی کورد بە((تەعلیماتی))کۆمیسیۆنەکانی بێگانە دابنرێو وتاری خیابانی بە بەیانی ئازادی.

هێزەکانی سمکۆ ورمێیان ئابلۆقەدا. رێگەکانیان بەست. گرانیو قاتوقڕی لەشار بڵاوبوەوە. ئەڵقەی ئابلۆقە دانی شاری ورمێ تا ئەهات تەنگتر ئەبو چونکە هەمو رۆژێ زۆرتر کورد ئەهاتنە پاڵ سمکۆو، هەمو شەو هێرشیان ئەکردە سەر قەڵای ورمێ. خەڵکی ورمێ بەرگرییان ئەکردو نەیان ئەهێشت بکەوێتە دەست کورد.

((کۆمیسیۆنی جەنگ))چەکدارەکانی ورمێی بەسەر ٧ دەروازەکەی شارو بورجەکانو دیواری قەڵادا بۆ بەرگری لەهێرشی کورد دابەش کردبو[٣٥].

ئەم کۆمیسیۆنە نەی ئەتوانی پارەی کڕینی تفەنگو فیشەك و باروتو موچەی تفەنگچیەکان تەئمین بکا. داوایان لەمیستەر پاکارد سەرۆکی میسیۆنی ئەمریکایی کرد ٣هەزار تومانیان بەقەرز بداتێ. ئەویش پارەکەی پێدانو بەوە کەوتنە دیفاع لەشار[٣٦] سەیر ئەوەیە لەگێڕانەوەی روداوەکاندا ئاغای تمەن کورد تاوانبار ئەکا بەوەی پارەیان لەمیستەر پاکارد وەرگرتوەو بە ئامۆژگاری ئەو کەوتونەتە جوڵان. کەچی لەهەمان کاتدا خۆی وەرگرتنی پارە لەپاکاردا بۆ کڕینی چەكو دابین کردنی پێویستیەکانی بەرهەڵستی کورد ئەگێڕێتەوە.

۲۰ی مایسی ۱۹۱۹هێرشی بۆ سەر شار دەس پێ کردەوە. سەرەتای شەوی ۱۲ی رەمەزان هێرشەکەیان توند کرد، بەڵام چەکدارەکانی ورمێ بەرهەڵستیان کرد. هێرشەکەی ئەم جارە سمکۆ خۆی راستەوخۆ سەرکردایەتی ئەکرد. تەرکیزی کردبوە سەر دەروازەکانی نوگچر، عەسکەرخان، بلو. هەوڵیاندا لەلای بلووە درزێك بکەنە دیواری قەڵاوە. هێرشی ئەمجارەش دوای ئەوەی ۳٦ سەعاتی خایاند نەیتوانی دەس بەسەر ورمێدا بگرێ. لەبەرئەوە کشانەوە[37].

ئابلۆقە دانی ورمێ ماوەی ۲٥ رۆژی خایاند. خەڵکی شار لەو ماوەیەدا ئازایانە بەرگرییان لەشارەکەیان کردو نەیان هێشت بکەوێتە دەست کورد. کۆنسولی ئینگلیز کەوتە ناوبژیو حاکمێکی نوێ بۆ ورمێ دانرا. لە١٥ی تیرماهی ۱۲۹۸ (۸ی شوالی ۱۳۳۷/ ۸ ژوئیە ۱۹۱۹)سمکۆ ئابلۆقەی ورمێی بەردا. پاراستنی ئاسایشی رێگەکان بەسمکۆ خۆی سپێردراو بەم کارە لەلایەن فەرمانداریەوە مانگانەی بۆ بڕدرایەوە. ئەویش چەند کسێ چەکداری بۆ ئەم کارە تەرخان کرد[38].

لەو دەوروبەردا سمکۆ ئەی ویست دەسەڵاتی خۆی فراوان بکا بۆ گوندەکانی لەکستانو سوڵتان ئەحمەدو قەرەقشلاخ کەئازەری بون. ئەوانە ملیان نەئەداو شەڕی خوێناوی رویدا لەنێوانی خەڵکی ئەویو هێزەکانی سمکۆدا. دانیشتوانی ورمێو دەوروبەری بەردەوام داوای یارمەتییان لەتەورێزو تاران ئەکرد.

### ٥/۳ گفتوگۆیەکی سەرنەکەوتو

سەردار ئینتسار تازە بوبو بەجێگری والی کەوتە سازدانی هێز بۆ سەرکوت کردنی سمکۆ. سەرەتا ماژور میرحسێنخانی لەگەڵ هێزی ژاندارم رەوانە کرد. بەدوی ئەواندا دەستەی قازاخ. داوای سوارەی لەهەمو لایەك ئەکردو پەیتا پەیتا ئەی ناردن. لەتارانەوە فیلیپوف سەرکردەیەکی قازاخیان بۆ فەرماندەیی لەشکر نارد.

فیلیپوف دوای دیتنی سەردار ئینتسار چو بۆ شەرەفخان بۆ دەس کردن بەکار. چەند شەڕو تێکهەڵچون لەنێوان کوردو هێزی ئێراندا رویدا. گرنگ ترینی ئەو شەڕانە لەنزیك دیلمقان قەوما. ٤ کەس لەسەرکردەکانی قازاخو چەند کسێ لەسەرکردەکانی ژاندارم کوژران. دیلمقان ناوەندی سەلماس کەوتەوە دەست هێزی ئێران.

سمکۆ تەلگرافێکی بۆ عین الدولەی والی ئازەربایجان نارد. عین الدولە ئەگەرچی والی ئازەربایجان بو بەڵام لەزەنجان دائەنیشت. عین الدولە فەرمانی راگرتنی شەڕیدا. شەڕ راوەستاو گفتوگۆ لەنێوان سمکۆو سەردار ئینتسارو

فیلیپوف دەستی پێ کرد. ئێرانیەکان ئەم مەرجانەیان بۆ لێ خوش بونی سمکۆ دانا بو:
١-تالآنیەکانی لەکستان بداتەوە بەخاوەنەکانی‌و خوێنبایی کوژراوەکان بدا.
٢-پاشماوەی سوپاییانی عوسمانی لای خۆی دەربکا.
٣-دەس وەرنەداتە کاروباری سەلماس‌و ورمێ.
٤-خەرجی لەشکری دەوڵەت بیژێرێ.
٥-هەرچی تفاقێکی جەنگی لایە تەسلیمی دەوڵەتی بکا.
٦-ئەحمەد ئاغای برای بنێرێ بۆ تەورێز بۆ ئەوەی لەقازاقخانە لەناو سەرکردەکاندا بێ[٣٩].
هەر کەس نەختێ رێزی خۆی بگرێ مەرجگەلی لەو بابەتە قوبوڵ ناکا، نەك کەسێکی بەناوبانگ ولاسارو خاوەن ئامانجی سیاسی گەورەی وەکو سمکۆ. گفتوگۆ سەری نەگرت. زۆری نەخایاند تێکهەڵچون‌و شەڕ دەستی پێ کردەوە.
سمکۆ بەکردەوە خەریك بو دەسەلآتی لەناوچە دێهاتیەکانی ورمێ، سەلماس، خوی، میاندواو، شنۆ.. جێگیر ئەبو.
### ٦/٣ درێژەکێشانی شەڕ
حکومەتی ئێران لەبەردەمی گۆڕانی ناوەکی گرنگدا بو. ناوەندی دەسەلآتی زۆرو ناکۆك دروست بوبون. پشێوی لەهەمو ئێراندا هەبو. دەسەلآتی ناوەندی کز بو. دەسەلآتی زنجیرەی قاجار خەریك بو کۆتایی ئەهات. رەزا خان لەقازاقێکی پچوکەوە بوبو بەئەفسەرێکی گەورە. دوایی تر بو بەسەرداری سوپا. بەبیانوی رزگارکردنی نیشتمانەوە لەپشێوی‌و لاوازی خۆی ئامادە ئەکرد دەسەلآت بگرێتە دەست‌و خۆی ببێ بەشای ئێران.
لەتاران کابینە زۆر نە ئەمایەوە، لەئازەربایجانیش والیەکان زو زو ئەگۆڕان. کارەکانی سمکۆ لەهەمو ئێراندا دەنگی دابوەوە. کاری ئەکردە سەر دامەزران‌و مان‌و روخانی کابینە[٤٠]. لەبەرئەوە هەر کابینەیەك ئەهاتە سەر کارو هەرکەس ئەبو بەوەزیری جەنگ ئەبو دواهێنان بەبزوتنەوەی سمکۆ لەبەرنامەی کارەکانی‌دا بێ.
سمکۆش لەهەوڵدانێکی بەردەوامدا بو بۆ فراوان کردنی ناوچەکانی شۆڕش‌و ئازادکردنی مەڵبەندە کوردنشینەکان لەدەسەلآتی عەجەم. هێزەکانی شۆڕش ورمێ، سابلاغ، شنۆ، خوی کەوت بوە ژێر دەست.
کاتێ مخبر السلطنە بو بەوالی ئازربایجان یەکەمین لەشکرکێشی گەورە بۆ سەر سمکۆ دەستی پێ کرد.

مخبر السلطنه هێزێکی قازاخی بەفەرماندەیی سەرتیپ ظفر الدوله ناردە تەسوجو هێزێکی ژاندارمی بە فەرماندەیی ملك زاده نارده ساباڵخ. هێزەکانی کورد ئەم دو هێزەیان تەفروتونا کرد. ظفر الدوله بۆ ئەوەی خۆی لەدیلی دەرباز بکا بە بەلەم لەگۆمی ورمێوە هەڵات. ملك زادەش بەدیل گیرا[٤١].

سمکۆ ئەفسەرەکانی پاش ماوەیەك ئازاد کردو بەملك زادەی وت: ((ئاغا برۆ بەم والیە بێ لیاقەتە دڵڕەقە بڵێ، شەرم بیگرێ، لەم چەند هەنگاوەی دوایی تەمەنیدا لاوانی بڕەمەندو تازە پێگەیشتو نەکاتە خۆراکی لولەی تۆپ))[٤٢].

لەسەر داوای هەمان والی ١٥٠٠ ژاندارم بە سەرکردایەتی لیند بیرگ گەیشتە تەورێز، پاش حەسانەوە رەوانەی شەرەفخانە کران.

هێزێکی ٣ هەزار کەسی چریکی تازەرییش بەسەرکردایەتی امیر ارشد کۆکرابوەوە. امیر ارشد سام خانی حاجی علیلو برای محەمەد حسێن خانی ضرغام، بکوژی جەعفەر ئاغای شوکاك بو.

اقبال السلطنەش بەسوارەکانی ماکۆوە ئەبو بەشداری ئەم هێرشە بێ.

لەرۆژی ٢١ی کانونی دوەمی ١٩١٩ (٢٨ ازرماه ١٣٠٠ش ٢٧ ربیع الاول ١٣٣٨) قەمەریدا لەداوێنی کێوی شکریازی لەبەینی خوی‌و سەلماسدا لەشوێنێکا بەناوی قانی دەرە(واتە دۆڵی خوێناوی) هێزەکانی ئێران‌و لەشکری کورد لێکیاندا.

ئەم هێزە لەسەرەتادا هەواڵی سەرکەوتنی خۆی‌و شکانی کوردی بڵاوکردەوە. بەڵام امیر ارشد کە لەبەرزاییەکانی شکریازیەوە سەرکردایەتی شەڕەکەی ئەکرد کوژرا. هێزەکەی پەرەوازە بون‌و لاشەی خۆیشی لەمەیدانی شەڕا بەجێ ما[٤٣].

ئەم هێرشە لەبەر خراپی پلانەکەی‌و ناڕێکوپێکی هێزەکەو لێ نەهاتویی سەرکردەکانی تێ شکا. وورەی شۆڕشگێڕانی کوردی پێ بەهێز بو. بەڵام ئەمە سەرەتای دەس پێ کردنی لەشکرکێشییە گەورەکانی حکومەتی ئێران بو لەسەرەتادا بۆ ڕێبڕین لەتەنینەوەی شۆڕشی کوردو ئینجا تەسك کردنەوەی ناوچەکانی‌و سەرەنجام لەناوبردنی یەکجاری.

### ٧/٣ ڕەفتاری سمکۆ لەگەڵ دوژمن

هەندێ کاری سمکۆ جێگەی ڕەخنە لێ گرتن بو. تا ئەندازەیەك کاری لەناوبانگی سمکۆش کرد بو، هەڵوێستی لەهەندێ ئەنجومەنی مەشروتەخوازان، کوشتنی مارشیمۆن، ڕاووروت‌و تاڵانی کەهێزەکانی لەناوچەکانی دۆست‌و دوژمندا ئەیان کرد. ڕەفتاری ڕەقی خۆی لەگەڵ دوژمن. دوژمن‌و ناحەزەکانی سمکۆو بزوتنەوەی کورد پڕوپاگەندەی زۆریان بەم کەرەستانەوە ئەکرد. بگرە بۆ زڕاندنی ناوی کوردو

شکاندنی ناوبانگی بزوتنەوەکەی‌و بەدناوکردنی سمکۆ زۆریـان بـەم قسـانەوە ئـەنا. نوسەرانی ئێرانی هەتا ئێستەش کـەدەربارەی سمکـۆ ئەنوسـن، لایـەنی بێلایـەنیی‌و پێوانەی زانستیی بەر ئەدەن. بەدوژمنایەتییـەکی بـێ ئەنـدازەوە وەکـو جەردەیـەکی خوێنڕێژی خێڵەکی دواکەوتو باسی ئەکەن.

لەو گفتوگۆیەدا مستەفا پاشا لەگـەڵی کـردوە،، سمکـۆ هەنـدێ لـەو رەخنانـەی لەباری سەرنجی خۆیەوە رەت کردۆتەوە. دەربـارەی کوشـتنی مـارشیمۆن، راووڕوتـی هێزەکانی، رەفتاری رەق بەرامبەر دوژمن دواوە، دو نمونە لێرەدا رائەگوێزین:

((پرسیار: هۆی کوشتنی ئەو ۸۰۰ دیلـە فارسـەی کـە لەسـێپتەمبەری سـاڵی رابردودا گیرا بون، چی بو؟

وەڵام: ئەوانە وەختی خۆی لەشەڕی ورمـێدا گیرابون، هـیچ خراپەیـەکمان لەگـەڵ نەکردن، بەڵکو جل‌و پارەمـان دانێ بەو مەرجەی نەچـنەوە پـاڵ ئێـران، بـەرەڵلامـان کردن. بەڵام هەر کەبـەربون چونەوە پـاڵ ئێـران‌و دەسـتیان کـردەوە بەدەسـدرێژیی‌و کوشتن‌و برین، بۆیە ئەمجارە لێیان خۆش نەبوین‌و تۆڵەمان لێ کردنەوە.

((پرسیار: کەواتە ئێوە دەڵێن، بـە تـەواوی بـۆ نیشـتمان هـەوڵ دەدەن، وانیـە؟ بەڵام ئەی بۆچی کەسابلاختان گـرت، دوکانـەکانیان تـالان کـران‌و هەندێکیشـیان کوژران، لەناو ئەوانەدا قازی لطیف کەپیاوێکی ناسراوو رێز لێگیراو بو؟

... ئایا ئەو جۆرە روداوانە ئێرانیەکان دڵ خۆش ناکاو بۆ سودی ئەوان نیە؟

وەکو بیستم مـاڵی حاجی ئیلخانی سـەرۆکی ناسـراوی دیبـۆکری تـالان کـراوە، لەبەرئەوە هیچ دور نیە کەبەشێك لەمـەنگوڕو بەگزادەی گەورك‌و ناوچەی سەقز دژی تۆ یەك بگرن...

((وەڵام: وەختێك رومان کردە سابلاخ، ناردمـان بەشوێن هەمو سەرکردەکانـدا، بەڵام نەهاتن. هیچ نوێنەرێکی سەقز یا نێردراوێکی نـەهات. ئێرانیـەکانیش لـەناو شاردا شەڕیان دەکرد. شەڕەکە دو رۆژ درێژەی کێشـا. ئـەوە بـو لەئـەنجامدا نـاو شـار گیراو هەندێك کەس کوژران. شوکاکیشیان تێدا بو. لەو شەڕەدا دانیشـتوانی شـارو عەشایەر تێکەڵ بون‌و تێکرژان‌و رەشاش‌و تۆپیشی تێدا بەکارهێنرا.. لەحاڵـەتێکی وادا، ناتوانرێت رێگا لەتالان‌و برۆ بگیرێت، ئەگەرچی من خۆم زۆر دژی ئەوە بوم.

ئێمە گومانمان لەعەشیرەتی مەنگوڕو دیبوکری هەبو، بـەڵام گوێشـمان نەدایـە. حاجی‌ی ئیلخانی بەوەشەوە نەوەسـتا کەهـەر ببێتـە لایـەنگری ئێرانیـەکان، بـەڵکو بەناوی کوردەوە داوای لەخـەڵك دەکـرد. کەبچـنە پـاڵی‌و شـەڕمان لەگـەڵدا بکـەن. عـەشیرەتی مامـەش زۆر دڵسۆزی ئێمەن کوڕی خوالێخۆشبو محمود ئاغـای هـەمزە ئاغامـان کـردە حـاکمی سـابلاخ‌و کـەریم ئاغـای بـرای بەموفەتیشـی ناوچـەی

حەمەجان(؟) و ناوچەی بانەلیس(؟) و گەورکی دراوسێی. دوای گرتنی سابلاخ توانییان فارسەکان لەسەقز دەربکەن، بەلام لەسەر داوای خەلکی سەقز دەولەت ٣٠٠-٤٠٠ جەندرمەی خۆی لەسنەوە ناردو بانالیسیان گرتەوە...))[٤٤].

٤-سمکۆو رۆژنامەوانی

رۆژنامەوانی کوردی لەچاو رۆژنامەوانی لەناو گەلانی ترا درەنگ لەدایك بوە. کوردستانی ئێران دوای شوێنەکانی تریش کەوتوە. وەکو هەندێ سەرچاوە ئەگێرنەوە یەکەمین گۆڤار بەزمانی کوردی بەناوی ((کوردستان))ەوە سالی ١٩١٢ لەلایەن میسیونێرەکانەوە لەورمێ چاپ کراوە. ئەویش زۆر نەژیاوە[٤٥]. بەلام سەرچاوەیەکی تر ئەلێ: عەبدولرەزاق بەدرخان رۆژنامەیەکی کوردی لەورمێ لە ١٩١٢دا دەرکرد, کەروسەکان عەبدولڕەزاق بەگیان لەورمێ دورخستەوە، دوای ئەو سمکۆ ئەرکی دەرکردنی گرتە ئەستۆ تا ١٩١٤ کەداخرا[٤٦] ئاگادارییەکی ئەوتۆ دەربارەی ئەم رۆژنامانە هێشتا لەدەستا نیە. سمکۆ لەزەمانێکا ورمێی بەدەستەوە بو. هەفتەنامەیەکی کوردی- فارسی بلاوکردۆتەوە. دوای گرتنەوەی ورمێ ئەویش راوەستا.

٤/١ رۆژنامەی ((کورد)) یا ((رۆژی کورد-شەوی عەجەم))

تەدن خاوەنی چاپخانەیەکی ورمێ، ئەگێرێتەوە:

((رۆژێکیان شێخ عەبدوللا((لەکەسانی تێگەیشتوی سمکۆو لەخزمانی سەید تەها))هاتە لامو، لەناو قسەکانی‌دا دەری خست ئاغا((واتە سمکۆ))لەبەرچاوێتی بەهۆی نەبونی بلاوکراوە لەرضائیە ئەم نوقسانیە نەهێلێو لەرضائیەش رۆژنامە بلاوبکرێتەوە، ئایا بەرەئی ئێوە بە چ قەوارەو تیراژ ئەتوانرێ رۆژنامەیەك لەم شارەدا بلاوبکرێتەوە کەهەم سەنگینو هەم جوان بێو هەم جێگەی سەرنجدان بێ. نوسەر لەوەلامی شێخ عەبدوللا وای رون کردەوە: بەداخەوە حەرفەکانی چاپخانەکەمان زۆر کەمەو بۆ چاپی رۆژنامە بەس نیە. شێخ عەبدوللا وەختێ ئەم وەلامەی بیست، زۆر تێکچوو گۆڕا منیش ترسامو هەستم بەهەلەکەی خۆم کردو وتم: ئەگەر لەگەل کرێکارەکانی دامەزراوەکەی خۆمان تەقەللا بدەین لەوانەیە کەموکورییەکانی نەهێلینو چاپی رۆژنامەکە مومکینە، بەلام ئەبێ زەحمەتی زۆر بکێشین تا کەرەستەی پێویست ئامادە ببێ. لێرەدا قیافەتی شێخ عەبدوللا گۆڕاو وەلامی نەدایەوە. هەرچەندە ئەو بەلێنی ئەدا کەهەقدەستی کرێکارەکانو کارەکەرانی رۆژنامەکە بدا، بەلام نە دەکرا لەو رۆژانەدا بڕوا بەقسەی کورد بکەی. لەبەرئەوەی یاخی بون لەفەرمانی سمکۆ لەو هەلومەرجەدا یاری کردن بو بەگیان، پاش دو سێ رۆژ هەلاتم...))[٤٧]

دوای راکردنی ئاغای تەمەدن، دیارە سمکۆ هەر سور بوە لەسەر دەرکردنی رۆژنامە. هەمان نوسەر لەسەری ئەڕوا:

((تابلۆی چاپخانەی تەمەدنیان لابرد بو، لەجێگەی ئەو تابلۆی چاپخانەی غیرەتیان لێ دانا بو. رۆژنامەیەکیان بەزمانی فارسیو کوردی بڵاوکردبوەوە. تەنیا بەناوی رۆژنامەی هەفتەیی کورد لەژێر ناوی((رۆژی کورد-شەوی عەجەم))کەدوایی تر بەناوی((رۆژی کورد))و دوایی‌تر تەنیا بەناوی((کورد))بڵاوی‌کردبوەوە.

ژمارەی یەکەمی لە١٢ی مانگی شەوالی ١٣٤٠دا بەمودیری محەمەد تورجانی بڵاوکراوەتەوە))[٤٨]

مامۆستا سەجادی دەربارەی ئەم رۆژنامەیە نوسیوێتی: ((کورد))رۆژنامەیەکی کوردیو زمانی حاڵی سمایل ئاغای سمکۆ بوە، لە١٩٢١ لەشاری ورمێ دەرچوە، تەنها سێ چوار ژمارەی لێ دەرچوە لەوە دوا پەکی کەوت[٤٩].

لەم رۆژنامانەی تەمەدن باسیان ئەکا، تا ئێستا هیچ کامیان نەدۆزراونەتەوە کەبێگومان نرخێکی مێژوییان هەیە بۆ خوێندنەوەو تێگەیشتنی باری سەرنجی سمکۆو هەواڵو روداوەکانی ئەودەم.

### ٢/٤ سمکۆ لەهەفتەنامەی((بانگی کوردستان))دا

سمکۆ لەکوردستان وەکو قارەمانی نەتەوەی کورد سەیری ئەکرا. هەفتەنامەی کوردی- فارسی-تورکی((بانگی کوردستان))لەلایەن((جەمعییەتی کوردستان))ەوە لەو سەردەمەدا لەسلێمانی دەرئەچو. خاوەنی ئیمتیازو بەرپرسو سەرنوسەری حاجی مستەفا پاشای یاملکیو، نوسەری بەشی کوردیو فارسی عەلی باپیر ئاغاو شێخ نوری شێخ ساڵحو نوسەری تورکی رەفیق حلمی بو.

لەزۆری ژمارەکانی((بانگی کوردستان))دا هەواڵ، دەنگوباسی شەڕ، شیعر، وتارو لێدوانی بۆ پشتیوانی لەسمکۆ نوسیوە.

لەژمارەی ١ی رۆژی ٢ی ئاغستوسی ١٩٢٢دا بەفارسی نوسیوێتی:

((لەبابەت تێکشکانی کوردەوە لەدەوری خۆی لەجەریدەکانی ئێراندا چەند دێڕێ بەرچاو کەوت. نوسینەکانی ئەو جەریدانەمان پێ راست نەبو، بەپێی بیستراوەکانی ئەم دواییە نابێ بەو شائیعاتی ئێرانیە باوەڕ بکرێ. بۆ بەرهەڵستی ئێران ئیسماعیل خان(سمکۆ)هێزی کافی هەیە. لەژمارەی داهاتودا درێژییەکەی ئەنوسرێ))

لەژمارەی ٢ی رۆژی ١٤ی ئاغستوسی ١٩٢٢دا هەر بەفارسی چەند هەواڵێکی لەرۆژنامەکانی ئێران وەرگرتوەو وەڵامی داوەتەوەو وتارێکی درێژی لەسەر

پێشینەی مێژویی باوباپیرانی سمکۆو هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش نوسیوە. لێرەدا هەندێکی رائەگوێزین:

ئێران ٣ی ذی القعدە ١٣٤٠: راپۆرتی تەلگرافی خۆی هەواڵ ئەدا بەپێی ئەو دەنگوباسانەی گەیشتون بەیانی ٥ی سرطان: ٢٦ی جونی ١٩٢٢ لەشکری کورد هێرشی بردۆتە سەر گوندی رەزال. شەڕێکی قورس بو. سەرەنجام کوردەکان شکان‌و چەند کەسێکیان کوژراون‌و بریندار بون. عەلی نەقی خان یاوەری فەوجی نۆهەمی خوی‌و دو سەرباز زامار بون.

ئێران ٧ی ذی القعدە: بەپێی راپۆرتی گەیشتو لەحەوتەمی سرطاندا هێزەکانی خوی لەگەڵ ئەشراری دەوروبەری ئەوێ تێك هەڵچون. سەرکەوتن بۆ هێزەکانی دەوڵەتی بوە.

ئێران ٩ی ذی القعدە بەپێی هەواڵی تەلگرافی کە لەئازەربایجانەوە گەیشتوە. لەم دواییەدا لەدەوروبەری خوی چێکادانێ لەگەڵ کورد روی داوە. لەئەنجامدا ٢٨ کەس لەکوردەکان بەجۆرەی خوارێ کوژراون.

٢ ئەرمەنی، ٦ عەسکەر، ٢٠ کورد، ٢٨ سەر ئەسپ‌و محەمەد ئاغا ناو کە لەبەهادورانی ئیسماعیل ئاغاو سەرۆکی ئەم ٦٠٠سوارە بوە کوژراوە. زیان ٨ بریندا.

**بانگی کوردستان:**

ئەوەندە بڕوای بەم روداوانە نیە، لەم زەمانەدا بونی ئەرمەنی لەناو لەشکری کوردا دورە. روداوی بۆمبایە واتە نارنجۆکی کە بەفێڵ‌و بەنزمی لەتاریخی شەعبانی ٣٣٧ی هیجری لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە بۆ(چاری)بۆ ئیسماعیل خانیان نارد بو بەئەرمەنیەکاندا رەوانەیان کرد بو.

ئیتر کوردانی شوکاك چۆن بەچ مەرجێ لەگەڵ ئەرمەن پێك هاتون.

ئەمە بۆ ئێمە نەزانراوە. مەبست لەعسکەر چیە ئەوەش خەیاڵە.

مەسەلەی بۆمبا (نارنجۆك)کەبو بەهۆی ئەم جیاوازیی‌و ناکۆکیە خوێناریە لەنێوان کوردو عەجەم‌داو ئێستا بەوپەڕی توندوتیژییەوە درێژە ئەکێشێ بەجۆرەیە..))

بانگی کوردستان بەدرێژی داستانی بنەماڵەی سمکۆو چۆن کاربەدەستانی ئێرانی ئیسماعیل ئاغای باپیرە گەورەی، عەلی باپیری‌و جەوهەر ئاغای برایان بەفێڵ کوشتوەو، محەمەد ئاغای باوکی بەدورخراوەیی لەمرودس مردوە، نوسیوە، لەبەر درێژی وتار پاشماوەکەی لەژمارەی داهاتودا تەواو کردوە. لەوێدا روداوی ناردنی بۆمباو تەقینەوەی بەدرێژی ئەگێڕێتەوە.

لـەژمارەی ٤ی ڕۆژی ٢٨ی ئاغستوسی ١٩٢٢دا لـەژێر سـەرناوی((سمکـۆ)دا نوسیویّتی:

((سمکۆ وەکو خەبـەرمان زانیـوە لەئـەترافی (شـەرەفخانە)لەسـەر ڕێـی تـەورێز لەساحیلی شیمالی گۆلی ورمێ، لەشکری سمکۆ لەگەڵ لەشکری عەجـەم شـەڕێکی بەشیددەتیان بوە. کوردان غالیبو عەجەم وەکو پێشو هەر مەغلوبن)).

لـــەژمارەی ٥ی ڕۆژی ٤ی ئـــەیلولی ١٩٢٢دا لـــەژێر ســـەرناوی((سمکـــۆو عەجەم))نوسیویّتی:

((بینا لەئەخباری ئەستەمول غەزەتەی ئەلرافدان نوسیویە کە لەشکری سمکـۆ داخلی تـەورێز بـوە. وەزارەتـی تـەهران لەخـەوفا تەلـەبی موعاوەنـەتو ئیمدادی لەفیرقەی یازدەهەمی بولشەویك(روسیە)کردوە.

((سەبا هەڵسە دەخیلت بم بڕۆ چارێ لای سمکۆ

((بلێ تاوی بدا ئەسپی هەتا تەبرێزو قافلانکۆ

((هەمو کرمانجو کرماشان بەئاواتن بەجانو دڵ

((سنە حازر هەمو خەلقی دەڵێن: بێ لەشکری سمکۆ!))

لەژمارەی ٦ی ڕۆژی ١٨ی ئەیلولی ١٩٢٢دا لـەژێر سـەرناوی((دیسـان سـەردار نصرت:(سمکۆ)ئیسماعیل خان)) نوسیویّتی:

بینـــا بەئـــەخبارێکی تـــازە کـــە لەبانـــە وەرگـــیراوە جـــەنابی ئیســـماعیل خـان(سمکـۆ)لـەپاش ئەمـە کەمەقـەڕی خـۆی یـەعنی(چـاری)تـەرکو تەحەسـونی بەمەوقیعی مەنیعی شـاخانی سـۆمایو لەشـکرێکی عـەجـەمی بێشـومـار چـاریو ئەترافیان هەمو ئیستیلاو یەغما کـرد. سمکـۆ چـەند ڕۆژێ ئـەم ئەحواڵـەی سـەیرو تەماشاو بەم وەسیلەوە عـەجەمەکانی ئیغفالو تەداروکاتی خۆیشی ئیکمال دەکـرد. لەپاش ئەم استحضاراتە شەوێك بەسەر لەشکری عەجەمدا شەبەیخونێکی ماهیرانـەی کردو بەروایەتێکی مەوسوقە قەریب پێنج هـەزار تەلـەفیاتو برینـداری بـەئۆردوی عـەجـەمدا و لـەپاش ئەمـەیش بـۆ ئـەتراف تەصـمیمی نوسـی کەحەسیەلئینسـانیە هەرکەسو هەر عەشیرەتێکی کورد بەقەدەری ئیمکانی خۆی بـۆ کفـنو دفنـی ئـەو عەجەمانە موعاوەنەتی نەقدییـەی تەلـەب کـرد.. لەسـەر ئـەم غالیبیەتـەش دیسـان جـەنابی سمکـۆ عــودەتی بـۆ چـاری موناسـیب نـەدیوەو لەگـەڵ تـەرتیباتێکی مەخسوسەی خۆی مەشغوڵە. بـزانین تـا ئـەم حەملـەی دوەمـە بـۆ کوێیـە. وەلحاسـل جەنابی سمکۆ دیسان غالیبە. ئێمـە زاتـەن تـا ئێسـتا بەمەغلوبیـەتی ئـەو چـونکە بەراستی باوەڕمان نەکرد بو هەر بەحسی غالیبەتی ئـەومان دەنوسـی. ئینشـائەڵلا هـیچ کـوردێ لەسـەر حـەق مـەغلوب نابـێو لـەخودا تەمـەننا دەکـەین کەئـەم

ئیختیلاف‌و موونازەعاتە لەبەینی کوردان یەعنی قەومی پەهلەوی‌و عەجەم دایە بەزوویی موبەدەلی خێر ببێ تا لەهەردو تەرەف نەوعی یەتی بەشەرو موسلمانان ئیتر زەرەر دیدە نەبن. چونکە کورد بۆ ئێمە چەند مەتلوبە دۆستیی هەموو ئێران‌و عەجەمان کەخانەدانی موحتەرەم مونەوەرانی بەقیمەتی زۆرەو بۆ ئێمە ئەوەندە بەقیمەت‌و پێویستە.

بەشارەت بێ دەڵێن سمکۆ هجومی کردە سەر ئێران
بلاوەی کرد عەجەم، تێك چون، وەکو رێوی لەبەر شێران
شەبەیخونێکی مەردانە شوکاک‌و هەرکییان کردی
بڵندی کرد بحمدالله کولاهو تەپڵەی کوردان
دەسا کوردان فیداتان بم هەمو هەڵسن بەیەکجارە
نەتیجەی ئەم شەڕە خێرە، کەئیستیقلالە بۆ کوردان))

لەژمارەی ٨ی رۆژی ٢٩ی ئەیلولی ١٩٢٢دا لەژێر سەر ناوی سمکۆ))دا نوسیویێتی:

((بینا لەکاغەزێك کە لەبانەوە هاتوە جەنابی سمکۆ هەتا ئێستا دو دەفعە لەگەڵ عسکەری عەجەم موسادەمەی واقیع بوەو هەردو دەفعەکە تەلەفیاتێکی زۆری لەعەجەمەکان داوە، بەموفەقییەت گەڕاوەتەوە بۆ چاری))

لەژمارەی ٩ی رۆژی ٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا لەژێر سەرناوی(ئیسماعیل خانی سمکۆ نوسیوێتی:

((مودەیێ کە لەتەرەف ئیسماعیل خانەوە هیچ خەبەری نەبو، دوێنێ لەبانەوە خەبەری هاتوە کەسەردار نصرت(سمکۆ)لەپاش ئەمە کەچاری(مەقەڕی قەدیمی خۆیان)لەعەجەمان بەزۆر گرتەوە. لەشکری مظفری شوکاکانی بۆ تەرەفی سەلماس رەوانە کردو دیلمان کەمەرکەزی مەحاڵی(قەزا)ی سەلماسە لەدوژمنانی خۆی پاك‌و ئیستیرداد کردوە. خودا کوردان لەسەر حەق لەهەمو جێگایەك غالب بکاو بەمەئمورانی مەغروری عەجەمانی دۆستمانیش ئینساف‌و فەهمێکی با سیاسەت بدا تائەم خوێن رژاندنە لەبەینی دوفیرقەی ئیسلامدا تەواو ببێ.

بکێشە خەنجەرت سمکۆ بدە نەعرە هەتا توران
سەلامی کە لەشاە رای(؟)کەیارە بۆ هەمو کوردان
نیهایەت دە بە قاجاران کەجای قاجار لەتورانە
وەلی جای پەهلەوی‌و فورسان تەواوی مولکی ئێرانە
دەسا دیبوکرییان هەڵسن لەگەڵ مەنگوڕ بەئازانە
ببەستن رێی فیرار(؟) ئەسیری کەن بەمەردانە.

لەژمارە ١٠ی رۆژی ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣دا لەژێر سەرناوی سمکۆ سەردار نصرت ئیسماعیل خان))دا نوسیویێتی:

((لەمینە ئاغا کەرەئیسی عەشیرەتی گەورکی تەرەفی سەقزەو خۆی ئێستاکە لەدێی کەندە سورەی تابیعی بانەیە ریوایەت دەکەن جەنابی سمکۆ(ئیسماعیل خان سەردار نصرت)ئەز سەرنو شەهری ورمێی ئیستیلاو ئیستیرداد کردوەو عەشایەری کوردانی ئەو تەرەفانە حەتتا گەلیاغیو سائیرەی جیهەتی سەقزو چوار سینەیش بۆ موعاوەنەتی سمکۆ بیلعوموم حازرنو حکومەتی ئێرانیش ئەم جارە لەهیمەتو سەباتی کوردان تێ گەیشتوەو بو بەمونا کەرە رێککەوتن خەبەری بۆ سمکۆ ناردوە. مەعلوم دەبێ کەخەبەری خێری تەشەکولی حکومەتی موستەقیلەی کوردستان لەسلێمانیدا دەماری حەسییەتو غیرەتی کوردانی هێناوەتە حەرەکەت.

دەسا کوردان بەقوربانتان هەمو یەك بن وەکو شێران
وەها بن تا خودا بیکا لەزولمی دائیمی ئێران[٥٠]

### ٥- پێکهێنانی((ئەرتەش))ی نوێی ئێران

رۆژی ٣ی ئەسفەند ماهی ١٣٩٩ی خورشیدی رەزا خان بەکودەتایەکی سوپایی دەستی گرت بەسەر حکومەتی ئێراندا. خۆی بوە سەرداری سوپاو وەزیری جەنگو دەسەلاتداری یەکەمی ناو دەوڵەتی ئێران. رەزا خان لەپێش هەمو شتێکا نوێ کردنەوەو رێکخستنەوەی هێزە چەکدارەکانی کردە ئەرکی سەرەکی بەرنامەی کارەکانی. هێزە چەکدارەکانی ئێران لەو سەردەمەدا ناوی جیاوازیان هەبو. لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرانی بێگانەدا بون:

-بریگادی قازاق، لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرانی روسیدا بو
-ژاندارمەری لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرانی ئینگلیزیدا بو
-پۆلیسی جنوب لەژێر سەرکردایەتی ئەفسەرانی ئینگلیزیدا بو

ئەم هێزانە لەناو خۆیاندا ناکۆك بون. هەندێ جار ئەچون بەگژ یەکا. جلوبەرگو پلەیان لەیەك نەئەچو. جاری واهەبو بە٨ مانگ ١جار موچەیان ئەدرایە. موچەی ئەوانە بەزۆری لەلایەن ئەفسەرەکانیانەوە ئەخورا. هێزە چەکدارەکانی ئێران خۆیان بەخەڵك ئەژیاندو زۆڵموزۆریان لێ ئەکردن.

### ١/٥ ئەرتەشی نوێ

رەزاخان ، سەرداری سوپا، لەرۆژی ١٤ی قەوسی ١٣٠٠دا بناغەی((ئەرتەشی))ی یەکگرتوی ئێرانی دانا. لەروی ناوو جۆری رێکخستنو سەرکردایەتییەوە پەکی خستو، ئەفسەرانی بێگانەی لێ دورخستەوەو ئەفسەرانی

ئێرانی لەجێگە دانان. ڕێکخراوەکانی ((ئەرتەشی شاهنشاهی ئێران))ی لەئوستانە جیاوازەکانی ئێراندا بەم جۆرە سازدا:

لەشکری ١ی تاران

بەفەرماندەیی ڕاستەوخۆی سەرداری سوپا، ڕەزاخان

سەرۆکایەتی ستادی سپێردرا بو بەسەرهەنگ ٢ ئیسماعیل شفائی

ڕێکخراوەکانی بریتی بو لە:

١-تیپی تیرئەندازی گارد

٢-تیپی تیرئەندازی عیراق

٣-تیپی سواری گارد

٤-تیپی تۆپخانە

٥-بەشی سەربەخۆیی گەیلان، تەنگابون، مازندەران

لەشکری ٢ی شیمالغەرب لەتەورێز

بەفەرماندەیی سەر لەشکر ئیسماعیل فضلی

سەرۆکایەتی ستادی سپێردرا بو بەمحەمەد حسێن میرزا فیروز

ڕێکخراوەکانی بریتی بو لە:

١-بریگادی تێکەڵاوی قازاق

٢-تیپی تێکەڵاو(ئاتریاد)ی ئەردەبیل

٣-هەنگی ژاندارمری تەورێز

٤-بەتالیۆنی سەربەخۆی ژاندارمری زەنجان

لەشکری ٣ی خوراسان لەمەشهەد

بەفەرماندەیی سەرلەشکر حسێن خزاعی

سەرۆکایەتی ستادی سپێردرا بو بەسەرهەنگ ٢ محەمەد حسێن میرزا جهانبانی

ڕێکخراوەکانی بریتی بو لە:

١-بەشی تێکەڵاو(ئاتریاد) قازاقی خۆراسان

٢-هەنگی ١٠ی ژاندارمری ئستراباد

٣-هەنگی سەربازی سدەو هەنگی سەربازی قاین‌و بەشی تۆپخانەی سیستان

لەشکری ٤ی ئەسفەهان

بەفەرماندەیی سەرلەشکر محەمەد ئایرم

سەرۆکایەتی ستدای سپێردرا بو بەسەرهەنگ حەیدەرقلی پسیان

ڕێکخراوەکانی بریتی بو لە:

١-بەشی تێکەڵاو(ئاتریاد)ی قازاقی ئەسفەهان

٢-هەنگی ژاندارمەری ئەسفەهان
٣-بەتالیۆنی سەربەخۆی کاشان
لەشکری ٥ی هەمەدان
بەفەرماندەیی سەرلەشکر ئەحمەد ئەمیر ئەحمەدی
سەرۆکایەتی ستادی سپێردرا بو بەسەرهەنگ عەبدولرەزاق افخمی
رێکخراوەکانی بریتی بو لە:
١-ئاتریادی هەمەدان، ئاتریادی بروجرد
٢-هەنگی ١١ی ژاندارمی کوردستان
٣-هەنگی ١٢ی ژاندارمی کرماشان
٤-هەنگی ٧ی ژاندارمی عیراق
٥-هەنگی ٨ی ژاندارمی بروجرد[٥١]

ژاندارم، قازاق، سەرباز لەژێر ناوی نیزام یەکخران. جلوبەرگیان وەکو یەکی لێ کرا. رەزا خان خۆی گرنگییەکی تایبەتی ئەدا بە ئەرتەش‌و ئەفسەرەکانی، بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی خۆی، دەسەڵاتێکی نائاسایی‌دا بو بەوان بۆ سەرکوت کردنی خەڵك‌و دامەزراندنی دەسەڵاتی ناوەندیی دەوڵەت، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا لەچەند شوێنی گرنگی ئێراندا پشێوی‌و هەڵگەڕانەوەی چەکدار هەبو، کەیەکێکیان بزوتنەوەکەی سمکۆ بو لەناوچەی ورمێ‌و لەمەڵبەندی موکریان.

## ٢/٥ لاوازییەکانی سمکۆ

ماوەی چەند ساڵێکی خایاند تا حکومەتی ناوەندی ئێران خۆی گرتەوە هەندێ لەلاوازییەکانی چارە کرد. سمکۆ نەی توانی کەڵك لەو کات‌و لاوازیە وەربگرێ.

سمکۆ هەینەتێکی ئەرکانی جەنگیی نەبو، رێکخراوێکی سیاسی یا ئەنجومەنێکی سەرکردایەتی‌ی نەبو، هەروەها ستراتیجێکی جەنگیی- سیاسی دیاری کراوی نەبو. هێزەکانی لەچەکداری هۆزەکان پێك هات بو نارێکوپێك‌و مەشق نەدیو بون. شارەزای شەڕی نیزامی نەبون‌و بۆ بەرهەڵستی سوپای نیزامی رانەهێنرا بون. نەیان ئەتوانی بەباشی‌و رێکوپێکی ناوچە رزگار کراوەکان بەڕێوە ببەن‌و نەیان ئەتوانی پارێزگاری جەنگیی ناوچەو شارەکان بکەن لەبەردەمی هێزی ئێرانی‌دا.

دوای رزگارکردنی شارەکانی ورمێ‌و سەلماس‌و سابڵاخ جوڵانەوەکە توشی جۆرێ لەراوەستان بو نە تەنییەوە بۆ ئوستانە کوردنشینە گرنگەکانی کوردستان‌و کرماشان‌و ئیلام. هەندێ لەسەرۆکی هۆزەکانی ئەو شوێنانە هاودەردی‌و هاوکاری

زۆرتریان لەگەڵ شێخ محمود دەرنەبڕیو نەچونە پاڵ سمکۆ. جولانەوەکە لەناوچەیەکی جوگرافی تەسکی کەم بایەخی ستراتیجی ئێران قەتیس ما.

هێزەکانی سمکۆ لەزۆری شەڕەکانی‌دا هەندێ سەرکەوتنی بەدەس هێنابو. بەڵکو جەزرەبەی کاریگەری لەهێزە چەکدارەکانی دەوڵەتی ئێران سرەواند بو[٥٢] بەڵام هێزەکانی سمکۆ لەچەکداری ئێلاتی کورد پێك هات بون. هەرچەندە ئێرانییەکان بۆ پاساودانی تێکشکانەکانی خۆیان ئەڵێن ئەفسەرانی تورك لەناو هێزەکەی‌دا بون بەڵام راستییەکەی هیچ پسپۆڕێکی بێگانەی تورك یا نەتورك لەهێزەکانی سمکۆدا نەبو. ئەم هێزانە نە سەرکردایەتییەکی شارەزای هەبو بەرێوەی ببات و نەهەینەتێکی ئەرکانی هەبو بەشێوەیەکی نوێ رێکی بخاو، پلانی خۆپاراستنو بەرەنگاریو هێرشی بۆ دابنێ. تەنانەت ئەو ئەفسەرە کوردانەی ((جەمعیەتی کوردستان))ناردنی بۆ هاوکاریی لەگەڵ سمکۆ هێشتا لەسەقز بون. نەگەیشت بونە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی ئەو، هەواڵی شکانی سمکۆو سەرکەوتنی ئەرتەشی ئێرانیان بیستو بەدڵشکاوی گەڕانەوە[٥٣] ئەگەرچی لەو کاتەدا توانای ئەوە هەبو، چەندین ئەفسەری لێوەشاوەو خاوەن تەجروبەی کورد کەپێشتر لەناو ئۆردوی عوسمانی‌دا فێر بوبون، ئامادە بون هاوکاری سمکۆ بکەنو لەریزی هێزەکانی ئەوا بەدڵسۆزی کاربکەن. سمکۆ کەڵکی لەوانە وەرنەگرت، لەسەرشێوەی کونینەی عەشایەری هێزەکەی بەرێوە ئەبردو هەمویان فەرمانیان لەخۆی وەرئەگرتو راستەوخۆ بەسترابون بەخۆیەوە. بۆیە چارەنوسی بزوتنەوەکەش بەند بو بەچارەنوسی سمکۆ خۆیەوە.

سمکۆ کەڵکی لەکاتی لاوازیی ئێران وەرنەگرت بۆ پێکهێنانی لەشکرێکی رێکوپێك و دروست کردنی رێکخراوێکی سیاسیو کۆکردنەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی خەڵكو دامەزراندنی بەرێوەبەرایەتییەکی ئەوتۆ لەکوردستان‌دا کەمافو ئاسایشی سەرو سامانی خەڵك دابین بکا. لەو کاتەدا ئێران بەتەنگوچەڵمەیەکی قوڵدا تێ ئەپەڕی لەچەند شوێنی جیاجیای‌دا هەڵگەڕانەوەی چەکداری دژی دەسەڵاتی ناوەندی دەستی پێ کرد بو، سمکۆ لەگەڵ ئەوانەش نەی توانی پێوەندی هاوکاریو هاودەنگی دامەزرێنێ. لەبەرئەوە زەمینەی ناوەکی تێکشکانی بزوتنەوەکەی تا ئەهات تەخت تر ئەبو. حکومەتی ئێران پاش خۆگرتنەوەی بەچەند هێرشێکی یەك لەدوای یەك توانی هەمو ناوچە ئازاد کراوەکانیان لێ بسێنێتەوە، بزوتنەوەکە بە تەواوی تێك بشکێنێ.

رەزاخان کەڵکی لەنارێکوپێکیو لەیەك دابڕاوی جولانەوەکانی ناو ئێران وەرگرت بۆ دامەزراندنی دیکتاتۆرییەتی خۆیو پێکهێنانی ئەرتەشێکی نوێو

چەسپاندنی دەسەڵاتی ناوەندی حکومەتی ئێران‌و تێکشکاندنی هەمو بزوتنەوە دیموکراتی‌و ئازادیخوازەکانی ئێران.

### ٣/٥ لەشکرکێشی یەکەمی ئەرتەش

ئیسماعیل ئاغای ئەمیر فضلی دانرا بەفەرماندەی لەشکری شیمالغەرب.

بۆ بەهێزکردن‌و پشتیوانی لەکارەکانی ئەم لەشکرە ٤ هەزار چریکی کوردو ئازەری بەسەرکردایەتی خالۆ قوربان‌و هەندێ قازاخ لەمیاندواو کۆکرابوەوە.

خالۆ قوربان کوردی کرماشان‌و یەکێ لەهاوکارە نزیکەکانی میرزا کوچك خانی جەنگەلی‌و، وەزیری جەنگی حکومەتی جەنگەڵ بو، دوای خۆبەدەستەوەدانی هێزێکی چریکی عەشایەری پێك هێنا بو شان بەشانی ژاندارم‌و قازاخی ئێران بەشداری ئەکرد لەسەرکوت کردنی جولانەوەکانی دژی دەوڵەتدا.

سەرۆکی ستادی ئەم هێزە سەرهەنگ روح الله کیکاوسی بو(پێشان نازناوی جهانبانی بو)کیکاوسی ئەبو جولانی جەنگیی هێزی چریك لەگەڵ فەرمانەکانی سەرکردەی گشتی عملیاتدا بگونجێنێ.

هێزەکانی تەورێز لەبەندەری کمارلو، سوارەکانی ظفرالدولە لەخوی، هێزەکانی چریك لەمیاندواو مۆڵ درا بون.

لەتارانەوە سەرتیپ حبیب الله شیبانی بۆ پشکنین‌و سەرپەرشتی گشتی عەمەلیاتەکە نێردرا.

هێزەکەی خالۆ قوربان ئەبو خەتی نێوان موکریان و ورمێ بگرێ بۆ ئەوەی هێزەکانی کورد لەو دو شوێنە لەیەك دابڕێ.

هەر ٣ هێز ئەبو پێکەوە هەریەکەیان لەقۆڵی خۆیەوە پێشڕەوی بکا بۆ سەر بارەگای سمکۆ.

هاوزەمان لەگەڵ خۆئامادەکردن بۆ ئەم لەشکرکێشییە سەرهەنگی ژاندارم لاهوتی لەتەورێز یاخی بو. لاهوتی کوردی کرماشان بو. سەردەمێ حوکمی ئیعدامی درا بو. لەسەر ئەوە هەڵات بو بۆ ئەستەمول‌و ماوەیەك لەوێ بو. تێکەڵاوی ئازادیخوازانی کوردو تورك بوبو. پاشان حکومەتی ئێران لێی خۆش بو، بەپلەی سەرهەنگی گەڕایەوە ناو ژاندارمی ئێران. یەکەمین هەلی کەبۆ هەڵ کەوت، تەورێزی گرتە دەست، بەتەما بو بچێتە سەر تاران. شیبانی بۆ سەرکوت کردنی لاهوتی هەندێ لەهێزەکانی گێڕایەوە بۆ تەورێز. جولانەوەکەی لاهوتی زۆر زو سەرکوت کرا. لەم کاتەدا هێزی کورد پەلاماری هێزەکانی خالۆ قوربانیدا. لەبەرزاییەکانی ئیندرقاش لای بۆکان بو بەشەڕ. خالۆ قوربانی سەرکردەی چریکەکانی کوژرا. هێزەکە بەکوژرانی سەرکردەکەیان ورەیان بەرداو ریزەکانیان

تێك چو. بەتێکشکاوی بڵاوەیان لێ کرد. سەرهەنگ کیکاوسی، سەرهەنگ شهاب بهادرالسلطنەو ئەفسەرەکانی تری لەگەڵ خالۆ قوربان بون نەیان توانی هێزەکە رێك بخەنەوە. ئەوانیش خۆیان و قازاخەکانیان دەرباز کرد.

ژمارەی دوەمی رۆژنامەی ((کورد))ی زمانی بزوتنەوەکەی سمکۆ بەزمانی فارسی ریپۆرتاجێکی لەسەر ئەم شەڕە نوسیوە. ئاغای تمدن لەکتێبەکەیدا وەکو خۆی رای گوێزاوە. وەکو بەڵگەیەکی مێژویی لێرەدا کوردییەکەی ئەنوسینەوە.

((هەواڵنێری ئێمە ئەنوسی:

کوژرانی خالۆ قوربان و شکانی ئۆردوەکەی بۆ ئاگاداری خوێنەرانی بەرێز رون ئەکەمەوە. رۆژی ٢٨ی مانگی رەمەزانی ١٣٤٠ی قەمەری لەکاتێکا ئۆردوی کورد لەژێر فەرماندەیی سەید تەها ئەفەندیدا لەدەوروبەری گوندی قزلوی خاکی ئەفشار پەلاماری ساپین قەڵای دابو هەواڵی هێرشی ئۆردوی خالۆ قوربان لەمیاندواوە بۆ شارویران و سابڵاخ لەلایەن دو سواری ئاغای سەرداری موکرییەوە هات دەسبەجێ روی کردە سابڵاخ. شەوی ٢٩ی رەمەزان لەبۆکان مایەوە سبەی بەیانییەکەی زو جولا و دو سەعاتی مابو بۆ رۆژئاوا لەنزیك گوندی درمان. سەرانی عەشایەر لەگەڵ سەید تەها ئەفەندی بۆ گفتوگۆو راوێژ کۆبونەوەو پلانی پەلاماردانی ئۆردوەکەی خالۆ قوربانیان بەمجۆرە دانا:

جیهانگیر بەگ(لەئیلی هەرکی)ئەسکەندەر خان(خەڵکی برادۆست)حەمزە ئاغا(لەئیلی مامەش)و ئەمیر ئەسعەد دیبوکری و سالار سەعید لەخەتی لاچین، لەکاتی ئاوابونی خۆردا لەهەر ٣ لاوە لەکاتێکی دیاری کراودا دەس بکەن بەهێرش و دەسرێژ.

امیر العشائرو امیر اسعدو سالار سەعید لەبەیانی ٢٩ی رەمەزان لەبەرزاییەکانی کێوی زاوابوکەوە هەڵیان کوتایە سەر تاقمێ لەهێزەکانی خالۆ قوربان کە لەسەرگردی دوشان مەجید لەناو سەنگەردا خۆیان بۆ شەڕ ئامادە کردبو. لەهەردولاوە بو بەشەڕ. سوارانی کورد نەیان هێشت شەڕ درێژە بکێشێ رژانە ناو سەنگەرەکانی عەجەمەکانەوە. ئەوانەیان بەلولەی تفەنگ دەرکردو راو نا. هەندێکیان دیل و هەندێکیان کوژران و هەندێکیشیان رایان کرد بۆ گوندی ئەگریقاش بۆلای خالۆ قوربان. سوارەکانی امیر العشائر حاجی سطوە السلطنەی حوکمرانی سابڵاخیان بەدیل گرت و سوارەکانی امیر اسعدیش یەك عەرادە مەترەلۆزیان دەسکەوت بو. ئەسپ و قاترو تفەنگێکی زۆر لەکاتی هێرشەکەدا گیرابو.

امیر العشائرو سالار سەعید پاش تەواوکردنی کوشتن‌و بەدیل گرتنی تاقمەکەی دوشان مەجید تاقمی سواریان بۆ راونانی راکردوەکان ناردو خۆیان هەڵیان کوتایە سەر تاقمێکی تری هێزەکانی خالۆ قوربان کە لەسەر کێوی غەزالی بون، ئەوانەش دوای تێکهەڵچونێکی کەم شوێنەکەیان چۆڵ کردو هەڵاتن. لەوانەش هەندێکیان کوژراو دیل کراو ئەسپ‌و تفەنگێکی زۆر گیرا.

سوارەکانی سالار سەعید لەوێدا عەرادەیەك مەترەلۆزیان گرت. هەر کەراکردوانی ئەم دو شوێنە بەم داماوی‌و لێقەوماویە گەیشتنەوە ئاگریقاش، ئۆردوەکەی خالۆ قوربان ترسان‌و دەستیان کرد بەراکردن.

لەوکاتەدا ئاغایانی مەنگورو هەرکی‌و زەرزا شالاویان بۆ بردن لەپێکدانەکەدا خالۆ قوربان لەگەڵ ژمارەیەك خاوەن پایەو خەڵکی تر کوژران‌و ژمارەیەکی زۆریشیان بەدیل گیران. تاقمەکەی سەید تەها ئەفەندی ۳ عەرادە تۆپ‌و سوارەکانی مەنگورِ ۱ عەرادەو سوارەکانی هەرکی ۱ عەرادە مەترەلۆزو تفەنگ‌و کەلوپەلێکی زۆرو ۲ عەرادە تۆپی گەورەیان دەسکەوت. خالۆ قوربان بەگێڕانەوەیەك سوارەی ئەحمەد کلالی ئاغای مەنگورو بەگێڕانەوەیەکی تر ئەحمەد خانی هەرکی کوشتویانە.

راکردوانی ئۆردوی خالۆ قوربان زۆریان گەڕاونەتەوە شوێنەکانی خۆیان‌و تاقمێکی دوسەد کەسیشیان چونەتە تەورێزو کۆلۆنێل نصرالله خان سەرۆکی ئۆردوی ژاندارمری کە لەساین قەڵاوە پەلاماری موکری دابو، بە تەواوی لەم روداوانە بێ ئاگاو بەوپەڕی مەغرورییەوە روی کرد بوە بۆکان‌و بەتەما بو بداتە پاڵ خالۆ قوربان.

امیر اسعد لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵ دەسبەجێ خۆی گەیاندە میراوای لای بۆکان‌و کۆلۆنێلیش چو بوە ناو بۆکانەوە، هەر کەهەواڵی کوشتنی خالۆ قوربان‌و راکردنی ئۆردوەکەی ئەبیستێ، بۆکان بەجێ ئەهێڵێ‌و ئەڕوا بۆ لای ساین قەڵا.

سوارانی بەگزادەو سەرداری موکری کەوتنە دویان‌و سوارەکانی امیر اسعدی‌و هەمو ئاغایانی دیبوکرییش گەیشتنە یارمەتی سوارانی موکری‌و بەگزادە، ئۆردوی ژاندارمرییان لەکێوەکەی پشتی گوندی ئالبلاخ گەمارۆدا، ژمارەیەکی

زۆریان لێ کوشتن‌و دیل کردو دەسکەوتێکی زۆریان گرت. لەو پەلامارەدا سولتان عبدالحمیدخان، ئەفسەری ژاندارمری، کوژراو کۆلۆنێل لەگەڵ پاشماوەی هێزەکەی بەشەو لەکێوەکە هات بوە خواری‌و لەکوێرە ڕێگاوە رای کرد.

ئاغایانی بەگزادە، فیض‌الله بەگییش تۆپێکی گەورەیان گرت‌و ناردیان بۆ چەهریق. لەڕاستی‌دا تێکۆشان‌و تەقەلای گشت ئاغایانی موکری، بۆ بەجێهێنانی فەرمانی نەتەوەیی، شایانی ڕێز لێ نانە. انشاءالله بەناوی هەقناسییەوە لەو جەریدە ناوازەیەدا ئەنوسرێ. ع ش))[٥٤].

ئەم لەشکرکێشییە بەشکان‌و ریسوایی دوایی هات. بەڵام سەرکردایەتی ئەرتەشی نوێ تەجروبەو شارەزایی زیادی ئەکردو ڕێکخستنی نوێی خەریك بو ئەچسپا.

## ٤/٥ دوایین لەشکرکێشی

تێکشکانی هێزی ئێران‌و درێژەکێشانی ڕوداوەکانی ئازەربایجان پەژارەیەکی زۆری لەتاران دروست کرد بو. ڕەزاخان پێویستی بەدەسکەوت‌و سەرکەوتن هەبو بۆ خۆی. سەرتیپ شیبانی کسەرکەوتو نەبو لەکارە جەنگییەکانی‌دا دژی سمکۆ، کێشرایەوە بۆ تاران. سەرتیپ امان الله میرزای جهانبانی سەرۆکی ستادی ئەرتەش خۆی چوە ئازەربایجان، بو بەفەرماندەی گشتی هێزەکانی ئازەربایجان. دکتۆر مصدق لەو ڕۆژانەدا والی تەوریز بو. دەستی لەکار هەڵگرت. وەزارەتی کیشوەر کسی کەی لەجێگەی ئەو دانەنا بەوالی. کاروباری ئیالەتی بەجهانبانی سپارد. بەجۆرە جهانبانی بەگوتەی ئێرانیان((دەسەڵاتی کیشوەری‌و لەشکری))پێ سپێردرا. کەوتە کۆکردنەوەو سازدانی هێزەکانی ئێران‌و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر سمکۆو، دارشتنی پلانی پەلاماردانی.

### ١-دارشتنی پلانی هێرش

پاش ئەوەی جهانبانی زانیاری تەواوی لەجوگرافیای ناوچەکەو هێزەکانی سمکۆ چاری کۆکردەوە کەوتە دارشتنی پلانی هێرش. بەجۆرە فەرمانی دەرکرد:

١-هەمو ئەو هێزانەی لەتارانەوە هاتون جگە لەسوارە نیزام کە لەژێر فەرمانی ئەمیر لەشکر ئیسماعیل ئاغای امیر فضلی‌دا بو بەهۆکانی گوێزانەوەی دەریایی بەنهێنی‌و لەناکاو لەبەندەری دانالو بۆ بەندەری شەرەفخان بگوێزرێنەوەو لەوێ جێگیر بن. سوارە نیزامی هێزی ناوبراویش ئەبو بەزۆرترین کات لەوشکاییەوە خۆی بگەیەنێتەوە بەندەری شەرەفخان.

ب-بەزوترین کات هەمو هێزەکانی ئازەربایجان لەبەندەری شەرەفخان کۆببنەوە. هێزەکانی ئێران بەهۆی شەرەفخانەوە ئەی توانی دەس بەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی

گۆمی ورمێدا بگرێو لەوێوە بجولێ. هێزی کورد لەکەناری رۆژئاوای گۆمی ورمێدا بەندەرەکانی قوچیو گولمانخانەی بەدەستەوە بو، بەهۆی نەبونی هۆی گواستنەوە نەی ئەتوانی کەلکی تەواویان لێ وەربگرێ لەنێوان هەردو بەندەریشدا بەرزایی ((سەنگی کاظم))بەدەست کوردەوە نەبو. بەدەست یاخییەکی عەجەمی بەناوبانگی ئەو ناوەوە بو.

هێزەکانی دەوڵەت بەهۆی گۆمی ورمێوە ئەیان توانی مناوەرەی خێرا بکەنو لەلای چەپو راستەوە بجولێنو لەهەر شوێنێکی کەناری رۆژئاوایدا، کە بەدەست کوردەوە بو، بیانەوێ دابەزن، بەم پێیە بڕیاریدا:

١-لەبەرئەوەی لەسەروی گۆمی ورمێدا دیوارێکی تەخت هەیە کەهەورازی قزل داغەو لەشارستانی سەلماس تەواو ئەبێ، وا دانرا ئەو هێزانەی لەبەندەری شەرەفخان کۆبونەتەوە بەدزە کردن لەدیواری تەختی سەرو لەبەرزاییەکانی قزل داغەوە راببورنو دوای گرتنی شارستانی سەلماس راستەوخۆ هێرش ببەنە سەر قەلای چەهریق. بۆ ئەمەش ئەبو لەوشوێنە دابەزن کەبەدەس کاظمی یاخییەوە بو.

٢-هێزی چریك کە بەناوی گوردانی مورادی ناوئەبراو لەپاشماوەی هێزەکەی خالۆ قوربان پێك هێنرا بو لەژێر سەرکردایەتی مراد خانی کوردا لەگەڵ هێزێکی پچوکی نیزامی لەژێر فەرمانی راستەوخۆی سەرهەنگ ابوالحسن خان پورزندا ئەبو لەکەناری رۆژئاوا لەبەندەری سەنگی کاظم دابەزن. فەرماندەی هەمو ئەم هێزە بەپورزند بو.

هێزەکانی دەوڵەت کە بەسەرکردایەتی سەرتیپ امان الله میرزای جهانبانی لەشەرەفخانە کۆبوبوەوە لەم بەشانە پێك هات بو:

١-ستادی فەرماندەیی گشتی هێزەکانی ئازەربایجان

جهانبانی ویستی زۆرترین سود لەئەفسەرانی لاوو خوێنەوار وەربگرێ. سەرهەنگ سەیف الله شەهاب، سەرهەنگ روح الله میرزا، سەرهەنگ شاهرخ میرزا، سەرهەنگ ئەحمەد خان چارلسکی(دوایی ناوی گۆڕی بۆ ئەقسی)لەسەرۆکایەتی ستادی گشتی دانران. سەرهەنگ یوسف خانو سەروان مهینیش هەر لەوێ کاریان پێ سپێردرا.

٢-ستونی گارد، پێك هات بو لەهەنگی پیادەی پەهلەوی، هەنگی پیادەی رضاپور، یەك سواران سواری اکتشافی ١ ئاتەشباری روسی، ٤ عەرادە تۆپ بەسەرکردایەتی سەرتیپ فضل الله خانی زاهدی(ناوی پێشوی بصیر دیوان بو)

۳-ستونی شیمالغەرب پێك هات بو لە۲ هەنگی پیادەی لەشکری ئازەربایجان، ۱ سوارانی اکتشاف ۱ ئاتەشبار، ٤ عەرادەی روسی شاخی، بەسەرکردایەتی سەرتیپ حسێن مقدم.

٤-ستونی سوارە پێك هات بو لەهەنگی سواری لەشکری شیمالغەرب هەنگی سواری خاوەن چەکی قورسی مەرکەز، ۱ ئاتەشباری شنایدەری صحرایی، ۱ دەستە تۆپخانەی ابوخوفی صحرایی، بەسەرکردایەتی سەرهەنگ کریلائی عەلی خان نخچوان.

٥-شەرکەرانی غەیرە نیزامی کەهەزار کەس بون بەسەرپەرشتی ئەفسەرانی ئەرمەنی.

٦-ئاتریادی هەمەدان بەسەرکردایەتی سەرهەنگ رضاخان کنهی بۆ احطیاط لەبەردەستی فەرماندەیی گشتیدا دانرابو.

۷-سەرهەنگ مەحمود خانی پولادین لەگەڵ هێزێکی بچوکی نیزامیو سواری چریكو ژاندارمەری، لەساخلوی نیزامی خوی بن.

هێزەکانی دەوڵەت بەهەموی بریتی بو لە۸ هەزار پیادەو ۱ هەزار سوارەو ٥ هەزار چریكو ۱ هەزار شەرکەری غەیرە نیزامی کەتێکڕا ئەی کردە ۱٥ هەزار کەس.

هێزی دەوڵەت بەبێ شەڕ لەسەنگی کاظم دابەزی. بەمەش جێگە پێیەکی گرنگی خۆیان لەناوچەکانی شۆڕشدا کردەوە. لەوێوە ئەیان توانی هێرش دەس پێ بکەن. کاظم هەمو تاقمەکەی خۆی بۆ چاوساغی ئەرتەش تەرخان کردو کوێرە ڕێگەکانی چەهریقیان پیشان دان.

فەرماندەی گشتی ((حوکمی عەمەلیاتی جەنگیی))بەمجۆرەی لای خوارێ بەهەمو سەرکردەکان راگەیاند.

ا-ستونی گارد: هەنگی پیادەی پەهلەوی، هەنگی پیادەی رضا پور، ۱ سوارانی سوارەی اکتشاف، ۱ ئاتەشبار ٤ ئەرابەی کوهستانی، لەژێر سەرکردایەتی فضل الله خانی زاهدی. ئەم هێزە ئەبو لەبەرزاییەکانی قزل داغو میشوداغ بەرەو قەڵای چەهریق پێشڕەوی بکەن.

ب-ستونی شیمالغەرب: هەنگی پیادەی لەشکری ئازەربایجان، ۱ سۆران اکتشاف ۱ ئاتەشبار، ٤٠کوهستانی، لەژێر سەرکردایەتی سەرتیپ حسێن مقدم. ئەبو لەبەرزاییەکانی شکریازی بەرەو قەڵای چەهریق پێشڕەوی بکەن"

ج-جەنگاوەرانی نا نیزامی: لەژێر سەرپەرشتی ئەفسەرانی ئەرمەنیدا، ئەبو لەلێواری روی سەروی کەناری گۆمی ورمێ بەرەو قەڵای چەهریق پێشڕەوی بکا"

د-ستونی چریك: لەبەندەری سەنگی كاظمدا لـەژێر سـەركردایەتی سـەرهەنگ ابو الحسن پورزند، ئەبو لەگەڵ عـمـەلیاتی هێزەكانی بەندەری شـەرەفخانە پێكـەوە هاوئاهەنگ بن‌و لەیەك رۆژدا دەس پێ بكەن.

## ٢-فه تحی چه هريق

لەبـەیانی رۆژی ٤ی مـوردادی ١٣٠١(بەرامبـەر بـە١٠ی موحـەرەم واتـە رۆژی عاشورای ١٣٤١) بەفەرمانی سەرتیپ جهانبانی عـمـەلیات بەخێرایی دەستی پێ كرد. لەهەمو لاكانەوە شەڕ بەگـەرمی دەسـتی پێ‌كـرد, لەبەرزاییـەكانی قـەزل داغ شەڕێكی سەخت لـەنێوان سـتونی هەنگـەكانی گـاردو هێزەكـانی سمكـۆدا رویدا، هێزی كوردەكان توانی بویـان كەرتـەكانی ئـەو هێـزە لەیـەكتری دابـڕێن‌و درزێكـی گەورە بكەنە ریزەكانییەوە، جهانبـانی سـتونی سـواری وەكـو هێـزی ئیحتیـاط بـۆ روداوی كتـوپڕ لەبەردەسـتی خۆیـا گـل دابـوەوە، دەسـبەجێ فـەرمانی‌دا بـەهێزی ئیحتیـاط ئـەو كەلێنـەی كوردەكـان كردبویانـە هێزەكـانی گـاردەوە پـڕ بكەنـەوە. تێكهەڵچون شەوورۆژێكی خایاند. هێزەكانی كـورد لـەوە زیـاتر بـەرەنگاریيان پـێ نەكراو، بەتێكشكاوی كشانەوە سەلماس‌و چەهریق. هێزەكانی ئێـران نـەیان هێشـت هێزەكـانی كـورد مـاوەی خۆرێكخسـتنەوە خۆكۆكردنـەوەیان هـەبێ. لەبەرئـەوە جهانبانی فەرمانی دواكـەوتنی هێـزی كوردەكـانی‌دا، لـەپاش دو رۆژ بەرهەڵسـتی كوردەكان سەلماسیان بەرداو، بەرەو چەهریق كشانەوە. سەرتیپ جهانبانی بۆ ئـەوەی ئەو سەركەوتنەی بەدەستی هێنا بو بیقۆزێتەوەو، نەهێڵێ هێزەكانی دوژمن فریـای پشودان‌و خۆرێكخستنەوەو بكـەون، فـەرمانی بەهـەمو هێزەكـانی‌دا هـەل لـەدەس نەدەن‌و هەمویان هێرش بەرن بۆ سەر چەهریق. هێزەكانی ئێـران لـەپاش برینـی ٨ فرسەخ رێگەی سەختی شاخاوی توانییان قۆنـاغ لـەدوای قۆنـاغ بەرهەڵسـتی پچـڕ پچڕی شۆڕشگێڕانی كورد تێك بشكێنن‌و بگەنە داوێنی قەڵای چەهریق‌و گەمارۆی بدەن، لەرۆژی ٢٠ی موردادی ١٣٠١دا قەڵای چەهریقیان گرت‌و هێزەكـانی سمكـۆ بەتێكشكاوی كشانەوە ناو خاكی توركیا.

جهانبانی مژدەی ئەم سەركەوتنەی بەم بروسكەیەدا بەرضاخان:

((لەچەهریقەوە، ژ ٦٤١:

مـەقامی مـەنیعی بەنـدەگانی حضـرتی اشـرەف وەزیـری جـەنگ‌و فەرمانـدەی گشتی قشون، دامت عظمته!

بەدوای راپۆرتی ژ١٧١ بەعـەرزی حضوری موبارەك ئەگەیەنێ" هێزەكـانی ئێمـە بەدوی دوژمنـەوە ئـەمڕۆ ٢٠هـەمی بـورجی ئەسـەد سـەعات ١١ی بەیانی قـەڵای چـەهریقی گـرت‌و، ئـەو تـۆپ‌و موسەلسـەلانەی لـەماوەی رابـردودا لـەهێزەكانی

دەوڵـەتی گـرت بـو، گێڕایـەوە. دوژمـن بەلێقـەوماوی رای کـردو موتـەواری بـو، هێزەکانی ئێمە بۆ راونانی دوژمن بەخێرایی لەپێشڕەوی دان.

فەرماندەی هێزەکانی ئازەربایجان

سەرتیپ امان الله))[55].

حسێن مکی لەبارەی گیرانی چەهریقەوە ئەڵێ:

((فەتحی قەڵای چەهریق شوهرەتێکی گەورەی پەیدا کـردو لەگشـت ئیـالاتو ولایەتـەکاندا دەنگـی دایـەوە زەمینەیـەکی‌دا بەدەسـت جەریـدەکانی لایـەنگری سەرداری سوپاوە کەماوەیەك لەو روەوە قەڵەم فەرسایی بکەن. تەلگرافی پیرۆزبـایی لەهەمو شارستانەکانەوە بۆ سەرۆکی حکومەتو سەرداری سـوپا نێـردراو لـەزۆری شـارەکاندا لەلایـەن فەرمانـدەکانی لەشـکرەوە بەشـانازی ئـەم پیرۆزییـەوە کردیـان بەجەژنو چراخان. بۆ سەرداری سوپا کە کابرایەکی ظـاهرسـاز بـو هـەلێکی لـەبار بـەدەس هـات لـەبارەی فتوحـاتی نیزامییـانی ئازەربایجـانو هێـزە ناوچـەییەکانی تەظاهوراتێ بنوێنێ. بەم بۆنەیەوە لە٢٨ی ئەسـەدی ١٣٠١ی خورشـیدی بەشـانازی سـەرکەوتنی ئـۆردوی دەوڵـەتی لـەئازەربایجان بـەپێی فـەرمانی وەزیـری جـەنگ لە((مەیدانی مەشق))جـەژنیان کـرد. هـەمو ئەفسـەران لـەم جەژنـەدا بەشـداربون. دوای نان خواردنی ئێوارە لەلایەن سـەرداری سـوپا(وەزیـری جـەنگی)ەوە وتـارێکی گرنگ درا کە لەباری سەرنجی بایەخو گیانی دیماگۆگیو بەگوتـەی هەنـدێ نیشـان دانـی سـەرداری سـوپا لـەباخی سـەوزا بـە تـەواوی شـایانی سـەرنج دانـە، چـونکە نوسـەرانی بـەتوانای سـەرداری سـوپا ئـەو وتارەیـان بـێ ئەنـدازە بـاش ئامـادە کردبو..))[56]

نوسەری بەناوبانگی ئێران ملك الشعراء بەهار، وەکو خۆی ئەڵێ، ئـەو وتـارەی بۆ سەرداری سوپا نوسی بو بەم بۆنەیەوە بیخوێنێتەوە[57].

### ٦- پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتان

### ١/٦ ئێران

ئێران، وڵاتێکی فرەنەتەوەو فرەزمانو فرەمەزەبە، قـانونی ئەسـاسـی بەرهـەمی مەشروتە هیچ دەسکەوتێکی تایبەتی بـۆ نەتـەوەکانی نـاو ئێـران بـەدەس نـەهێنا، کەمافی فەرهەنگی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوورییان دابین بکا. قانونی ئەسـاسـی ئەنجومـەنی ئییالـەتیو ولایـەتی سـەلماند بـو، ئەمـە ئێرانـی ئـەکردە وڵاتێکـی دیمـوکرات. بـەڵام ئیالەتـەکانو ولایەتـەکان لەسـەر بنچـینەیەکی نازانسـتی جیاکرابونـەوە، لەجیاکردنـەوەی سـنوری ولایەتـەکاندا، هێڵـی رەگـەز، زمـان، عەشـیرەت، نەتـەوە، مـەزەب، دیـن، پێویسـتی جـوگرافی، دەسـکەوتی ئـابوری،

تەنانەت مەسەلەی عەسکەری لێك نەدرا بووەوە، ئەگەر رێکخستنەوەی ولایەتەکان بەو گوێرەیە بوایەو، ئەنجومەنی ئیبالەتو ولایەت رێك بخرایە، ئەوسا ئێران لەرۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا لەوانە بو ببێتە نمونەی نیشتمانی پێکەوە ژیانی نەتەوەو رەگەزو دینو مەزەبی جیاواز.

لەئەنجامی شۆڕشی مەشروتەدا کورد هیچ دەسکەوتێکی پێ نەبڕا. کاروباری ولایەتەکەی نەدرایەوە دەس رۆڵەکانی خۆی. تەنانەت یەك رۆژنامەی بەزمانی خۆی پێ نەبڕا. هەروەها دەزگای فاسیدی دەولەتو، زولمی ژاندارمی لەسەر هەلّ نەگیرا، مەشروتە لەکوردستاندا نەك رەنگی نەدایەوە، بەلّکو ئەوەی لەمەشروتە خوازان ئەبو بەبەلاّ ئەیان نارده کوردستان.

دەزگای مەرکەزی، فەسادی گەیشت بوە رادەیەك، حوکمڕانی شارەکانی بەپارە ئەفرۆشتو، سەروەزیرانیش هەمو نیشتمانەکەی بەنرخێکی هەرزان ئەفرۆشت.

ئەو((غەدر))ەی کەمێژونوسی ئێرانی سەعید نەفیسی باسی ئەکا کە لەناو بنەمالّەی قاجارا بو بوە نەریتی حوکمڕانی، دوردۆنگیەکی وەهای دروست کرد بو کسەرکردەکانی کورد، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی شەخسی خۆیان، یاخود کێشەی گشتی میللەتەکەیان بڕوایان بەهیچ بەلّێنو گفتێکی حکومەتی مەرکەزی نەبو.

دەرباری ئێرانو کورە دەسەلاّتدارەکانی حکومەت بۆچونێکی دیموکراتییان نەبو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی، خواستی نەتەوەییان بەجیابونەوە خوازیو پارچەکردنی ئێرانو خیانەت لەشاو نیشتمان دائەنا. بەلّکو بەگوێرەی تێگەیشتنی رەسمیی ئەوان لەئێران قەومو قەبیلەو عەشیرەت هەبون، نەتەوەی جیاواز نەبو. دانیان بەبونی کوردا نەئەنا وەکو نەتەوەیەکی جیاواز. لەئێران یەك نەتەوە هەبو، ئەویش نەتەوەی ئێران بو. کوردیش قەومێکی ئێرانیە، بەلّکو لەقەومە رەسەنەکانی ئێرانە. لەم روانگەیەوە حکومەتی ئێران لەبەرئەوەی لای وابو کێشەی کورد لەئێراندا بەباشی چارەسەرکراوە، دوای راگرتنی جەنگی جیهانی لەکاتی بەستنی کۆنفرەنسی ئاشتیدا، داوای ئەکرد بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەی کورد لەتورکیا هەمو کوردستانی عوسمانی بخرێتە سەر ئێران.

رضا شا بەچاولێکەری مستەفا کەمال ئەی ویست جیاوازی نەتەوەو رەگەزو زمان لەئێران دا نەهێلێو نەتەوە- دەولەت دروست بکا. هەر بەو مەبەستە بو لەسییەکاندا وشەی((ئێران))ی لەباتی وشەکانی((پارس))و((فارس))کردە ناوی رەسمی ولاّتەکەی[58].

نیشتمانپەروەرانی کورد، لەوانە سمکۆ، لایان وابو ئێران نەتەوە نیەو ولاّتە. کورد نەتەوەیەکی جیاوازە لەفارسو ئازەریو تورکو عەرەب. ئەویش وەکو هەمو

نەتەوەکانی تری دنیا مافی ئازادیو سەربەخۆییو هەبونی دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەیە.

تەجروبەی کورد بەگشتی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران باش نەبو. تەجروبەی سمکۆش، هی خۆیو براکانیو باوکیو باپیریو باپیرە گەورەی باش نەبو. هیچ لایەکیان بڕوای بەوی تریان نەبو. کاربەدەستانی ئێرانی سمکۆیان بەیاخیو نافەرمانو راووڕوتکەر.. دائەنا، ئەویش کاربەدەستانی ئێرانی بەپەیمان شکێنو زینهار نەناسو زاڵمو بەرتیلخۆر.. دائەنا.

لەبەرئەو هۆیانە لەیەك گەیشتنی کوردو ئێران لەتواناادا نەبو، چونکە بۆچونو باری سەرنجو تێگەیشتنیان بۆ مافی نەتەوەیی ئەوەندە جیاوازو لەیەك دور بو، بەهیچ جۆرێ نەئەگەیشتنە یەکتری.

زمانی دانوسەندنی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ سمکۆ بەزۆری گوللەو دیوانی گفتوگۆیان بەزۆری مەیدانەکانی شەڕ بو. ئەو چەند جارەی ئێران لەئەنجامی لاوازیو گیروگرفتی ناوخۆیدا پێوەندی لەگەڵ سمکۆ کردوە. هەموی بەنیازی خاوکردنەوەی سمکۆو، دانانی رێوشوێنی لەناوبردنی بوە. ئەو چەند جارەش سمکۆ لەئەنجامی ناچاریو نائومێدیو تێکشکاندا پێوەندی لەگەڵ کردون، هەموی بەنیازی خۆگرتنەوەو جێگیر کردنەوەی خۆی بوە.

سمکۆ چەندین جار کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت.

گفتوگۆکانی لەگەڵ عین الدولە بەئەنجام نەگەیشت، چونکە لەسەر ئاستی سیاسی هیچ دەسکەوتێکی بۆ کورد یا بۆ خۆی تیادا نەبو، لەسەر ئاستی شەخسییش ئەیان ویست هەمو شتێکی لێ بسێنن بێ ئەوەی هیچی بدەنێ.

گفتوگۆکانی لەگەڵ رضاخان ۱۳٤۳کۆچی ئەویش هەر بەئەنجام نەگەیشت، چونکە رضاخان نەك هەر هیچ رەنگێکی سیاسی نەدا بەدیتنەکە، بەڵکو دڵنیاییو تەئمینی شەخسییشی لەلای سمکۆ دروست نەکرد، لەکاتێکا لەو دیتنەدا سمکۆ ئەی توانی رضا خان لەناو ببا.

دوایین گفتوگۆی ۱۹۳۰ لەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانی کێشی کردە ناو داوی مەرگەوە، بەکوشتنی خۆیو دوایی هاتنی بزوتنەوەکەی تەواو بو.

## ۲/٦ تورکیای کەمالی

تورکیا بەشکاوی لەجەنگی جیهانیی یەکەم دەرهات بو. هێزەکانی هاوپەیمانەکان چوبونە ناو ئەستەمولی پایتەختی عوسمانی تێکشکاوەوە. ئەوان دەستیان بەسەر کاروبارەکاندا گرت بو.

ئەگەرچی سولّتان مابو، بەلاّم پایەیەکی روکەش بو، دەسەلاّتێکی راستەقینەی نەبو، دەستی بەسەر هیچ شوێنێکی تورکیادا نەئەڕۆیشت. گەورە پیاوەکانی کورد لەئستەمولّ بەهیوای بەلێنی هاوپەیمانەکان کەوت بونە چالاکی سیاسیو رۆشنبیری، لەخەلکی کوردستان دابڕا بون. مستەفا کەمال لەئەرزڕومەوە کەوتە رێکخستنەوەی تۆردوی تورکو دەرکردنی هێزەکانی بێگانەو تێکشکاندنی بزوتنەوەی کوردو دانانی بناغەی تورکیای نوێ.

بۆچونی مستەفا کەمال بەرامبەر کوردو بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد هەرگیز هیچ لێلییەکی تیّدا نەبوە. لەو رۆژەوە لەئەرزڕوم کەوت بوە کارکردن. یەکێ لەبەندەکانی کارنامەی سیاسی بەگژاچونی جولاّنەوەی کوردو رێ گرتن بو لەهەمو چالاکییەکی سیاسیو فەرهەنگی کوردیو، هەولّ دان بو بۆ پەك خستنو شکاندنی هەولّی رزگاری خوزای کورد.

مستەفا کەمال هەر لەسەرەتاوە لقو بارەگاکانی هەمو رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی قەدەغە کردو، فەرمانی گرتنی دەرکرد بۆ جەلادەتو کامەران بەدرخانو ئەحمەد فائق کە لەگەلّ میجەر نوئێل چو بون بۆ مەلاتیە بۆ پێوەندی کردن لەگەلّ گەورە پیاوانی کورد دەربارەی خواستە نەتەوەییەکانی.

ناوچەکانی ژێردەسەلاّتی سمکۆ هاوسنوری ناوچەکانی جموجوّلّی کەمال بو، بەلکو پشتی جەبهەی هێزەکانی بو. بێگومان سمکۆ لەچالاکی سیاسیو دیپلۆماسیو رۆشنبیری رێکخراوە کوردییەکانی ئستەمولّ بێ ئاگا نەبو، چونکە هیچ نەبێ بەهۆی سەید تەهاوە کەهەم ژنبرایو هەم یەکێ لەهاوکارە نزیکەکانی بو، ئەبێ ئاگادار بو بێ. هەروەها ئەبێ لەهەلّوێستی مستەفا کەمالو جولاّنەوەکەشی بەرامبەر ئامانجە نەتەوەییەکانی کورد لەتورکیا کەم یا زۆر ئاگادار بوبێ.

سمکۆ باوەڕێکی قولّی بەوە هەبو، ئێران زۆر لاوازو بێ توانایەو تەقەللاکانی کورد لەوێدا کۆبکرێنەوە بۆ بەدەسهێنانی دەسەلاّتو دامەزراندنی ناوەندێکی سەربەخۆی کوردی. بۆ دامەزراندنی ئەوەش پێویستی بەچەكو تەقەمەنی ئەبێ، کەئەبێ لەشوێنێکەوە دابین بکرێ. سمکۆ ئینگلیزی تاقی کرد بوەوە ئامادە نەبون چەكو پارەی بدەنێ. سۆڤێت لەبارێکی وەهادا نەبو بتوانێ یارمەتی کورد بدا. ناوچەکەش جگە لەحکومەتی تورکیای کەمالی دەولّەتی تری تیّدا نەبو. بەتایبەتی ناوچەکانی سمکۆ راستەوخۆ نوسا بون بەناوچەکانی دەسەلاّتی مستەفا کەمالەوە. هەر لەم روانگەیەوە هەلّوێستی خۆی لەکوردستانی تورکیاو عیراق دیاری کردوە.

کاتێ ئەحمەد تەقی لەکاتی گیرانی شێخ محمودا بەزمانی هەندێ لەگەورە پیاوەکانی کوردستانی عێراقەوە لەتشرینی یەکەمی ۱۹۲۰دا داوای هاوکاریو پشتیوانی لێ ئەکا بۆ بەرپاکردنی شۆڕش بەپشتیوانی تورك لەدژی ئینگلیز، لەوەڵامدا ئەڵێ: ((ئێستا ئینگلیز زۆر بەهێزە، موجادەلە کردن لەگەڵیا لەبارەی کوردەوە زۆر گرانە، باوەڕ ناکەم تورکی زەبونیش بتوانێ بەناردنی هێز بۆ ئەوەی دەست بخاتە کاروباری سیاسی رەواندزەوە، چاکترین شت بۆ کورد ئەمڕۆ ئەوەیە لەئێراندا جوڵانەوەمان یەك بخەین، وبونی خۆمان لەئێراندا بپارێزین، ئەمە بۆ باری ئەمڕۆمان زۆر باشە، و لەدوا رۆژا ئەتوانین کەڵکی لێ وەربگرین[59].

لەو گفتوگۆیەشدا کە لەتشرینی یەکەمی ۱۹۲۱دا مستەفا یاملکی لەگەڵ سمکۆی کردوە لەبارەگاکەی خوی لەچەهریق، لەو روەوە ئاشکراتر بیروڕای خۆی رون ئەکاتەوە:

((پرسیار: باشە تۆ هەوڵ دەدەی بۆ ئەوەی کورد رزگارو ئازاد بکەیت، ئەی بۆچی پێش هەمو شتێك ناوچەی وانو ئەرزڕوم بەتلیسو هەکاریو خەرپوت رزگار ناکەیتو ئەو خەڵکە رێك ناخەی، کەماوەیەکە لەژێر جەورو ستەمی تاقمەکەی مستەفا کەمال دان؟

وەڵام: من وای بەباش دەزانم، کە لەپێشدا لەئێرانەوە دەست پێ بکەم، من هیچ بەچاکی نازانم، لەم رۆژەدا لەگەڵ تورکەکاندا تێکی بدەم، چونکە ئەوان بەتفەنگو فیشەك یارمەتیم دەدەن...)).

تورك بەرواڵەت دۆستایەتی سمکۆیان ئەکرد. هەندێ چەكو تەقەمەنییان دابویە. ئەویش بەدابین کردنی خواردەمەنی، کە لەو سەردەمەدا گرنگییەکی تایبەتی هەبو، یارمەتی ئەدانەوە. بەڵام سمکۆ سەرکردەیەکی بزوتنەوەی کورد بو. هەوڵی دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆی ئەدا. ئەمەش بەتەواوی ناکۆك بو لەگەڵ ئامانجی کەمالییەکاندا.

کەمالییەکان بۆ راپەڕاندنی خەڵکی کوردستانی عیراق دژی ئینگلیزو گرتنەوەی ولایەتی موسڵ، بەهاوکاری هەندێ لەکوردەکانی ئەوێ. مەفرەزەیەکی پچوکیان بەسەرکردایەتی کابرایەك، بەناوی ئوزدەمیر بەگ. نارد بوە ناوچەی رەواندز. لەنامەکانی نێوان کاربەدەستانی تورکو فەرمانداەی ئەم بارەگا پچوکەدا، هەڵوێستی کەمالییەکان لەسمکۆ دەرئەکەوێ، کەئەمە نمونەیەکێتی:

((دیاربەکر

۳۳۸/٦/١٤

ئیستیخبارات، نومرە- ۱۷٤٥

بۆ ئوزدەمیر بەگی قایمقام

١-سمکۆ کابرایەکی فێڵبازە، بەهۆی زرنگی خۆیەوە ئەو خەنجەرە کەهەڵی گرتوە بۆ کاتی خۆی ئەشارێتەوە. ئەم کابرایە بیری سەربەخۆیی لەکەللەدایە. مەبستی ئەوەیە کە تا لەئێراندا دەسەڵاتی زیاد ئەکاو بەهێز ئەبێ لەگەڵ ئێمە تێك نەچێ‌و بەجۆرە بەمەرام‌و ئامانج بگا.

٢-سەرکەوتنی سمکۆ لەناو عەشایری کوردا بەجۆرە گەورە بونی‌و دەسەڵات پەیداکردنی بۆ حکومەتی میللی ئێمە(واتە بۆ حکومەتی تورکی مستەفا کەمال)دەس نادا. بەڵام لەم ڕۆژەدا تیکچونمان لەگەڵ سمکۆ بۆ ئێمەش باش نیە. ئەگەر بتوانن هەوڵی ئەوە بدەن کەبەپڕوپاگەندەو بەبڵاوکردنەوەیەکی وا کەعەشایەری پێ تەفرە بدەن‌و بیان کەن بەدوژمنی سمکۆ بەڕاستی خزمەتی گەورە بۆ حکومەت جێبەجێ ئەکەن. وەکو ئەوە کەبڵێن سمکۆ بەپارەی ئینگلیز ئەم شۆڕشە ئەگێڕێ‌و بۆ قازانجی خۆی‌و خزمەتی ئینگلیز خوێنی کوردەکان ئەڕژێنێ.

٣-ئەو مەفرەزەیە کەلێرەوە خراوەتە ڕێ جارێ ئەچێتە جولەمێرگ. دوای گەیشتنی ئێوە بەرەواندزو جێگیربونتان لەوێ، بەپێی هەواڵ‌و پێویست فەرمانی تر ئەدرێ بەبزوتنەوەی مەفرەزەکەو هاتن وە یا نەهاتنی بۆ ڕەواندز.

٤-مەکارە(هۆی گوێزانەوە)مان نیە کەتۆپ‌و مەترالیوزی (ڕەشاش)پیا بنێرن. هەوڵ ئەدەین کەئەوەشتان بۆ جێبەجێ بکەین.

بەناوی قوماندانی جەبهەوە

ڕەئیسی ئەرکانی حەرب بصری[٦٠]

وەکو ئەوان سمکۆیان بەدوژمن داناوە، سمکۆش باوەڕی بەوان نەبو، بەڵکو وەکو لەگفتوگۆکانی‌دا لەگەڵ یاملکی وتویەتی تورکی لەعەجەم بەدوژمن تر زانیوە بۆ کورد. بەڵام لەو کاتەدا پێویستی هەردو لایانی کۆکردۆتەوە، بەتایبەتی تورك کاتێ پێویستی بەبێلایەنی سمکۆ بو کەهێشتا لەشەڕا بو لەگەڵ هێزەکانی ئەرمەنی‌و، دوایی تر فەرەنسی‌و، ئینجا یۆنانی.

لەدوای ئەو هێرشە گەورەیەی ئەرتەشی ئێران کردی بۆ سەر مەڵبەندەکانی ژێردەسەڵاتی سمکۆو داگیرکردنی چەهریق، سمکۆ کشایەوە بۆ ناو تورکیا. دۆستایەتی سمکۆ لەگەڵ کەمالییەکان بەکەڵکی نەهات. چونکە هەڵوێستی ڕاستەقینەی کەمالیەکان لەسمکۆ وەها بو وەکو لەو بەڵگەیەدا نوسراوە، نەك وەکو ئەوەی سمکۆ تێی گەیشت بو. لەناو خاکی تورکیادا هێزێکی سوکەڵەی تورك لەناکاو بەشەو پەلاماری سمکۆیاندا بیکوژن. لەم پەلامارەدا ژنەکەی‌و هەندێ

لەهاورێکانی کوژران، کورەکەی بەدیل گیرا، هەرچی زێڕو سامانێکی پێ بو بە تالان برا. خۆیو براکەی بەزەحمەت دەرباز بون.

سمکۆ لەو سەفەرەدا کەهاتە کوردستانی خوارو، نوێنەرانی ئینگلیزی لەدێریو بەحرکە بینیو پاشان روی کردە سلێمانی بۆ دیدەنی شێخ محمود. لەو کاتەدا لەسلێمانی نوێنەرانی تورك خەریکی گفتوگۆ بون لەگەڵ شێخ محمود. ئینگلیزەکان بەهیوا بون سمکۆو شێخ محمود لەدۆستایەتی تورك ژیوان بکاتەوە. بەلام سمکۆش کەگەیشتە سلێمانی لەگەڵ تورك تێ هەڵ چوەوە، بۆ ئەوەی کوڕەکەی بەر بدەنو پارەکانی بدەنەوەو دالدەی بدەن.

سمکۆ زۆر لەسلێمانی نەمایەوە، چونکە سلێمانی لەئەنجامی هەڕەشەی بەریتانیدا چۆڵ کرا. گەڕایەوە ناوچەکانی سنورو لەوێ پێوەندی لەگەڵ تورك نوێ کردەوە. تورك لەو کاتەدا لەگەڵ ئینگلیزو حکومەتی تازە دامەزراوی عیراق لەسەر ولایەتی موسڵ لەکێشەدا بون. ئینگلیز ئەی ویست ئاسوریەکان لەبادینان لەسەر سنوری تورك نیشتەجێ بکا. تورکیش ویستی سمکۆ تێکەلاوی ئەم گەمەیە بکا. سمکۆیان بانگ کرد بۆ وان. گفتیان پێدا یارمەتی بدەن بەچەكو سەرباز بۆ ئەوەی بچێ بۆ یارمەتی دانی شێخ محمود لەدژی ئینگلیز بجەنگێ. زۆری نەخایاند تورکو ئینگلیز کێشەکانی خۆیان بەخۆشی چارەسەر کرد. تورك پێویستیەکی بەسمکۆو بەشێخ محمود نەما. کەوتە تەنگ پێ هەڵ چنینو راونانی. لەدوای تێکشکانی شۆڕشی ١٩٢٥ی کوردستانی تورکیا سمکۆ ناچار بو چەند جارێ لەنێوان تورکیاو ئێرانو عیراقدا ئەم دیو وئەو دیوی سنور بکا تا سەرەنجام لەشنۆ کوژرا.

### ٣/٦ بەریتانیا

بەریتانیاو روسیا لە١٩٠٧ەوە لەسەر دابەشکردنی ئێران رێ کەوت بون. هەمو کوردستانی ئێران ئەبو بکەوێتە ژێردەستی روسیا. بەلام شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەو نەخشەیەی بەجارێ هەڵ وەشاندەوە. بەریتانیا وازی لەدابەشکردنی ئێران هێنا. ئەی ویست دەوڵەتی ئێران بمێنێو حکومەتێکی مەرکەزی بەهێزی ئەوتۆی تێدا دابمەزرێ بەری تەنینەوەی کۆمۆنیزمو نفوزی سۆڤیێتی بگرێ. بەلام لەهەمان کاتدا ئەی ویست ئێران بەپەیمانێکی دو قۆڵی بەخۆیەوە ببەستێتەوە بۆ ئەوەی لەژێر کار تێ کردنی خۆیدا بێ.

ئێران ئەیویست لەکۆنفرەنسی ئاشتیدا بەشدار بێو بەیارمەتی بەریتانیا سنورەکانی خۆی لەسەر حسابی تورکیاو روسیا فراوان بکا. بەریتانیاش نەیئەویست ئێران، کەبەشداری جەنگی جیهانی نەبو بو، بەشداری کۆنفرەنسی

ئاشتی بێ بۆ ئەوەی هیچ بەشدارییەکی لەدیاری کردنی چارەنوسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەبێ.

بەریتانیا لەرێگەی دانی چەردەیەك بەرتیل بەوثوق الدولەی سەر وەزیرو وەزیری دەرەوەو وەزیری داراییەوە لە١٩١٩دا پەیمانێکی لەگەڵ ئێران بەست بەکردەوە ئێرانی ئەکردە ژێردەستەی بەریتانیا.

سیاسەتی ئێرانیی بەریتانیا بەکورتی ئەوە بو، ئێران بەیەکگرتویی‌و بەهێزی بهێنێ. لەبەر ئەوە کورد هەلی ئەوەی نەبو، پشتیوانی بەریتانی بۆ خواستە نەتەوەییەکانی خۆی لەئێراندا بەدەس بهێنێ. لەکاتی سەردانی ویلسۆندا بۆ سلێمانی بۆ کۆبونەوە لەگەڵ شێخ مەحمودو مەزنەکانی تری کورد، کەمەسەلەی کوردی ئێران هێنرایە پێشەوەو، هەندێ لەمەزنەکانی کوردی ئێران ئارەزوی یەکگرتنیان لەگەڵ کوردستانی عیراق دەربڕی، ویلسۆن ئەمەی بۆ نەسەلماندن.

لەکۆنفرەنسی پاریس، ئەگەرچی نوێنەرایەتی کورد مەسەلەی کوردی ئێرانی هێنایە کایەوە بەڵام لەپەیمانی سیڤەردا کوردستانی ئێران بەتەواوی پشت گوێ خرا.

هەروەها سمکۆش کە بەهۆی بابەکر ئاغای پشدەرییەوە پێوەندی لەگەڵ ئینگلیز کردو، دوایی تر سەید تەهای نارد بو دیدەنی مەندوبی سامی لەبەغداد، بەڵێنی هیچ جۆرە یارمەتیەکیان پێ نەدا.

زۆرکەس لەسمکۆیان پرسیوە بۆچی لەگەڵ ئینگلیز رێك ناکەوێ. سمکۆ رێککەوتنی لەگەڵ ئینگلیز رەت نەئەکردەوە. زۆریشیان لەگەڵ خەریك بو. بەڵام ئینگلیز هیچ یارمەتییەکی سمکۆیان نەداو هیچ پشتیوانییەکیان لێ نەکرد، چونکە پشتیوانی کردنی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لەئێران لەگەڵ سیاسەتی ئەوان نەئەگونجا، خۆیشی بەهۆی کوشتنی مارشیمۆن‌و رەفتاری لەگەڵ مەسیحییەکان لەلای ئەوان بەدناو بو.

مس بیل لەو روەوە ئەڵێ بەهۆی ئەو بەیانەوە کەمیجەر نوئێل لەحوزەیرانی ١٩١٩دا دەربارەی مەسەلەی کورد بڵاوی کردەوە سمکۆ زیاتر نزیك بوەوە لەوەکیلی حاکمی عامی عیراق, بەڵام بەهۆی ئەو پەیمانەوە کەئێمە لەگەڵ ئێران بەستمان هیچ هیوایەکی نەما بەپشتیوانی ئێمە بۆ دامەزراندنی یەکێتییەکی نەتەوەیی لەناو کوردەکانی تورکیاو ئێراندا. سەرەڕای ئەوەش ئەترسا سزا بدرێ لەسەر رەفتاری خراپی لەگەڵ مەسیحییەکان[٦١].

سمکۆ دوای تێکشکانی لەئێران روی کردە کوردستانی عیراق. لەدێرێ‌و لەبەحرکە نوێنەرانی ئینگلیزی بینی دو پێشنیاری خستە بەر چاویان" هاوکاری

کورد لەگەڵ ئینگلیز بەرامبەر بەوە ئەوانیش پشتیوانی کورد بکەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان.

ئەگەر ئەوە ناکەن، یارمەتی خۆی بدەن بەئاشت کردنەوەی لەگەڵ ئێران یا بەشەرِ بگەرِێتەوە شوێنی خۆی[٦٢].

دوایین دوژمنایەتی ئینگلیز لەگەڵ سمکۆ ئەوە بو" کاتێ سمکۆ لەژێر گوشاری تورکی‌دا بەناچاری چوە کوردستانی عیراق، موعتەمیدی بەریتانی لەبەغداد داوای لەحکومەتی عیراق کرد هاوکاری لەگەڵ حکومەتی ئێران بکا بۆ سەرکوت کردنی یاخیبونی سمکۆ[٦٣].

**٤/٦ روسیە**

سیاسەتی کوردیی روس لەپێش هەڵگیرسانی جەنگ‌و لەساڵانی جەنگ‌دا خواستە نەتەوەییەکانی کوردی رەچاو نەئەکرد. هەمو تەقەللاکانی عەبدولرزاق بەگی بەدرخان، کامل بەگی بەدرخان، سمکۆ، شێخ عبدالسلامی بارزانی، مەلا سلیمی خیزان، سەید تەهای شەمزینی کەڵکی نەبو. روسیا گرەوی لەسەر هاوکاری ئاسوری‌و ئەرمەنی کردبو، نەی ئەویست بۆ کورد ئەوان لەخۆی برِەنجێنێ.

روسیە لەدوای سەرکەوتنی ئۆکتۆبەر، توشی کێشەی ناوخۆی‌و ئابلۆقەدانی دەوڵەتانی ئەوروپی بو، ئەیویست تەوقی ئابلۆقەدان بشکێنێ‌و، نەهێڵێ نفوزی دەوڵەتانی ئیمپریالیستی بگەنە سنوری لای خواروی، هەر بۆ ئەوەش بەپێچەوانەی سەردەمی قەیسەرِ کەرێ کەوت بو لەگەڵ بەریتانیاو فەرەنسەو ئیتالیا بۆ دابەشکردنی خاکی عوسمانی‌و ئێران، سیاسەتی حکومەتی سۆڤیێتی هەڵوەشاندنەوەی هەمو رێککەوتنامە کۆنەکان‌و دروست بونی دەوڵەتی بەهێز لەتورکیاو ئێران‌و ئەفغانستان بو.

سۆڤیێت دەستی لەئەرمەنی‌و ئاسوری هەڵگرت‌و، بەکاروباری ناوخۆی‌و بەرەنگاری گەلە کۆمەکێی دنیای سەرمایەداریەوە مەشغوڵ بو، نەی ئەپەرژایە سەر دەس وەردانە کاروباری ناوەوەی ئێران‌و تورکیا، لەبەرئەوەش نەیویست کۆمەك بەشۆرِشگێرِانی ئێران‌و تورکیا بکا، بەڵکو کۆمەکی بەحکومەتی مەرکەزی کردو، پەیمانی دۆستایەتی لەگەڵ تورکیای کەمالی‌و ئێران‌و ئەفغانستان بەست.

سمکۆیش کەخۆی رەفتاری لەگەڵ روس کرد بو، لەپێش جەنگ‌دا سەردانی تفلیسی کرد بو، و لەنزیکەوە سەرکردەکانی دی بون بەتایبەتی دوای رێکەوتنی روسی- بەریتانی ١٩٠٧کە هات بونە ئازربایجانەوە، و لەسەردەمی جەنگ‌دا بەگیراوی بردبویانە قافقاس‌و، دوایی دەس بەسەر لەخوی‌و پاشان بێلایەن لەچەهریق دانیشت بو.

سمکۆ لەساڵانی دەربەدەری کەهێشتا لەناوچەی باشقەڵای کوردستانی تورکیا بو لەسەرداوای خالد بەگی جەبرانلی سەرۆکی((جەمعییەتی ئیستیقلالی کوردستان))لەرێگەی کونسوڵی سۆڤێتیەوە لەورمێ پێوەندی لەگەڵ کردن. دو پێشنیاری خستە بەردەم" هاوکاری کوردو سۆڤێت بەرامبەر بەوەی پشتیوانی لەئامانجە نەتەوەییەکانی گەلی کورد بکەن. ئەگەر ئەوە نەتوانرا، لای کاربەدەستانی ئێران هەوڵی بۆ بدەن بگەڕێتەوە شوێنی خۆی‌و ئەوان دەستەبەری سەلامەتی بن.

یەکێتی سۆڤێت ئامادە نەبو پشتیوانی لەبزوتنەوەی کورد بکا چونکە لەگەڵ سیاسەتی ئێرانیی‌و تورکیی سۆڤێتی‌دا نەئەگونجا. روسیای سۆڤێتی لەو کاتەدا ئەی ویست دەوڵەتانی ئێران‌و تورکیا بەهێز بن‌و بتوانن خۆیان لەبەر گوشاری دەوڵەتانی ئەوروپی دوژمنی سۆڤێتدا رابگرن‌و، نەکەونە ژێردەستی ئەوان، هەروەها پەیمانی ((دۆستایەتی‌و هاوکاری))لەگەڵ ئیمزا کرد بون. نوێنەرانی سۆڤێتی لەوەڵامدا ئاگاداریان کرد، داوای یەکەمی لەگەڵ سیاسەتی ئەوان ناگونجێ، ناشیانەوێ درۆ لەگەڵ کورد بکەن. بۆ داوای دوەمی ئامادەییان دەربڕی بو بۆ یارمەتی دانی.

هەر لەئەنجامی ئەو سیاسەتەدا بو یەکێتی سۆڤێت بەدەنگ داواکانی شێخ مەحمودەوە لەعیراق‌و، داواکانی خالد بەگ‌و جەمعییەتی ئیستیقلالی کوردستانەوە لەتورکیاو، داواکانی سمکۆوە لەئێران، نەهات.

### ٧-ساڵانی دەربەدەری

### ١/٧ شەبەیخونی تورك

حاجی مستەفا پاشای یاملکی لەمانگی تشرینی یەکەمی ١٩٢١دا سەردانێکی سمکۆی کرد، لەم سەردانەش چەند مەبەستێکی هەبو" لەسەرو هەمویانەوە هاندانی سمکۆ دژی کەمالییەکان کەئەو بەگەورەترین دوژمنی کوردی دائەنان، هەروەها دەربڕینی پشتیوانی لەسمکۆو، ئامادەیی بۆ هاوکاری کردنی‌و گۆڕینی رەنگی جوڵانەوەکەی لەبزوتنەوەیەکی خێڵەکیی ناڕێکوپێکەوە بۆ بزوتنەوەیەکی سیاسی نەتەوەیی رێکخراو، یاملکی نەی توانی هیچ کام لەمەبستەکانی بهێنێتەدی. لەهەمان کاتدا بو بەهۆی پونگانەوەی زۆرتری کامالییەکان لەسمکۆو بزوتنەوەکەی.

سمکۆ لەبەر هێرشی گەورەی ئەرتەشی ئێراندا بەرەو سنوری تورکیا کشایەوە، پشت ئەستور بەدۆستایەتی پێشوی لەگەڵ کەمالییەکان، بەتەمابو یارمەتی بدەن. سەرتیپ جهانبانی دەسبەجێ کاربەدەستانی تورکی لەپەڕینەوەی سمکۆ بۆ ناوخاکی ئەوان ئاگادار کردو داوای لێ کردن، سمکۆ بگرن‌و بیدەنەوە بەئێران[٦٤].

تورك لەلایەك دوژمنایەتی هەمو جولانەوەیەكی نەتەوەیی كوردیان ئەكرد، كەسمكۆ لەو قۆناغەدا رویەكی درەوشاوەی بو، لەلایەكی ترەوە دیتنی یاملكی، دوژمنی خوێنەخۆیی مستەفا كەمال‌و كەمالیەكان، ترسی ئەوەی لێ پەیدا كرد بون سمكۆ شۆرش بگوێزێتەوە ناو كوردستانی توركیا. ئێرانیش داوای گرتن‌و بەدەستەوەدانی كردبو، تورك ویستیان هەلی تێكشكانی سمكۆ بقۆزنەوە، ئەو جولانەوەیەی لەوانەیە بتەنێتەوە بۆ ناو كوردەكانی ئەوێش‌و، كێشەیەكی گەورەیان بۆ دروست بكا لەكاتێكا ئەوان بەشەرِی یۆنانەوە خەریك بون، لەرێگەی كوشتنی سمكۆوە بەیەكجاری تەواو بكەن.

هێزێكی سوكەڵەی تورك شەوێ لەناكاو پەلاماری بارەگاكەی سمكۆیاندا. یەكێ لەهاوسەرەكانی‌و چەند كسێ لەپیاو ماقوڵەكانی كوژران. خسرەوی كوڕی گیرا. هەرچی پارەو داراییەكی پێی بو كەوتە دەست تورك. خۆی‌و ئەحمەد ئاغای برای‌و تاقمێ لەسوارەكانی بەفەلاكەت دەرباز بون[٦٥] تورك كەوتنە شوێنی‌و تەنگیان پێ هەڵچنی. سمكۆ روی كردە دێرێ لەسەروی هەولێر لەكوردستانی خوارو.

### ٢/٧ سمكۆ لەكوردستانی خوارو

لەو كاتەدا هەمو عیراق لەژێردەستی ئینگلیزدا بو، بەڵام هەندێ بەشی هەلومەرجێكی تایبەتی هەبو، شێخ محمود لەسلێمانی مەلیكی كوردستان بو. تورك بەهاوكاری هەندێ كوردی دوژمنی ئینگلیز هێزێكی كەمیان ناردبوە رەواندز. ئەیان ویست ولایەتی موسڵ بخەنەوە سەر توركیا. ئینگلیزیش ئەی ویست بیخاتە سەر عیراق. ئەو هێزە پچوكەی تورك دەردەسەرێكی راستەقینەی بۆ كاربەدەستانی بەریتانی دروست كردبو. ئەیان ویست هەرچۆنێ بێ دەریان بكەن. هەندێ شوێنی كوردستان لەژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی هیچ لایەكدا نەبو. نێوانی شێخ محمودو ئینگلیز تێك چو بو. ناكۆكیەكانیان سەرلەنوێ خەریك بو ئەتەقیەوە. شێخ محمود لەگەڵ هێزەكەی تورك لەرەواندزو لەرێگەی ئەوانەوە لەگەڵ كەمالییەكان پێوەندی دۆستانەی دامەزراند بو. ئینگلیز لەهەڵوێستی شێخ مەحمودو پێوەندی لەگەڵ كەمالیەكان نارەحەت بو. پەلاماردانی سمكۆ لەلایەن توركەوەو هاتنی بۆ كوردستانی عیراق بۆ ئینگلیز هەلێ بوو ویستیان بیقۆزنەوە، بۆ ئەوەی لەرێگەی ئەوەوە كار لەشێخ مەحمود بكەن‌و نێوانی لەگەڵ تورك تێك بدەن.

ئینگلیز سمكۆیان بانگ كرد بۆ هەولێرو عیزەت تۆپچی یەكێ لەهاوكارەكانی شێخ مەحمودیان نارد بەدویدا بیهێنی. سمكۆ لێیان دڵنیا نەبو، ئەترسا لەسەر

داوای ئاسوریەکان بیگرن، لەبەر ئەوە نەچو بۆ هەولێر بەڵکو چو بۆ گوندی بەحرکە[٦٦] لەوێوە کەوتە ئاڵوگۆڕی پەیام لەگەڵ شێخ محمود.

### ٣/٧ گفتوگۆی ئینگلیزو سمکۆ

ئەدمۆنس گفتوگۆی خۆیانو سمکۆ بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

((... رۆژی چوارەمی نۆڤەمبەر بۆ گفتوگۆ لەگەڵ لاین بەفرۆکە چوم بۆ کۆیە، لەپێنجەمی نۆڤەمبەردا کەوتمە رێ بۆ هەولێر. لەرۆژی شەشەمدا لەگەڵ لاین، کە لەکۆیەوە بەئوتومبێل گەڕابوەوە، و ئەحمەد ئەفەندیو لیتل دیل بەئوتومبێل کەوتینە رێ بۆ دیداری سمکۆ. دیدار لەگوندی بەحرکە بو کەهی هۆزی گەردییە کەوتۆتە دە میلیی کەناری رێی دێرە. سمکۆ لەگەڵ ئەحمەدی برایو دو سێ خزمی گەورەتریو نزیکەی بیست کەس لەهاوڕێکانی هات بو.

وتی هەست بەپەژارەو رەنجانێکی تایبەتی ناکا بەرامبەر ئێرانیەکان، ئەوەندەی لێی چێشتون، ئەوەندەشی تێ سرەواندون، بەڵام ئەیەوێ تەسفیەی حساب لەگەڵ تورکەکان بکا، کەگفتیان دابویە پشتیوانی بکەن، کەچی پشتیان تێ کرد. سەری سوڕما لەوەی، ئێمە زۆر بەتەنگ نەرەنجاندنی ئێرانیەکانەوەین، لەبەرئەوەی هەمو ئەزانن بەدرێژایی سنور ئێرانیەکان لەگەڵ تورکەکان ئێمەیان لەرەواندز و رانیەوە دەرپەڕاندوەو هێشتا لەگەڵ ئێمە ئەجەنگنو هاوکاری ئەکەن. وتی بەو هیوایە هات بو کەئێمە ئامادە ئەبین پشتیوانی بکەین لەئازادی کورد لەتەوقیی دو حکومەتی کەدوژمنایەتییان هەیە لەگەڵی، ئەگەر بەهەڵەدا چوە ئەوا لەم حاڵەدا هیچ ئارەزویەکی نیە داوای پەنادان لەئێمە بکات، بەڵکو ئەگەڕێتەوە ناو هۆزەکەیو خۆی بەتەنیا ئەوپەڕی تەقەلا ئەدا[٦٧].

ئەحمەد تەقی لەزمانی سمکۆ وە گفتوگۆکان بەمجۆرە ئەگێڕێتەوە:

((ئینگلیزەکانو تورکەکان هەردو لایان درۆمان لەگەڵ دەکەن لەبابەت سەربەخۆییو سەربەستی کوردستانەوە، هەر بەڵێنو قسەیەك بدەنو بڵێن درۆ دەکەن وە هەڵمان دەخەڵەتێنن، ئینگلیز ئەیەوێ هەمو کوردێك وەك نۆکەر هەڵسوڕێنێو ئیشی پێ بکات بۆ چاکەو دەسکەوتی خۆی، وەك مەیمون هەڵمانپەڕێنێ بەکەیفی خۆی، بەرانبەر نەتەوەکەمان شەرمەزارمان بکا ئەمەش بەمن ناکرێت..

لەکاتێکا من لەشوێنەکەی خۆم رام کردو تورکەکان هێرشیان هێنایە سەرم، لەسەر ئامۆژگاریو هاندانی سەید تەها، من هاتم بۆ ناوچەی((دێرێ))لەعیراق لەلیوای هەولێر بۆ دیدەنیو رێك کەوتن لەگەڵ ئینگلیزەکان. حاکمی سیاسی ئینگلیز لەگەڵ سەید تەها دا هاتنە دێرێ بۆ دیدەنیم، دورو درێژ قسەمان کرد

پێم وت: ((من کوردم ولێم قەوماوە دوژمنی حکومەتی فارسم لەئێران، ئەوا ئەم جارەش بومە دوژمنی تورك چونکە ژنیان کوشتمو کوڕیان بەدیل بردم. ئێوەش ئینگلیزەکان گەلێ قسەتان کردوە لەگەڵ((کۆمەڵی کورد))لەئەستەموڵ، وە بەڵێنی زۆرتان داونەتێ هیچتان بەجێ نەهێناوە، لەبەر ئەوە کوردەکان لەگەڵ مستەفا کەمال دا رێك کەوتن، وە هەروەها لەکوردستانی خوارووشدا ئێوە ئیدارەی حکومەتی شێخ محمودتان تێکدا، ئەوانیش ناچاربون لەگەڵ کەمالیەکانا رێك کەوتنو هێنایانن بۆ رەواندز لەکوردستانی خواروودا، ئێستاش من لەجیاتی هەمو کوردێك لەهەمو کوردستانا پێتان ئەڵێم: ئەگەر ئێوە ئامادە بنو راست بکەن وە بەراستی بێنە پێشەوە بۆ دانی سەربەخۆیی بەکوردستان، منیش خۆم ئامادەمو بەڵێن ئەدەم کوردتان لەگەڵ رێك بخەم، ئەگەر ئەمەش ناکەن، تەنها داواتان لێ ئەکەم یاریدەم بدەن بچمەوە جێگای خۆم ئایا بەشەر کردن لەگەڵ ئێراندا، یا بەئاشت بونەوە لەسەر بەڵێنو گفتی ئێوە.

حاکمی سیاسی ئینگلیز لەوەڵاما وتی: جارێ حەز ئەکەم بزانم ئێوە کۆچتان کردوە چەند پارەتان پێویستە بۆ نەهێشتنی ئاتاجیتان؟

ئیسماعیل خان وەڵامی دایەوە، وتی: هیچ جۆرە ئاتاجیەکمان نیە. من میوانی برا کوردە دلێرەکانم تازە شێخ مەحمودی بەرێز ٥٠٠ لیرەی ئاڵتونی بۆ ناردوم.

حاکم ئینجا وتی: ئەی چۆنە لاتان کەسەید تەها بکەین بەحاکمی رەواندزو حەریر، وە ئەحمەد ئاغای برات بەحاکمی بادینان؟

ئیسماعیل خان لەم پرسیارەی حاکمی سیاسی زۆر دڵگیر بو، وتی: منو سەید تەها کۆچەرین, لەدێرێ دانیشتوین ئەم ناوچەیە لەشۆڕشان لەگەڵ ئێوەدا، من لەپێشەوە بۆم رون کردنەوە ئەگەر راست ئەکەن ئەبێ لەپێش هەمو شتێکەوە سەربەخۆییو ئازادی کوردستان بخەنە بەرچاو، تەشکیلاتو دانانی خەڵك ئەبێ بەپێی ئارەزوی دانیشتوانی وڵاتەکە بێت نەك ئارەزوی منو تۆ، لام وایە ئێوە نیازتان وایە بەقبوڵ کردنی ئەم داوا کردنانە، ئێمە بکەن بەدوژمنی کوردەکانی کوردستانی خوارو وە سوکمان بکەن لەناویانا، بۆ لەبریتی پرسی دانانی حاکمی بۆ رەواندزو حەریر، باسی تەرتیباتو تەشکیلاتی دامەزراندنی سەربەخۆیی کوردستان ناکەنو بەنوێنەر نامنێرن بۆ لای شێخ محمود کەبەشدار ببێ لەم یەکێتییەدا؟ بەداخەوە زۆر بەئەندێشەوە ئەڵێم داواکردنەکانت لەجێی خۆیا نیە.

حاکمی سیاسی پاش بێ دەنگ بونو بیر لێ کردنەوە بۆ ماوەیەك وتی: ئەم داواکردنانەی ئێوە بەمن نادەگێڕرێتەوە نەقبوڵیش دەکرێت چونکە لەدەسەڵاتی من دا نین، فەرمو بابچین بۆ هەولێر لەوێوە نوێنەری سامی لەبەغداوە دەهێنن بۆ گفتوگۆ کردنو دوان لەم بابەتە[68].

### ٤/٧ پەیامەکانی سمکۆو شێخ محمود

هەر لەو ماوەیەدا کەسمکۆ لەبەحرکە بو بەتەلگراف لەگەڵ شێخ محمود کەوتە ئاڵوگۆڕی بیروڕا. پەیامەکانی هەردوکیان نرخێکی مێژوییان هەیە بۆ جۆری تەقەللای نەتەوەیی کوردو تێگەیشتن لەسیاسەتی کوردیی بەریتانیا.

ئەبێ ڕۆژنامەکانی ئێران لەسەر سەفەری سمکۆ هەندێ هەواڵی ناڕاستیان بڵاو کردبێتەوە، لەبەر ئەوە((ڕۆژی کوردستانی)) زمانی حکومەتی کوردستان تێکستی پەیامە ئاڵوگۆڕکراوەکانی هەردوکیانی وەکو خۆی بەمجۆرە بڵاوکردۆتەوە:

((بەتاریخی ٩ رەبیع ئەلئەوەلی ١٣٤١ ژمارە ٧٠ی غەزەتەی ستارە ئێران موخالیفی حەقیقەت بەعزی نەشریاتی کرد بو، بۆ تەصحیحی ئەفکاری عمومی سەرداران‌و موننەوەرانی کورد مەجبور بوین موخابەراتی کە لەبەینی حضرتی مەلیکی کوردستان‌و جەنابی سمکۆ و سەید تەها دا جەرەیانی کردوە دەرج نەشری بکەین:

سلێمانی

بۆ حوزوری حوکمداری اعظمی کوردستان

ئەمڕۆ موقەدەراتی کوردستان تەودیعی دەستی موبارەکتان کراوە. موناسیبی نازانین هیچ ئیشێك بێ ئەمری زاتی حوکمدارانەتان بکرێ. بەزەییتان نایەتەوە بەئێمەمانان کەمیللەتی کوردی مەغدورین ئیستیرحام ئەکەین لەهەمو خوصوصێکەوە موعاوەنەت بفەرمون بۆ ئیستیخلاصی ئەم وەطەنەمان.

١٤ی کانونی ئەوەلی ٣٣٨ سمکۆ

ئەربیل

قەهرەمانی کوردستان حضرتی ئیسماعیل ئاغا

هەڵبەتە تەقدیری ئەفەرمون کە بەتاقی تەنیا لەرێگای سەندنی حوقوقی میللەتی کوردا لەپێش هەمو کسێکەوە بە چ دەرەجە فیداکاریم کردوەو بەو نیسبەتەش فەلاکەتم دیوە. ئەمرۆش بەئیتیفاقی قەهرەمانێکی وەکو زاتی وەطەن پەروەرانەی ئێوە بۆ گەیشتن بەعەینی غایە دەرەجەی ئارەزوم ئیحتیاج بەایضاح ناکات، حەواڵەی تەقدیری ویجدانی جەنابتانی ئەکەم. لاکین ئەبێ بۆ مودافەعەی حەقی بێ کەبێ قووەت ، بێ پاڵ، بێ موعاوەنەت. بێ حەق، خۆمان بهاوینە ناو جیدال‌و مەعرەکەی شەڕوشۆڕو بۆ سەندنی غایەی میللەتی کوردبێ کەحەیاتی ئەم قەومە سەوقی افەنا بکەین، ئەمڕۆ حەقێکی رەسمی نەدراوە بەمیللەتی کورد، ئێمە

کەببێتە سەبەبی جونبوش‌و مودافەعەی دوشمنانی خاریجی. وە هەرچەند ئێمە داوای لوطف‌و حوقوقمان کردبێ بەنەوع نەوع وەعدو بەهانە ئیهمال کراوە.

٣مانگ لەمەوپێش حکومەتی فەخیمەی بەریتانیا ئەو موعاوەنەتە کەوەعدی فەرموە لەسەد یەکێکی بەجێ نەهێناوە تا وەکو منیش میللەتی کورد بەئیستیقبالەوە تەماعداریان بکەم. بۆ حەقی شەڕوشۆڕم پێ خۆشە، بەلاّم بۆ ناحەقی پێم خۆش نیە کەخوێنی موسولّمانانی کورد برێژم. ئەگەر لوطفەن حەقی خۆمان پێ ببەخشرێ حازرین بۆ هەمو فیداکاری‌و دەفع‌و دورخستنەوەی موعتەریزەکانمان. ئەگینا هەر بۆ اطاعەتی موطلەقەی حکومەتی فەخیمە بەقطعی قەول ئەدەم کەبێ تەرەف‌و صادق ئەمێنمەوە بەرامبەر دەولّەتی موعەظەمەی بەریتانیا.

ئەگەر لەمە زیاتر لزوم بە موزاکەرە هەیە بۆ تەشریف فەرمونتان رجاو تەئیید ئیحتیرام ئەکەم.

١٤ی کانونی ئەوەلی ٣٣٨ محمود

سلێمانی

بۆ حوزوری حوکمداری ئەفخەم

لەحکومەتی ئینگلیس بەو لاوە کەس نیە حوقوق بەئێمە ببەخشێ‌و موقابیل ئەو لوطفە کە لەگەلّمان ئەکات چاوەڕوانی خدمەتی ئێمەیە. ئەم حوقوقە بێ شوبهە ئەتوانین بیسێنێن. ئەگەر هەر لەجەنابی حوکمداریتانەوە ئیرادەیەکی دەرکردنیان ببێ بەعەونی خودا بێ خوێن رشتنی موسولّمانان لێرە دەریان ئەکەم. وە حوقوقیشمان بەهەمو نەوع وەرئەگرین. وا مەصلەحەت ئەبینم کەپێکەوە دوشمن لەناو خۆمان دەرکەین‌و حوقوقیشمان هەر پێکەوە لەحکومەتی بەریتانیاو عەرەب وەرگرین.

١٤ی منە سمکۆ

ئەربیل

قەهرەمانی کوردستان حەزرەتی ئیسماعیل ئاغا

حەقیقەتەن بۆ هەمو نیعمەتی ئیختیاری زەحمەت‌و بۆ هەمو لوطفی عەرضی تەشەکور لازمە. لاکین بۆ لوطفی کەڕەوا نەبینرێ ئیختیاری کولفەت کردن لەوە ئەچێ کەفیدای مەوجودیەت بکرێ بۆ مەنافیعی خەلقی تر. غەیری حکومەتی بەریتانیا ئەوی حەقی حەیاتمان بداتێ‌و ئومێدی سەعادەتی لێ بکرێ کەس شك نابەم. وەکو قیام کردن لەموقابیل موعتەریضی ئەو حوقوقەمان کەبە مەرحەمەت پێ ئەبەخشرێ بەمەشروعی ئەزانم بەبێ سەبەب چونە موجادەلەشەوە ئەوەندە

بەغەیر مەعقولی ئەزانم. هەمو میللەتی کورد بێ تەرەدود حازرە بۆ دەفعی دوشمنی خۆی بەشەرتێ وەکو حکومەتی بەریتانیا وەعدی داوە وەعدەکەی بەجێ بێنێ. ئیعتیراف بەمیللیەتمان بکاتو بەمەرحەمەت تەقدیری حوقوقمان بفەرموێولەحەرەکاتێکدا کەبەرامبەر دوشمنمان ئەکرێ مادیەن یارمەتیمان بدات بەڵام ئەمڕۆ موعتەریضی وەطەنو دوشمنی میللیەتم ناناسم. کێ حەقمان ئەداتێ چ حکومەتی تەعەروضی حوقوقمان ئەکات. بێ زانینی سەبەب. بێ چاوپێکەوتنی حەق موجادەلە بۆچی بکەین، وە بۆ مەنفەعەتی کێ خوێن بڕێژین. ئەگەر بەم حاڵە رازی بین موعاوەنەتێکی کورد لەدوای خۆمانەوە نابینین، چونکە ئەگەر بپرسن بۆ چ حەقێك مودافەعەو خوێنی میللەت فیدا ئەکەن؟ جەوابمان نیە بیدەینەوە. ئیتر لەجیاتی دوشمنایەتی غەیر رەسمی اطاعەت کردنی حکومەتو بێ طەرەفانە لەماڵی خۆمدا دانیشتن بەموناسیب تر ئەزانم.

١٤ی مینهو محمود

سلێمانی

بۆ حوزوری عالی حوکمدار

دەستتان ماچ ئەکەم. ئەگەر مەظهەری تەوجیهتان بم خۆم بە بەختیار ئەزانم. مەعروضاتم بۆ حەضرەتی ئیسماعیل ئاغا تەرك کرد ئەفەندم.

١٤ی مینهو سەید تەها

ئەربیل

بۆ حەزرەتی برای موحتەرەمی خۆم سەید تەها ئەفەندی

بێ قەیدو شەرت تەشەکوری ئەو لوطفو تەوەجوهاتی داعی ئەوازانەتان ئەکەم. کە لەحەقم رەوا بینراوە. جوابی ئەمرەکانی ئیسماعیل ئاغام تەقدیم کردوە. من کوردم چونکە بەکوردی ژیان بەسەعادەت ئەزانم مەفتونی سەویەی میللەت پەروەرانەی هەمو قەهرەمانێکی کوردم.

١٤ی منە محمود[٦٩]

سمکۆ لەهاتنیدا بۆ کوردستانی خوارو ئومێدی وابو بەریتانیا پشتیوانی لەبزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بکا لەئێرانو تورکیاو عیراق بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی، بەڵام ئەوان نەیان ئەویست هیچ کارێ لەدژی ئێران بکەن، ئەیان ویست دەوڵەتی ئێران وەکو خۆی بمێنێ، دەوڵەتی عیراق دروست ببێو کوردستانی خواروی پڕ لەپەترۆڵیش بەشێکی بێ. دروستکردنی دەوڵەتی کوردی

لەهیچ لایەکی کوردستاندا لەبەرنامەی ئینگلیزەکان دا نەبو. سمکۆ هیچ ئومێدێکی لەسەر هەڵ نەچنینو چو بۆ سلێمانی بۆ سەردانی شێخ محمود.

## ٥/٧ سەردانی سلێمانی

رەفیق حلمی لەم بارەیەوە نوسیوێتی:

((تەلگرافەکانی بەینی سمکۆو شێخ محمود، ئینگلیزەکانی خست بوە هیواوە لەبەرئەوە رێگایاندا کەسمکۆ بێتە سلێمانی، کەئەم دەنگەش بلاّوبوەوە، سلێمانی بەجارێ خرۆشا، ناوو شورەتی سمکۆو باسو حەکایەتی ئازاییو قارەمانی ئەم کوردە ناودارە دەمێك بو گەیشت بوە کوردستانی عیراق. لەبەرئەوە هاتنی بۆ سلێمانی، بۆ مەسەلەی کورد بەمزگێنی ئەژمێردراو هیوای نیشتمانپەروەرەکانی تازە ئەکردەوە. سمکۆ یا ئیسماعیل ئاغای سەرەك عەشیرەتی شوکاك لەدلّی هەمو کوردێکا جێگەیێکی بەرزی هەبو بەقارەمانێکی میللی ئەدرایە قەلّەم. حکومەتەکانی تورکو ئێران بەچاوێکی پڕ لەکینو شکەوە تەماشایان ئەکرد. لەبەر ئەمە هاتنی بۆ سلێمانی شتێکی کەم نەبو، گەورەو بچوك بەژنو پیاوەوە، لەم هاتنە ئەدوانو بێ ئۆقرە چاویان لەرێ بو، چاوەڕوانی گەیشتنی ئەم قارەمانەیان ئەکرد. ئەیانویست ساتێ زوتر بەدیداری شادبن، ئەوانە کە کوردو نیشتمانپەروەر بون سمکۆیان بەقارەمانێکی میللی ئەهاتە بەرچاو. هیوای ئەوەیان لێ ئەکرد کەئەم هاتنەی ببێتە هۆی گۆڕینی((مەجرای سیاسەت)). تا تەرازوی کوردایەتی سەرکەوێو شێخ محمود لەو((دو رییان))ـەوە کەلێی وەستا بو بخرێتەوە سەر رێی مەبەس، واتا روی پێ بکرێتەوە مەسەلەی کوردستان. مستەفا پاشا لەهەمو کەس زیاتر بەکەیف بو. لەو حالّەوە کەتیابو چو بوە حالّێکی ترەوە. خۆی قیت کردەوە. بو بو بەکوڕی چواردە سالّ. ئەویش لەسەودایەکی ترا بو، بەتەمای ئەوە بو سمکۆ شێخ محمود بەرەو ئامانجی خۆی بەرێ. لەو خەیالّەدا بۆ کەسیاسەتی ئینگلیز بێتە جێ. لەپێش هەمو شتێکا تورك لە((رەواندز))بکرێتە دەرەوە. خەباتو ئاژاوە بگاتە کوردستانی تورکیا. بەکورتی بۆ شکاندنی پشتی((مستەفا کەمال))هەولّی ئەدا....

ئیتر هاتنی سمکۆ بۆ سلێمانی نزیك ئەبوەوە، ئینجا لەسەر فەرمانی مەلیك، خانوەکەی شێخ مستەفای نەقیب پاکرایەوەو رێکخرا. رۆژی هاتنی سمکۆ سەرپاکی سلێمانی بەجارێ لەمالّ هاتنە دەرەوە، زۆربەی سوارەی عەشایری دەورو پشت چون بەپیریەوە. شاری سلێمانی وەکو بوك رازایەوە. لەناو ئاهەنگێکی گشتیو زەماوەندێکی میللیو نەتەوەییا بەرەو پیریەکی زۆر شیرینو شاهانەی بۆ کرا. شەوێك پێش گەیشتنی، شاری سلێمانی بەسانی شارە مێروڵە رروژا. دەرزیت

بهارێشتایه نەئەکەوتە سەر ئەرز. تا ڕۆژ خەو لەچاوی کەس نەکەوت. شتێکی کەسەیر بێ ئەوە بو تورك خواکانیش لەکەیفا بون. بەڵکو ئەوان لەکورد پەروەرەکان زیاتر نەشئەیان پەیا کرد بو، وا دەرئەکەوت کە بەلای دەستەی تورك خواکانیشەوە هاتنی سمکۆ جێی هیوا بو، وە بۆ سەرکەوتنی سیاسەتی تورك‌و مەبستی خۆیان بەباشیان ئەزانی. ڕۆژئاوا بو بو، کە لەمستەفا پاشا کاغەزێکم وەرگرت. داوای ئەوەی لێ ئەکردم کەهەر بەو شەوە((گۆرانی))یەکی جوانی میللی ڕێك بخەم‌و فێری قوتابیەکانی بکەم بۆ ئەوە کە لەبەرەو پیری سمکۆدا بخوێنرێتەوە. دەسبەجێ چومە مەکتەبی ئەعدادی. شەو بو بو بەرۆژ. لەبەرئەمە بەئاسانی قوتابیەکان کۆکرانەوە، تا ئەوان کۆبونەوە منیش((گۆرانی))یەکم ئامادە کرد. تانیوە شەو لەگەڵ دەستەی قوتابیی گۆرانی خەریك بوم‌و هەمو شتێ جێبەجێ کرا، قوتابییەکان لەخۆشییا نەیان ئەزانی چی بکەن؟ پێیان عەرزی نەئەگرت. بەتەما نەبون ئەو شەوە سەرخەوێ بشکێنن، بۆ ئەوە چونە ماڵەوە کەبۆ سبەینێ خۆیان کۆبکەنەوە. ئەو سبەینێیە کەجەژنی کورد بوو ئەچون بەپیر پاڵەوانی کوردستانەوە...

بەیانی ئەو شەوە، پێش هەتاو کەوتن ئەهالی شاری سلێمانی وردو درشت، بەپیاوو ژنەوە ڕژابونە کۆلانەکان، قوتابیانی مەکتەبەکان، لەو کۆلانەدا کەئەچو بۆ ماڵی((شێخ مستەفا))لەگەڵ عەسکەرو پۆلیس بەرانبەر بەیەك ڕیزیان بەست بو. بۆ ڕاگرتنی ئەمانەو ڕێکخستنیان، زابتە کوردەکان‌و مامۆستاکان بەچوستی لەهات‌و چۆدا بون، خەلق تا ئەهات زۆر ئەبون‌و لەو دەشت‌و کۆلانەدا جێیان نە ئەبوەوە، تەلارو پێش هەیوان‌و بەرپەنجەرەی خانوەکان، وسەربانی مزگەوتی گەورەو دوکان‌و بازاڕ، جمەی ئەهات، دێهاتی‌و لادێی نزیکی سلێمانی بەجارێ ڕویان کرد بوە ناو شار، لەدوای ئەمانەو چاوەڕوانییەکی بێ ئۆقرە، نزیکی نیوەڕۆ سەیارەی شێخ قادری سەرەك ڕەئیس دەرکەوت. خەڵقەکە جارێکی تر خرۆشان‌و بەیەکا چون. مامۆستا خوێن گەرمەکان‌و زابتە چوست‌و چالاکەکان، گورج بونەوەو چون بەلای قوتابیان‌و عەسکەرەکانەوە، ئیتر بۆ کڕنوش((سەلاو))چاوەڕوانی ئیشارەتی بون، ڕیزی قوتابیان بەرانبەر بەریزی عەسکەرەکان وەکو دو خەتی ڕاستی بەڕاستە کێشراو وەستا بون، چاویان بڕی بوە دەمی زابت‌و مامۆستاکانیان، لەپڕ سەیارەیەك گەیشتە پێشەوەو دەرگاکەی کرایەوە، بەتەنیشت شێخ قادرەوە باڵای بەرزو قەدی شمشاڵی سمکۆ دەرکەوت، پڵنگی کوردستان لەبەرگی عەسکەریا بەوێنەی ژەنەراڵێك هاتە پێشەوە.

چاوێکی بەو خەڵقەدا خشاندو بۆ سەڵاو هەردو دەسی بەجارێ بڵند کردەوە، ئیتر لەگەڵ هەلهەلەو چەپڵە ڕێزانی ژنان، لەلایەکەوە گوڵ بارانو دەنگی((بژی بژی))و لەلایەکی تریشەوە گرمەی تۆپ دەسی پێ کرد. فرمێسکی شادی بەری چاوی نیشتمانپەروەرەکانی گرت بو بۆ ماوەیەك لەهۆش خۆیان چون، لەمێژوی ڕۆژە گرنگە پیرۆزەکانی سلێمانی یا، دوای ڕۆژی گەڕانەوەی شێخ محمود لەهیندستان، ئەو ڕۆژە یەکەم ڕۆژی شادیو پیرۆزی سلێمانی بو، ئەو ڕێزە قوتابیو عەسکەرانە کە لەکرنۆشا وەستا بون چاوەڕوانی سمکۆ بون، ئەبو بە بەردەمیانا بڕواو بیان پشکنی، ئەنجا سمکۆ بەهەنگاوێکی ڕێكو لەسەرخۆ بەرەو ئەوان ئەجولایەوە. لەو ساتەدا لەشاهێ لەو شاهانە ئەچو کە لەبیرو خەیاڵی کوردا ئەژین، قوتابی لەگەڵ گۆرانی بەخێرهاتنا دەسیان کرد بەگوڵبارانو عەسکەرو پۆلیس بەتفەنگە بریسکەدارەکانیانەوە لەسەلاوا وەستان، وێنەی ئەو ساتەی سمایل خانو دەستە سوارەکەی پڕ لەچەکی شوکاك، ئەشیا کەبچێتە لاپەڕەکانی مێژوی کوردەوە، سمکۆ خۆی هەرچەن بەرگی عەسکەری لەبەرا بو، بەلام لەگەڵ ئەمەشا نیشانەی ڕەگەزی کوردایەتی ئەو بەجێگەیێکی بەرزەوە ئەبینرا. واتا کلاوێکی کوردانەی شوکاکیشی لەسەر نابو وچەن هەورییەكو مشکی بەدەوری ئەم کلاوەدا پێچا بو وتیێ ئالاند بو، ئەو پیاوانەی کە لەگەڵیشی بون بە بەرگی کوردی شوکاکەوە لەکوردستانی باکورەوە دیاریەکی بەنرخ، واتا دیمەنێکی شیرینی براکانی ژوروبان بۆ هانی بوین، مستەفا پاشای دۆستی دێرینی سمکۆ، بەوتارێکی گەرمو بەهێز داستانی دورو درێژی ئەم بێچوە شێرەی بۆ گێڕاینەوە، مێژوی پاڵەوانیو نیشتمانپەروەری سمکۆو ئەو کارەساتانەی بۆ هۆنینەوە کە لەم ڕێیەدا بەسەری هات بو))[٧٠].

ژمارەی ٨ی هەفتەنامەی((ڕۆژی کوردستان))زەمانی حکومەتی کوردستان ڕیپۆرتاجێکی درێژی لەسەر چونی سمکۆ بۆ سلێمانی بەمجۆرە نوسیوە:

((قەهرەمانی کوردستان، حەضرەتی ئیسماعیل ئاغا- سمکۆ

هەفتە لەمەوپێش جەنابی طاهر ئەفەندی سەرکاتبی حەضرەتی ملوکانە بەقوەتێکی سواریەوە تەشریفی حەرەکەتی کرد بۆ ئیستیقبالی حەضرەتی قەهرەمانی کوردستان جەنابی ئیسماعیل ئاغا.

ڕۆژی ٧ی کانون سانی ٣٩ کەجەنابی ئاغا قۆناغی نزیك سلێمانی بۆ وە حەضرەتی رەئیس الرؤسا جەنابی شێخ قادر ئەفەندی کە لەمەعییەتی موبارەکیدا قوماندانی تابوری ژاندرمە بەقوەتێکی زۆرەوەو کوللی ئەشرافی مەملەکەت مەوجود بون بۆ ئیستیقبال حەرەکەت فەرما بو و نزیکی مەنزلی تەشریفی چو بەپیریەوە.

رۆژی ٨ی کانونی سانی ٣٩ عوموومی دەوائیری حکومەت تەعتیل کرا ئەهالی دوکانیان هەڵ گرت. عوموومی ساداتی کیرامو مەئمورانی عەسکەریو مولکی رونەساو ئەشرافو موننەوەرانو ئەهالی موحتەرەمە بۆ مەراسیمی ئیستیقبال نزیکی نیوسەعات بسواریو بەپیادە حەرەکەتو رویان کردە رێگای ئیستیقبالو ئینتیزار.

جەنابی رەئیسی داخلیە لەگەڵ جەنابی کەپتان چپمن وەکیلی فەخامەتی مەندوبی سامیدا بەئوتومبێلو سائیری رونەسای حکومەت قیسمەن بەئوتومبێل تا سەعاتی رێگا ئیستقبالیان کرد. هەرچی رونەسای عەشایری کە لەسلێمانی حازر بون هەرکسە بەخۆیو دەستەو دایرەیەوە بەسورەتێکی مونتەظەمو جیاواز داخلی مەراسیمی ئیستیقبال بون.

لەپاش تەرتیبو تەنظیمی ئەم مەراسیمە گەردونە حەزرەتی جەلالەتی مەلیك دامە شەوکەتوهو ساعەت لەشەشی کوردی لەشارەوە نزیکی نیو سەعات رێگا بۆ ئیستیقبال تەشریفی فەرمو وە لەجێگای مەخصوص ئینتیزارو ئیستراحەتیان فەرمو، کەتەشریفی موبارەکی حەزرەتی ئاغای نامدار نزیك بوە لەریاسەتی قوماندانی میللیدا عوموومی قەطەعاتی سواری میللی ملوکانە ساعەتی رێگا لەشار دور تا کەناری شار لەهەردو لای رێگادا صەف بەستەی ئیحتیرامو سەلام بونو عەرضی تەعظیماتو تەبریکاتیان کرد.

لەپاش قەدەرێ کەحەضرەتی ئاغای نامدار لەگەڵ جەنابی ئەحمەد ئاغای برای موحتەرەمیو سایری خزمانو مەعییەتی موبارەکیو رونەسای کیرامو ذیالاحترامی عەشیرەتی پشدەر جەنابی بابەکر ئاغاو جەنابی عەباس ئاغاو سایری رونەسای پشدەرو مەنگورو ئوجاغ لەخزمەت جەنابی رئیس الرؤسا حەزرەتی شێخ قادر ئەفەندیدا بەتەواوی نزیکی مەوقیعی مەخصوصی جەلالەتی حەضرەتی مەلیك بونەوە، ئەوسا گەردونە حەضرەتی تاجداریش تۆزێ چوە پێشەوە هەردو طەرەف دا موصافەحەو بەیانی خۆش ئامەدیو تەبریکاتو لەوازیمی موحیبەتو حورمەتی فوقولعادە لەهەردو جیهەتەوە بەجێ هێنرا. وە بەئیرادەی ملوکانە حەضرەتی ئاغای موحتەرەم لەگەردونەی مەخصوصەی ملوکانەدا ئەخزی مەوقیعی فەرموو لەخزمەت حەضرەتی مەلیكدا گەڕانەوە بۆ شار.

ئومەراو زابتانو عەساکیری مەنصورەی کوردستانیش کە لەخاریجی شاردا بەصورەتێکی مونتەزەظم صەف بەستەی ئیحتیرامو سەلام بون رەسمی تەعزیماتو سەلامیان ئیفاو گەلێ گۆرانی وەطەنی خۆشیان خوێندەوەو دوعای تەرەقیو موەفەقییەتی حکومەتو میللەتی کوردیان کرد، لەطەرەف جەلالەتی حەضرەتی

مەلیك‌و حەضرەتی ئاغای نامدارەوە تەفتیشی عەسکەرەکان کراو یەکە یەکە مەظهەری سەلام بون.

لەدوایی‌دا بەعومومی عەودەت کرایەوە بۆ خانوی مەوقیعی مەخصوصی حەضرەتی ئاغای موحتەرەم‌و لەبەر دەرگا تەوەقوفیان فەرمو لەوێ‌دا هەمو شاگردانی مەکتەب بەصورەتێکی رێکوپێك لەصەفی حورمەت‌و ئینتیزاردا راوەستان. گەلێ گۆرانی‌و ئەشعاری کوردی وەطەنی بەتەئسیریان خوێندەوە کەدڵی سامیعینی ئەکرد بەئاو.

لەطەرەف یەکێ لەشاگردانی مەکتەبەوە بەموناسەبەتی ئەو رۆژە موبارەکەوەو ئەو زاتە موحتەرەمەوە نوطقیکی جوان‌و رەوان خوێنرایەوە. کەعەرضی خۆش ئامەدی حەضرەتی ئاغای نامدار، دوعای بەقای موەفەقییەت‌و تەرەقی حەضرەتی مەلیك‌و میللەتی کورد بو، لەم ئیستیقبالە مونتەظەمەو لەم مەنظەرە موحتەشەمە عادەتەن عالەمی کوردییەت‌و قەومییەت ئیحیا بوەوە، لەپاشدا موسافرینی موحتەرەمە لەخزمەت حەضرەتی جەلالەتی مەلیکدا تەشریفیان چوە مەقامی خصوصی خۆیان.

حەقیقەت ئەم رۆژە رۆژێکی تاریخی‌و زۆر موقەددەسە. ئێمە ناتوانین دەرکی مەعالی‌و مەدح‌و سەنای خەدەماتی وەطەنپەروەرانەو ئیقداماتی فیداکارانەی حەضرەتی ئاغای نامدار بکەین. لاکین بەناوی عومومی میللەتی کوردەوە عەرضی خۆش ئامەدی‌و تەبریکاتی حەضرەتی ئەم قەهرەمانی کوردستانەوە رەفیقانی موحتەرەمی ئەکەین‌و بەتەشریف هاوردنیان ئیعلانی مسارو ئیفتیخارو سەعادەت‌و موەفەقییەتی هەمو قەومی کورد لەبارەگاهی کبریا ئیستیرحام ئەکەین)).

هاوزەمان لەگەڵ سەردانی سمکۆ بۆ سلێمانی چەند ئەفسەرێکی تورك، توپال رەمزی، فوزی بەگ لەلایەن تورکەوە لەرەواندزەوە هات بون بۆ گفتوگۆ لەگەڵ شێخ محمود، لەرێگەی موسڵیشەوە فەتاحی ئەمینی عەتار، ژنبرای شێخ محمودو ئەفسەری تورك هات بوە سلێمانی. ماوەیەك بۆ ئاڵوگۆڕی نامە لەنێوانی شێخ محمودو ئوزدەمیر، فەرماندەی هێزەکەی تورك لەرەواندز، هاتوچۆی نوێنەرانی هەردولا بەردەوام بو. ئەوانە توانییان شێخ محمود لەئینگلیز دور بخەنەوەو رای بکێشنە ناو سیاسەتی تورکەوە. سمکۆش پاش گەیشتنی تێکەڵاو بو. شێخ محمودو سمکۆو ٢٠کەس لەپیاوە ناسراوەکانی کوردستانی عیراق‌و ئێران مەزبەتەیەکیان دابو بەتورك دەربارەی مافەکانی کوردو رێکخستنی جۆری پێکەوە ژیانی کوردو تورك[٧١].

دەستەیەکی نوێنەرایەتیشیان لەرەفیق حلمی، ئەحمەد تەقی، فەتاح ئەمین عەتار پێك هێنا لەگەڵ نوێنەرانی تورك فوزی بەگو رەمزی بەگ بچن بۆ گفتوگۆ بۆ تورکیا[٧٢].

سمکۆ لەگفتوگۆکانی لەگەڵ نوێنەرانی ئینگلیز هیچ بەڵێنێکی سەبارەت بەمافی نەتەوەیی کورد وەرنەگرت بو، لەبەرئەوە لەچونیدا بۆ سلێمانی نەك هەر نەی توانی شێخ محمودو ئینگلیز پێك بهێنێتەوە، بەڵکو خۆیشی لەئینگلیز هەڵگەڕایەوە، لەگەڵ تورك رێك کەوتەوە. لەو رۆژانەدا نێوانی شێخ محمودو بەریتانیا بەتەواوی تێك چو بو. بەوردی ئاگایان لەکەینوبەینی شێخ محمودو تورك بو. ئەیان ویست شێخ محمود لێ بخەنو سلێمانی لەژێر دەست دەربهێننو بیخەنە سەر دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراق.

ئەدمۆنس پلانی روخاندنی حکومەتی کوردستان بەجۆرە ئەگێڕێتەوە:

((لەبەرئەوە لەشانزەهەمی شوباتدا بەفڕۆکە چوم بۆ بەغداد لەوێ لەکۆنفرەنسێکا بەهاوبەشی سێر هینری دوبس، بوردیلنو من لەلایەکو، سەرتیپی هێزی ئاسمانی بورتنو فەرماندەی هێز ماکنیس بەنوێنەرایەتی سەرکردایەتی گشتی لەسەر پلانی کاری ژێرو پێکهاتین: ١)لە٢١ی شوباتدا کۆمیساری باڵا محمود بە تەلگراف داوا بکا بۆ بەغداد" ٢)هەر کە لەجێبەجێ کردنی فەرمانەکە سەرپێچی کرد هێزی ئاسمانی بەسەر سلێمانیدا دەس بکا بەفڕینی نمایشییو فڕێ دانی بەیان، تێیدا لێخرانی ئەو رابگەیەنێو پێنج رۆژ مۆڵەتی بدەنێ لەگەڵ هەمو ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی بچن بۆ بەغداد" ٣)بۆ بەهێزکردنی ((هێزی ناوچەیی))و پێشگیری لە هەر جۆرە پەلامارێکی کتوپڕ بۆ سەر ئەم لایە، دو گروهان لەکەرتی١٤ی سیك، بەشەمەندەفەر ببرێتە کنگربانو لەوێشەوە بەفڕۆکە بگوێزرێنەوە بۆ کەرکوك" ٤)ئەگەر محمود شاری بەجێ نەهێشت سەربازگاو بارەگاکەی بۆمباران بکرێ. دەسەڵاتیش درا بەمن ئاگاداری سمکۆ بکەم کەدەوڵەتی ئێران بەهۆی کۆمیساری باڵاوە لێبوردنی ئەوی قوبوڵ کردوە، هانی بدەم سلێمانی بەجێ بهێڵێ[٧٣].

ئینگلیزەکان نەیان توانی بەهەڕەشە شێخ محمود لابەن، لەبەرئەوە هەڕەشەی بۆمبارانیان لەخەڵکی سلێمانی کرد.

لەرۆژی ۱۹۲۳/۲/۲۳دا بەیاننامەیان بەفڕۆکە فڕێ دایە خوارەوە داوایان لەسمکۆ کرد کسلێمانی بەجێ بهێڵێت بۆ ئەوەی لەبۆمبارانی سلێمانیدا توشی زەرەر نەبێ.

لەرۆژی ۱۹۲۳/۲/۲٦دا بەیاننامەیەکی تریان بۆ شێخ محمودو دانیشتوانی شاری سلێمانی بەفڕۆکە بەسەر سلێمانیدا بلاوکردەوە. داوایان لەشێخ محمودو دانیشتوانی شارەکە کرد چۆڵی بکەن چونکە بۆمبارانی ئەکەن.

لەرۆژی ۱۹۲۳/۲/۲۸دا سمکۆ سلێمانی بەجێ هێشت. بۆ راوێژ رەشید جودت، کەیەکێ لەئەفسەرە هاوکارەکانی شێخ محمود بو، لەگەڵێ چو، بەرەو ناوچەکانی سنور.

پاش ئەوان شێخ محمود بەلەشکرەوە چوە ئەشکەوتی جاسەنە. دانیشتوانی شارەکەش رویان کردە دێهاتەکان.

لەتاریکولێلی بەیانی۱۹۲۳/۳/٤دا فڕۆکەکانی بەریتانیا سلێمانیان بۆمباران کرد[٧٤].

سمکۆ بەر لەوەی سلێمانی بەجێ بهێڵێ، بەهۆی رۆژنامەی((رۆژی کوردستان))ـەوە سوپاسنامەیەکی بەمجۆرە بلاوکردەوە:

((لەسەر دەعوەتو ئیرادەی حەضرەتی جەلالەتی مەلیکی کوردستانو سیدالسادات جەنابی مەلیك محمودی اول، دامە شەوکەوتوهو، بەکەمالی شەوقو شەطارەتەوە بۆ کەسبی شەرەفی زیارەتی حەضرەتی مەلیکی موعەظەم هاتمە سلێمانی. لەهەمو خوصوصێکەوە مەظهەری تەوەجوهاتو عینایاتی حەضرەتی ملوکانە بوم لەبەرئەوە بەهەمو مەوجودییەتمەوە عەرضی تەشەکورو ئیفتیخار ئەکەمو لەشێوەی ئینسانییەتو حسیاتی قەومییەت پەروەرانە کە لەمەراسیمی ئیستیقبالدا لەطەرەف جەنابی رئیس الرؤساو ساداتی کیرامو روئەساو مەئمورانی عەسکەریو مولکی حکومەتو ئەشرافو مونەوەرانو ئەهالی کوردستانەوە دەرحەق بەشەخسی من رەوا بینرا بو گەلێ موتەشەکیرو موفتەخیرم بەڵکو هەر فەلاکەتو ئەزییەتی کە لەرێگای خزمەتی ئازادیو خەلاصی ئەم میللەتەدا بەسەرما هاتوە لەبیرم چۆتەوە.

خودا هەمو لایەکمان موەفەق بکات...... سمکۆ))[٧٥].

**٨-گەڕانەوە بۆ سنور**

سمکۆ لەسلێمانی لەگەڵ تورك پێك هاتەوە. لەو روەوە حلمی نوسیوێتی:

((سمکۆ لەدلا تورکی خۆش نەئەویست. جگە لەمە تورکەکان تازە دەسیان لێ وەشاند بور برینیان کولاند بۆوە، لەبەرئەوە بۆی بکرایەو هیوای سەرکەوتنی

بیوایە، بەهەمو جۆرێ هەوڵی ئەوەی ئەدا کە تۆڵەیان لێ بسەنێتەوە، بەڵام هەواڵی بەجۆرێکی تر ئەهاتە بەرچاو، پڕوپاگەندەی ئوزدەمیرو لاگیرەکانی ئێجگار بەهێزو وەستایانە بو. تای تەرازوی سیاسەتی تورك لەسەرەوە بو، لەولای تریشەوە((خەسرەو)) پارچەیی لەجەرگی سمکۆ، بەدیل گیرابو لەلای تورك بو، لەخەزێنەی پارەکەشی دوای تاڵانو لەناوچون، نزیکەی ٢٠ هەزار لیرەی ئاڵتونی لە وان لەسندوقی فیرقەدا دانرا بۆ مابوەوە, چ لەئێرانو چ لەتورکیادا بستێ عەرزیشی دەس نەئەکەوت کەتیا بحەوێتەوە[٧٦].

تورك بەڵێنیان دایە گیراوەکانی بەربدەنو پارەکانی بدەنەوە، لێی بگەڕێن لەموڵکەکانی خۆیا لەتورکیا دابنیشێ. سمکۆ سلێمانی بەجێ هێشت بەرەو ناوچەی باشقەڵا کەنزیکی مەڵبەندی ژیانی خۆی بو.

کەمالیەکان ویستیان لەگەمەی سیاسی نێوان خۆیانو ئینگلیزدا لەکاتی ئاڵۆزانی کێشەی موسڵدا, لەبەرامبەر هەڕەشەی ئاسوریدا، کەڵك لەم وەربگرن.

کاربەدەستانی تورك لە وان داوایان لەسمکۆ کرد" بچێتە مەرکەزی ولایەتو سەر بۆ حکومەت دابنەوێنێو دڵسۆزیی خۆی بسەلمێنێ، بەڵێنی شەرەفیان دابویە لەو چونەدا بسەلامەتی بگەڕێتەوە. بۆ دەربڕینی دۆستایەتی فەرماندەی ئۆردوی تورك لەوان دوسەد لیرەو هەندێ تفەنگو فیشەکی بەئەحمەد تەقیو ڕەشید جەودەتو وەهبی بەگی یاوەری خۆیدا بەدیاری بۆ نارد.

سمکۆ مەرجەکانی قوبوڵ کرد. خۆیو هەندێ لەپیاوەکانی چون بۆ وان. کاربەدەستانی تورك بەڕێزەوە پێشوازییان کرد. سمکۆ میوانی فەرماندەی ئۆردو بو. هەزار لیرەی تریان لەپارەکەی خۆی دایەوە، لەگەڵ هەندێ چەکی تر.

وەکو سەرچاوە کوردیەکان ئەگێڕنەوە کاربەدەستانی تورك بەسمکۆیان وتوە: ((حکومەتی ئەنقەرە بڕیاری داوە هەزار سەربازی پڕ چەکی تورك بەجلوبەرگی نەتەوایەتی کوردەوە بخەنە ژێر فەرماندەتانەوە لەگەڵ هەمو هێزی نەتەوەدا. حکومەت چیتان پێویست بێ بۆتان ئامادە ئەکا. بەم هێزەوە بچنە ئێران شوێنو جێگای خۆتان بگرنەوە. لەوێ ئەحمەد ئاغای برات بەوەکالەتی خۆت دابنێ. خۆشتان بەهێزەکەتانەوە بچن بۆ کوردستانی خوارو بۆ یاریدەدانی شێخ محمودو عەباس ئاغا پێکەوە لەدژی ئینگلیز. سمکۆ بەم قسانە زۆر دڵخۆش ئەبێت. ڕێگەی ئەدەن بگەڕێتەوە بارەگاکەی خۆی چاوەڕوانی ئەو هەزار سەربازە بێ بۆی بنێرن. بەڵام پاش ماوەیەك ئاگاداریان کرد" بەهۆی باری سیاسی ناو دەوڵەتانەوە مەسەلەکەیان دوا خستوە)).

ئینگلیز بۆ ئەوەی گوشار بۆ سەر تورك ببات سنوری خۆی لەگەڵ دەوڵەتی تازەی عیراق وا دیاری بکا وەکو ئەوان ئەیانەوێو بۆ ئەوەی تۆڵە لەو هۆزە کوردانە بکاتەوە کەبەرەنگاری دەسەڵاتی بەریتانی بوبونو هەندێ ئەفسەری ئینگلیزیان کوشت بو، ئەی ویست ئاسورییەکان لەبادینان لەسەر سنوری تورك نزیك مەڵبەندی مێژویی خۆیان، نیشتەجێ بکا. تورکیش ئەیان ویست سمکۆ بەکاربهێنن.

مەسەلەی نیشتەجێ کردنی ئاسوریەکان سەری نەگرت. هەر زو هۆزە کوردەکان روبەڕوی راوەستان. مادەی سێیەمی پەیمانی لۆزانیش لەتەموزی ۱۹۲۳دا بڕیاریدا مەسەلەی موسڵ بخرێتە بەردەمی((کۆمەڵەی گەلان)) ئەگەر تورك‌و ئینگلیز لەماوەی نۆ مانگدا نەیان توانی بەخۆشی بەلایەکی دا بخەن. تورك پێویستی بەسمکۆ نەما[٧٧].

## ١/٨ هەوڵدان لەگەڵ سۆڤێت

هەر لەو ماوەیەدا کەسمکۆ لەسەر سنوری تورکی- ئێرانی بو.((کۆمەڵی ئیستیقلالی کوردستان))بەسەرکردایەتی خالد بەگی جبرانلی خەریکی خۆ ئامادەکردن بون بۆ شۆڕش. خالد بەگ لەسمکۆ رائەسپێرێ پێوەندی لەگەڵ سۆڤێت بکاو داوای پشتیوانیو یارمەتییان لێ بکا. سمکۆ بۆ ئەو مەبەستە ئەحمەد تەقی ئەنێرێ بۆ دیتنی کۆنسوڵی سۆڤێتی لەورمێ. راسپاردەکانی سمکۆ بۆ سۆڤێت بریتی ئەبێ لەدو شت" یەکەمیان، ئەگەر روسیا قایل بێت رێك بکەویت لەگەڵمان من ئامادەم هەمو کوردەکانی لەگەلا رێك بخەم بۆ یارمەتیەکی سیاسیو دەست کەوتو چاکەی روسیا، بەو مەرجەی روسیاش ئامادە بێت بۆ یارمەتیدانی کوردەکان بۆ سەندنی سەربەخۆییو وەرگرتنی مافی نەتەوایەتیمان. دوەمیان، ئەگەر ئەمەش نەکەن یارمەتی شەخسی خۆم بدەن بۆ گەڕانەوەم بۆ شوێنو جێی خۆم لەئێراندا لەسەر بەڵێنو چاودێری روسیا)). کونسوڵی روسی لەوەڵامدا وت بوی: ((بەئیسماعیل خان بڵێن داواکردنی یەکەمی لەگەڵ سیاسەتی ئەمڕۆی روسیادا ناگونجێت وەناشیانەوێ درۆی لەگەڵدا بکەن، چونکە لەپاشەڕۆژدا کوردو روس ئەبێ رێك کەون بۆیە نایانەوێ بەدرۆزن دەرچن لایان. بۆ داواکردنی دوەم ئەگونجێ تێ بکۆشینو هەوڵ بدەین بام خان لەمەودوا پەیوەندی بێ لەگەڵمان...)).

یەکێتی سۆڤێت تازە((پەیمانی دۆستایەتیو هاوکاری)) لەگەڵ حکومەتەکانی ئێرانو تورکیا بەست بو، وەبەڵێنیان دابو بەیەك یارمەتی دوژمنانی یەکتری نەدەن.

## ٢/٨ یەکتر بینینی رضا خان و سمکۆ

رضا خان دوای ئەوەی بو بەسەرداری سوپاو وەزیری جەنگ لەمانگی ذی القعدە ١٣٤٣ هیجری‌دا سەردانێکی ئازەربایجانی کرد. ئەوسا عەبدوڵلا خانی ئەمیر طهماسبی فەرماندەی لەشکری شیمالغرب بو. ئێران بەناو لەسمکۆ خۆش بو بو. لەو سەردانەدا رەزا خان و سمکۆ لەشاری سەلماس یەکتریان بینی. نوسەرێکی ئێرانی لەزمانی دبیر اعظم بهرامی کەسەرۆکی کابینەو هاورێی رەزاخان بوە لەو سەفەرەدا چیرۆکی ئەو یەکتر بینینە بەم جۆرە ئەگێرێتەوە:

((..لەماوەی چەند رۆژێکا فەرماندەی لەشکر بەو پەڕی خۆشییەوە کەوتە پیشان دانی پێشکەوتن و ئیصلاحات و باشییەکانی زەمانی خۆی" رێگای زۆرو جادەی شوسەدار، سەربازخانە. . .

سەرۆکەکانی عەشیرەتەکانی بانگ کردە خزمەت. لەوانە ویستی ئیسماعیل ئاغای سمکۆی ناسراو لەگەڵ سەرداری سوپا بەیەك بگەیەنێ. عەبدوڵلا خان لەپێشەوە تەلگرافی بۆ ئیسماعیل ئاغا کرد لەسەلماس ئامادە بێ تا بەخزمەتی حەضرەتی ئەشرەف شەرەفیاب بێ. حەزرەتی ئەشرەفیش لەگەڵ عەبدوڵلا خان و چەند نەفەر هاورێکاکانی خۆی کە لەتارانەوە لەگەڵی هات بون چونە سەلماس.

ئیسماعیل ئاغا لەگەڵ ٨٠٠ نەفەر سواری کورد هەمو بەجلوبەرگی قەشەنگ و مەوهیبی کوردییەوە، بەچەکداری ریزیان بەست بۆ چاوەڕوانی گەیشتنی فەرماندەی گشتی لەشکر بون.

سەرداری سوپا کاتێ ژمارەی هاورێکانی خۆی، کەتەنها ئەوانەی ناو دو ئوتومبێل بون، بینی و دیمەنی هەشت سەد سواری چەکداری کوردیشی لەپشت سەری ئیسماعیل ئاغاوە دی و بینی سەربازخانەکەش چۆڵە، بێ ئەندازە ترساو، هەقیشی بو. مەگەر ئەمە هەمان ئیسماعیل ئاغا نیە کەچوار سەد نەفەر ژاندارمەری بێچارەی بەو چەرمەسەرییە کوشت؟ مەگەر ئەمانە هەمان سوارانی نین کە یەك لەدوای یەك بەوپەڕی دلرەقییەوە خەنجەرە ترسناکەکانی خۆیان لەپرشالی قوتوری خۆیان ئەکێشاو ورگیان ئەدڕی و مەمکیان ئەبڕی و سەریان ئەپەڕاند؟ ئەم فەرماندەی لەشکرەمان گەوجێکی چەند سەیرە کەمن و خۆی بەمجۆرە بەدەس بەسراوی خستۆتە داوی ئەو جانەوەرانەوە. ئێستە تەنیا فەرمانێکی ئیسماعیل ئاغا کافیە بۆ ئەوەی ئێمەش وەکو ئەو ژاندارمانە کوت کوت بکەن. . .

لەگەڵ ترسی زۆرا دیسان سەرداری سوپا، وەکو هەمیشە رۆڵی خۆی بەباشی یاری کرد، هەرگیز پەشۆکانی دەرنەخست(تەنیا یەك دو کەس لەنزیکەکانی کەچاك شارەزای رەوشتی بون و بەچەند نیشانەیەکی پچوکی دیارا پەیان بەشاردراوەکانی ناو دەرونی ئەبرد، تێ گەیشتن).

ئیسماعیل ئاغا هەر بەبینینی سەرداری سوپا لەئەسپەکەی هاتە خوارێو بەشێوەی خۆیان سلاو و چاکوچۆنی کرد، بەلام سەرداری سوپا بەئەنقەست زۆر گوێی نەدایە، بەلوتبەرزییەکی زۆرەوە وەلامێکی ساردی دایەوەو یەکسەر روی کردە سەربازخانە.

ئەفسەری لەپێش سەربازخانەدا راوەستابو بەو پەڕی رێزەوە سەلامی کرد، بەلام فەرماندەی گشتی کەبەهۆی شتی ترەوە. نارازیو تورە بو گوێی نەدایەو لوطفی پیشان نەدا. تەنانەت شەللاقەکەی لەتورەییدا شکا. غەزەبی حەضرەتی اشرەف نەنیشتەوە. دوایی چوە سەربازخانە ئامادە بوان هەمو بەسەرسامی راوەستا بون. کەس لەهۆی ئەوە تێ نەئەگەیشت، سەرداری سوپاش لەپێش ئەوەدا ئەوانی تر لەسەرسامی دەربێن روی کردە ئەو مالەی بۆ شەو بۆیان ئامادە کرد بو. ئەو شەوە تا بەیانی نەنوستو هەموی لەناو ژورەکەدا هاتوچۆی ئەکرد. ئینسافەن هەقیشی بو. بۆچی سمکۆ شەو بە ۸۰۰ سوارەکەیەوە نەی دا بەسەر ئەم دە پانزە کەسەدا؟ هێشتا کەس تێ نەگەیشتوە، تەنانەت بیستم سمکۆش دوایی لەگێلی خۆی سەری سورما بو و ئەفسوسی خوارد بو.

لەکاتێکا کەپاش ماوەیەك دیسانەوە ئیسماعیل ئاغا بەهێزەکەی خۆیەوە چو بۆ شەڕی لەشکری شیمالغەرب، بیستم بەنزیکەکانی خۆی گوتوە: من ئیحتیمالی زۆر دائەنێم لەم شەڕەدا بەشکاوی لەناو بچم بەلام سەرەرای ئەوەش ئەجەنگم. چونکە ئەمە چارەنوسی منەو ئەبێ گوێڕایەلی چارەنوسی خۆم بم، ئەگینا ئەو شەوەی سەرداری سوپاو عەبدوللا خان لەگەڵ چەند کەسێکی دەستو پێ بەستراو وەکو مەلی کساس کەوت بونە داوی منەوە، هەق وابو کەلك لەئیقبالی خۆم وەربگرمو هەموویانم بکوشتایە. لەبەرئەوەی شەقم لەبەختی خۆم هەڵ داوە مەحکومم بە لەناوچون.

بەکورتی ئەو شەوە لەشانسی سەرداری سوپا، سمکۆ خۆی گوتەنی کەلکی لەئیقبالی وەرنەگرتو بەیانی هەمو بەسەلامەتی لەسەلماس دەرچونو بەرەو سەلماسی کۆن کەوتنە رێ..

..پاش بەسەربردنی تەشریفاتی سەردانو پشکنینی پێویستو بەخشینی خەلات بەسمکۆ، سەرداری سوپا سەلماسی بەجێ هێشتو لەگەڵ هاوڕێکانی گەڕایەوە بۆ تەورێز.

راوی ئەڵێ کاتێ سەرداری سوپا بەئەندازەی کافی لەسمکۆ دور کەوتەوە لەنزیك قاوەخانەیەکەوە راوەستاو هەناسەیەکی قولی هەڵ کێشاو بەزمانی حاڵ وتی: توشی عەجەب تەڵەیەك بوین! واقیعەن ئەم کابرا گەوجە ئێمەی هاویشت بوە چ تەهلوکەیەکەوە، ئەوەندەی نەما بو بەخۆڕایی تیا بچین، بیحەمدیللا بەخێر تێ پەڕی...))[٧٨].

### ٣/٨ ڕێکەوتنی تورکی- ئێرانی

ڕضا شا لەزۆر ڕووەوە لاسایی مستەفا کەمالی ئەکردەوە. بەنمونەیەکی پێشڕەوی دائەنا بۆ نویێ کردنەوەی ئێران. ئێران‌و تورکیا چەندین کێشەی هاوبەش‌و لەیەکچویان هەبو. لەوانە کێشەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد. سمکۆ دوای تێکشکانی لەچەهریق ئیتر چالاکییەکی چەکداری ئەوتۆی نەکردبو دژی ئەرتەشی ئێران. ڕەزا شا بەتەواوی دەستی گرت بو بەسەر ئێراندا. کۆتایی بە شۆڕش‌و یاخی بونی ناوچە جیاوازەکان هێنابو. دەسەڵاتی ناوەندی بەهێزی تێدا دامەزراند بون.

لەنیسانی ١٩٢٦دا ئێران‌و تورکیا پەیمانێکی دو قۆڵییان بەناوی((معاهده نامەی ودادیەو تامینیه مابین دولت علیەی ایران‌و جمهوریت ترکیه)) بەست. ئەم پەیمانە ١١ فسڵ(مادە)بو. تەرخان کرا بۆ دانانی ڕێوشوێنی ئاشتی لەنێوان هەردو وڵاتدا. بێلایەنی ئەم لایە ئەگەر لاکەی تر توشی شەڕ بو. بەشدار نەبون لەهیچ جۆرە پێکهاتنێکی سیاسی‌وماڵی‌و ئابوری‌دا دژی یەکتری، ڕێکەوتنی بازرگانی، کونسوڵی پۆست‌و تەلەگراف، ئیقامەو دانەوەی تاوانباران، بەلاداخستنی ناکۆکی بەخۆشی. ئەوەی لێرەدا جێگەی سەرنجدانە فسڵەکانی پێنجەم‌و شەشەمە:

فسڵی پێنجەم: هەردو لایەنی مەزنی پەیمانکار بەڵێن ئەدەن، لەخاکی خۆیاندا ڕێگە نەدەن بەدامەزراندن‌و جێگیر بونی دامەزراو دەستەی ئەوتۆ کەئەیانەوێ ئاشتی‌و ئاسایشی مەملەکەتی پەیمانکارەکەی تر تێك بدەن یاحکومەتەکەی بگۆڕن، هەروەها ئەو کەس‌و تاقمانەی بەڕێگەی پڕوپاگەندە یا بەهەر ڕێگەیەکی تر ئەیانەوێ دژی مەملەکەتی پەیمانکارەکەی تر کار بکەن لەخاکی خۆی‌دا ڕانەگرن.

فسڵی شەشەم: بۆ دابین کردنی ئاسایش‌و ئەمنییەتی دانیشتوانی ناوچەکانی سنور هەردو لایەنی پەیمانکار هەمو جۆرە هەنگاوێکی پێویست ئەنێن بۆ کۆتایی هێنان بەخرابکاری‌و کردەوەکانی تایەفەکانی دانیشتوی سەرسنورەکان کە لەوانەیە زەرەر لەئاسایشی مەملەکەت بدەن. هەردو دەوڵەت ئەو کارانە بەجیا یا ئەگەر بەپێویستیان زانی پێکەوە ئەکەن[٧٩].

دیارە هەندێ لەبەندەکانی ئەم ڕێکەوتنە لەترسی بزوتنەوەی کورد بوە لەو ماوەیەدا. شۆڕشی سمکۆ لەکوردستانی ئێران‌و شۆڕشی شێخ سەعید لەکوردستانی تورکیاو شۆڕشی شێخ محمود لەکوردستانی عیراق.

شۆڕشەکانی کوردستانی تورکیا" ١٩٢٥و ١٩٢٧-١٩٣٠ تورکیای هەژاند. مەڵبەندەکانی سەر سنوری تورکی- ئێرانیشی گرت بووەوە. هەم هێزەکانی شۆڕش بۆ خۆپاراستن ناچار ئەبون ئەمدیو و ئەودیو بکەن، هەم هێزەکانی تورك. لەکاتی

هەڵگیرسانی شۆڕشی ئاگری داخدا ئەم سنور شکاندنە بو بەهۆی گرژی پێوەندی هەردو حکومەتو ئاڵوگۆڕی نامەو نوێ کردنەوەی گفتوگۆ بۆ دانانی ڕێوشوێنی هاوبەش دژی بزوتنەوەی کورد. لێرەدا ڕاگەیەنراوێکی ڕەسمی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی حکومەتی ئێران لە١٧ی مانگی میهری ١٣٠٦دا بو نمونە ئەنوسینەوە:

((قائیم بالاعمالی تورکیا لە٢٠ی ئەیلول دا لەنامەیەکا بۆ وەزارەتی دەرەوەی نوسیوێتی: لەبەرئەوەی حکومەتی تورکیا لەمانگی ئەیلولدا دەس ئەکا بەتەمێ کردنی کوردەکانی خۆی لەئاگری داخ کە لەسەرسنور شەرارەت ئەکەن، داوا لەحکومەتی ئێران ئەکا بەهێزەکانی ئاسایشی خۆی رێ بگرێ لەو ئەشرارەی بیانەوێ پەنا بۆ خاکی ئێران بهێنن، هەروەها داوا لەحکومەتی ئێران ئەکا بۆ ئەوەی هەنگاوەکانی تورکیا کاریگەر بێ. لەو بارەیەوە کاری هاوبەش بکەن.

لە١٩ی شەهریوەردا، دوای ئەوەش لە٤ی میهردا وەزارەتی کاروباری دەرەوە بۆ سەفارەتی تورکیای نوسیوە" کەهەڵبەت حکومەتی تورکیا لەسەرکوت کردنی عەشیرەتەکانی خۆیدا ئازادەو حکومەتی ئێران لەروانگەی پتەوکردنی پێوەندی دۆستانەی نێوان هەردو وڵاتەوەو لەروانگەی ئەرکی دراوسێیەتییەوە سەرەڕای کورتی ماوەکەو دواکەوتنی دانی ئاگاداری بەدەوڵەتی ئێران، کوردەکانی خۆی ئەخاتە ژێر چاودێرییەوە بۆ ئەوەی لەلایەن ئەوانەوە یارمەتی بەکوردەکانی تورکیا نەدرێو بۆ ئەوەی نەوەکو بەهۆی تەعسباتی هاونەژادیو خزمایەتییەوە ئەوانە کارێ بکەن، ئێلاتە سنور نشینەکانی خۆی لەخەتی سنور دور ئەخاتەوەو بۆ ناوەوەی وڵاتیان ڕانەگوێزێو، فەرمان دراوە بەکاربەدەستانی قشونو سنور" ئەگەر کوردەکانی تورکیا لەبەرامبەر عەمەلیاتی هێزە جەنگییەکانی تورکیادا ڕایان کرد بۆ ناو خاکی ئێران" نەهێڵن ئەوانە لەسنورەکانا بێننەوەو بتوانن سەر لەنوێ کاری جەنگیی دژی ئۆردوی تورك بکەن، خاوەن پایەیەکی بەرزیش بۆ چاودێری بڕیارەکانی سەرو نێردراوو فەرمانی پێ درا کە لەپێوەندی ڕاستەوخۆدا بێ لەگەڵ فەرماندەیی تورکاو لەیارمەتی دانی پێویست درێخی نەکاو هەنگاوی پێویست بنێ بۆ ڕێ برین لەپەڕینەوەی یاخییانی کورد لەسنوری ئێران. لەهەمان کاتدا حکومەتی ئێران لەروانگەی دائیمی خۆیەوە جارێکی تر بیری حکومەتی تورکی خستەوە" کەمادام ناکۆکییەکانی سنور کە لەلایەن حکومەتی تورکیاوە دروست کراون بەلادا نەخرێنو، دەسدرێژی کاربەدەستانی سنورو هێزە چەکدارەکانی تورك بۆ سەر خاکی ئێران ڕانەگیرێو کێشەکانی سنور چارە نەکرێو، حکومەتی تورکیا ڕێگری نەکا لەپەلاماری ئەشراری تورکیا بۆ سەر خاکی ئێران، هاوکاری تەواوی حکومەتی ئێران لەگەڵ حکومەتی تورکیا لەتوانادا نابێ.

لەوەڵامی نامەی ١٩ی شەهریوەری وەزارەتی دەرەوە، قائیم بالاعمالی تورکیا بەناوی حکومەتەکەی خۆیەوە لەیارمەتی دانی حکومەتی ئێرانی سوپاسی دەربڕی.

لەگەڵ هەمو ئەو یارمەتییانەی ئێران‌و بەجێهێنانی ئەرکەکانی دۆستی‌و دراوسێیەتی، ماوەیەك لەمەوبەر هەواڵ گەیشت کەفڕۆکەکانی تورکیا دەسدرێژییان کردۆتە سەر خاکی ئێران‌و بۆمبایان بەرداوەتەوەو چەند کەسێکیان بریندار کردوەو ئۆردوی تورك پەلاماری ناوەندێکی سنوری لەسەردار بلاغی داوەو سوتاندویەتی. هەر لەم ماوەیەدا لە١ی تشرینی(٨ی میهر)نوسراوێ لەقائیم بالاعمالی تورکیاوە گەیشت" کەتاقمێ سەربازی تورك لەکاتی جولاندا لەناو خاکی تورکیادا لەلایەن عەشایەری کوردەوە پەلاماری داون ٤٤ سەربازو چەند خاوەن پایەو ٥ رەشاش کەوتۆتە دەس پەلاماردەرەکان‌و بردویانەتە ناو خاکی ئێرانەوە، داوای کرد بو لەماوەی ١٠ رۆژدا دیلەکان بەر بدرێن‌و چەکە گیراوەکان بدرێتەوەو زەرەرەکانی لێیان کەوتوە بۆیان ببژێردرێ، داوای مەعزەرەت لەتورکیا بکا، لەحاڵەتی جێبەجێ نەکردنی ئەوانەدا دور نیە پێوەندی سیاسی ببڕێ.

پێویست بەوتن ناکا کە گەیشتنی نوسراوی گۆڕین مایەی سەرسوڕمان‌و داخی حکومەتی ئێرانە بەتایبەتی بەپێی ئەو زانیارییانەی بەحکومەتی ئێران گەیشتوەو ئەو قسانەش کەخاوەن پایەکانی تورك کەلای کوردەکان دیل بون‌و بەراکردن خۆیان گەیاند بوە بارەگای پۆستەکانی ئێران کردویانە، پشتیوانی لێ ئەکا بەجۆرە بوە:

لە٣١ی شەهریوەردا خاوەن پایەیەکی تورك بەناوی بینباشی محەمەد شوکری بەگ بەبرینداری پەنای برد بوە بەر بارەگای سنوریی قەراولانی ئێرانی، لەوێ وتویەتی کە لەگەڵ تاقمەکەی خۆیا بەرەو((ایدر))ئەچون لەناو خاکی تورکی‌دا، لەناکاو کەوت بونە ناو ئابلۆقەی کوردە قاچاغەکانی تورکیاوە، زۆری سەربازەکان ئەکوژرێن‌و رەشاشەکان‌و هەمو تفاقە جەنگییەکان بەتاڵان چون‌و ئەویش خۆی‌و چەند خاوەن پایەیەکی تر بەدیل ئەگیرێن. محەمەد شوکری بەگ بەکەسێ ئەسپێرن کەبیباتە ماڵی عەبدولقادر. ئەو کەسەش لەرێگا گوللەیەکی نابو بەسەری محەمەد شکری بەگەوە وای زانی بو مردوە لەوێ بەجێی ئەهێڵێ‌و خۆی ئەڕوا، ئەویش هەرچۆنێ ئەبێ خۆی ئەگەیەنێتەوە پۆستی قەرەوڵەکانی ئێران. پۆستە سنورییەکەی ئێران میوانداری شوکری بەگ ئەکەن‌و ئەینێرنەوە بۆ بارەگای ئۆردوی تورك. هەروەها قسەکانی خاوەن پایەیەکی تری تورکیش بەناوی سەلاحەدین بەگ پشتیوانی لەم ئاگادارییانە ئەکا.

لە١٣ی میهردا وەزارەتی دەرەوە بەدرێژی وەڵامی نوسراوەکەی سەفارەتی تورکیای دایەوەو بەو بەڵگانەی لەدەستابون دەربڕینەکانی تورکیا بەرپەرچ

درانەوە، دەری برِی بو کەهیچ جۆرە بەرپرسییەك لەسەر ئەوەی سەربازانی تورکیا بەهۆی بێ ئیحتیاطیەوە لەناوچەیەکی جەنگیی‌دا کەوتونەتە بەر هێرشی کوردی تورکیاو لەناو خاکی تورکیادا ناتوانرێ ئاراستەی ئێران بکرێ. بەپاڵ دانی ئەو مەسەلانە بەحکومەتی ئێران نامەتیقیو جێگەی ئیعتیراضی حکومەتی ئێرانە. دەربارەی ئەوەی کوردە قاچاغەکانی تورکیا دیل‌و چەکەکانیان هێنابێتە ناو ئێرانەوە حکومەتی ئێران ئاگادارییەکی باوەڕ پێ کراوی نیە، بگرە ئاگادارییەکانی سەرچاوە ئێرانییەکان پشتیوانی لەوە ناکەن. مەسەلەکە پێویستی بەلێکۆڵینەوە هەیە. لەئەنجام‌دا حکومەتی ئێران کاتی دیاری کراوی حکومەتی تورکیاو ناوەرِۆکی نوسراوی ١ی ئۆکتۆبەری قوبوڵ نیە. بەڵام بۆ پیشان دانی نیازی باشی خۆی پێشنیار ئەکا دەستەیەکی تێکەڵاو لەنوێنەرانی هەردولا لەشوێنی روداوەکەدا لەمەسەلەکە بکۆڵنەوە بۆ ئەوەی راستی رون بێتەوە. ئەگەر بکەرەکان لەخاکی ئێران‌دا بون، حکومەتی ئێران ئەوانە تەمێ ئەکاو, ئەگەر کوردە قاچاغەکانی تورکیا دیل یا چەکەکانیان هێنا بوە ناو خاکی ئێرانەوە هەنگاو ئەنێ بۆ وەرگرتنەوەیان.

ئەگەرچی گەیشتنی نوسراوی باسکراو بونەتە هۆی داخ‌و سەرسوڕمانی حکومەتی ئێران، لەگەڵ ئەوەش‌دا ئێمە هێشتا بێ هیوا نین کەسیاسەتی بنچینەیی‌و قازانجە بەرزەکانی هەردو وڵات زاڵ بێ بەسەر ئەو روداوانەداو.. حکومەتی تورکی بە لەبەرچاو گرتنی ئەو گیروگرفتانەی کە لەسیاسەتی رۆژهەڵاتی لەوانەیە بەهۆی ئاڵۆزانی پێوەندییەکانی ئێران‌و تورکیاوە پەیدا ببێ گیانی هێمنیی‌و دۆستایەتی کە لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە پیشان دراوە لەلایەن حکومەتی تورکیاشەوە پیشان بدرێ‌و مەسەلەکە بەکۆتاییەکی باش بگات))[٨٠].

لەو کاتەدا محەمەد عەلی فروغی لەئەوروپاوە بۆ ئێران ئەگەڕایەوە. لەسەر داوای حکومەتی ئێران بۆ گفتوگۆ چو بۆ تورکیا. چەند هەفتەیەك لەوێ مایەوە. پێوەندییان چوەوە دۆخی ئاسایی جارانی.

## ٤/٨ پەڕینەوە بۆ کوردستانی عیراق

تورك تەنگی بەسمکۆ هەڵچنی. بەتایبەتی دوای شۆڕشی ١٩٢٥ی کوردستانی تورکیا. لەتشرینی یەکەمی ١٩٢٦دا هاتە ناو کوردستانی عیراقەوە. حکومەتی عیراق ویستی دەری بکا بەڵام نەی توانی. لەناوچەکانی دەوروبەری رەواندزدا مایەوە.

معتمدی سامی بەریتانی لەبەغداد داوای لەحکومەتی عیراق کرد هاوکاری لەگەل ئێران بکات بۆ سەرکوت کردنی جولاَنەوەکەی سمکۆ. وەزارەتی دوەمی جەعفەر العسکری لەم بارەیەوە لەکۆبونەوەی ١٤ی تەموزی ١٩٢٧دا بڕیاریدا:

((حکومەتی عیراق جاران‌و ئێستا پێڕەوی سیاسەتی چەك کردنی هەمو عەشایەری کردوە، لەبەرئەوە چەك هەلگرتنی بێ ئیجازەی لەهەمو عیراقییەکان قەدەغە کردوە لەهەندێ ناوچەی دیاری کراودا، وە پلە پلە کەوتە فراوان کردنی ئەو ناوچانەو دابین کردنی هێزی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی سیاسەتی چەککردنی گشتی، لای وایە ئەم سیاسەتە دەستەبەری بەدیهێنانی ئامانجە ویستراوەکانە، بەلاَم مەسەلەی چەککردنی عەشایەر بەزۆری هێرشی سوپایی، ناتوانێ ئەنجامی گونجاوی هەبێ. ئەگەر ئەو هێرشانە بەڕێوەبەرایەتی بەهێز لەدوای خۆی بەجێ نەهێلێ، لەو شوێنانەدا کەبۆی ئەنێرن، حکومەتی عیراقی لەو بڕوایەدایە ئەو دواکەوتنەی لەدامەزراندنی پێوەندی لەنێوان عیراق‌و ئێراندا بوەو لەئەنجامی ئەوەشدا نەبونی هاوکاری کردنی راستەقینەی کاربەدەستانی سنور، بۆتە هۆی هان دانی عەشایەرو، تاقمە چەکدارەکان بەردەوام بن لەسەر کارە زیانبەخشەکانیان ئەو کارانەی تائێستا حکومەتی عیراق گلەیی لەدەس ئەکا)).

لەمایسی ١٩٢٨دا سمکۆ لەژێر گوشاری عیراقدا چوەوە ناو تورکیا. بەلاَم تورك سەرلەنوێ تەنگیان پێ هەلْ چنییەوە. بەناچاری روی کردەوە کوردستانی عیراق. دیسانەوە حکومەتی عیراق زۆری بۆ بردو لەئەرزی عیراق دەری کرد. ئێران لەنیسانی ١٩٢٩دا بەرەسمی دانی بەدەولْەتی تازە دامەزراوی عیراقدا نا. حکومەتەکانی عیراق‌و ئێران لەیەك نزیك بونەوە. بەگوتەی عەبدولرەزاق الحسنی((حکومەتی عیراق شۆڕشگێڕی ئێرانی سمکۆی ناچار کرد خاکی عیراق بەجێ بهێلێ‌و بچێتە ناو خاکی تورکیاوە))[81] سمکۆ ئەو ماوەیە لەمەلْبەندە سنوریەکانی تورکیاو ئێران عیراقدا لەهەلومەرجێکی ناخۆشدا ئەژیا. لەهەر ٣ لاوە بەدوایەوە بون. کەوتە هەولْ دان بۆ بەدەس هێنانی لێبوردنی حکومەتی ئێرانی.

**٩-گەڕانەوە بۆ ئێران‌و کوژرانی( حوزەیرانی ١٩٣٠)**

سمکۆ دوای ئەوەی لەتورکیاو بەریتانیاو عیراق ناتومێد بو. جێیەکی نەمابو تیێدا بحەوێتەوە، پێوەندی لەگەلْ کاربەدەستانی ئێرانی کرد بەهیوای ئەوەی لێی ببورن‌و رێی بدەن بگەرێتەوە سەر جێگەو رێگەی خۆی. کاربەدەستانی ئەرتەش بەلێنیان دایەو بۆ گفتوگۆ بانگیان کرد بۆ شنۆ. لەشنۆ بەپیلانێکی ناجوامێرانە کوشتیان. نوسەرانی ئێرانی بەتایبەتی ئەوانەی مێژوی روداوەکانی ئازەربایجان, یا

